



# معالم السنة النبوية

## نیڤشکێ فەرموودەیێت پێغەمبەری

نیڤشکێ «١٤» چواردە ژێدەرێت سەرەکینە یێت فەرموودەیان

کۆمکرن

شێخ صالح أحمد الشامی

کرمانجیکرن

ب دەستویریا شێخ صالح أحمد الشامی

دکتۆر إسماعیل سگێری

بەرگێ دووێ











# نیشکێ فەرموودەیێت پێغەمبەری

نیشکێ «١٤» چواردە ژێدەرێت سەرەکینە یێت فەرموودەیان


کۆمکرن

شێخ صالح أحمد الشامي

وەرگێران

ب دەستویریا شێخ صالح أحمد الشامي

دکتۆر ئیسماعیل سگێری


## بەرگێ دوێ


١٤٤٥ ٢٠٢٤






ناڤێ پەرتووکێ: نیڤشکێ فەرموودەیێت پێغەمبەری

کۆمکرن: شێخ صالح أحمد الشامي

وەرگێران: ب دەستویریا (شێخ صالح أحمد الشامي)

(دکتۆر ئیسماعیل سگێری)

دیزاینا بەرگی: مللەت موحەممەد

رێکخستنا ناڤەرۆکێ: دلۆڤان عەساف

سەرپەرشتێ چاپێ: ئەواب ئەحمەد جزیری

سالا چاپکرنێ: ٢٠٢٤

تیراژ:١٠٠٠

هژمارا سپاردنێ:٢٣\١٢٦٨٠\D-




دهوک - بەرامبەر پەیکەرێ ئەحمەدێ خانی

00964 750 458 88 06

Jeziry BookShop Jeziry BookShop



پەرستن

# الكتاب الخامس:

# صلاة التطوع والوتر

# كتێبا پێنجێ:

# نڤێژا سوننەت و نڤێژا وترێ

## الفصل الأول: صلاة التطوع

## پشکا ئێکێ: نڤێژا سونەت

### ١ ـ باب: تعاهد ركعتي الفجر

### بابەتێ: پارێزیکرن و هشیاری ل سەر دو رکعەتێت سونەتا سپێدێ

١٣١٧ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَت: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ (ﷺ)، عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ، أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُداً عَلَى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ. [خ١١٦٣/ م٧٢٤]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ل سەر چو سونەتان پتر پێ رژد و هەشیارتر نەبوو وەکی رژدی و هشیاریا ل سەر دو رکعەتێت سونەتا سپێدێ.**

١٣١٨ – (م) عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ قَالَ فِي شَأْنِ الرَّكْعَتَيْنِ عِنْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ: (**لَهُمَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعاً**). [م٧٢٥].

- وفي رواية: قَالَ: (**رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا**).

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) ژ پێغەمبەری (ﷺ) وی د راستا دو رکعەتێت دەمێ دەرکەفتنا سپێدێدا گۆت: **(ئەو هەردو رکعەت بۆ من ژ دنیایێ هەمییێ خۆشڤیترن).**

- **و د ڤەگێرەکێدا گۆت: (دو رکعەتێت بەری نڤێژا سپێدێ ژ دنیایێ و ژ تشتێت د دنیایێدا چێترن).**

١٣١٩ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ، وَكَانَ يَقُولُ: (**نِعْمَ السُّورَتَانِ هُمَا، يُقْرَأُ بِهِمَا فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ**: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، وَ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ). [جه١١٥٠].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دو رکعەت بەری نڤێژا سپێدێ دکرن و دگۆت: (باشترین سۆرەت د هەردو رکعەتێت سپێدێدا بێنە خواندن ئەڤ هەردو سۆرەتەنە: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾).**

١٣٢٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا رَكَعَ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ. [حم٦٦١٩].

* صحيح لغيره.

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دو ركعەتێت سونەتا سپێدێ دكرن ل سەر رەخێ خۆ یێ ڕاستێ درازیا.

## ٢ ـ باب: التطوع قبل المكتوبة وبعدها.

**بابەتێ: كرنا سونەتان بەری نڤێژێت فەرز و پشتی وان.**

١٣٢١ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ)، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: (لِمَنْ شَاءَ). [خ٦٢٧ (٦٢٤)/ م٨٣٨].

**ژ عەبدوللایێ كورێ موغەففەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (د ناڤبەرا هەردو بانگاندا (مەخسەد پێ د ناڤبەرا بانگی و قامەتێدا) سونەت یا هەی، د ناڤبەرا هەردو بانگاندا سونەت یا هەی)، جارا سێیێ گۆت: (یێ بڤێت).**

١٣٢٢ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ المؤَذِّنُ إِذَا أَذَّنَ، قَامَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) يَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ، حَتَّى يَخْرُجَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَهُمْ كَذلِكَ، يُصَلُّونَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ المغْرِبِ، وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ شَيْءٌ. [خ٦٢٥ (٥٠٣)/ م٨٣٧].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر بانگبێژی بانگ دابا، هندە كەس ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) رادبوون لەز دكرن دچۆنە دەڤ دنگان. (و دنگێت مزگەفتێ قورمێت دارڤەسپان بوون) هەتا پێغەمبەر (ﷺ) دەركەتبا ئەو د وەسا بوون دو ركعەتێت بەری مەغرەب دكرن، و چو د ناڤبەرا بانگی و قامەتێدا نەبوو.**

١٣٢٣ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ): سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ المغْرِبِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، وَسَجْدَتَيْنِ بَعْدَ الجُمُعَةِ، فَأَمَّا المغْرِبُ وَالْعِشَاءُ فَفِي بَيْتِهِ. [خ١١٧٢ (٩٣٧)/ م٧٢٩].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دو ركعەت بەری نڤێژا نیڤرۆ و دو ركعەت پشتی نڤێژا نیڤرۆ و دو ركعەت پشتی نڤێژا مەغرەب و دو ركعەت پشتی نڤێژا عەیشا و دو ركعەت پشتی نڤێژا خوتبێ یێت كرین بەلێ پا یا دو ركعەتێت پشتی نڤێژا مەغرەب و عەیشا ل مالا خۆ دكرن.**

١٣٢٤ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ لاَ يَدَعُ أَرْبَعاً قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ. [خ١١٨٢].

**ژ عائیشایێ (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چار رکعەت بەرێ نڤێژا نیڤرۆ و دو رکعەت بەرێ نڤێژا سپێدێ نەدهێلان.**

١٣٢٥ - (م) عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يُصَلِّي للهِ كُلَّ يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعاً، غَيْرَ فَرِيضَةٍ؛ إِلاَّ بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ ـ أَوْ إِلاَّ بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ ـ)**.

قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: فَمَا بَرِحْتُ أُصَلِّيهِنَّ بَعْدُ. [م٧٢٨].

- زاد الترمذي: **(أَرْبَعاً قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ)**. [ت٤١٥].

**ژ ئوم حەبیبە، هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) وێ گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نینە بەندەیەکێ موسلمان هەرۆژ دوازدە رکعەتان سونەت ژ بلی فەرزان بۆ خودێ بکەت، هەکە خودێ مالەکێ بۆ د بەحەشتێدا ئاڤا نەکەت. یان: هەکە مالەك بۆ د بەحەشتێدا نەهێتە ئاڤاکرن).**

**ئوم حەبیە دبێژیت: پشتی ڤێ ئەز بەردەوام وان رکعەتان دکەم.**

- **و ترمزی زێدەکرییە: (چوار رکعەت بەری نڤێژا نیڤرۆ و دو رکعەت پشتی وێ و دو رکعەت پشتی نڤێژا مەغرەب و دو رکعەت پشتی نڤێژا عەیشا و دو رکعەت بەری نڤێژا سپێدێ).**

١٣٢٦ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، عَنْ تَطَوُّعِهِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي فِي بَيْتِي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبعاً، ثُمَّ يَخْرُجُ فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. وَكَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. وَيُصَلِّي بِالنَّاسِ الْعِشَاءَ، وَيَدْخُلُ بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. وَكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ، فِيهِنَّ الْوِتْرُ. وَكَانَ يُصَلِّي لَيْلاً طَوِيلاً قَائِماً، وَلَيْلاً طَوِيلاً قَاعِداً. وَكَانَ إِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ، رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ قَاعِداً، رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَاعِدٌ. وَكَانَ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. [م٧٣٠].

ژ عەبدوللایێ کوڕێ شەقیقی (رحمه الله) گۆت: من پرسیارا سونەتێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ عائیشایێ کر؟ ئینا گۆت: چوار رکعەت بەری نڤێژا نیڤرۆ ل مالا من دکرن، پاشی دەردکەفت نڤێژ بەری خەلکی دکر، پاشی دهات دو رکعەت دکرن، و مەغرەب نڤێژ بەری خەلکی دکر پاشی دهاتە د مالا منڤە دو رکعەت دکرن، و عەیشا نڤێژ بەری خەلکی دکر پاشی دهاتە د مالا منڤە دو رکعەت دکرن و ب شەڤ نەهـ رکعەت دکرن و وتر ژ وان بوو، و دەمەکێ درێژ نڤێژ ژ پیاڤە ب شەڤ دکر، و دەمەکێ درێژ روینشتی نڤێژ ب شەڤ دکر و ئەگەر ژ پیاڤە خواندبا رکوع و سوجدە دبر و ئەو یێ ژ پیاڤە، و ئەگەر روینشتی خواندبا رکوع و سوجدە دبرن و ئەو یێ روینشتی، و ئەگەر سپێدە ببا دو رکعەت دکرن.

١٣٢٧ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (رَحِمَ اللهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعاً). [د١٢٧١/ ت٤٣٠].

* حسن.

و ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودێ دلۆڤانییێ ب مرۆڤەکی ببەت چار رکعەتان بەری نڤێژا ئێڤاری بکەت).**

## ٣ ـ باب: التطوع في البيت.

## بابەتێ: کرنا سونەتان ل مال.

١٣٢٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلاَتِكُمْ، وَلاَ تَتَّخِذُوهَا قُبُوراً**). [خ٤٣٢/ م٧٧٧].

و ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هندەك ژ نڤێژێت خۆ[1] (مەخسەد سونەت) بێخنە د مالێت خۆڤە و نەکەنە گۆڕ)[2].**

---

(١) مەخسەد پێ سونەتان نە نڤێژێت فەرز.

(٢) ئانکو: وەکی گۆڕان لێ نەکەن، چونکی چو نڤێژ د گۆڕانڤە ناهێنە کرن.

١٣٢٩ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِذَا قَضَى أَحَدُكُمُ الصَّلاَةَ فِي مَسْجِدِهِ؛ فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ نَصِيباً مِنْ صَلاَتِهِ، فَإِنَّ اللهَ جَاعِلٌ فِي بَيْتِهِ مِنْ صَلاَتِهِ خَيْراً**). [م٧٧٨].

**ژ جابری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە ئێك ژ هەوە نڤێژا خۆ ل مزگەفتا خۆ كر، بلا پشكەكێ ژ نڤێژا خۆ بێخیتە مالا خۆ[1] ب راستی خودێ خێرا سونەتا د مالا ویڤە مەزن دكەت).**

١٣٣٠ - عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ (ﷺ) فِي مَسْجِدِ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ الْمَغْرِبَ، فَقَامَ نَاسٌ يَتَنَفَّلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الصَّلاَةِ فِي الْبُيُوتِ**).[د١٣٠٠/ ت٦٠٤/ ن١٥٩٩]

* حسن.

**ژ كەعبێ كوڕێ عوجرەی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا مەغرەب ل مزگەفتا بنەمالا عەبد ئەشهەلی كر، ئینا خەلك رابوون سونەت كرن، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (كرنا ئەڤێ سونەتێ ببەنە مالان).**

## ٤ ـ باب: صلاة النافلة قاعداً.

## بابەتێ: كرنا نڤێژا سونەت روینشتی.

١٣٣١ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقْرَأُ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ جالِساً، حَتَّى إِذَا كَبِرَ قَرَأَ جَالِساً، فَإِذَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنَ السُّورَةِ ثَلاَثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهُنَّ، ثُمَّ رَكَعَ. [خ١١٤٨ (١١١٨)/ م٧٣١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من چو جارا پێغەمبەر (ﷺ) نەدیتییە د نڤێژا شەڤێدا روینشتی تشتەك خواندبیت، هەتا مەزن بووی، ئەگەر تەكبیر كربا روینشتی دخواند، و ئەگەر ژ سۆرەتێ سیە یان چل ئایەت ل بەر وی مابان رادبوو و ئەو دخواندن پاشی ركوع دبر.**

١٣٣٢ - (خ) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ـ وَكَانَ مَبْسُوراً ـ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ صَلاَةِ الرَّجُلِ قاعِداً؟ فَقَالَ: (**إِنْ صَلَّى قائِماً فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِداً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ، وَمَنْ صَلَّى نَائِماً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ**). [خ١١١٥].

---

(١) ئانكو: سونەتا خۆ بلا ببەتە مالا خۆ.

**ژ عیمرانێ كورێ (حصین)ی، بەواسیر لێ بوو (ﭬ) گۆت: من پرسیارا كرنا نڤێژێت سونەت ژ پێغەمبەری (ﷺ) كر، مرۆڤ روینشتی بكەت؟ ئینا گۆت: (ب راستی ئەگەر ئەو ژ پیاڤە بكەت ئەو باشترە، و یێ روینشتی بكەت بۆ وی نیڤ خێرا یێ ژ پیاڤەیە و یێ رازیی بكەت بۆ وی نیڤ خێرا یێ روینشتییە)[1].**

## ٥ . باب: صلاة الضحى.

## بابەتێ: نڤێژا تێشتەگەهێ.

١٣٣٣ - (ق) عَنِ عَبْدِ الرَّحمنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: ما أَنْبَأَنَا أَحَدٌ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى الضُّحَى غَيْرُ أُمِّ هَانِيءٍ، ذَكَرَتْ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ اغْتَسَلَ فِي بَيْتِهَا، فَصَلَّى ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، فَمَا رَأَيْتُهُ صَلَّى صَلاَةً أَخَفَّ مِنْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ. [خ١١٠٣/ م. صلاة المسافرين ٣٣٦ (٨٠)]

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ ئەبی لەیلا (ﭬ) گۆت: كەسێ نەگەهاندییە مە وی پێغەمبەر (ﷺ) دیتبیت نڤێژا تێشتەگەهێ كربیت ئوم هانیء نەبیت، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) رۆژا فەتحا مەكەهێ ل مالا وێ سەرێ خۆ شویشت و هەشت ركعەت كرن، من ئەو نەدیتییە ژ وان سڤكتر نڤێژ كربیت بەلێ ركوع و سوجود دورست دبرن.**

١٣٣٤ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُصَلِّي الضُّحَى أَرْبَعاً، وَيَزِيدُ مَا شَاءَ اللهُ. [م٧١٩].

**ژ عائیشایێ (ﭭ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چار ركعەت سونەتا زوحا دكرن و هندی خودێ حەز دكر زێدە دكر.**

١٣٣٥ - (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: أَوْصَانِي حَبِيبِي (ﷺ) بِثَلاَثٍ، لَنْ أَدَعَهُنَّ مَا عِشْتُ: بِصِيَامِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَصَلاَةِ الضُّحَى، وَبِأَنْ لاَ أَنَامَ حَتَّى أُوتِرَ. [م٧٢٢].

**ژ ئەبی دەردائی (ﭬ) گۆت: خۆشتڤییێ من ئەز ب سێ تشتان شیرەتكرم، هندی ئەز یێ ساخم ئەز وان ناهێلم: رۆژیگرتنا سێ رۆژان ژ هەمی هەیڤان، و دو ركعەتێت تێشتەگەهێ و نەنڤم هەتا ویترێ نەكەم.**

---

(١) هەلبەت نەڤە بۆ وییە یێ بشێت ژ پیاڤە بكەت، بەلێ روینشتی بكەت و بشێت روینشتی بكەت، بەلێ رازایی بكەت و وی شیان نەبن لەوا روینشتی یان رازایی دكەت خێرا وی یا تمامە و چو كێماسی تێدا نینە.

١٣٣٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لا يُحَافِظُ عَلى صَلاةِ الضُّحَى إِلاَّ أَوْابٌ) قَالَ: (وَهِيَ صَلاةُ الأَوَّابِينَ). [مه١٢٢٤/ ك١١٨٢].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (کەس بەردەوامیێ نادەتە نڤێژا تێشتەگەهێ زێدە خۆزڤڕی و تەوبەدار نەبیت) گۆت: (ئەو نڤێژا زێدە خۆزڤڕی و تەوبەدارانە).**

## ٦ . باب: صلاة الأوابين.

## بابەتێ: نڤێژا زێدە خۆزڤڕی و تەوبەداران.

١٣٣٧ - (م) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ: رَأَى قَوْماً يُصَلُّونَ مِنَ الضُّحَى، فَقَالَ: أَمَا لَقَدْ عَلِمُوا أَنَّ الصَّلاَةَ فِي غَيْرِ هَذِهِ السَّاعَةِ أَفْضَلُ، إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (صَلاَةُ الأَوَّابِينَ حِينَ تَرْمَضُ الْفِصَالُ).[م٧٤٨] [انظر: ١٣٣٦].

**ژ زەیدێ کورێ ئەرقەمی (رضي الله عنه)، دیت هندە کەس یێ سەرێ وەختێ وێ زوحایێ دکەن، ئینا گۆت: ئەرێ ما نەزانییە نە د ڤی وەختیدا بخێرترە، ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نڤێژا زێدە خۆزڤڕی و تەوبەداران دەمێ تێژکێ حێشترێ دسوژیت)[1].**

## ٧ . باب: صلاة الاستخارة.

## بابەتێ: نڤێژا خێرخوازییێ (ئستیخارێ).

١٣٣٨ - (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: كانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُعَلِّمُنَا الاِسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كما يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: (إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلِ: اللَّهُمَّ! إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ. اللَّهُمَّ! إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي . أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ . فَاقْدُرْهُ لِيَ وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي . أَوْ قَالَ: فِي

(١) نانکو: دەمێ گەرم زێدە دبیت نێزیکە تێژکێ حێشترێ بسوژیت.

عاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ . فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ. قَالَ: وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ). [خ١١٦٦].

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا ئستیخارێ و دوعایا وێ د هەمی كار و باراندا نیشا مە ددا وەكی سۆرەتێ ژ قورئانێ، و دگۆت: **(هەكە ئێكی ژ هەوە كارەك[1] كرە دلێ خۆ بلا دو ركعەتێت سونەت نەیێت فەرز بكەت، پاشی بلا بێژیت: یا خودێ ئەز ب زانینا تە یا خێرتر ژ تە دخوازم، و ئەز شیانێ ب شیانا تە دخوازم، و ئەز داخوازێ ژ تە دكەم ژ كەرەما تە یا مەزن، ب راستی تو دشێی و ئەز نەشێم، و تو دزانی** (كا خێرا من د كیرێدایە) **و ئەز نوزانم و تو زانایێ نهێنیانی. یا خودێ هەكە تو بزانی ئەڤ كارە** (...كارێ خۆ بێژە...) **بۆ من د دینێ مندا و د دنیا مندا و د دویماهییا مندا چێترە بۆ من بنڤیسە و بۆ من ساناهی بكە، یان گۆت: د دنیا مندا و د ئاخرەتا مندا** (و ئەڤە شكە ژ ڤەگێری) **یا خودێ هەكە تو بزانی ئەڤ كارە** (...كارێ خۆ بێژە...) **بۆ من د دینێ مندا و د دنیا مندا و د دویماهییا مندا خرابترە ژ من بدە پاش و من ژێ بدە پاش، یان گۆت: د دنیا مندا و د ئاخرەتا مندا** (و ئەڤە شكە ژ ڤەگێری) **و خێرێ ب رزقێ من بكە هەر جهێ لێ بیت پاشی من پێ رازیكە، و گۆت: و دێ هەوجەییا خۆ بێژیت).**

٨ ـ باب: تحية المسجد.

**بابەتێ: نڤێژا سلاڤا مزگەفتێ (تەحیا مزگەفتێ).**

١٣٣٩ - عَنِ ابْنِ لاَسٍ الْخُزَاعِيِّ قَالَ: دَخَلَ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ الْمَسْجِدَ، فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ أَخَفَّهُمَا وَأَتَمَّهُمَا، قَالَ: ثُمَّ جَلَسَ، فَقُمْنَا إِلَيْهِ فَجَلَسْنَا عِنْدَهُ، ثُمَّ قُلْنَا لَهُ: لَقَدْ خَفَّفْتَ رَكْعَتَيْكَ هَاتَيْنِ جِدّاً يَا أَبَا الْيَقْظَانِ؟ فَقَالَ: إِنِّي بَادَرْتُ بِهِمَا الشَّيْطَانَ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيَّ فِيهِمَا، قَالَ:... فَذَكَرَ الْحَدِيثَ.

[حم١٨٣٢٣، ١٨٣٢٤].

* حديث صحيح، وإسناده حسن.

[انظر: ١٠٨٧، ١٤٧٧].

---

(١) ژ كارێت كرن و نەكرن وەكی نێك، و یێت حەلال.

**ژ كورێ لاسێ خوزاعی (ﷺ) گۆت: عەمماری كورێ یاسری هاتە د مزگەفتێڤە ئینا سڤكترین و تمامترین دو ركعەت نڤێژ كرن، گۆت: پاشی روینشت، ئینا ئەم رابووین چۆینە دەڤ و ل دەڤ روینشتین، پاشی مە گۆتێ: ئەی بابێ یەقزانی ب راستی دو ركعەتێت خۆ تە گەلەك سڤك كرن؟ گۆت: ب راستی من لەز پێ كر رێگرتن ژ شەیتانی د واندا بهێتە من[1]، گۆت و فەرمووده گۆت.**

## ٩ ـ باب: صلاة التسبیح.

## بابەتێ: نڤێژا درێژ (تەسابیحان).

١٣٤٠ – عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِلْعَبَّاسِ: **(يَا عَمِّ! أَلاَ أَصِلُكَ، أَلاَ أَحْبُوكَ، أَلاَ أَنْفَعُكَ)** ؟ قَالَ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(يَا عَمِّ، صَلِّ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ، فَإِذَا انْقَضَتِ الْقِرَاءَةُ فَقُلْ: اللهُ أَكْبَرُ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً قَبْلَ أَنْ تَرْكَعَ، ثُمَّ ارْكَعْ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ اسْجُدْ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ اسْجُدْ الثَّانِيَةَ فَقُلْهَا عَشْراً، ثُمَّ ارْفَعْ رَأْسَكَ فَقُلْهَا عَشْراً قَبْلَ أَنْ تَقُومَ، فَتِلْكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ، وهِيَ ثَلاَثُمِائَةٍ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ، فَلَوْ كَانَتْ ذُنُوبُكَ مِثْلَ رَمْلِ عَالِجٍ لَغَفَرَهَا اللهُ لَكَ)**. قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَنْ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَقُولَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ؟ قَالَ: **(فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ أَنْ تَقُولَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ فَقُلْهَا فِي جُمْعَةٍ، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ أَنْ تَقُولَهَا فِي جُمُعَةٍ فَقُلْهَا فِي شَهْرٍ)**، فَلَمْ يَزَلْ يَقُولُ لَهُ حَتَّى قَالَ: **(فَقُلْهَا فِي سَنَةٍ)**.[ت٤٨٢/ جه١٣٨٦].

* صحيح.

**ژ ئەبی رافعی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە عەباسی: (ئەی مام ئەرێ ئەز مرۆڤانییێ د گەل تە نەكەم، ئەرێ ئەز دانەكێ نەدەمە تە، ئەرێ ئەز تشتەكی نیشا تە نەدەم مفاییێ تە تێدا بیت)؟ گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (ئەی مام چوار ركعەتان بكە د هەر ركعەتەكێدا فاتحەیێ و سۆرەتەكێ بخوینە، ڤێجا ئەگەر خواندن ب دویماهی هات بەری بچییە ركوعێ پازدە جاران بێژە: (اللهُ أَكْبَرُ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) پاشی هەرە ركوعێ هەر وێ دەه جاران بێژە، پاشی سەرێ خۆ ژ ركوعێ راكە و دەه جاران وێ بێژە، پاشی هەرە سوجدێ و دەه جاران وێ بێژە، پاشی سەرێ خۆ**

---

(١) تراسا هندێ شەیتان رویمەتییێ بۆ چێكەت، چونكی چاڤێ وان ل وی بوو.

**راکە و دەه جاران وێ بێژە، پاشی سوجدا دووێ ببە و دەه جاران وێ بێژە، پاشی سەرێ خۆ راکە و دەه جاران بەری تو رابییە ژ پێڤە وێ بێژە، ئەڤە بوونە حەفتێ و پێنج جار د هەر رکعەتەکێدا، و سێ سەد جار د چوار رکعەتاندا، ئەگەر گونەهێت تە وەکی رەملا کۆمکری بیت خودێ دێ بۆ تە ژێ بەت). گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ کی دشێت هەر رۆژ ڤێ بێژیت؟ گۆت: ئەگەر هەر رۆژ نەشیای د هەر حەفتییەکێدا بێژە، و ئەگەر د هەر حەفتییەکێدا نەشیای بێژی د هەر هەیڤەکێدا بێژە) و بەردەوام گۆتێ هەتا گۆتییێ (د سالەکێدا بێژە).**

## ١٠ . باب: صلاة الحاجة.

## بابەتێ: نڤێژا پێدڤییێ.

[انظر: ٢٢٧١][1].

## ١١ . باب: الاضطجاع بعد ركعتي الفجر.

### بابەتێ: پاڵدانێ پشتی هەردو رکعەتێت سونەتا سپێدێ.

١٣٤١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ اضْطَجَعَ. [جه١١٩٩].

* حسن صحيح.

[انظر: ١٣٢٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سونەتا سپێدێ دکر خۆ ل سەر تەنشتێ درێژ دکر.**

---

(1) **مەبەست نەڤ فەرموودەیە:** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ حُنَيْفٍ: أَنَّ رَجُلاً ضَرِيرَ الْبَصَرِ، أَتَى النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم فَقَالَ: ادْعُ اللهَ أَنْ يُعَافِيَنِي، قَالَ: (إِنْ شِئْتَ دَعَوْتُ، وَإِنْ شِئْتَ صَبَرْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ) ، قَالَ: فَادْعُهْ، قَالَ: فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ، وَيَدْعُوَ بِهَذَا الدُّعَاءِ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ، نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِيَ، اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ) . [ت٣٥٧٨/ جه١٣٨٥]

* صحيح.

**ژ عوسمانێ کوڕێ حونەیفی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکێ کۆرە هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: دوعا ژ خودێ بکە من سلامەت بکەت، گۆت: (ئەگەر تە بڤێت دێ دوعا بۆ تە کەم و ئەگەر تە بڤێت بێهنا خۆ فرەه بکە و ئەو بۆ تە باشترە)، گۆت: دوعا ژ خودێ بکە، گۆت: فەرمانا وی کر ئەو دەستنڤێژێ بشۆت و باش دەستنڤێژا خۆ بشۆت و ب ڤێ دوعایێ دعا بکەت: (ئەی خودا ئەز داخوازێ ژ تە دکەم و ئەز ب پێغەمبەرێ تە موحەممەدی بەرێ خۆ ددەمە تە پێغەمبەرێ دلۆڤانییێ، ب راستی من ب تە بەرێ خۆ دا خودایێ خۆ د ڤێ هەوجەییا خۆدا دا بۆ من بهێتە ڤەتاندن، یا خودێ بەرهڤانییا وی بۆ من قەبویل بکە.**

## ١٢ ـ باب: متى يقضي ركعتي الفجر.

**بابەتێ: کەنگی دێ هەردو رکعەتێت بەری نڤێژا سپێدێ قەزا کەت**

١٣٤٢ – عَنْ قَيْسِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) رَجُلاً يُصَلِّي بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**صَلاَةُ الصُّبْحِ رَكْعَتَانِ**)، فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي لَمْ أَكُنْ صَلَّيْتُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، فَصَلَّيْتُهُمَا الْآنَ، فَسَكَتَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [د١٢٦٧/ ت٤٢٣/ جه١١٥٤]

* صحيح.

**ژ قەیسێ کوڕێ عەمری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەلامەك دیت دو رکعەت نڤێژ پشتی نڤێژا سپێدێ دکرن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نڤێژا سپێدێ دو رکعەتن)، زەلامی گۆت: من ئەو هەردو رکعەتێت بەری سپێدێ نەکربوون، من ڤێ گاڤێ کرن، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بێدەنگ بوو.**

١٣٤٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ لَمْ يُصَلِّ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ؛ فَلْيُصَلِّهِمَا بَعْدَ مَا تَطْلُعُ الشَّمْسُ**). [ت٤٢٣].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ هەردو رکعەتێت سونەتا سپێدێ نەکربن بلا هەردووا پشتی رۆژ دەردکەڤیت بکەت).**

## ١٣ ـ باب: هل يتطوع حيث صلى المكتوبة.

**بابەتێ: ئەرێ دێ سونەتێ ل وی جهی کەت یێ نڤێژا فەرز لێ کری.**

١٣٤٤ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ** . قَالَ عَنْ عَبْدِ الْوَارِثِ . **أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ، أَوْ عَنْ يَمِينِهِ، أَوْ عَنْ شِمَالِهِ**). زَادَ فِي حَدِيثِ حَمَّادٍ: (**فِي الصَّلاَةِ**) يَعْنِي: فِي السُّبْحَةِ. [د١٠٠٦/ جه١٤٢٧]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەرێ ئێك ژ هەوە نەچارە ـ گۆت: ژ عەبد وارسی ـ پێش بکەڤیت یان پاش بکەڤیت یان بۆ لایێ چەپێ یان**

**یێ راستێ بچیت) و د فەرمووودا حەممادیدا زێدە کرییە: (د نڤێژێدا)[1] ئانکو: د نڤێژا سونەتدا.**

١٣٤٥ - عَنْ ابن عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَنْ صَلَّى الْفَرِيضَةَ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُصَلِّي بَعْدَهَا، فَلْيَتَقَدَّمْ أَوْ لِيْكَلِّمْ أَحَداً.

[هق٢/١٩١].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەر کەسێ نڤێژا فەرز کر و پاشی ڤیا سونەتێ پشتی وێ بکەت بلا پێش بکەڤیت یان د گەل ئێکی باخڤیت[2].**



(١) ئانکو: هەر گاڤا نڤێژا ب جەماعەت تمام کر بلا ئێکسەر نەرابیت سونەتا خۆ بکەت هەتا جهێ خۆ دگوهۆریت بۆ پێشییێ یان بۆ پاشییێ یان بۆ لایێ چەپێ یان بۆ لایێ راستێ وەك نیشان ناڤبڕ ئێخستە د ناڤبەرا نڤێژا فەرز و سونەتدا.

(٢) پشتی نڤێژا فەرز تمام دبیت ئەگەر جهێ خۆ نەگوهۆری بلا د گەل ئێکی باخڤیت دا ببیتە نیشان ئەو ژ نڤێژا فەرز هاتە دەرڤە.

## الفصل الثاني: التهجد والوتر

## پشکا دووێ: شەڤنڤێژ و ویتر

### ١ ـ باب: فضل الدعاء والصلاة آخر الليل.

### بابەتێ: بهایێ دوعایێ و نڤێژێ ل دویماهییا شەڤێ.

١٣٤٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ). [خ١١٤٥/ م٧٥٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (ڕەزی) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودایێ مە یێ پاك و بلند د هەمی شەڤاندا دهێتە خوارێ عەسمانێ دنیایێ[1]، دەمێ سێکا دویماهییا شەڤێ دمینیت، دبێژیت: کی گازی من دکەت دێ بەرسڤا وی دەم ، کی ژ من دخوازیت بدەمێ دێ دەمێ، کی گونەهژێبرنێ ژ من دخوازیت دێ گونەهێت وی ژێ بەم).**

### ٢ ـ باب: صلاة الليل مثنى مثنى.

### بابەتێ: نڤێژا شەڤێ دو رکعەت دو رکعەتە.

١٣٤٧ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى) . [خ٩٩٠ (٤٧٢)/ م٧٤٩].

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەکی پرسیارا نڤێژا شەڤێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نڤێژا شەڤێ دو رکعەت دو رکعەتە و ئەگەر ئێك ژ هەوە ژ سپێدێ ترسیا بلا رکعەتەکێ بکەت ئەڤە ئەو نڤێژێت کرین دێ بۆ کەتە کەت).**

---

(١) هاتنەخوارەکا بێ چەوایی و لایقی خودایێ پاك و بلند و مەزن.

## ٣ ـ باب: صفة قيام الليل.

## بابەتێ: رەوشا رابوونا شەڤنڤێژان.

١٣٤٨ - (ق) عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عائِشَةَ رضي الله عنها: كَيْفَ صَلاَةُ النَّبِيِّ (ﷺ) بِاللَّيْلِ؟ قَالَتْ: كانَ يَنَامُ أَوَّلَهُ، وَيَقُومُ آخِرَهُ، فَيُصَلِّي ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَذَّنَ المؤذِّنُ وَثَبَ، فإِنْ كَانَ بِهِ حَاجَةٌ اغْتَسَلَ؛ وَإِلاَّ تَوَضَّأَ وَخَرَجَ. [خ١١٤٦/ م٧٣٩].

**ژ ئەسوەدی (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیار ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) کر: پێغەمبەری (ﷺ) چاوا نڤێژ ب شەڤێ دکرن؟ گۆت: دەستپێکا وێ دنڤست و دویماهیيا وێ رادبوو، ڤێجا دا نڤێژا کەت پاشی دا زڤریتە سەر جهێ خۆ یێ نڤستنێ، و ئەگەر بانگ بێژی بانگ دابا ب لەز رادبووڤە، و ئەگەر پێدڤییەك هەبایە خۆ دشویشت، و ئەگەر نە دەستنڤێژ دگرت و دەردکەفت.**

١٣٤٩ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، مِنْهَا الْوِتْرُ وَرَكْعَتَا الْفَجْرِ. [خ١١٤٠/ م٧٣٧]

- وفي رواية لمسلم: يُوتِرُ مِنْ ذَلِكَ بِخَمْسٍ، لاَ يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ فِي آخِرِهَا.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) د شەڤێدا سێزدە رکعەت نڤێژ دکرن و ژ وان ویتر و هەردو رکعەتێت سونەتا سپێدێ ژی د گەل وان بوون.**

- **و د ڤەگێرەکێدا یا موسلمی: ژ وان پێنج رکعەتێت ویترێ دکرن و د چویا ژ واندا نەروینشت رکعەتا دویماهییێ نەبیت[1].**

١٣٥٠ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ لَهُ: (أَحَبُّ الصَّلاَةِ إِلَى اللهِ صَلاَةُ دَاوُدَ عليه السلام ، وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَيَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوْماً) . [خ١١٣١/ م١١٥٩].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمرێ کورێ عاسی (خودێ ژ هەردووان رازی بیت) گۆت:** پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(خۆشڤیترین نڤێژ بۆ خودێ نڤێژا داوودییە و خۆشڤیترین رۆژی بۆ خودێ رۆژیا داوودییە، نیڤەکا شەڤێ دنڤست، و سێکا شەڤێ رادبوو، و شەشێکا وێ دنڤست، و رۆژەك دگرت و ئێك دخوار).**

[1] ئانكو: هەر پێنج رکعەت ب تەحیاتەکێ ب تنێ دکرن ئەو ژی د رکعەتا دویماهییێدا دخواند.

١٣٥١ – (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ لِيُصَلِّيَ، افْتَتَحَ صَلاَتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ. [م٧٦٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب شەڤ رادبوو دا نڤێژێ بكەت نڤێژا خۆ ب دو ركعەتێت سڤك دەست پێ دكر.**

**٤ ـ باب: حثه (ﷺ) على قيام الليل.**

**بابەتێ: هاندانا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر شەڤنڤێژان.**

١٣٥٢ – (ق) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ بِنْتَ النَّبِيِّ عليه السلام لَيْلَةً، فَقَالَ: (**أَلاَ تُصَلِّيَانِ**) ؟ فَقُلْتُ: يَا رَسولَ اللهِ، أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللهِ، فَإِذَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا، فَانْصَرَفَ حِينَ قُلْتُ ذَلِكَ وَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئاً، ثُمَّ سَمِعْتُهُ وَهُوَ مُوَلٍّ، يَضْرِبُ فَخِذَهُ، وَهُوَ يَقُولُ: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا﴾ [الكهف:٥٤] . [خ١١٢٧/ م٧٧٥]

**ژ عەلییێ كوڕێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) گۆت: شەڤەكێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەرگەهێ وی و یێ فاتما كچا پێغەمبەری (ﷺ) قوتا، ئینا گۆت: (ما هوین نڤێژێ ناكەن)؟ من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ جانێ مە یێ د دەستێ خودێدا ئەگەر ڤیا مە هشیار بكەت دێ مە هشیاركەت، ئینا دەمێ من ئەڤە گۆتی ئەو چۆ و بەرسڤا من دا، پاشی من گوه لێ بوو و وی بەرێ خۆ وەرگێرایی دەستێ خۆ ل رانێ خۆ ددا و دگۆت:** ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا﴾[1].

١٣٥٣ – (خ) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهْوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الحَمْدُ للهِ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، أَوْ دَعَا، اسْتُجِيبَ لَهُ، فَإِنْ تَوَضَّأَ وَصَلَّى قُبِلَتْ صَلاَتُهُ**). [خ١١٥٤].

**ژ عوبادەیێ كوڕێ سامتی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ب شەڤ هشیار ببیت بێژیت: (لا إِلَهَ إِلاَّ اللهَ وَحْدَهَ لا شرِيكَ لَهَ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهَوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ**

(١) نانكو: مرۆڤ ژ هەمی تشتان پتر یێ مەدەرك و ڤاویش كێشە.

قَدِيرٌ، الحَمْدُ للهِ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ)[١] **پاشی بێژیت: یا خودێ گونەهێت من ژێ ببە، یان دوعا بکەت بەرسڤا وی هاتە دان، و ئەگەر دەستنڤێژێ بشۆت و نڤێژێ بکەت نڤێژا وی هاتە قەبویلکرن).**

١٣٥٤ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ وَأَبِي هُرَيْرَةَ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنِ اسْتَيْقَظَ مِنَ اللَّيْلِ، وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ، فَصَلَّيَا رَكْعَتَيْنِ جَمِيعاً، كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ)** .[د١٣٠٩، ١٤٥١/ جه١٣٣٥].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری و ئەبی هورەیرە، (خودێ ژ هەردووان رازی بیت)، گۆتن: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەکە زەلامی ژنا خۆ ب شەڤ ژ خەو راکر و هەردووان پێکڤە[٢] دو رکعەت شەڤنڤێژ کرن، ئەو ژ زەلامێت زکرکەر و ژنێت زکرکەر هاتنە نڤیسین).**

١٣٥٥ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَا مِنِ امْرِئٍ تَكُونُ لَهُ صَلاَةٌ بِلَيْلٍ، يَغْلِبُهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ؛ إِلاَّ كُتِبَ لَهُ أَجْرُ صَلاَتِهِ، وَكَانَ نَوْمُهُ عَلَيْهِ صَدَقَةً )**. [د١٣١٤/ ن١٧٨٣ ـ ١٧٨٥].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (خودێ ژێ رازی بیت) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە کەسەکی نڤێژا شەڤێ هەبیت و خەو سەری ژێ بستنیت و بشێتێ[٣] ئەگەر خودێ خێرا نڤێژا وی بۆ نەنڤیسیت و نڤستنا وی ل سەر وی دێ بیتە سەدەقە)[٤].**

---

(١) رامان: ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت و یێ بێ شریك و بێ هەڤاله و هەمی مولك و سەرومری و پەسن و حەمد بۆ وینە و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە، هەمی سوپاسی بۆ خودێ و پاکی و پاقژی بۆ خودێ بیت و چو خودێ و پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت و خودێ یێ مەزنە، و چو بزاڤ و شیان و چو هێز نینن ب خودێ نەبن.

(٢) و د ڤەگێرەکێدا: یان هەر ئێکی دو رکعەت کرن.

(٣) ڤی کاری دو رەنگ یێت هەین: ئێك: ئنیەت ئینابیت ب شەڤ راببیت و هشیار نەبیت، دو: هشیار ببیت بەلێ خەوا وی د گەل بهێت و نەشێتە خۆ و بێژیت ئەز دێ پیچەکێ نڤم و پاشی رابمەڤە بەلێ بنڤیت و هشیار نەبیت.

(٤) خلاتێ وی نەڤەیە خەو ل سەر نەهێتە پرسین و بۆ وی خێرا نڤێژکەران بهێتە نڤیسین.

## ٥ ـ باب: ما يقول إذا قام للتهجد.

## بابەتێ: کا دێ چ بێژیت ئەگەر رابوو شەڤنڤێژان.

١٣٥٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا تَهَجَّدَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: (**اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ، أَنْتَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ. أَنْتَ الحَقُّ، وَوَعْدُكَ الحَقُّ، وَقَوْلُكَ الحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ الحَقُّ، وَالجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ. اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلهِي، لاَ إِلهَ إِلا أَنْتَ**). [خ٧٤٩٩ (١١٢٠)/ م٧٦٩].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ ب شەڤ شەڤنڤێژ دکر، دگۆت: **(یا خودێ هەمی حەمدو پەسن بۆ تە بن، تو عەرد و عەسمانان ڕۆن دکەی، تویی راگر و ڕێبەرێ کاروبارێت عەرد و عەسمانان، و هەمی حەمد و پەسن بۆ تە بن، تو خودانێ عەرد و عەسمانان و تشتێ تێدایی، تو یێ حەقی و گۆتنا تە یا بێ شك و ڕاستە، و ژڤانا تە یا بێ شك و ڕاستە، و ڕاوەستیانا بەردەستێ تە یا بێ شك و ڕاستە، و بەحەشت یا بێ شك و ڕاستە، و جەهنەم یا بێ شك و ڕاستە، و پێغەمبەر هەمێ د بێ شك و ڕاستن و ڕۆژا قیامەتێ یا بێ شك و ڕاستە، یا خودێ من خۆ سپارتە تە[1] و باوەری ب دورستی ب تە ئینا، و من پشتا خۆ ب تە گەرم کر، و ئەز ب گوهداری و پەرستنێ زڤڕیمە تە، و ب تە هەڤڕکییا نەیار و نەحەزێت دینی دکەم، و ئەز دویڤ شەریعەت و ڕێکا تە فەرمانێ و حوکمی دکەم، ڤێجا بۆ من بغەفرینە و ژێ ببە یا من ل پێشییا خۆ کری، و یا من ب پاش خۆڤە هێلایی، و یا من ب بەرزەییڤە کری و یا من ب ئاشکەرایی کری، تو خودایێ منی چو خودایێت راست و دورست نینن تو نەبی)**.

---

(١) ئانکو: من خۆ رادەستی تە کر فەرمان فەرمانا تەیە و ئەز ژێ نادەرکەڤم و من خۆ ئێخستە بن فەرمانێت تە و فەرمانا کەسێ ـ ڤێجا ئەو کی بیت ـ ب سەر فەرمانا تە نائێخم.

## ٦ - باب: ما يكره من التشدد في العبادة.

## بابەتێ: ئەوا نەباش ژ توندڕەوییێ د پەرستنێدا.

١٣٥٧ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَإِذَا حَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: (**مَا هذَا الْحَبْلُ**)؟ قَالُوا: هَذَا حَبْلٌ لِزَيْنَبَ، فَإِذَا فَتَرَتْ تَعَلَّقَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ، حُلُّوهُ، لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ**) . [خ١١٥٠/ م٧٨٤].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه)، گۆت، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە د مزگەفتێڤە، و وەریسەك د ناڤبەرا دو دنگانڤە یێ گرێدای بوو گۆت: (ئەڤە چ وەریسە)؟ گۆتن: ئەڤە وەریسێ زەینەبێیە، ئەگەر وەستیا خۆ پێڤە دگریت، پێغەمبەری ﷺ گۆت: (ڤەكەن، بلا ئێك ژ هەوە هند نڤێژێ بكەت هندی ئەو ل سەر چالاكی و هێزا خۆ، هەكە وەستیا بلا روینیت).**

١٣٥٨ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ، قَالَ: (**مَنْ هَذِهِ**) ؟ قَالَتْ: فُلاَنَةُ، تَذْكُرُ مِنْ صَلاَتِهَا، قَالَ: (**مَهْ! عَلَيْكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ، فَوَاللهِ لاَ يَمَلُّ اللهُ حَتَّى تَمَلُّوا**) . وَكَانَ أَحَبُّ الدِّينِ إِلَيْهِ مَا دَاوَمَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ. [خ٤٣/ م٧٨٥]

**ژ عائیشایێ، (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەڤ و ژنەك ل دەڤ بوو، گۆت: (ئەڤە كییە)؟ من گۆت: ئەڤە بێڤانە، بەحسێ نڤێژا خۆ دكەت، گۆت: (نە، هندێ بكەن هوین بشێن، ئەز ب خودێ كەمە خودێ بێزار نابیت هەتا هوین بێزار نەبن[1] و خۆشڤیترین كارێ دینی بۆ وی ئەو بوو یێ خودانێ وی ل سەر بەردەوام).**

## ٧ - باب: اجتهاده ((ﷺ)) في العبادة.

## بابەتێ: وەستیانا پێغەمبەری (ﷺ) د پەرستنێدا.

١٣٥٩ - (ق) عَنِ الْمُغِيْرَةِ رضي الله عنه قَالَ: إِنْ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) لَيَقُومُ . أَوْ لَيُصَلِّي . حَتَّى تَرِمَ قَدَمَاهُ . أَوْ سَاقَاهُ . فَيُقَالُ لَهُ، فَيَقُولُ: (**أَفَلاَ أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً**) . [خ١١٣٠/ م٢٨١٩].

---

(١) ئانكو: خەلاتێ كاری ژ هەوە نابڕیت هەتا هوین بێزار نەبن.

**ژ موغیرەی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هند ژ شەڤێ رادبوو یان هند نڤێژ دکرن هەتا پێت وی یان باقێ پێت وی وەرمتین، ئەڤ چەندە دگۆتنێ[1] گۆت: (ڤێجا ما ئەز بەندەیەکێ شوکردار نەبم).**

١٣٦٠ - (ق) عَنْ عَائشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يُصَلِّي إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، كَانَتْ تِلْكَ صَلاَتَهُ ـ تَعْنِي: بِاللَّيْلِ ـ فَيَسْجُدُ السَّجْدَةَ مِنْ ذَلِكَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً، قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ، حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِّنُ لِلصَّلاَةِ.

[خ٩٩٤ (٦٢٦)/ م٧٣٦].

**ژ عائیشایێ (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یازدە رکعەت دکرن (ئانکو: د شەڤێدا) و سوجدە دبر، درێژییا وێ ئێك ژ هەوە پێنجی ئایەتان بخوینیت بەری سەرێ خۆ بلندکەت، و دو رکعەت بەری نڤێژا سپێدێ دکرن، و پاشی ل سەر تەنشتا راستێ خۆ درێژ دکر هەتا گازیکەر بۆ نڤێژا سپێدێ دهاتە دەڤ.**

١٣٦١ - (م) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَافْتَتَحَ الْبَقَرَةَ، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ عِنْدَ الْمِائَةِ. ثُمَّ مَضَى، فَقُلْتُ: يُصَلِّي بِهَا فِي رَكْعَةٍ. فَمَضَى، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ بِهَا. ثُمَّ افْتَتَحَ النِّسَاءَ فَقَرَأَهَا. ثُمَّ افْتَتَحَ آلَ عِمْرَانَ فَقَرَأَهَا، يَقْرَأُ مُتَرَسِّلاً، إِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا تَسْبِيحٌ سَبَّحَ، وَإِذَا مَرَّ بِسُؤَالٍ سَأَلَ، وَإِذَا مَرَّ بِتَعَوُّذٍ تَعَوَّذَ. ثُمَّ رَكَعَ، فَجَعَلَ يَقُولُ: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ**) ، فَكَانَ رُكُوعُهُ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِ. ثُمَّ قَالَ: (**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ**) ثُمَّ قَامَ طَوِيلاً، قَرِيباً مِمَّا رَكَعَ. ثُمَّ سَجَدَ فَقَالَ: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى**) ، فَكَانَ سُجُودُهُ قَرِيباً مِنْ قِيَامِهِ. [م٧٧٢].

**ژ حوزەیفەی (ﷺ)، گۆت: من شەڤەکێ نڤێژ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) کر، دەست ب سۆرەتا بەقەرە کر، من گۆت: ل ئایەتا سەدێ دێ چیتە رکوعێ، پاشی بەردەوام بوو، من گۆت: دێ رکعەتەکێ نڤێژێ پێ کەت، هەر بەردەوام بوو، من گۆت: دێ ب دویماهی ئینیت و چیتە رکوعێ، پاشی دەست هاڤێتە سۆرەتا نیساء خواند، پاشی دەست هاڤێتە سۆرەتا ئالیعومران خواند، و ب دلێ خۆ دخواند، و هەکە ل سەر ئایەتەکا پاك و پاقژکرنا خودێرا بۆریبا، تەسبیحا وی دکر و ژ کێماسییان پاك و پاقژ دکر، و هەکە ل سەر ئایەتەکا دوعاکرنێرا بۆریبا دوعا دکر، و هەکە ل سەر ئایەتەکا خۆپاراستنێرا**

---

(١) تو بۆ ڤێ دکەی یا پێغەمبەرێ خودێ و بێ گۆمان گونەهێت تە یێت پێش و پاش یێت هاتینە ژێبرن؟

بۆریبا، داخوازا خۆپاراستنێ ژ خودێ دکر، پاشی چۆ رکوعێ و دگۆت: **(پاکی و پاقژی بۆ خودایێ من یێ مەزن بن)**، و رکوعا وی هندی رابوونا وی بوو، پاشی گۆت: **(خودێ بەرسڤا وی دا یێ شوکرا وی کر)**، خودایێ مە شوکر هەمی بۆ تەیە، پاشی رابوو رابوونەکا درێژ نێزیکی یا رکوعێ، پاشی چۆ سوجدێ، و گۆت: **(پاکی و پاقژی بۆ خودایێ من یێ بلندتر بن)**، و سوجدا وی نێزیکی رابوونا وی بوو.

## ٨ ـ باب: من نام الليل حتى أصبح.

**بابەتێ: یێ ب شەڤ بنڤیت هەتا سپێدە دبیت.**

١٣٦٢ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ رضي الله عنه قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) رَجُلٌ، فَقِيلَ: مَا زَالَ نَائِماً حَتَّى أَصْبَحَ، مَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ، فَقَالَ: **(بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنِهِ)** . [خ١١٤٤/ م٧٧٤].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه)، گۆت: ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) بەحسێ زەلامەکی هاتە کرن ب شەڤ ما نڤستی هەتا لێ بوویە سپێدە و نەرابوو نڤێژێ ئینا گۆت: (شەیتانی یا میزتییە د گوهێ ویدا).**

١٣٦٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلاَثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ: عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَأَصْبَحَ نَشِيطاً طَيِّبَ النَّفْسِ؛ وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلاَنَ)**.

[خ١١٤٢/ م٧٧٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر ئێکێ ژ هەوە دەمێ دنڤیت شەیتان سێ گرێکان ل پشتا پاتکا وی ددەت (ئانکو خەوێ ل بەر گران دکەت) ل سەر هەرگرێکەکێ دبێژیت: بنڤە شەڤەکا درێژ یا ب بەر تەڤە، هەکە هشیار بوو و زکرێ خودێ کر گرێیەک ڤەبوو، و هەکە دەستنڤێژا خۆ شویشت گرێیەک ڤەبوو، و هەکە نڤێژ کر هەمی گرێ ڤەبوون و دێ سپێدە لێ بیت یێ زیرەک و لەش سڤک، و هەکە نە دێ سپێدە لێ بیت یێ لەشگران و بێخێرەت).**

## ٩ ـ باب: الوتر.

## بابەتێ: ویترێ.

١٣٦٤ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُلَّ اللَّيْلِ أَوْتَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ. [خ٩٩٦/ م٧٤٥].

- وَفِي رواية لمسلم: قَالَتْ: مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ وَأَوْسَطِهِ وَآخِرِهِ، فَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: د هەمی دەمێت شەڤێدا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ویتر یا کری، و ویترا وی یا گەهشتییە سپێدێ.**

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا گۆت: د هەمی دەمێت شەڤێدا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ویتر یا کری، ژ سەرێ شەڤێ و ژ نیڤا وێ و ژ دویماهییا وێ، و ویترا وی یا گەهشتییە سپێدێ.**

١٣٦٥ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (اجْعَلُوا آخِرَ صَلاَتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْراً). [خ٩٩٨/ م٧٥١].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دویماهییا نڤێژا خۆ ب شەڤ بکەنە ویتر).**

١٣٦٦ – (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ خَافَ أَنْ لاَ يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ، وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ؛ فَإِنَّ صَلاَةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ، وَذَلِكَ أَفْضَلُ)**. [م٧٥٥].

**ژ جابری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ بترسیت دویماهییا شەڤێ نەرابیت، بلا سەرێ وێ ویترێ بکەت، و یێ ب ئومێد بیت دویماهییا وێ هشیار بیت، بلا دویماهییا شەڤێ ویترێ بکەت، ب راستی نڤێژا دویماهییا شەڤێ یا ب شاهدە (ژ لایێ ملیاکەتانڤە) و ئەو چێترە).**

١٣٦٧ – عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: الْوِتْرُ لَيْسَ بِحَتْمٍ كَهَيْئَةِ الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ، وَلَكِنْ سُنَّةٌ سَنَّهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [ت٤٥٣/ ن١٦٧٥/ جه١١٦٩/ مي١٦٢٠].

* صحيح.

**ژ عەلی (ﷺ)، گۆت: سونەتا ویترێ نەفەرزە وەكی نڤێژا فەرز بەلێ سونەتەكە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یا كرییە سونەت.**

١٣٦٨ - عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الْوِتْرُ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِخَمْسٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِثَلَاثٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِوَاحِدَةٍ فَلْيَفْعَلْ**) . [د١٤٢٢/ ن١٧٠٩/ جه١١٩٠/ مي١٦٢٣]

* صحيح.

**ژ ئەبی ئەیوبێ ئەنساری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ویتر ل سەر هەر موسلمانەكی یا بنەجهە[1] هەر كەسێ بڤێت ب پێنج ركعەتان ویترێ بكەت بلا بكەت، و هەر كەسێ ڤیا ب سێیان ویترێ بكەت بلا بكەت، و هەر كەسێ ڤیا ب ئێكێ ویترێ بكەت بلا بكەت).**

## ١٠ . باب: القنوت.

## بابەتێ: قنوتێ.

١٣٦٩ - (ق) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَأُقَرِّبَنَّ صَلَاةَ النَّبِيِّ (ﷺ). فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه يَقْنُتُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُخْرَى مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ، وَصَلَاةِ الْعِشَاءِ، وَصَلَاةِ الصُّبْحِ، بَعْدَمَا يَقُولُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَيَدْعُو لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَلْعَنُ الْكُفَّارَ. [خ٧٩٧/ م٦٧٦]

**ژ ئەبی سەلەمە و ژ ئەبی هورەیرە (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ب سویند ئەز دێ نڤێژا پێغەمبەری (ﷺ) بۆ هەوە نێزیك كەم، ڤێجا ئەبو هورەیرە (ﷺ) د ركعەتا دویماهییێدا ژ نڤێژا نیڤرۆ و نڤێژا عەیشا و نڤێژا سپێدێ پشتی دگۆت: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) دوعا بۆ باوەرداران دكر و نەفرەت ل گاوران دكر[2].**

١٣٧٠ - عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي: يَا أَبَتِ، إِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتَ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ، وَعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ هَاهُنَا بِالْكُوفَةِ نَحْواً مِنْ خَمْسِ سِنِينَ، أَكَانُوا يَقْنُتُونَ؟ قَالَ: أَيْ بُنَيَّ، مُحْدَثٌ. [ت٤٠٢/ ن١٠٧٩/ جه١٢٤١]

---

(١) ئانكو: مەبەست پێ سونەتەكا بنەجهە و رامان ئەو نینە ئەركە یان واجبە، هەرچەندە ل دەڤ ئەبی حەنیفەی (ﷺ) ئەركە.

(٢) ئانكو: پشتی ژ ركوعا د ركعەتا دویماهییێدا رادبوو و پشتی دگۆت (سمع الله لمن حمده) قنوت دخواند رامانا ڤێ ئەڤەیە جهێ قنوتێ پشتی ركوعا دویماهییێیە.

نْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي: يَا أَبَتِ، إِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتَ خَلْفَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَأَبِي كْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ، وَعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ هَاهُنَا بِالْكُوفَةِ نَحْواً مِنْ خَمْسِ سِنِينَ، أَكَانُوا يَقْنُتُونَ؟ قَالَ: أَيْ نَيَّ. مُحْدَثٌ.

**ژ ئەبی مالکێ ئەشجەعی (رحمه الله) گۆت: من گۆتە بابێ خۆ، باب، ب راستی تە نڤێژ ل پشت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبوبەکری و عومەری و عوسمانی، و عەلییێ کوڕێ ئەبی تالبی ئها ل ڤێرێ ل کوفە نێزیکی پێنج سالان پێت کرین، ئەرێ وان قنوت دخواند؟ گۆت: کوڕێ من، یا نوییە.**

١٣٧١ - عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ لا يَقْنُتُ، إِلاَّ إِذا دَعَا لِقَوْمٍ أَوْ دَعَا عَلى قَوْمٍ.[مه١٢٠].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) قنوت نەدخواند ژ بلی ئەگەر دوعا بۆ هندەکان کربا یان نفرین ل هندەکان کربا.**

## ١١ . باب: القنوت في رمضان.

## بابەتێ: خواندنا قنوتێ د رەمەزانێدا.

١٣٧٢ - عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِهِ: أَنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَمَّهُمْ - يَعْنِي: فِي رَمَضَانَ - وَكَانَ يَقْنُتُ فِي النِّصْفِ الْآخِرِ مِنْ رَمَضَانَ. [د١٤٢٨].

* ضعيف. وقال شعيب: صحيح بشواهده.

**ژ موحەممەدێ کوڕێ سیرینی (رحمه الله) ژ هندەکان ژ هەڤالێت خۆ گۆتن: ئوبەیێ کوڕێ کەعبی ئیمامەتی بەری وان کر، ئانکو: د رەمەزانێدا و د نیڤا دووێ د رەمەزانێدا قنوت دخواند.**

## ١٢ . باب: دعاء القنوت في الوتر.

## بابەتێ: دوعا قنوتێ د ویترێدا.

١٣٧٣ - عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ رضي الله عنهما قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ فِي الْقُنُوتِ: **(اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ).** [د١٤٢٥/ ت٤٦٤/ ن١٧٤٤/ جه١١٧٨/ مي١٦٣٢].

* صحيح.

ژ حەسەنێ كورێ عەلی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هندە پەیڤ نیشا من دان وان د ویترێدا د قنوتێدا بێژم: **(یا خودێ من راستەرێ بكە د گەل وان یێت تە راستەرێ كرین، و من سلامەت بكە د گەل وان یێت تە سلامەت كرین، و من بپارێزە د گەل وان یێت تە پاراستین، و بەرەكەتێ بۆ من بێخە وێ یا تو ددەی، و من ژ خرابیا وێ قەدەرا تو دكەی بپارێزە، ب راستی قەدەر و حوكمێ تە دڤێت تو دكەی، و كەس حوكمی ل تە ناكەت و حوكمێ تە كەس ناراوەستینیت، ب راستی ئەو ناشكێت یێ تە پشتەڤانییا وی كر، و ئەو عەزیز و ب هێز ناكەڤیت یێ تە شكاند، یا خودێ بەرەكەت و خێرێت تە زێدە بین و مەزنییا تە بلند بوو، و ل سەر هەمی تشتان ئاشكرا بوو).**

١٣٧٤ - عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ فِي آخِرِ وِتْرِهِ: **(اللَّهُمَّ! إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سُخْطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ)** . [د١٤٢٧/ ت٣٥٦٦/ ن١٧٤٦/ جه١١٧٩].

* صحيح.

ژ عەلییێ كورێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د دویماهییا ویترا خۆدا دگۆت: **(یا خودێ ئەز خۆ ب رازیبوونا تە ژ كەربا تە دپارێزم، و ئەز خۆ ب لێبۆرینا تە ژ ئیزایا تە دپارێزم، و ب تە ژ ئیزایا تە، ئەز نەشێم وەكی تو هەژی پەسنا تە بكەم، ب راستی تو یێ وەسایی وەكی تە خۆ دایە نیاسین و پەسنا خۆ كری).**

١٣ ـ باب: قضاء الوتر.

**بابەتێ: قەزاكرنا ویترێ.**

١٣٧٥ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ نَامَ عَنْ وِتْرِهِ، أَوْ نَسِيَهُ؛ فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهُ)** .

- زاد الترمذي: **(وَإِذَا اسْتَيْقَظَ)** . [د١٤٣١/ ت٤٦٥/ جه١١٨٨]

* صحيح.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ ژ ویترا خۆ بنڤیت یان ژ بیرێ چۆ بلا دەمێ بیرا وی لێ دهێت بكەت).**

- و ترمزی زێدەكرییە: **(و ئەگەر هشیار بوو).**

## ١٤ . باب: قيام الليل بآية يرددها.

## بابەتێ: شەڤنڤێژی ب ئایەتەکێ دوبارە بکەت.

١٣٧٦ - عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِآيَةٍ حَتَّى أَصْبَحَ يُرَدِّدُهَا، وَالْآيَةُ: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ [المائدة] . [ن١٠٠٩/ جه١٣٥٠]

* حسن.

**ژ ئەبی زەرِ (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ب ئایەتەکێ شەڤنڤێژ کر و هەتا سپێدە لێ بووی دوبارە دکر** ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾[1].

١٣٧٧ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِآيَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ لَيْلَةً. [ت٤٤٨].

* صحيح الإسناد.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل شەڤەکێ ب ئایەتەکا قورئانێ ب تنێ شەڤنڤێژ کر.**

## ١٥ . باب: القراءة في الوتر.

## بابەتێ: خواندن د ویترێدا.

١٣٧٨ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بِـ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾، وَ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، وَ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ فِي رَكْعَةٍ رَكْعَةٍ.

[ت٤٦٢/ ن١٧٠١/ جه١١٧٢/ مي١٦٢٧].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) د ویترێدا** ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾**، و** ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾**، و** ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ **د رکعەت رکعەتدا دخواند.**

---

(١) رامان: ئەگەر تو وان ئیزا بدەی ئەو بەندەیێت تەنە، و ئەگەر تو ل وان ئەگری ب ڕاستی تو یێ دەستهەلاتدار و کاربنەجهی.

١٣٧٩ – عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يُوتِرُ بِـ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾، وَ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، وَ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، وَكَانَ يَقُولُ إِذَا سَلَّمَ: (**سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ**) ثَلاَثاً، وَيَرْفَعُ صَوْتَهُ بِالثَّالِثَةِ. [ن١٧٣٠].

* صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ کورێ ئەبزى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ویتر ب ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾، و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ دکر و دەمێ سلاڤ ڤەددا سێ جاران دگۆت: (پاکی و پاقژی بۆ خودانێ هەمی تشتان و ژ هەمی کێماسییان پاقژ) و د یا سێییێدا دەنگێ خۆ پێ بلند دکر.**

**١٦ . باب: الوقوف عند آيات الرحمة وغيرها.**

**بابەتێ: راوەستان ل سەر ئایەتێت دلۆڤانییێ و یێت دیتر.**

١٣٨٠ – عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قُمْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَبَدَأَ فَاسْتَاكَ وَتَوَضَّأَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، فَبَدَأَ فَاسْتَفْتَحَ مِنَ الْبَقَرَةِ، لاَ يَمُرُّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلاَّ وَقَفَ وَسَأَلَ، وَلاَ يَمُرُّ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلاَّ وَقَفَ يَتَعَوَّذُ، ثُمَّ رَكَعَ، فَمَكَثَ رَاكِعاً بِقَدْرِ قِيَامِهِ، يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: (**سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ**) ، ثُمَّ سَجَدَ بِقَدْرِ رُكُوعِهِ، يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: (**سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ**) ، ثُمَّ قَرَأَ آلَ عِمْرَانَ، ثُمَّ سُورَةً، ثُمَّ سُورَةً فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ. [د٨٧٣/ ن١٠٤٨].

* صحيح.

**ژ عەوفێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز د گەل پێغەمبەرى (ﷺ) رابوومە شەڤنڤێژێ دست پێ کر سیواك ب کار ئینا، و دەستنڤێژ گرت، پاشی رابوو نڤێژ کر و ژ بەقەرێ دەست پێ کر و ل سەر هەر ئایەتەکا دلۆڤانییێرا بۆریبا رادوەستا و داخواز دکر و ل سەر هەر ئایەتەکا ئیزاییێرا بۆریبا رادوەستا دوعا خۆپاراستنێ دکر، پاشی رکوع بر و تەمەت راوەستانا خۆ ما و د رکوعا خۆدا دگۆت: (پاکی و پاقژی ژ هەمی کێماسییان بۆ خودانێ زالگەهی و سەردەستییێ و شاهی و سەروەرییێ، و مەزناتییێ د زاتێ خۆدا و مەزناتییێ د سیفات و سالۆخەتێت خۆدا)، پاشی سوجدە بر و تەمەت رکوعا خۆ ما و د سوجدەیا خۆدا دگۆت: (پاکی و پاقژی ژ هەمی کێماسییان بۆ خودانێ زالگەهی و سەردەستییێ و شاهی و سەروەرییێ، و مەزناتییێ د زاتێ خۆدا و مەزناتییێ د سیفات و سالۆخەتێت**

**خۆدا)**، پاشی ئالیعومران خواند، پاشی سۆرەتەکا دی پاشی سۆرەتەکا دی، و هەروەسا دکر[1].

١٣٨١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِي (ﷺ) كَانَ إِذا قَرَأَ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ قَالَ: (**سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى**) . [هق٢/٣١٠][وانظر: ١٣٦١].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ خواندبا دگۆت: (پاکی و پاقژی بۆ خودایێ من یێ بلندترین).**



(١) ئانکو: ل سەر ئایەتێت دلۆڤانییێ رادوەستا و داخوازا وێ دکر و ل سەر ئایەتێت ئیزایێ رادوەستا و داخوازا خۆپاراستنێ ژێ دکر.

## الفصل الأول: الإمامة

## پشكا ئێكێ: پێشنڤێژی

### ١ ـ باب: الأَحق بالإمامة.

### بابەتێ: كی ب ئیمامەتییێ هەژیترە.

١٣٨٢ - (ق) عَنْ مالِكِ بْنِ الحُوَيْرِثِ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِي، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ رَحِيماً رَفِيقاً، فَلَمَّا رَأَى شَوْقَنَا إِلَى أَهَالِينَا، قَالَ: (**ارْجِعُوا فَكُونُوا فِيهِمْ، وَعَلِّمُوهُمْ، وَصَلُّوا، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ؛ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ**) . [خ٦٢٨/ م٦٧٤].

**ژ مالكێ كوڕێ حووەیریسی (ﷺ) ئەز د گەل هندەك كەسان ژ مرۆڤێت خۆ هاتینە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەم بیست شەڤان ماینە ل دەڤ، و ئەو یێ دلۆڤان و نەرم و حەلیم بوو، ڤێجا دەمێ دیتی ئەم ژ مالێت خۆ یێت خەریب بووین، گۆت: (بزڤرن و د ناڤ مرۆڤێت خۆدا بمینن و وان فێركەن و نڤێژێ بكەن، و هەكە وەختێ نڤێژێ هات ئێك ژ هەوە بلا بانگی بدەت و بلا یێ مەزنتر ژ هەوە نڤێژێ ل بەری هەوە بكەت).**

١٣٨٣ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ المهَاجِرُونَ الأَوَّلُونَ الْعُصْبَةَ . مَوْضِعٌ بِقُبَاءَ . قَبْلَ مَقْدَمِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، كَانَ يَؤُمُّهُمْ سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَكَانَ أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً. [خ٦٩٢].

**ژ ئیبن عومەری (ﷺ) دەمێ مشەختێت ئێكێ هاتینە عوسبەیێ (جهەكە ل قوبایێ) بەری پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بهێت سالمی ئازاكرییێ حوزەیفەی پێشنڤێژیا وان دكر و وی ژ وان پتر قورئان ژبەر بوو.**

١٣٨٤ - (م) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِلْماً، وَلاَ يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي سُلْطَانِهِ، وَلاَ يَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ**) . [م٦٧٣].

**ژ ئەبی مەسعودێ ئەنساری (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بلا یێ پتر قورئان ژبەر (یان یێ د قورئانێدا شارەزاتر یان خواندن باشتر) د ناڤ خەلكیدا ببیتە**

**ئیمام (پێشنڤێژ) و هەکە هەمی د قورئانێدا وەکی ئێك بن، بلا یێ د حەدیسێدا شارەزاتر، و هەکە د حەدیسێدا وەکی ئێك بن، بلا یێ هجرەت و مشەختبوون پێشتر، و هەکە د مشەختاتییێدا وەکی ئێك بن، بلا یێ ژی درێژتر، نابیت پێشنڤێژییا مرۆڤی د دەسهەلاتییا ویدا بێتە کرن، و نابیت د مالا ویدا ل سەر جهێ وی یێ تایبەت روینیتە خوارێ ب دەستویرییا وی نەبیت).**

٢ ـ باب: الإمام يخفف الصلاة ويتمها.

**بابەتێ: پێشنڤێژ دێ نڤێژێ سڤك و تمام کەت.**

١٣٨٥ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: مَا صَلَّيْتُ وَرَاءَ إِمَامٍ قَطُّ أَخَفَّ صَلاَةً وَلاَ أَتَمَّ مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ)، وإِنْ كَانَ لَيَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَيُخَفِّفُ، مَخَافَةَ أَنْ تُفْتَنَ أُمُّهُ. [خ٧٠٨/ م٤٦٩، ٤٧٠].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: من نڤێژ پشت چو ئیمامان نەکرییە نڤێژا وی سڤکتر و تمامتر بیت ژ یا پێغەمبەری (ﷺ) و وی گوه ل دەنگێ گریا بچویکی دبوو ژ بەر هندێ نڤێژ کورت دکر ترسا هندێ دایکا وی ژ نڤێژا خۆ بێئاگەه بیت.**

١٣٨٦ - (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسولَ اللهِ، إِنِّي وَاللهِ لأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلاَةِ الغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلاَنٍ، مِمَّا يُطِيلُ بِنَا فِيهَا، قَالَ: فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) قَطُّ أَشَدَّ غَضَباً فِي مَوْعِظَةٍ مِنْهُ يَوْمَئِذٍ، ثُمَّ قَالَ: (يا **أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى** بِالنَّاسِ فَلْيُوجِزْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الْحَاجَةِ) . [خ٧١٥٩ (٩٠)/ م٤٦٦].

**ژ ئەبی مەسعودێ ئەنساری (رضي الله عنه)، گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ب راستی ئەز نڤێژا سپێدێ گیرۆ دبم ژ بەر بێڤانی هندی نڤێژێ ب مە درێژ دکەت، من چو جار پێغەمبەر (ﷺ) نەدیت بوو د شیرەتەکێدا زێدە تۆڕە بووی وەکی وێ رۆژێ تۆڕە بووی و گۆت: (گەلی خەلکێ ب راستی مرۆڤ رەڤینك ژ هەوە پێت هەین، هەر کەسێ ژ هەوە پێشنڤێژی ل بەری خەلکی کر بلا کورت کەت، ب راستی پیر و بچویك و خودان هەوجەیی پێت پشت وی).**

١٣٨٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ مِنْهُمُ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَالكَبِيرَ، وَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ)** . [خ٧٠٣/ م٤٦٧]. [نظر: ١٠٢٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەکە ئێکی ژ هەوە نڤێژ ب خەلکی کر بلا سڤك بکەت، ب راستی پێت لاواز و نەساخ و مەزن پێت د ناڤدا، و هەکە ئێکی ژ هەوە بۆ خۆ نڤێژ کر چەند ڤیا بلا درێژ کەت).**

## ٣ . باب: إنما جعل الإمام ليؤتم به.

## بابەتێ: ئیمام پێ هاتییە دانان دا چاڤ لێ بهێتە کرن و ل دویڤ وی بچن.

١٣٨٨ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي بَيْتِهِ وَهُوَ شَاكٍ، فَصَلَّى جَالِساً، وَصَلَّى وَرَاءَهُ قَوْمٌ قِيَاماً، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ: **(أَنِ اجْلِسُوا)** . فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: **(إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا صَلَّى جَالِساً فَصَلُّوا جُلُوساً)** .[خ٦٨٨/ م٤١٢].

**ژ عائیشایێ دایکا موسلمانان (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مالا خۆ و ئەو یێ نەساخ بوو روینشتی نڤێژ کر و هندەك كەسان ل پشت وی ژ پیاڤە نڤێژ د گەل کر، ئینا نیشان کرە وان (روینە خوار) ڤێجا دەمێ سلاڤا ملان ڤەدایی گۆت: ( ئیمام پێ هاتییە دانان دا چاڤ ل وی بکەن و ل دویڤ وی بچن، ڤێجا ئەگەر رکوع بر رکوعێ ببەن، و ئەگەر رابوو رابن، و ئەگەر روینشتی نڤێژ کر، روینشتی نڤێژێ بکەن)[1].**

١٣٨٩ - (ق) عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا قَالَ: **(سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)** ، لَمْ يَحْنِ أَحَدٌ مِنَّا ظَهْرَهُ، حَتَّى يَقَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) سَاجِداً، ثُمَّ نَقَعُ سُجُوداً بَعْدَهُ. [خ٦٩٠/ م٤٧٤].

**ژ بەرائی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر گۆتبا (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)[2] کەسێ ژ مە پشتا خۆ خوار نەدکر هەتا پێغەمبەر (ﷺ) داکەتبا سوجدەیێ پاشی ئەم پشتی وی دادکەڤتینە سوجدەیێ.**

---

(١) د سەحیحا بوخاریدا هاتییە: ئەبو عەبدوللایێ حومەیدی گۆت: ئەڤ فەرمودە یا نەسخکرییە، چونکی دویماهی نڤێژ پێغەمبەری (ﷺ) کری روینشتی کر و خەلك ل پشت وی ژ پیاڤە بوون. [خ ٥٦٥٨].

(٢) رامان: خودێ بەرسڤا وی دا، یێ شوکرا وی کر.

١٣٩٠ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُعَلِّمُنَا، يَقُولُ: **(لاَ تُبَادِرُوا الإِمَامَ، إِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: وَلاَ الضَّالِّيْنَ، فَقُولُوا: آمِينَ، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ)**. [م٤١٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نیشا مە ددا و د گۆت: (د بەری ئیمامیڕا نەكەن، ئەگەر تەكبیر كر، تەكبیرێ بكەن، و ئەگەر گۆت: (وَلاَ الضَّالِّيْنَ) هوین بێژن ئامین، و ئەگەر چۆ ركوعێ، هەرنە ركوعێ، و ئەگەر گۆت (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) هوین بێژن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ)).**

## ٤ ـ باب: النهي عن سبق الإمام.

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا د بەری ئیمامیڕا بكەن.

١٣٩١ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(أَما يَخْشَى أَحَدُكُمْ ـ أَوْ: لاَ يَخْشَى أَحَدُكُمْ ـ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ، أَنْ يَجْعَلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ، أَوْ يَجْعَلَ اللهُ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ)** . [خ٦٩١/ م٤٢٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ما هوین ناترسن، یان ما كەس ژ هەوە ناترسیت ئەگەر ئەو بەری ئیمامی سەرێ خۆ راكەت، خودێ سەرێ وی بكوهۆریت بكەتە سەرێ كەری، یان خودێ وێنەیێ وی بكوهۆریت بكەتە وێنەیێ كەری).**

١٣٩٢ – (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: **(أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي إِمَامُكُمْ فَلاَ تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَلاَ بِالسُّجُودِ، وَلاَ بِالْقِيَامِ وَلاَ بِالاِنْصِرَافِ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ أَمَامِي وَمِنْ خَلْفِي)** . ثُمَّ قَالَ: **(وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ رَأَيْتُمْ مَا رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً)** ، قَالُوا: وَمَا رَأَيْتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(رَأَيْتُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ)** . [م٤٢٦].

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: رۆژەكێ پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژ ل بەری مە كر، ڤێجا دەمێ نڤێژ ب دویماهی هاتی، بەرێ خۆ دا مە و گۆت: **(گەلی خەلكی ئەز ئیمامێ هەوەمە، نە د ركوعێدا و نە د سوجدێدا و نە د رابوونا ژ پێڤەدا و نە د سلاڤڤەدانێدا پێش من نەكەڤن و د بەری منڕا نەكەن، ب راستی ئەز ژ سینگیڤە و ل پشت خۆ ژی**

**هەوە دبینم)**[1]. پاشی گۆت : **(ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستیدا هەکە هوین وێ ببینن یا من دیتی، دا کێم کەنە کەنی و گەلەك کەنە گری)** گۆتن: **ما تە چ دیت ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟** گۆت: **(من بەحەشت و جەهنەم دیتن).**

## ٥ . باب: إذا تأخر الإمام.

## بابەتێ: ئەگەر ئیمام گیرۆ بوو.

١٣٩٣ - (م) عَنِ المغِيرَةِ بنِ شُعْبَةَ: أَنَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) تَبُوكَ، قَالَ الْمُغِيرَةُ: فَتَبَرَّزَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قِبَلَ الغَائِطِ، فَحَمَلْتُ مَعَهُ إِدَاوَةً قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَيَّ أَخَذْتُ أُهْرِيقُ عَلَى يَدَيْهِ مِنَ الإِدَاوَةِ، وَغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يُخْرِجُ جُبَّتَهُ عَنْ ذِرَاعَيْهِ فَضَاقَ كُمَّا جُبَّتِهِ، فَأَدْخَلَ يَدَيْهِ فِي الْجُبَّةِ، حَتَّى أَخْرَجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، وَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ.

قَالَ الْمُغِيرَةُ: فَأَقْبَلْتُ مَعَهُ حَتَّى نَجِدُ النَّاسَ قَدْ قَدَّمُوا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، فَصَلَّى لَهُمْ، فَأَدْرَكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى مَعَ النَّاسِ الرَّكْعَةَ الآخِرَةَ. فَلَمَّا سَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ قَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُتِمُّ صَلاَتَهُ، فَأَفْزَعَ ذَلِكَ الْمُسْلِمِينَ، فَأَكْثَرُوا التَّسْبِيحَ. فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ (ﷺ) صَلاَتَهُ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ ثُمَّ قَالَ: (أَحْسَنْتُمْ) . أَوْ قَالَ: (قَدْ أَصَبْتُمْ) . يَغْبِطُهُمْ أَنْ صَلَّوُا الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا.[م٢٧٤/ الصلاة ١٠٥].

**ژ موغیرەیێ کورێ شوعبەیی (رضي الله عنه) وی د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) غەزوا تەبووکێ کر، موغیرەی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ دەستئاڤێ چۆ، ئینا من جەوادکەکێ ئاڤێ بەری نڤێژا سپێدێ د گەل هەلگرت، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زڤری من ئاڤ ژ وی جەوادکێ د گەل من ل دەستێت وی کر، و دەستێت خۆ سێ جاران شویشتن، پاشی ناڤچاڤێت خۆ شویشتن، پاشی کار کر عەبایێ خۆ ژ زەندکێت خۆ دەربێخیت بەلێ هەردو هچکێت وی د تەنگ بوون، ئینا دەستێت خۆ کرنە د عەبایڕا هەتا هەردو زەندکێت خۆ د بن عەبایڕا دەرئێخستین، و دەستێت خۆ هەتا ئەنیشکێ شویشتن، پاشی هەردو خوفکێت خۆ ڤەمالین پاشی هاتەڤە.**

**موغیرەی گۆت: و ئەز د گەل هاتم هەتا مە دیتی خەلکی عەبدولرەحمانێ کورێ عەوفی یێ پێشییا خۆ ئێخستین و نڤێژێ ل بەری وان دکەت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ**

(١) نەڤە تایبەتمەندییەکا پێغەمبەری بوو (ﷺ) ل پشت خۆ ددیت و ناگەهـ ژ نڤێژا موسلمانان هەبوو.

**(ﷺ) گەهشتە ئێك ژ دو ركعەتان، و ركعەتا دویماهییێ د گەل موسلمانان كر، ڤێجا دەمێ عەبدولرەحمانێ كوڕێ عەوفی سلاڤا ملان ڤەدایی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو نڤێژا خۆ تمام كەت، ئەڤێ چەندێ موسلمان ترساندن، زێدە تەسبیح كرن، ڤێجا دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژا خۆ تمام كری، بەرێ خۆ دا وان پاشی گۆت: (هەوە باش كر) یان ژی گۆت: (هەوە یا دورست كر) كەیفا وی ب وان هات نڤێژ د دەمێ وێدا كر.**

٦ ـ باب: الإمام يخرج لعلة.

**بابەتێ: ئیمام ژ بەر ئەگەرەكی دەركەڤیت.**

١٣٩٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ وَعُدِّلَتِ الصُّفُوفُ قِيَاماً، فَخَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَلَمَّا قَامَ فِي مُصَلاَّهُ، ذَكَرَ أَنَّهُ جُنُبٌ، فَقَالَ لَنَا: (**مَكَانَكُمْ**) . ثُمَّ رَجَعَ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَيْنَا وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ، فَكَبَّرَ، فَصَلَّيْنَا مَعَهُ. [خ٢٧٥/ م٦٠٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: قامەت هاتە گرتن، و ریز ژ پیاڤە هاتنە راستكرن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفت، دەمێ ئەو ل جهێ نڤێژا خۆ بیرا وی هات ئەو یێ ب جەنابەت بوو، ئینا گۆتە مە: (ل جهێت خۆ بن) پاشی چۆ سەرێ خۆ شویشت، پاشی زڤری دەڤ مە، و چپكێت ئاڤێ ژ سەری د كەفتن، و تەكبیر كر و مە نڤێژ د گەل كر.**

٧ ـ باب: إمامة المفتون والمبتدع والعبد.

**بابەتێ: ئیمامەتییا سەرداچۆیی و بیدعەچی و كۆلەیی.**

١٣٩٥ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**يُصَلُّونَ لَكُمْ، فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ، وَإِنْ أَخْطَؤُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ**). [خ٦٩٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دێ بەری هەوە نڤێژا كەن، ئەگەر دورست كرن بۆ هەوە هەمیانە، و ئەگەر دورست نەكرن بۆ هەومیە و ل سەر وانە)[1].**

(١) نانكو: نڤێژا هەوە یا دورستە و گونەه د ستۆیێ وانە نە د ستۆیێ هەومیە.

## ٨ ـ باب: الإمام ينتظر اجتماع الناس.

### بابەتێ: ئیمام دێ چاڤەرێی هاتنا خەلکی کەت.

١٣٩٦ - عَنْ سَالِمٍ أَبِي النَّضْرِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِينَ تُقَامُ الصَّلَاةُ فِي الْمَسْجِدِ، إِذَا رَآهُمْ قَلِيلاً جَلَسَ لَمْ يُصَلِّ، وَإِذَا رَآهُمْ جَمَاعَةً صَلَّى. [د٥٤٥].

* ضعيف. وقال شعيب: رجاله ثقات وهو مرسل.

**ژ سالمێ کورێ نەزری (ﷺ) گۆت: دەمێ قامەت ل مزگەفتێ بۆ نڤێژێ دهاتە گرتن ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیتبان ئەو د کێمن دروینشت نڤێژ نەدکر[1] و ئەگەر دیتبان کۆمەکن نڤێژ دکر.**

## ٩ ـ باب: إمامة النساء.

### بابەتێ: ئیمامەتییا ژنێ.

١٣٩٧ - عَنْ عَطَاءٍ عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّهَا كَانَتْ تُؤَذِّنُ وَتُقِيمُ، وَتَؤُمُّ النِّسَاءَ، وَتَقُومُ وَسَطَهُنَّ. [ك٧٣١/هق١/١٧٨١].

**ژ عەتائی (ﷺ) ژ عائیشایێ: وێ بانگ ددا و قامەت دگرت و ئیمامەتییا ژنان دکر و ل نیڤا وان رادوەستا.**

١٣٩٨ - عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: تَؤُمُّ المرأَةُ النِّسَاءَ تَقُومُ وَسَطَهُنَّ. [هق٣/١٣١]. [وانظر: ١٠٣٠، ١٠٣١].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژن دێ ئیمامەتییا ژنان کەت و دێ ل نیڤا وان راوەستیت.**

## ١٠ ـ باب: من أمَّ قوماً وهم له كارهون.

### بابەتێ: یێ ئیمامەتییا هندە کەسان بکەت و وان پێنەخۆش بیت.

١٣٩٩ - عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الْمُصْطَلِقِ قَالَ: كَانَ يُقَالُ: أَشَدُّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ اثْنَانِ: امْرَأَةٌ عَصَتْ زَوْجَهَا، وَإِمَامُ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ. [ت٣٥٩].

* صحيح الإسناد.

---

(١) نانکو: خۆ دگرت هەتا خەلك هاتبان کۆمبیان.

**ژ عەمرێ کوڕێ حارسێ کوڕێ موستەلیقی (ﷺ) گۆت: دهاتە گۆتن: دو مرۆڤان ڕۆژا قیامەتێ ئیزایا وان ژ هەمیان گرانترە: ژنەکێ نەگوهدارییا زەلامێ خۆ کربیت، و ئیمامێ هندە کەسان ئەو د پێ نەخۆش بن.**

١١ . باب: الإمام يقوم مكاناً أرفع من مكان القوم.

**بابەتێ: ئیمام ل جهەکێ بلندتر ژ جهێ خەلکی ڕاوەستیت.**

١٤٠٠ - عَنْ هَمَّامٍ: أَنَّ حُذَيْفَةَ أَمَّ النَّاسَ بِالْمَدَائِنِ عَلَى دُكَّانٍ، فَأَخَذَ أَبُو مَسْعُودٍ بِقَمِيصِهِ فَجَبَذَهُ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ قَالَ: أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُنْهَوْنَ عَنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: بَلَى، قَدْ ذَكَرْتُ حِينَ مَدَدْتَنِي. [د٥٩٧].

* صحيح.

**ژ هومامی (ﷺ) حوزەیفەی ل مەدائن نڤێژ بەری خەلکی ل سەر دۆشکەکێ جهەکێ بلند کر، ئینا ئەبو مەسعودی قەمیسێ وی کێشا (دا بهێتە خوار و بهێتە ڕێزا خەلکی)، ڤێجا دەمێ ژ نڤێژا خۆ ب دویماهی هاتی، گۆت: ما تو نوزانی پاشڤەلێدان ل هندێ دهاتە کرن؟[1]. گۆت: بەلێ من دزانی و دەمێ تە ئەز کێشایم هاتە بیرا من.**

١٢ . باب: الإمام لا يتطوع في مكانه.

**بابەتێ: ئیمام سونەتێ ل جهێ خۆ ناکەت.**

١٤٠١ - عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ يُصَلِّ الْإِمَامُ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ حَتَّى يَتَحَوَّلَ**) . [د٦١٦/ جه١٤٢٨]

* صحيح.

[انظر: ١٣٤٤، ١٣٤٥] .

**ژ موغیرەیێ کوڕێ شوعبەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئیمام سونەتێ ل وی جهی ناکەت یێ نڤێژ لێ کری هەتا جهێ خۆ دگوهۆڕیت).**

---

(١) نانکو: ما تو نوزانی پێغەمبەری (ﷺ) و هەڤالێت وی پاشڤەلێدان ل هندێ دکر ئیمام نڤێژێ ل جهەکێ بلندتر ژ نڤێژکەران بکەت.

## ١٣ ـ باب: الفتح على الإمام.

## بابەتێ: ل ئیمامی زڤراندن.

١٤٠٢ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى صَلاَةً فَقَرَأَ فِيهَا، فَلُبِسَ عَلَيْهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ لِأُبَيّ: (**أَصَلَّيْتَ مَعَنَا**) ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَمَا مَنَعَكَ**) ؟ [د٩٠٧].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژەك كر و قورئان ل سەر خواند و ل بەر وی تێكەل بوو، ڤێجا دەمێ نڤێژ تمام كری گۆتە ئوبەی: (ئەرێ تە نڤێژ د گەل مە كر)؟ گۆت: بەلێ، گۆت: (ئەرێ چ تشتی رێگری ل تە كر)[1].**



(١) رامان: ئەرێ چ تشتی نەهێلا تو بەرسڤا من نە دەیی؟

## الفصل الثاني: صلاة الجماعة

## پشکا دووێ: نڤێژا ب جەماعەت

### ١ ـ باب: وجوب صلاة الجماعة

### بابەتێ: واجبیا نڤێژا ب جەماعەت

١٤٠٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، **لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ، ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَيُؤَذَّنَ لَهَا، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمَّ النَّاسَ، ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ**. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُهُمْ: أَنَّهُ يَجِدُ عَرْقاً سَمِيناً، أَو مِرْمَاتَيْنِ حَسَنَتَيْنِ، لَشَهِدَ الْعِشَاءَ) . [خ٦٤٤/ م٦٥١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستیدا نێزیك بوو ئەز فەرمانێ بدەم دار بێنە کۆمکرن، پاشی گازیکەمە نڤێژێ و بانگ بۆ بێتە دان، پاشی ئەمرێ زەلامەکی بکەم بەری خەلکی نڤێژێ بکەت، پاشی ئەز بچمە دەڤ هندە زەلامان (ئەوێت نەهاتینە نڤێژێ) و مالێت وان ب سەر واندا بسۆژم، ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستیدا ئەگەر ئێکی ژ وان زانیبا ئەو هەستیکەکێ قەلەو یان دو پێپکێت باش دێ بینن دا هێتە نڤێژا عەیشا).**

١٤٠٤ – (م) وَعَنْهُ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ أَعْمَى، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّهُ لَيْسَ لِي قَائِدٌ يَقُودُنِي إِلَى الْمَسْجِدِ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَنْ يُرَخِّصَ لَهُ فَيُصَلِّيَ فِي بَيْتِهِ، فَرَخَّصَ لَهُ، فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ: (**هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ**) ؟ فَقَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (**فَأَجِبْ**) . [م٦٥٣].

**و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکێ کۆرە گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ من کەس نینە من بینیتە مزگەفتێ، داخواز ژ پێغەمبەرێ خودێ کر (ﷺ) دەستویریا وی بدەت نڤێژێ ل مالا خۆ بکەت، وەختێ چۆی گازیکرێ، گۆت: (تە گوھ ل بانگێ نڤێژێ هەیە)؟ گۆت: بەلێ، ئینا گۆت: (یا وەرە).**

١٤٠٥ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسعودٍ قَالَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَلْقَى اللهَ غَداً مُسْلِماً، فَلْيُحَافِظْ عَلَى هَؤُلَاءِ الصَّلَوَاتِ حَيْثُ يُنَادَى بِهِنَّ، فَإِنَّ اللهَ شَرَعَ لِنَبِيِّكُمْ (ﷺ) سُنَنَ الْهُدَى، وَإِنَّهُنَّ مِنْ سُنَنِ الْهُدَى، وَلَوْ أَنَّكُمْ صَلَّيْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ كَمَا يُصَلِّي هَذَا الْمُتَخَلِّفُ فِي بَيْتِهِ لَتَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ، وَلَوْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ لَضَلَلْتُمْ. وَمَا مِنْ رَجُلٍ يَتَطَهَّرُ فَيُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ يَعْمِدُ إِلَى مَسْجِدٍ مِنْ هَذِهِ الْمَسَاجِدِ؛ إِلاَّ كَتَبَ اللهُ لَهُ

كِلِّ خَطْوَةٍ يَخْطُوهَا حَسَنَةً، وَيَرْفَعُهُ بِهَا دَرَجَةً، وَيَحُطُّ عَنْهُ بِهَا سَيِّئَةً. وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنْهَا إِلا مُنَافِقٌ مَعْلُومُ النِّفَاقِ، وَلَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ يُؤْتَى بِهِ يُهَادَى بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ حَتَّى يُقَامَ فِي الصَّفِّ. [م٦٥٤].

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (ﷺ)، گۆت: هەر کەسێ پێ خۆش بیت سوبەهی موسلمان بگەهیتە خودایێ مەزن، بلا پارێزییێ ل ڤان نڤێژان بکەت هەر جهێ بانگ بۆ بێتە دان، و ب راستی خودێ رێکێت راستەرێیێ بۆ پێغەمبەرێ خۆ یێت دانایین و دیار کرین، و هەکە هەوە نڤێژێت خۆ ل مالێت خۆ کرن هەروەکی ڤی پاشڤەمای ل مالا خۆ کری، دێ رێکا پێغەمبەرێ خۆ هێلن، و هەکە هەوە رێکا پێغەمبەرێ خۆ هێلا، دێ سەردا چن و بەرزە بن، و مە خۆ دیت کەس ژ نڤێژێ نەڤەدما دورِوییەك نەبا یێ دورِوییاتییا وی ئاشکەرا، و زەلام هەبوو د مابەینا ملێت دو زەلاماندا دهاتە ئینان هەتا ل رێزا ئێکێ رادوەستا.**

١٤٠٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ صَلاَةَ لِجَارِ المَسجِدِ إلاَّ فِي المَسجِدِ**) .[ك٨٩٨، هق٣/٥٧][1].

* ضعيف.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: جیرانێ مزگەفتێ نڤێژا وی لێ نینە ل مزگەفتێ نەبیت.**

## ٢ ـ باب: فضل صلاة الجماعة.

## بابەتێ: خێرا نڤێژا ب جامعەت

١٤٠٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**صَلاَةُ الجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلاَةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً**) . [خ٦٤٥/ م٦٥٠]

---

(١) **شیخ سالحی ژ بەر لاوازیيا ڤێ فەرموودەیێ نەڤە د مالپەرێ خۆدا شیێ نینایە:** ١٤٠٦ - عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (لَيَنْتَهِيَنَّ رِجَالٌ عَنْ تَرْكِ الجَمَاعَةِ، أَوْ لأُحَرِّقَنَّ بُيُوتَهُمْ) . [جه٧٩٥].

* صحيح.

**ژ ئوسامەیێ کورێ زەیدی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هندەك زەلام یان دێ هێلانا نڤێژێت جەماعەت بەسکەن یان دێ مالێت وان سۆژم).**

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری، (خودێ ژ هەردووان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: نڤێژا ب جەماعەت بیست و حەفت جاران ب خێرترە ژ نڤێژا ب تنێ.**

١٤٠٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(تَفْضُلُ صَلاَةُ الْجَمِيعِ صَلاَةَ أَحَدِكُمْ وَحْدَهُ بِخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءاً، وَتَجْتَمِعُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ)** . ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَاقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾ [الإسراء:٧٨] . [خ٦٤٨ (١٧٦)/ م٦٤٩] .

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نڤێژا ب جەماعەت بیست و پێنج جاران ب خێرترە ژ نڤێژا ئێك ژ هەوە ب تنێ بكەت، و ملیاكەتێت شەڤێ و ملیاكەتێت رۆژێ د نڤێژا سپێدێدا دگەهنە ئێك). پاشی ئەبو هورەیرەی گۆت: بخوینن ئەگەر هەوە بڤێت ﴿إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾[1].**

١٤٠٩ - (م) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ)** .[م٦٥٦].

**ژ عوسمانێ كورێ عەففانی (ﷺ)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر كەسێ نڤێژا عەیشا ب جەماعەت بكەت، هەروەكی ئەو نیڤا شەڤێ رابووی و نڤێژا سپێدێ ب جەماعەت بكەت هەروەكی ئەو شەڤێ هەمییێ رابووی).**

## ٣ ـ باب: القراءة خلف الإمام.

## بابەتێ: خواندن ل پشت ئیمامی.

١٤١٠ - عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَائِشَةَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لَعَلَّكُمْ تَقْرَؤُونَ وَالْإِمَامُ يَقْرَأُ)** ، مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّا لَنَفْعَلُ، قَالَ: **(فَلاَ تَفْعَلُوا، إِلاَّ أَنْ يَقْرَأَ أَحَدُكُمْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)** . [حم١٨٠٧٠].

(١) رامان: و نڤێژا سپێدێ ژبیر نەكە (نڤێژا سپێدێ ب قورئانێ هاتە ب ناڤكرن، چونكی قورئان ب درێژی ل سەر دئێتە خواندن)، چونكی ب راستی نڤێژا سپێدەییان ملیاكەت ل سەر شاهدن (ب شەڤ و رۆژ تێدا حازر دبن، و خۆ تێدا پێك دگوهۆرن، ڤێجا هەردو جوین ل سەر دبنە شاهد).

* إسناده صحيح.

**ژ موحەممەدێ كورێ ئەبی عائیشایێ (ﷺ) ژ زەلامەكی ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دو یان سێ جاران گۆت: (دبیت هوین بخوینن و ئیمام دخوینیت)، ئینا گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی ئەم وەدكەین، گۆت: (وەنەكەن ژ بلی ئێك ژ هەوە فاتیحەیێ بخوینیت).**

١٤١١ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِي (ﷺ) لما قَضَى صَلاَتَهُ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: (**أَتَقْرَؤُونَ فِي صَلاَتِكُمْ وَالإِمَامُ يَقْرَأُ**) ؟ فَسَكَتُوا، فَقَالَ لَهُمْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ قَائِلٌ أَوْ قَائِلُونَ: إِنَّا لَنَفْعَلُ، قَالَ: (**فَلاَ تَفْعَلُوا، لِيَقْرَأْ أَحَدُكُمْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فِي نَفْسِهِ**). [حب١٨٤٤/ هق٢/١٦٦].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ نڤێژا خۆ تمام كری بەرێ خۆ دا وان، گۆت: (ئەرێ هوین د نڤێژا خۆدا دخوینن و ئیمام دخوینیت) ئینا بێدەنگ بوون، ئینا گۆت: سێ جاران ئەڤە گۆت: ئێكی گۆت یان هندەكان گۆت: (ب راستی ئەم وەدكەین، گۆت: وەنەكەن بلا ئێك ژ هەوە فاتیحەیێ د دلێ خۆدا (ئانكو ب دەنگێ نزم) بخوینیت).**

١٤١٢ – عَنْ عَلِي: أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ . أَوْ يَحُثُّ . أَنْ يُقْرَأَ خَلْفَ الإِمَامِ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ، وَفِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ. [ك٨٧٤/ هق٢/١٦٨].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ عەلی (ﷺ) وی فەرمان دكر یان هندان دكر د نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاریدا د هەردو ركعەتێت ئێكێدا فاتحەیێ و سۆرەتەكێ بخوینن و د هەردو ركعەتێت دیدا فاتحەیێ ب تنێ بخوینن.**

## ٤ . باب: تسوية الصفوف وفضيلة الأول.

## بابەتێ: راستكرنا رێزان و خێرا رێزا ئێكێ.

١٤١٣ – (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلاَةِ**). [خ٧٢٣/ م٤٣٣].

ولفظ مسلم: (**مِنْ تَمَامِ الصَّلاَةِ**).

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: رێزێت خۆ راست كەن، ب راستی راستكرنا رێزان ژ كرن و پاراستنا نڤێژێیە.**

- **و د ریوایەتا موسلمیدا: ب راستی راستكرنا رێزان ژ تامیبا نڤێژێیە.**

١٤١٤ - (ق) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ، أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ)** . [خ٧١٧/ م٤٣٦].

- وفي رواية لمسلم، زاد في أوله: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُسَوِّي صُفُوفَنَا، حَتَّى كَأَنَّمَا يُسَوِّي بِهَا الْقِدَاحَ، حَتَّى رَأَى أَنَّا قَدْ عَقَلْنَا عَنْهُ. ثُمَّ خَرَجَ يَوْماً فَقَامَ حَتَّى كَادَ يُكَبِّرُ، فَرَأَى رَجُلاً بَادِياً صَدْرُهُ مِنَ الصَّفِّ، فَقَالَ: **(عِبَادَ اللهِ، لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ)** .

- وفي رواية عند البخاري معلقة: قال النُّعمانُ: رَأيتُ الرَّجلَ مِنَّا يُلزقُ كعبَه بكعبِ صاحبِهِ. [الأذان والإمامة، باب ٧٦].

**ژ نەعمانێ كورێ بەشیری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یان هوین دێ رێزێت خۆ راست كەن یان ب سویند خودێ دێ دلێت هەوە ژ بەرێك بەت).**

- **و د ریوایەتەكا موسلمیدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەردەوام رێزێت مە راست دكرن هەتا دا بێژی تیران پێ راست دكەت، هەتا دیتی ئەم تێگەهشتین، پاشی رۆژەكێ پێشكەفت، رابوو هەتا نێزیك بووی دەست ب نڤێژێ بكەت زەلامەك دیت سینگێ وی دیار ببوو، ئینا گۆت: (بەندەیێت خودێ ب سویند هوین دێ رێزێت خۆ راست كەن یان ب سویند خودێ دێ دلێت هەوە ژ بەرێك بەت).**

- **و د ریوایەتەكا بوخاریدا یا موعەلەقدا: نەعمانی گۆت: من زەلام دیت گۆزەكا پێ خۆ ب گۆزەكا پێ هەڤالێ خۆڤە نا.**

١٤١٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لَوْ تَعْلَمُونَ . أَوْ يَعْلَمُونَ . مَا فِي الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ، لَكَانَتْ قُرْعَةً)** . [م٤٣٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەگەر هوین بزانن یان وان زانیبا كا چ خێر د رێزا ئێكێدایە دا كەنە پشككێشان).**

١٤١٦ – عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَتَخَلَّلُ الصَّفَّ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَى نَاحِيَةٍ، يَمْسَحُ صُدُورَنَا وَمَنَاكِبَنَا، وَيَقُولُ: (**لاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ**) . وَكَانَ يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصُّفُوفِ الأُوَلِ**). [د٦٦٤/ ن٨١٠/ مي١٢٩٩].

* صحيح.

**ژ بەرائێ کوڕێ عازبی (خودێ ژ هەردووان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ سینگێت مە و ملێت مە د نڤێژێدا راست دکرن و دگۆت: (رێزێت خۆ راست کەن و پێش ئێك و دو نەکەڤن دێ دلێت هەوە ژ بەرێك چن) و دگۆت: (ب راستی خودێ و ملیاکەتێت وی سەلەواتان ددەنە سەر رێزێت ئێکێ)[1].**

١٤١٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ وَصَلَ صَفّاً وَصَلَهُ اللهُ، وَمَنْ قَطَعَ صَفّاً قَطَعَهُ اللهُ عزّ وجل**) .

- زاد أبو داود في أوله: (**أَقِيمُوا الصُّفُوفَ، وَحَاذُوا بَيْنَ الْمَنَاكِبِ، وَسُدُّوا الْخَلَلَ، وَلِينُوا بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ، وَلاَ تَذَرُوا فُرُجَاتٍ لِلشَّيْطَانِ...**) . [د٦٦٦/ ن٨١٨].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری، (خودێ ژ هەردووان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ کێماتییا رێزەکێ بگریت خودێ دێ گەهینیتە دلۆڤانییا خۆ و یێ کێماتییەکێ چێ کەت و رێزێ ببڕیت خودێ دێ وی ژ دلۆڤانییا خۆ بڕیت).**

- **و ئەبو داود د دەستپێکا وێدا زێدەکرییە: رێزان دورستکەن، و ملان بگەهیننە ئێك و کێماتییان بگرن، و خۆ د دەستێت برایێت خۆدا نەرم بکەن[2] و کێماسییان بۆ شەیتانی نەهێلن).**

١٤١٨ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**أَتِمُّوا الصَّفَّ الْمُقَدَّمَ، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ، فَمَا كَانَ مِنْ نَقْصٍ، فَلْيَكُنْ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ**) . [د٦٧١/ ن٨١٧].

* صحيح.

[وانظر: ١٠١٠].

---

(١) و سەلەوات ژ خودێ، دلۆڤانییە، و ژ ملیاکەتان دوعانە، نانکو: ملیاکەت دوعا بۆ وان کەسێت رێزا ئێکێ دکەن.

(٢) نانکو: هەکە ڤیان هەوە بکێشن یان پاشڤە ببەن بۆ دورستکرنا رێزێ.

ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گۆت: **(رێزا پێشییێ تمامکەن پاشی یا دویڤرا، و هەکە کێماتییەك هەبیت بلا د رێزا دویماهییێدا بیت).**

٥ ـ باب: إذا أُقيمت الصلاة فلا صلاة إلا المكتوبة.

**بابەتێ: ئەگەر قامەت هاتە گرتن چو نڤێژ ناهێنە کرن ژ بلی یا فەرز.**

١٤١٩ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةُ)**. [م٧١٠].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر قامەت هاتە گرتن، چو نڤێژ ناهێنەکرن یا فەرز نەبیت).**

١٤٢٠ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجِسَ قَالَ: دَخَلَ رَجُلٌ الْمَسْجِدَ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي صلاَةِ الْغَدَاةِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ فِي جَانِبِ الْمَسْجِدِ، ثُمَّ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، قَالَ: **(يَا فُلاَنُ! بِأَيِّ الصَّلاَتَيْنِ اعْتَدَدْتَ؟ أَبِصَلاَتِكَ وَحْدَكَ، أَمْ بِصَلاَتِكَ مَعَنَا)** ؟. [م٧١٢].

ژ عەبدوللایێ کورێ سەرجیسی (ﷺ) گۆت: زەلامەك هاتە د مزگەفتێڤە و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا سپێدێ دکر، ئینا دو رکعەت ل رەخێ مزگەفتێ کرن، پاشی هاتە ناڤ نڤێژێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ ژی نڤێژ کر، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سلاڤا ملان فەدایی گۆت: **(ئەی بێڤان، ئەرێ تە کیژ ژ هەردو نڤێژێت خۆ فەرز هەژمارتن؟ نڤێژا خۆ یا ب تنێ یان ئەو نڤێژا تە د گەل مە کری).**

٦ ـ باب: متى يقوم المصلون للصلاة.

**بابەتێ: نڤێژکەر کەنگی دێ رابنە نڤێژێ.**

١٤٢١ – (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي، وَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ)** . [خ٦٣٨ (٦٣٧)/ م٦٠٤].

ژ ئەبی قەتادەی (ﷺ) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر قامەت هاتە گرتن، نەرابن هەتا هوین من دبینن و د رەحەت و ل سەر خۆ بن).**

## ٧ . باب: من يقف خلف الإمام.

**بابەتێ: کی دێ ل پشت ئیمامی بیت.**

١٤٢٢ - (م) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا فِي الصَّلاَةِ وَيَقُولُ: **(اسْتَوُوا وَلاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)** . [م٤٣٢].

**ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێت خۆ د ملێت مەدا دئینا خوار و ملێت مە د نڤێژێدا راست دکرن و دگۆت: (ریزێت خۆ راست کەن و پێش ئێك و دو نەکەڤن دێ دلێت هەوە ژ بەرێك چن، بلا یێت خودان عەقل و بالق (یان یێت خودان قەدر) ژ هەوە نێزیکی من بن، پاشی یێت نێزیکی وان (د سالۆخێ بۆریدا) پاشی یێت نێزیکی وان).**

## ٨ . باب: صفوف النساء خلف الرجال.

**بابەتێ: ریزێت ژنان ل پشت زەلامان.**

١٤٢٣ - (خ) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا سَلَّمَ، قَامَ النِّسَاءُ حِينَ يَقْضِي تَسْلِيمَهُ، وَمَكَثَ يَسِيراً قَبْلَ أَنْ يَقُومَ.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأُرَى . وَاللهُ أَعْلَمُ . أَنَّ مُكْثَهُ لِكَيْ يَنْفُذَ النِّسَاءُ، قَبْلَ أَنْ يُدْرِكَهُنَّ مَنِ انْصَرَفَ مِنَ الْقَوْمِ. [خ٨٣٧].

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سلاڤا ملان ڤەددا و دەمێ سلاڤا وی تمام دبوو ژن رادبوون و دچۆن[1]، و ئەو کێمەکێ دما بەری رابیت.**

**و ئیبن شیهاب دبێژیت: ئەز هۆسا دبینم و خودێ چێتر دزانیت مانا وی بۆ هندێ بوو دا ژن رابن و دەرکەڤن بەری زەلام رابن و ب وانرا بگەهن.**

١٤٢٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا)** . [م٤٤٠].

---

(١) چونکی ژنان و زەلامان ل ئێك جە نڤێژ دکرن و ناڤبر د ناڤبەرا واندا نەبوو، ئەو بەری زەلامان رادبوون دا تێکەلی وان نەبن و بگەهنە زارۆك و کارێت خۆ.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (باشترین ڕێزێت زەلامان یا ئێکێیە و خرابترین ڕێز یا دویماهییێیە[1]، و باشترین ڕێزێت ژنان یا دویماهییێیە و خرابترین ڕێز یا ئێکێیە)[2].**

٩ ـ باب: فضل كثرة الخطا إلى المساجد.

**بابەتێ: خێرا هاڤێتنا گەلەك پێنگاڤان بۆ مزگەفتان**

١٤٢٥ – (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَعْظَمُ النَّاسِ أَجْراً فِي الصَّلاَةِ أَبْعَدُهُمْ فَأَبْعَدُهُمْ مَمْشى، وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الإِمَامِ، أَعْظَمُ أَجْراً مِنَ الَّذِي يُصَلِّي ثُمَّ يَنَامُ)** . [خ٦٥١/ م٦٦٢].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (ب ڕاستی مرۆڤێ خێرا وی ب نڤێژێ ژ هەمیان مەزنتر، یێ ژ هەمیا دویرتر و پتر ب ڕێ دئێت، و خێرا وی یێ خۆ دگریت هەتا نڤێژێ د گەل ئیمامی دکەت مەزنترە ژ وی یێ نڤێژێ دکەت و دنڤیت[3]).**

١٤٢٦ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(صَلاَةُ الْجَمِيعِ تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ وَصَلاَتِهِ فِي سُوقِهِ خَمْساً وَعِشْرِينَ دَرَجَةً، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ، وَأَتَى الْمَسْجِدَ، لاَ يُرِيدُ إِلاَّ الصَّلاَةَ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ خَطِيئَةً، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ، وَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ، كَانَ فِي صَلاَةٍ مَا كَانَتْ تَحْبِسُهُ، وَتُصَلِّي ـ يَعْنِي ـ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ، مَا دَامَ فِي مَجْلِسِهِ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، مَا لَمْ يؤذِ، يُحْدِثُ فِيهِ)** .[خ٤٧٧ (١٧٦)/ م٦٤٩ (٢٧٢) كتاب المساجد].

**(صَلاَةُ الْجَمِيعِ تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ وَصَلاَتِهِ فِي سُوقِهِ خَمْساً وَعِشْرِينَ دَرَجَةً، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ، وَأَتَى الْمَسْجِدَ، لاَ يُرِيدُ إِلاَّ الصَّلاَةَ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ**

---

(١) مەبەست ئەو نینە گونەهکارن یان کارەکێ خراب و گونەه کرییە، بەلکی مەبەست پێ خێر کێمترە.

(٢) هەلبەت ئەڤە ئەگەر ژن و زەلامان ل جهەکی نڤێژ کرن و د بن ئێك بانڤە، بەلێ ئەگەر جهێ وان یێ نڤێژێ جودا بیت و تایبەت بیت ب وانڤە، وەکی ئەڤرۆ ل پترییا مزگەفتان هەی ـ هۆلا وان یا جودایە ژ یا زەلامان ـ وی دەمی حوکمێ ڕیزێت وان حوکمێ ڕیزیت زەلامانە، باشترین ڕیزێت وان ئانکو: یێت ژنان یا ئێکێیە و خرابترین ڕیزا وان یا دویماهییێیە.

(٣) ـ بۆ نموونە: بانگێ ئیڤرۆ یان یێ ئێڤاری یان یێ عەیشا هاتە دان ئەو هند خۆ ناگریت بچیتە مزگەفتێ و نڤێژا ب جەماعەت بکەت ـ ڤێجا گەل بانگ دا ژ بەر خەوێ دێ لەزێ ل نڤێژێ کەت و دێ نڤیت، نڤێژا وی یێ خۆ گرتی و چۆیە مزگەفتێ گەلەك ب خێرترە بلا وی دەسپێکا دەمی ژی نڤێژ کربیت.

خَطِيئَةٌ، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ، وَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ، كَانَ فِي صَلَاةٍ مَا كَانَتْ تَحْبِسُهُ، وَتُصَلِّي ـ يَعْنِي ـ عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ، مَا دَامَ فِي مَجْلِسِهِ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، مَا لَمْ يؤذِ، يُحْدِثُ فِيهِ) .

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت، **(نڤێژا مرۆڤی ب جەماعەت بیست و پێنج دەرەجان ژ نڤێژا وی یا ل مالا وی یان یا ل سویکا وی[1] زێدەتر و ب خێرترە، ب راستی ئەگەر ئێکی ژ هەوە دەستنڤێژا خۆ شویشت و باش شویشت، و بێتە مزگەفتێ، و ژ نڤێژێ پێڤەتر چو پێ دی نەڤێت، نینە ئەو پێنگاڤەکێ باڤێت ئەگەر پێ ب دەرەجەکێ بلند نەبیت و گونەهەک پێ ژێ نەوەریت هەتا دچیتە د مزگەفتێڤە، و ئەگەر چۆ د مزگەفتێڤە، ئەو پێ د نڤێژێدا هندی نڤێژ وی بهێلیت، و ملیاکەت دوعا بۆ دکەن هندی ئەو د جهێ خۆدا بیت پێ نڤێژ تێدا کری دبێژن: گونەهێت وی ژێ ببە، یا خودێ رەحمێ پێ ببە، هندی ئەو ئەزیەتا کەسێ نەکەت یان دەستنڤێژا خۆ نەشکێنیت).**

١٤٢٧ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: خَلَتِ الْبِقَاعُ حَوْلَ الْمَسْجِدِ، فَأَرَادَ بَنُو سَلِمَةَ أَنْ يَنْتَقِلُوا إِلَى قُرْبِ الْمَسْجِدِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ لَهُمْ: (إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكُمْ تُرِيدُونَ أَنْ تَنْتَقِلُوا قُرْبَ الْمَسْجِدِ) قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ قَدْ أَرَدْنَا ذلِكَ، فَقَالَ: (يَا بَنِي سَلِمَةَ، دِيَارَكُمْ تُكْتَبْ آثَارُكُمْ، دِيَارَكُمْ تُكْتَبْ آثَارُكُمْ) . [م٦٦٥].

ژ جابری (رضي الله عنه)، گۆت: جه ڤالا بوو و بەنی سەلەمە ڤیان خۆ ڤەگوهێزنە نێزیکی مزگەفتێ، ئەڤە گەهشتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە وان: **(من یا زانی هەوە دڤێت مالێت خۆ ڤەگوهێزنە نێزیکی مزگەفتێ)؟** گۆتن: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، مە ئەو دڤیا، گۆت: **(گەلی بەنی سەلەمە ل جهێ خۆ بن، شوین پێت هەوە دنڤێسین، شوین پێت هەوە دنڤێسین).**

١٤٢٨ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ مَشَى إِلَى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ، لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِضِ اللهِ، كَانَتْ خَطْوَتَاهُ إِحْدَاهُمَا تَحُطُّ خَطِيئَةً، وَالأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً) . [م٦٦٦].

---

(١) مەخسەد پێ نڤێژا ب تنێ دهێتە کرن چ ل سویکێ یان ل سەر کاری یان ل مال بیت.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ دەستنڤێژێ ل مالا خۆ بشۆت، پاشی بچیتە مالەکێ ژ مالێت خودێ دا فەرزەکێ ژ فەرزێت خودێ بکەت، پێنگاڤێت وی ئێك گونەهەکێ ژێ دبەت و یا دی دەرەجەکێ بلند دکەت).**

١٤٢٩ - عَنْ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**. [د٥٦١/ ت٢٢٣].

* صحيح.

ژ بورەیدەیێ ئەسلەمی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(مزگینییێ ب رۆناهییا هەمی رەخان دگریت رۆژا قیامەتێ بدە وان یێت د تارییاندا زێدە دچنە مزگەفتێ).**

١٤٣٠ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يُكَفِّرُ اللهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَزِيدُ بِهِ فِي الْحَسَنَاتِ)** ؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: **(إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ)** . [جه٤٢٧/ مي٧٢٥]

* حسن صحيح.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ئەرێ ئەز نیشا هەوە نەدەم تشتێ خودێ گونەهان پێ ژێ دبەت، و خێران پێ زێدە دکەت)؟** گۆتن: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(دەستنڤێژ شویشتنا دورست د نەخۆشییاندا و زێدە پێنگاڤ هاڤێتن بۆ مزگەفتان و خۆگرتن ل هیڤییا نڤێژێ پشتی کرنا نڤێژێ).**

## ١٠ ـ باب: المسبوق يأتي الصلاة بسكينة ووقار.

**بابەتێ: پێ نەگەهشتییە نڤێژێ رەحەت و ب رویمەت دێ هێتە نڤێژێ.**

١٤٣١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَأْتُوهَا تَسْعَوْنَ، وَأْتُوهَا تَمْشُونَ، عَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فاتَكُمْ فَأَتِمُّوا)** .[خ٩٠٨ (٦٣٦)/ م٦٠٢].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەریٚ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(هەکە دەست ب نڤێژێ کرن، نەهێنە نڤێژێ و هوین بکەنە غار یان ب لەز بهێن، بەلێ نەرم وەرنێ و ل سەر خۆ بن، یا هوین گەهشتنێ بکەن، و یا ژ هەوە چۆ تمامکەن).**

١٤٣٢ – (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، إِذْ سَمِعَ جَلَبَةَ رِجَالٍ، فَلَمَّا صَلَّى قَالَ: **(مَا شَأْنُكُمْ)** ؟ قَالُوا: اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: **(فَلاَ تَفْعَلُوا، إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا)** . [خ٦٣٥/ م٦٠٣].

ژ ئەبی قەتادەی (رضي الله عنه) گۆت: د دەمەکیدا مە نڤێژ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دکر، دەنگێ ڕپڕپا پێت زەلامان بوو، ڤێجا دەمێ نڤێژ کری گۆت: **(هەوە خێر بوو)؟** گۆتن: مە لەز بۆ نڤێژێ دکر، ئینا گۆت: **(وێ نەکەن (ئانکو لەزێ نەکەن) ئەگەر هوین هاتنە نڤێژێ هێدی و رەحەت وەرن، و یا هوین گەهشتنێ بکەن، و یا ژ هەوە چۆیی تمامکەن).**

١٤٣٣ – (خ) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ: أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَهُوَ رَاكِعٌ، فَرَكَعَ قَبْلَ أَنْ يَصِلَ إِلَى الصَّفِّ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: **(زَادَكَ اللهُ حِرْصاً، وَلاَ تَعُدْ)** . [خ٧٨٣]

ژ ئەبی بەکرەتە (رضي الله عنه) گۆت: ئەو گەهشتە پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو د رکوعێدا بوو ڤێجا وی رکوع بر بەری بگەهیتە ڕێزێ و وی ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئینا گۆت: **(خودێ ڕژدییا تە زێدە بکەت و وەنەکەڤە).**

## ١١ . باب: التصفيق للنساء.

## بابەتێ: دەستقوتان بۆ ژنانە.

١٤٣٤ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ)**.

وزاد في رواية لمسلم: (فِي الصَّلاَةِ) . [خ١٢٠٣/ م٤٢٢].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(گۆتنا سبحان الله، بۆ زەلامایە، و دەستقوتان بۆ ژنانە)**[1].

---

(١) ئەگەر ئیمام خەلەت بوو، ڕێکا ئاگەهدارکرنا وی ئەڤەیە: زەلام بێژن: (سبحان الله) و ژن دەستێ خۆ یێ راستێ ل پشتا دەستێ خۆ یێ چەپێ بدەن، و هۆسا دیارە دبیت ڕێکا ئاگەهدارکرنا ئیمامی ژ زەلامان ب گۆتنا (سبحان الله)ە و ڕێکا ئاگەهدارکرنا ئیمامی ژ ژنان ب لێکدانا دەستانە دەستێ خۆ یێ راستێ ل سەر یێ چەپێ بدەت.

١٤٣٥ - عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِذَا أَنْسَانِي الشَّيْطَانُ شَيْئاً مِنْ صَلاَتِي؛ فَلْيُسَبِّحِ الرِّجَالُ، وَلْيُصَفِّقِ النِّسَاءُ**) . [حم١٤٦٥٤].

* صحيح لغيره.

**ژ جابری (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەری (ﷺ) بوو دگۆت: (ئەگەر شەیتانی تشتەك ژ نڤێژا من ژ بیرا من بر بلا زەلام بێژن سوبحان الله و ژن دەستێت خۆ لێك بدەن).**

## ١٢ . باب: الصلاة في الرحال في المطر.

### بابەتێ: نڤێژکرنا ل مالان دەمێ بارانێ.

١٤٣٦ - (ق) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ أَذَّنَ بِالصَّلاَةِ فِي لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ، ثُمَّ قَالَ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَأْمُرُ المؤَذِّنَ، إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ ذَاتُ بَرْدٍ وَمَطَرٍ، يَقُولُ: (**أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ**). [خ٦٦٦ (٦٣٢)/ م٦٩٧].

**ژ نافعی (ﷺ) گۆت: ئیبن عومەری د شەڤکا سار و ب باران بانگ بۆ نڤێژێ دا، پاشی گۆت: هشیار بن ل مالێت خۆ نڤێژان بکەن، پاشی گۆت: ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا بانگدەهی دکر ئەگەر شەڤەکا سار و ب بارانبایە، بێژیت: (هشیار بن و نڤێژێ ل مالان بکەن).**

## ١٣ . باب: استحباب يمين الإمام.

### بابەتێ: باشدانانا لایێ راستێ یێ ئیمامی.

١٤٣٧ - (م) عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، أَحْبَبْنَا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ، يُقْبِلُ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ، قَالَ: فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (**رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ . أَوْ تَجْمَعُ . عِبَادَكَ**) .[م٧٠٩].

**ژ بەرائی (ﷺ) گۆت: دەمێ مە نڤێژ ل پشت پێغەمبەرێ خودێ دکر (ﷺ) مە حەز دکر ئەم ل رەخێ وی یێ راستێ بین، بەرێ خۆ ددامە، من گوه لێ بوو دگۆت: (یا خودێ من ژ ئیزایا خۆ بپارێزە رۆژا تو بەندەیێت خۆ کۆم دکەی).**

## ١٤ ـ باب: يقف المنفرد عن يمين الإمام.

**بابەتێ: يێ ب تنێ دێ ل رەخێ راستێ يێ ئیمامی راوەستیت.**

١٤٣٨ – عن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قال: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُصَلِّي الْمَغْرِبَ، فَجِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ. [جه٩٧٤]

- وزاد عند أحمد: فَجَاءَ صَاحِبٌ لِي فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ. [حم١٤٤٩٦].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللايی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا مەغرەب دكر، ئەز هاتم رەخێ وی یێ چەپێ راوەستام، ئینا ئەز ئینامە رەخێ خۆ یێ راستێ.**

- **و ئیمام ئەحمەد زێدەكرییە: ئینا هەڤالەكێ من هات و ئەم ل پشت وی رێز بووین.**

## ١٥ ـ باب: تدرك الصلاة مع الإمام بركعة (صلاة المسبوق).

**بابەتێ: گەهشتنا نڤێژێ ب كرنا ركعەتەكێ د گەل ئیمامی (نڤێژا گیرۆبووی).**

١٤٣٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذَا جِئْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا، وَلاَ تَعُدُّوهَا شَيْئاً، وَمَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ)** . [د٨٩٣]

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر هوین هاتنە نڤێژێ و ئەم یێت د سوجدەیێدا هەرنە سوجدەیێ و ركعەت نەهەژمێرن و یێ گەهشتە ركعەتەكێ ئەو گەهشتە نڤێژێ).**

١٤٤٠ – عَنْ عَلِيٍّ وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالاَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِذَا أَتَى أَحَدُكُمُ الصَّلاَةَ وَالْإِمَامُ عَلَى حَالٍ، فَلْيَصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الْإِمَامُ)** . [ت٥٩١].

* صحيح.

**ژ عەلی و مەعازێ كورێ جەبەلی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە هاتە نڤێژێ و ئیمام د چ دا بیت بلا وێ بكەت یا ئیمام دكەت).**

١٤٤١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَهَا، قَبْلَ أَنْ يُقِيمَ الإِمَامُ صُلْبَهُ**). [هق٢/٨٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ بگەهیتە ركعەتەكێ ژ نڤێژێ بەری ئیمام پشتا خۆ راست بكەت ب ڕاستی ئەو گەهشتە نڤێژێ).**

١٤٤٢ - عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِذَا أَدْرَكَ الرَّجُلُ الرَّكْعَةَ، فَكَبَّرَ تَكْبِيرَةً وَاحِدَةً، أَجْزَأَتْ عَنْهُ تِلْكَ التَّكْبِيرَةُ. [ط١٧١].

**ژ مالكی (رحمه الله) ژ كوڕێ شیهابی وی دگۆت: ئەگەر زەلام گەهشتە ركوعێ بەری ئیمام سەرێ خۆ راكەت و تەكبیرەكا تنێ بێژیت ئەو تەكبیرە بەسی وییە.**

## ١٦ ـ باب: تقديم الطعام على الصلاة.

## بابەتێ: پێشئێخستنا خوارنێ ل سەر نڤێژێ.

١٤٤٣ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا قُدِّمَ الْعَشَاءُ فَابْدَؤُوا بِهِ قَبْلَ أَنْ تُصَلُّوا صَلاَةَ الْمَغْرِبِ، وَلاَ تَعْجَلُوا عَنْ عَشَائِكُمْ**) . [خ٦٧٢/ م٥٥٧].

- وفي رواية لهما: (**إذا وُضِعَ العَشاءُ وأُقِميتِ الصلاة، فابدؤوا بالعَشَاءَ**) . [خ٥٤٦٣].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر شیڤ هاتە دانان دەست پێ بكەن بەری هوین نڤێژا مەغرەب بكەن، و لەزێ ل شیڤا خۆ نەكەن).**

- **و د ڤەگێڕەكا دی یا واندا: (ئەگەر شیڤ هاتە دانان، و قامەت هاتە گرتن دەست ب شیڤێ بكەن).**

## ١٧ ـ باب: من لم يدرك الجماعة فصلى في المسجد.

## بابەتێ: یێ نەگەهیتە جەماعەتێ و ل مزگەفتێ نڤێژێ بكەت.

١٤٤٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ رَاحَ فَوَجَدَ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا، أَعْطَاهُ اللهُ جَلَّ وَعَزَّ مِثْلَ أَجْرِ مَنْ صَلاَّهَا وَحَضَرَهَا، لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أَجْرِهِمْ شَيْئاً**) . [د٥٦٤/ ن٨٥٤].

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: **(هەر کەسێ باش دەستنڤێژا خۆ بشۆت پاشی بچیتە مزگەفتێ و ببینیت خەلکی نڤێژ یا کری، خودایێ هەر ب هێز و مەزن دێ خێرا وان دەتێ یێت کرین و ئامادە بووین، و چو ژ خێرا وان کێم نابیت).**

## ١٨ ـ باب: الجماعة في مسجد قد صُلي فيه.

**بابەتێ: نڤێژا ب جەماعەت ل مزگەفتەکێ نڤێژا ب جەماعەت تێدا هاتبیتە کرن.**

١٤٤٥ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَبْصَرَ رَجُلاً يُصَلِّي وَحْدَهُ، فَقَالَ: **(أَلاَ رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا، فَيُصَلِّيَ مَعَهُ)** . [د٥٧٤/ ت٢٢٠/ مي١٤٠٨].

* صحيح.

ژ ئەبو سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) زەلامەك دیت ب تنێ نڤێژ دکر، ئینا گۆت: **(ئەرێ زەلامەك هەیە سەدەقەکێ د گەل ڤی بکەت، د گەل وی نڤێژێ بکەت).**

## ١٩ ـ باب: إذا صلى ثم أقيمت الصلاة.

**بابەتێ: ئەگەر نڤێژ کربیت پاشی قامەتا نڤێژێ هاتە گرتن.**

١٤٤٦ – عَنْ مِحْجَنِ بْنِ أَبِي مِحْجَنٍ الدِّيلِيِّ: أَنَّهُ كَانَ فِي مَجْلِسٍ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَأَذَّنَ بِالصَّلاَةِ فَقَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، ثُمَّ رَجَعَ وَمِحْجَنٌ فِي مَجْلِسِهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ؟ أَلَسْتَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ!)** قَالَ: بَلَى، وَلَكِنِّي كُنْتُ قَدْ صَلَّيْتُ فِي أَهْلِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذَا جِئْتَ فَصَلِّ مَعَ النَّاسِ، وَإِنْ كُنْتَ قَدْ صَلَّيْتَ)** . [ن٨٥٦].

* صحيح.

ژ میحجەنێ کورێ ئەبی میحجەنێ دیلی (رضي الله عنه) ئەو د گەل پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) د دیوانەکێدا بوو، ئینا قامەت بۆ نڤێژێ هاتە گرتن، پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) رابوو نڤێژ کر، پاشی زڤری و میحجەن یێ ل جهێ خۆ، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆتێ: (چ رێگرییا تە کر تو نڤێژێ نەکەی؟ ما تو زەلامەکێ موسلمان نینی)؟! گۆت: بەلێ، بەلێ من نڤێژ یا ل مال کری، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆتێ: **(ئەگەر تو هاتی د گەل خەلکی نڤێژێ بکە بلا تە نەڤێژ کربیت).**

## ٢٠ ـ باب: صلاة المنفرد خلف الصف.

## بابەتێ: نڤێژا مرۆڤێ ب تنێ ل پشت ریزێ.

١٤٤٧ - عَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ الصَّلاَةَ. [د٦٨٢/ ت٢٣٠/ جه١٠٠٤/ مي١٣٢٢].

* صحيح.

**ژ وابیسەیێ کورێ مەعبەدی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەلامەك دیت ئەو ب تنێ یێ نڤێژێ ل پشت ریزێ دکەت ئینا فەرمانا وی کر ئەو نڤێژێ دوبارەکەت.**

## ٢١ ـ باب: موقف الإمام إذا كانوا ثلاثة.

## بابەتێ: جهێ ئیمامی ئەگەر ئەو سێ بن.

١٤٤٨ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ بِالْهَاجِرَةِ، فَوَجَدْتُهُ يُسَبِّحُ، فَقُمْتُ وَرَاءَهُ، فَقَرَّبَنِي حَتَّى جَعَلَنِي حِذَاءَهُ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا جَاءَ يَرْفَا تَأَخَّرْتُ فَصَفَفْنَا وَرَاءَهُ. [ط٣٦٣].

* إسناده صحيح.

[وانظر: ١٤٣٨] .

**ژ عەبدوللایێ کورێ عوتبەیێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل کەلەژانا گەرما نیڤرۆ چۆمە دەڤ عومەرێ کورێ خەتتابی من دیت یێ نڤێژێ دکەت، ئینا ئەز ل پشت وی راوەستام، وی ئەز نێزیك کرم هەتا ئەز ئینایمە تەنشتا لایێ خۆ یێ راستێ، و دەمێ یەرفا[1] هاتی ئەز پشت و پشت چۆم و د گەل وی ل پشت وی ریز بووین.**

## ٢٢ ـ باب: نهي الحاقن أن يصلي.

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا تەنگاڤی ژ نڤێژێ.

١٤٤٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْأَرْقَمِ: أَنَّهُ خَرَجَ حَاجّاً أَوْ مُعْتَمِراً، وَمَعَهُ النَّاسُ، وَهُوَ يَؤُمُّهُمْ، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَقَامَ الصَّلاَةَ صَلاَةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ قَالَ: لِيَتَقَدَّمْ أَحَدُكُمْ ـ وَذَهَبَ إِلَى الْخَلاَءِ ـ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَذْهَبَ الْخَلاَءَ، وَقَامَتِ الصَّلاَةُ؛ فَلْيَبْدَأْ بِالْخَلاَءِ) .[د٨٨/ ت١٤٢/ ن٨٥١/ جه٦١٦/ مي١٤٦٧]

---

(١) یەرفا: دەرگەڤانێ عومەرێ کورێ خەتتابی بوو (خودێ ژ وان رازی بیت).

ژ عەبدوللایێ کورێ ئەرقەمی (رضي الله عنه) ئەو دەرکەفت چۆ عومرێ یان حەجێ و خەلك د گەل وی بوون و وی ئیمامەتی ل بەری وان دکر، ڤێجا دەمێ رۆژەکێ قامەت بۆ نڤێژا سپێدێ هاتییە گرتن، گۆت: بلا ئێك ژ هەوە پێش بکەڤیت ـ و ئەو ب خۆ چۆ دەستئاڤێ ـ ب راستی من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ئەگەر ئێك ژ هەوە ڤیا بچیتە دەستئاڤێ، و قامەت بۆ نڤێژێ هاتە گرتن، بلا ب چۆنا دەستئاڤێ دەست پێ بکەت).**

٢٣ ـ باب: الحدث يخرج من الصلاة.

**بابەتێ: ئەوێ دەستنڤێژا وی کەڤت دێ ژ نڤێژێ دەرکەڤیت.**

١٤٥٠ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (إِذَا أَحْدَثَ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ؛ فَلْيَأْخُذْ بِأَنْفِهِ، ثُمَّ لِيَنْصَرِفْ) . [د١١١٤/ جه١٢٢٢].

* صحيح.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێك ژ هەوە دەستنڤێژ د نڤێژا خۆدا ئێخست بلا دفنا خۆ بگریت و پاشی بلا ژ نڤێژێ دەرکەڤیت بچیت).**

٢٤ ـ باب: الذاهب إلى المسجد لا يشبك بين أصابعه

**بابەتێ: ئەوێ دچیتە مزگەفتێ دەستێت خۆ ناکەتە د ناڤێکرا**

١٤٥١ - عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ، فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ خَرَجَ عَامِداً إِلَى الْمَسْجِدِ، فَلاَ يُشَبِّكَنَّ يَدَيْهِ، فَإِنَّهُ فِي صَلاَةٍ) . [د٥٦٢/ ت٣٨٦/ مي١٤٠٤].

* صحيح.

ژ کەعبێ کورێ عوجرەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە دەستنڤێژ گرت و باش دەستنڤێژا خۆ گرت پاشی رێکا مزگەفتێ گرت، بلا دەستێت خۆ نەکەتە د ناڤێکرا چونکی ئەو یێ د نڤێژێدا).

## ٢٥ . باب: الجماعة في البيت.

**بابەتێ: نڤێژا ب جەماعەت ل مال.**

١٤٥٢ – عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ: أَنَّهُ صَنَعَ طَعَاماً، فَدَعَا إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِي وَإِبْرَاهِيمَ التَّيْمِي وَسَلَمَةَ بْنَ كُهَيْلٍ وَذَرّاً وأُنَاساً مِنْ وُجُوهِ الْقُرَّاءِ فَأَمَرَ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِي، فَقَصَّ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّوْا فِي الْبُيُوتِ فِي جَمَاعَةٍ، وَلَمْ يَخْرُجُوا إِلَى الْمَسْجِدِ، ثُمَّ جَاءَهُمْ بِالطَّعَامِ. [هق٣/٦٧].

**ژ حەبیبێ کورێ ئەبی سابتی (ﷺ) وی خوارنەك چێ کربوو و ئیبراهیمێ نەخەعی و ئیبراهیمێ تەمیمی و سەلەمەیێ کورێ کوهەیلی و زەڕ و خەلکەك ژ ناڤدارێت قورئان خوینان گازیکرن، ئینا فەرمان ل ئیبراهیمێ تەمیمی کر چیرۆك بۆ وان گۆت، پاشی دەمێ نڤێژێ هات و وان نڤێژ ل مال کر، و نەچۆنە مزگەفتێ، پاشی خوارن بۆ وان ئینا.**

## ٢٦ . باب: ما أدرك مع الإمام فهو أول صلاته.

**بابەتێ: ئەوا د گەل ئیمامی دگەهیتێ ئەو دەستپێکا نڤێژا وییە.**

١٤٥٣ – عَنْ عَلِي رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: مَا أَدْرَكْتَ فَهُوَ أَوَّلُ صَلاَتِكَ. [هق٢/٢٩٨].

**ژ عەلی (ﷺ) وی گۆت: ئەوا تو دگەهییێ ئەو دەستپێکا نڤێژا تەیە.**

١٤٥٤ – عَنْ رَبِيعَةَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ وَأَبَا الدَّرْدَاءِ رضي الله عنهما قَالاَ: مَا أَدْرَكْتَ مِنْ آخِرِ صَلاَةِ الإِمَامِ، فَاجْعَلْهُ أَوَّلَ صَلاَتِكَ. [هق٢/٢٩٨].

**ژ رەبیعەی (ﷺ) گۆت: عومەرێ کورێ خەتتابی و ئەبو دەردائی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: ئەوا تو ل دویماهییا نڤێژێ د گەل ئیمامی دگەهییێ دانە دەستپێکا نڤێژا تەیە.**

## ٢٧ . باب: المسبوق يكتفي بتكبيرة الإحرام.

**بابەتێ: یێ نەگەهشتیە نڤێژێ تەکبیرەك تنێ بەسی وییە.**

١٤٥٥ – عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ إِذَا أَتَيَا الإِمَامَ وَهُوَ رَاكِعٌ كَبَّرَا تَكْبِيرَةً وَيَرْكَعَانِ بِهَا. [هق٢/٩١].

ژ ئیبن شهابی (رحمه الله) گۆت: ئیبن عومەری و زەیدێ كوڕێ سابتی (خودێ ژ وان رازی بیت) ئەگەر هاتبانە نڤێژێ و ئیمام د ركوعێدابا ئێك تەكبیر تنێ دكرن و دچۆنە ركوعێ.

١٤٥٦ - عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: إِنْ أَدْرَكَهُمْ رُكُوعاً أَوْ سُجُوداً أَوْ جُلُوساً يُكَبِّرُ تَكْبِيرَتَيْنِ. [هق٢/٩١].

ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر د ركوعێدا یان د سوجدێدا یان د تەحیاتێدا گەهشتبا وان دو تەكبیر دكرن[1].



(١) رامانا ڤێ نەڤەیە: تەكبیرەك ب تنێ دورستە و دو تەكبیر ژی دورستە.

پەرستن

الكتاب السابع:

صلاة الجمعة والعيدين والكسوف والإستسقاء والخوف.

# کتێبا حەفتێ:

# نڤێژا خوتبێ و هەردو جەژنان

# و رۆژگەیرینێ و بارانێ و ترسێ.

## الفصل الأول: صلاة الجمعة

## پشکا ئێکێ: نڤێژا خوتبێ

### ١ ـ باب: فضيلة يوم الجمعة.

### بابەتێ: قەدرێ نڤێژا خوتبێ.

١٤٥٧ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وعَنْ حُذَيْفَةَ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَضَلَّ اللهُ عَنِ الْجُمُعَةِ مَنْ كَانَ قَبْلَنَا، فَكَانَ لِلْيَهُودِ يَوْمُ السَّبْتِ، وَكَانَ لِلنَّصَارَى يَوْمُ الأَحَدِ، فَجَاءَ اللهُ بِنَا، فَهَدَانَا اللهُ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، فَجَعَلَ الْجُمُعَةَ وَالسَّبْتَ وَالأَحَدَ. وَكَذلِكَ هُمْ تَبَعٌ لَنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، نَحْنُ الآخِرُونَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، وَالأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، الْمَقْضِيُّ لَهُمْ قَبْلَ الْخَلاَئِقِ**).[م٨٥٦].

ژ ئەبو هورەیرە و ژ حوزەیفە (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**خودێ یێت بەری مە ژ خوتبێ بەرزەکرن، رۆژا شەمبی یا جوهیانە و رۆژا ئێك شەمبی یا فەلانە، و خودێ ئەم ئینایین و بەرێ مە دا رۆژا خوتبێ، و کرە خوتبە و شەمبی و ئێك شەمب، و هۆسا رۆژا قیامەتێ ئەو دویکەفتێت مەنە، و ئەم ژ خەلکێ دنیایێ یێت دویماهییێنە بەلێ یێت ئێکێینە رۆژا قیامەتێ حوکم بەراهیيا هەمی خەلکی بۆ مە دهێتە کرن**).

١٤٥٨ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ: فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ**).[م٨٥٤].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**خێرترین رۆژ، رۆژ ل سەر هەلاتی رۆژا ئەینییە: د وێدا ئادەم یێ هاتییە چێکرن، و د وێدا یێ کرییە د بەحەشتێدا، و د وێدا یێ ژێ هاتییە دەرێخستن و رۆژا قیامەتێ نارابیت د رۆژا خوتبەدا نەبیت**).

١٤٥٩ – عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاَةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ**). قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلاَتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرِمْتَ ـ يَقُولُونَ: بَلِيتَ ـ؟ فَقَالَ: (**إِنَّ اللهَ عزّ وجل حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَجْسَادَ الأَنْبِيَاءِ**).[د١٠٤٧/ ن١٣٧٣/ جه١٠٨٥/ مي١٥٧٢].

* صحيح.

ژ ئەوسێ كوڕێ ئەوسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی رۆژا هەوە یا ژ هەمیان قەدرتر رۆژا ئەینییە، د وێدا ئادەم پێ هاتییە چێكرن، و د وێدا جانێ وی پێ هاتییە كێشان، و پفكرنا بووڤێ یا د وێدا[1]، و مرنا گشتی[2] كو دەستپێكا رۆژا ڤیامەتێیە یا د وێدا، لەوا گەلەك سەلەواتان تێدا بدەنە سەر من، ب راستی سەلەواتێت هەوە بۆ من دئێنە ڤەگوهاستن)**، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ چاوا بۆ تە دئێنە ڤەگوهاستن و تو پێ بوویە ئاخ (ئانكو پێ مری)؟ دبێژن: تو پێ بوویە ئاخ، ئینا گۆت: **(ب راستی خودایێ هەر ب هێز و مەزن لەشێ پێغەمبەران پێ ل سەر عەردی حەرام كری)**.

## ٢ ـ باب: الساعة التي في يوم الجمعة.

**بابەتێ: ئەو دەمێ دوعا ڤەبویلكرنێ د رۆژا خوتبەدا.**

١٤٦٠ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) ذَكَرَ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَقَالَ: **(فِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ، وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللهَ تَعَالَى شَيْئاً، إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ)**. وَأَشَارَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا.[خ٩٣٥/ م٨٥٢].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەحسێ رۆژا خوتبە كر و گۆت: **(وەختەك پێ د رۆژا ئەینیدا هەی، نینە بەندەیەكێ موسلمان بكەڤیتە تێدا، و ئەو ژ پیاڤە بیت نڤێژێ بكەت، و دوعا ژ خودێ بكەت، هەكە خودێ تشتێ داخوازكری نەدەتێ. و ئیشارەت كرە دەستێ خۆ كێم دانا)**[3].

١٤٦١ – (م) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي شَأْنِ سَاعَةِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلاَةُ)**. [م٨٥٣].

ژ ئەبی بوردەیێ كوڕێ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (ﷺ)، گۆت: عەبدوللایێ كوڕێ عومەری گۆتە من: تە گوه لێ بوویە بابێ تە تشتەك ل سەر وەختێ ڤەبویلبوونا دوعایێ یا رۆژا خوتبە ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەگوهازتی؟ گۆت: من گۆت: بەلێ، من

---

(١) دو پفكرن پێت هەین، پفا ئێكێ كەس ل سەر روییێ عەردی ساخ نامینیت و دێ مریت و پفا دووێ هەمی دێ ساخ بن بۆ مەیدانا حەشرێ.

(٢) مرنا ب كۆمییە و نەڤ نیشانە پشتێ وێ دەستپێكرنا ڤیامەتێیە.

(٣) ئانكو: ب ئیشارەتا دەستێ خۆ دیار كر ئەو وەخت پێ كێمە.

**گوه لێ بوو دگۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ئەو وەخت ئەوە یێ د ناڤبەرا روینشتنا ئیمامی (ل سەر مینبەرێ) هەتا نڤێژ خلاس دبیت).**

١٤٦٢ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**يَوْمُ الْجُمُعَةِ ثِنْتَا عَشْرَةَ . يُرِيدُ سَاعَةً . لاَ يُوجَدُ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللهَ عزّ وجل شَيْئاً؛ إِلاَّ أَتَاهُ اللهُ عزّ وجل، فَالْتَمِسُوهَا آخِرَ سَاعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ**). [د١٠٤٨/ ن١٣٨٨]

* صحيح.

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) **گۆت: (رۆژا خوتبە دوازدەنە ـ مەبەست دوازدە دەمن[1] ـ نینە موسلمان تشتەكی تێدا ژ خودێ بخوازیت ئەگەر خودایێ هەر ب هێز و مەزن نەدەتێ، ل دویماهیك دەمێ پشتی ئێڤاری لێ بگەریێن).**

## ٣ ـ باب: الغسل يوم الجمعة.

## بابەتێ: سەرشویشتنا رۆژا خوتبێ.

١٤٦٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ؛ فَلْيَغْتَسِلْ**). [خ٨٧٧/ م٨٤٤].

ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) **گۆت: (هەكە ئێك ژ هەوە هاتە خوتبێ بلا سەرێ خۆ بشۆت).**

١٤٦٤ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْغَسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ**). [خ٨٥٨/ م٨٤٦].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(سەرشویشتنا رۆژا خوتبە واجبە ل سەر هەر بالغەكی).**

١٤٦٥ - عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ تَوَضَّأَ يومَ الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، وَمَنِ اغْتَسَلَ فَهُوَ أَفْضَلُ**). [د٣٥٤/ ت٤٩٧/ ن١٣٧٩/ مي١٥٨١]

* حسن.

---

(١) ئانكو: دەمێ رۆژا خوتبە بكە دوازدە پشك و پشكا دویماهییێ پشتی ئێڤاری خەمێ ژێ بخۆ.

ژ سەمورەی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ دەستنڤێژا خۆ رۆژا خوتبە بشۆت باشە، و یێ سەرێ خۆ بشۆت، سەرشویشتن چێترە).

١٤٦٦ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ، فَدَنَا وَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ، وَزِيَادَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ. وَمَنْ مَسَّ الْحَصَى فَقَدْ لَغَا).

[د١٠٥٠/ ت٤٩٨/ جه١٠٩٠]

* صحيح.

[وانظر: ١٤٧٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ دەستنڤێژا خۆ بشۆت، دورست بشۆت، و بێتە خوتبێ، و گوهێ خۆ بدەتێ و خۆ بێ دەنگ بكەت، گونەهێت وی مابەینا وی و ئەینییێ هاتنە ژێبرن، و سێ رۆژێت دی ژی ل سەر زێدە، و هەركەسێ دەستێ خۆ بكەتە حەسحاسان[1] ئەو ئاخفت، یان كەفتە د باتلیدا، یان خوسارەت بوو، یان تشتەكێ نەهەژی كر).**

٤ ـ باب: الطيب للجمعة.

**بابەتێ: بێهنخۆشییێ بۆ خوتبێ.**

١٤٦٧ – (خ) عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (لاَ يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ، أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَلاَ يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الإِمَامُ؛ إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الجُمُعَةِ الأُخْرَى).

[خ٨٨٣].

**ژ سەلمانێ فارسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە ئێك ژ هەوە رۆژا خوتبێ خۆ بشۆت و هندی بشێت خۆ پاقژكەت، و خۆ ب دوونێ خۆ دووندەت، یان گولاڤا مالا خۆ ل خۆ بدەت، و پاشی دەركەڤیت و دو مرۆڤان لێكڤە نەكەت، (ئانكو دووان لێك نەدەتە پاش و د مابەینا واندا روینیتە خوار) پاشی هند سونەتان بكەت**

(١) ئانكو: یاریان پێ بكەت، یان دەمێ دچیتە سوجدێ دەستێ خۆ بدەتێ بۆ خۆ دەشت كەت، نەڤە چونكی هینگێ مزگەفتا پێغەمبەری ﷺ نە یا رائێخستی بوو.

**هندی خودێ بۆ نڤیسین، پاشی گوهێ خۆ بدەتە ئیمامی هەكە ئاخفت، هەكە خودێ گونەهێت وی یێت مابەینا خوتبا وی و یا دیدا ژێ نەبەت).**

٥ ـ باب: فضل التبكير إلى الجمعة.

**بابەتێ: زویچۆنا خوتبێ.**

١٤٦٨ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الجُمُعَةِ غُسْلَ الجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشاً أَقْرَنَ، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ حَضَرَتِ المَلاَئِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ).

[خ٨٨١/ م٨٥٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ رۆژا خوتبە سەرێ خۆ بشۆت، وەكی سەرشویشتنا جەنابەتێ، پاشی وەختێ ئێكێ بچیتە خوتبێ هەروەكی حێشترەك كرییە خێر، و یێ سەعەتا دووێ بچیت هەروەكی چێلەك كرییە خێر، و یێ سەعەتا سێیێ بچیت هەروەكی بەرخەكێ ب شاخ كرییە خێر، و یێ سەعەتا چارێ بچیت هەروەكی مریشكەك كرییە خێر، و یێ سەعەتا پێنجێ بچیت هەروەكی هێكەك كرییە خێر، و هەكە ئیمام رابوو دا خوتبێ بخوینیت ملیاكەت بەرهەڤ دبن دا گوهێ خۆ بدەنە زكری).**

٦ ـ باب: وقت الجمعة.

**بابەتێ: دەمێ خوتبێ.**

١٤٦٩ – (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) الجُمُعَةَ ثُمَّ نَنْصَرِفُ، وَلَيْسَ لِلْحِيطَانِ ظِلٌّ نَسْتَظِلُّ فِيهِ. [خ٤١٦٨/ م٨٦٠]

- وفي رواية لمسلم: ثُمَّ نَرْجِعُ نَتَتَبَّعُ الْفَيْءَ.

**ژ سەلەمەیێ كورێ ئەكوەعی (رضي الله عنه) گۆت: مە نڤێژا خوتبێ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دكر پاشی ئەم دزڤرین و دیواران سیبەر نەبوون خۆ بدەینە بەر.**

- **و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: پاشی ئەم دزڤرین ل سیبەرێ دگەریاین.**

١٤٧٠ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كانَ يُصَلِّي الجُمُعَةَ حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ. [خ٩٠٤]

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دەمێ رۆژ ل نیڤا عەسمانی خوارکەتبا نڤێژاخوتبێ دکر.**

## ٧ ـ باب: الأَذان يوم الجمعة.

## بابەتێ: بانگی ل رۆژا خوتبە.

١٤٧١ - (خ) عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قالَ: إِنَّ الأَذَانَ يَوْمَ الجُمُعَةِ كَانَ أَوَّلُهُ حِينَ يَجْلِسُ الإِمَامُ يَوْمَ الجمُعَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما، فَلَمَّا كَانَ فِي خِلاَفَةِ عُثْمَانَ رضي الله عنه، وَكَثُرُوا، أَمَرَ عُثْمانُ يَوْمَ الجُمُعَةِ بِالأَذَانِ الثَّالِثِ، فَأُذِّنَ بِهِ عَلَى الزَّوْرَاءِ، فَثَبَتَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ. [خ٩١٦ (٩١٢)].

**ژ سائیبێ كوڕێ یەزیدی گۆت: ب ڕاستی بانگ رۆژا خودبێ ل دەستپێكا وی ئەو بوو دەمێ ئیمام رۆژا خوتبە ل سەر مینبەرێ دروینشتە خوارێ ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبی بەكری و عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت)، ڤێجا دەمێ بوویە خیلافەتا عوسمانی (ﷺ) و خەلك زێدە بووین، عوسمانی فەرمان ب بانگێ سێیێ ل رۆژا خوتبە كر، بانگ ل سەر زەورائێ هاتە دان[1]، و ئەڤ كارە ل سەر ڤێ چەندێ بنەجه بوو.**

## ٨ ـ باب: الخطبة لصلاة الجمعة.

## بابەتێ: گۆتارێ بۆ نڤێژا خوتبێ.

١٤٧٢ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) خُطْبَتَانِ يَجْلِسُ بَيْنَهُمَا، يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيُذَكِّرُ النَّاسَ. [م٨٦٢].

**ژ جابرێ كوڕێ سەمورەی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دو گۆتار دخواندن و د ناڤبەرا واندا دروینشتە خوارێ و قورئان دخواند بیرا خەلكی دئینا.**

١٤٧٣ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ، وَعَلاَ صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ، حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ، يَقُولُ: صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ! وَيَقُولُ: (**بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ**

---

(١) زەوراء جهەكە یان خانییەكە ل بازارێ مەدینەیێ بوو.

كَهَاتَيْنِ) وَيَقْرُنُ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى. وَيَقُولُ: (أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيْرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ). ثُمَّ يَقُولُ: (أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْناً أَوْ ضَيَاعاً فَإِلَيَّ وَعَلَيَّ). [م٨٦٧].

ژ جابری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ خوتبە دخواند چاڤێت وی سۆر دبوون، و دەنگێ وی بلند دبوو، و كەربا وی زێدە دبوو دا بێژی مە ب هاتنا لەشكەرەكی دترسینیت و دبێژیت: سپێدێ ب سەرڕوەدا گرت و ئێڤاری ب سەرڕوەدا گرت و دگۆت: **(ئەز و قیامەت وەكی ڤان هەردوكاینە)**، و هەردو تلێت خۆ یا نیڤێ و یا شەهدێ دگەهاندنە ئێك[1] و دگۆت: **(ئەڤە و پاشی، ب راستی چێترین ئاخفتن ئاخفتنا خودێیە، و باشترین رێك رێكا موحەممەدییە (ﷺ) و خرابترین كار و بار ئەون ئەوێت نوی د دینیدا دئێنە كرن، و ب راستی هەر بیدعەكا[2] هەبیت یا پویچە، پاشی دگۆت: ئەز ژ هەمی موسلمانان نێزیكترم بۆ وی، هەركەسێ مالەك و سەمیانەك پاش خۆ هێلابیت بۆ مالا وییە، و یێ دەین و قەرەك یان زارۆكێت بێ كەس و هەوجە پاش خۆ هێلابن ئەز سەركار و هاریكارێ وانم)**.

١٤٧٤ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). فَكَانَتْ صَلاَتُهُ قَصْداً، وَخُطْبَتُهُ قَصْداً. [م٨٦٦].

ژ جابرێ كوڕێ سەمورەی (ﷺ) گۆت: من نڤێژ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دكر و نڤێژا وی یا ناڤنجی بوو و گۆتارا وی ژی یا ناڤنجی بوو.

### ٩ . باب: الإنصات للخطبة يوم الجمعة.

### بابەتێ: خۆبێدەنككرن و گوهداریكرنا خوتبێ ل رۆژا خوتبە.

١٤٧٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: أَنْصِتْ، وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، فَقَدْ لَغَوْتَ ). [خ٩٣٤/ م٨٥١]

---

(١) ئیشارەت بۆ نێزیكبیا رۆژا قیامەتێ بشتی پێغەمبەر ﷺ هاتییە هنارتن.

(٢) بیدعە ئەو تشتە یێ نوی د شەریعەتیدا و چو بنیات و بەلگەیێ شەرعی بۆ نەبیت.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (ئەگەر رۆژا خوتبە تە گۆتە هەڤالێ خۆ بێدەنگ ببە و ئیمام یێ خوتبێ دخوینیت، ئەو تو ئاخفتی، یان تو کەفتییە د باتلیدا، یان تو خوسارەت بووی، یان تە تشتەکێ نەهەژی کر).**

١٤٧٦ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنِ اغْتَسَلَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ، فَصَلَّى مَا قُدِّرَ لَهُ، ثُمَّ أَنْصَتَ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ خُطْبَتِهِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَعَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى، وَفَضْلُ ثَلاَثَةِ أَيَامٍ**).. [م٨٥٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (هەر کەسێ سەرێ خۆ بشۆت، پاشی بهێتە خوتبێ، ـ نڤێژ ـ ڤێجا هندی خودێ بۆ حەز کری سونەت کرن، پاشی بێدەنگ بوو و گوهدارییا خوتبا وی کر هەتا ب دویماهی هاتی، پاشی نڤێژ د گەل وی کر، گونەهێت وی مابەینا وی و ئەینییێ هاتنە ژێبرن، و سێ رۆژێت دی ژی ل سەر زێدە).**

## ١٠ ـ باب: تحية المسجد والإمام يخطب.

## بابەتێ: سونەتا سلاڤا مزگەفتێ دەمێ ئیمام گۆتارێ دخوینیت.

١٤٧٧ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ يَخْطُبُ (**إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ ـ أَوْ قَدْ خَرَجَ ـ فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ**). [خ١١٧٠/ م٨٧٥].

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) و وی گۆتار دخواند: (ئەگەر ئێك ژ هەوە هات و ئیمام یێ خوتبێ دخوینیت ـ یان ئیمام دەرکەفتبیت ـ بلا بەری روینیت دو رکعەتان بکەت).**

## ١١ ـ باب: ما يقرأ في صلاة الجمعة

## بابەتێ: چ د نڤێژا خوتبێدا دئێتە خواندن

١٤٧٨ - (م) عَنِ النعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَفِي الْجُمُعَةِ، بـ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾، وَ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ﴾.

قَالَ: وَإِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ، يَقْرَأُ بِهِمَا أَيْضاً فِي الصَّلاَتَيْنِ. [م٨٧٨]

**ژ نەعمانێ کوڕێ بەشیری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د هەردو جەژناندا و د خوتباندا ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ و ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ﴾ دخواند.**

**و گۆت: ئەگەر جەژن و خوتبە د ئێك رۆژدا د گەلێك کۆمببانە، د هەردو نڤێژاندا هەر ئەو هەردو دخواندن.**

### ١٢ ـ باب: ما يقرأ في فجر الجمعة.

### بابەتێ: ج د نڤێژا سپێدا رۆژا خوتبەدا دهاتە خواندن.

١٤٧٩ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقْرَأُ فِي الجُمُعَةِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ: ﴿الٓمٓ ① تَنزِيلُ﴾ [السَّجْدَةَ]، وَ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾[الإنسان]. [خ٨٩١/ م٨٨٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ل رۆژا خوتبە و د نڤێژا سپێدێدا ﴿(الٓمٓ تَنزِيلُ﴾ و ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾ دخواندن.**

### ١٣ ـ باب: الصلاة بعد الجمعة.

### بابەتێ: نڤێژا پشتی نڤێژا خوتبێ.

١٤٨٠ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الجُمُعَةَ، فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعاً**). [م٨٨١].

زاد في رواية: (**فَإِنْ عَجِلَ بِكَ شَيْءٌ، فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ فِي الْمَسْجِدِ، وَرَكْعَتَيْنِ إِذَا رَجَعْتَ**).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەکە ئێکی ژ هەوە نڤێژا خوتبێ کر بلا چار رکعەتان پشتی وێ بکەت).**

**و د ریوایەتەکێدا زێدەکرییە: (ئەگەر تشتەکی لەز ل تە کر، دو رکعەتان ل مزگەفتێ بکە و دو رکعەتان ئەگەر تو زڤری).**

١٤٨١ – (م) عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُمَرُ بْنُ عَطَاءِ بْنِ أَبِي الْخُوَارِ: أَنَّ نَافِعَ بْنَ جُبَيْرٍ أَرْسَلَهُ إِلَى السَّائِبِ ابْنِ أُخْتِ نَمِرٍ، يَسْأَلُهُ عَنْ شَيْءٍ رَآهُ مِنْهُ مُعَاوِيَةُ فِي الصَّلاَةِ، فَقَالَ: نَعَمْ صَلَّيْتُ مَعَهُ الْجُمُعَةَ فِي الْمَقْصُورَةِ، فَلَمَّا سَلَّمَ الإِمَامُ قُمْتُ فِي مَقَامِي، فَصَلَّيْتُ، فَلَمَّا دَخَلَ أَرْسَلَ إِلَيَّ فَقَالَ: لاَ تَعُدْ لِمَا

فَعَلْتَ، إِذَا صَلَّيْتَ الْجُمُعَةَ فَلاَ تَصِلْهَا بِصَلاةٍ، حَتَّى تَكَلَّمَ أَوْ تَخْرُجَ؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَمَرَنَا بِذَلِكَ، أَنْ لاَ تُوصَلَ صَلاَةٌ بِصَلاَةٍ، حَتَّى نَتَكَلَّمَ أَوْ نَخْرُجَ. [م٨٨٣].

**ژ ئیبن جورەیجی (رحمه الله) گۆت: عومەرێ كورێ عەتائێ كورێ ئەبی خواری گۆتە من: نافعێ كورێ جوبەیری ئەو ڤرێكرە دەڤ سائیبێ كورێ خویشكا نەمری، پرسیارا وی بكەت ژ تشتەكی موعاوییەی ژێ دیتبوو، ئینا گۆت: بەلێ، من نڤێژا خوتبێ د گەل وی كر ل ژۆرەكا مزگەفتێڤە، ڤێجا دەمێ ئیمامی سلاڤا ملان ڤەدای، ئەز ژ جهێ خۆ رابووم و من سونەت كر، و دەمێ هاتییە د ژۆرڤە جابا من هنارت و گۆت: وەنەكەڤە: هەكە تە نڤێژا خوتبێ كر سونەتێ نەكە هەتا تو دئاخڤی یان دەردكەڤی، ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا مە ب ڤێ یا كری، ئەم نڤێژێ ب نڤێژێڤە گرێ نەدەین هەتا ئەم نەئاخڤین یان نەدەركەڤین.**

## ١٤ ـ باب: الرخصة بعدم حضور الجمعة في المطر.

## بابەتێ: دەستویردانێ بۆ نەهاتنا نڤێژا خوتبێ د بارانێدا.

١٤٨٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الحارِثِ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ لِمُؤَذِّنِهِ فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ: إِذَا قُلْتَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، فَلاَ تَقُلْ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، قُلْ: صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ، فَكَأَنَّ النَّاسَ اسْتَنْكَرُوا، قَالَ: فَعَلَهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي، إِنَّ الجُمُعَةَ عَزْمَةٌ، وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أُحْرِجَكُمْ، فَتَمْشُونَ فِي الطِّينِ وَالدَّحَضِ. [خ٩٠١ (٦١٦)/ م٦٩٩].

**ژ عەبدوللایێ كورێ حارسی (رحمه الله) گۆت: ئیبن عەباسی د رۆژەكا باراندا گۆتە بانگدەرێ خۆ ئەگەر تە گۆت: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ) نەبێژە: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)، بێژە: نڤێژا خۆ ل مالێت خۆ بكەن، و هەروەكی خەلكی ئەڤە دورست نەدیت، ئینا گۆت، یێ ژ من باشتر ئەڤە یا كری، خوتبە ئەركەكێ پێدڤییە[1] و من نەدڤیا ئەز هەوە دەربێخم هوین ل تەڤنێ و تەحسینۆكێ بچن.**

(١) و ئەگەر من گۆتبا (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ) ڤیابا هوین هاتبان و دا نەڤە بیتە نەگەرێ زەحمەتێ بۆ هەوە.

## ١٥ ـ باب: وجوب الجمعة والتغليظ في تركها.

## بابەتێ: واجببوونا خوتبێ و توندكرن د هێلانا وێدا.

١٤٨٣ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ وَأَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ عَلَى أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ: **(لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ).** [م٨٦٥].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری، (خودێ ژ هەردووان رازی بیت)، گۆتن: مە گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) ل سەر دارێت مینبەرا خۆ دگۆت: (هندە كەس یان دێ هێلانا خوتبا بەسكەن یان خودێ دێ سەر دلێت وان مۆركەت، پاشی دێ ژ بێ ئاگەهان بن).**

١٤٨٤ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ لِقَوْمٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الجُمُعَةِ: **(لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلاً يُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ أُحَرِّقَ عَلَى رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنِ الجُمُعَةِ بُيُوتَهُمْ).** [م٦٥٢].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) د راستا هندە كەساندا یێت نەهاتینە خوتبێ گۆت: (نێزیك بوو ئەز فەرمانێ ل زەلامەكی بكەم بەری خەلكی نڤێژێ بكەت، پاشی ئەز مالێت هندە زەلامان د سەرێ واندا بسۆژم یێت نەهاتینە خوتبێ.**

١٤٨٥ - عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ ـ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ ـ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ تَرَكَ ثَلاَثَ جُمَعٍ تَهَاوُناً بِهَا طَبَعَ اللهُ عَلَى قَلْبِهِ).** [د١٠٥٢/ ت٥٠٠/ ن١٣٦٨/ جه ١١٢٥/ مي١٦١٢].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی جەعدێ زومەری (رضي الله عنه) و وی هەڤالینی د گەل پێغەمبەری (ﷺ) هەبوو گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ سێ خوتبەیان ژ سستی و بێخەمی بهێلیت خودێ دێ ل سەر دلێ وی مۆركەت).**

١٤٨٦ - عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ؛ إِلاَّ أَرْبَعَةً: عَبْدٌ مَمْلُوكٌ، أَوْ امْرَأَةٌ، أَوْ صَبِيٌّ، أَوْ مَرِيضٌ).** [د١٠٦٧].

* صحيح.

ژ تارقێ کورێ شیهابی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(خوتبە ب جەماعەت حەقەکێ پێدڤییە ل سەر هەر موسلمانەکێ هەبیت چوار تێ نەبن: بەندەیەکێ کۆلە، یان ژن، یان زارۆك، یان نەساخ)**[1].

## ١٦ ـ باب: تحريم البيع وقت الجمعة.

### بابەتێ: حەرامکرنا کرین و فرۆتنێ د دەمێ خوتبێدا.

١٤٨٧ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: يَحْرُمُ الْبَيْعُ حِينَئِذٍ.

وعَنْ عَطَاءٍ قَالَ: تَحْرُمُ الصِّنَاعَاتُ كُلُّهَا.

وعَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: إِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَهُوَ مُسَافِرٌ، فَعَلَيْهِ أَنْ يَشْهَدَ. [خ. الجمعة، باب ١٨]

**ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: فرۆتن هینگێ حەرامە.**

**ژ عەتائی (ﷺ) گۆت: هەمی کار حەرام دبن.**

**و ژ زوهری (ﷺ) گۆت: ئەگەر بانگدەری رۆژا خوتبە بانگ دا و ئەو رێڤنگ بیت دڤێت ئامادە ببیت.**

## ١٧ ـ باب: استقبال الإمام وهو يخطب.

### بابەتێ: بەرێخۆدانا ئیمامی دەمێ ئەو خوتبێ دخوینیت.

١٤٨٨ - عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا اسْتَوَى عَلَى الْمِنْبَرِ، اسْتَقْبَلْنَاهُ بِوُجُوهِنَا. [ت٥٠٩].

* صحيح.

**ژ ئیبن مەسعودی (ﷺ) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب سەر مینبەرێ دکەفت مە بەرێ خۆ ددا وی.**

## ١٨ ـ باب: الزينة ليوم الجمعة.

### بابەتێ: خەملاندنێ بۆ رۆژا خوتبە.

١٤٨٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلَامٍ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(مَا عَلَى أَحَدِكُمْ إِنْ وَجَدَ . أَوْ إِنْ وَجَدْتُمْ . أَنْ يَتَّخِذَ ثَوْبَيْنِ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، سِوَى ثَوْبَيْ مِهْنَتِهِ)**. [د١٠٧٨/ جه١٠٩٥].

* صحيح.

---

[1] دیسا یێ رێڤنگ ژی و هەرکەسێ دەستویرییەك هەبیت ژ نفێژا جەماعەت ڤەمینیت ئەو دەستویرە ژ خوتبێ ژی ڤەمینیت.

ژ عەبدوللایێ كوڕێ سەلامی (ڕەزی خودێ لێ بیت) وی گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: (دێ چ ل سەر ئێك ژ هەوە كەڤیت ئەگەر وی هەبیت یان هەوە هەبیت ئەوی دو جلك بۆ ڕۆژا خوتبە هەبن ژ بلی جلكێت خۆ یێت شۆلێ خۆ).

## ١٩ ـ باب: كراهة تخطي الرقاب في الجمعة.

### بابەتێ: نەباشییا بۆڕینا د سەر ستۆیانڕا ل ڕۆژا خوتبە.

١٤٩٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَالنَّبِيُّ (ﷺ) يَخْطُبُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): (اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ). [د١١١٨/ ن١٣٩٨]

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ كوڕێ بوسری (ڕەزی خودێ لێ بیت) گۆت: زەلامەك ڕۆژا خوتبە هات و د سەر ستۆیێت خەلكیڕا دبۆری و پێغەمبەری (ﷺ) خوتبە دخواند، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: (ڕوینە خوار تە ئەزیەت كر).

## ٢٠ ـ باب: النعاس في صلاة الجمعة.

### بابەتێ: نقرۆسكا د خوتبێدا.

١٤٩١ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ؛ فَلْيَتَحَوَّلْ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ إِلَى غَيْرِهِ). [د١١١٩/ ت٥٢٦]

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: من گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە د نقرۆسك چۆ و ئەو ل مزگەفتێ بلا جهێ خۆ یێ ئەو لێ بۆ ئێكێ دی بگوهۆڕیت).



## الفصل الثاني: صلاة العيدين

## پشكا دووێ: نڤێژا هەردو جەژنان

### ١ . باب: صلاة العيد قبل الخطبة

### بابەتێ: نڤێژا جەژنێ بەری گوتارێیە

١٤٩٢ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرَ رضي الله عنهما، يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الخُطْبَةِ. [خ٩٦٣/ م٨٨٨]

- وفي رواية للبخاري: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يُصَلِّي فِي الأَضْحَى وَالْفِطْرِ، ثُمَّ يَخْطُبُ بَعْدَ الصَّلاَةِ. [خ٩٥٧]

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبوبەكری و عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) نڤێژا هەردو جەژنان بەری خوتبێ دكرن.**

- **و د ڤەگێرا بوخاریدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا جەژنا قوربانی و رەمەزانێ دكر پاشی خوتبە پشتی نڤێژێ دخواند.**

١٤٩٣ - (ق) عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَوْمَ الْفِطْرِ فَصَلَّى، فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ ثُمَّ خَطَبَ، فَلَمَّا فَرَغَ نَزَلَ فَأَتَى النِّسَاءَ، فَذَكَّرَهُنَّ وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلاَلٍ، وَبِلاَلٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ، يُلْقِي فِيهِ النِّسَاءُ الصَّدَقَةَ.

قُلْتُ لِعَطَاءٍ: زَكَاةَ يَوْمِ الْفِطْرِ؟ قَالَ: لاَ، وَلكِنْ صَدَقَةً يَتَصَدَّقْنَ حِينَئِذٍ تُلْقِي فَتَخَهَا، وَيُلْقِينَ. قُلْتُ: أَتُرَى حَقّاً عَلَى الإِمَامِ ذلِكَ يأْتِيهِنَّ وَيُذَكِّرُهُنَّ؟ قَالَ: إِنَّهُ لَحَقٌّ عَلَيْهِمْ، وَمَا لَهُمْ لاَ يَفْعَلُونَهُ؟.

[خ٩٧٨ (٩٥٨)/ م٨٨٥]

**ژ ئیبن جورەیجی (رحمه الله) گۆت: عەتائی ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی گۆتە من، گۆت: من گوه ل وی بوو دگۆت: پێغەمبەر (ﷺ) رۆژا جەژنا رەمەزانێ رابوو نڤێژ كر، دەست ب نڤێژێ كر، پاشی خوتبە خواند، ڤێجا دەمێ خوتبە تمام كری، خوارکەفت و هاتە دەڤ ژنان و شیرەت ل وان كرن، و وی خۆ دابوو سەر دەستێ بیلالی، و بیلای كۆشا خۆ ڤەكربوو، ژنان خێر و سەدەقێت خۆ دهاڤێتنە تێدا.**

**من گۆتە عەتائی: زەكاتا فترەیان بوو؟ گۆت: نەخێر، بەلێ سەدەقەك بوو وان د وی دەمیدا دكرن، حەلەقا خۆ دهاڤێت، و ئەڤە و ئەڤە دهاڤێتن، من گۆت: ئەرێ تو دبینی نەڤە ئەركە ل سەر ئیمامی بهێتە دەڤ ژنان وان شیرەت بكەت؟ گۆت: بەلێ ئەو ئەركە ل سەر وان، و ما بۆچی وێ ناكەن؟**

٢ ـ باب: لا أَذان ولا إقامة في العيد.

**بابەتێ: نە بانگ و نە قامەت د نڤێژا جەژنێدا هەیە.**

١٤٩٤ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، قَالاَ: لَمْ يَكُنْ يُؤَذَّنُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَلاَ يَوْمَ الأَضْحَى. [خ٩٦٠/ م٨٨٦]

زاد في رواية مسلم: قَالَ: أَخْبَرَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيُّ: أَنْ لاَ أَذَانَ لِلصَّلاَةِ يَوْمَ الْفِطْرِ، حِينَ يَخْرُجُ الإِمَامُ وَلاَ بَعْدَمَا يَخْرُجُ، وَلاَ إِقَامَةَ، وَلاَ نِدَاءَ، وَلاَ شَيْءَ. لاَ نِدَاءَ يَوْمَئِذٍ وَلاَ إِقَامَةَ.

**ژ ئیبن عەباسی و جابرێ كورێ عەبدوللایێ ئەنساری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: بانگ نە بۆ نڤێژا جەژنا رەمەزانێ دهاتە دان و نە بۆ نڤێژا جەژنا حەجییان.**

**د ڤەگێرەكا موسلمیدا زێدە كرییە. جابرێ كورێ عەبدوللایێ ئەنساری گۆتە من: رۆژا جەژنا رەمەزانێ بانگ بۆ نڤێژێ نینە دەمێ ئیمام دەردكەڤیت و نە پشتی دەردكەڤیت و نە قامەت و نە بانگ و نە چو تشت نە بانگ وی دەمی هەیە و نە قامەت.**

٣ ـ باب: لا صلاة قبل العيد ولا بعدها.

**بابەتێ: سونەت بەری نڤێژا جەژنێ و پشتی وێ نینە.**

١٤٩٥ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى يَوْمَ الفِطْرِ رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ، فَأَمَرَهُنَّ بالصَّدَقَةِ، فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ، تُلْقِي المرْأَةُ خُرْصَهَا وَسِخَابَهَا.

[خ٩٦٤ (٩٨)/ م٨٨٤ (١٣)].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژا رۆژا جەژنا رەمەزانێ دو ركعەت كرن نە بەری وێ و نە پشتی وێ سونەت نەكر، و پاشی هاتە دەڤ ژنان و بیلال د گەل وی بوو، و فەرمانا وان ب سەدەقەیان كر ڤێجا دەستهاڤێتنێ سەدەقەیێت خۆ دان ڤێجا ژنێ گوهارك ددا و رستك (ستڤانك) ددا.**

### ٤ ـ باب: ما يقرأُ في صلاة العيدين.

### بابەتێ: ئەوا د نڤێژا هەردو جەژناندا دهێتە خواندن.

١٤٩٦ - (م) عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: سَأَلَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: عَمَّا قَرَأَ بِهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي يَوْمِ الْعِيدِ؟ فَقُلْتُ: بـ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾، وَ﴿قٓ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ۝١﴾.[م٨٩١].

[وانظر: ١٤٧٨].

**ژ ئەبی واقدێ لەیسی (رضي الله عنه) گۆت: عومەرێ کوڕێ خەتتابی پرسیارا ئەوا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د نڤێژا جەژنێدا خواندی ژ من کر؟ ئینا من گۆت: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾ و ﴿قٓ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ﴾ خواند.**

### ٥ ـ باب: خروج النساء إلى المصلى.

### بابەتێ: دەرکەفتنا ژنان بۆ نڤێژگەهێ[1].

١٤٩٧ - (ق) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: أُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ الْحُيَّضَ يَوْمَ الْعِيدَيْنِ، وَذَوَاتِ الْخُدُورِ، فَيَشْهَدْنَ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَدَعْوَتَهُمْ، وَيَعْتَزِلُ الْحُيَّضُ عَنْ مُصَلاَّهُنَّ. قَالَتِ امْرَأَةٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِحْدَانَا لَيْسَ لَهَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ: (**لِتُلْبِسْهَا صَاحِبَتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا**). [خ٣٥١ (٣٢٤)/ م٨٩٠]

**ژ ئوم عەتیەیێ (رضي الله عنها) گۆت: فەرمان ل مە هاتە کرن ئەم ژنێت د بێنڤێژییاندا و کچێت نەشویکری ل رۆژا هەردو جەژنان دەربێخین دا پشکداری جڤاتا موسلمانان و دوعایێت وان ببن و ژنێت د بێنڤێژییاندا خۆ ژ نڤێژگەهێت خۆ دویر بێخن، ئینا ژنەکێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئێکێ ژ مە سەرپۆشی نینە؟ گۆت: (بلا هەڤالا وێ سەرپۆشا خۆ بکەتە بەر وێ).**

### ٦ ـ باب: اللعب والغناء أيام العيد

### بابەتێ: یاری و ستران ل رۆژێت جەژنێ

١٤٩٨ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَعِنْدِي جارِيَتَانِ، تُغَنِّيَانِ بِغِنَاءِ بُعَاثَ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحوَّلَ وَجهَهُ. وَدخلَ أَبو بكْرٍ فَانْتَهرَنِي، وَقَالَ: مِزمارَةُ الشَّيطَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)! فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ: (**دَعْهُمَا**). فَلَمَّا غَفَلَ غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا.

---

(١) نڤێژگەه (مصلیٰ) جهەکێ تایبەتە ل دەرڤەی باژێری، موسلمانان نڤێژا هەردو جەژنان و نڤێژا بارانی لێ دکر.

وَكَانَ يَوْمَ عِيدٍ، يَلْعَبُ فيه السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، وَإِمَّا قَالَ: (**تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ**)، فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ، خَدِّي عَلَى خَدِّهِ، وَهُوَ يَقُولُ: (**دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ**)، حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ، قَالَ: (**حَسْبُكِ**) ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَاذْهَبِي**). [خ٩٤٩ و٩٥٠ (٤٥٤)/ م٨٩٢].

- وفي رواية لهما: قَالَتْ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ وَعِنْدِي جارِيَتَانِ مِنْ جَوَارِي الأَنْصَارِ، تُغَنِّيَانِ بِمَا تَقَاوَلَتِ الأَنْصَارُ يَوْمَ بُعَاثَ، قَالَتْ: وَلَيْسَتَا بِمُغَنِّيَتَيْنِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ فِي بَيْتِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)؟ وَذلِكَ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يَا أَبَا بَكْرٍ، إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيداً، وَهذَا عِيدُنَا). [خ٩٥٢].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ من و دو کچێت بچویك ل دەڤ من بوون، ستران ب رۆژا بوعاسێ[1] دگۆتن، ئینا خۆ ل جهێ خۆ درێژ کر، و بەرێ خۆ وەرگێرا، و ئەبوبەکر هات و ئەز پاشڤەبرم و گۆت: ئەرێ سترانێت شەیتانی ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێنە (ﷺ)؟! ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرێ خۆ دایێ و گۆت: (ژێ بگەرە) ڤێجا دەمێ بێئاگەهـ بووی، من چاڤکرێ دەرکەڤن، ئینا هەردو دەرکەفتن.**

**و ئەو رۆژ جەژن بوو و رەشپیستان ب روم و مەتالان یاری دکرن، یان من ژ پێغەمبەرێ (ﷺ) خواست یان وی گۆتە من: (تە دڤێت بەرێ خۆ بدەیێ)؟ من گۆت: بەلێ، ئینا ئەز پشت خۆ راوەستاندم و روییێ من ل سەر روییێ وی بوو و وی دگۆت: (دێ ئەی بەنی ئەرفیدە) هەتا ئەز بێزار بوویم گۆت: ( تە بەسە؟) من گۆت: بەلێ، گۆت: دێ هەرە.**

- **و د ریوایەتەکا هەردووواندا: عائیشایێ گۆت: ئەبوبەکر هاتە دەڤ من دو کچێت بچویك ژ کچێت ئەنساریيان ل دەڤ من بوون، ستران دگۆتن ب ئەوا ئەنساریيان ب رۆژا بوعاسێ دگۆتن، و ئەو سترانبێژ نەبوون، ئەبوبەکری گۆت: ئەرێ سترانێت شەیتانی د مالا پێغەمبەرێ خودێڤەنە (ﷺ)؟ و ئەو رۆژا جەژنێ بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی ئەبا بەکر هەر ملەتەکی جەژنا خۆ یا هەی، و ئەڤە جەژنا مەیە).**

١٤٩٩ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَسْتُرُنِي بِرِدَائِهِ، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى الحَبَشَةِ يَلْعَبُونَ فِي المَسْجِدِ، حَتَّى أَكُونَ أَنَا الَّتِي أَسْأَمُ، فَاقْدُرُوا قَدْرَ الجَارِيَةِ الحَدِيثَةِ السِّنِّ، الحَرِيصَةِ عَلَى اللَّهْوِ. [خ٥٢٣٦ (٤٥٤)/ م٨٩٢/١٨]

---

(١) بوعاس: ناڤێ شەرەکییە بەری ئیسلامێ د ناڤبەرا ئەوس و خەزرەجاندا رویدابوو، و ئەوس تێدا سەرکەفتبوون.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت ئەز ب جلكێ خۆ دڤەشارتم، و من بەرێ خۆ ددا حەبەشییان ل مزگەفتێ یاری دكرن، هەتا ئەز بێزارا ببام، ڤێجا كچا ژیێ وێ بچویك بەرچاڤ بگرن ئەوا هێژ حەژ یاریان دكەت.

## ٧ ـ باب: الأَكل يوم الفطر قبل الخروج.

**بابەتێ: خوارنێ ل رۆژا جەژنێ بەری دەركەفتنێ.**

١٥٠٠ - (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لاَ يَغْدُو يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ. وَيَأْكُلُهُنَّ وِتْراً. [خ٩٥٣].

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سپێدا رۆژا جەژنا رەمەزانێ دەرنەدكەفت هەتا چەند قەسپەك خواربان و ب كەت دخوارن.

١٥٠١ - عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) لاَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ، وَلاَ يَطْعَمُ يَوْمَ الْأَضْحَى حَتَّى يُصَلِّيَ. [ت٥٤٢/ جه١٧٥٦/ مي١٦٤١].

* صحيح.

ژ بورەیدەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ل سپێدا رۆژا جەژنا رەمەزانێ دەرنەدكەفت هەتا تشتەك خواربا و ل سپێدا رۆژا جەژنا حەجییان چو نەدخوار هەتا نڤێژ كربا.

## ٨ ـ باب: كراهة حمل السلاح في العيد وفي الحرم.

**بابەتێ: نەباشییا هەلگرتنا چەكی د جەژنێ و حەرەمێدا.**

١٥٠٢ - (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ، حِينَ أَصَابَهُ سِنَانُ الرُّمْحِ فِي أَخْمَصِ قَدَمِهِ، فَلَزِقَتْ قَدَمُهُ بِالرِّكَابِ، فَنَزَلْتُ فَنَزَعْتُهَا، وَذَلِكَ بِمِنًى، فَبَلَغَ الحَجَّاجَ، فَجَعَلَ يَعُودُهُ، فَقَالَ الحَجَّاجُ: لَوْ نَعْلَمُ مَنْ أَصَابَكَ؟ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَنْتَ أَصَبْتَنِي، قَالَ: وَكَيْفَ؟ قَالَ: حَمَلْتَ السِّلاَحَ فِي يَوْمٍ لَمْ يَكُنْ يُحْمَلُ فِيهِ، وَأَدْخَلْتَ السِّلاَحَ الحَرَمَ، وَلَمْ يَكُنِ السِّلاَحُ يُدْخَلُ الحَرَمَ. [خ٩٦٦].

ژ سەعیدێ كورێ جوبەیری (رحمه الله) گۆت: ئەز د گەل ئیبن عومەر بووم دەمێ سەركێ رومەكێ ژ بنێ پێ وی گرتی، پێ وی ب ركێبێڤە گرێدا، ئینا ئەز هاتمە خوارێ و من ژێ كێشا، و ئەڤە ل مینایێ بوو، و ئەڤ رویدانە گەهشتە حەجاجی، ئینا هاتە سەرەدانا وی، حەجاجی گۆت: ئەگەر مە زانیبا كێ وەل تە كرییە؟ ئینا ئیبن عومەری

گۆت: تە یێ وەل من كری، گۆت: ئەو چاوا؟ گۆت: تە چەك د رۆژەكێدا هەلگرت تێدا نەدهاتە هەلگرتن، و تە چەك برە د حەرەمێڤە و چەك نەدهاتە د حەرەمێڤە.

٩ ـ باب: مخالفة الطريق يوم العيد.

**بابەتێ: گوهۆرینا رێكێ ل رۆژا جەژنێ.**

١٥٠٣ - (خ) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا كَانَ يَوْمُ عِيدٍ خَالَفَ الطَّرِيقَ.[خ٩٨٦].

ژ جابری (ﭬ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ هەكە رۆژا جەژنێبا د رێكەكێڕا دچۆ و د رێكەكا دیڕا دزڤری.

١٥٠٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا خَرَجَ يَوْمَ الْعِيدِ فِي طَرِيقٍ، رَجَعَ فِي غَيْرِهِ. [ت٥٤١/ جه١٣٠١/ مي١٦٥٤]

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (ﭬ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ل رۆژا جەژنێ د رێكەكێڕا دەركەفتبا د ئێكا دیدا دزڤریڤە.

١٠ ـ باب: فضل عشر ذي الحجة.

**بابەتێ: خێرا دەهكێت جەژنا حەجییان.**

١٥٠٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**مَا الْعَمَلُ فِي أَيَّامِ الْعَشْرِ أَفْضَلَ مِنَ الْعَمَلِ فِي هذِهِ**)، قَالُوا: وَلاَ الْجِهَادُ؟ قَالَ: (**وَلاَ الْجِهَادُ، إِلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ يُخَاطِرُ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَلَمْ يَرْجِعْ بِشَيْءٍ**).[خ٩٦٩].

[انظر: ١٨٨٦].

ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (چو رۆژان كارێ خێرێ تێدا وەكی ڤان رۆژان ل دەڤ خودێ خۆشڤیتر نینە)، ئانكو ژ دەهكان، گۆتن: (یا پێغەمبەرێ خودێ خۆ جیهادا د رێكا خودێدا ژی؟ گۆت: خۆ جیهادا د رێكا خودێدا ژی، زەلامەك نەبیت ب خۆ و مالێ خۆڤە دەركەڤیت، و ب چو ژ ڤانڤە نەزڤریت).

## ١١ ـ باب: اجتماع العيد والجمعة.

## بابەتێ: کۆمبوونا جەژنێ و خوتبێ د گەلێك.

١٥٠٦ - (ق) عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ ـ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ ـ: أَنَّهُ شَهِدَ الْعِيدَ يَوْمَ الأَضْحَى مَعَ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه، فَصَلَّى قَبْلَ الخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَدْ نَهَاكُمْ عَنْ صِيَامِ هذَيْنِ الْعِيدَيْنِ: أَمَّا أَحَدُهُمَا فَيَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَأَمَّا الآخَرُ فَيَوْمَ تَأْكُلُونَ نُسُكَكُمْ. [خ٥٥٧١ (١٩٩٠)/ م١١٣٧]

وعند البخاري قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: ثُمَّ شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، فَكَانَ ذلِكَ يَوْمَ الجُمُعَةِ، فَصَلَّى قَبْلَ الخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ هذَا يَوْمٌ قَدِ اجْتَمَعَ لَكُمْ فِيهِ عِيدَانِ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْتَظِرَ الجُمُعَةَ مِنْ أَهْلِ الْعَوَالِي فَلْيَنْتَظِرْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَرْجِعِ فَقَدْ أَذِنْتُ لَهُ. [خ٥٥٧٢].

**ژ ئەبی عوبەیدەی ئازاکرییێ ئیبن ئەزهەری (رضي الله عنه): ئەو ل رۆژا جەژنا حەجییان د گەل عومەرێ کوڕێ خەتتابی بوو (رضي الله عنه) بەری خوتبێ نڤێژ کر و پاشی خوتبە بۆ خەلکی خواند، ئینا گۆت: گەلی خەلکی ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هوین ژ رۆژیگرنا ڤان هەردو جەژنان یێت داینە پاش، هندیکە ئێك ژ وانە رۆژا خوارنا رۆژیا هەومیە و هندیکە یا دییە رۆژەکە هوین قوربانییێت خۆ تێدا دخۆن.**

**و ل دەڤ بوخاری: ئەبو عوبەیدە (رضي الله عنه) دبێژیت: ئەز ل جەژنێ د گەل عوسمانێ کوڕێ عەففانی بووم، و ئەو رۆژا خوتبە بوو، بەری خوتبێ نڤێژ کر و پاشی خوتبە خواند ئینا گۆت: گەلی خەلکی ب راستی ئەڤرۆ رۆژەکە دو جەژن بۆ هەوە یێت تێدا کۆم بووین، ڤێجا هەر کەسێ ل خەلکێ گوندان ل دەرڤەی مەدینەیێ بڤێت خۆ ل نڤێژا خوتبێ بگریت بلا خۆ بگریت و هەر کەسێ بڤێت بزڤریت بلا بزڤریت من دەستویری دایێ.**

١٥٠٧ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(قَدْ اجْتَمَعَ فِي يَوْمِكُمْ هَذَا عِيدَانِ؛ فَمَنْ شَاءَ أَجْزَأَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ، وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ).** [د١٠٧٣/ جه١٣١١]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (ب راستی د ڤێ رۆژا هەومدا دو جەژن پێت کۆم بووین، و هەر کەسێ بڤێت جهێ خوتبێ بۆ دگریت[1] و ب راستی ئەم دێ خوتبێ کەین).**

## ١٢ ـ باب: إذا فاته العيد.

## بابەتێ: ئەگەر نڤێژا جەژنێ ژێ چۆ.

١٥٠٨ – (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أنه أَمَرَ مَوْلاَهُمْ ابْنَ أَبِي عُتْبَةَ بِالزَّاوِيَةِ، فَجَمَعَ أَهْلَهُ وَبَنِيهِ، وَصَلَّى كَصَلاَةِ أَهْلِ الْمِصْرِ وَتَكْبِيرِهِمْ. [خ. كتاب العيدين، باب ٢٥].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) وی فەرمانا ئازاکرییێ خۆ ل زاوییە[2] کر، ئینا وی خێزانا وی و عەیالێ وی کۆم کرن و نڤێژ وەکی نڤێژ و تەکبیرێت خەلکێ باژێری بەراهییا وان کر.**

١٥٠٩ – عَنْ أَبِي عُمَيْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ عُمُومَةٍ لَهُ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، أَنَّ رَكْباً جَاؤوا إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) يَشْهَدُونَ أَنَّهُمْ رَأَوْا الْهِلاَلَ بِالْأَمْسِ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يُفْطِرُوا، وَإِذَا أَصْبَحُوا أَنْ يَغْدُوا إِلَى مُصَلاَّهُمْ. [د١١٥٧/ ن١٥٥٦/ جه١٦٥٣].

* صحيح.

**ژ ئەبی عومەیری کورێ ئەنەسی (رضي الله عنه) ژ مامەکێ خۆ ژ هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: کۆمەکا مرۆڤان هاتنە دەڤ پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) شەهدەیی دان وان دوهی هەیڤا دیتی، ئینا پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فەرمانا وان کر ئەو رۆژیا خۆ بخۆن، و ئەگەر بوو سوبەهی سپێدێ بچنە نڤێژگەها خۆ.**

---

(١) ئانکو: ئەو دشێت خوتبێ نەکەت و نەبێ گونەهکارە، و نڤێژا نیڤرۆ چوار رکعەت دێ کەت.

(٢) زاوییە: جهەکە نێزیکی بەسرایە، ئەنەس (رضي الله عنه) ل وێرێ یێ ئاکنجی بوو، مزگەفتەکا تایبەت و یا بچویک بۆ خۆ ل وێرێ دورست کربوو.

## ١٣ ـ باب: الخروج إلى العيد ماشياً.

**بابەتێ: دەرکەفتنا نڤێژا جەژنێ ب پێیان.**

١٥١٠ – عَنِ عَلِيٍّ قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ تَخْرُجَ إِلَى الْعِيْدِ مَاشِياً، وأَنْ تَأْكُلَ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ.
[ت٥٣٠، جه١٢٩٦]

* حسن.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: ژ سوننەتێیە ب پێیان بچییە نڤێژا جەژنێ و بەری دەرکەڤی تشتەکی بخۆی[1].**

## ١٤ ـ باب: التكبير في صلاة العيدين.

**بابەتێ: تەکبیردانا د نڤێژا هەردو جەژناندا.**

١٥١١ – عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يُكَبِّرُ فِي الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى: فِي الْأُولَى: سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ، وَفِي الثَّانِيَةِ: خَمْساً. [د١١٤٩/ جه١٢٨٠].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د جەژنا رەمەزانێ و یا حەجییاندا تەکبیر دکرن، د رکعەتا ئێکێدا حەفت تەکبیر، و د یا دوویێدا پێنج تەکبیر.**

١٥١٢ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ): **(التَّكْبِيرُ فِي الْفِطْرِ سَبْعٌ فِي الْأُولَى، وَخَمْسٌ فِي الْآخِرَةِ، وَالْقِرَاءَةُ بَعْدَهُمَا كِلْتَيْهِمَا).** [د١١٥١]

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمرێ کوڕێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تەکبیر د نڤێژا جەژنا رەمەزانێدا د رکعەتا ئێکێدا حەفتن و د یا دیدا پێنجن و خواندن پشتی وان هەردوکانە).**

١٥١٣ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّهُ كَانَ يُكَبِّرُ مِنْ غَدَاةِ عَرَفَةَ، إِلَى صَلَاةِ الْعَصْرِ مِنْ آخِرِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ. [ك١١١٣].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) وی ل سپێدەیا عەرەفێ هەتا نڤێژا ئێڤاری ژ دویماهی رۆژێت تەشریقێ تەکبیر دکرن.**

---

(١) مەبەست پێ خوارنا جەژنا رەمەزانێیە نە جەژنا حەجییان هەروەکی د فەرمووودێت بۆریدا هاتی.

## ١٥ ـ باب: خطبة العيد.

## بابەتێ: خوتبا جەژنێ.

١٥١٤ – عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نُووِلَ يَوْمَ الْعِيدِ قَوْساً فَخَطَبَ عَلَيْهِ.[د١١٤٥]

* حسن.

**ژ بەرائێ كورێ عازبی (رضي الله عنه) گۆت: ل رۆژا جەژنێ كڤانەك دانەڤ پێغەمبەری (ﷺ) خوتبە ل سەر خواند (ئانكو دا بەر خۆ).**

١٥١٥ – . عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ قَالَ: السُّنَّةُ فِي تَكْبِيرِ يَوْمِ الأَضْحَى وَ الفِطْرِ عَلَى الْمِنْبَرِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ: أَنْ يَبْتَدِئَ الإِمَامُ قَبْلَ الْخُطْبَةِ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى الْمِنْبَرِ بِتِسْعِ تَكْبِيرَاتٍ تَتْرَى لاَ يَفْصِلُ بَيْنَهَا بِكَلاَمٍ، ثُمَّ يَخْطُبُ، ثُمَّ يَجْلِسُ جَلْسَةً ثُمَّ يَقُومُ فِي الْخُطْبَةِ الثَّانِيَةِ فَيَفْتَتِحُهَا بِسَبْعِ تَكْبِيرَاتٍ تَتْرَى لاَ يَفْصِلُ بَيْنَهَا بِكَلاَمٍ ثُمَّ يَخْطُبُ.

- وفي رواية: ثُمَّ يَدْعُو وَيُكَبِّرُ بَعْدُ مَا بَدَا لَهُ. [هق٣/٢٩٩]

**ژ عوبەیدوللایێ كورێ عەبدوللایێ كورێ عوتبەیی گۆت: سونەت د تەكبیرێت رۆژا جەژنا حەجییان و یا رەمەزانێدا ل سەر مینبەرێ بەری خوتبێ، ئیمام ژ پیاڤە بەری خوتبێ و ل سەر مینبەرێ دەست ب نەهـ تەكبیران ل دویڤ ئێك بكەت و د ناڤبەرا واندا ب چو ئاخفتنێ ژێكڤە نەكەت، پاشی خوتبێ بخوینیت پاشی روینشتنەكێ روینیت پاشی د خوتبا دووێدا رابیت و ب حەفت تەكبیران دویڤكرا دەست پێ بكەت و د ناڤبەرا واندا ب چو ئاخفتنێ ژێكڤە نەكەت پاشی خوتبێ بدەت.**

- **و د ڤەگێرەكێدا: پاشی دوعا بكەت و تەكبیرا پشتی هینگێ بدەت هندی وی دڤێن.**

## ١٦ ـ باب: الجلوس لاستماع الخطبة.

## بابەتێ: روینشتنێ بۆ گوهدانا خوتبێ.

١٥١٦ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ السَّائِبِ قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) الْعِيدَ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: (**إِنَّا نَخْطُبُ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَجْلِسَ لِلْخُطْبَةِ فَلْيَجْلِسْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَذْهَبَ فَلْيَذْهَبْ**). [د١١٥٥/ ن١٥٧٠/ جه١٢٩٠]

* صحيح مرسل.

**ژ عەبدوللایێ كورێ سائبی (ﷺ) گۆت: من نڤێژا جەژنێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، ڤێجا دەمێ نڤێژ ب دویماهی هاتی گۆت: (ئەم دێ خوتبێ دەین یێ بڤێت بۆ گوهدانا خوتبێ روینیت بلا روینیت و یێ بڤێت بچیت بلا بچیت).**

## ١٧ ـ باب: وقت صلاة العيد.

**بابەتێ: دەمێ نڤێژا جەژنێ.**

١٥١٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ ـ صَاحِبِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) ـ أنه خرج مَعَ النَّاسِ فِي يَوْمِ عِيدِ فِطْرٍ أَوْ أَضْحَى، فَأَنْكَرَ إِبْطَاءَ الْإِمَامِ، فَقَالَ: إِنَّا كُنَّا قَدْ فَرَغْنَا سَاعَتَنَا هَذِهِ، وَذَلِكَ حِينَ التَّسْبِيحِ.

[د١١٣٥/ جه١٣١٧].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ بوسری (ﷺ) هەڤالێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو رۆژا جەژن د گەل خەلكی دەركەفتە نڤێژا جەژنا رەمەزانێ یان یا حەجییا، نەرازی بوو ل سەر گیرۆبوونا ئیمامی و گۆت: ئەم ل ڤی دەمێ خۆ تمام دبووین و ئەو دەمێ سونەتا زوحایێ بوو[1].**

## ١٨ ـ باب: صلاة العيد في المسجد يوم المطر

**بابەتێ: كرنا نڤێژا جەژنێ ل مزگەفتێ ل رۆژەكا باران.**

١٥١٨ – عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ التَّيْمِيِّ قَالَ: مُطِرْنَا فِي إِمَارَةِ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ عَلَى الْمَدِينَةِ مَطَراً شَدِيداً لَيْلَةَ الْفِطْرِ، فَجَمَعَ النَّاسَ فِي الْمَسْجِدِ فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَى الْمُصَلَّى الَّذِي يُصَلَّى فِيهِ الْفِطْرُ وَالأَضْحَى، ثُمَّ قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ: قُمْ فَأَخْبِرِ النَّاسَ مَا أَخْبَرْتَنِي، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَامِرٍ: إِنَّ النَّاسَ مُطِرُوا عَلَى عَهْدِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه فَامْتَنَعَ النَّاسُ الْمُصَلَّى، فَجَمَعَ عُمَرُ النَّاسَ فِي الْمَسْجِدِ فَصَلَّى بِهِمْ، ثُمَّ قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) كَانَ يَخْرُجُ بِالنَّاسِ إِلَى الْمُصَلَّى يُصَلِّي بِهِمْ لأَنَّهُ أَرْفَقُ بِهِمْ وَأَوْسَعُ عَلَيْهِمْ، وَإِنَّ الْمَسْجِدَ كَانَ لاَ يَسَعُهُمْ، قَالَ: فَإِذَا كَانَ هَذَا الْمَطَرُ فَالْمَسْجِدُ أَرْفَقُ. [هق٣/٣١٠].

---

(١) یا باش ئەوە نڤێژا جەژنا حەجییان زویتر بهێتە كرن دا خەلك بگەهن قوربانێت خۆ ڤەكوژن، بەلێ نڤێژا جەژنا رەمەزانێ باشتر ئەوە لەز لێ نەهێتە كرن و گیرۆتر بهێتە كرن دا دەرفەت هەبیت بۆ ئەوێ فترە نەدایی فترا خۆ بدەت.

**ژ عوسمانێ كورێ عەبدولرەحمانێ تەیمی گۆت: د حوكمدارییا ئەبانێ كورێ عوسمانیدا ل سەر مەدینەیێ بارانەكا بۆش ل شەڤا جەژنا رەمەزانێ ل مە هات، ئینا خەلك ل مزگەفتێ كۆم كرن و نەدەركەفتە نڤێژگەها نڤێژا جەژنا رەمەزانێ و حەجییان لێ دهاتە كرن، پاشی گۆتە عەبدوللایێ كورێ عامرێ كورێ رەبیعەی: رابە ئەوا تە بۆ من گۆتی بۆ خەلكی بێژە، ئینا عەبدوللایێ كورێ عامری گۆت: باران ل سەر دەمێ عومەرێ كورێ خەتتابی ل خەلكی هات و خەلك نەشیان بچنە نڤێژگەهێ، ئینا عومەری د مزگەفتێڤە كۆم كرن و نڤێژ بەری وان كر، پاشی چۆ سەر مینبەرێ و گۆت: گەلی خەلكی ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەلك دبرە نڤێژگەهێ و نڤێژ ب وان دكر و ئەو بۆ وان سڤكتر و بەرفرەهتر بوو و ب راستی مزگەفتێ تێرا وان نەدكر، گۆت: و ئەگەر ئەڤ بارانە هەبیت مزگەفت ل سەر هەوە سڤكترە.**

## ١٩ ـ باب: الغسل للعيد.

## بابەتێ: سەرشویشتنا بۆ جەژنێ.

١٥١٩ - عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَغْتَسِلُ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ إِلَى الْمُصَلَّى. [ط٤٢٨]

* إسناده صحيح.

**ژ مالكی (رحمه الله) ژ نافعی: عەبدوللایێ كورێ عومەری ل رۆژا جەژنا رەمەزانێ بەری دەركەڤیتە نڤێژگەهێ سەرێ خۆ دشویشت.**

## ٢٠ ـ باب: أعياد المسلمين.

## بابەتێ: جەژنێت موسلمانان.

١٥٢٠ - عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْمَدِينَةَ وَلَهُمْ يَوْمَانِ يَلْعَبُونَ فِيهِمَا، فَقَالَ: (**مَا هَذَانِ الْيَوْمَانِ**) ؟ قَالُوا: كُنَّا نَلْعَبُ فِيهِمَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ قَدْ أَبْدَلَكُمْ بِهِمَا خَيْراً مِنْهُمَا: يَوْمَ الأَضْحَى، وَيَوْمَ الْفِطْرِ**). [د١١٣٤/ ن١٥٥٥].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) هاتە مەدینەیێ و وان دو رۆژ هەبوون یاری تێدا دکرن، ئینا گۆت: (ئەڤە چ دو رۆژن)؟ گۆتن: مە د نەزانینێدا یاری تێدا دکرن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (ب ڕاستی خودێ بۆ هەوە ئەو ب دو رۆژێت دی یێت ژ وان باشتر و ب خێتر گوهارتین، رۆژا جەژنا حەجییان و رۆژا جەژنا رەمەزانێ).**



## الفصل الثالث: صلاة الكسوف.

## پشكا سێیێ: نڤێژا رۆژگەیرینێ.

### ١ ـ باب: الشمس والقمر آيتان.

### بابەتێ: رۆژ و هەیڤ دو نیشانن.

١٥٢١ – (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، وَلكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَقُومُوا فَصَلُّوا)**. [خ١٠٤١/ م٩١١]

**ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت (ب ڕاستی رۆژ و هەیڤ بۆ مرنا كەسێ ژ مرۆڤان ناغەیرن، بەلێ ئەو دو نیشانن ژ نیشانێت خودێ، ڤێجا ئەگەر هەوە ئەو غەیری دیتن، رابن نڤێژێ بكەن).**

### ٢ ـ باب: صفة صلاة الكسوف.

### بابەتێ: چاوانییا نڤێژا رۆژغەیرینێ.

١٥٢٢ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ في عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِالنَّاسِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ما فَعَلَ فِي الأُولَى، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَقَدِ انْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: **(إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ، لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذلِكَ فَادْعُوا اللهَ، وَكَبِّرُوا وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا)**. ثُمَّ قَالَ: **(يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، واللهِ، مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ، أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ أَوْ تَزْنِي أَمَتُهُ. يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللهِ لَوْ تَعْلَمُونَ ما أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً)**. [خ١٠٤٤/ م٩٠١]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) وێ گۆت: رۆژ ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) غەیری ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ب خلكی كر، و راوەستا و راوەستان درێژ كر، پاشی چۆ ركوعێ، و ركوع درێژركر، پاشی رابوو و رابوون درێژ كر، بەلێ كێمتر ژ رابوونا ئێكێ، پاشی ركوع بر و ركوع درێژ كر بەلێ كێمتر ژ ركوعا ئێكێ، پاشی سوجدە بر، و سوجدە درێژ كر، پاشی د ركعەتا دووێدا ئەو كر یا د ركعەتا ئێكێدا كری، پاشی خلاس كر و رۆژ**

دیار بوو، ئینا خوتبە بۆ خەلكی خواند و سوپاسی و حەمدا خودێ كر و پەسنا وی كر و پاشی گۆت:

**(رۆژ و هەیڤ دو نیشانن ژ نیشانێت خودێ، بۆ مرن و ژیانا كەسێ ژ مرۆڤان ناگەیرن، ئەگەر هەوە غەیری دیتن دوعا ژ خودێ بكەن و تەكبیران بدەن (بێژن: الله ئەكبەر) و نڤێژان بكەن و سەدەقەیان بدەن) پاشی گۆت: (ئەی ئوممەتا موحەممەدی سویند ب خودێ كەس ژ خودێ ب غیرەتتر نینە بەندەیێ وی زنایێ بكەت، یان بەندەیا وی زنایێ بكەت[1] ئەی ئوممەتا موحەممەدی سویند ب خودێ ئەگەر ئەوا ئەز دزانم هوین بزانن دا كێم كەنن و گەلەك گرین).**

١٥٢٣ – (م) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَفَزِعَ، فَأَخْطَأَ بِدِرْعٍ، حَتَّى أُدْرِكَ بِرِدَائِهِ بَعْدَ ذَلِكَ. قَالَتْ: فَقَضَيْتُ حَاجَتِي، ثُمَّ جِئْتُ وَدَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَائِماً، فَقُمْتُ مَعَهُ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، حَتَّى رَأَيْتُنِي أُرِيدُ أَنْ أَجْلِسَ، ثُمَّ أَلْتَفِتُ إِلَى الْمَرْأَةِ الضَّعِيفَةِ، فَأَقُولُ: هَذِهِ أَضْعَفُ مِنِّي، فَأَقُومُ، فَرَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، حَتَّى لَوْ أَنَّ رَجُلاً جَاءَ خُيِّلَ إِلَيْهِ أَنَّهُ لَمْ يَرْكَعْ. [م٩٠٦].

**ژ ئەسمائا كچا ئەبی بەكری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: رۆژ ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) غەیری، ئینا ترسێ گرت و لەز كر، و قەمیس ب تنێ ب خەلەتیڤە بر و هەتا كراسێ ناڤتەنگێ پشتی هینگێ گەهاندییێ، ئینا (ئەسمایێ) گۆت: من هەوجەییا خۆ قەتاند (هەروەكی هەوەجەییەك ل دەڤ عائیشایێ هەبوو) پاشی ئەز هاتم چۆمە د مزگەفتێڤە، و من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت ژ پیاڤە یێ راوەستایە ئینا ئەز ژی راوەستام، و راوەستیان درێژ كر، هەتا دا من بینی من دڤیا روینم پاشی من بەرێ خۆ دا ئەو ژنا لاواز من بۆ خۆ دگۆت: ئەڤە ژ من لاوازترە ئەز ژ پیاڤە دمام، و پاشی ركوع بر و ركوع درێژ كر پاشی سەرێ خۆ بلند كر و رابوون درێژ كر هەتا هەكە زەلامەك هاتبا دا هزركەت وی هێژ ركوع نەبرییە.**

---

(١) ئانكو: خودێ پێ نەخۆشە فەرمانێت وی ب جھ نەهێن و بێنەمرییا وی بهێتە كرن و زنا نەگوهداری و بێنەمرییە، هشیار بن نەكەڤنە تێدا خودێ بێ سزا ناهێلیت.

## ٣ . باب: من قال بأكثر من ركوعين في الركعة.

## بابەتێ: ئەوێ دبێژیت پتر ژ دو ركوعا یێت ركعەتەكێدا هەین.

١٥٢٤ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ صَلَّى فِي كُسُوفٍ، قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ. قَالَ: وَالأُخْرَى مِثْلُهَا. [م٩٠٩]

وفي رواية قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، حِينَ كَسَفَتِ الشَّمْسُ، ثَمَانَ رَكَعَاتٍ، فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ. [م٩٠٨]

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ): وی نڤێژ د رۆژگەیرینەكێدا كر، قورئان خواند و پاشی چۆ ركوعێ، پاشی قورئان خواند و چۆ ركوعێ، پاشی قورئان خواند و چۆ ركوعێ، پاشی قورئان خواند و چۆ ركوعێ، پاشی چۆ سوجدەیێ، گۆت: و یا دووێ ژی وەكی وێ كر.**

**و د ڤەگێرەكێدا گۆت: دەمێ رۆژ گەیری پێغەمبەری (ﷺ) هەشت ركوع د چوار سوجدەیاندا برن.**

## ٤ . باب: ما عرض عليه (ﷺ) في صلاة الكسوف من أمر الجنة والنار.

## بابەتێ: كا چ نیشا پێغەمبەری (ﷺ) هاتە دان د نڤێژا رۆژگەیرینێدا ژ كاروبارێت بەحەشتێ و جەهنەمێ.

١٥٢٥ - (خ) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى صَلاَةَ الْكُسُوفِ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ، فَسَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ رَفَعَ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ: **(قَدْ دَنَتْ مِنِّي الْجَنَّةُ، حَتَّى لَوِ اجْتَرَأْتُ عَلَيْهَا، لَجِئْتُكُمْ بِقِطَافٍ مِنْ قِطَافِهَا، وَدَنَتْ مِنِّي النَّارُ حَتَّى قُلْتُ: أَيْ رَبِّ، وَأَنَا مَعَهُمْ؟ فَإِذَا امْرَأَةٌ ـ حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ ـ تَخْدِشُهَا هِرَّةٌ، قُلْتُ: مَا شَأْنُ هذِهِ؟ قَالُوا: حَبَسَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ جُوعاً، لاَ أَطْعَمَتْهَا، وَلاَ أَرْسَلَتْهَا تَأْكُلُ ـ قَالَ نَافِعٌ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ ـ مِنْ خَشِيشِ أَوْ خَشَاشِ الأَرْضِ)**. [خ٧٤٥].

**ژ ئەسمایا كچا ئەبی بەكری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژا رۆژگەیرینێ كر و راوەستا و راوەستان درێژ كر، پاشی چۆ ركوعێ، و ركوع درێژ كر،**

پاشی رابوو و رابوون درێژ کر، پاشی رکوع بر و رکوع درێژ کر، پاشی سوجده بر، و سوجده درێژ کر، پاشی رابوو، پاشی سوجده بر و سوجده درێژ کر، پاشی رابوو و رابوون درێژ کر، پاشی رکوع بر و رکوع درێژ کر پاشی رابوو و رابوون درێژ کر پاشی رکوع بر و رکوع درێژ کر پاشی رابوو و سوجده بر و سوجده درێژ کر پاشی رابوو پاشی سوجده بر و سوجده درێژ کر پاشی سلاڤا ملان ڤەدا، ئینا گۆت: **(بەحەشت هند ل من نێزیك بوو هەتا ئەگەر ئەز وێریابامە[1] دا بۆ هەوە ئویشییەکی ژ ئویشییێت وێ ئینم، و جەهنەم هند ژ من نێزیك بوو هەتا من گۆت: ئەی خودا ئەز ژی د گەل وانم؟ من ژنەك دیت ـ** ئەز هزر دکەم وی گۆت ـ: **پشیکەکێ پەنج لێ ددان من گۆت: کاروبارێ ڤێ چییە؟ گۆتن: وێ ئەو پشیك زیدان کربوو هەتا ژ برساندا مری، نە وێ خوارن ددایێ و نە بەرددا خوارنێ بخۆت ـ نافع دبێژیت:** ئەز دبێژم گۆت ـ **ژ خشۆکێت ئەردی بخۆت).**

٥ . باب: ما جاء في الكواكب.

**بابەتێ: تشتێ د راستا هەسارەیاندا هاتی.**

١٥٢٦ - عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: كُنَّا مَعَ أَبِي قَتَادَةَ عَلَى ظَهْرِ بَيْتِنَا، فَرَأَى كَوْكَباً انْقَضَّ، فَنَظَرُوا إِلَيْهِ، فَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ: إِنَّا قَدْ نُهِينَا أَنْ نُتْبِعَهُ أَبْصَارَنَا. [حم٢٢٥٤٩].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ موحەممەدێ کورێ سیرینی (رحمه الله) گۆت: ئەم د گەل ئەبی قەتادەیی ل سەر بانێ مالا مە بووین، هەسارەیەك دیت رژیا ئینا بەرێ خۆ دانێ، ئینا ئەبو قەتادەیی گۆت: ئەم یێت هاتینە پاشڤەلێدان دویڤچۆنێ ب چاڤێت خۆ بۆ بکەین.**



(١) چونکی دەستویری ژ خودایێ خۆ نەبوو ئەو تشتەکی ژ بەحەشتێ بینیت لەوا وەگۆت.

## الفصل الرابع: صلاة الاستسقاء.

## پشکا چوارێ: نڤێژا بارانێ

### ١ ـ باب: تحويل الرداء.

### بابەتێ: ڤاژیکرنا جلکی.

١٥٢٧ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَرَجَ إِلَى المصَلَّى، فَاسْتَسْقَى، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَقَلَبَ رِدَاءَهُ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ. [خ١٠١٢ (١٠٠٥)/ م٨٩٤]

وفي رواية لهما: رَأَيْتُ النبيَّ (ﷺ) يَوْمَ خَرَجَ يَسْتَسْقِي، فَحَوَّلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ يَدْعُو، ثُمَّ حَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى لنا رَكْعَتَيْنِ. زاد البخاري: جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ. [خ١٠٢٥]

**ژ عەبدوللایێ کورێ زەیدی (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) دەرکەفتە نڤێژگەهێ و داخوازا باران بارینێ کر و بەرێ خۆ دا قیبلەیێ و جلکێ خۆ ڤاژی کر و دو رکعەت نڤێژ کرن.**

**و د ڤەگێرەکا واندا: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا دەرکەفتی دوعا باران بارینێ کری دیت پشتا خۆ دا خەلکی و بەرێ خۆ دا قیبلەیێ و دوعا کرن و پاشی جلکێ خۆ ڤاژی کر پاشی دو رکعەت بۆ مە کرن، و بوخاری زێدە کرییە خواندن تێدا بلند کر.**

### ٢ ـ باب: رفع اليدين بالدعاء في الاستسقاء.

### بابەتێ: دەست بلندکرن ب دوعایێ د نڤێژا بارانێدا.

١٥٢٨ – (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) لاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ في شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلاَّ في الاِسْتِسْقَاءِ، وَإِنَّهُ يَرْفَعُ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ. [خ١٠٣١/ م٨٩٥].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دەستێت خۆ چو ژ دوعایێت خۆ بلند نەدکرن د دوعا نڤێژا بارانێدا نەبیت[1] و وی هند بلند دکرن هەتا سپیاتییا بن کەفشێت وی دەردکەفت.**

١٥٢٩ – (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اسْتَسْقَى، فَأَشَارَ بِظَهْرِ كَفَّيْهِ إِلَى السَّمَاءِ. [م٨٩٦].

---

(١) مەبەست ئەوە هند زێدە دەستێت خۆ وەکی دوعا بارانێ بلند نەدکرن، و رامان ئەو نینە د دوعایاندا دەستێت خۆ بلند نەدکرن، چونکی د گەلەك فەرموودەیاندا هاتییە دەستێ خۆ د دوعایاندا بلند دکرن، بەلێ ڤێرێ رامان ئەوە د چو دوعایاندا وەکی دوعایا بارانێ بلند نەدکرن.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دوعا نفێژا بارانێ كر پشتا دەستێت خۆ دا عەسمانی[1].**

١٥٣٠ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) بَوَاكِي، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ اسْقِنَا غَيْثاً مُغِيثاً، مَرِيئاً مَرِيعاً نَافِعاً غَيْرَ ضَارٍّ، عَاجِلاً غَيْرَ آجِلٍ**) قَالَ: فَأَطْبَقَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ. [د١١٦٩].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژن ب گریڤە هاتنە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: (یا خودێ بارانەكا ڤورتالكەر، و بێ ئاتاف، و ڤەلەوكەر، یا ب مفا و نەیا زیانكەر، و یا ب لەز و نەپاشئێخستی بدە مە) گۆت: ئینا عەسمان ب سەر واندا هاتە خوار (ئانكو: بارانەكا بۆش و زۆر هات).**

١٥٣١ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا اسْتَسْقَى قَالَ: (**اللَّهُمَّ اسْقِ عِبَادَكَ وَبَهَائِمَكَ، وَانْشُرْ رَحْمَتَكَ، وَأَحْيِ بَلَدَكَ الْمَيِّتَ**). [د١١٧٦].

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر دوعا بارانێ كربا دگۆت: (یا خودێ بەندەیێت خۆ و جانەوەرێت خۆ ئاڤ بدە، و دلۆڤانییا خۆ ب بارانێ بەلاڤ بكە، و عەردێ خۆ یێ هشك شین بكە).**

## ٣ ـ باب: الاستسقاء في خطبة الجمعة

## بابەتێ: دوعا بارانێ د گۆتارا ئەینییێدا.

١٥٣٢ - (ق) عَنْ شَرِيكٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ الْمَسْجِدَ يَوْمَ جُمُعَةٍ، مِنْ بَابٍ كَانَ نَحْوَ دَارِ الْقَضَاءِ، ورَسُولُ اللهِ (ﷺ) قَائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَائِماً، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! هَلَكَتِ الأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللهَ يُغِيثُنَا، فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا، اللَّهُمَّ أَغِثْنَا**). قَالَ أَنَسٌ: وَلاَ وَاللهِ ما نَرَى فِي السَّمَاءِ مِنْ سَحَابٍ، وَلاَ قَزَعَةً، وَمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ سَلْعٍ مِنْ بَيْتٍ وَلاَ دَارٍ. قَالَ: فَطَلَعَتْ مِنْ وَرَائِهِ سَحَابَةٌ مِثْلُ التُّرْسِ، فَلَمَّا تَوَسَّطَتِ السَّمَاءَ انْتَشَرَتْ، ثُمَّ أَمْطَرَتْ، فَلاَ وَاللهِ ما رَأَيْنَا الشَّمْسَ سِتّاً. ثُمَّ دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ ذلِكَ الْبَابِ فِي الْجُمُعَةِ ـ يَعْنِي:

(١) نەڤ ڤاژیكرنە گەشبینییە رەوش بهێتە گوهۆرین ژ نەبارینێ بۆ بارینێ و مە بەلگە نینە د درێژییا دوعایێدا نەڤ كارە دكر.

ثَّانية ـ ورَسُولُ اللهِ (ﷺ) قائِمٌ يَخْطُبُ، فَاسْتَقْبَلَهُ قائِماً، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَلَكَتِ الأَمْوَالُ، وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللهَ يُمْسِكْهَا عَنَّا. قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا، اللَّهُمَّ عَلَى الآكَامِ وَالظِّرَابِ، وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ، وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ**). قَالَ: فَأَقْلَعَتْ، وخَرَجْنَا نَمْشِي فِي الشَّمْسِ.قَالَ شَرِيكٌ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مالِكٍ: أَهُوَ الرَّجُلُ الأَوَّلُ؟ فَقَالَ: مَا أَدْرِي.[خ١٠١٤ (٩٣٢)/ م٨٩٧].

**ژ شەریكی (رضي الله عنه) ژ مالكێ كوڕێ ئەنەسی گۆت: ڕۆژەكا ئەینی زەلامەك د دەرگەهەكیڕا ڕاستا خانییێ بۆ دەینان فرۆتی[1] هاتە د مزگەفتێڤە و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ پیانڤە بوو خوتبە دخواند، و ڕاوەستا و بەرێ خۆ دا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ مال و سامان تێچۆن و ڕێك نەمان و هاتنە بڕین، ڤێجا دوعا ژ خودێ بكە بارانێ بۆ مە ببارینیت، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) هەردو دەستێت خۆ بلند كرن پاشی گۆت: (یا خودێ بارانێ بۆ مە بینە، یا خودێ بارانێ بۆ مە بینە، یا خودێ بارانێ بۆ مە بینە).**

**ئەنەس دبێژیت: ئەز ب خودێ سویند دخۆم نە عەور و نە پارچەكا عەوری تە ل عەسمانی نەددیتن، و د ناڤبەرا مە و چیایێ سەلعدا نە مال و نە خانی هەبوون، عەورەكی وەكی مەتالی گرۆڤر ل پشت دەركەفت، ڤێجا دەمێ گەهشتییە نیڤا عەسمانی بەلاڤ بوو، پاشی باران باری، ئەز ب خودێ كەمە مە حەفتییەكێ ڕۆژ نەدیت، پاشی ڕۆژا خوتبە ـ ئانكو خوتبا دووێ ـ زەلامەك د وی دەرگەهیڕا هاتە د ژۆرڤە و پێغەمبەرێ خودێ ژ پیاڤە گۆتار دخواند، و بەرێ خۆ دایێ و ل سەر پیان ڕاوەستا و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ مالییەت تێ چۆ و ڕێك نەمان و هاتنە بڕین، دوعا ژ خودێ بكە بارانێ ل سەر مە ڕاوەستینیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێت خۆ بلند كرن و گۆت: (یا خودێ دۆرماندۆرێت مە ببارینە، و نە ل سەر مە، یا خودێ ل سەر گرێت ئاخێ و چیان و چیایێت سەر دەشت و نە بلند، و نهال و جهێ چەرمیان ببارینە). گۆت: باران ڕاوەستا و ئەم دەركەفتین و ل بەر ڕۆژێ چۆین.**

(١) دبێژنە ڤی خانی (دار القضاء) نە چونكی دادگەه بوو، بەلكی ئەو خانی یێ عومەرێ كوڕێ خەتتابی بوو (رضي الله عنه) پشتی مری دەین ل سەر بوون و وی خانی جهێ دەینێت عومەری گرت لەوا وی ناڤی دبێژنێ، ئانكو: خانییێ دەین ئەدا كری.

شەریكی گۆت: من پرسیار ژ مالكێ كوڕێ ئەنەسی كر، ئەرێ ئەو هەر زەلامێ ئێكێ بوو؟ گۆت: ئەز نوزانم.

## ٤ . باب: استسقاء عمر رضي الله عنه

## بابەتێ: دوعایا عومەری (خودێ ژێ رازی بیت) بۆ بارانێ

١٥٣٣ – (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رضي الله عنه: كانَ إِذَا قَحَطُوا اسْتَسْقَى بِالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ المطَّلِبِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا، وإنا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا، قَالَ: فَيُسْقَوْنَ. [خ١٠١٠].

ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: عومەرێ كوڕێ خەتتابی ئەگەر هشكەسالی چێ ببا ب عەباسێ كوڕێ عەبدولموتتەلب دوعا بارانێ دكر و دگۆت: ئەی خودا مە ژ پێغەمبەری دخواست دوعا باران بارینێ بۆ مە بكەت و دوعایا وی بۆ مە رێكەك بوو تو بارانێ بۆ مە ببارینی و تە باران بۆ مە دئینان و ئەم ب دوعایا مامێ پێغەمبەرێ مە ژ تە دخوازین بارانێ بۆ مە ببارینی (ئانكو: ژ عەباسی دهاتە خواستن ئەو دوعاییێت باران بارینێ بكەت) و باران بۆ وان دهاتن.

## ٥ . باب: لا أذان للاستسقاء.

## بابەتێ: بانگ بۆ نڤێژا بارانێ نینە.

١٥٣٤ – (خ) وَقَالَ لَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ زُهَيْرٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: خَرَجَ عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ الْأَنْصَارِيُّ، وَخَرَجَ مَعَهُ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ وَزَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ رضي الله عنهم، فَاسْتَسْقَى، فَقَامَ بِهِمْ عَلَى رِجْلَيْهِ عَلَى غَيْرِ مِنْبَرٍ، فَاسْتَغْفَرَ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ يَجْهَرُ بِالْقِرَاءَةِ، وَلَمْ يُؤَذِّنْ وَلَمْ يُقِمْ.

قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: وَرَأَى عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ النَّبِيَّ (ﷺ). [خ معلق ١٠٢٢].

ئەبو نەعیمی ژ زوهەیری ژ ئەبی ئیسحاقی گۆتە مە: عەبدوللایێ كوڕێ یەزیدێ ئەنساری دەركەفت و بەرائێ كوڕێ عازبی و زەیدێ كوڕێ ئەرقەمی (خودێ ژ وان رازی بیت) د گەل دەركەفتن و دوعا بارانێ كر، ئینا ژ پییانڤە راوەستا ل سەر پێت خۆ نە ل سەر مینبەرێ و دوعا گونەهژێبرنێ خواست و پاشی دو ركعەت نڤێژ كر و خواندن تێدا بلند كر و نە بانگ دا و نە قامەت گرت.

ئەبو ئیسحاقی گۆت: عەبدوللایێ كوڕێ زەیدی پێغەمبەر (ﷺ) هۆسا دیتبوو.

## ٦ ـ باب: ما يقول وما يفعل عند نزول المطر.

## بابەتێ: كا دێ چ بێژی و چ كەی دەمێ باران دباریت.

١٥٣٥ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا رَأَى المطَرَ قَالَ: (**صَيِّباً نَافِعاً**). [خ١٠٣٢]

ولفظ السنن: (**اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ صَيِّباً نَافِعاً**).

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر باران دیتبا دگۆت: (بارانەكا مفدار بیت).**

**و بێژەیا سونەنان: (یا خودێ بكە بارانەكا مفدار).**

١٥٣٦ - (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أَصَابَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَطَرٌ، قَالَ: فَحَسَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ثَوْبَهُ، حَتَّى أَصَابَهُ مِنَ الْمَطَرِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ لِمَ صَنَعْتَ هَذَا؟ قَالَ: (**لأَنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ تَعَالَى**). [م٨٩٨].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: باران ل مە هات و ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ)، گۆت: ئینا پێغەمبەری (ﷺ) جلكێ خۆ راكر هەتا باران ڤێ كەفتی، ئینا مە گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆچی تە وەكر؟ گۆت: (چونكی ئەو نێزیك یا ژ دەڤ خودایێ خۆ هاتی).**

## ٧ ـ باب: التعوذ عند رؤية الريح

## بابەتێ: خۆپاراستن ل دەمێ دیتنا هرۆبای

١٥٣٧ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا رَأَى مَخِيلَةً فِي السَّمَاءِ أَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، وَدَخَلَ وَخَرَجَ، وَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ، فَإِذَا أَمْطَرَتِ السَّمَاءُ سُرِّيَ عَنْهُ، فَعَرَّفَتْهُ عائِشَةُ ذلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**ما أَدْرِي لَعَلَّهُ كما قالَ قَوْمٌ**: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ﴾ الآيَةَ [الأحقاف:٢٤] ). [خ٣٢٠٦/ م٨٩٩]

- وزاد عند مسلم في أوله: قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا عَصَفَتِ الرِّيحُ قَالَ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا فِيهَا وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ**).

- وفي رواية أُخرى له ـ وأولها عند البخاري ـ: أَنَّهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مُسْتَجْمِعاً ضَاحِكاً حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ، إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ. قَالَتْ: وَكَانَ إِذَا رَأَى غَيْماً أَوْ رِيحاً، عُرِفَ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ.. [خ٦٠٩٢]

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) عەورەكێ ب برویسی ل عەسمانی دیتبا، د هات و دچۆ و ب زۆر دكەفت و دەر دكەفت، و سەروچاڤێت وی دگوهۆرین، ڤێجا ئەگەر عەوران باران باریبا ئەوێ چەندێ ئەو بەرددا و ژێ دچۆ، و عائیشایێ ئەڤە دزانی، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ما ئەز چ دزانم دبیت ئەو وەسا بیت هەروەكی هندەكان گۆتی: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ﴾[1].**

- **و ل دەڤ موسلمی ل دەستپێكا وێ زێدە كرییە: گۆت: ئەگەر هڕەبایەك هاتبا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (یا خودێ ئەز داخوازا باشییا ڤی هڕەبای ژ تە دكەم، و باشییا تێدا و باشییا بۆ هاتییە هنارتن، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خرابییا ڤی هڕەبای و ژ خرابییا تێدا و ژ خرابییا بۆ هاتییە هنارتن).**

- **و د ڤەگێرەكا دیدا یا وی و دەستپێكا ل دەڤ بوخاری وێ گۆت: من هند پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ چو تشتان زێدە رژد نەدیتییە بكەتە كەنی هەتا ئەز گۆشتێ سۆرێ پانكا دەڤێ وی ببینم، بەلێ ئەو دگرنژی، و گۆت: و ئەگەر عەورەك یان هڕەبایەك دیتبا ئەڤە ل سەروچاڤان ئاشكرا دبوو و دهاتە زانین (ئانكو گوهۆرین دكەفتێ).**

١٥٣٨ – عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: كَانَ إِذَا اشْتَدَّتِ الرِّيحُ يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ لِقْحاً لا عَقِيماً**). [حب١٠٠٨/ك٧٧٧٠].

* قال الذهبي: على شرطهما.

---

(١) ئانكو: ئەز دترسم ئەڤە وەكی وی عەورێ ملەتێ هوود پێغەمبەری بیت دەمەكێ درێژ باران بۆ نەهاتن، ڤێجا دەمێ عەورەك دیتین یێ بەر ب نهالێت وانڤە دئێت كەیفا وان هات دیتین، دلخۆش بوون ـ بەلێ عەور نە عەورێ دلخۆشییێ بوو بەلكی یێ عەزابێ بوو ـ گۆتن: ئەڤە عەورەكە دێ بارانێ بۆ مە ئینیت و ئەو دەمەك بوو خودێ باران ژ وان ڤەگرتبوون، ڤێجا وەختێ وان ئەو عەور دیتی هزر كرن عەورێ بارانێیە و كەیفا وان پێ هات، و گۆتنە هوودی نەڤ عەورە دێ بارانێ بۆ مە ئینیت، هوود پێغەمبەری گۆتە وان: نەخێر ئەڤە نەعەورێ بارانێیە، وەكی هوین هزر دكەن بەلێ ئەڤە ئەو ئیزایە یا هوین لێ ب لەز، ئەڤە بایەكە، ئیزایەكا ب ژان و دژوار یا تێدا.

ژ سەلەمەیێ كورێ ئەكوەعی (ﷺ) دگەهینیتە پێغەمبەری (ﷺ) دبێژیت: ئەگەر با ببا هرەبا دگۆت: **(یا خودێ بكە هرمبایەكێ ئاڤ هەلگر و نەكەیە هرمبایەكێ خرشێ بێ ئاڤ).**

٨ـ باب: تمثل ابن عمر بشعر أَبي طالب.

**بابەتێ: نموونە ئینانا ئیبن عومەری ب هۆزانا ئەبی تالبی.**

١٥٣٩ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَتَمَثَّلُ بِشِعْرِ أَبِي طَالِبٍ:

وَأَبيَضُ يُسْتَسْقَى الْغَمَامُ بِوَجْهِهِ ثِمَالُ الْيَتَامى عِصْمَةٌ لِلأَرَامِلِ. [خ١٠٠٨].

- وفي رواية معلقة: وَقَالَ عُمَرُ بْنُ حَمْزَةَ: حَدَّثَنَا سَالِمٌ، عَنْ أَبِيهِ: رُبَّمَا ذَكَرْتُ قَوْلَ الشَّاعِرِ، وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى وَجْهِ النَّبِيِّ (ﷺ) يَسْتَسْقِي، فَمَا يَنْزِلُ حَتَّى يَجِيشَ كُلُّ مِيزَابٍ. [خ١٠٠٩].

ژ عەبدوللایێ كورێ دیناری گۆت من گوهـ ل ئیبن عومەری بوو نموونە ب هۆزانا ئەبی تالبی دئینا.

و یێ سپییە و باران ب وی دهێتە داخوازكرن پشتگرێ ئێتیمانە و پارێزەرێ بێژنانە.

- و د ڤەگێرەكا موعەلەقدا: و عومەرێ كورێ حەمزەی گۆت: سالمی ژ بابێ خۆ گۆتە مە: و دبیت هندە جاران گۆتنا هۆزانڤانی من دگۆت و من بەرێ خۆ دا سەروچاڤێت وی و ئەو دوعا باران بارینێ دكەت و ژ جهێ خۆ نەدهاتە خوارێ هەتا باران ژ هەمی بۆتكان نەچۆبا.

٩ـ باب: ليست السنة بأَن لا تمطروا.

**بابەتێ: هشكەسالی نە ئەوە باران بۆ هەوە نەهێن.**

١٥٤٠ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(لَيْسَتِ السَّنَةُ بِأَنْ لاَ تُمْطَرُوا، وَلَكِنِ السَّنَةُ أَنْ تُمْطَرُوا وَتُمْطَرُوا، وَلاَ تُنْبِتُ الأَرْضُ شَيْئاً).** [م٢٩٠٤].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هشكەسالی نەئەوە باران بۆ هەوە نەهێن، بەلێ هشكەسالی ئەوە باران بۆ هەوە بهێن و بهێن و عەرد چو شین نەكەت).**



## الفصل الخامس: صلاة الخوف

## پشكا پێنجێ: نڤێژا ترسێ

### ١ . باب: سبب مشروعية صلاة الخوف

### بابەتێ: ئەگەرێ دورستییا نڤێژا ترسێ

١٥٤١ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَوْماً مِنْ جُهَيْنَةَ، فَقَاتَلُونَا قِتَالاً شَدِيداً، فَلَمَّا صَلَّيْنَا الظُّهْرَ قَالَ الْمُشْرِكُونَ: لَوْ مِلْنَا عَلَيْهِمْ مَيْلَةً لاَقْتَطَعْنَاهُمْ، فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) ذلِكَ، فَذَكَرَ ذلِكَ لَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ). قالَ وَقَالُوا: إِنَّهُ سَتَأْتِيهِمْ صَلاَةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنَ الأَوْلاَدِ.

فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ، قَالَ: صَفَّنَا صَفَّيْنِ، وَالْمُشْرِكُونَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ. قَالَ: فَكَبَّرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَكَبَّرْنَا، وَرَكَعَ فَرَكَعْنَا، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الأَوَّلُ، فَلَمَّا قَامُوا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الأَوَّلُ، وَتَقَدَّمَ الصَّفُّ الثَّانِي، فَقَامُوا مَقَامَ الأَوَّلِ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَكَبَّرْنَا، وَرَكَعَ فَرَكَعْنَا، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الأَوَّلُ، وَقَامَ الثَّانِي، فَلَمَّا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي، ثُمَّ جَلَسُوا جَمِيعاً، سَلَّمَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [م٨٤٠].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: مە د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) غەزوا ملەتەكی ژ جوهەینییان كر، شەڕەكێ دژوار د گەل مە كرن، ڤێجا دەمێ مە نڤێژا نیڤرۆ كری هەڤپشكچێكەران گۆت: ئەگەر مە ب سەر واندا گرتبا دا وان ژێكڤەكەین، ئینا جبریلی ئەڤە گەهاندە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە گۆتە مە، و گۆتن: نڤێژەك بۆ وان دهێت ئەو ل دەڤ وان ژ زارۆكێت وان خۆشڤیترە.**

**ڤێجا وەختێ بوویە دەمێ نڤێژێ گۆت: ئەم كرینە دو ڕێز و هەڤپشكچێكەر د ناڤبەرا مە و قیبلێدا بوون، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تەكبیر كر و مە ژی تەكبیر كر، و چۆ ركوعێ و ئەم ژی چۆینە ركوعێ، پاشی چۆ سوجدەیێ و ڕێزا ئێكێ د گەل چۆنە سوجدەیێ، ڤێجا دەمێ ڕابووین ڕێزا دووێ چۆنە سوجدەیێ پاشی ڕێزا ئێكێ پاشڤە هاتن و ڕێزا دووێ پێشڤە چۆن، و ل جهێ یا دی ڕاوەستان، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تەكبیر كر و مە ژی تەكبیر كر پاشی چۆ ركوعێ و ئەم ژی چۆینە ركوعێ، پاشی چۆ**

**سوجدەیێ و رێزا ئێكێ د گەل چۆنە سوجدەیێ، و رێزا دووێ رابوون، ڤێجا دەمێ رێزا دووێ سوجدە برین پاشی هەمی روینشتن و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سلاڤا ملان ڤەدا.**

## ٢ ـ باب: كيفيات صلاة الخوف.

## بابەتێ: جەوانییا كرنا نڤێژا ترسێ.

١٥٤٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) صَلَّى بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ، وَالطَّائِفَةُ الْأُخْرَى مُوَاجِهَةُ الْعَدُوِّ، ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَقَامُوا فِي مَقَامِ أَصْحَابِهِمْ أُولَئِكَ، فَجَاءَ أُولَئِكَ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ قَامَ هَؤُلَاءِ، فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ، وَقَامَ هَؤُلَاءِ، فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ. [خ٤١٣٣ (٩٤٢)/ م٨٣٩].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژ بەری كۆمەكێ كر، و كۆما دی بەرامبەر دژمنی بوون، پاشی ئەو چۆن جهێ هەڤالێت خۆ یێت دی گرتن، و یێت دی هاتن و پێغەمبەری ركعەتەك بەراهییا وان كر، پاشی سلاڤا ملان ڤەدا، پاشی ئەو رابوون ركعەتا مایی تمام كرن، و یێت دی رابوون ركعەتا مایی تمام كرن.**

١٥٤٣ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ قَالَ: يَقُومُ الإِمَامُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، وَطَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَهُ، وَطَائِفَةٌ مِنْ قِبَلِ الْعَدُوِّ، وُجُوهُهُمْ إِلَى الْعَدُوِّ، فَيُصَلِّي بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ يَقُومُونَ فَيَرْكَعُونَ لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً، وَيَسْجُدُونَ سَجْدَتَيْنِ فِي مَكَانِهِمْ، ثُمَّ يَذْهَبُ هؤُلَاءِ إِلَى مَقَامِ أُولَئِكَ، فَيَجِيءُ أُولَئِكَ فَيَرْكَعُ بِهِمْ رَكْعَةً، فَلَهُ ثِنْتَانِ، ثُمَّ يَرْكَعُونَ وَيَسْجُدُونَ سَجْدَتَيْنِ. [خ٤١٣١، م٨٤١].

**ژ سەهلێ كورێ ئەبی حەسمەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئیمام دێ بەرامبەر قیبلەیێ راوەستیت و كۆمەك ژ وان دێ د گەل وی بن، و كۆمەك دێ بەرامبەر دژمنی بن و بەرێ خۆ دەنە وان، ڤێجا دێ ركعەتەكێ ب وان كەت یێت د گەل وی پاشی دێ رابن دێ بۆ خۆ ركوعێ بەن و دو سوجدەیان د جهێ خۆدا پاشی ئەو دێ چنە جهێ ئەوێت دی و ئەو دێ هێن و ئیمام دێ ركعەتەكێ ب وان كەت بۆ وی (ئیمامی) بوونە دو ركعەت، پاشی دێ ركعەتەكا دی كەن و دو سوجدەیان بەن.**

١٥٤٤ - (ق) عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، عَمَّنْ شَهِدَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ ذَاتِ الرِّقَاعِ صَلَّى صَلَاةَ الْخَوْفِ: أَنَّ طَائِفَةً صَفَّتْ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ وِجَاهَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّتِي مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ثَبَتَ قَائِماً، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَصَفُّوا وِجَاهَ الْعَدُوِّ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى فَصَلَّى بِهِمُ الرَّكْعَةَ الَّتِي بَقِيَتْ مِنْ صَلَاتِهِ ثُمَّ ثَبَتَ جَالِساً، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ. [خ٤١٢٩، م٨٤٢].

ژ سالحێ كورێ خەوواتی (رضي الله عنه) ژ وی یێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا شەرێ (ذَاتِ الرِّقَاعِ) نڤێژا ترسێ كری: كۆمەك د گەل وی ریز بوون و كۆمەك راستا دژمنی راوەستان، ڤێجا ركعەتەك ب وان یێت د گەل وی كر، پاشی ما راوەستای و وان بۆ خۆ تمام كر، و پاشی چۆن بەرامبەری دژمنی راوەستان، و كۆما دی هاتن و ركعەتا مایی ژ نڤێژا وی ب وان كر، پاشی روینشتی د جهێ خۆدا ما، و وان بۆ خۆ ركعەتا مایی تمام كر پاشی سلاڤا ملان ب وان ڤەدا.



پەرستن

# الكتاب الثامن
# قصر الصلاة وجمعها وأحكام السفر

# كتێبا هەشتێ
# كورتكرن و كۆمكرنا نڤێژێ و فەرمانێت وەغەرێ

# الفصل الأول: قصر الصلاة وجمعها.

## پشكا ئێكێ: كورتكرن و كۆمكرنا نڤێژێ.

## ١ ـ باب: قصر الصلاة

## بابەتێ: كورتكرنا نڤێژێ.

١٥٤٥ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ قَالَتْ: فَرَضَ اللهُ الصَّلاةَ حِينَ فَرَضَهَا، رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ، فَأُقِرَّتْ صَلاَةُ السَّفَرِ، وَزِيدَ فِي صَلاَةِ الْحَضَرِ. [خ٣٥٠/ م٦٨٥].

**ژ عائیشایێ دایكا باوەریداران (رضي الله عنها) گۆت: خودێ نڤێژ فەرز كر، دەمێ فەرز كری دو ركعەت دو ركعەت د خۆجهی و وەغەرێدا، ئینا د وەغەرێدا وەكی خۆ ما و د خۆجهییێدا هاتە زێدەكرن.**

١٥٤٦ – (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّيْتُ الظُّهْرَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِالمدِينَةِ أَرْبَعاً، وَالْعَصْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ. [خ١٠٨٩/ م٦٩٠].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: من نڤێژا نیڤرۆ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) ل مەدینەیێ چوار ركعەت كرن و نڤێژا ئێڤاری ل زیلحولەیفەیێ[1] دو ركعەت.**

١٥٤٧ – (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فَرَضَ اللهُ الصَّلاَةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ (ﷺ) فِي الْحَضَرِ أَرْبَعاً، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً. [م٦٨٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خودێ ل سەر ئەزمانێ پێغەمبەرێ هەوە (ﷺ) نڤێژ ل خۆجهییێ چوار ركعەت و د وەغەرێدا دو ركعەت و د ترسێدا ركعەتەك فەرز كرییە.**

١٥٤٨ – (م) عَنْ يَحْيَى بْنِ يَزِيدَ الْهُنَائِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ عَنْ قَصْرِ الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا خَرَجَ مَسِيرَةَ ثَلاَثَةِ أَمْيَالٍ، أَوْ ثَلاَثَةِ فَرَاسِخَ ـ شُعْبَةُ الشَّاكُّ ـ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. [م٦٩١].

---

(١) نوكە ب نەبیار عەلی دهێتە نیاسین، جهێ ئیحرام بەستنێت خەلكێ مەدینەیێ و یێ د وێرێرا دچیت، نێزیكی (١٣) كم ژ مەدینەیێ دویرە.

**ژ یەحیایێ کورێ یەزیدێ هونائی (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیارا نڤێژ کورتکرنێ ژ ئەنەسێ کورێ مالکی کر؟ ئینا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر قۆناغا سێ میلان[1] یان سێ فەرسەخان[2] دەرکەفتبا ـ گۆمانکار شوعبەیە ـ دو رکعەت دکرن.**

١٥٤٩ – (م) عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ [النساء:١٠١] فَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ! فَقَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ ذلِكَ، فَقَالَ: (**صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ**). [م٦٨٦].

**ژ یەعلایێ کورێ ئومەییەیی (رضي الله عنه) گۆت من گۆتە عومەرێ کورێ خەتتابی** ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾[3] **و خەلك ئێمن بوو! ئینا گۆت ئەز ژ وێ حێبەتی بووم یا تو ژێ حێبەتی بووی، ئینا من پرسیارا وێ چەندێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر: گۆت: (خێرەکە خودێ د گەل هەوە کری ڤێجا خێرا خودێ قەبویل بکەن).**

١٥٥٠ – عَنْ عُمَرَ بنِ الخطابِ قَالَ: (**صَلاَةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَانِ، وَصَلاَةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَانِ، وَصَلاَةُ الْأَضْحَى رَكْعَتَانِ، وَصَلاَةُ السَّفَرِ رَكْعَتَانِ، تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ**) عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ (ﷺ).[ن١٤١٩/ جه١٠٦٣]

* صحيح.

**ژ عومەرێ کورێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت: (نڤێژا خوتبێ دو رکعەتن و نڤێژا جەژنا رەمەزانێ دو رکعەتن و نڤێژا عەیدا حەجییان دو رکعەتن و نڤێژا تێشتەگەهێ دو رکعەتن و نڤێژا وەغەرێ دو رکعەتن د تمامن نە د کورتن) ل سەر ئەزمانێ موحەممەدی (ﷺ).**

---

(١) ب پیڤەرێ نەڤرۆ سێ میل دبنە پێنج کلم.

(٢) ب پیڤەرێ نەڤرۆ سێ فەرسەخ دبنە چواردە کلم.

(٣) رامانا ئایەتێ ب کورتی: و ئەگەر هەوە وەغەرەك (ئانکو: سەفەرەك) د ئەردیدا کر، چو گونەه ل سەر هەوە نینە، هوین نڤێژا (چار رکاعەت) کورت بکەن، ئەگەر هوین ترسیان ئەوێت گاور هەوە ئەزیەت بدەن.

## ٢ ـ باب: مدة القصر ومسافته.

## بابەتێ: دەمێ كورتكرنێ و دویراتییا وێ.

١٥٥١ - (ق) عَنْ يَحْيى بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَساً يَقولُ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) مِنَ المدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى المدِينَةِ. قُلْتُ: أَقَمْتُمْ بِمَكَّةَ شَيْئاً؟ قَالَ: أَقَمْنَا بِهَا عَشْراً. [خ١٠٨١/ م٦٩٣].

**ژ یەحیایێ كوڕێ ئەبی ئیسحاقی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: من ژ ئەنەسی گوه لێ بوو دگۆت: ئەم د گەل پێغەمبەری (ﷺ) ژ مەدینەیێ بۆ مەكەهێ دەركەفتین، وی دو ركعەت دو ركعەت نڤێژ دكرن هەتا ئەم زڤرینەڤە مەدینەیێ، من گۆت: هوین تشتەكی ل مەدینەیێ مان؟ گۆت: ئەم دەه رۆژان لێ ماین.**

١٥٥٢ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَقَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) تِسْعَةَ عَشَرَ يَقْصُرُ، فَنَحْنُ إِذَا سَافَرْنَا تِسْعَةَ عَشَرَ قَصَرْنَا، وَإِنْ زِدْنَا أَتْمَمْنَا. [خ١٠٨٠].

- وفي رواية له: قال: أقام النَّبِيُّ (ﷺ) بمكةَ تسعةَ عشرَ يوماً يصلي ركعتين. [خ٤٢٩٨].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نوازدە رۆژان ما نڤێژ كورت دكر و ئەگەر مە نوازدە رۆژان وەغەر كربا مە كورت دكر و ئەگەر مە زێدە كربا مە نڤێژ تمام دكر.**

- **و د ڤەگێڕەكا دیدا یا وی: گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) نوازدە رۆژان ما ل مەكەهێ نڤێژ دو ركعەت دكرن.**

١٥٥٣ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِتَبُوكَ عِشْرِينَ يَوْماً يَقْصُرُ الصَّلاَةَ. [د١٢٣٥]

* صحيح.

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بیست رۆژان ما ل تەبووكێ نڤێژ كورت دكرن.**

## ٣ - باب: قصر الصلاة بمنىً.

## بابەتێ: كورتكرنا نڤێژێ ل مینایێ.

١٥٥٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِمِنى رَكْعَتَيْنِ، وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَمَعَ عُثْمَانَ صَدْراً مِنْ إِمَارَتِهِ، ثُمَّ أَتَمَّهَا. [خ١٠٨٢/ م٦٩٤].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من نڤێژ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) و ئەبوبەكری و عومەری و عوسمانی ل دەستپێكا فەرمانداریيا وی ل مینایێ دو ركعەت كرن، پاشی عوسمانی تمام كر چوار ركعەت كرن.**

١٥٥٥ - (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: صَلَّى بِنَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ رضي الله عنه بِمِنى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، فَقِيلَ ذَلِكَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه فَاسْتَرْجَعَ، ثُمَّ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بِمِنى رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه بِمِنى رَكْعَتَيْنِ، وَصَلَّيْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه بِمِنى رَكْعَتَيْنِ، فَلَيْتَ حَظِّي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ رَكْعَتَانِ مُتَقَبَّلَتَانِ. [خ١٠٨٤/ م٦٩٥].

**ژ عەبدولرەحمانێ كوڕێ یەزیدی (رضي الله عنه) گۆت: عوسمانێ كوڕێ عەففانی (رضي الله عنه) ل مینایێ چوار ركعەت نڤێژ ب مە كرن، ئەڤە بۆ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) هاتە گۆتن، ئینا گۆت** (إنا لله وإنا اليه راجعون) **پاشی گۆت: د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مینایێ من دو ركعەت نڤێژ پێت كرین، و ل مینایێ دو ركعەت نڤێژ من د گەل ئەبوبەكری (رضي الله عنه) پێت كرین، و ل مینایێ دو ركعەت نڤێژ من د گەل عومەری (رضي الله عنه) پێت كرین و خۆزی بارا من ژ چوار ركعەتان دو ركعەتێت قەبویلكریبانە.**

## ٤ - باب: التطوع في السفر.

## بابەتێ: نڤێژێت سونەت د وەغەرێدا.

١٥٥٦ - (ق) عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ قَالَ: سَافَرَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما فَقَالَ: صَحِبْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَلَمْ أَرَهُ يُسَبِّحُ فِي السَّفَرِ، وَقَالَ اللهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾. [خ١١٠١/ م٦٨٩]

ولمسلم: عن حفصِ بْنِ عاصمٍ قَالَ: صَحِبْتُ ابْنَ عُمَرَ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ. قَالَ: فَصَلَّى لَنَا الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَقْبَلَ وَأَقْبَلْنَا مَعَهُ حَتَّى جَاءَ رَحْلَهُ، وَجَلَسَ وَجَلَسْنَا مَعَهُ، فَحَانَتْ مِنْهُ الْتِفَاتَةٌ نَحْوَ حَيْثُ صَلَّى فَرَأَى نَاساً قِيَاماً، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلاءِ؟ قُلْتُ: يُسَبِّحُونَ، قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُسَبِّحاً لأَتْمَمْتُ صَلاَتِي. يَا ابنَ أَخِي!

إِنِّي صَحِبْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فِي السَّفَرِ، فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، وَصَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، وَصَحِبْتُ عُمَرَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ. ثُمَّ صَحِبْتُ عُثْمَانَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ، وَقَدْ قَالَ اللهُ: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ [الأحزاب: ٢١]. [م٦٨٩، ٦٩٤/١٨].

**ژ حەفسەیێ كوڕێ عاسمی (رحمه الله) گۆت: ئیبن عومەر (خودێ ژ وان رازی بیت) وەغەر كر ئینا گۆت: من وەغەرا د گەل پێغەمبەری (ﷺ) كری و من نەدیتییە سونەت د وەغەرێدا دكرن، و خودایێ هەر ب هێز و مەزن دبێژیت:** ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[1].

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا دبێژیت: ژ حەفسەیێ كوڕێ عاسمی گۆت: من هەڤالینییا ئیبن عومەری ل رێكا مەكەهێ كر، گۆت: نڤێژا نیڤرۆ دو ركعەت ب مە كرن پاشی بەرێ خۆ دا مە و مە ژی بەرێ خۆ دایێ هەتا ل دەڤ بارێ خۆ روینشتی و ئەم ژی د گەل روینشتین، بەرێ خۆ دا ئەو جهێ نڤێژ لێ كری خەلك دیت یێ ژ پیاڤە، ئینا گۆت: ئەڤە چ دكەن؟! من گۆت: سونەتان دكەن، گۆت: ئەگەر من سونەت كربا دا نڤێژا خۆ تمام كەم، برازا من وەغەرا د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كری و ژ دو ركعەتان زێدەتر نەكرییە هەتا خودێ برییە دەڤ خۆ، و من وەغەرا د گەل ئەبوبەكری كری و ژ دو ركعەتان زێدەتر نەكرییە هەتا خودێ برییە دەڤ خۆ، و من وەغەرا د گەل عومەری كری و ژ دو ركعەتان زێدەتر نەكرییە هەتا خودێ برییە دەڤ خۆ، و من وەغەرا د گەل عوسمانی كری و ژ دو ركعەتان زێدەتر نەكرییە هەتا خودێ برییە دەڤ خۆ، و خودایێ مەزن دبێژیت:** ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾.

(١) رامان ب كورتی: ب سویند پێغەمبەرێ خودێ بۆ هەوە باشترین نموونە بوو چاڤ لێ بێتە كرن.

## ٥ ـ باب: التطوع في السفر على الدواب.

## بابەتێ: کرنا سونەتێ د وغەرێدا ل سەر پشتا دەواری.

١٥٥٧ – (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَسِيرُ مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ بِطَرِيقِ مَكَّةَ، فَقَالَ سَعِيدٌ: فَلَمَّا خَشِيتُ الصُّبْحَ نَزَلْتُ، فَأَوْتَرْتُ، ثُمَّ لَحِقْتُهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: أَيْنَ كُنْتَ؟ فَقُلْتُ: خَشِيتُ الصُّبْحَ فَنَزَلْتُ فَأَوْتَرْتُ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: أَلَيْسَ لَكَ فِي رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ؟ فَقُلْتُ: بَلَى وَاللهِ! قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يُوتِرُ عَلَى الْبَعِيرِ. [خ٩٩٩/ م٧٠٠].

**ژ سەعیدێ کورێ یەساری (رحمه الله) وی گۆت: ئەز ل رێکا مەکەهێ د گەل ئیبن عومەری دچۆم، ڤێجا دەمی ئەز ترسیام سپێدە ببیت، ئەز هاتمە خوارێ و من ویتر کر و پاشی ئەز ڤێرا گەهشتم، ئینا عەبدوللایێ کورێ عومەری گۆتە من: تو ل کیرێ بووی؟ من گۆت: ئەز ترسیام سپێدە ببیت ئەز هاتمە خوارێ من ویتر کر، ئینا عەبدوللایی گۆت: ما پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ تە باشترین نموونە نینە؟ من گۆت: بەلێ ئەز ب خودێ کەمە، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ویتر ل سەر پشتا حێشترێ دکر.**

١٥٥٨ – (خ) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ، فَإِذَا أَرَادَ الْفَرِيضَةَ، نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ. [خ٤٠٠].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا سونەت ل سەر پشتا دەوارێ خۆ دکر هەر جهێ دەواری بەرێ خۆ دابایێ، و ئەگەر نڤێژا فەرز ڤیابا دهاتە خوارێ و بەرێ خۆ ددا قیبلەیێ.**

## ٦ ـ باب: الجمع بين الصلاتين في السفر.

## بابەتێ: کۆمکرنا دو نڤێژان د وەغەرێدا.

١٥٥٩ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاَةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ إِذَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ سَيْرٍ، وَيَجْمَعُ بَيْنَ المَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ.[خ١١٠٧ معلقاً].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاری د گەلێك کۆم دکرن ئەگەر ل سەر وەغەرێبایە و مەغرەب و عەیشا د گەلێك کۆم دکرن.**

١٥٦٠ - (م) عَنْ مُعَاذٍ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَكَانَ يُصَلِّي الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعاً، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءِ جَمِيعاً. [م٧٠٦].

**ژ موعازی (رضي الله عنه) گۆت: ل خەزایا تەبووكێ ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفتین، وی نیڤرۆ و ئێڤاری هەمی پێكڤە دكرن و مەغرەب و عەیشا هەمی پێكڤە دكرن.**

## ٧ ـ باب: الجمع بين الصلاتين في الحضر.

## بابەتێ: كۆمكرنا دو نڤێژان د خۆجهییێدا.

١٥٦١ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعاً، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعاً، فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ سَفَرٍ. لا [م٧٠٥].

- وفي رواية: بِالْمَدِينَةِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ.[م٧٠٥م].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاری پێكڤە و مەغرەب و عەیشا پێكڤە كرن و نە ترس هەبوو و نە وەغەر.**

- **و د ڤەگێرەكا دیدا: ل مەدینەیێ نە ژ ترسێ و نە ژ بارانێ.**

## ٨ ـ باب: من أجمع الإقامة أتم.

## بابەتێ: هەركەسێ رژد بیت خۆجه ببیت دێ نڤێژێ تمام كەت.

١٥٦٢ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ يَعْنِي ابْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا أَجْمَعُ الْمَقَامَ بِبَلَدٍ، أَتَمَّ الصَّلاَةَ. [هق٣/١٤٦].

**ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: عەبدوللایێ ئانكو: ئیبن عومەری ئەگەر رژد ببا ل جهەكی خۆجه ببیت نڤێژ تمام دكر.**

١٥٦٣ - عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: مَنْ أَجْمَعَ عَلَى إِقَامَةِ أَرْبَعِ لَيَالٍ وَهُوَ مُسَافِرٌ، أَتَمَّ الصَّلاَةَ. [هق٣/١٤٨].

**ژ سەعیدێ كوڕێ موسەییەبی (رحمه الله) گۆت: هەر كەسێ رژد بوو چوار شەڤان خۆجه ببیت و ئەو رێڤینگ بیت دێ نڤێژێ تمام كەت.**

## ٩ - باب: المسافر يؤم المقيمين.

### بابەتێ: رێڤینگ نڤێژێ ل بەری خۆجهان بكەت.

١٥٦٤ - عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ الله: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رضي الله عنه كَانَ إِذَا قَدِمَ مَكَّةَ صَلَّى لَهُمْ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ مَكَّةَ أَتِمُّوا صَلاَتَكُمْ فَإِنَّا قَوْمٌ سَفْرٌ. [هق٣/١٢٦].

**ژ سالمێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەگەر عومەرێ كورێ خەتتابی هاتبا مەكەهێ دو ركعەت پێشیا وان دكر، پاشی دا بێژیت: گەلی خەلكێ مەكەهێ نڤێژا خۆ تمام كەن ب راستی ئەم كەسێت وەغەرچینە.**

## ١٠ - باب: المسافر يأتم بالمقيم.

### بابەتێ: رێڤینك نڤێژێ ل پشت خۆجهی بكەت.

١٥٦٥ - عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عُمَرَ: الْمُسَافِرُ يُدْرِكُ رَكْعَتَيْنِ مِنْ صَلاَةِ الْقَوْمِ، يَعْنِي الْمُقِيمِينَ، أَتُجْزِيهِ الرَّكْعَتَانِ أَوْ يُصَلِّي بِصَلاَتِهِمْ؟ قَالَ: فَضَحِكَ، وَقَالَ: يُصَلِّي بِصَلاَتِهِمْ. [هق٣/١٥٧].

**ژ بابێ میجلەزی (ﷺ) گۆت: من گۆتە ئیبن عومەری: ئەگەر رێڤینگ گەهشتە دو ركعەتێت خۆجهان ئەو دو ركعەت بەسی وینە یان دێ ب نڤێژا وان نڤێژێ كەت؟ گۆت: كرە كەنی و گۆت: دێ نڤێژێ ب نڤێژا وان كەت.**

١٥٦٦ - عَنْ الشَّعْبِي: أَنَّ ابْن عُمَر كَانَ إِذَا كَانَ بِمَكَّةَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يَجْمَعَهُ إِمَامٌ فَيُصَلِّي بِصَلاَتِهِ، فَإِنْ جَمَعَهُ الإِمَامُ يُصَلِّي بِصَلاَتِهِ. [مه٩٥٤]

* إسناده صحيح.

**ژ شەعبی (ﷺ) گۆت: دەمێ ئیبن عومەر ل مەكەهێ دو ركعەت دو ركعەت دكرن، ئەو نەبیت د گەل ئیمامەكی كۆم ببا ب نڤێژا وی نڤێژ دكر، ئەگەر ئیمامی كۆم كربا ب نڤێژا وی نڤێژ دكر.**

## ١١ ـ باب: الجمع في المطر.

## بابەتێ: کۆمکرنا نڤێژان د بارانێدا.

١٥٦٧ – عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا جَمَعَ الْأُمَرَاءُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي الْمَطَرِ جَمَعَ مَعَهُمْ. [ط:٣٣٣].

**ژ نافعی (ﷺ) گۆت: ئیبن عومەری ئەگەر سەرکردەیان نڤێژ د ناڤبەرا مەغرەب و عەیشادا د بارانێدا کۆم کربان وی ژی د گەل وان کۆم دکر.**

١٥٦٨ – عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ أَنَّ أَبَاهُ عُرْوَةَ وَسَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ وَأَبَا بَكْرِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ الْمَخْزُومِي كَانُوا يَجْمَعُونَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ، إِذَا جَمَعُوا بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ وَلاَ يُنْكِرُونَ ذَلِكَ. [هق٣/١٦٨].

**ژ هیشامێ کوڕێ عوروەی (ﷺ) گۆت: بابێ وی عوروە و سەعیدێ کوڕێ موسەییەبی و ئەبوبەکرێ کوڕێ عەبدولرەحمانێ کوڕێ حارسی کوڕێ هیشامێ کوڕێ موغیرەیێ مەخزومی، وان د شەڤا بارانێدا نڤێژ د ناڤبەرا مەغرەب و عەیشادا کۆم دکر، و ئەگەر وان د ناڤبەرا دو نڤێژاندا کۆم کربانە ئەڤە وان نەدورست نەددانان.**



## الفصل الثاني: أحكام السفر.

## پشکا دووێ: فەرمانێت وەغەرێ

### ١ ـ باب: السفر قطعة من العذاب.

### بابەتێ: وەغەر پارچەکە ژ ئیزایێ.

١٥٦٩ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ، يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَنَوْمَهُ، فَإِذَا قَضَى نَهْمَتَهُ؛ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ**). [خ١٨٠٤/ م١٩٢٧]

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(وەغەر پارچەکا ئیزایە ئێك ژ هەوە ژ خوارنا وی و ڤەخوارنا وی و نڤستنا وی ڤەدکەت، ڤێجا هەکە ئێك ژ هەوە هەوجەیا خۆ ڤەتاند بلا بەر ب مالا خۆڤە لەزێ بکەت).**

### ٢ ـ باب: لا تسافر المرأة إلا مع محرم.

### بابەتێ: ژن وەغەرێ ناکەت د گەل مەحرەمی نەبیت.

١٥٧٠ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ ثَلاَثاً؛ إِلاَّ مَعَ ذِي مَحْرَمٍ**). [خ١٠٨٧ (١٠٨٦)/ م١٣٣٨].

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ژن سێ رۆژان وەغەرێ نەکەت د گەل مەحرەمەکی[1] نەبیت).**

١٥٧١ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ لَيْسَ مَعَهَا حُرْمَةٌ**). [خ١٠٨٨/ م١٣٣٩].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نەدورستە بۆ ژنەکێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت ڤۆناغا شەڤەك و رۆژەکێ ب تنێ وەغەرێ بکەت ژ بلی د گەل مەحرەمەکێ خۆ بیت).**

---

(١) مەحرەم: هەڤژینێ ژنێیە و هەر کەسێ هەتا هەتا دورست نەبیت هەڤژینییێ د گەل بکەت، نانکو: حەرامە بۆ هەتا هەتا شوی پێ بکەت وەکی بابێ خالێ مامێ برازای و خوارزای و نەڤی و .....هتد.

## ٣ ـ باب: لا يسافر منفرداً.

### بابەتێ: کەس ب تنێ وەغەرێ نەکەت.

١٥٧٢ – (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ ما فِي الْوَحْدَةِ ما أَعْلَمُ، ما سَارَ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ**). [خ٢٩٩٨].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئەوا ئەز دزانم ژ چۆنا ب تنێ خەلکی زانیبا چو سویار ب شەڤ ب تنێ نەچۆن).**

١٥٧٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الرَّاكِبُ شَيْطَانٌ، وَالرَّاكِبَانِ شَيْطَانَانِ، وَالثَّلاَثَةُ رَكْبٌ**). [د٢٦٠٧/ ت١٦٧٣]

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سویارەك شەیتانە و دو سویار دو شەیتانن و سێ کاروانن)[1].**

## ٤ ـ باب: دعاء السفر.

### بابەتێ: دوعایا وەغەرێ.

١٥٧٤ – (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجاً إِلَى سَفَرٍ، كَبَّرَ ثَلاَثاً، ثُمَّ قَالَ: (﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ۝١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ۝١٤﴾ [الزخرف]. **اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى. اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرنَا هَذَا، وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ. اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ، وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ، فِي الْمَالِ وَالأَهْلِ**). وَإِذَا رَجَعَ قَالَهُنَّ، وَزَادَ فِيهِنَّ: (آيِبُونَ، تَائِبُونَ، عَابِدُون، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ). [م١٣٤٢].

**ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل حێشترا خۆ سویار دبوو و دڤیا بۆ وەغەرەکێ دەرکەڤیت سێ جاران دگۆت: الله أكبر، پاشی دگۆت: ( ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا**

---

(١) رامان: سویارەك (رێڤنگەك ب تنێ) شەیتانەك یێ د گەل و دو سویار دو شەیتان یێ د گەل و سێ سویار دبنە کۆم و کاروان و ئێکی دێ کەنە رێبەر و سەرکێش و شەیتان ژ وان دویر دکەڤن.

**لَمُنقَلِبُونَ﴾** [1]**یا خودێ ئەم د ڤێ وەغەرا خۆدا داخوازا باشی و پارێزكارییێ ژ تە دكەین و ژ وی كارێ یێ تو پێ رازی، یا خودێ ڤێ وەغەرا مە ل سەر مە سڤك بكە، و دویراتییا وێ بۆ مە بگەهینە ئێك و نێزیك بكە، یا خودێ تو هەڤالی د وەغەرێدا و تویی جهێ پشتراستبوونێ د مالێدا، یا خودێ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ زەحمەتا وەغەرێ و دیمەنێ دلئێش و زڤرینا خراب د مال و كەس و كار و زارۆكاندا).** و دەمێ دزڤری ژی هەر ئەڤە دگۆت و لێ زێدە دكر: **(ئەم زڤرین و تەوبەدارین و خودێ پەرێسین و شوكرا خودایێ خۆ ب تنێ دكەین).**

٥ ـ باب: ما يقول إذا قفل من سفر حج وغيره.

**بابەتێ: كا دێ چ بێژیت ئەگەر ژ وەغەرا خۆ یا حەجێ زڤریڤە.**

١٥٧٥ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كانَ إِذَا قَفَلَ مِنْ غَزْوٍ أَوْ حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ يُكَبِّرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ مِنَ الأَرْضِ ثَلاَثَ تَكْبِيرَاتٍ، ثُمَّ يَقُولُ: **(لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عابِدُونَ سَاجِدُونَ، لِرَبِّنَا حامِدُونَ، صَدَقَ اللهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ).** [خ١٧٩٧/ م١٣٤٤].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ ژ حەجێ یان ژ عومرێ دزڤری هەرگاڤا ب سەر رێكەكا چیای سەركەتبا یان ب سەر گركەكێ ئەردی كەتبا سێ جاران دگۆت: الله أكبر، پاشی دگۆت: (لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ) ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت و یێ بێ شریك و بێ هەڤاله و هەمی مولك و سەروەری و پەسن و حەمد بۆ وینە و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە، ئەم زڤرین و تەوبەدارین و خودێ پەرێسین و شوكرا خودایێ خۆ ب تنێ دكەین، پەیمانا خۆ ب جە ئینا و بەندەیێ خۆ ب سەر ئێخست و وی ب تنێ هەڤپەیمان شكاندن).**

---

[1] رامانا وێ: پاكی و پاقژی ژ هەمی كێماسییان بۆ وی خودایی، ئەوێ ئەڤە بۆ مە سەرنەرم كرین، و مە ب خۆ نەڤ شیانە نەبوون، و ئەم هەر دێ ب بال خودایێ خۆڤە زڤرین.

## ٦ ـ باب: استقبال المسافر

### بابەتێ: پێشوازییا یێ ژ وەغەرێ زڤری.

١٥٧٦ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَكَّةَ، اسْتَقْبَلَتْهُ أُغَيْلِمَةُ بَنِي عَبْدِ المطَّلِبِ، فَحَمَلَ وَاحِداً بَيْنَ يَدَيْهِ، وَالآخَرَ خَلْفَهُ. [خ١٧٩٨].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) هاتییە مەكەهێ هندە گەنجێت بنەمالا عەبدولموتەلبی هاتنە پێشییا وی، ئێنا ئێك ژ وان ل بەر سینگێ خۆ هەلگرت و یێ دی ل پشت خۆ.**

١٥٧٧ – عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله عنها قَالَتْ: أَقْبَلْنَا مِنْ مَكَّةَ فِي حَجٍّ . أَوْ عُمْرَةٍ . وَأُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ يَسِيرُ بَيْنَ يَدَي رَسُولِ الله (ﷺ)، فَتَلَقَّانَا غِلْمَانٌ مِنَ الأَنْصَارِ، كَانُوا يَتَلَقَّوْنَ أَهَالِيَهُمْ إِذَا قَدِمُوا.[هق٥/٢٦٠].

**ژ عائیشایێ دایكا موسلمانان (رضي الله عنها) گۆت: ئەم ل مەكەهێ ل حەجەكێ یان ل عومرەیەكێ دهاتین، و ئوسەیدێ كورێ حوزەیری ل پێشییا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دچۆ، هندەك گەنجێت ئەنساران هاتنە پێشییا مە وان پێشوازییا مرۆڤێت خۆ دكرن دەمێ دهاتن.**

## ٧ ـ باب: الصلاة إذا قدم من سفر.

### بابەتێ: كرنا سونەتێ ئەگەر ژ وەغەرا خۆ ڤەگەریا.

١٥٧٨ – (ق) عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ لاَ يَقْدَمُ مِنْ سَفَرٍ إِلاَّ نَهَاراً، فِي الضُّحَى، فَإِذَا قَدِمَ، بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ، فَصَلَّى فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ فِيهِ. هذا لفظ مسلم. [خ٣٠٨٨/ م٧١٦].

**ژ كەعبێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ژ چو سەفەرا نەدزڤری ب رۆژێ نەبا و تێشتەگەهێ، و هەكە هاتبا، دەست ب مزگەفتێ دكر، دو ركعەت تێدا دكرن، پاشی تێڤە دروینشتە خوارێ.. و ئەڤە بێژەیا موسلمییە.**

## ٨ ـ باب: لا يطرق أهله ليلاً.

## بابەتێ: ب شەڤ نەهێتە مالا خۆ[1].

١٥٧٩ - (ق) عَنْ جابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: نَهى النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يَطْرُقَ أَهْلَهُ لَيْلاً.

[خ١٨٠١ (٤٤٣)/ م ـ الإمارة: ٧١٥ (١٨٢ ـ ١٨٥)].

- وفي رواية لمسلم قَالَ: نَهى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ يَطْرُقَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ لَيْلاً، يَتَخَوَّنُهُمْ، أَوْ يَلْتَمِسُ عَثَرَاتِهِمْ.

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهی یا كری زەلام ب شەڤ بێتە مالا خۆ و وان هشیار بكەت.**

- **و د ڤەگێڕا موسلمیدا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهی یا كری زەلام ب شەڤ بێتە مالا خۆ هزرا خیانەتێ ژێ بكەت یان ل هەلنگفتنێت وێ بگەریت.**

١٥٨٠ - عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) حِينَ قَدِمَ مِنْ غَزْوِهِ قَالَ: (**لاَ تَطْرُقُوا النِّسَاءَ**)، وَأَرْسَلَ مَنْ يُؤْذِنُ النَّاسَ أَنَّهُ قَادِمٌ الْغَدَ. [هق٩/١٧٤]

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ ژ شەڕەكی ڤەگەریای گۆت: (ب شەڤ نەچنە مالێت خۆ) و ئێك هنارت خەلكی ئاگەهدار بكەت ئەو سوبەهی دێ هێت.**

## ٩ ـ باب: الدعاء إذا نزل منزلاً.

## بابەتێ: دوعایا چۆنا هەر جهەكی.

١٥٨١ - عَنْ صُهَيْبٍ: أَنَّ مُحَمَّداً (ﷺ) لَمْ يَرَ قَرْيَةً يُرِيدُ دُخُولَهَا إِلاَّ قَالَ حِيْنَ يَرَاهَا: (**اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظْلَلْنَ، وَرَبَّ الأَرَضِيْنَ السَّبْعِ وَمَا أَقْلَلْنَ، وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أَضْلَلْنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَا ذَرَيْنَ، فَإِنَّا نَسْأَلُكَ خَيْرَ هذِهِ الْقَرْيَةِ وَخَيْرَ أَهْلِهَا، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وشَرِّ أَهْلِهَا، وَشَرِّ مَا فِيها**). [مخ ٨/٦٧ ـ ٦٩]

* إسناده صحيح.

**ژ سوهەیبی (رضي الله عنه) گۆت: موحەممەدی (ﷺ) گوندەك نەددیت و ڤیابا چۆبا تێدا ئیللا دەمێ ددیت دا بێژیت:: (یا خودێ خودانێ حەفت عەسمانان و یێ سیبەرێ**

---

(١) زانا دبێژن نەڤە بۆ وییە یێ دەمەكێ درێژ وەغەر كربیت و مالا وی چو ژێ نەزانن، بەلێ نەوێ چاڤەرێكرن لێ دهێتە كرن ها نەڤرۆ سوبەهی یان هەر گاڤەكا هەبیت دێ هێت نەڤ فەرمانە ژ وی ناگریت.

**لێ دکەت، و خودانێ حەفت رێزێت عەردی و یێ هەلدگریت، و خودایێ شەیتانان و یێت سەردابرین، و خودایێ بای و یێ د گەل خۆ دبەت، ئەز داخوازا باشییا ڤی گوندی ژ تە دکەم، و باشییا خەلکێ وی، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خرابییا وی، و ژ خرابییا خەلکێ وی و ژ خرابییا تێدا).**

## ١٠ ـ باب: الدعاء عند الوداع.

## بابەتێ: دوعا خاترخواستنێ.

١٥٨١ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أنه كَانَ يَقُولُ لِلرَّجُلِ إِذَا أَرَادَ سَفَراً، ادْنُ مِنِّي، أُوَدِّعْكَ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُوَدِّعُنَا؛ فَيَقُولُ: (**أَسْتَوْدِعُ اللهَ دِينَكَ، وَأَمَانَتَكَ، وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ**). [د٢٦٠٠/ ت٣٤٤٣].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، وی دگۆتە زەلامی هەکە وەغەرەك ڤیابایە: نێزیکی من ببە دا خاترخواستنا تە بکەم هەروەکی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خاترخواستنا مە دکر، دگۆت: (ئەز دینێ تە و ئەمانەتێ د ستۆیێ تەدا ژ فەرمانێت شەرعی و مافێت مرۆڤان و دویماهی کارێ تە ئەمانەتی خودێ دکەم).**

١٥٨٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: وَدَّعَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**أَسْتَوْدِعُكَ اللهَ الَّذِي لاَ تَضِيعُ وَدَائِعُهُ**). [جه٢٨٢٥]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خاترخواستنا من کر ئینا گۆت: (ئەز دینێ تە ئەمانەتی خودێ دکەم ئەوێ ئەمانەتێت وی بەرزە نەبن).**

## ١١ ـ باب: استحباب السفر يوم الخميس.

## بابەتێ: باشدانانا وەغەرکرنا رۆژا پێنج شەمبی.

١٥٨٣ – (خ) في حديث توبة كعب: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَرَجَ يَوْمَ الخَمِيسِ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يَخْرُجَ يَوْمَ الخَمِيْسِ. [خ٢٩٥٠]

**ژ کەعبێ کورێ مالکی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا پێنج شەمبی دەرکەفتە تەبووکێ، و حەز دکر رۆژا پێنج شەمبی دەرکەڤیت.**

## ١٢ ـ باب: التبكير في السفر وغيره

### بابەتێ: دەستپێکا رۆژێ د گەشتێ و غەیری وێدا

١٥٨٤ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا). [جه٢٢٣٨]

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یا خودێ بەرەکەتێ بۆ ئوممەتا من بێخە هشیاربوونا وان دەستپێکا رۆژێ).**

## ١٣ ـ باب: الثلاثة يؤمرون أحدهم.

### بابەتێ: سێ رێڤینگ ئێکی دێ کەنە سەردار.

١٥٨٥ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا خَرَجَ ثَلَاثَةٌ فِي سَفَرٍ، فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ). [د٢٦٠٨].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەکە سێ بۆ وەغەرەکێ دەرکەفتن بلا ئێکی ژ خۆ بکەنە سەردار).**

## ١٤ ـ باب: الإطعام عند القدوم من سفر.

### بابەتێ: دانا خوارنێ دەمێ ژ وەغەرێ دزڤریت.

١٥٨٦ – (ق) عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ نَحَرَ جَزُوراً أَوْ بَقَرَةً.

[خ٣٠٨٩/ م ـ المساقاة: ٧١٥ (١١٥، ١١٦)]

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زڤڕییە مەدینەیێ حێشترەك یان چێلەك سەرژێ کر.**



# الجنائز

# جنازەیان

## ١ ـ باب: تلقين الموتى: لا إله إلا الله.

## بابەتێ: نیشادان و بیرئینانا كەسێت ل بەر مرنێ ب گۆتنا (لا إله إلا الله).

١٥٨٧ – (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ**).[م٩١٦]

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ((لا إله إلاّ الله) بیننە بیرا یێت بەر مرنێ ژ خۆ و نیشا بدەن).**

١٥٨٨ – عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ**). [د٣١١٦].

* صحيح.

**ژ مەعازێ كوڕێ جەبەلی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ دویماهی ئاخفتنا وی (لا إله إلاّ الله) بیت ئەو چۆ بەحەشتێ).**

## ٢ ـ باب: ما يقال عند المصيبة

## بابەتێ: ل دەمێ موسیبەتێ چ بێژیت

١٥٨٩ – (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَا مِنْ مُسْلِمٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ، فَيَقُولُ مَا أَمَرَهُ اللهُ: إِنَّا للهِ وإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللَّهُمَّ أجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْراً مِنْهَا؛ إِلاَّ أَخْلَفَ اللهُ لَهُ خَيْراً مِنْهَا**).

قَالَتْ: فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ قلْتُ: أَيُّ الْمُسْلِمِينَ خَيْرٌ مِنْ أَبِي سَلَمَةَ؟ أَوَّلُ بَيْتٍ هَاجَرَ إِلَى رَسُولِ اللهِ، (ﷺ) ثُمَّ إِنِّي قُلْتُهَا، فَأَخْلَفَ اللهُ لِي رَسُولَ اللهِ (ﷺ). [م٩١٨]

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) وێ گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نینە بەندەیەك بەلایەك [ ئاتافەك ] ب سەری بهێت، بێژیت، ب راستی ئەم هەر یێت خودێینە [ ئانكو ئەم بەندەیێت وینە ]، و هەر دێ ب بال ویڤە زڤڕین، یا خودێ بەلایا من ب خێر بۆ من بنڤیسە، و باشتر بۆ من ل جهی دانە ئەگەر خودێ باشتر بۆ شوینێ نەدانیت).**

**ئوم سەلەمەیێ گۆت: ڤێجا دەمێ ئەبو سەلەمە مری من گۆت: ما كی ژ موسلمانان ژ ئەبو سەلەمەی باشترە مالا ئێكێ بۆ دەڤ پێغەمبەرێ خودێ مشەخت بووی، پاشی من ئەو گۆت، ئینا خودێ پێغەمبەرێ خودێ بۆ من شوینێ ئینا.**

## ٣ ـ باب: إغماض الميت والدعاء له.

## بابەتێ: دانانا سەرێك و نقاندنا چاڤێت مری و دوعاكرن بۆ وی.

١٥٩٠ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَلَمْ تَرَوْا الإِنْسَانَ إِذَا مَاتَ شَخَصَ بَصَرُهُ)** ؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: **(فَذَلِكَ حِينَ يَتْبَعُ بَصَرُهُ نَفْسَهُ)**. [م٩٢١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هوین نابینن ئەگەر مرۆڤ مر چاڤێت وی دمینن زل)؟! گۆتن بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (ئەو هنگییە دەمێ چاڤێت وی ل دویڤ جانێ وی دزڤرن).**

١٥٩١ - عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذَا حَضَرْتُمْ مَوْتَاكُمْ، فَأَغْمِضُوا الْبَصَرَ، فَإِنَّ الْبَصَرَ يَتْبَعُ الرُّوحَ، وَقُولُوا خَيْراً، فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تُؤَمِّنُ عَلَى مَا قَالَ أَهْلُ الْبَيْتِ)**. [جه١٤٥٥].

* حسن.

**ژ شەددادێ كورێ ئەوسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر هوین هاتنە دەڤ مرییێت خۆ چاڤێت وان داننە سەرێك، ب ڕاستی هەكە رح دەركەڤت چاڤ ل دویڤ دزڤڕن، و ئاخفتنا خێرێ بێژن[1]، ب ڕاستی ملیاكەت ل سەر یا خودانێت مالێ دبێژن، دبێژن: ئامین (ئانكو: یا خودێ قەبویلكە).**

## ٤ ـ باب: الأمر بحسن الظن بالله تعالى عند الموت

## بابەتێ: فەرمانا ب هزرا باش ژ خودێ ل دەمێ مرنێ

١٥٩٢ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَبْلَ مَوْتِهِ بِثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، يَقُولُ: **(لاَ يَمُوتَنَّ أَحَدُكُمْ إِلاَّ وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللهِ عزّ وجل)**. [م٢٨٧٧].

---

(١) ئانكو: نفرینا ل خۆ نەكەن و بێژن ئەم نەمینن و ئاخفتنێت هۆسا.

ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی خودێ ژ هەردووان رازی بیت، وی ژ پێغەمبەری (ﷺ) گوهـ لێ بوو بەری مرنا وی ب سێ رۆژان، دگۆت: **(كەس ژ هەوە نەمریت هەكە هزرا باش ژ خودایێ خۆ یێ ب هێز و مەزن نەكەت).**

١٥٩٣ - (م) وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ). [٢٨٧٨ م].

و ژ وی، (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر بەندەیەك كا ل سەر چ مرییە دێ رۆژا قیامەتێ ل سەر هندێ رابیت).**

## ٥ . باب: إذا خرجت روح الميت.

## بابەتێ: ئەگەر جانێ مری دەركەفت.

١٥٩٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا حُضِرَ الْمُؤْمِنُ، أَتَتْهُ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ بِحَرِيرَةٍ بَيْضَاءَ، فَيَقُولُونَ: اخْرُجِي رَاضِيَةً مَرْضِيّاً عَنْكِ، إِلَى رَوْحِ اللهِ وَرَيْحَانٍ وَرَبٍّ غَيْرِ غَضْبَانَ، فَتَخْرُجُ كَأَطْيَبِ رِيحِ الْمِسْكِ، حَتَّى أَنَّهُ لَيُنَاوِلُهُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً، حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ بَابَ السَّمَاءِ فَيَقُولُونَ: مَا أَطْيَبَ هَذِهِ الرِّيحَ الَّتِي جَاءَتْكُمْ مِنَ الأَرْضِ! فَيَأْتُونَ بِهِ أَرْوَاحَ الْمُؤْمِنِينَ، فَلَهُمْ أَشَدُّ فَرَحاً بِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ بِغَائِبِهِ يَقْدَمُ عَلَيْهِ، فَيَسْأَلُونَهُ مَاذَا فَعَلَ فُلاَنٌ؟ مَاذَا فَعَلَ فُلاَنٌ؟ فَيَقُولُونَ: دَعُوهُ، فَإِنَّهُ كَانَ فِي غَمِّ الدُّنْيَا، فَإِذَا قَالَ: أَمَا أَتَاكُمْ؟ قَالُوا: ذُهِبَ بِهِ إِلَى أُمِّهِ الْهَاوِيَةِ. وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا احْتُضِرَ أَتَتْهُ مَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ بِمِسْحٍ، فَيَقُولُونَ: اخْرُجِي سَاخِطَةً مَسْخُوطاً عَلَيْكِ إِلَى عَذَابِ اللهِ عزّ وجل، فَتَخْرُجُ كَأَنْتَنِ رِيحِ جِيفَةٍ، حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ بَابَ الأَرْضِ فَيَقُولُونَ: مَا أَنْتَنَ هَذِهِ الرِّيحَ؟ حَتَّى يَأْتُونَ بِهِ أَرْوَاحَ الْكُفَّارِ). [ن١٨٣٢].

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر باوەریدار كەفتە بەر مرنێ ملیاكەتێت دلۆڤانییێ دێ ئارمویشەكێ سپی بۆ ئینن و دێ بێژن: رازی وەرە دەر و خودێ ژی ژ تە رازی بۆ لایێ دلۆڤانییا خودێ و رحان و خودایێ ژ تە نەتۆرە، ڤێجا دێ ل خۆشترین بێهنا مسكێ دەركەڤیت هەتا هندەك جانێ وی ددەنەڤ ئێكدو، هەتا دئیننە بەر دەرگەهێ عەسمانی، دێ بێژن: ئەڤ بێهنە چەندا خۆشە ل عەردی بۆ هەوە هاتییە، ڤێجا دێ ئیننە دەڤ جانێت باوەریداران، ئەو باوەریدار ژ ئێك ژ هەوە بەرزە**

**بووی بۆ وی بزڤریتەڤە دلخۆشترن ب وی، دێ پرسیاران ژێ کەن فلانی چ کر؟ فلانی چ کر؟؟ ڤێجا دێ بێژن: وی بهێلن چونکی ئەو د ناڤ نەخۆشی و خەمێت دنیایێدا بوو، ڤێجا ئەگەر گۆت: ما ئەو نەهاتییە دەڤ هەوە؟ دێ بێژن: یێ هاتییە برن بۆ جەهنەمێ. و گاور ئەگەر کەفتە بەر مرنێ مەلائیکەتێت ئیزایێ دێ ب پەرۆکەکێ ژ موییێ زڤرڤە هێنە دەڤ و دێ بێژنە جانێ وی نەرازی وەرە دەر نەرازالێکری بۆ ئیزایا خودایێ هەر ب هێز و مەزن، ڤێجا دێ وەك گەنیتر بێهنا کەلەخەکی دەرکەڤیت هەتا دئیننە بەر دەرگەهێ عەسمانێ عەردی ملیاکەت دێ بێژن: ئەڤ بێهنە چەندا گەنییە هەتا دئیننە دەڤ جانێت گاوران.**

## ٦ ـ باب: البكاء على الميت.

## بابەتێ: گریا ل سەر مری.

١٥٩٥ – (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَرْسَلَتْ ابْنَةُ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَيْهِ: إِنَّ ابْناً لِي قُبِضَ فَائْتِنَا، فَأَرْسَلَ يُقْرِئُ السَّلَامَ، وَيَقُولُ: (**إِنَّ للهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ ما أَعْطَى، وَكُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ**). فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ تُقْسِمُ عَلَيْهِ لَيَأْتِيَنَّهَا، فَقَامَ وَمَعَهُ: سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَمَعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَرِجَالٌ، فَرُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ. قَالَ: حَسِبْتُهُ أَنَّهُ قَالَ: كَأَنَّهَا شَنٌّ. فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسولَ اللهِ ما هذَا؟ فَقَالَ: (**هذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللهُ مِنَ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ**). [خ١٢٨٤/ م٩٢٣].

**ژ ئوسامەیێ کورێ زەیدێ کورێ حاریسەی، ئازاکرییێ پێغەمبەری (ﷺ)، خۆشتڤییێ پێغەمبەری و کورێ خۆشتڤییێ پێغەمبەری، خودێ ژ هەردووکان رازی بیت، گۆت: کچا پێغەمبەری (ﷺ) ڤرێکر، کورێ من یێ د سەکەراتێدا وەرە دەڤ مە. ئێك ڤرێکر، سلاڤان لێ بکەت و بێژیتێ: (هەر چییێ خودێ دبەت یێ وییە، و هەر چییێ خودێ ددەت یێ وییە، و هەمی تشتان ل دەڤ وی رۆژەك و دویماهییەکا هەی، سەبرێ بکێشە، و خێرێ بۆ خۆ بدانە) ڤرێکرەڤە دویڤرا و ب خودێ دا سویندێ هەر بهێت، ئینا رابوو و سەعدێ کورێ عوبادەی، و مەعازێ کورێ جەبەلی، و ئوبەیێ کورێ کەعبی، و زەیدێ کورێ سابتی، و هندە زەلامێت دی، خودێ ژ وان رازی بیت، د گەل بوون، بچویك بلند کرە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا کرە د کۆشا خۆدا، و رحا وی یا دهێت و دچیت،**

ئینا چاڤێت وی تژی رۆندك بوون، سەعدی گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەڤە چییە؟ گۆت: **(ئەڤە رەحمەتە خودێ دكەتە د دلێت بەندەیێت خۆدا و خودێ بەس دێ رەحمێ ب وان عەبدێت خۆ بەت یێت ب رەحم).**

١٥٩٦ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: دَخَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عَلَى أَبِي سَيْفٍ الْقَيْنِ . وَكَانَ ظِئْراً لِإِبْرَاهِيمَ عليه السلام . فَأَخَذَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِبْرَاهِيمَ فَقَبَّلَهُ وَشَمَّهُ، ثُمَّ دَخَلْنَا عَلَيْهِ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ، فَجَعَلَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللهِ (ﷺ) تَذْرِفانِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ عَوْفٍ رضي الله عنه: وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَقَالَ: **(يَا ابْنَ عَوْفٍ إِنَّهَا رَحْمَةٌ)**، ثُمَّ أَتْبَعَهَا بِأُخْرَى، فَقَالَ (ﷺ): **(إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ، وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلاَ نَقُولُ إِلاَّ ما يَرْضى رَبُّنَا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ).** [خ١٣٠٣/ م٢٣١٥].

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ دەڤ كورێ خۆ ئیبراهیمی (عليه السلام)، و وی رحا خۆ دكێشا، رۆندك ژ چاڤێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتنە خوارێ، عەبدولرەحمانێ كورێ عەوفی گۆتێ: و تو ژی یا پێغەمبەرێ خودێ؟ ئینا گۆت: **(ئەو رۆندكێت دلۆڤانییێنە یا كورێ عەوفی)**، پاشی دویڤرا گۆت: **(ب راستی چاڤ رۆندكان دكەن، و دل ب خەم دكەڤیت، و ئەم چو نابێژین ئەو نەبیت یا خودایێ مە پێ رازی، و ب راستی ئەم بۆ چۆنا تە ب خەمین).**

٧ ـ باب: عظم جزاء الصبر.

**بابەتێ: مەزناتییا خەلاتێ بێهنفرەهییێ.**

١٥٩٧ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: ما لِعَبْدِي الْمُؤْمِنِ عِنْدِي جَزَاءٌ، إِذَا قَبَضْتُ صَفِيَّهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، ثُمَّ احْتَسَبَهُ ؛ إِلاَّ الْجَنَّةُ)**. [خ٦٤٢٤].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودایێ مەزن دبێژیت: چو خەلات بۆ بەندەیێ من یێ خودان باوەری ل دەڤ من نینن، هەكە من جانێ خۆشتڤییێ وی ژ خەلكێ دنیایێ (ئانكو بچویكێ وی) كێشا، و پاشی سەبرا خۆ بكێشیت، و ب قەدەرا خودێ یێ رازی بیت ژ بلی بەحەشتێ).**

## ٨ ـ باب: الميت يعذب ببكاء أهله.

## بابەتێ: مری ب گریا خەلكێ خۆ دئێتە ئیزادان.

١٥٩٨ - (ق) عَنْ عُرْوَةَ قالَ: ذُكِرَ عِنْدَ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَفَعَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ): (**إِنَّ المَيِّتَ لَيُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ**). فَقَالَتْ: وَهَلَ ابْنُ عُمَرَ رحمه الله، إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّهُ لَيُعَذَّبُ بِخَطِيئَتِهِ وَذَنْبِهِ، وَإِنَّ أَهْلَهُ لَيَبْكُونَ عَلَيْهِ الآنَ**). قَالَتْ: وَذَاكَ مِثْلُ قَوْلِهِ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَامَ عَلَى الْقَلِيبِ وَفِيهِ قَتْلَى بَدْرٍ مِنَ المشْرِكِينَ، فَقَالَ لَهُمْ مِثْلَ مَا قَالَ: (**إِنَّهُمْ لَيَسْمَعُونَ مَا أَقُولُ**)، إِنَّمَا قَالَ: (**إِنَّهُمُ الآنَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّ مَا كُنْتُ أَقُولُ لَهُمْ حَقٌّ**)، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾[النمل:٨٠]، ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِى ٱلْقُبُورِ﴾[فاطر:٢٢] تَقُولُ: حِينَ تَبَوَّؤُوا مَقَاعِدَهُمْ مِنَ النَّارِ. [خ٣٩٧٨، ٣٩٧٩، (١٣٧١) م٩٣٢]

**ژ عوروەی (رضي الله عنه) گۆت: ل دەڤ عائیشایێ (رضي الله عنها) هاتە گۆتن كو ئیبن عومەر دگەهینیتە پێغەمبەری (ﷺ) (ب ڕاستی مری ب گریا مرۆڤێت خۆ د گۆڕێ خۆدا دهێتە ئیزادان)**، ئینا گۆت: خودێ دلۆڤانییێ ب ئیبن عومەریدا ببەت یێ خەلەت بووی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تنێ گۆتبوو: **(ب ڕاستی ئەو ب گونەها خۆ یێ دهێتە ئیزادان و مرۆڤێت وی نوكە یێ ل سەر دكەنە گری)** گۆت: ئەڤە وەكی گۆتنا وییە: پێغەمبەر (ﷺ) ل سەر دەرێ بیرێ ڕاوەستا و كوشتییێت بەدرێ ژ موشركان تێدابوون، و وەكی ئەوا گۆتی گۆتە وان **(ب ڕاستی وان گوه لێیە یا ئەز دبێژم)** وی بەس ئەڤە گۆت: **(ب ڕاستی ئەو نوكە باش دزانن یا من دگۆتە وان ڕاستی بوو)** پاشی خواند: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِى ٱلْقُبُورِ﴾ **دبێژیت پشتی جهێ خۆ ژ ئاگری گرتین.**

١٥٩٩ - . (ق) عَنْ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ**). [خ١٢٩٢/ م٩٢٧]

**ژ عومەری (رضي الله عنه)، گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مری د گۆڕێ خۆدا ب پێگۆتنا ل سەر هاتییە كرن دهێتە ئیزادان).**

١٦٠٠ - (م) عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ عَائِشَةَ قَوْلُ ابْنِ عُمَرَ: الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: رَحِمَ اللهُ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، سَمِعَ شَيْئاً فَلَمْ يَحْفَظْهُ، إِنَّمَا مَرَّتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) جِنَازَةُ يَهُودِيٍّ، وَهُمْ يَبْكُونَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: (أَنْتُمْ تَبْكُونَ، وَإِنَّهُ لَيُعَذَّبُ).[م٩٣١].

**ژ عوروەی (رضي الله عنه) گۆت، گۆتنا ئیبن عومەر ل دەڤ عائیشایێ (رضي الله عنها) هاتە گۆتن، (ب ڕاستی مری ب گریا مرۆڤێت خۆ د گۆڕێ خۆدا دهێتە ئیزادان)، ئینا گۆت، خودێ دلۆڤانییێ ب بابێ عەبدولرەحمانی ببەت پێ گوه ل تشتەكێ بوویی و ژبەر نەكرییە، ئەو بەس ئەڤە بوو تەرمەكێ جوهیەكێ ل بەر پێغەمبەرێ خودێرا (ﷺ) بوری و مرۆڤێت وی بۆ دكرنە گری ئینا گۆت، (هوین دكەنە گری و ئەو پێ دهێتە ئیزادان).**

## ٩ . باب: التشديد في النياحة.

## بابەتێ: توندكرن د ڤێطۆتنا ب دەنطێ بلند.

١٦٠١ - (ق) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها قَالَتْ: أَخَذَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (ﷺ) عِنْدَ الْبَيْعَةِ أَنْ لاَ نَنُوحَ، فَمَا وَفَتْ مِنَّا امْرَأَةٌ غَيْرُ خَمْسِ نِسْوَةٍ: أُمُّ سُلَيْمٍ، وَأُمُّ الْعَلاَءِ، وَابْنَةُ أَبِي سَبْرَةَ امْرَأَةُ مُعَاذٍ، وَامْرَأَتَانِ. أَوِ: ابْنَةُ أَبِي سَبْرَةَ، وَامْرَأَةُ مُعَاذٍ، وَامْرَأَةٌ أُخْرَى. [خ١٣٠٦/ م٩٣٦].

**ژ ئوم عەتییەی (رضي الله عنها) گۆت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پەیمان (بەیعە) ژ مە وەرگرت ئەم ب دەنگێ بلند ب مرییان نەبێژین، كەسێ ژ مە ژنان ب دورستی ب جھ نەئینا پێنج ژن نەبن، دەیكا سولەیمی و دایكا عەلائی و كچا ئەبی سەبرەیی هەڤژینا مەعازی و دو ژنێت دی، یان كچا ئەبی سەبرەیی و هەڤژینا مەعازی و ژ نەكا دی.**

١٦٠٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ). [خ١٢٩٤/ م١٠٣].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نە ژ مەیە یێ ل رویێت خۆ بدەت و یێ بەرویكان بدڕینیت و یێ (د بەلا و نەخۆشییاندا) ئاخفتنێت نەزانان بێژیت).**

١٦٠٣ - (خ) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنهما قَالَ: أُغْمِيَ عَلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ رَوَاحَةَ، فَجَعَلَتْ أُخْتُهُ عَمْرَةُ تَبْكِي: وَاجَبَلاَهْ، وَاكَذَا وَاكَذَا، تُعَدِّدُ عَلَيْهِ، فَقَالَ حِينَ أَفَاقَ: ما قُلْتِ شَيْئاً إِلاَّ قِيلَ لِي: أَأَنْتَ كَذَلِكَ؟. [خ٤٢٦٧].

**ژ نوعمانێ کوڕێ بەشیری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: عەبدوللایێ کوڕێ رەواحەی (ﷺ) گێژ بوو، خویشکا وی دەست هاڤێتێ کرە گری و گۆت: وا چیاوا وا بێڤان وا بێڤان، و باشییێت وی دهەژمێریت دەمێ هشار بووی گۆت: تە چو نەگۆتییە، هەکە ئێکی نەگۆتبیتە من ئەرێ تو یێ وەسای؟**

١٦٠٤ – عَنْ أَسِيدِ بْنِ أَبِي أَسِيدٍ، عَنِ امْرَأَةٍ مِنَ الْمُبَايِعَاتِ، قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي الْمَعْرُوفِ الَّذِي أَخَذَ عَلَيْنَا أَنْ لاَ نَعْصِيَهُ فِيهِ: (**أَنْ لاَ نَخْمُشَ وَجْهاً، وَلاَ نَدْعُوَ وَيْلاً، وَلاَ نَشُقَّ جَيْباً، وَأَنْ لاَ نَنْشُرَ شَعْراً**).[د٣١٣١].

* صحيح.

**ژ ئەبی ئوسەیدێ کوڕێ ئەبی ئوسەیدێ تابعی ژ ژنەکێ ژ وان ئەوێت سۆز و پەیمان داینە پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ژ پەیمانێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ مە وەرگرتین ژ وان یێت دا ئەم بێئەمرییا وی نەکەین: (ئەم سەر و چاڤان پەنجە نەدەین، و نفرینان نەکەین، و جلکان ل بەرحەڤکان نەدڕینین و پرچێ ڤژمڤژ نەکەین).**

١٠ ـ باب: الصبر عند المصيبة.

**بابەتێ: بێنفرەهی د دەمێ نەخۆشییێدا.**

١٦٠٥ – (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ (ﷺ) بِامْرَأَةٍ تَبْكِي عِنْدَ قَبْرٍ، فَقَالَ: (**اتَّقِي اللهَ وَاصْبِرِي**). قَالَتْ: إِلَيْكَ عَنِّي فَإِنَّكَ لَمْ تُصَبْ بِمُصِيبَتِي، وَلَمْ تَعْرِفْهُ، فَقِيلَ لَهَا: إِنَّهُ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَأَتَتْ بَابَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدَهُ بَوَّابِينَ، فَقَالَتْ: لَمْ أَعْرِفْكَ، فَقَالَ: (**إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى**). [خ١٢٨٣ (١٢٥٢)/ م٩٢٦].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) د بەر ژنکەکێرا بۆری ل نك گۆڕەکی دکرە گری، گۆت: (ژ خودێ بترسە و بێهنا خۆ فرەهکە) ئینا گۆت: ژ من دویرکەڤە بەلا ب سەرێ من هاتی ب سەرێ تە نەهاتییە. و نەدنیاسی، ئێکی گۆتێ: ئەو پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ). هاتە بەردەرگەهێ پێغەمبەری (ﷺ) چو دەرگەهڤان ل دەڤ نەدیتن، گۆت: من تو نەنیاسی! (هەروەکی داخوازا لێبۆرینێ دخوازیت) گۆت: (سەبرێ دورست و ب خێر بەس ئەوە یێ دەستپێك و د گەرمەگەرما نەخۆشییێدا).**

## ١١ - باب: في تسجية الميت.

## بابەتێ: ل سەر رائێخستنا مری.

١٦٠٦ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها . زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) .: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) حِينَ تُوُفِّيَ سُجِّيَ بِبُرْدٍ حِبَرَةٍ. [خ٥٨١٤/ م٩٤٢].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر كری ب چارچەڤەكا خەتخەت هاتە رائێخستن.**

## ١٢ - باب: غسل الميت.

## بابەتێ: شویشتنا مری.

١٦٠٧ - (ق) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأَنْصَارِيَّةِ رضي الله عنها قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، حِينَ تُوُفِّيَتِ ابْنَتُهُ، فَقَالَ: (**اغْسِلْنَهَا ثَلَاثاً، أَوْ خَمْساً، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذلِكَ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُوراً، أَوْ شَيْئاً مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي**). فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَعْطَانَا حِقْوَهُ، فَقَالَ: (**أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ**). تَعْنِي: إِزَارَهُ. [خ١٢٥٣ (١٦٧)/ م٩٣٩].

- وفي رواية لهما: قال لها: (**ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا، وَمَوَاضِعِ الوضوءِ منها**). [خ١٦٧].
- وفي رواية لهما: قالت: ومشَطْنَاها ثَلاثَةَ قرونٍ. [خ١٢٥٤].

**ژ ئوم عەتییە یا ئەنساری (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ مە، دەمێ كچا وی مری، ئینا گۆت: (ب ئاڤ و سیدرێ سێ جاران یان پێنج جاران یان پتر ژ هندێ ئەگەر هوین باش ببینن بشۆن، دویماهی شویشتن بلا ب كافوورێ بیت، یان ب تشتەكی ژ كافوورێ، ئەگەر هەوە شویشتن ب دویماهی ئینا من ئاگەهدار بكەن)، ڤێجا دەمێ مە تمام كری مە ئەو ئاگەهدار كر، ئینا ئیزارێ خۆ داف مە و گۆت: (وێ پێ بپێچن) ئانكو ب ئیزارێ وی.**

- **و د ڤەگێڕەكا دی یا واندا: (ژ لایێ راستێ و ژ جهێت دەستنڤێژێڤە دەست پێ بكەن).**
- **و د ڤەگێڕەكا دی یا واندا: و مە شە كر و سێ كەزی بۆ ڤەهاندن.**

## ١٣ ـ باب: في كفن الميت.

## بابەتێ: كفنكرنا مری.

١٦٠٨ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كُفِّنَ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ يَمَانِيَةٍ، بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ، لَيْسَ فِيهِنَّ قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ. [خ١٢٦٤/ م٩٤١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب سێ جلكێت سپی یێت سەحولی (سەحولی ناڤێ گوندەكییە) ژ هرییێ هاتە كفنكرن نە قەمیس د گەل بوو و نە شاشك.**

١٦٠٩ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَطَبَ يَوْماً، فَذَكَرَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ قُبِضَ، فَكُفِّنَ فِي كَفَنٍ غَيْرِ طَائِلٍ، وَقُبِرَ لَيْلاً. فَزَجَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يُقْبَرَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهِ؛ إِلاَّ أَنْ يُضْطَرَّ إِنْسَانٌ إِلَى ذَلِكَ، وَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِذَا كَفَّنَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ؛ فَلْيُحَسِّنْ كَفَنَهُ)**. [م٩٤٣].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) رۆژەكێ گۆتارەك خواند بەحسێ زەلامەكی ژ هەڤالێت خۆ كر ئەمرێ خودێ كربوو، و ب كفنەكێ كێم و بەرنەكەفتی هاتبوو كفنكرن، و ب شەڤ هاتبوو ڤەشارتن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) پاشڤەلێدان كر مرۆڤ ب شەڤ بهێتە ڤەشارتن هەتا نڤێژ ل سەر دهێتە كرن ژ بلی مرۆڤ نەچاری هندێ ببیت، و پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە برایێ خۆ كفن كر بلا باش كفن بكەت).**

١٦١٠ – عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ، فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ)**. وفي رواية: **(فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ)**. [ت٢٨١٠/ ن١٨٩٥/ جه٣٥٦٧]

* صحيح.

**ژ سەمورەی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جلكێت سپی بكەنە بەر خۆ، ب راستی ئەو پاقژترن و باشترن[1] و مرییێت خۆ پێ كفن بكەن) و د ڤەگێڕەكێدا: (ب ڕاستی ئەو ژ باشترین جلكێت هەومیە).**

---

(١) باشییا وان نەجلكێت خۆ مەزنكرنێنە.

## ١٤ ـ باب: كيف يكفن المحرم.

## بابەتێ: چاوا دێ ئیحرامگرێدای هێتە كفنكرن.

١٦١١ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ، إِذْ وَقَعَ عَنْ رَاحِلَتِهِ فَوَقَصَتْهُ ـ أَوْ قَالَ: فَأَوْقَصَتْهُ ـ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلاَ تُحَنِّطُوهُ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّياً**). [خ١٢٦٥/ م١٢٠٦].

- وفي رواية لهما: (**وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، وَلاَ تَمَسُّوهُ بِطِيبٍ**). [خ١٨٥١].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: د دەمەكیدا زەلامەك ل عەرەفەیێ ل سەر پشتا دەوارێ خۆ یێ راوەستای بوو، تێدا كەفت و ستۆیێ وی شكەست و مر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب سیدرێ و ئاڤێ بشۆن و ب هەردو پارچێت وی كفن بكەن و بێهنخۆشییێ لێ نەكەن و سەرێ وی نەنخێڤن، ل رۆژا قیامەتێ ئەو دێ ب لەبیەیكە ئەللاهومە لەبیەیكە هێتە ساخكرن).**

- **و د ڤەگێرەكا دی یا واندا: (ب هەردو جلكێت وی (پارچا سەری و بنی) كفن بكەن و چو بێهنخۆشییێ نەگەهیننێ).**

## ١٥ ـ باب: التكفين بالثياب القديمة

## بابەتێ: كفنكرنا ب جلكێت كەڤن.

١٦١٢ – (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: دَخَلْتُ عَلَى أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه، فَقَالَ: فِي كَمْ كَفَّنْتُمُ النَّبِيَّ (ﷺ)؟ قَالَتْ: فِي ثلاثةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ. وَقَالَ لَهَا: فِي أَيِّ يَوْمٍ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)؟ قَالَتْ: يَوْمَ الاثْنَيْنِ، قَالَ: فَأَيُّ يَوْمٍ هذَا؟ قَالَتْ: يَوْمُ الاثْنَيْنِ، قَالَ: أَرْجُو فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ اللَّيْلِ. فَنَظَرَ إِلَى ثَوْبٍ عَلَيْهِ كانَ يُمَرَّضُ فِيهِ، بِهِ رَدْعٌ مِنْ زَعْفَرَانٍ، فَقَالَ: اغْسِلُوا ثَوْبِي هَذَا، وَزِيدُوا عَلَيْهِ ثَوْبَيْنِ، فَكَفِّنُونِي فِيهَا، قُلْتُ: إِنَّ هَذَا خَلَقٌ؟ قَالَ: إِنَّ الحَيَّ أَحَقُّ بِالجَدِيدِ مِنَ المَيِّتِ، إِنَّمَا هُوَ لِلْمُهْلَةِ.

فَلَمْ يُتَوَفَّ حَتَّى أَمْسى مِنْ لَيْلَةِ الثُّلاَثَاءِ، وَدُفِنَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ. [خ١٣٨٧ (١٢٦٤)].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: ئەز چۆمە دەڤ ئەبوبەكری (ﷺ) ئینا گۆت: هەوە د چەند جلكاندا پێغەمبەر (ﷺ) كفن كربوو؟ گۆت: د سێ جلكێت سپی یێت سەحولیدا[1]،**

---

(١) سەحولی دزڤریتە گوندەكی ژ گوندێت یەمەنێ.

نە قەمیس و نە شاشك تێدا نەبوون، گۆتە وێ: د كیژ رۆژێدا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر كر؟ گۆت: د رۆژا دوشەمبیدا، گۆت: پا ئەڤە چ رۆژە؟ گۆت: دوشەمبە، ئینا گۆت: هیڤییا من ئەوە ڤێ گاڤێ هەتا شەڤێ خودێ ئەمانەتێ خۆ ژ من وەرگریت، ئینا بەرێ خۆ دا جلكەكێ ل بەر خۆ نەساخییێ ل بەر بوو، زەعفەران[1] پێڤە بوو ئینا گۆت: ئەڤێ جلكێ من بشۆن و دو جلكێت دی داننە سەر و من پێ كفن بكەن، من گۆت: ئەڤە یێ كەڤن بووی؟ گۆت: ب راستی یێ ساخ ب یێ نوی هەژیترە، چونكی ئەو هەر بۆ كێم و ئاداڤێیە.

ڤێجا ئەو نە مر هەتا ئێڤارییا شەڤا سێ شەمبی و بەری سپێدە ببیت هاتە ڤەشارتن.

١٦ - باب: الإسراع بالجنازة.

**بابەتێ: لەزكرن د برنا جەنازەیدا.**

١٦١٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ يَكُ سِوَى ذَلِكَ، فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ**). [خ١٣١٥/ م٩٤٤].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(لەزێ ل جەنازەی بكەن هەكە یا باش بیت باشییە هوین پێشكێشی وێ دكەن، و هەكە وەسا نەبیت، خرابییەكە هوین ژ سەر ملێت خۆ رادكەن).**

١٦١٤ - (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا وُضِعَتِ الْجِنَازَةُ، وَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ، فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَالَتْ: قَدِّمُونِي، وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ صَالِحَةٍ قَالَتْ: يَا وَيْلَهَا! أَيْنَ يَذْهَبُونَ بِهَا؟ يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إِلاَّ الإِنْسَان، وَلَو سَمِعَهُ صَعِقَ**). [خ١٣١٤].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دەمێ تەرم هاتە دانان، یان دەمێ خەلك یان زەلامان ل ستۆیێت خۆ هەلدگرن، هەكە یێ باش بیت دێ بێژیت: من ببەن من ببەن، و هەكە یێ خراب بیت، دێ بێژیت: وەی خۆلی ب سەرێ (مەخسەد پێ تەرمە) دێ كیڤە بەن؟ هەمی تشتی گوه ل دەنگێ وی دبیت، مرۆڤ نەبیت، و هەكە گوه لێ ببیت (ژ ترساندا) دێ مریت).**

---

(١) زەعفەران گیایەكێ رەنگدار و بێهنخۆشە.

## ١٧ ـ باب: فضل اتباع الجنائز

### بابەتێ: خێرا دویچوونا جەنازەیان

١٦١٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنِ اتَّبَعَ جَنَازَةَ مُسْلِمٍ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً وَكَانَ مَعَهُ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا وَيُفْرَغَ مِنْ دَفْنِهَا فَإِنَّهُ يَرْجِعُ مِنَ الأَجْرِ بِقِيرَاطَيْنِ، كُلُّ قِيرَاطٍ مِثْلُ أُحُدٍ. وَمَنْ صَلَّى عَلَيْهَا، ثُمَّ رَجَعَ قَبْلَ أَنْ تُدْفَنَ، فَإِنَّهُ يَرْجِعُ بِقِيرَاطٍ). [خ٤٧/ م٩٤٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ د گەل جەنازێ موسلمانەكی بچیت ب باوەر ب خێرا چوونێ و دا بگەهیتە وێ خێرێ و د گەل بیت هەتا نڤێژێ ل سەر دكەن و فەشارتنا وی ب دویماهی دئێت، ئەو دێ ب دو قیراتێت خێران زڤریت، و هەر قیراتەك هندی چیایێ ئوحودێیە، و یێ نڤێژێ ل سەر بكەت، و پاشی بزڤریت، ئەو دێ ب قیراتەكێ خێران زڤریت).**

١٦١٦ - (ق) عَنْ نَافِعٍ قَالَ: حُدِّثَ ابْنُ عُمَرَ: أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رضي الله عنهم، يَقُولُ: مَنْ تَبِعَ جَنَازَةً فَلَهُ قِيرَاطٌ، فَقَالَ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَيْنَا! فَصَدَّقَتْ ـ يَعْنِي ـ عائِشَةَ أَبَا هُرَيْرَةَ، وَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُهُ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: لَقَدْ فَرَّطْنَا فِي قَرَارِيطَ كَثِيرَةٍ.[خ١٣٢٣، ١٣٢٤/ م٩٤٥]

**ژ نافعی (رضي الله عنه) گۆت: گۆتنە ئیبن عومەری هندیكە ئەبو هورەیرەیە (رضي الله عنه) دبێژیت: (هەر كەسێ د گەل جەنازەی بەرهەڤ ببیت هەتا نڤێژێ ل سەر دكەت، قیراتەكێ[1] خێران بۆ وییە، ئینا گۆت: ئەبو هورەیرە زێدە كرییە! ئینا عائیشایێ ئەو راستگۆ دەرئێخست و گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) وەدگۆت، ئینا ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ب ڕاستی مە سستی یا د گەلەك قیراتاندا كری.**

## ١٨ ـ باب: الاستغفار للميت.

### بابەتێ: كێشانا ئستیغفاران بۆ مری.

١٦١٧ - عَنِ ابْنِ سِيرِينَ: أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ: شَهِدَ جِنَازَةَ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، قَالَ: فَأَظْهَرُوا الِاسْتِغْفَارَ، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ أَنَسٌ. [حم٤٠٨٠].

* إسناده على شرطهما.

---

(١) قیرات: نانكو: چیایەكێ مەزن ژخێران.

**ژ ئەنەسێ كوڕێ سیرینی (ﺭﺣﻤﻪ ﷲ) گۆت: ئەنەس پشكداری د برنا جەنازەیەكێ زەلامەكێ ژ خەلكێ مەدینەیێدا ژ ئەنساران كر، خەلكی ئستیغفار بۆ ئاشكر كر (ئانكو ب دەنگێ بلند كر) و ئەنەسی نەرازیبوونا خۆ ل سەر ڤێ چەندێ دیار نەكر.**

**١٩ . باب: اتباع النساء الجنائز.**

**بابەتێ: چۆنا ژنان د گەل جەنازەی.**

١٦١٨ - (ق) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها قَالَتْ: نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الجَنَائِزِ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا. [خ١٢٧٨ (٣١٣)، م٩٣٨]

**ژ ئوم عەتییە (ﺭﺿﻲ ﷲ ﻋﻨﻬﺎ)، گۆت: پاشڤەلێدانا مە ل چۆنا د گەل جنازەیان یا هاتییە كرن و توندی ل پاشڤەلێدانا مە نەهاتە كرن.**

**٢٠ . باب: الصلاة على الجنازة.**

**بابەتێ: نڤێژا ل سەر جەنازەی.**

١٦١٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَعى النَّجَاشِيَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي ماتَ فِيهِ، خَرَجَ إِلَى المصَلَّى، فَصَفَّ بِهِمْ، وَكَبَّرَ أَرْبَعاً. [خ١٢٤٥/ م٩٥١].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﺭﺿﻲ ﷲ ﻋﻨﻪ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەنگێ مرنا نەجاشی رۆژا تێدا مری راگەهاند و دەركەفتە نڤێژگەهێ و موسلمان رێزكرن و چوار تەكبیر دان.**

١٦٢٠ - (م) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: كَانَ زَيْدٌ يُكَبِّرُ عَلَى جَنَائِزِنَا أَرْبَعاً، وَإِنَّهُ كَبَّرَ عَلَى جِنَازَةٍ خَمْساً، فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُكَبِّرُهَا. [م٩٥٧].

**ژ عەبدولرەحمانێ كوڕێ ئەبی لەیلایێ (ﺭﺣﻤﻪ ﷲ) گۆت: زەیدی چوار تەكبیر ل سەر مرییێت مە ددان ، و ل سەر مرییەكی پێنج تەكبیر ددان، ئینا من پرسیارا ڤێ ژێ كر؟ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پێنج تەكبیر ددان.**

١٦٢١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَبَّرَ عَلَى جَنَازَةٍ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ فِي أَوَّلِ تَكْبِيرَةٍ، وَوَضَعَ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى. [ت١٠٧٧]

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﺭﺿﻲ ﷲ ﻋﻨﻪ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر مرییەكی تەكبیر دا، و تەكبیرا ئێكێ دەستێت خۆ بلندكرن، و دەستێ راستێ دانا سەر یێ چەپێ.**

١٦٢٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ، فَكَبَّرَ عَلَيْهَا أَرْبَعاً، وَسَلَّمَ تَسْلِيمَةً. [ـ١٣٣٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر مرییەكی كر ڤێجا چوار تەكبیر ل سەر دان و سلاڤەك تنێ ڤەدا.**

## ٢١ . باب: أحكام الشهيد في الصلاة وغيرها.

## بابەتێ: فەرمانێت شەهیدی د نڤێژێ و تشتێ دیدا.

١٦٢٣ – (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ يَقُولُ: (**أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذاً لِلْقُرْآنِ**) ؟ فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ، وَقَالَ: (**أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هؤُلاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ. [خ١٣٤٣].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دو زەلام پێكڤە ژ كوشتییێت ئوحودێ دكرنە د گۆڕیدا، پاشی دگۆت: (كێ پتر قورئان ژبەرە)؟ و هەكە ئێك نیشا دابا ئەو د گۆڕیدا پێش دئێخست و گۆت: (رۆژا قیامەتێ ئەز بۆ ڤان شاهدم) و فەرمان كر ب خوینا وانڤە بهێنە ڤەشارتن و نە هاتنە شویشتن و نە نڤێژ ل سەر وان هاتە كرن.**

## ٢٢ . باب: الصلاة على الجنازة في المسجد.

## بابەتێ: نڤێژا ل سەر مرییان ل مزگەفتێ.

١٦٢٤ – (م) عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّ عَائِشَةَ أَمَرَتْ أَنْ يُمَرَّ بِجَنَازَةِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَتُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَأَنْكَرَ النَّاسُ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: مَا أَسْرَعَ مَا نَسِيَ النَّاسُ! مَا صَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى سُهَيْلِ ابْنِ الْبَيْضَاءِ إِلاَّ فِي الْمَسْجِدِ. [م٩٧٣].

**ژ عەببادێ كورێ عەبدوللایێ كورێ زوبەیری (رضي الله عنه) گۆت: عائیشایێ فەرمان كر تەرمێ سەعدێ كورێ ئەبی وەققاسی د مزگەفتێڕا بینن، دا ئەو نڤێژێ ل سەر بكەت، ئینا خەلكی ئەڤە ژ عائیشایێ دورست نەدیت، ئینا گۆت: خەلك چەند زوی ژبیر دكەت! پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەهلێ كورێ بەیزائی نەكرییە ل مزگەفتێ نەبیت.**

## ٢٣ ـ باب: قراءة الفاتحة في صلاة الجنازة.

## بابەتێ: خواندنا فاتیحەیێ د نڤێژا مریدا.

١٦٢٥ – (خ) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَلَى جَنَازَةٍ، فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَقَالَ: لِيَعْلَمُوا أَنَّهَا سُنَّةٌ. [خ١٣٣٥].

**ژ تەلحەیێ كوڕێ عەبدوللایێ كوڕێ عەوفی (رحمه الله) گۆت: من ل پشت ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) نڤێژ ل سەر مرییەكی كر ئینا فاتحە خواند و گۆت: دا بزانن ئەڤە سونەتە[1].**

١٦٢٦ – عَنِ الزُّهْرِي قالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو أُمَامَةَ بْنُ سَهْلٍ: أَنَّهُ أَخْبَرَهُ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِي (ﷺ): أَنَّ السُّنَّةَ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الْجَنَازَةِ أَنْ يُكَبِّرَ الإِمَامُ، ثُمَّ يَقْرَأُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ بَعْدَ التَّكْبِيرَةِ الأُولَى سِرّاً فِي نَفْسِهِ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، وَيُخْلِصُ الدُّعَاءَ لِلْجَنَازَةِ فِي التَّكْبِيرَاتِ لاَ يَقْرَأُ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ، ثُمَّ يُسَلِّمُ سِرّاً فِي نَفْسِهِ. [هق٤/٣٩].

**ژ زوهری (رحمه الله) گۆت: ئەبو ئومامەیێ كوڕێ سەهلی گۆتە من، كو ئێك ژ هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە وی، ژ سونەتێیە (٢)د نڤێژا مریدا ئیمام تەكبیرێ بكەت، پاشی فاتحێ پشتی تەكبیرا ئێكێ و ب دەنگێ نزم بخوینیت، پاشی سەلەواتان ب دەتە ل سەر پێغەمبەری (ﷺ)، و ژ دل و ب لسۆزی دوعایان دتەكبیراتاندا بۆ مری بكەت، و چ دواندا نا خوینیت، پاشی ب دەنگێ نزم دێ سلاڤا ملان ڤەدەت.**

## ٢٤ ـ باب: الدعاء للميت في الصلاة.

## بابەتێ: دوعا بۆ مری د نڤێژێدا.

١٦٢٧ – (م) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى جِنَازَةٍ، فَحَفِظْتُ مِنْ دُعَائِهِ وَهُوَ يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَاراً خَيْراً مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلاً خَيْراً مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجاً خَيْراً مِنْ زَوْجِهِ، وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ـ أَوْ مِنْ عَذَابِ النَّارِ ـ).**

---

(١) مەبەست دا بزانن ئەڤە پێغەمبەری (ﷺ) یا كری و ژ وی یا هاتییە وەرگرتن.

(٢) نانكو: ئەڤە ژ كریارا پێغەمبەری بوو (ﷺ) د كرنا نڤێژا مریدا.

قَالَ: حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ أَنَا ذَلِكَ الْمَيِّتَ. [م٩٦٣].

**ژ عەوفێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر مرییەكی كر و من ژ دوعایا وی ژبەر كر و وی دگۆت: (یا خودێ گونەهێت وی ژێ ببە، و دلۆڤانییێ پێ ببە، و د گۆڕیدا سلامەت بكە، و ئازا بكە، و بارا وی ل بەحەشتێ خۆش و پیرۆز بكە، و بارا وی ل بەحەشتێ بەرفرەه و دلخۆش بكە، و گونەهێت وی ب ئاڤێ و بەفرێ و تەرگێ بشۆ، و وی ژ گونەهان پاقژ بكە هەروەكی تە جلكێ سپی ژ قرێژێ پاقژ كری، و خانییەكی ژ خانییێ وی چێتر و كەس و كارەكێ ژ كەس و كارێ وی چێتر و خێزانەكا ژ خێزانا وی چێتر بۆ بەدەل ڤەكە، و ببە بەحەشتێ و وی ژ ئیزایا گۆڕی و ژ ئیزایا ئاگری بپارێزە).**

**هەتا من خۆزی خواست و حەز دكر ئەز ئەو مری بام.**

١٦٢٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى جَنَازَةٍ فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا. اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الْإِيمَانِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الْإِسْلَامِ.** اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلاَ تُضِلَّنَا بَعْدَهُ). [د٣٢٠١/ ت١٠٢٤/ جه١٤٩٨]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر مرییەكێ كر و گۆت: (یا خودێ گونەهێت ساخێت مە و مرییێت مە ژێ ببە، و یێت بچویكێت مە و یێت مەزنێت مە، و یێت زەلامێت مە و یێت ژنێت مە، و یێت حازرێت مە و یێت نەحازرێت مە، یا خودێ یێ تە ژ مە هێلا ساخ ل سەر ئیسلامێ بهێلە ساخ، و یێ تە ژ مە مراند ل سەر باوەری و ئیمانێ بمرینە، یا خودێ مە ژ خێرا وی بێبار نەكە، و مە پشتی وی سەردا نەبە).**

## ٢٥ ـ باب: مكان الإمام من الجنازة.

**بابەتێ: جهێ ئیمامی د نڤێژا مریدا.**

١٦٢٩ - (ق) عَنْ سَمُرَةَ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ (ﷺ) عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا، فَقَامَ عَلَيْهَا وَسَطَهَا. [خ١٣٣١ (٣٣٢)/ م٩٦٤].

**ژ سەمورەیی (ﭬ) گۆت: من ل پشت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر ژ نەكێ كر د بچویكبوونێدا مربوو، ئینا راستا نیڤا تەرمێ وێ راوەستا.**

١٦٣٠ – عَنْ أَبِي غَالِبٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَلَى جَنَازَةِ رَجُلٍ، فَقَامَ حِيَالَ رَأْسِهِ، ثُمَّ جَاؤوا بِجَنَازَةِ امْرَأَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَقَالُوا: يَا أَبَا حَمْزَةَ! صَلِّ عَلَيْهَا، فَقَامَ حِيَالَ وَسَطِ السَّرِيرِ، فَقَالَ لَهُ الْعَلاَءُ بْنُ زِيَادٍ: هَكَذَا رَأَيْتَ النَّبِيَّ (ﷺ) قَامَ عَلَى الْجَنَازَةِ مُقَامَكَ مِنْهَا، وَمِنَ الرَّجُلِ مُقَامَكَ مِنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: احْفَظُوا.

ورواية ابن ماجه: فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا فَقَالَ: احْفَظُوا. [د٣١٩٤/ ت١٠٣٤/ جه١٤٩٤]

* صحيح.

**ژ ئەبی غالبی (ﭬ) گۆت: من نڤێژ د گەل ئەنەسێ كورێ مالكی ل سەر تەرمێ زەلامەكی كر، ل ڕاستا سەرێ وی راوەستا، پاشی تەرمێ ژنەكێ ژ قورەیشییان هات، گۆتن: ئەی بابێ حەمزەی نڤێژێ ل سەر بكە، ئینا ل ڕاستا نیڤا داربەستێ راوەستا، ئینا عەلائێ كوڕێ زیادی گۆتێ: تە هۆسا پێغەمبەر (ﷺ) دیتییە وەكی جهێ تە ژ ژنێ راوەستایە و وەكی جهێ تە ژ زەلامی راوەستایە؟ گۆت: بەلێ، و ڤێجا دەمێ خلاس بووی گۆت: ژبەر بكەن[1].**

**و د ڤەگێڕا ئیبن ماجەیدا: ئینا بەرێ خۆ دا مە و گۆت: ژبەر بكەن.**

١٦٣١ – عَنْ عَمَّارٍ ـ مَوْلَى الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ ـ: أَنَّهُ شَهِدَ جَنَازَةَ أُمِّ كُلْثُومٍ وَابْنِهَا، فَجُعِلَ الْغُلاَمُ مِمَّا يَلِي الْإِمَامَ، فَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ، وَفِي الْقَوْمِ: ابْنُ عَبَّاسٍ وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ وَأَبُو قَتَادَةَ وَأَبُو هُرَيْرَةَ، فَقَالُوا: هَذِهِ السُّنَّةُ. [د٣١٩٣/ ن١٩٧٦].

* صحيح.

**ژ عەمماری (ﭬ) ئازاكرییێ حارسێ كوڕێ نەوفەلی، ئەو ل سەر جەنازێ ئوم كەلسوومێ و كوڕێ وێ ئامادە ببوو، بچویك نێزیكی ئیمامی دانا، ئینا من ئەڤە نەدورست دانا، و ئیبن عەباس و ئەبو سەعیدێ خودری و ئەبو قەتادە و ئەبو هورەیرە د ناڤ خەلكیدا بوون، گۆتن: ئەڤە سونەتە[2].**

---

(١) ئانكو: هۆسا فێر ببن و ژبیرنەكەن.

(٢) ئانكو: ئەڤە ریزبەندكرنە بچویكێ كوڕ ل بەری بیت ژ پێغەمبەری (ﷺ) هاتییە وەرگرتن.

## ٢٦ . باب: كثرة المصلين وشفاعتهم بالميت

**بابەتێ: زۆرییا نڤێژكەران و مەهدەرا وان بۆ مری.**

١٦٣٢ - (م) عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَا مِنْ مَيِّتٍ يُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ مِائَةً، كُلُّهُمْ يَشْفَعُونَ لَهُ؛ إِلاَّ شُفِّعُوا فِيهِ**). [م٩٤٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە مرییەكی كۆمەك ژ موسلمانان نڤێژێ ل سەر بكەن بگەهنە سەد مرۆڤان، هەمی بەرهڤانییێ بۆ بكەن هەكە بەرهڤانییا وان نەهێتە قەبویلكرن).**

١٦٣٣ - (م) عَنْ كُرَيْبٍ . مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ .، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّهُ مَاتَ ابْنٌ لَهُ بِقُدَيْدٍ أَوْ بِعُسْفَانَ، فَقَالَ: يَا كُرَيْبُ! انْظُرْ مَا اجْتَمَعَ لَهُ مِنَ النَّاسِ. قَالَ: فَخَرَجْتُ، فَإِذَا نَاسٌ قَدِ اجْتَمَعُوا لَهُ، فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: تَقُولُ هُمْ أَرْبَعُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَخْرِجُوهُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلَى جِنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً، لاَ يُشْرِكُونَ بِاللهِ شَيْئاً؛ إِلاَّ شَفَّعَهُمُ اللهُ فِيهِ**). [م٩٤٨]

**ژ كورەیبی، ئازاكرییێ ئیبن عەباسی، (رضي الله عنهما) ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەباسی، كوڕەكێ وی ل قەدیدێ یان ل عوسفانێ ئەمرێ خودێ كر، ئینا گۆت: ئەی كورەیب بەرێ خۆ بدێ كا دێ چەند ژ خەلكی كۆم بن، ئەز دەركەفتم من دیت خەلكەك یێ بۆ كۆم بووی، ئینا من ئەو ئاگەهدار كر، ئینا گۆت: تو دبێژی ئەو ببنە چل مرۆڤ؟ من گۆت: بەلێ، گۆت: دەربێخن (دا نڤێژ ل سەر بهێتە كرن)، ب ڕاستی من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نینە موسلمانەك بمریت و چل موسلمان پێت چو هەڤپشك و شریكان بۆ خودێ چێنەكەن رابن نڤێژێ ل سەر جەنازێ وی بكەن هەكە خودێ وی نەدەتە بەر مەهدەر و بەرهڤانییا وان).**

## ٢٧ . باب: ثناء الناس على الميت.

**بابەتێ: مەدحەكرنا خەلكی بۆ مری.**

١٦٣٤ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: مَرُّوا بِجَنَازَةٍ، فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْراً، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**وَجَبَتْ**). ثُمَّ مَرُّوا بِأُخْرَى، فَأَثْنَوا عَلَيْهَا شَرّاً، فَقَالَ: (**وَجَبَتْ**). فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضي الله

عنه: ما وَجَبَتْ؟ قَالَ: **(هذا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْراً فَوَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ، وَهذا أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرّاً فَوَجَبَتْ لَهُ النَّارُ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللهِ فِي الأَرْضِ)**. [خ١٣٦٧/ م٩٤٩]

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: د بەر جەنازەكێڕا بۆرین ب باشی بەحسێ وی كرن ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (واجب بوو)، پاشی د بەر ئێكێ دیڕا بۆرین ب خرابی بەحسێ وی كرن ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (واجب بوو)، ئینا عومەرێ كوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت: چ تشت واجب بوو؟ گۆت: (ئەڤە هەوە ب باشی بەحسێ وی كر بەحەشت بۆ واجب بوو، و ئەڤە هەوە ب خرابی بەحسێ وی كر، جەهنەم بۆ واجب بوو، ب راستی هوین شاهدێت خودێنە د عەردیدا).**

١٦٣٥ - (خ) عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ الدِّيْلِيِّ قَالَ: قَدِمْتُ المدِينَةَ، وَقَدْ وَقَعَ بِهَا مَرَضٌ، فَجَلَسْتُ إِلَى عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه، فَمَرَّتْ بِهِمْ جَنَازَةٌ، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْراً، فَقَالَ عُمَرُ رضي الله عنه: وَجَبَتْ، ثُمَّ مُرَّ بِأُخْرَى، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْراً، فَقَالَ عُمَرُ رضي الله عنه: وَجَبَتْ. ثُمَّ مُرَّ بِالثَّالِثَةِ، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا شَرّاً، فَقَالَ: وَجَبَتْ. فَقَالَ أَبُو الأَسْوَدِ: فَقُلْتُ: وَمَا وَجَبَتْ يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ؟ قَالَ: قُلْتُ كما قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَيُّمَا مُسْلِمٍ، شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ، أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةِ)**، فَقُلْنَا: وَثَلاَثَةٌ، قَالَ: **(وَثَلاَثَةٌ)**، فَقُلْنَا: وَاثْنَانِ، قَالَ: **(وَاثْنَانِ)**. ثُمَّ لَمْ نَسْأَلْهُ عَنِ الْوَاحِدِ. [خ١٣٦٨].

**ژ ئەبی ئەسوەدێ دەیلی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز هاتمە مەدینەیێ، روینشتمە دەڤ عومەرێ كوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه)، جەنازەك د بەر وانڕا بۆری، ب باشی بەحسێ خودانێ وی هاتە كرن عومەری گۆت: واجب بوو، پاشی ئێكێ دی بۆری ب باشی بەحسێ خودانێ وی هاتە كرن، عومەری گۆت: واجب بوو، پاشی یێ سێیێ بۆری ب خرابی بەحسێ خودانێ وی هاتەكرن، عومەری گۆت: واجب بوو، ئەبی ئەسوەدی گۆت: من گۆت: چ واجب بوو یا میرێ موسلمانان؟ گۆت: من وەگۆت هەروەكی پێغەمبەری (ﷺ) گۆتی: (هەر موسلمانەكێ چار شادەیێ ب باشی بۆ بدەن، خودێ ئەو برە بەحەشتێ)، مە گۆت: و سێ؟ گۆت: (و سێ)، مە گۆت: و دو؟ گۆت: (و دو)، پاشی مە پرسیارا ئێكی ژێ نەكر.**

## ٢٨ ـ باب: مستريح ومستراح منه.

### بابەتێ: یێ تەنایە و خەلك یێ ژێ تەنایە.

١٦٣٦ - (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ الأَنْصَارِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مُرَّ عَلَيْهِ بِجِنَازَةٍ، فَقَالَ: **(مُسْتَرِيحٌ وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ)**. قَالُوا: يَا رَسولَ اللهِ، مَا المسْتَرِيحُ وَالمسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ قَالَ: **(العَبْدُ المُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا وَأَذَاهَا إِلَى رَحْمَةِ اللهِ، وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلاَدُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ)**. [خ٦٥١٢/ م٩٥٠].

**ژ ئەبی قەتادەیێ كورێ ریبعییێ ئەنساری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر تەرمەكێڕا بۆری، ئینا گۆت: (یێ تەنایە و ژێ تەنانە) گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ یێ تەنایە و ژێ تەنانە چییە؟ گۆت: (بەندەیێ باوەریدار ژ وەستیانا دنیایێ و ئەزیەتا وێ بۆ دلۆڤانییا خودێ تەنا دبیت و بەندەیێ گونەهكار و خراب خەلك و وەلات و دار و گیانەوەر ژێ تەنا دبن).**

## ٢٩ ـ باب: ترك الصلاة على قاتل نفسه.

### بابەتێ: نەكرنا نڤێژێ ل سەر خۆكوژی.

١٦٣٧ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِرَجُلٍ قَتَلَ نَفْسَهُ بِمَشَاقِصَ، فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ. [م٩٧٨].

**ژ جابرێ كوڕێ سەمورەی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك ئینا دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) خۆ ب تیرێت پان كوشتبی، نڤێژ ل سەر نەكر[1].**

## ٣٠ ـ باب: ما يلحق الميت من الثواب.

### بابەتێ: تشتێ د دویڤ مریڕا دچیت ژ خێران.

١٦٣٨ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ: إِلاَّ مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ)**. [م١٦٣١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە مرۆڤ مر كار و كریارێت وی دهێنە بڕین سێ تێ نەبن: خێرەكا بەردەوام و زانینەكا مفا ژێ ببینیت و عەیالەكێ چاك (كوڕ بیت كچ بیت) دوعا بۆ بكەت).**

---

(١) نەكو نڤێژ ل سەر ناهێتە كرن، بەلێ وی نەكر هەروەكی ل سەر دەینداری نەدكر دا خەلكی زێدە ژ ڤان هەردو كاران بدەتە پاش و بزانن چەندا مەزنە، هەكە وەكی دی نڤێژ ل سەر وان دهێتە كرن.

## ٣١ ـ باب: الصلاة على القبر.

**بابەتێ: نڤێژكرنا ل سەر گۆڕی.**

١٦٣٩ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَرَّ بِقَبْرٍ قَدْ دُفِنَ لَيْلاً، فَقَالَ: (**مَتَى دُفِنَ هذَا**) ؟ قَالُوا: الْبَارِحَةَ، قَالَ: (**أَفَلاَ آذَنْتُمُونِي**) ؟ قَالُوا: دَفَنَّاهُ فِي ظُلْمَةِ اللَّيْلِ، فَكَرِهْنَا أَنْ نُوقِظَكَ، فَقَامَ فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَنَا فِيهِمْ، فَصَلَّى عَلَيْهِ. [خ١٣٢١].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر گۆڕەكێڕا بۆری ب شەڤ هاتبوو ڤەشارتن، ئینا گۆت: (ئەڤە كەنگی هاتییە ڤەشارتن؟) گۆتن: دوهی، گۆت: (بۆچی هەوە ئەز پێ ئاگەهدار نەدكرم؟) گۆتن: مە ب تارییا شەڤێ ڤەشارت و مە نەڤیا تە هشیار بكەین، ئینا رابوو ئەم ل پشت خۆ رێزكرین، ئیبن عەباس دبێژیت و ئەز ئێك ژ وان بووم، و نڤێژ ل سەر كر.**

## ٣٢ ـ باب: وقوف المشيعين على القبر للدعاء.

**بابەتێ: راوەستانا پشكداران د رێبرنا جەنازەیدا ل سەر گۆڕی و دوعاكرنێ بۆ وی.**

١٦٤٠ – عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ، وَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: (**اسْتَغْفِرُوا لِأَخِيكُمْ، وَسَلُوا لَهُ بِالتَّثْبِيتِ، فَإِنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ**). [د٣٢٢١].

* صحيح.

[وانظر: ١٠، ١٦٤٩، ١٦٥٠].

**ژ عوسمانێ كوڕێ عەففانی (ﷺ) گۆت: ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ ڤەشارتنا مری ب دویماهی هاتبا ل سەر رادوەستا و دگۆت: (دوعا گونەهژێبرنێ بۆ برایێ خۆ بكەن، و دوعا خۆراگرتنێ بۆ بكەن، ب ڕاستی ڤێ گاڤێ پرسیار یا ژێ دهێتە كرن).**

## ٣٣ ـ باب: القيام للجنازة.

**بابەتێ: راوەستان بۆ جەنازەی.**

١٦٤١ – (ق) عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ رضى الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ جِنَازَةً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَاشِياً مَعَهَا فَلْيَقُمْ حَتَّى يُخَلِّفَهَا، أَوْ تُخَلِّفَهُ، أَوْ تُوضَعَ مِنْ قَبْلِ أَنْ تُخَلِّفَهُ**).[خ١٣٠٨ (١٣٠٧)/ م٩٥٨].

**ژ عامرێ كورێ رەبیعەیی (ﭬ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە جەنازەك دیت، ئەگەر د گەل وی نەچیت، بلا رابیتەڤە هەتا ئەو ژێ دبۆریت، یان جنازە ژێ دبۆریت، یان بهێتە دانان بەری ژ وی ببۆریت).**

١٦٤٢ - (م) عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: رَأَيْنَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَامَ فَقُمْنَا، وَقَعَدَ، فَقَعَدْنَا. يَعْنِي: فِي الْجِنَازَةِ.[م٩٦٢].

**ژ عەلی (ﭬ) گۆت: مە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت رابوو، ئینا ئەم ژی رابووین، و روینشت و ئەم ژی روینشتین، ئانكو: بۆ جەنازەی.**

١٦٤٣ - عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَلِيٍّ، فَمَرَّتْ بِهِ جَنَازَةٌ، فَقَامُوا لَهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: أَمْرُ أَبِي مُوسَى، فَقَالَ: إِنَّمَا قَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِجَنَازَةِ يَهُودِيَّةٍ، وَلَمْ يَعُدْ بَعْدَ ذَلِكَ. [ن١٩٢٢].

* صحيح.

**ژ ئەبی مەعمەری (ﭬ) گۆت: ئەم ل دەڤ عەلی بووین جەنازەك د بەرڕا بۆری، ئینا بۆ رابوونەڤە، ئینا عەلی گۆت: ئەڤە چییە؟ گۆتن: فەرمانا ئەبی مووسایە، گۆت: هندی پێغەمبەرێ خودێیە (ﷺ) بۆ جەنازەكا جوهییەكێ رابوو، و پشتی ڤێ نەزڤریڤە ڤێ چەندێ.**

## ٣٤ . باب: أحكام القبر.

## بابەتێ: فەرمانێت گۆڕی.

١٦٤٤ - (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ: أَنَّه قَالَ فِي مَرَضِهِ الَّذِي هَلَكَ فِيهِ: الْحَدُوا لِي لَحْداً، وَانْصِبُوا عَلَيَّ اللَّبِنَ نَصْباً، كَمَا صُنِعَ بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ). [م٩٦٦].

**ژ سەعدێ كورێ ئەبی وەققاسی (ﭬ) وی د نەساخییا خۆدا یا تێدا مری گۆت: بۆ من گۆڕێ من ژ بنڤە ببەن و لبنەیان داننە بەر من هەر وەكی ئەڤە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتییە كرن.**

١٦٤٥ - (م) عَنْ أَبِي الْهَيَّاجِ الأَسَدِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ: أَلاَّ أَبْعَثُكَ عَلَى مَا بَعَثَنِي عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)؟ أَنْ لاَ تَدَعَ تِمْثَالاً إِلاَّ طَمَسْتَهُ، وَلاَ قَبْراً مُشْرِفاً إِلاَّ سَوَّيْتَهُ. [م٩٦٩].

**ژ ئەبی ئەلهەیاجێ ئەسەدی (ﭬ) ، گۆت: عەلییێ كورێ ئەبی تالبی (ﭬ)، گۆتە من: ئەز تە ب وێ نەهنێرم یا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز پێ**

هنارتیم؟ تو چو پەیکەران نەهێلی و پویچ نەکەی و چو گۆڕێت بلند نەهێلی و د گەل ئەردی راست نەکەی.

١٦٤٦ - (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرُ، وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ.[م٩٧٠].

**ژ جابری (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهی یا کری: گۆڕ بێنە گێچکرن و ل سەر روینە خوار و ل سەر بێتە ئاڤاکرن.**

١٦٤٧ - (م) عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ، وَلاَ تُصَلُّوا إِلَيْهَا**).[م٩٧٢].

**ژ ئەبی مەرسەدێ غەزنەوی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ل سەر گۆڕان نەروینە خوار و نڤێژان ل سەر نەکەن.**

## ٣٥ - باب: الميت يعرض عليه مقعده.

## بابەتێ: جهێ مری نیشا ددەن

١٦٤٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ، عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَيُقَالُ: هذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [خ١٣٧٩/ م٢٨٦٦].

ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ب ڕاستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێك ژ هەوە مر سپێدە و ئێڤاران جهێ وی نیشا ددەن ، ڤێجا ئەگەر ژ خەلکێ بەحەشتێ بیت جهێ وی ژ جهێت خلکێ بەحشتێیە و ئەگەر ژ خەلکێ جەهنەمێ بیت جهێ وی ژ جهێت خەلکێ جەهنەمێیە و دێ بۆ هێتە گۆتن: ئەڤە جهێ تەیە هەتا خودێ تە بۆ رۆژا قیامەتێ رادکەتەڤە).**

## ٣٦ - باب: سؤال القبر.

## بابەتێ: پرسیارا گۆڕی.

١٦٤٩ - (ق) عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ. وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ. أَتَاهُ مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانِهِ فَيَقُولاَنِ: ما كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ لِمُحَمَّدٍ (ﷺ)، فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ، فَيُقَالُ**

**لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ، قَدْ أَبْدَلَكَ اللهُ بِهِ مَقْعَداً مِن الجَنَّةِ، فَيَرَاهُمَا جَمِيعاً).** [خ١٣٧٤ (١٣٣٨)/ م٢٨٧٠]

قَالَ قَتَادَةُ: وَذُكِرَ لَنَا: أَنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ. زاد مسلم: سَبْعُونَ ذِرَاعاً، وَيُمْلأُ عَلَيْهِ خَضِراً إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ.

**ژ قەتادەی (رحمه الله) ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) ب ڕاستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر بەندە كرە د گۆڕێ ویدا و هەڤالێت وی پشتا خۆ دانێ و ئەو هێلا، ـ وی گوه ل ڕپڕپا شمكێن وانە ـ دو ملیاكەت دێ هێنە دەڤ دێ وی روینشتی كەن و دێ بێژنێ: تە چ د ڕاستا ڤی زەلامیدا موحەممەدیدا (ﷺ) دگۆت؟ هندیكە یێ باوەریدارە دێ بێژیت: ئەز شەهدەیێ ددەم بەندەیێ خودێیە و پێغەمبەرێ وییە، ڤێجا دێ بێژنێ: بەرێ خۆ بدە جهێ خۆ ژ ئاگری ب ڕاستی خودێ بۆ تە جهەك ژ بەحشتێ ل جهی دانا، و دێ هەردو جهان بینیت).**

**قەتادەی گۆت: و بۆ مە هاتە گۆتن: و گۆڕێ وی دێ بۆ هێتە فرەهكرن، و موسلمی زێدە كر: حەفتێ گەزان، و دێ بۆ ب كەسكاتی هێتە پڕكرن هەتا رۆژا هەمی رادبنەڤە.**

١٦٥٠ – عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي جَنَازَةِ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ وَلَمَّا يُلْحَدْ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ، كَأَنَّمَا عَلَى رُؤوسِنَا الطَّيْرُ، وَفِي يَدِهِ عُودٌ يَنْكُتُ بِهِ فِي الْأَرْضِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: (**اسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ**) مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً.

زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ هَاهُنَا، وَقَالَ: (**وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ خَفْقَ نِعَالِهِمْ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ حِينَ يُقَالُ لَهُ: يَا هَذَا، مَنْ رَبُّكَ، وَمَا دِينُكَ، وَمَنْ نَبِيُّكَ**)؟

قَالَ هَنَّادٌ: قَالَ: (**وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللهُ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: دِينِيَ الْإِسْلاَمُ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ**) ؟ قَالَ: (**فَيَقُولُ: هُوَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَيَقُولاَنِ: وَمَا يُدْرِيكَ؟ فَيَقُولُ: قَرَأْتُ كِتَابَ اللهِ، فَآمَنْتُ بِهِ وَصَدَّقْتُ**).

زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ: (**فَذَلِكَ قَوْلُ اللهِ عزّ وجل: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾**الْآيَةُ [إبراهيم:٢٧]). ثُمَّ اتَّفَقَا، قَالَ: (**فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: أَنْ قَدْ صَدَقَ عَبْدِي، فَأَفْرِشُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ،**

وَافْتَحُوا لَهُ بَاباً إِلَى الْجَنَّةِ، وَأَلْبِسُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ) قَالَ: (فَيَأْتِيهِ مِنْ رَوْحِهَا وَطِيبِهَا) قَالَ: (وَيُفْتَحُ لَهُ فِيهَا مَدَّ بَصَرِهِ).

قَالَ: (وَإِنَّ الْكَافِرَ . فَذَكَرَ مَوْتَهُ قَالَ: . وَتُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَدِهِ، وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ فَيَقُولاَنِ له: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ، هَاهْ، لاَ أَدْرِي، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ، هَاهْ، لاَ أَدْرِي، فَيَقُولاَنِ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ، هَاهْ، لاَ أَدْرِي. فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: أَنْ كَذَبَ، فَأَفْرِشُوهُ مِنَ النَّارِ، وَأَلْبِسُوهُ مِنَ النَّارِ، وَافْتَحُوا لَهُ بَاباً إِلَى النَّارِ). قَالَ: (فَيَأْتِيهِ مِنْ حَرِّهَا وَسَمُومِهَا). قَالَ: (وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِ قَبْرُهُ حَتَّى تَخْتَلِفَ فِيهِ أَضْلاَعُهُ).

زَادَ فِي حَدِيثِ جَرِيرٍ قَالَ: (ثُمَّ يُقَيَّضُ لَهُ أَعْمَى أَبْكَمُ مَعَهُ مِرْزَبَّةٌ مِنْ حَدِيدٍ، لَوْ ضُرِبَ بِهَا جَبَلٌ لَصَارَ تُرَاباً). قَالَ: (فَيَضْرِبُهُ بِهَا ضَرْبَةً يَسْمَعُهَا مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ؛ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ، فَيَصِيرُ تُرَاباً). قَالَ: (ثُمَّ تُعَادُ فِيهِ الرُّوحُ). [د٤٧٥٣ (٣٢١٢)/ ن٢٠٠٠/ جه١٥٤٩]

* صحيح.

ژ بەرائێ كورێ عازبی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د گەل جەنازەكێ زەلامەكی ژ ئەنسارییان دەركەفتین، ئەم گەهشتینە گۆڕی هێژ د بنڤە نەبربوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) روینشتە خوارێ و ئەم دۆرماندۆری وی روینشتین هەروەكی بالندە یێ ل سەر سەرێ مە[1]، و دارکەك د دەستێ ویدا بوو عەرد پێ هەلدكۆلا، ئینا سەرێ خۆ بلند كر و گۆت: **(خۆ ب خودێ ژ ئیزایا گۆڕی بپارێزن)** دو جاران یان سێ جاران وەگۆت.

د فەرموودەیا جەریریدا ئەڤە د ڤێرەدا زێدە كرییە و گۆت: **(و ب ڕاستی وی گوه ل خشخشا شمكێت وانە دەمێ ئەو دچن و پشتا خۆ ددەنێ و دەمێ دبێژنێ: ئەی فلان كەس خودایێ تە كییە؟ و دینێ تە چییە؟ و پێغەمبەرێ تە كییە؟).**

هەنادی گۆت: **(و دو ملیاكەت دێ هێنە وی و دێ وی راكەن و دێ بێژنێ: خودایێ تە كییە؟ دێ بێژیت: خودایێ من ئەللاهە، و دێ بێژنێ دینێ تە چییە؟ دێ بێژیت: دینێ من ئیسلامە، و دێ بێژنێ: ئەو زەلام كییە یێ د ناڤ هەوەدا هاتییە هنارتن؟ دێ بێژیت:**

(١) نانكو: كەس ژ مە نەلڤی و چاڤەڕێی پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ).

**ئەو پێغەمبەرێ خودێیە (ﷺ)، دێ بێژنێ و تو چاوا دزانی؟ دێ بێژیت: من کتێبا خودێ کو قورئانە یا خواندی من ئیمان یا پێ ئینای و باوەر پێ کری).**

د فەرموودەیا جەریریدا زێدە کرییە: **(و ئەڤەیە گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزن: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾** پاشی هەردو ڤەگێر بوونە ئێک و گۆتن[1]: **( ڤێجا گازیکەرەك ل عەسمانان دێ گازی کەت بەندەیێ من راستی گۆت ڤێجا ژ بەحەشتێ بۆ برائێخن و دەرگەهەکی ژ بەحەشتێ بۆ ڤەکەن و ژ جلکێ بەحەشتێ بکەنە بەر)**، گۆت: **(ڤێجا ژ باوەشین و تەناهی و ئارامی و بێهنخۆشییا بەحەشتێ دێ بۆ هێت)**، گۆت: **(و هندی چاڤێ وی ڤەترە دکەت دێ بۆ هێتە ڤەکرن).**

گۆت: **(و هندی گاورە،** و بەحسێ مرنا وی کر و گۆت: **و جانێ وی دێ زڤریتە لەشێ وی و دو ملیاکەت دێ هێنە وی و دێ وی راکەن و دێ بێژنێ، خودایێ تە کییە؟ دێ بێژیت: هاها هاها ئەز نوزانم، دێ بێژنێ دینێ تە چییە؟ دێ بێژیت: هاها هاها ئەز نوزانم، دێ بێژنێ ئەو زەلام کییە یێ د ناڤ هەوەدا هاتییە هنارتن؟ دێ بێژیت: هاها هاها ئەز نوزانم، گازیکەرەك ل ئەسمانان دێ گازی کەت: وی درەو کر، ڤێجا ژ ئاگرێ جەهنەمێ بۆ برائێخن، و ژ جلکێ ئاگرێ جەهنەمێ بکەنە بەر، و دەرگەهەکی ژ جەهنەمێ بۆ ڤەکەن)** گۆت: **(ڤێجا ژ گەرما ئاگری و ژ ژەهرا وێ دێ بۆ هێت)** گۆت: **(و گۆڕێ وی دێ ل سەر تەنگ بیت هەتا پەراسیێت وی دچنە د ناڤێکدا).**

و د فەرموودەیا جەریریدا ئەڤە زێدە کرییە: **(پاشی کۆرەیەکێ کەڕ دێ لێ پەیدا بیت گورزەکێ ئاسنی یێ ڤێ، ئەگەر دانیتە چیای دێ بیتە تۆز)** گۆت: **(ڤێجا دێ دربەکی پێ دانیتێ، دێ د ناڤبەرا رۆژهەلات و رۆژئاڤاییێدا گوه لێ بیت، مرۆڤ و ئەجنە نەبن و دێ بیتە ئاخ)** گۆت: **(پاشی دێ جانێ وی بۆ زڤریتەڤە).**

## ٣٧ ـ باب: عذاب القبر.

### بابەتێ: ئیزایا گۆڕی.

١٦٥١ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى قَبْرَيْنِ، فَقَالَ: (إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ مِنْ كَبِيرٍ). وفي رواية (في كبير) ثُمَّ قَالَ: (بَلَى، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ يَسْعَى

(١) ئانکو: هەردو ڤەگێرێت فەرمووده ڤەگێراین بوونە ئێك ئاخفتن.

بِالنَّمِيمَةِ، وَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ). قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ عُوداً رَطْباً فَكَسَرَهُ بِاثْنَيْنِ، ثُمَّ غَرَزَ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى قَبْرٍ، ثُمَّ قَالَ: (**لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا ما لَمْ يَيْبِسَا**). [خ١٣٧٨ (٢١٦)/ م٢٩٢].

**ژ ئيبن عەباسى، خودێ ژ هەردووان رازى بيت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر دو قەبرانڕا بۆرى، گۆت: (ب راستى ئەو پێت دهێنە ئيزادان و ئەو ل سەر گونەهەكا مەزن ناهێنە ئيزادان دويڤ هزرا وان، ئەو وەسا نينە وەكى ئەو هزر دكەن، ب راستى ئەو گونەه يا مەزنە؛ هنديكە ئێك ژ وانە ئاخفتن ڤەگوهێزى دكر، و هنديكە يێ دييە خۆ ژ ميزا خۆ نەدپاراست يان خۆ ژ چاڤێت خەلكى نەدپاراست) گۆت: پاشى چيلكەكێ شين هەلگرت و كرە دو چەق و هەر چەقەك ل سەر گۆڕەكى چاند، پاشى گۆت: (من هيڤييە ئيزايا وان ل سەر وان سڤك بكەت هندى هشك نەبن).**

١٦٥٢ - (ق) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَقَدْ وَجَبَتِ الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتاً، فَقَالَ: (**يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا**).

ولفظ مسلم: بَعْدَما غَرَبَتِ الشَّمْسُ. [خ١٣٧٥/ م٢٨٦٩].

**ژ ئەبى ئەيووبى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) دەركەفت و رۆژ ئاڤا ببوو، ئينا دەنگەك[1] گوه لێ بوو، گۆت: (جوهينە د گۆڕێت خۆدا دهێنە ئيزادان).**

**و د ڤەگێڕا موسلميدا: پشتى رۆژ ئاڤا بووى.**

## ٣٨ . باب: التعوذ من عذاب القبر.

## بابەتێ: خۆپاراستن ژ ئيزايا گۆڕى.

١٦٥٣ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ يَهُودِيَّةً دَخَلَتْ عَلَيْهَا، فَذَكَرَتْ عَذَابَ الْقَبْرِ، فَقَالَتْ لَهَا: أَعَاذَكِ اللهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، فَسَأَلَتْ عائِشَةُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، فَقَالَ: (**نَعَمْ، عَذَابُ الْقَبْرِ حَقٌّ**). قَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها: فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بَعْدُ صَلَّى صَلاَةً إِلاَّ تَعَوَّذَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ. [خ١٣٧٢ (١٠٤٩)/ م٩٠٣].

**ژ عائيشايێ (رضي الله عنها) ژنەكا جوهى هاتە دەڤ و بەحسێ ئيزايا گۆڕى كر، ئينا گۆتێ: خودێ تە ژ ئيزايا گۆڕى بپارێزيت، عائيشايێ پرسيارا ئيزايا گۆڕى ژ پێغەمبەرێ خودێ**

(١) يان دەنگێ ملياكەتێت ئيزادانێ يان دەنگێ ئيزادانێ ب خۆ يان دەنگێ ئيزالێكرييان ب خۆ.

**(ﷺ) كر، ئینا گۆت: (بەلێ ئیزایا گۆڕی راستە) عائیشا دبێژیت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پشتی ڤێ نەدیتییە ئەگەر پاراستنخوازی ژ ئیزایا گۆڕی نەكربیت.**

١٦٥٤ - (خ) عَنْ مُوسى بْنِ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَتْنِي ابْنَةُ خالِدِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ: أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) وَهُوَ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ. [خ١٣٧٦].

**ژ ئەبی مووسایێ كوڕێ عوقبەیی (رحمه الله) گۆت: كچا خالدێ كوڕێ سەعیدێ كوڕێ عاسی گۆتە من: كو وێ گوهـ ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) پاراستنخوازی ژ ئیزایا گۆڕی دخوازت.**

١٦٥٥ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ**). [ن٢٠٥٩]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (یا خودێ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ ئیزایا گۆڕی، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ ئیزایا ئاگرێ جەهنەمێ، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ بەلایا دنیایێ و مرنێ و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خرابی و بەلا دەجالی).**

## ٣٩ ـ باب: ما يقال عند دخول المقابر.

## بابەتێ: چ دێ هێتە گۆتن ل دەمێ چۆنا د ناڤ گۆڕستانێدا.

١٦٥٦ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ـ كُلَّمَا كَانَ لَيْلَتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) ـ يَخْرُجُ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ إِلَى الْبَقِيعِ، فَيَقُولُ: (**السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَأَتَاكُمْ مَا تُوعَدُونَ غَداً، مُؤَجَّلُونَ**، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَهْلِ بَقِيعِ الْغَرْقَدِ). [م٩٧٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: هەر دەمێ شەڤا وێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دویماهییا شەڤێ بۆ گۆڕستانا بەقیعێ دەردكەفت و دگۆت: (السلام علیكم، سلاڤ ل سەر هەوە بن، ئەی خەلكێ جهێ خودان باوەران، و یا پەیمان بۆ هەوە پێ دهاتە دان هات، بۆ**

**سوبەهی كو رۆژا قیامەتێیە یێت مایینە و ب راستی ئەم هەكە خودێ حەزكەت دێ گەهینە هەوە، یا خودێ گونەهێت خەلكێ گۆڕستانا بەقیعا غەرقەدێ ژێ ببە[1]).**

١٦٥٧ - (م) عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُعَلِّمُهُمْ إِذَا خَرَجُوا إِلَى الْمَقَابِرِ، فَكَانَ قَائِلُهُمْ يَقُولُ: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ لَلاَحِقُونَ، أَسْأَلُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ). [م٩٧٥]

ژ بورەیدەی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نیشا وان دا هەكە بۆ گۆڕستانان دەركەڤن، بێژن: **(سلاڤ ل سەر هەوە بن، یا خەلكێ ڤی جهی ژ خودان باوەر و موسلمانان، و ب راستی ئەم هەكە خودێ حەزكەت دێ گەهینە هەوە، ئەز سلامەتی و ئێمنییێ بۆ خۆ و بۆ هەوە ژ خودێ دخوازم).**

## ٤٠ . باب: الحض على زيارة القبور.

## بابەتێ: هاندانێ بۆ سەرەدانا گۆڕان.

١٦٥٨ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: زَارَ النَّبِيُّ (ﷺ) قَبْرَ أُمِّهِ، فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ، فَقَالَ: (اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي، وَاسْتَأْذَنْتُهُ فِي أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأُذِنَ لِي؛ فَزُورُوا الْقُبُورَ، فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الْمَوْتَ). [م٩٧٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) سەرەدانا گۆڕێ دایكا خۆ كر، كرە گری و یێت دۆرماندۆری خۆ ژی گریاندن، ئینا گۆت: (من دەستویری ژ خودایێ خۆ خواست داخوازا گونەهژێبرنێ بۆ دایكا خۆ بكەم، دەستویری نەدا من، و من دەستویری ژێ خواست سەرا گۆڕێ وێ بدەم، دەستویری دا من، ڤێجا سەردانا گۆڕان بكەن ب ڕاستی ئەو مرنێ ل بیرا مرۆڤی دئینیت.**

## ٤١ . باب: الجريدة على القبر.

## بابەتێ: بەلگێت دارقەسپێ ل سەر گۆڕی.

١٦٥٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى قَبْرٍ فَقَالَ: (ائْتُونِي بِجَرِيدَتَيْنِ) فَجَعَلَ إِحْدَاهُمَا عِنْدَ رَأْسِهِ، وَالْأُخْرَى عِنْدَ رِجْلَيْهِ، فَقِيلَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، أَيَنْفَعُهُ ذَلِكَ؟ قَالَ: (لَنْ يَزَالَ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُ بَعْضُ عَذَابِ الْقَبْرِ مَا كَانَ فِيهِمَا نُدُوٌّ). [حم٩٦٨٦]

---

(١) بەقیع: ناڤێ گۆڕستانا خەلكێ مەدینەییێیە و (غەرقەد) ناڤێ گیایەكییە گەلەك ل وێرێ هەبوو لەوا دبێژنێ بەقیعا غەرقەدێ.

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر گۆڕەكێڕا بۆری ئینا گۆت: (كا بۆ من دو بەلگێت دارقەسپێ بینن) ئێك ل راستا سەرێ وی دانا و یێ دی ل جهێ پێت وی، ئینا گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ما ئەڤە دێ مافییێ وی كەت؟ گۆت: (بەردەوام دێ هندەك ژ ئیزایا گۆڕی ل سەر سڤك كەت هندی تەڕاتی تێ مابیت).**

٤٢ ـ باب: ثواب من مات له ولد فاحتسب.

**بابەتێ: خێرا وی یێ زارۆكەكێ وی بمریت و بۆ خۆ خێر بهەژمێریت.**

١٦٦٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ يَمُوتُ لِمُسْلِمٍ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، فَيَلِجَ النَّارَ؛ إِلاَّ تَحِلَّةَ الْقَسَمِ)**. [خ١٢٥١/ م٢٦٣٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە موسلمانەكی سێ ژ زارۆكێت وی بمرن، و ئاگر وی بگریت بۆ سویندێ نەبیت)[1].**

١٦٦١ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(ما مِنَ النَّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ، يُتَوَفَّى لَهُ ثَلاَثٌ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ؛ إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ)**. [خ١٢٤٨].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە موسلمانەكی سێ عەیالێت وی هێژ بالق نەبووین بمرن، هەكە خودێ ب كەرەما دلۆڤانییا خۆ ب وان وی نەبەتە بەحەشتێ).**

٤٣ ـ باب: لا يزكي أحداً.

**بابەتێ: پەسنا كەسێ ناهێتە كرن.**

١٦٦٢ - (خ) عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ: أَنَّ أُمَّ الْعَلاَءِ ـ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِمْ قَدْ بَايَعَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) ـ أَخْبَرَتْهُ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ طَارَ لَهُمْ سَهْمُهُ فِي السُّكْنَى، حِينَ أَقْرَعَتِ الأَنْصَارُ سُكْنَى الْمُهَاجِرِينَ، قَالَتْ أُمُّ الْعَلاَءِ: فَسَكَنَ عِنْدَنَا عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ، فَاشْتَكَى فَمَرَّضْنَاهُ، حَتَّى إِذَا تُوُفِّيَ، وَجَعَلْنَاهُ فِي ثِيَابِهِ، دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَقُلْتُ: رَحْمَةُ اللهِ عَلَيْكَ أَبَا السَّائِبِ، فَشَهَادَتِي عَلَيْكَ

---

(١) بۆ سویندێ نەبیت، مەخسەد پێ گۆتنا خودێیە: ﴿وإن منكم إلا واردها﴾ ئانكو: و كەس ژ هەوە نینە د سەرڕا (د سەر دۆژەهێڕا) نەچیت [ خودان باوەر دێ د سەرڕا بۆرنە بەحەشتێ، و گاور دێ كەڤنە تێدا ] ئەڤە فەرمانەكا ڤەبڕییە ژ خودایێ تە. و رامان ژ ورودێ ئەڤەیە: بۆرینا سەر پرا سیراتێیە، و ئەو پرەكە یا دانایە سەر هەردو رەخێت دۆژەهێ، خودێ مە ژێ بپارێزیت.

لَقَدْ أَكْرَمَكَ اللهُ، فَقَالَ لِي النَّبِيُّ (ﷺ): (**وَمَا يُدْرِيكِ أَنَّ اللهَ أَكْرَمَهُ**) ؟ فَقُلْتُ: لاَ أَدْرِي، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسولَ اللهِ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَمَّا عُثْمَانُ فَقَدْ جَاءَهُ وَاللهِ الْيَقِينُ، وَإِنِّي لأَرْجُو لَهُ الْخَيْرَ. وَاللهِ ما أَدْرِي ـ وَأَنَا رَسُولُ اللهِ ـ ما يُفْعَلُ بِهِ**). قَالَتْ: فَوَاللهِ لاَ أُزَكِّي أَحَداً بَعْدَهُ أَبَداً. وَأَحْزَنَنِي ذلِكَ، قَالَتْ: فَنِمْتُ، فَأُرِيتُ لِعُثْمَانَ عَيْناً تَجْرِي، فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: (**ذلِكَ عَمَلُهُ**). [خ٢٦٨٧ (١٢٤٣)].

**ژ خاریجەیێ كورێ زەیدێ ئەنساری (رضي الله عنه) گۆت: ئوم عەلائێ ژنەكا وان بوو، پەیمان دابوو پێغەمبەری (ﷺ)، وێ گۆتە وی: عوسمانێ كورێ مەزعوونی پشكا وی یا ئاكنجیبوونێ ل دەڤ وان كەفت، دەمێ خەلكێ مەدینەیێ پشك بۆ ئاكنجیبوونا مشەختییان كێشاین، ئوم عەلاء دبێژیت: ئینا عوسمانێ كورێ مەزعوونی ل دەڤ مە ئاكنجی بوو، نەساخ بوو و مە چاڤێ خۆ دایێ هەتا وەغەر كری، ئینا مە كرە د ناڤ جلكێت ویدا، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ مە، ئینا من گۆت: خودێ دلۆڤانییێ ب تە ببەت ئەی بابێ سائیبی، شەهدەییا من بۆ تە خودێ كەرەم د گەل تە كر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە من: (و تو چ دزانی خودێ كەرەم د گەل كرییە؟) من گۆت: دایك و بابێت من گۆری تە ببن ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز نوزانم، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هندیكە عوسمانە ب سویند راستی (مرن) بۆ هات، و ئەز هیڤییا خێرێ بۆ دخوازم، و ب خودێ ئەز پێغەمبەرێ خودێمە و ئەز نوزانم دێ چ لێ هێت) ئینا گۆت ئەز ب خودێ كەمە ئەز هەتا پەسنا كەسێ دی پشتی وی ناكەم، و ئەڤە چەندێ ئەز ب خەم ئێخستم، گۆت: ئەز نڤستم من كانییەك بۆ عوسمانی خەونێدا دیت ئاڤ ژ بەر دچۆ، ئینا ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) من بۆ گۆت، ئینا گۆت: (ئەو كارێ وییە).**

١٦٦٣ – عَنْ أُمِّ العَلاَءِ فِي حَدِيثِها عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُون وَثَنَائِهَا عَلَيْهِ عِنْدَ مَوْتِهِ وَقَوْلِهِ (ﷺ) فِي ذَلِكَ..

وزاد في رواية: فَكَرِهَ المسْلِمُونَ مَا قَالَه (ﷺ) لِعُثْمَانَ، حَتَّى تُوُفِيَتْ ابْنَةُ النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: (**الْحَقِي بِفَرَطِنَا عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُون**). [هق٤/٧٦].

**ژ دایكا عەلائی د فەرمووودا خۆدا د ڕاستا عوسمانێ كورێ مەزعوونی و پەسنەكرنا وی بۆ وی دەمێ مری و گۆتنا پێغەمبەرێ خودێ د ڤێ چەندێدا.**

**و د ڤەگێرەكێدا زێدە كرییە: موسلمان ب وێ گۆتنا پێغەمبەری د ڕاستا عوسمانیدا گۆتی، هەتا كچا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتی: (بگەهە پێشەنگێ مە عوسمانێ كوڕێ مەزعوونی ).**

## ٤٤ ـ باب: النهي عن سب الأموات.

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ جڤینگۆتنا مرییان.

١٦٦٤ – (خ) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى ما قَدَّمُوا).** [خ١٣٩٣].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خەبەرا نەبێژنە مرییان، ئەو گەهشتنە كار و كریارێت وان كرین).**

١٦٦٥ – عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) **(لاَ تَسُبُّوا الْأَمْوَاتَ فَتُؤْذُوا الْأَحْيَاءَ).** [ت١٩٨٢].

* صحيح.

**ژ موغیرەیێ كوڕێ شوعبەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خەبەرا نەبێژنە مرییان ب ڤێ چەندێ هوین زێندییان ئەزیەت ددەن).**

## ٤٥ ـ باب: الانصراف من الجنازة.

## بابەتێ: هێلانا جەنازەیی.

١٦٦٦ – عَنْ ثَوْبَانَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، أُتِيَ بِدَابَّةٍ وَهُوَ مَعَ الْجَنَازَةِ، فَأَبَى أَنْ يَرْكَبَهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَ أُتِيَ بِدَابَّةٍ فَرَكِبَ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: **(إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ كَانَتْ تَمْشِي، فَلَمْ أَكُنْ لِأَرْكَبَ وَهُمْ يَمْشُونَ، فَلَمَّا ذَهَبُوا رَكِبْتُ).** [د٣١٧٧]

* صحيح.

**ژ سەوبانی (رضي الله عنه) گۆت: دەوارەك بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا، و ئەو د گەل جەنازەیی بوو نەڤیا لێ سویار ببیت، ڤێجا دەمێ چۆی دەوار بۆ ئینا لێ سویار بوو، ئینا پرسیار ژێ هاتە كرن؟ گۆت: (ب ڕاستی ملیاكەت پیادە د گەل دچۆن و ئەز نە ئەوم سویار ببم و ئەو پیادە د گەل دچن، ڤێجا دەمێ چۆین ئەز سویار بووم).**

## ٤٦ . باب: ما جاء في قبر النبي (ﷺ).

**بابەتێ: تشتێ د ڕاستا گۆڕێ پێغەمبەریدا (ﷺ) هاتی.**

١٦٦٧ - (خ) عَنْ سُفْيَانَ التَّمَّارِ: أَنَّهُ رَأَى قَبْرَ النَّبِيِّ (ﷺ) مُسَنَّماً. [خ١٣٩٠].

**ژ سوفیانێ تەممار (رضي الله عنه) وی گۆڕێ پێغەمبەری (ﷺ) ژ عەردی بلندتر دیت.**

١٦٦٨ - (خ) عَنْ عُرْوَةَ قال: لَمَّا سَقَطَ عَلَيْهِمُ الحَائِطُ في زمانِ الْوَلِيدِ بْنِ عَبْدِ الملِكِ، أَخَذُوا فِي بِنَائِهِ، فَبَدَتْ لَهُمْ قَدَمٌ، فَفَزِعُوا، وَظَنُّوا أَنَّهَا قَدَمُ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَمَا وَجَدُوا أَحَداً يَعْلَمُ ذلِكَ، حَتَّى قَالَ لَهُمْ عُرْوَةُ: لاَ وَاللهِ، ما هِيَ قَدَمُ النَّبِيُّ (ﷺ)، ما هِيَ إِلاَّ قَدَمُ عُمَرَ رضي الله عنه. [خ١٣٩٠]

**ژ عورومیی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ دیوار ل سەر دەمێ وەلیدێ کوڕێ عەبدولمەلك ب سەر واندا کەفتی، دەست ب دورستکرنا دیواری کرن ئینا پێیەك بۆ ئاشکرا بوو، ترسیان و هزر کرن ئەو پێ پێغەمبەرییە، و وان کەسەك نەدیت وێ بزانیت هەتا عورومیی گۆتییە وان ئەو نە پێ پێغەمبەرییە (ﷺ) ئەو پێ کەسێ نینە یێ عومەری نەبیت (رضي الله عنه).**

## ٤٧ . باب: أوقاتٌ نُهي عن الدفن فيها.

**بابەتێ: دەمێت پاشڤەلێدان ژێ هاتییە کرن مری تێدا بهێتە ڤەشارتن.**

١٦٦٩ - عَنْ مَالِك، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي حَرْمَلَةَ . مَوْلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ حُوَيْطِبٍ .: أَنَّ زَيْنَبَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ تُوُفِّيَتْ، وَطَارِقٌ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، فَأُتِيَ بِجَنَازَتِهَا بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، فَوُضِعَتْ بِالْبَقِيعِ. قَالَ: وَكَانَ طَارِقٌ يُغَلِّسُ بِالصُّبْحِ.

قَالَ ابْنُ أَبِي حَرْمَلَةَ: فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ لِأَهْلِهَا: إِمَّا أَنْ تُصَلُّوا عَلَى جَنَازَتِكُمُ الآنَ، وَإِمَّا أَنْ تَتْرُكُوهَا حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ. [ط٥٣٦]

* إسناده صحيح.

**ژ مالکی (رضي الله عنه) ژ موحەممەدێ کوڕێ ئەبی حەرمەلە، ئازاکرییێ عەبدولرەحمانێ کوڕێ ئەبی سوفیانێ کوڕێ حومیتبی، گۆت: زەینەبا کچا ئەبی سەلەمە مر، و تارق والییێ مەدینەیێ بوو پشتی نڤێژا سپێدێ جەنازەیێ وێ ئینا و دانا بەقیعێ و گۆت: و تارقی نڤێژ ل تارییێ دەستپێکا سپێدێ دکر.**

**کوڕێ ئەبی حەرمەلە دبێژیت: من گوهـ ل عەبدوللایێ کوڕێ عومەری بوو گۆتە مرۆڤێت وێ یان ڤێ گاڤێ (ئانکو ل تارییێ) نڤێژێ ل سەر مرییێ خۆ بکەن و یان نڤێژێ بهێلن هەتا رۆژ بلند دبیت.**

١٦٧٠ - عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: يُصَلَّى عَلَى الْجَنَازَةِ بَعْدَ الْعَصْرِ، وَبَعْدَ الصُّبْحِ إِذَا صُلِّيَتَا لِوَقْتِهِمَا. [ط٥٣٧].

**ژ مالکی (رحمه الله) ژ نافعی گۆت: عەبدوللایێ کوڕێ عومەری گۆت: نڤێژا مری پشتی نڤێژا سپێدێ و نڤێژا ئێڤاری دهێتە کرن ئەگەر ئەو هەردو نڤێژ د دەمێ خۆدا هاتنە کرن[1].**

١٦٧١ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّه صَلَّى مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَلَى عَائِشَةَ رضي الله عنها زَوْجِ النَّبِي (ﷺ) حِينَ صَلَّوا الصُّبْحَ. [هق٢/٤٥٩]

[وانظر: ١٠٥٤، ١٦١٢، ١٦٦٩، ١٧٠٣].

**ژ نافعی (رحمه الله) وی نڤێژ د گەل ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ل سەر عائیشایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) کر دەمێ وان نڤێژا سپێدێ کری.**

**٤٨ ـ باب: ما جاء في شدة الموت.**

**بابەتێ: ئەوا ل دۆر تەنگاڤییا مرنێدا هاتی.**

١٦٧٢ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا أَغْبِطُ أَحَداً بِهَوْنِ مَوْتٍ بَعْدَ الَّذِي رَأَيْتُ مِنْ شِدَّةِ مَوْتِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [ت٩٧٩]

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەز خۆزییا سڤکی و ساناهییا مرنا کەسێ ناخوازم پشتی ئەوا من ژ تەنگاڤییا مرنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیتی.**

١٦٧٣ - عَنْ بُرَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْمُؤْمِنُ يَمُوتُ بِعَرَقِ الْجَبِينِ**). [ت٩٨٢/ ن١٨٢٧، ١٨٢٨/ جه١٤٥٢]

* صحيح.

---

(١) ئانکو: یا پشتی نڤێژا سپێدێ هند گیرۆ نەبیت هەتا سپیتالەیی باش دەرکەڤیت هینگێ باشتر نەوە خۆ بگرن هەتا رۆژ بلند بیت و یا پشتی ئێڤاری ژی هند گیرۆ نەبیت هەتا رۆژ دکەڤیتە د ناڤابوونێدا، وی دەمی یا باش نەوە خۆ بگرن هەتا رۆژ ب دورستی ئاڤا دبیت.

**ژ بورەیدەیێ (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (باوەریدار ب خوها ئەنییێ[1] دمریت).**

## ٤٩ ـ باب: في نعي الميت.

## بابەتێ: خەبەردانا خەبەرێ مرنێ.

١٦٧٤ - عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ قَالَ: إِذَا مِتُّ فَلاَ تُؤْذِنُوا بِي أحداً، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ نَعْياً، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَنْهَى عَنِ النَّعْيِ. [ت٩٨٦/ جه١٤٧٦]

* حسن.

**ژ حوزەیفەیێ یەمانی (ﷺ) گۆت: ئەگەر ئەز مرم كەسێ پێ ئاگەهدار نەكەن، ئەز دترسم ئەو ئاشكراكرنا مرنا مری بیت، و من یا گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بووی (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ خەبەردانا خەبەرێ مرنێ كری.**

١٦٧٥ - عَنْ يَحْيَى بْنِ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنَ رَافِعٍ عَنْ جَدَّتِهِ: أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ مَاتَ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَأُتِيَ ابْنُ عُمَرَ فَأُخْبِرَ بِمَوْتِهِ فَقِيلَ لَهُ: مَا تَرَى أَيُخْرَجُ بِجَنَازَتِهِ السَّاعَةَ؟ فَقَالَ: إِنَّ مِثْلَ رَافِعٍ لاَ يُخْرَجُ بِهِ حَتَّى يُؤْذَنَ بِهِ مَنْ حَوْلَنَا مِنَ الْقُرَى، فَأَصْبِحُوا فَاخْرجُوا بِجَنَازَتِهِ. [هق٤/٧٤].

**ژ یەحیایێ كوڕێ عەبدولحەمیدێ كوڕێ رافعی (ﷺ) ژ داپیرا خۆ، گۆت: رافعێ كوڕێ خەدیجی پشتی بانگێ ئێڤاری مر، هاتنە دەڤ ئیبن عومەری و ب مرنا وی ئاگەهدار كر، و گۆتێ: تو چ دبێژی ڤی گاڤێ جەنازێ وی ببەین؟ ئینا گۆت: ب ڕاستی ئێكێ وەكی ڕافعی ناهێتە دەرئێخستن هەتا گوندێت دۆرماندۆر ب مرنا وی نەهێنە ئاگەهداركرن بلا ل وە ببیتە سپێدە پاشی جەنازێ وی ببەن.**

## ٥٠ ـ باب: الصلاة على الطفل.

## بابەتێ: نڤێژ ل سەر بچویكی.

١٦٧٦ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الطِّفْلُ لاَ يُصَلَّى عَلَيْهِ، وَلاَ يَرِثُ، وَلاَ يُورَثُ، حَتَّى يَسْتَهِلَّ**). [ت١٠٣٢].

■ ولفظ ابن ماجه: (**إِذَا اسْتَهَلَّ الصَّبِيُّ، صُلِّيَ عَلَيْهِ، وَوُرِّثَ**). [جه١٥٠٨]

* صحيح. وقال شعيب: ضعيف جداً.

---

(١) ئانكو: خوە پێدا دهێتە خوار ژ شەرماندا پشتی ملیاكەت مزگینییێ ددەنێ یان بۆ گونەهژێبرنێ یان نیشانا خێرێیە.

ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(بچویکی نەفێژ ل سەر ناهێتە کرن و میراتی ناوەرگریت و میرات ژێ ناهێتە وەرگرتن هەتا ب ساخی ژ دایک نەبیت).**

و دبێژەیا ئیبن ماجەدا: **(ئەگەر بچویک ب ساخی ژ دایکا خۆ بوو نەفێژ ل سەر دهێتە کرن و میرات ژێ دهێتە وەرگرتن).**

## ٥١ ـ باب: تقبيل الميت.

## بابەتێ: ماچیکرنا مری.

١٦٧٧ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يُقَبِّلُ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهُوَ مَيِّتٌ، حَتَّى رَأَيْتُ الدُّمُوعَ تَسِيلُ.

وعند ابن ماجه: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى دُمُوعِهِ تَسِيلُ عَلَى خَدَّيْهِ. [د٣١٦٣/ ت٩٨٩/ جه١٤٥٦]

* صحيح.

[انظر: ٣٧١٥].

ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت عوسمانێ مەزعوونی ماچی کر و یێ مری هەتا من رۆندکێت وی دیتن دهاتنە خوار.

و ل دەڤ ئیبن ماجەیی: هەروەکی ئەز یا بەرێ خۆ ددەمە رۆندکێت وی ب سەر روییێت ویدا دهێنە خوار.

## ٥٢ ـ باب: المشي أمام الجنازة.

## بابەتێ: چوونا پێشییا جەنازەیی.

١٦٧٨ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، يَمْشُونَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ.

[د٣١٧٩/ ت١٠٠٧/ ن١٩٤٣/ جه١٤٨٢].

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر دیتن ل پێشییا جەنازەی دچۆن.

١٦٧٩ – عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(الرَّاكِبُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ، وَالْمَاشِي، حَيْثُ شَاءَ مِنْهَا، وَالطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْهِ).** [د٣١٨٠/ ت١٠٣١/ ن١٩٤١/ جه١٤٨١]

ولفظ أبي داود: (الرَّاكِبُ يَسِيرُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ، وَالْمَاشِي يَمْشِي خَلْفَهَا وَأَمَامَهَا، وَعَنْ يَمِينِهَا وَعَنْ يَسَارِهَا قَرِيباً مِنْهَا، وَالسِّقْطُ يُصَلَّى عَلَيْهِ، وَيُدْعَى لِوَالِدَيْهِ بِالْمَغْفِرَةِ وَالرَّحْمَةِ).

* صحيح.

ژ موغیرەیێ كورێ شوعبەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(سویار دێ د دویڤ جەنازەیرا چیت و پیادە ل هەر جهێ بڤێت دێ د گەل چیت، و بچویكی دێ نڤێژ ل سەر هێتە كرن).**

و بێژەیا ئەبی داوود: **(سویار دێ د دویڤ جەنازەیرا چیت و پەیادە پشت وی و پێشییا وی و لایێ وی یێ چەپێ و لایێ وی یێ راستێ و نێزیك وی دێ چیت، و بچویكێ بەرچۆی دێ نڤێژ ل سەر هێتە كرن و دێ دوعا گونەهژێبرنێ و دلۆڤانییێ بۆ دایبابێت وی هێتە كرن).**

٥٣ ـ باب: دفن الجماعة في القبر الواحد.

**بابەتێ: ڤەشارتنا كۆمەكێ د ئێك گۆڕدا.**

١٦٨٠ - عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ أُحُدٍ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! الْحَفْرُ عَلَيْنَا لِكُلِّ إِنْسَانٍ شَدِيدٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(احْفِرُوا وَأَعْمِقُوا وَأَحْسِنُوا، وَادْفِنُوا الاِثْنَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ)**. قَالُوا: فَمَنْ نُقَدِّمُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(قَدِّمُوا أَكْثَرَهُمْ قُرْآناً)**، قَالَ: فَكَانَ أَبِي ثَالِثَ ثَلاَثَةٍ فِي قَبْرٍ وَاحِدٍ. [د٣٢١٥/ ت١٧١٣/ ن٢٠٠٩/ جه١٥٦٠]

* صحيح.

ژ هیشامێ كورێ عامری گۆت: ڕۆژا ئوحودێ مە گازندە ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كرن و مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆ هەر مرۆڤەكی گۆڕەكێ (چالەكێ) بكۆلین بۆ مە یا ب زەحمەتە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(گۆڕی بكۆلن و كویركەن و باش بكەن، و هەر دووان و سێیان د ئێك گۆڕدا ڤەشێرن)** گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەم كێ پێشبێخین؟ گۆت: **(یێ پتر قورئان ژبەر پێشبێخن)** گۆت: بابێ من سێیەمێ سێیێ بوو د ئێك گۆڕدا.

## ٥٤ ـ باب: ما يقال إذا أدخل الميت القبر.

## بابەتێ: ئەوا دهێتە گۆتن ئەگەر مری كرە د گۆڕێدا.

١٦٨١ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا وَضَعَ الْمَيِّتَ فِي الْقَبْرِ قَالَ: (**بِاسْمِ اللهِ، وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ**) (ﷺ). [د٣٢١٣/ ت١٠٤٦/ جه١٥٥٠].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر مری كرە د گۆڕێدا دگۆت: (ب ناڤێ خودێ ئەز دەست پێ دكەم و ل دویف رێكا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و دینێ وی ئەز دڤەشێرم.**

## ٥٥ ـ باب: في التعزية.

## بابەتێ: بەهیلێدانێ

١٦٨٢ – عَنْ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**مَا مِنْ مُؤْمِنٍ يُعَزِّي أَخَاهُ بِمُصِيبَةٍ، إِلاَّ كَسَاهُ اللهُ سُبْحَانَهُ مِنْ حُلَلِ الْكَرَامَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [جه١٦٠١].

* حسن.

**ژ عەمرێ كوڕێ حەزمی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نینە باوەریدارەك سەرەخۆشییێ ل برایەكێ خۆ ب بەلایەكێ بكەت ئەگەر خودێ پاك و پاقژ ژ هەمی كێماسییان رۆژا قیامەتێ ژ جلكێت ب قەدر و بها نەكەتە بەر).**

## ٥٦ ـ باب: الغسل من غسل الميت.

## بابەتێ: سەرشویشتن ژ شویشتنا مری.

١٦٨٣ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَيْسَ عَلَيْكُمْ فِي غَسْلِ مَيِّتِكُمْ غُسْلٌ إِذَا غَسَّلْتُمُوهُ، إِنَّ مَيِّتَكُمْ لَمُؤْمِنٌ طَاهِرٌ، وَلَيْسَ بِنَجِسٍ، فَحَسْبُكُمْ أَنْ تَغْسِلُوا أَيْدِيَكُمْ. [ك١٤٢٦/هق١/٣٠٦].

وهو مرفوع عند الحاكم.

* قال الذهبي: على شرط البخاري مرفوعاً.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: سەرشویشتن ل سەر هەوە ژ شویشتنا مرییێ هەوە نینە ئەگەر هەوە شویشت، ب ڕاستی مرییێ هەوە یێ باوەریدار و پاقژە و نەیێ هەڕمییە و بەسی هەوەیە هوین دەستێت خۆ بشۆن.**

**و ئەڤە ل دەڤ حاکمی بۆ پێغەمبەری (ﷺ) یا بلند کرییە.**

١٦٨٤ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تُنَجِّسُوا مَوْتَاكُمْ، فَإِنَّ الْمُسْلِمَ لَيْسَ بِنَجِسٍ حَيّاً وَلاَ مَيِّتاً**). [ك١٤٢٢/هق١/٣٠٦].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مرییێت خۆ هەرمی نەبینن ب راستی موسلمان یێ ساخ بیت یێ مری بیت نە یێ هەرمییە).**

## ٥٧ . باب: إعداد الطعام لأهل الميت

### بابەتێ: چێکرنا خوارنێ بۆ خودانێت مری.

١٦٨٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) (**اصْنَعُوا لآلِ جَعْفَرٍ طَعَاماً، فَإِنَّهُ قَدْ أَتَاهُمْ أَمْرٌ يَشْغَلُهُمْ**). [د٣١٣٢/ ت٩٩٨/ جه١٦١٠]

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ کورێ جەعفەری (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خوارنێ بۆ مالا جەعفەری چێکەن ب ڕاستی ئەو کار بۆ وان هات وان مژویل بکەت).**

## ٥٨ . باب: مواراة المشرك.

### بابەتێ: ڤەشارتنا موشرکی.

١٦٨٦ – عَنْ عَلِيٍّ عليه السلام قال: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): إِنَّ عَمَّكَ الشَّيْخَ الضَّالَّ قَدْ مَاتَ، قَالَ: (**اذْهَبْ فَوَارِ أَبَاكَ، ثُمَّ لاَ تُحْدِثَنَّ شَيْئاً حَتَّى تَأْتِيَنِي**)، فَذَهَبْتُ فَوَارَيْتُهُ، وَجِئْتُهُ، فَأَمَرَنِي فَاغْتَسَلْتُ، وَدَعَا لِي. [د٣٢١٤/ ن١٩٠].

* صحيح.

**ژ عەلی (سلاڤ ل سەر بن) گۆت: من گۆتە پێغەمبەری (ﷺ) ب ڕاستی مامێ تە یێ پیرێ بەرزە مر گۆت: (هەرە بابێ خۆ ڤەشێرە، پاشی چو نەکە هەتا دهێیە دەڤ من) ئەز چۆم من ڤەشارت و ئەز هاتمە دەڤ، ئینا فەرمانا من کر من خۆ شویشت و دوعا بۆ من کرن.**

## ٥٩ ـ باب: العلامة على القبر.

## بابەتێ: نیشان ل سەر گۆڕی.

١٦٨٧ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَعْلَمَ قَبْرَ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ بِصَخْرَةٍ. [جه١٥٦١]

* حسن صحيح.

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆڕێ عوسمانێ كوڕێ مەزعوونی ب كەڤرەكی نیشان كر.**

## ٦٠ ـ باب: كسر عظم الميت.

## بابەتێ: شكاندنا هەستییێ مری.

١٦٨٨ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيًّا). [د٣٢٠٧/ جه١٦١٦].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (شكاندنا هەستییێ مری وەكی شكاندنا وییە ئەو یێ ساخ).**

## ٦١ ـ باب: كيف يُدْخَل الميت القبر.

## بابەتێ: چاوا دێ مری كەنە د گۆڕێدا.

١٦٨٩ - عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ السَّبِيعِيِّ قَالَ: أَوْصَى الْحَارِثُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ يَزِيدَ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، ثُمَّ أَدْخَلَهُ الْقَبْرَ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيِ الْقَبْرِ، وَقَالَ: هَذَا مِنَ السُّنَّةِ. [د٣٢١١]

* صحيح.

**ژ ئەبی ئیسحاقێ سەبیعی (رحمه الله) گۆت: حارسی وەسیەت كر عەبدوللایێ كوڕێ یەزیدی نڤێژێ ل سەر بكەت، ئینا وی نڤێژ ل سەر كر پاشی ئەو ژ لایێ جهێت پێت مریڕا كرە د گۆڕێدا و گۆت: ئەڤە ژ سونەتێیە.**

١٦٩٠ - عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ أَنَسٍ فِي جِنَازَةٍ، فَأَمَرَ بِالْمَيِّتِ فَسُلَّ مِنْ قِبَلِ رِجْلِ الْقَبْرِ. [حم٤٠٨١].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

ژ موحەممەدی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل جەنازەیەكی د گەل ئەنەسی بووم، فەرمان ب مری كر ژ لایێ پێت گۆڕیڤە كرە تێدا.

٦٢ ـ باب: من يُدْخِلُ الميتَ القبر.

**بابەتێ: كی دێ مری كەتە د گۆڕێدا.**

١٦٩١ – عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ قَالَ: غَسَّلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَلِيٌّ وَالْفَضْلُ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَهُمْ أَدْخَلُوهُ قَبْرَهُ.

قَالَ: وحدثني مَرْحَبٌ ـ أَوْ ابن أَبِي مَرْحَبٍ ـ أَنَّهُمْ أَدْخَلُوا مَعَهُمْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ، فَلَمَّا فَرَغَ عَلِيٌّ قَالَ: إِنَّمَا يَلِي الرَّجُلَ أَهْلُهُ. [د٣٢٠٩].

* صحيح.

**ژ عامرێ شەعبی گۆت: عەلی و فەزلی و ئوسامەیێ كوڕێ زەیدی پێغەمبەرێ خودێ شویشت و وان ئەو كرە د گۆڕێدا.**

**گۆت: مەرحەبی گۆتە من یان كوڕێ ئەبی مەرحەبی، وان عەبدولرەحمانێ كوڕێ عەوفی ژی دا د گەل وان، ڤێجا دەمێ عەلی ب دویماهی هاتی گۆت: ب ڕاستی بەس خەلكێ مری دێ وی داننە د ناڤ گۆڕێدا.**

٦٣ ـ باب: لا تتبع الجنازة بنار.

**بابەتێ: ئاگری د دویڤ مریڕا نابەن.**

١٦٩٢ – عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: أَوْصَى أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ حِينَ حَضَرَهُ الْمَوْتُ، فَقَالَ: لاَ تُتْبِعُونِي بِمِجْمَرٍ، قَالُوا لَهُ: أَوَسَمِعْتَ فِيهِ شَيْئاً؟ قَالَ: نَعَمْ، مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [جه١٤٨٧]

* حسن.

**ژ ئەبی بوردەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەبو مووسایێ ئەشعەری دەمێ كەفتییە بەر مرنێ وەسیەت كر، ئینا گۆت: چو ئاگردانكا د دویڤ منڕا نەئینن، ئینا گۆتنێ: ئەرێ تە تشتەك د ڤێدا گوه لێ بوویە؟ گۆت: بەلێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ).**

٦٤ ـ باب: كراهة الذبح عند القبر.

**بابەتێ: نەباشییا سەرژێكرنێ ل دەڤ گۆڕی.**

١٦٩٣ – عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ عَقْرَ فِي الْإِسْلاَمِ).[د٣٢٢٢].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سەرژێكرن (ل دەڤ گۆڕی) د ئیسلامەتییێدا نینە)[1].**

٦٥ ـ باب: حثو التراب في القبر.

**بابەتێ: هاڤێتنا ئاخێ د گۆڕێدا.**

١٦٩٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ، ثُمَّ أَتَى قَبْرَ الْمَيِّتِ فَحَثَى عَلَيْهِ مِنْ قِبَلِ رَأْسِهِ ثَلاَثاً. [جه١٥٦٥]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر مرییەكی كر، پاشی هاتە سەر گۆڕێ مری و ژ لایێ سەرێ ویڤە سێ جارا ئاخ هاڤێتە تێدا.**

٦٦ ـ باب: ضغطة القبر.

**بابەتێ: گڤاشتنا گۆڕی.**

١٦٩٥ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (هَذَا الَّذِي تَحَرَّكَ لَهُ الْعَرْشُ، وَفُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَشَهِدَهُ سَبْعُونَ أَلْفاً مِنَ الْمَلاَئِكَةِ، لَقَدْ ضُمَّ ضَمَّةً ثُمَّ فُرِّجَ عَنْهُ). [ن٢٠٥٤].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەڤە ئەوێ عەرش بۆ هژیایی و دەرگەهێت عەسمانی بۆ ڤەبووین، و سیه هزار ملیاكەت بۆ ئامادەبووین ب ڕاستی گڤاشتنەكێ هاتە گڤاشتن پاشی هاتە بەردان).**

١٦٩٦ - عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ لِلْقَبْرِ ضَغْطَةً، وَلَوْ كَانَ أَحَدٌ نَاجِياً مِنْهَا، نَجَا مِنْهَا سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ). [حم٢٤٢٨٣]

* حديث صحيح.

---

(١) د جاهلییەتێدا بۆ دو مەرەمان حێشتر یان هەسپ ل سەر گۆڕێ مری سەرژێ دكرن:

ئێك: ئەگەر مری یێ مەرد و ناندەهبا: حێشتر ل سەر گۆڕێ وی سەرژێ دكر، دا بێژن ئەڤ خەلاتكرنا وییە و نیشانا مەرداتی و ناندەهییا وییە چ یێ مری بیت یان یێ ساخ.

دو: یان ژی هزرەك هەبوو ئەگەر دەوارێ وی ل سەر گۆڕی سەرژێ كر دێ رابیت ئەو ب سواری چیتە مەحشەرێ و ئەگەر نە دێ پییان چیتە مەحشەرێ، و پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤ رەنگە سەرژێكرنە د ئیسلامێدا نەدورست دانا.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب ڕاستی گۆڕی گڤاشتنا هەی ئەگەر ئێك هەبا ژێ ڕزگار ببا دا سەعدێ كوڕێ مەعازی ژێ رزگار بیت).**

١٦٩٧ - عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى عَلَى صَبِيٍّ أَوْ صَبِيَّةٍ، قَالَ: **(لَوْ نَجَا أَحَدٌ مِنْ ضِيْقَةِ . أَوْ ضَغْطَةِ . القَبْرِ لَنَجَا هَذَا الصَّبِيُّ)**. [مخ٥/١٨٢٤ . ١٨٢٦]

* إسناده صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژ ل سەر بچویكەكی كر - كوڕ بوو یا كچ - و گۆت: (ئەگەر ئێك ژ تەنگاڤییێ یان ژ گڤاشتنا گۆڕی رزگار ببا دا ئەڤ بچویكە رزگار بیت).**

١٦٩٨ - عَنْ أَنَسٍ قَالَ: تُوُفِيَتْ زَيْنَبُ ابْنَةُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَكَانَتْ امْرَأَةً مِسْقَامَةً، فَتَبِعَها رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَسَاءَنَا حَالُه، فَلَمَّا دَخَلَ القَبْرَ، التَمَعَ وَجْهُهُ صُفْرَةً، ثُمَّ أَسْفَرَ وَجْهُهُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، رَأَيْنا مِنْكَ أَمْراً سَاءَنَا، فَلَمَّا دَخَلْتَ القَبْرَ التَمَعَ وَجْهُكَ صُفْرَةً، ثُمَّ أَسْفَرَ وَجْهُكَ، فَمِمَّ ذَاكَ؟ قَالَ: **(ذَكَرْتُ ضَعْفَ بُنَيَّتِي، وَشِدَّةَ عَذَابِ القَبْرِ، فَأُخْبِرْتُ أَنَّهُ قَدْ خُفِّفَ عَنْها، وَلَقَدْ ضُغِطَتْ ضَغْطَةً سَمِعَ صَوْتَها مَا بَيْنَ الخَافِقَيْنِ)**. [مخ٦/٢١٦٢]

* إسناده صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: زەینەبا كچا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مر و ئەو ژنەكا پر نەخۆشی بوو، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) دویڤڕا هات و رەوشا وی ئەم نەخۆش كرین، ڤێجا دەمێ چۆیە د گۆڕێ وێدا سەروچاڤێت وی زەر بوون پاشی سەروچاڤێت وی گەش بوون، مە گۆتێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ تشتەك مە ژ تە دیت ئەم ئێشاندین، دەمێ تو چۆیە د گۆڕیدا روییێ تە زەر بوو، پاشی روییێ تە گەش بوو، ئەو ژ چ بوو؟ گۆت: (من هزرا لاوازییا كچا خۆ كر و دژوارییا ئیزایا گۆڕی، ئینا ئەز هاتمە ئاگەهداركرن ل سەر وێ هاتە سڤككرن، و ئەو گڤاشتنەكێ هاتە گڤاشتن دەنگێ وێ د ناڤبەرا رۆژهەلات و رۆژئاڤاییێدا هاتە گوهلێبوون).**

## ٦٧ ـ باب: خلع النعلين في المقابر.

## بابەتێ: ئێخستنا شمكان د ناڤ گۆڕاندا.

١٦٩٩ - عَنْ بَشِيرِ ابنِ الْخَصَاصِيَةِ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أُمَاشِي رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، مَرَّ بِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ: (**لَقَدْ سَبَقَ هَؤُلاَءِ خَيْراً كَثِيراً**) ثَلاَثاً، ثُمَّ مَرَّ بِقُبُورِ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ: (**لَقَدْ أَدْرَكَ هَؤُلاَءِ خَيْراً كَثِيراً**). وَحَانَتْ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) نَظْرَةٌ، فَإِذَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي الْقُبُورِ، عَلَيْهِ نَعْلاَنِ، فَقَالَ: (**يَا صَاحِبَ السِّبْتِيَّتَيْنِ، وَيْحَكَ! أَلْقِ سِبْتِيَّتَيْكَ**)، فَنَظَرَ الرَّجُلُ، فَلَمَّا عَرَفَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَلَعَهُمَا فَرَمَى بِهِمَا. [د٣٢٣٠/ ن٢٠٤٧/ جه١٥٦٨].

* حسن.

**ژ بەشیرێ كوڕێ خەساسییەتی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دچۆم، د بەر گۆڕێت موشركانڕا بۆری، ئینا سێ جاران گۆت: (ئەڤان خێرەكا مەزن ژ وان چۆ)، پاشی د بەر گۆڕێت موسلمانانڕا بۆری، ئینا گۆت: (ئەڤە گەهشتنە خێرەكا مەزن)، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هۆ دیت زەلامەك یێ د ناڤ گۆڕانڕا دچیت و دو شمك یێت پێ وی، ئینا گۆت: (ئەی خودانێ دو شمكان وەی بۆ تە شمكێت خۆ بێخە) ئینا وی زەلامی بەرێ خۆ دایێ، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نیاسی، ئێخستن و هاڤێتن.**

## ٦٨ ـ باب: من مات غريباً.

## بابەتێ: ئەو كەسێ نە ل جهێ خۆ بمریت.

١٧٠٠ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: مَاتَ رَجُلٌ بِالْمَدِينَةِ مِمَّنْ وُلِدَ بِهَا، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ثُمَّ قَالَ: (**يَا لَيْتَهُ مَاتَ بِغَيْرِ مَوْلِدِهِ**)، قَالُوا: وَلِمَ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا مَاتَ بِغَيْرِ مَوْلِدِهِ، قِيسَ لَهُ مِنْ مَوْلِدِهِ إِلَى مُنْقَطَعِ أَثَرِهِ فِي الْجَنَّةِ**). [ن١٨٣١/ جه١٦١٤]

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەك ل مەدینەیێ مر، ژ وان یێت ل وێرێ بوویی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل سەر كر و پاشی گۆت: (خۆزی ئەو نە ل وی جهێ لێ بووی مربا) گۆتنێ ئەڤە بۆچی ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (ئەگەر مرۆڤ نە ل وی جهێ لێ بوویی مر، ل جهێ ئەو تێدا بوویی هەتا ئەو جهێ لێ مری بۆ د بەحەشتێدا دێ هێتە پیڤان).**

## ٦٩ - باب: زيارة النساء للقبور.

**بابەتێ: سەرەدانا ژنان بۆ گۆڕستانێ.**

١٧٠١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) زَوَّارَاتِ الْقُبُورِ. [ت١٠٥٦/ جه١٥٧٦].

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لەعنەتێت ل وان ژنان كرین ئەوێت زێدە سەردانا گۆڕان دكەن.**

١٧٠٢ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ: أَنَّ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَقْبَلَتْ ذَاتَ يَوْمٍ مِنَ الْمَقَابِرِ، فَقُلْتُ لَهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَيْنَ أَقْبَلْتِ؟ قَالَتْ: مِنْ قَبْرِ أَخِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، فَقُلْتُ لَهَا: أَلَيْسَ كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ كَانَ نَهَى، ثُمَّ أَمَرَ بِزِيَارَتِهَا. [هق٤/٧٨]

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ ئەبی مولەیكە (رضي الله عنه) گۆت: عائیشا (رضي الله عنها) رۆژەكێ ژ گۆڕستانێ دهات، ئینا من گۆتێ: ئەی دایكا موسلمانان تو ژ كیڤە دهێی؟ گۆت: ژ سەر گۆڕێ برایێ خۆ عەبدولرەحمانێ كوڕێ ئەبوبەكری، ئینا من گۆتێ: ما پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان ژ سەرەدانا گۆڕان نەكرییە؟ گۆت: بەلێ پاشڤەلێدان لێ كربوو، پاشی فەرمان ب سەرەدانا وان كر.**

## ٧٠ - باب: في الدفن ليلاً.

**بابەتێ: ڤەشارتنا مری ب شەڤ.**

١٧٠٣ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تَدْفِنُوا مَوْتَاكُمْ بِاللَّيْلِ، إِلاَّ أَنْ تُضْطَرُّوا)**. [جه١٥٢١]

* صحيح.

[وانظر: ١٦١٢، ١٦٦٩].

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مرییێت خۆ ب شەڤ نەڤەشێرن ژ بلی هوین نەچار ببن).**

## ٧١ ـ باب: موت الفجأة

## بابەتێ: مرنا ژ نیشکەکێڤە.

١٧٠٤ – عَنْ عُبَيْدِ بْنِ خَالِدٍ السُّلَمِيِّ ـ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ رفعه مَرَّةً، ولم يرفعه أخرى : (**مَوْتُ الْفَجْأَةِ أَخْذَةُ آسِفٍ**). [د ٣١١٠].

* صحيح.

**ژ عوبەیدێ کورێ خالدێ سولەمی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) جارەکێ دگەهاندە پێغەمبەری و جارا دی نەدگەهاندێ، گۆت: (مرنا دەملدەست گرتنا (مراندنا) تۆڕەیێیە)[1].**



---

[1] ...انکو: هەروەکی خودێ ژێ تۆڕەیە مراند و دەرفەت نەدایێ ل خۆ بزڤریت و پێداچۆنان بکەت و نەڤە نە ب رەنگەکێ گشتییە بۆ ...ر کەسێ دەملدەست و بێ نیشانێت پێشاهییێ هەبن بمریت.

## الفصل الأول: الزكاة الواجبة.

## پشكا ئێكێ: زەكاتا واجب

### ١ . باب: الزكاة من أركان الإسلام.

### بابەتێ: زەكات ژ شەنگستێت ئیسلامێیە

١٧٠٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، فَقَالَ عُمَرُ رضي الله عنه: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهَ، فَمَنْ قَالَهَا، فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مالَهُ وَنَفْسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللهِ)** ؟ فَقَالَ: وَاللهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلاَةِ وَالزَّكاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ المالِ. وَاللهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً كانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا. قَالَ عُمَرُ رضي الله عنه: فَوَاللهِ ما هُوَ إِلاَّ أَنْ قَدْ شَرَحَ اللهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ. [خ١٣٩٩ و١٤٠٠/ م٢٠].

ولفظ مسلم: «لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً »، وهو رواية عند البخاري.　　　　[خ٧٢٨٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆیە بەر دلۆڤانییا خودێ و ئەبوبەكر (رضي الله عنه) بوویە جهگرێ وی، و یێ ژ عەرەبان گاور بووی گاور بوو (و ئەبوبەكری ڤیا شەڕێ وان بكەت یێت زەكات راوەستاندین و نەداین)، عومەری (رضي الله عنه) گۆتێ: چاوا دێ شەڕێ خەلكی كەی، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یا گۆتی: (ئەمرێ من پێ هاتییە كرن، ئەز شەڕێ خەلكی بكەم[1] هەتا شەهدە بدەن بێژن: اشهَدُ ان لا إلهَ إلاّ الله، وانّ مُحَمّداً رسولُ اللهِ و نڤێژان بكەن و زەكاتێ بدەن هەكە وەكرن، وان خوینێت خۆ و مالێ خۆ ژ من پاراستن ب حەقێ موسلمانەتییێ نەبیت[2] و حسێبا وان[3] ل سەر خودێیە). ئەبوبەكری گۆت: ئەز ب خودێ كەم دێ شەڕێ وان كەم یێت زەكات و نڤێژ ژێك جودا كرین، ب راستی زەكات ماف و حەقێ مالییە، ئەز ب خودێ كەم هەكە ئەو كاركێ مێ ژ من ڤەگرن و وان ددا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دێ شەڕێ وان كەم**

---

(١) هەلبەت ئەوێت دژی موسلمانەتییێ دراوەستن.

(٢) ئانكو: ئەو و مالێ وان پێ پاراستییە هندی ئەو چو نەكەن، موسلمانەتی تشتەكی ل سەر دانیت، بۆ نموونە: پێ مالێ ئێكی پویچ بكەت یان پێ ئێكی بریندار بكەت یان بكوژیت هینگێ ب حەقێ ئیسلامێ ئەو و مالێ وی نە د پاراستینە، دڤێت تۆل ژێ بێنە ڤەكرن.

(٣) د نەپەنی و نهێنییا واندا.

ل سەر وێ ڤەگرتنێ، عومەری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ب خودێ کەم من بێ گۆمان زانی خودێ دلێ ئەبوبەکری بۆ شەڕی ڤەکر من زانی حەقی ئەوە.

و د بێژەیا موسلمیدا: ئەگەر ئەو کنفەکێ ژ من ڤەگرن، و ئەو ڤەگێرەکە ل دەڤ بوخاری.

٢ ـ باب: إثم مانع الزكاة.

**بابتێ: گونەها وی یێ زەکاتێ نەدەت.**

١٧٠٦ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ آتَاهُ اللهُ مالاً فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ، مُثِّلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعاً أَقْرَعَ، لَهُ زَبِيبَتَانِ، يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَيْهِ ـ يَعْنِي: شِدْقَيْهِ ـ ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا مَالُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، ثُمَّ تَلاَ: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ﴾ الآية [آل عمران: ١٨٠] ). [خ١٤٠٣].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ خودێ مال دابیتێ و زەکاتا وی نەدەت، رۆژا قیامەتێ ئەو مال دێ لێ بیتە مارەکێ سەر حۆچ خودان کەڤژا هەردو لێڤان یان خودان دو خالێت رەش ل هنداڤ چاڤێت وی، و رۆژا قیامەتێ دێ ل دۆرماندۆری وی هەلهێت، پاشی دێ وی مرۆڤی (یێ زەکات نەدایی) ب لێڤێت خۆ گریت، و پاشی دێ بێژیت: ئەز مالێ تەمە، ئەز دانەسەرێکا تەمە، پاشی ئەڤ ئایەتە خواند ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ).**

١٧٠٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسولُ الله (ﷺ): (مَا نَقَضَ قَوْمٌ الْعَهْدَ قَطُّ إِلاَّ كَانَ الْقَتْلُ بَيْنَهُمْ، وَلاَ ظَهَرَتِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ إِلاَّ سَلَّطَ اللهُ عَلَيْهِمُ الْمَوْتَ، وَلاَ مَنَعَ قَوْمٌ الزَّكَاةَ إِلاَّ حَبَسَ اللهُ عَنْهُمُ الْقَطْرُ). [هق٩/٢٣١].

ژ عەبدوللایێ کوڕێ بورەیدەیی (رضي الله عنه) ژ بابێ خۆ، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نینە ملەتەك پەیمانێ بشکێنیت ئەگەر کوشتن نەکەڤیتە د ناڤبەرا واندا، و کریار و گۆتنێت کرێت د ناڤ ملەتەکیدا چو جارا ئاشکرا نابیت ئەگەر خودێ مرنێ ل سەر وان زال نەکەت، و نینە ملەتەك زەکاتێ نەدەت ئەگەر خودێ بارانێ ژ وان نەڤەگریت).**

## ٣ ـ باب: المقادير الواجب فيها الزكاة (النصاب).

### بابەتێ: كوژمێت زەكات تێدا واجب.

١٧٠٨ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ).
[خ١٤٠٥/ م٩٧٩]

وفي رواية لهما: قال: (لَيْسَ فِيما دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ صَدَقَةٌ، وَلَيْس فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ مِنَ الإِبْلِ صَدَقَةٌ) . [خ١٤٥٩].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ((زیڤ) ژ پێنج وەقییان[1] كێمتر زەكات تێدا نینە، و ژ پێنج حێشتران كێمتر زەكات تێدا نینە، و (فێقی و دەرامەت) ژ پێنج باران كێمتر[2] زەكات تێدا نینە).**

**و د ڤەگێرەكا وان هەردوكاندا: (ژ پێنج باران كێمتر[3] زەكات د قەسپاندا نینە، و ژ پێنج وەقیان[4] كێمتر زەكات د زیڤیدا نینە، و ژ پێنج حێشتران كێمتر زەكات د حێشتراندا نینە).**

١٧٠٩ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ أَوْ كَانَ عَثَرِيّاً الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ) . [خ١٤٨٣].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ((زەكات) د ئەوا ب بارانێ و كانییان هاتییە ئاڤدان یان یا دێمی بیت دەهێكە، و (زەكات) د یا ب ئاڤ ڤەگوهازتنێ هاتییە ئاڤدان نیڤ دەهێكە).**

١٧١٠ - (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رضي الله عنه، كَتَبَ لَهُ هَذَا الْكِتَابَ، لَمَّا وَجَّهَهُ إِلَى الْبَحْرَيْنِ:

بسم الله الرحمن الرحيم، هذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى المسْلِمِينَ، وَالَّتِي أَمَرَ اللهُ بِهَا رَسُولَهُ، فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ المسْلِمِينَ عَلَى وَجْهِهَا فَلْيُعْطِهَا، وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَهَا فَلاَ يُعْطِ:

---

(١) و هەر وەقییەك دبیتە چل دەرهەم، و پێنج وەقی دبنە دوسەد دەرهەم و ئەو دبنە (٥٩٠ غرام).

(٢) هەر بارەك دبیتە شێست من، و هەر منەك دبیتە (٢،١٧٦غرام)، و شێست من دبنە (١٣٠،٥٦)، و پێنج بار دبنە ٦٥٣كغم.

(٣) هەر بارەك دبیتە شێست من، و هەر منەك دبیتە (٢،١٧٦غرام)، و شێست من دبنە (١٣٠،٥٦)، و پێنج بار دبنە ٦٥٣كغم.

(٤) و هەر وەقییەك دبیتە چل دەرهەم، و پێنج وەقی دبنە دوسەد دەرهەم و ئەو دبنە (٥٩٠ غرام).

(فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ فَمَا دُونَهَا، مِنَ الْغَنَمِ، مِنْ كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْساً وَعِشْرِينَ إِلَى خَمْسٍ وَثَلاَثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ أُنْثَى، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتّاً وَثَلاَثِينَ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ أُنْثَى، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتّاً وَأَرْبَعِينَ إِلَى سِتِّينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْجَمَلِ، فَإِذَا بَلَغَتْ وَاحِدَةً وَسِتِّيْنَ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ . يَعْنِي: . سِتّاً وَسَبْعِينَ إِلَى تِسْعِينَ فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْجَمَلِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ إِلاَّ أَرْبَعٌ مِنَ الإِبِلِ فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ؛ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْساً مِنَ الإِبِلِ فَفِيهَا شَاةٌ.

وَفِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ: فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ إِلَى مِائَتَيْنِ شَاتَانِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى مِائَتَيْنِ إِلَى ثَلاَثِمَائَةٍ فَفِيهَا ثَلاَثُ شِيَاهٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلاَثِمَائَةٍ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، فَإِذَا كَانَتْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ نَاقِصَةً مِنْ أَرْبَعِينَ شَاةً وَاحِدَةً، فَلَيْسَ فِيهَا صَدَقَةٌ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا.

وَفِي الرِّقَةِ رُبُعُ الْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ إِلاَّ تِسْعِينَ وَمِائَةً فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ؛ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا) .[خ١٤٥٤ (١٤٤٨)].

**ژ ئەنەسی (ﺭﺿﻲ ﺍﻟﻠﻪ ﻋﻨﻪ) گۆت: ئەبوبەكری (ﺭﺿﻲ ﺍﻟﻠﻪ ﻋﻨﻪ) ئەڤ نڤیسینە بۆ هاتە نڤیسین دەمێ هنارتییە بەحرێنێ:**

**ب ناڤێ خودێ یێ دلۆڤان و دلۆڤین، ئەڤە زەكاتا واجبە ئەوا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر موسلمانان واجب كری، و ئەوا خودێ و پێغەمبەرێ وی فەرمان پێ كری، ڤێجا هەر كەسێ وەكی وێ ژ موسلمانان ژێ هاتە خواستن بلا بدەتێ و هەر كەسێ ژ ڤێ زێدەتر ژێ هاتە داخوازكرن بلا نەدەت:**

**زەكاتا حێشتران ژ بیست و چواران و كێمتر زەكات ژ پەزییە و هەر پێنج حێشتران كاڤرەك[١] زەكاتە، ڤێجا ئەگەر گەهشتە بیست و پێنجان هەتا سیه و پێنجان حێشترەكا مێ[٢] یا ئێك سالی زەكاتە، و ئەگەر گەهشتنە سیه و شەشان هەتا چل و پێنجان حێشتەركا مێ[٣] یا دو سالی زەكاتە، و ئەگەر گەهشتنە چل و شەشان هەتا شێستان**

---

(١) سالەك تمام كربیت، و د گۆتنەكێدا شەش هەیڤ یان پەزێ رەش بیت دو سال تمام كربن، و د گۆتنەكێدا سالەك.

(٢) بنت مەخاز: ئەو حێشترا مێیە یا ئێك سالی دەرباز كربیت چۆبیتە د سالا دوویێدا.

(٣) بنت لەبوون: ئەو حێشترا مێیە یا دو سالی دەرباز كربیت و چۆبیتە د سالا سێیێدا.

حێشترەكا مێ[١] یا سێ سالی زەكاتە، و ئەگەر گەهشتنە شێست و ئێكا هەتا حەفتێ و پێنجان حێشترەكا مێ[٢] یا چوار سالی زەكاتە و ئەگەر گەهشتنە حەفتێ و شەشان هەتا نۆتان دو حێشترێت مێ یێت ئێك سالی زەكاتن، و ئەگەر گەهشتنە نۆت و ئێكان هەتا سەد و بیستان دو حێشترێت مێ یێت سێ سالی زەكاتن، و ئەگەر ژ سەد و بیست و ئێكا زێدەبوو د هەر چلاندا حێشترەكا مێ یا دو سالی زەكاتە، و ژ هەر پێنجییان حێشترەكا مێ یا سێ سالی زەكاتە و هەر كەسێ ژ چوار حێشتران پێڤەتر نەبن زەكات ل سەر وی نینە ژ بلی خودانێ وان بڤێت بدەت، و ئەگەر بوونە پێنج حێشتر زەكات كاڤرەكە[٣].

و د زەكاتا پەزیدا (رەش و سپی) د ئەواندا یێت ب دەڤێ خۆ دچەرییێن، ئەگەر چل بن هەتا سەد و بیستان كاڤرەك[٤] زەكاتە، و ئەگەر ژ سەدو بیستان بۆری هەتا دو سەدان دو كاڤر یێت تێدا، و ئەگەر ژ دو سەدان بۆری هەتا سێ سەدان سێ كاڤر یێت تێدا، و ئەگەر ژ سێ سەدان بۆری د هەر سەداندا كاڤرەكە، و ئەگەر پەزێ مرۆڤی یێ ب دەڤێ خۆ دچەریت ئێك ژ چلان ژێ یا كێم بیت زەكات تێدا نینە، ژ بلی ئەگەر خودان حەز بكەت بدەت.

و د زیڤیدا زەكاتا وی چارێكا دەهێیە، و ئەگەر سەد و نۆت ب تنێ هەبیت چو زەكات تێدا نینە ژ بلی ئەگەر خودان حەز بكەت بدەت[٥].

## ٤ ـ باب: في الركاز الخمس.

**بابەتێ: پێنجێك زەكات یا د دیتنا خزینەیا ژێر عەردیدا هەی.**

١٧١١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (الْعَجْمَاءُ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ) . [خ١٤٩٩/ م١٧١٠].

■ وفي رواية لهما: (الْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ..) . [خ٦٩١٢].

---

(١) حوققە: ئەو حێشترا مێیە یا سێ سالی دەرباز كربیت و چۆبیتە د سالا چوارێدا.

(٢) جەزعە: ئەو حێشترا مێیە یا چوار سالی دەرباز كربیت و چۆبیتە د سالا پێنجێدا.

(٣) سالەك تمام كربیت و د گۆتنەكێدا شەش هەیڤ یان پەزێ رەش بیت دو سال تمام كربن و د گۆتنەكێدا سالەك.

(٤) سالەك تمام كربیت، و د گۆتنەكێدا شەش هەیڤ یان پەزێ رەش بیت دو سال تمام كربن و د گۆتنەكێدا سالەك.

(٥) مەخسەد ئەگەر (دو سەد دەرهەمان) كێمتر بیت زەكات لێ ناكەڤیت، راستە وی گۆت (سەد و نۆت)، بەس ئەو دەه دەهە دهەژمێریت و دو سەدان لێ دكەڤیت.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تەلەفا گیانەوەری[1] یا بێ بەرامبەرە و زیانا ژ ئەگەرێ بیرێ دورست دبیت[2] یا بێ بەرامبەرە، و زیانا د لێدانا مەعدەنیدا[3] یا بێ بەرامبەرە، و پێنجێك زەکات یا دیتنا خزینا ژێر عەردیدا هەی).**

- **و د ڤەگێرەکا واندا: (بریندارکرنا گاینەوەری یا بێ بەرامبەرە)[4].**

١٧١٢ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**فِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ**) .[جه٢٥١٠].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پێنجێك زەکات یا دیتنا خزینا ژێر عەردیدا هەی).**

**٥ ـ باب: إرضاء السعاة.**

**بابەتێ: رازیکرنا زەکاتکاران.**

١٧١٣ - (م) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنَ الأَعْرَابِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالُوا: إِنَّ نَاساً مِنَ الْمُصَدِّقِينَ، يَأْتُونَنَا فَيَظْلِمُونَنَا، قالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَرْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ**).[م٩٨٩].

**ژ جەریرێ کورێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت: هندە مرۆڤ ژ کۆچەرە عەرەبان هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا گۆتن: ب راستی هندەك زەکاتکار دهێنە دەڤ مە و ستەمێ ل مە دکەن، گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زەکاتکارێت خۆ رازیکەن)[5].**

---

(١) ئانکو: زیانا گیانەوەر دکەت دەمێ ل رێکێ دچیت وەکی ئێك ل سەر دەوارێ خۆ بیت و های ژێ نەبیت و ژ پشتڤە پێنەکێ ل ئێکی بدەت زیانەکێ بگەهینیتێ.

(٢) وەکی ئێك بیرێ ل ناڤ عەردێ خۆ بکۆلیت و ئێك بچیت بکەڤیتە تێدا و زیان بگەهیتێ.

(٣) وەکی ئێك کۆلانێ بکەت دا مەعدەنەکی دەربێخیت، ڤێجا کارکەرەکێ کرێگرتی تشتەك ب سەری بهێت.

(٤) بۆ نموونە: بزنەك ڤۆچەکێ ل مرۆڤەکی بدەت و بریندار بکەت.

(٥) زەکاتکار: ئەو فەرمانبەرە یێ بەرپرس ژ کۆمکرن و وەرگرتنا زەکاتێ ژ وان کەسێت زەکات د مالێ واندا هەی.

## ٦ ـ باب: وسم إبل الصدقة.

## بابەتێ: درۆكرنا حێشترێت زەكاتێ.

١٧١٤ – (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: غَدَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بِعَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ لِيُحَنِّكَهُ، فَوَافَيْتُهُ فِي يَدِهِ الْمِيسَمُ، يَسِمُ إِبِلَ الصَّدَقَةِ. [خ١٥٠٢/ م٢١١٩]

[وانظر: ٢٩٦٥، ٢٩٦٦] .

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: من سپێدێ عەبدوللایێ كورێ ئەبی تەلحەیی برە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دا مێژكۆ بكەت، ئەز گەهشتمێ و مۆر د دەستیدا بوو حێشترێت زەكاتێ بێ درۆ دكرن.**

## ٧ ـ باب: لا زكاة في العبد والفرس.

## بابەتێ: زەكات د كۆلە و هەسپیدا نینە.

١٧١٥ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي فَرَسِهِ وغلاَمِهِ صَدَقَةٌ**) . [خ١٤٦٣/ م٩٨٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (زەكات ل سەر موسلمانی د هەسپ كۆلەیێ ویدا نینە).**

## ٨ ـ باب: تعجيل الزكاة.

## بابەتێ: پێشئێخستنا دانا زەكاتێ.

١٧١٦ – عَنْ عَلِيٍّ: أَنَّ الْعَبَّاسَ سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) فِي تَعْجِيلِ صَدَقَتِهِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ، فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ. [د١٦٢٤/ ت٦٧٨/ جه١٧٩٥/ مي١٦٧٦].

* حسن.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) عەباسی داخواز ژ پێغەمبەری (ﷺ) كر دانا زەكاتا خۆ بەری دەمێ وێ بهێت پێش بێخیت، ئینا دەستویری دایێ.**

١٧١٧ ـ وَعَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ لِعُمَرَ: (**إِنَّا قَدْ أَخَذْنَا زَكَاةَ الْعَبَّاس عَامَ الْأَوَّلِ لِلْعَامِ**) . [ت٦٧٩]

* حسن.

ژ عەلی (ﷺ) پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە عومەری: **(ب ڕاستی مە زەكاتا عەباسی سالا ئێكێ بۆ ئەڤ ساله یا وەرگرتی)**[1].

٩ ـ باب: الدعاء لمن أتى بصدقته.

**بابەتێ: دوعاكرن بۆ ئەوێ زەكاتا خۆ دئینیت.**

١٧١٨ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ قَالَ: **(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ فُلاَنٍ)** ، فَأَتَاهُ أَبِي بِصَدَقَتِهِ، فَقَالَ: **(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى)**.[خ١٤٩٧/ م١٠٧٨].

ژ عەبدوللایێ كوڕێ ئەبی ئەوفایی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر هندە كەسان ب زەكاتا خۆ هاتبانە دەڤ دا بێژیت: **(یا خودێ پەسنا بنەمالا فلانی ل دیوانا بلند بكە و دلۆڤانییێ ب وان ببە و گونەهێت وان ژێ ببە)**، ئینا بابێ من ب زەكاتا خۆڤە هاتە دەڤ ئینا گۆت: **(یا خودێ پەسنا مالا ئەبی ئەوفا ل دیوانا بلند بكە و دلۆڤانییێ ب وان ببە و گونەهێت وان ژێ ببە)**.

١٠ ـ باب: عمل المصدِّق وثوابه.

**بابەتێ: كارێ زەكاتكاری و خێرا وی.**

١٧١٩ – عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَطَاءٍ ـ مَوْلَى عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ـ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ زِيَاداً ـ أَوْ بَعْضَ الْأُمَرَاءِ ـ بَعَثَ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ لِعِمْرَانَ: أَيْنَ الْمَالُ؟ قَالَ: وَلِلْمَالِ أَرْسَلْتَنِي؟ أَخَذْنَاهَا مِنْ حَيْثُ كُنَّا نَأْخُذُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَوَضَعْنَاهَا حَيْثُ كُنَّا نَضَعُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [د١٦٢٥/ جه١٨١١].

* صحيح.

ژ ئیبراهیمێ كوڕێ عەتائی (ﷺ) ئازاكرییێ عیمرانێ كوڕێ حوسەینی ژ بابێ خۆ، زیادی یان هندەك ئەمیران عیمرانێ كوڕێ حوسەینی هنارتە كارێ زەكات وەرگرتنێ، ڤێجا دەمێ زڤرییەڤە، گۆتە عیمرانی: كانێیە ئەو مال؟ گۆت: تە بۆ مالی ئەز هنارتبووم؟ من ژ وان وەرگرتن ب وی ڕەنگێ ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مە ژ وان وەردگرت و مە ب وی ڕەنگی دا ئەوێ مە ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ددا.

---

(١) ئانكو: سالەكێ بەری دەمێ خۆ زەكاتا وی هاتبوو پێشنێخستن.

١٧٢٠ – عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**الْعَامِلُ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالْحَقِّ، كَالْغَازِي فِي سَبِيلِ اللهِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ**) . [د٢٩٣٦/ ت٦٤٥/ جه١٨٠٩].

* حسن.

**ژ رافعێ كوڕێ خەدیجی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (كاركەرێ ل سەر زەكاتێ ب راستی و دلسۆزی وەكی خەزاكەرێ د رێكا خودێدایە هەتا دزڤریتەڤە مالا خۆ[1]).**

١٧٢١ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) بَعَثَ سَعْدَ بْنِ عُبَادَةَ مُصَدِّقاً وَقَالَ: (**إِيَّاكَ يَا سَعْدُ أَنْ تَجِيءَ يَوْمَ القِيَامَةِ بِبَعِيرٍ لَهُ رُغَاءٌ**) فَقَالَ: لا أَجِدُهُ وَلا أَجِيءُ بِهِ، فَأَعْفَاهُ. [حب٣٢٧٠/ك١٤٥١].

* إسناده على شرطهما.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) سەعدێ كوڕێ عوبادەی زەكاتكار هنارت و گۆت: (هشیار بی ئەی سەعد ئەز رۆژا قیامەتێ تە نەبینم تو ب حێشترەكێ ڤێ دهێی و عۆڕعۆڕا وێیە) ئینا گۆت: ئەز نابینم و نائینم ئینا ب وی هێلا.**

## ١١ ـ باب: ما جاء في الخرص.

## بابەتێ: ئەوا د جوداكرنا زەكاتێدا هاتی.

١٧٢٢ – عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَبْعَثُ عَبْدَ اللهِ بْنَ رَوَاحَةَ فَيَخْرُصُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ يَهُودَ قَالَ: فَجَمَعُوا لَهُ حُلِيّاً مِنْ حُلِيِّ نِسَائِهِمْ فَقَالُوا: هَذَا لَكَ، وَخَفِّفْ عَنَّا، وَتَجَاوَزْ فِي الْقَسْمِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ رضي الله عنه: يَا مَعْشَرَ يَهُودَ وَاللهِ إِنَّكُمْ لِمَنْ أَبْغَضِ خَلْقِ اللهِ إِلَيَّ، وَمَا ذَلِكَ بِحَامِلِي عَلَى أَنْ أَحِيفَ عَلَيْكُمْ، فَأَمَّا الذي عَرَّضْتُمْ مِنَ الرِّشْوَةِ، فَإِنَّهَا سُحْتٌ، وَإِنَّا لاَ نَأْكُلُهَا، قَالُوا: بِهَذَا قَامَتِ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ. [هق٤/١٢٢].

**ژ سولەیمانێ كوڕێ یەساری (رحمه الله) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) عەبدوللایێ كوڕێ رەواحەیی دهنارت دا د ناڤبەرا وی و جوهیاندا تەقدیر بكەت و حەقێ ئیسلامێ جودا بكەت، گۆت: ئینا جوهیان چەكەك بۆ كۆم كرن ژ چەكێت ژنێت خۆ و گۆتن: ئەڤە بۆ تە و ل سەر مە سڤك بكە و چاڤێ خۆ ل هندە مالێ مە بنقینە و نەهەژمێرە، ئینا**

---

(١) ئانكو: خێرا وی وەكی خێرا خەزاكەرییە.

**عەبدوللایێ كوڕێ ڕەواحەی (رضي الله عنه) گۆت: گەلی جوهیان ئەز ب خودێ كەمە و ب ڕاستی ژ هەمی چێكرییێت خودێ هوین ل دەڤ من نەخۆشڤیترینن، و ئەڤە وەل من ناكەت ئەز ستەمێ ل هەوە بكەم، ڤێجا هندی ئەوا هەوە پێشكێش كری ژ بەرتیلی ب ڕاستی ئەو یا حەرامە و ب ڕاستی ئەم حەرامی ناخۆین، گۆتن ئها ڤێ (دادپەروەرییێ) عەرد و عەسمان پێت ڕاگرتین.**

١٧٢٣ - عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رضي الله عنه بَعَثَهُ عَلَى خَرْصِ التَّمْرِ، وَقَالَ: إِذَا أَتَيْتَ أَرْضاً فَاخْرُصْهَا، وَدَعْ لَهُمْ قَدْرَ مَا يَأْكُلُونَ.[ك١٤٦٥/هق٤/١٢٤].

**ژ سەهلێ كوڕێ ئەبی حەسمەیی (رضي الله عنه) گۆت: عومەرێ كوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) ئەو هنارت بۆ تەقدیركرنا قەسپان[1] و گۆت: ئەگەر تو هاتییە عەردەكی تەقدیر بكە و هندی ئەو دخۆن بۆ وان بهێلە ل سەر نەهەژمێرە.**

## ١٢ ـ باب: مكان أخذ الصدقة.

### بابەتێ: جهێ زەكات لێ دهێتە وەرگرتن.

١٧٢٤ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**تُؤْخَذُ صَدَقَاتُ الْمُسْلِمِينَ عَلَى مِيَاهِهِمْ**) . [جه١٨٠٦].

* حسن صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زەكاتێت موسلمانان ل سەر ئاڤێت وان[2] ژ وان دهێتە وەرگرتن).**

## ١٣ ـ باب: ما تجب فيه الزكاة من الأموال.

### بابەتێ: ئەوێ زەكات تێدا واجب دبیت ژ مال و سامانان.

١٧٢٥ - عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ قَالَ: عِنْدَنَا كِتَابُ مُعَاذٍ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ إِنَّمَا أَخَذَ الصَّدَقَةَ مِنَ الْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ. [حم٢١٩٨٩].

* إسناده صحيح، رجاله رجال الشيخين.

---

(١) بۆ دیاركرنا پشكا زەكاتێ ژ وان.

(٢) ئانكو: ل ناڤ جهـم و باخچە و بیساتنێت وان.

**ژ مووسایێ كوڕێ تەلحەی (﵁) گۆت: نڤیسارا موعازی ژ پێغەمبەری (ﷺ) یا ل دەڤ مە، و ب ڕاستی وی بەس زەكات ژ دەخلی و جەهی و مێویژێ و قەسپێ وەرگرتییە.**

١٧٢٦ - عَنْ مَالِكٍ أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ كَتَبَ إِلَى عَامِلِهِ عَلَى دِمَشْقَ فِي الصَّدَقَةِ: إِنَّمَا الصَّدَقَةُ فِي الْحَرْثِ وَالْعَيْنِ وَالْمَاشِيَةِ. [ط٥٧٧].

**ژ مالكی گەهشتییە وی: عومەرێ كوڕێ عەبدولعەزیزی بۆ كاربەدەستێ خۆ ل دیمەشقێ د زەكاتێدا نڤیسی: زەكات بەس یا د چاندن و زێر و زیڤ (پارە) و تەرشیدا.**

١٧٢٧ - عَنْ مَالِكٍ: أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ عَنِ الزَّيْتُونِ، فَقَالَ: فِيهِ الْعُشْرُ. [ط٦١٠].

**ژ مالكی (﵀) وی پرسیارا زەكاتا زیتوونێ ژ ئیبن شیهابی كر، ئینا گۆت: دەهێك یا تێدا.**

## ١٤ . باب: زكاة الذهب والورق.

## بابەتێ: زەكاتا زێری و زیڤی.

١٧٢٨ - عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(قَدْ عَفَوْتُ عَنْ صَدَقَةِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، فَهَاتُوا صَدَقَةَ الرِّقَةِ، مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَماً دِرْهَماً، وَلَيْسَ فِي تِسْعِينَ وَمِائَةٍ شَيْءٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ مِائَتَيْنِ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ)**. [د١٥٧٤/ ت٦٢٠/ ن٢٤٧٦/ جه١٧٩٠/ مي١٦٦٩].

* صحيح.

[وانظر: ١٧١٠] .

**ژ عەلی (﵁) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب ڕاستی ئەز ل زەكاتا هەسپ و كۆلەیان بۆریم، ڤێجا زەكاتا زیڤی بینن هەر ژ چل دەرهەمان دەرهەمەكە، و د سەد و نۆتاندا چو تێدا نینە، و ئەگەر گەهشتە دو سەد دەرهەمان پێنج دەرهەم یێت تێدا).**

## ١٥ . باب: زكاة الحلي.

## بابەتێ: زەكاتا جەكێ ژنێ.

١٧٢٩ - عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَلْبَسُ أَوْضَاحاً مِنْ ذَهَبٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَكَنْزٌ هُوَ؟ فَقَالَ: (مَا بَلَغَ أَنْ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ، فَزُكِّيَ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ) . [د١٥٦٤].

* حسن.

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: من هندەك چەك ژ زێری دكرنە بەر خۆ، ئینا من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ: ما ئەڤە گەنجینەكرنە (دانانە سەرێكە) گۆت: (ئەوا گەهشتە زەكات دانێ زەكاتێ ژێ بدە ئەو نەگەنجینەكرنە).**

١٧٣٠ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَرَأَى فِي يَدَيَّ فَتَخَاتٍ مِنْ وَرِقٍ، فَقَالَ: (**مَا هَذَا يَا عَائِشَةُ**) ؟ فَقُلْتُ: صَنَعْتُهُنَّ أَتَزَيَّنُ لَكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**أَتُؤَدِّينَ زَكَاتَهُنَّ**)؟ قُلْتُ: لاَ، أَوْ مَا شَاءَ اللهُ، قَالَ: (**هُوَ حَسْبُكِ مِنَ النَّارِ**). [د١٥٦٥]

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ شەددادێ كوڕێ هادی گۆت: ئەم چۆینە دەڤ عائیشایێ، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ من و هندەك گوستیركێت مەزن ژ زیڤی د دەستێ من بوون، ئینا گۆت: (ئەڤە چییە ئەی عائیشا)؟ من گۆت: من یێت چێكرین خۆ بۆ تە پێ جوان بكەم، ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (تو زەكاتا وان ددەی)؟ من گۆت: نەخێر، یان ئەڤا خودێ حەز كری، گۆت: (ئەو بەسی تەیە بچییە ئاگری).**

١٧٣١ - عَنِ الْقَاسِمِ: أَنَّ عَائِشَةَ . زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) . كَانَتْ تَلِي بَنَاتِ أَخِيهَا، يَتَامَى فِي حَجْرِهَا، لَهُنَّ الْحَلْيُ، فَلاَ تُخْرِجُ مِنْ حُلِيِّهِنَّ الزَّكَاةَ. [ط٥٨٤].

* إسناده صحيح.

**ژ قاسمی (رحمه الله) گۆت: عائیشایێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) چاڤدێرییا برازایێت خۆ دكر ئێتیم بوون ل دەڤ وێ، و وان چەك هەبوو و وێ زەكات ژ چەكێ وان نەدەردئێخست.**

١٧٣٢ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يُحَلِّي بَنَاتِهِ وَجَوَارِيَهُ الذَّهَبَ، ثُمَّ لاَ يُخْرِجُ مِنْ حُلِيِّهِنَّ الزَّكَاةَ. [ط٥٨٥].

* إسناده صحيح.

**ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: عەبدوللایێ كوڕێ عومەری چەكێ زێری بۆ كچ و جارییێت خۆ چێ دكر و پاشی زەكات ژ چەكێ وان نەدەردئێخست.**

## ١٦ ـ باب: زكاة العسل.

**بابەتێ: زەكاتا هنگڤینی.**

١٧٣٣ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (فِي الْعَسَلِ، فِي كُلِّ عَشَرَةِ أَزُقٍّ، زِقٌّ). [ت٦٢٩].

* صحيح، وقال الترمذي: في إسناده مقال.

**ژ ئيبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د هنگڤينيدا هەر دەه مەشكان مەشكەكە).**

١٧٣٤ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ كِتَابٌ مِنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ إِلَى أَبِي وَهُوَ بِمِنًى: أَنْ لاَ يَأْخُذَ مِنَ الْعَسَلِ، وَلاَ مِنَ الْخَيْلِ صَدَقَةً. [ط٦١٤].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ ئەبی بەكرێ كوڕێ عەمرێ كوڕێ حەزمی (رحمه الله) وی گۆت: نڤيسارەك ژ عومەرێ كوڕێ عەبدولعەزيزی بۆ بابێ وی هات و ئەو ل مينایێ بوو: زەكاتێ نە ژ هنگڤينی و نە ژ هەسپان نەوەرگريت.**

١٧٣٥ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَتَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ، أَنْ يُؤْخَذَ مِنَ الْعَسَلِ الْعُشْرُ. [هق٤/١٢٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ خەلكێ یەمەنێ نڤيسی ئەو زەكاتێ ژ هنگڤينی دەهێكێ وەرگرن.**

## ١٧ ـ باب: هل في المال حق سوى الزكاة.

**بابەتێ: ئەرێ مافەكێ دی ژ بلی زەكاتێ د ماليدا هەيە.**

١٧٣٦ - عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِي أَنَّهُ سَمِعَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّ اللهَ فَرَضَ عَلَى الأَغْنِيَاءِ فِي أَمْوَالِهِمْ بِقَدْرِ مَا يَكْفِي فُقَرَاءَهُمْ، فَإِنْ جَاعُوا وَعُرُوا وَجُهِدُوا فَبِمَنْعِ الأَغْنِيَاءِ، وَحَقٌّ عَلَى اللهِ أَنْ يُحَاسِبَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيُعَذِّبَهُمْ عَلَيْهِ. [هق٧/٢٣].

**ژ موحەممەدێ كوڕێ عەلی (رحمه الله) وی گوه ل عەلییێ كوڕێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) بوو گۆت: ب ڕاستی خودێ هند یێ ل سەر زەنگينان د مالێ واندا واجب كری تێرا هەژارێت وان بكەت، ڤێجا ئەگەر ئەو برسی بوون و رویس بوون و وەستيان ئەو ژ**

ئەگەرێ ڤەگرتنا زەنگینانە، و حەقە ل سەر خودێ رۆژا قیامەتێ پرسینا وان بكەت و وان ل سەر هندێ ئێزا بدەت.

١٨ ـ باب: عقوبة مانع الزكاة.

**بابەتێ: سزایا وی یێ زەكاتێ نەدەت.**

١٧٣٧ – عَنْ معاوية بْنِ حَيْدَةَ القُشَيْرِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ: ابْنَةُ لَبُونٍ، لاَ يُفَرَّقُ إِبِلٌ عَنْ حِسَابِهَا ، مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِراً فَلَهُ أَجْرُهَا، وَمَنْ أَبَى فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ إِبِلِهِ، عَزْمَةٌ مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا، لاَ يَحِلُّ لآلِ مُحَمَّدٍ مِنْهَا شَيْءٌ).[د١٥٧٥/ ن٢٤٤٣/ مي١٧١٩].

- ولفظ أبي داود والدارمي: (وَمَنْ مَنَعَهَا، فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ مَالِهِ).

* حسن.

ژ موعاوییەیێ كورێ حەیدەتێ قوشەری (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: **(د هەر چل حێشترێت ژ چەرەیی خودان دبن، حێشترەكا مێ یا دو سال تمام كربن و چۆبیتە د سالا سێیێدا یا دتێدا، و چو حێشتر ژ هەژمارتنێ ناهێنە جوداكرن[1]، و هەر كەسێ بۆ خێرێ بدەت بۆ وی خێر یا هەی، و یێ نەدەت دێ ژێ هێتە ستاندن و نیڤا حێشترێت وی ژی، وەك حەقەك ژ حەقێت خودایێ مە، و بۆ مالا موحەممەدی چو ژ وان حەلال نینە).**

- و بێژەیا ئەبو داوود و دارەمی: **(و هەر كەسێ زەكات ڤەگرت و نەدا ب ڕاستی ئەم دێ ژێ ستینین و نیڤا مالێ وی).**

١٩ ـ باب: زكاة مال اليتيم والتجارة له فيه.

**بابەتێ: زەكاتا مالێ ئێتیمی و بازرگانیكرن بۆ تێدا.**

١٧٣٨ – عَنِ الْقَاسِمِ أَنَّهُ قَالَ: كَانَتْ عَائِشَةُ تَلِينِي وَأَخاً لِي يَتِيمَيْنِ فِي حَجْرِهَا، فَكَانَتْ تُخْرِجُ مِنْ أَمْوَالِنَا الزَّكَاةَ. [ط٥٨٧].

* إسناده صحيح.

ژ قاسمی (رحمه الله) وی گۆت: عائیشایێ چاڤێ خۆ ددا من و برایەكێ من ئەم ئێتیم بووین ل دەڤ وێ، و وێ زەكات ژ مالێ مە دەردئێخست.

(١) نانكو: قەلەو و لاواز و بچویك و مەزن و لەنگ و چاوا بیت دێ هێنە هەژمارتن، و ژ هژمارتنێ ناهێتە ڤەدەركرن.

١٧٣٩ - عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: ابْتَغُوا بِأَمْوَالِ الْيَتَامَى لاَ تَأْكُلُهَا الصَّدَقَةُ. [هق٤/١٠٧].

* إسناده صحيح.

**ژ سەعیدێ كورێ موسەییەبی (رحمه الله) گۆت: عومەرێ كورێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت: بازرگانیێ ب مالێ ئێتیمان بكەن، زەكات ژێ نەخۆت.**

**٢٠ ـ باب: الزكاة في الدَّين.**

**بابەتێ: زەكاتا دەینی.**

١٧٤٠ - عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ كَانَ يَقُولُ: هَذَا شَهْرُ زَكَاتِكُمْ، فَمَنْ كَانَ عَلَيْهِ دَيْنٌ؛ فَلْيُؤَدِّ دَيْنَهُ، حَتَّى تَحْصُلَ أَمْوَالُكُمْ، فَتُؤَدُّونَ مِنْهُ الزَّكَاةَ. [ط٥٩١].

* إسناده صحيح.

**ژ سائبێ كورێ یەزیدی (رضي الله عنه) گۆت: عوسمانێ كورێ عەففانی دگۆت: ئەڤە هەیڤا زەكاتا هەوەیە، ڤێجا هەر كەسێ دەینەك ل سەر بیت بلا دەینێ خۆ بدەت، هەتا كا چ ژ مالێ هەوە دێ دمینیت ڤێجا زەكاتێ ژێ بدەن.**

١٧٤١ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: زَكُّوا مَا كَانَ فِي أَيْدِيكُمْ، وَمَا كَانَ مِنْ دَيْنٍ فِي ثِقَةٍ فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ مَا فِي أَيْدِيكُم، وَمَا كَانَ مِنْ دَيْنٍ ظَنُونَ فَلاَ زَكَاةَ فِيهِ حَتَّى يَقْبِضَهُ. [هق٤/١٥٠].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: كا زەكاتا چ د ناڤ دەستێت هەوەدایە بدەن، و كا چ دەین هەوە ل سەر ئێكی باوەرێ هەیە ئەو وەكی وییە یێ د ناڤ دەستێت تەدا، و كا چ دەینەكێ ب گۆمانە بزڤریت وی زەكات تێدا نینە هەتا وەردگریت.**

**٢١ ـ باب: لا زكاة حتى يحول الحول.**

**بابەتێ: زەكات نینە هەتا سالەك ب سەردا دهێت.**

١٧٤٢ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنِ اسْتَفَادَ مَالاً، فَلاَ زَكَاةَ عَلَيْهِ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ عِنْدَ رَبِّهِ**).

- وفي رواية: (**فَلاَ زَكَاةَ فِيْهِ**). [ت٦٣١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ مالەك ب دەستخۆڤە ئینا زەكات تێدا نینە هەتا سالەك ل دەڤ خودانێ خۆ ب سەردا نەهێت).**

- **و د ڤەگێرەكێدا : (زەكات تێدا نینە).**

١٧٤٣ - عَنْ عَلِي رضي الله عنه قَالَ: إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَالٌ اسْتَفَدْتَهُ فَلَيْسَ عَلَيْكَ زَكَاةٌ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلِ. [هق٤/١٠٣].

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر تە هندەك مال هەبیت ب دەستخۆڤە ئینابیت زەكات ل سەر نینە هەتا سالەك ب سەردا نەچیت.**

١٧٤٤ - عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: لَمْ يَكُنْ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه يَأْخُذُ مِنْ مَالٍ زَكَاةً حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ. [هق٤/١٠٣].

**ژ قاسمێ كورێ موحەممەدی، گۆت: ئەبوبەكری زەكات ژ چو مالی نەوەردگرت هەتا سالەك ب سەرڤە چۆبا.**

## ٢٢ ـ باب: نقل الزكاة من بلد إلى آخر.

## بابەتێ: ڤەگوهازتنا زەكاتێ ژ باژێرەكی بۆ باژێرەكێ دی.

١٧٤٥ - عَنْ أَسْلَمَ: أَنَّهُ لَمَّا كَانَ عَامُ الرَّمَادَةِ وَأَجْدَبَتْ بِبِلادِ الأَرْضُ، كَتَبَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ إِلَى عَمْرِو بْنِ العَاصِ: مِنْ عَبْدِ اللهِ عُمَرَ أَمِيرِ المُؤْمِنِينَ إِلَى العَاصِ بْنِ العَاصَ: لَعَمْرِي مَا تُبَالِي إِذَا سَمِنْتَ، وَمَنْ قِبَلَكَ، أَنْ أَعْجَفَ أَنَا وَمَنْ قِبَلِي وَيَا غَوْثَاهُ.

فَكَتَبَ عَمْرٌو: سَلامٌ، أَمَا بَعْدُ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، أَتَتْكَ عِيْرٌ أَوَّلُهَا عِنْدَكَ وَآخِرُهَا عِنْدِي، مَعْ أَنِّي أَرْجُو أَنْ أَجِدَ سَبِيلاً أَنْ أَحْمِلَ فِي البَحْرِ.

فَلَمَّا قَدِمَتْ أَوَّلُ عِيْرٍ دَعَا الزُّبَيْرَ فَقَالَ: اخْرُجْ فِي أَوَّلِ هذِهِ العِيْرِ فَاسْتَقْبِلْ بِهَا نَجْداً فَاحْمِلْ إِلَى كُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ قَدَرْتَ عَلَى أَنْ تَحْمِلَهُمْ إِلَيَّ، وَمَنْ لَمْ تَسْتَطِعْ حَمْلَهُ فَمُرْ لِكُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ بِبَعِيرٍ بِمَا عَلَيْهِ، وَمُرْهُمْ فَلْيَلْبِسُوا كِيَاسَ الذِينَ فِيهِمُ الحِنْطَةَ، وَلْيَنْحَروا البَعِيرَ فَلْيَجْمِلُوا شَحْمَهُ وَلْيَقِدُّوا لَحْمَهُ، وَلْيحْذُوا جِلْدَهُ، ثُمَّ لِيَأْخُذُوا كَمْيَّةً مِنْ قَدِيْدٍ وَكَمْيَّةً مِنْ شَحْمٍ وَحَفْنَةً مِنْ دَقِيقٍ، فَيَطْبُخُوا فَيَأْكُلُوا حَتَّى يَأْتِيَهُمُ اللهُ بِرِزْقٍ.

فَأَبَى الزُّبَيْرُ أَنْ يَخْرُجَ، فَقَالَ: أَمَا وَاللهِ لا تَجِدُ مِثْلَهَا حَتَّى تَخْرُجَ مِنَ الدُّنْيا، ثُمَّ دَعَا آخَرَ أَظُنُّهُ طَلْحَةَ فَأَبَى.

ثُمَّ دَعَا أَبَا عُبَيْدَةَ بْنِ الجَرَّاحِ فَخَرَجَ فِي ذَلِكَ، فَلَمَّا رَجَعَ بَعَثَ إِلَيْهِ بِأَلْفِ دِينَارٍ، فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ: إِنِّي لَمْ أَعْمَلْ لَكَ يَا ابْنَ الخَطَّابِ إِنَّمَا عَمِلْتُ للهِ وَلَسْتُ آخُذُ فِي ذَلِكَ شَيْئاً، فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ أَعْطَانَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي أَشْيَاءَ بَعَثَنَا لَهَا فَكَرِهْنَا، فَأَبَى ذَلِكَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَاقْبَلْها أَيُّها الرَّجُل، فَاسْتَعِنْ بِها عَلَى دُنْيَاكَ وَدِينِكَ، فَقَبِلَها أَبُو عُبَيْدَةَ بْنِ الجَرَّاحِ. ثم ذكر الحديث.[مه٢٣٦٧/ك١٤٧١/هق٦/٣٥٥].

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ ئەسلەمی (رضي الله عنه) دەمێ بوویە سالا تۆزەلۆكێ[1] و عەرد هشك بووی، عومەرێ كورێ خەتتابی بۆ عەمرێ كورێ عاسی نڤیسی: ژ بەندەیێ خودێ عومەری میرێ باوەریداران بۆ عاسێ كورێ عاسی تە خەم نینە ئەگەر تو و یێت دۆرماندۆرێت تە قەلەو ببن و ئەز و یێت دۆرماندۆرێت من لاواز ببین، وەی د هەوار و تانا مە وەرە.**

**ئینا عەمری نڤیسی: سلاڤ ل تە بن، پاشی لەبێ ل دویڤ لەبێ، ئەڤە كاروانەك بۆ تە هات سەرێ وی یێ ل دەڤ تە و دویماهییا وی یا ل دەڤ من، و د گەل وێ ژی من هیڤییە ئەز رێكەكێ د دەریاییدا ببینم بۆ هەوە بار بكەم.**

**ڤێجا دەمێ سەرێ كاروانی گەهشتی: گازی زوبەیری كر و گۆتێ: سەرێ ڤی كاروانی ببە بەرێ وی بدە نەجدێ، خەلكێ هەر مالەكا تو بشێی هەلگری بینە دەڤ من، و ئەوێت تو نەشێی هەلگری فەرمانێ ب حێشترەكێ بۆ خەلكێ هەر مالەكێ بدە، و فەرمانا وان بكە بلا ئەو گینیكێت گەنم تێدا بكەنە بەر خۆ و حێشترێ ڤەكوژن و بەزێ وێ بحەلینن و گۆشتێ وێ هشك بكەن و كەڤلێ وێ بۆ خۆ بكەنە پێلاڤ و پاشی هندەك ژ گۆشتێ وێ یێ هشككری و هندەك بەزێ وێ و هندەك ئاری بكەنێ بلێنن و بلا بخۆن هەتا خودێ رزقی بۆ وان دئینیت.**

**زوبەیری نەڤیا بچیت: ئینا عومەری گۆتێ: ما دەم تە نەكر ئەز ب خودێ كەمە تو وەكی ڤێ نابینی هەتا تو ژ دنیایێ دەردكەڤی، پاشی گازی ئێكێ دی كر، ئەز هزر دكەم تەلحە بوو و وی ژی نەڤیا بچیت.**

---

(١) ئەو سال ل سەر دەمێ عومەری بوو (رضي الله عنه) و نەهـ هەیڤان ل سەرێك باران ل مەدینەیێ و دەوروبەرێت وێ نەهات، و عەرد هشك بوو و وەكی تۆزێ لێ هات، ژ ڤێ ئەگەرێ برس و گرانی كەفتە د ناڤ خەلكیدا، لەوا ئەو سال ب سالا هشكاتی و تۆزەلۆكێ هاتە ناڤكرن.

پاشی گازی ئەبو عوبەیدەیێ كوڕێ جەراحی كر، ئەو بۆ وی كاری دەركەفت، ڤێجا دەمێ زڤرییەڤە، عومەری هزار دینار بۆ هنارتن، ئینا ئەبو عوبەیدەی گۆت: ئەی كوڕێ خەتتابی من ئەو كار بۆ تە نەكرییە من ب تنێ یێ بۆ خودێ كری، و ئەز چو بۆ وی كاری وەرناگرم، ئینا عومەری گۆتێ: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ هندە تشتان ئەم دهنارتین و پارە ددانە مە و مە ئەو نەدڤیا بەلێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) قەبویل نەدكر ئەگەر نەوەرگرین، ڤێجا وەرگرە زەلام و مفایی بۆ دنیا خۆ و دینێ خۆ ژێ وەرگرە، ئینا ئەبو عوبەیدەیێ كوڕێ جەراحی قەبویل كر. پاشی فەرموودە گۆت.



## الفصل الثاني: زكاة الفطر

## پشكا دووێ: زەكاتا فترێ

### ١ ـ باب: وجوب زكاة الفطر وأحكامها.

### بابەتێ: واجببوونا زەكاتا فترێ و فەرمانێت وێ.

١٧٤٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) زَكَاةَ الْفِطْرِ، صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى الْعَبْدِ وَالحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، مِنَ المُسْلِمِينَ.
[خ١٥٠٣/ م٩٨٤].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەكاتا فترێ فەرز كر منەك ژ قەسپا یان منەك[1] ژ جهی ل سەر بەندەیی و ئازای و نێر و مێ و بچویكی و مەزنی ژ موسلمانان.**

١٧٤٧ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ، صَاعاً مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعاً مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعاً مِن زَبِيبٍ.[خ١٥٠٦ (١٥٠٥)/ م٩٨٥].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: مە زەكاتا فترێ دەردئێخست منەك ژ خوارنێ یان منەك ژ جهی یان منەك ژ قەسپان یان منەك ژ كەشكی یان منەك ژ مێویژا.**

١٧٤٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَمَرَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ، قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ. [خ١٥٠٩/ م٩٨٦].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان ب دانا فترێ كر بەری خەلك بۆ نڤێژا جەژنێ دەركەڤن.**

### ٢ ـ باب: في الصاع.

### بابەتێ: دەرباری (صاع)ێ.

١٧٤٩ - (خ) عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كَانَ الصَّاعُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) مُدّاً وَثُلُثاً بِمُدِّكُمُ الْيَوْمَ، فَزِيدَ فِيهِ فِي زَمَنِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ. [خ٦٧١٢].

(١) هەلبەت (صاع) و منا قەسپا و دەخلی و جهی و كەشكی و مێویژان وەك پیڤان ژێك جودایە، و هندی ئێك نینن، لەوا من و (صاع) ب كێشانێ دكەڤیتە د ناڤبەرا (٢،٢٠٠-٢،٨٠٠) كغم، لەوا باشترە یێ فترێ بدەت یا پتر بدەت و نەگەر بكەتە ٣ كغم هێژ باشترە.

**ژ سائبێ كوڕێ یەزیدی (ﭭ) گۆت: (صاع) ل سەردەمێ پێغەمبەری (ﷺ) مستەك و سێكا مستا هەوە یا ئەڤرۆ بوو، ل سەر دەمێ عومەرێ كوڕێ عەبدولعەزیزی لێ زێدە كر.**

١٧٥٠ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ، وَالْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ**). [د٣٣٤٠/ ن٢٥١٩].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كێشان كێشانا خەلكێ مەكەهێیە و پیڤان پیڤان خەلكێ مەدینەیێیە)[1].**

## ٣ - باب: وقت إخراج صدقة الفطر

### بابەتێ: دەمێ دەرێخستنا زەكاتا فترێ.

١٧٥١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ، مَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلاَةِ؛ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلاَةِ؛ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ. [د١٦٠٩/ جه١٨٢٧].

* حسن.

[وانظر: ١٧٤٨] .

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەكاتا فترێ فەرز كر وەك پاقژكەرەك بۆ رۆژیگری ژ ئاخفتنا پویچ و ئاخفتا كرێت و وەك خوارن بۆ بەلنگازان، هەر كەسێ بەری نڤێژا جەژنێ دا ئەو زەكاتەكا قەبویلكرییە، و هەر كەسێ پشتی نڤێژێ دا ئەو خێرەكە ژ خێران.**

١٧٥٢ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَبْعَثُ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ إِلَى الَّذِي تُجْمَعُ عِنْدَهُ قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ. [ط٦٣٠].

---

(١) پیڤان و كیشانێ گرێدانەكا موكم یا ب زەكاتێڤە هەی، و د كێشان و پیڤانێدا جوداهی هەبوو، و دا ئەو جوداهی نەمینیت د هەژمارتنا مالیدا بۆ دانا زەكاتێ پێغەمبەری (ﷺ) دیار كر بۆ پیڤانێ پشتبەستن ب پیڤانا مەدینەیێ دهێتە كرن، و ئێكەیا وان یا پیڤانێ (صاع و رتل) بوو، و بۆ كێشانێ (وەزنێ) پشتبەستن ب كێشانا مەكەهێڤە دهێتە كرن، و ئێكەیا پیڤانێ یا وان دینار و دەرهەم بوون.

ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: عەبدوللایێ كوڕێ عومەری ب دو یان سێ رۆژان بەری جەژنێ زەكاتا فترێ فرێدكره ل دەڤ وی یێ فتره ل دەڤ كۆم دبوون.

## ٤ ـ باب: فرضت زكاة الفطر قبل الزكاة.

### بابەتێ: فتره بەری زەكاتێ هاتبوو فەرزكرن.

١٧٥٣ - عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ تَنْزِلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الزَّكَاةُ لَمْ يَأْمُرْنَا وَلَمْ يَنْهَنَا، وَنَحْنُ نَفْعَلُهُ.[ن٢٥٠٦/ جه١٨٢٨].

* صحيح.

ژ قەیسێ كوڕێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا مە ب زەكاتا فترێ كر بەری زەكات فەرز ببیت، ڤێجا دەمێ زەكات فەرز بووی نە فەرمانا مە كر و نە ئەم داینە پاش و ئەم ددەین[1].



(١) رامان ئەو نینە مرۆڤ یێ ب دلێ خۆیە دڤێت زەكاتا فترێ بدەت و دڤێت نادەت، چونكی زانا هەڤدەنگن فتره واجبە، بەلێ مەبەست ئەوە ئەم ماینە سەر فەرمانا ئێكێ و چو فەرمانێت نوی پێغەمبەری (ﷺ) د راستێدا نەدان.

الفصل الثالث: الصدقات.

**پشكا سێیێ: سەدەقەیان.**

١ ـ باب: فضل الصدقة والحض عليها.

**بابەتێ: خێرا سەدەقەیێ و پالدان ل سەر.**

١٧٥٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ، وَلاَ يَقْبَلُ اللهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ، فَإِنَّ اللهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يُرَبِّيها لِصَاحِبِهَا، كَما يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، حَتَّى تَكونَ مِثْلَ الجَبَلِ)** . [خ١٤١٠/ م١٠١٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ تەمەت قەسپەكێ ژ كارەكێ حەلال بكەتە خێر و خودێ چو خێران قەبویل ناكەت یا حەلال نەبیت، بێ گۆمان خودێ ژێ قەبویل دكەت، پاشی بۆ خودانێ وێ خودان دكەت، هەروەكی ئێك ژ هەوە ماهینا خۆ خودان دكەت، حەتا وەكی چیای لێ دهێت).**

١٧٥٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(ما مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ، فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقاً خَلَفاً، وَيَقُولُ الآخَرُ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكاً تَلَفاً)**. [خ١٤٤٢/ م١٠١٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو رۆژ نینن ل بەندەیان ببیتە سپێدە ئیللا دو ملیاكەت دئێنە خوارێ، ئێك ژ وان دبێژیت: یا خودێ بێ ددەت و دەمزێخیت شوینێ بدێ، و یێ دی دبێژیت: یا خودێ یێ گرتی و نەدەت نەمانێ بدێ).**

١٧٥٦ - عَنْ مَالِكِ بْنِ نَضْلَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(الْأَيْدِي ثَلاَثَةٌ: فَيَدُ اللهِ الْعُلْيَا، وَيَدُ الْمُعْطِي الَّتِي تَلِيهَا، وَيَدُ السَّائِلِ السُّفْلَى، فَأَعْطِ الْفَضْلَ، وَلاَ تَعْجِزْ عَنْ نَفْسِكَ)** . [د١٦٤٩].

* صحيح.

**ژ مالكێ كورێ نەزلەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەست سێنە: دەستێ خودێ یێ بلند و بالایە، و دەستێ یێ ددەت ئەوە یێ دویڤدا دهێت، و دەستێ یێ دخوازیت یێ نزمە، ڤێجا یا زێدە ژ خۆ و مالا خۆ بدە و هەمییێ نەدەی پاشی نەشێی مەزاختنێ ل خۆ و ل یێت ژێر بەرپرساتییا خۆ بكەی).**

١٧٥٧ – عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّهُمْ ذَبَحُوا شَاةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**مَا بَقِيَ مِنْهَا**) ؟ قَالَتْ: مَا بَقِيَ مِنْهَا إِلَّا كَتِفُهَا، قَالَ: (**بَقِيَ كُلُّهَا غَيْرَ كَتِفِهَا**). [ت٢٤٧٠].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، وان گیسكەك فەكوشت، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (چ ژێ مایە)؟ گۆت: چو ژێ نەمایە شەپویلێ وی نەبیت[1]، گۆت: (هەمی یێ ژێ مای شەپویلێ وی نەبیت)[2].**

١٧٥٨ – عَنْ مَالِكٍ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ مِسْكِيناً اسْتَطْعَمَ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، وَبَيْنَ يَدَيْهَا عِنَبٌ، فَقَالَتْ لِإِنْسَانٍ: خُذْ حَبَّةً فَأَعْطِهِ إِيَّاهَا، فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَيَعْجَبُ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَتَعْجَبُ؟ كَمْ تَرَى فِي هَذِهِ الْحَبَّةِ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ! [ط١٨٧٩]

* اسناده منقطع

* انفرد به الإمام مالك.

**ژ مالكی (رحمه الله) گۆت: گەهشتە من بەلنگازەكی خوارن ژ عائیشایێ دایكا موسلمانان خواست و تری ل بەر سینگێ وێ بوو، ئینا گۆتە مرۆڤەكی: تلیكەكا تری راكە بدە وی، ئینا دەستهاڤێتێ بەرێ خۆ دا عائیشایێ و گوهشی، ئینا عائیشایێ گۆت: تو گوهشی؟ تو دبینی وێ تلیكا تری چەند دنكا ژ هەمیان بچویكتر تێدایە.**

١٧٥٩ – عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**كُلُّ امْرِئٍ فِي ظِلِّ صَدَقَتِهِ، حَتَّى يُفْصَلَ بَيْنَ النَّاسِ**) أَوْ قَالَ: (**حَتَّى يُحْكَمَ بَيْنَ النَّاسِ**). [هق٤/١٧٧].

* قال الذهبي: إسناده قوي.

[وانظر: ٣٣٣٦ (والصدقة برهان).

وانظر: ٣٣٣٧ (ما نقصت صدقة من مال).

وانظر: ٣١٣٣ (في عدم شراء ما تصدق به)

وانظر: ٢ (الصدقة تطفئ الخطيئة)].

---

(١) ئانكو: هەمی مە یێ كرییە خێر شەپویلێ وی نەبیت.

(٢) ئانكو: یێ بوویە خێر، ئەو یێ مای و ئەو بۆ مرۆڤییە.

**ژ عوقبەیێ كوڕێ عامری (ڕەزی خودێ ژێ بیت) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر مرۆڤەك دێ ل بەر سیبەرا خێرا خۆ بیت هەتا د ناڤبەرا خەلكیدا دهێتە جوداكرن) یان گۆت: (هەتا حوكم د ناڤبەرا خەلكیدا دهێتە كرن).**

## ٢ ـ باب: على كل مسلم صدقة.

**بابەتێ: هەر موسلمانەكی سەدەقە یا ل سەر**

١٧٦٠ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ) . قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قالَ: (فَيَعْمَلُ بِيَدَيْهِ، فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ وَيَتَصَدَّقُ) . قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، أَوْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قالَ: (فَيُعِينُ ذَا الحَاجَةِ المَلْهُوفَ) . قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: (فَلْيَأْمُرْ بِالْخَيْرِ، أَوْ قَالَ: بِالمَعْرُوفِ) . قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: (فَلْيُمْسِكْ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهُ لَهُ صَدَقَةٌ). [خ٦٠٢٢ (١٤٤٥)/ م١٠٠٨].

**ژ ئەبو مووسایێ ئەشعەری، (ڕەزی خودێ ژێ بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (سەدەقە یا ل سەر هەر موسلمانەكی هەی). گۆتن: هەكە نەبیت؟ گۆت: (بلا ب دەستێت خۆ شۆل كەت، مفای ل خۆ بكەت و سەدەقێ ژی بدەت). گۆتن: هەكە نەشیا یان ئەو نەكر؟ گۆت: (بلا هاریكارییا هەوجەیێ هەوارخواز بكەت). گۆتن: هەكە ئەو نەكر؟ گۆت: (بلا فەرمانێ ب خێرێ بكەت یان گۆت: ب باشییێ) گۆت: ئەگەر نەكر؟ گۆت: (بلا خۆ ژ خرابییێ ڤەگریت ئەو ژی بۆ وی سەدەقەیە).**

١٧٦١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (كُلُّ سُلَامَى مِنَ النَّاسِ عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، كُلَّ يَوْمٍ تَطْلُعُ فِيهِ الشَّمْسُ: يَعْدِلُ بَيْنَ الاِثْنَيْنِ صَدَقَةٌ، وَيُعِينُ الرَّجُلَ عَلَى دَابَّتِهِ فَيَحْمِلُ عَلَيْهَا . أَوْ يَرْفَعُ عَلَيْهَا . مَتَاعَهُ صَدَقَةٌ، وَالْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا إِلَى الصَّلَاةِ صَدَقَةٌ، وَيُمِيطُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ). [خ٢٩٨٩ (٢٧٠٧)/ م١٠٠٩].

- وفي رواية للبخاري: (وَدَلُّ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ) . [خ٢٨٩١].

**ژ ئەبی هورەیرە (ڕەزی خودێ ژێ بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر ڕۆژەكا ڕۆژ تێدا ل سەر خەلكی دەركەڤیت سەدەقەكا ل سەر هەر گەهەكا وان هەی: دادوەرییێ د ناڤبەرا دوواندا بكەت سەدەقەیەكە، و هاریكارییا زەلامی د دەوارێ ویدا بكەت، باری هاری وی ڕاكەت یان باری هاری وی دانیت سەدەقەیەكە، و ئاخفتنا خۆش و خێرێ**

**سەدەقەیەكە، و هەر پێنگاڤەكا بۆ نڤێژێ باڤێت سەدەقەیەكە، و زیانێ ژ رێكێ راكەت سەدەقەیەكە).**

و د ڤەگێرا بوخاریدا: **(و رێنیشادان سەدەقەیەكە).**

## ٣ . باب: كل معروف صدقة.

## بابەتێ: هەر چاكییەكا هەبیت سەدەقەیە.

١٧٦٢ - (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ**). [خ٦٠٢١].

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر باشی و قەنجییەكا هەبیت سەدەقەیە).**

١٧٦٣ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ: أَنَّ نَاساً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالُوا لِلنَّبِيِّ (ﷺ): يَا رَسُولَ اللهِ، ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالأُجُورِ، يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ! قَالَ: (**أَوَ لَيْسَ قَدْ جَعَلَ اللهُ لَكُمْ مَا تَصَدَّقُونَ؟ إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً، وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ**). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟ قَالَ: (**أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ، أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ**). [م١٠٠٦].

ژ ئەبی زەرری (رضي الله عنه) گۆت: هندە مرۆڤان گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ، هەمی خێر گەهشتە خودانێت مالی (ئانكو زەنگینان)، نڤێژان دكەن هەروەكی ئەم نڤێژان دكەین، و رۆژییان دگرن هەروەكی ئەم رۆژییان دگرین، و مالێ خۆ یێ زێدە دكەنە سەدەقە. گۆت: **(ما چو نەدایە هەوە هوین بكەنە سەدەقە: ب راستی هەر تەسبیحەك (سبحان الله) سەدەقەیە، و هەر تەكبیرەك (الله اكبر) سەدەقەیە، و هەر تەحمیدەك (الحمد لله) سەدەقەیە، و هەر تەهلیلەك (لا اله الا الله) سەدەقەیە، و فەرمان ب باشییێ سەدەقەیە، و دانەپاش ژ خرابییێ سەدەقەیە، و سەدەقەیا د ئەندامێ (جهێ نامویسا) ئێك ژ هەوەدا)**، گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ، ئێك ژ مە بچیتە نڤینا ژنا خۆ، ئەڤە دێ بۆ خێر بیت؟ گۆت: **(بێژنە من هەكە بكەتە د حەرامیدا دێ گونەهـ ل سەر بیت ئان نە؟ هەر هۆسا هەكە بكەتە د حەلالیدا دێ خێر بۆ هێتە نڤیسین).**

## ٤ ـ باب: فضل صدقة الصحيح الشحيح

### بابەتێ: خێرا سەدەقەیا كەسێ ساخلەمێ دل ل سەر بیت

١٧٦٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ أَجْرًا؟ قَالَ: **(أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ ، تَخْشَى الْفَقْرَ، وَتَأْمُلُ الْغِنَى ، وَلاَ تُمْهِلُ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ ، قُلْتَ: لِفُلانٍ كَذَا، وَلِفُلانٍ كَذَا، وَقَدْ كَانَ لِفُلانٍ).**[خ١٤١٩/ م١٠٣٢].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، كیژ سەدەقە خێرا وێ مەزنترە؟ گۆت: **(تو سەدەقێ بدەی و تو یێ ساخلەم بی، و دلێ تە ل سەر بیت، و ژ هەژارییێ بترسی، و تە هیڤی هەبیت زەنگین ببی، و تو گیرۆ نەكەی هەتا رح دهێتە سەرێ گەریا تە ژ نوی بێژی: بۆ بێڤانی هندە و بۆ بێڤانی هندە و ئەو ب خۆ یێ بێڤانییە)**(١).

## ٥ ـ باب: ثبوت أجر الصدقة وَإِنْ وقعت في غير أهلها.

### بابەتێ: خێر دێ هێتە نڤیسین خۆ ئەگەر نەكەڤتە د جهێ خۆدا ژی.

١٧٦٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(قَالَ رَجُلٌ: لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ، فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِقٍ. فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ عَلَى سَارِقٍ. فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ. لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ زَانِيَةٍ. فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ. فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ. عَلَى زَانِيَةٍ. لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ، فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ غَنِيٍّ. فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ عَلَى غَنِيٍّ. فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ عَلَى سَارِقٍ، وَعَلَى زَانِيَةٍ، وَعَلَى غَنِيٍّ.**

**فَأُتِيَ: فَقِيلَ لَهُ: أَمَّا صَدَقَتُكَ عَلَى سَارِقٍ: فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعِفَّ عَنْ سَرِقَتِهِ. وأَمَّا الزَّانِيَةُ: فَلَعَلَّهَا أَنْ تَسْتَعِفَّ عَنْ زِنَاهَا، وَأَمَّا الْغَنِيُّ: فَلَعَلَّهُ يَعْتَبِرُ. فَيُنْفِقُ مِمَّا أَعْطَاهُ اللهُ)** . [خ١٤٢١/ م١٠٢٢].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(زەلامەكی گۆت: ئەز دێ خێرەكێ دەم، خێرا خۆ دەرێخست كرە د دەستێ دزیكەرەكیدا، سپێدە لێ بوو یێ ئاخفتن: ب شەڤ خێر یا دایە دزیكەرەكی، ئینا گۆت: یا خودێ ئەز حەمدا تە دكەم ب**

(١) ئانكو: یێ میراتخۆرییە بۆ هەیە زێدەی سێكێ قەبویل نەكەت.

**سویند ئەز دێ خێرەكێ دەم، خێرا خۆ دەرێخست كرە د دەستێ دەهمەن پیسەكێدا، سپێدە لێ بوو پێ ئاخفتن: ب شەڤ خێر یا دایە دەهمەن پیسەكێ، گۆت: یا خودێ ئەز حەمدا تە دكەم ل سەر دەهمەن پیسێ، ب سویند ئەز دێ خێرەكێ دەم، خێرا خۆ دەرێخست كرە د دەستێ زەنگینەكیدا، سپێدە لێ بوو پێ ئاخفتن: ب شەڤ خێر یا دایە زەنگینەكی، گۆت: یا خودێ ئەز حەمدا تە دكەم ل سەر دزیكەری و ل سەر دەهمەن پیسێ و ل سەر زەنگینی.**

**د خەونێدا دیت ئێكی گۆتێ: هندیكە خێرا تە دایە دزیكەری دبیت دزییا خۆ بهێلیت، و هندیكە دەهمەن پیسە دبیت دەهمەن پیسیا خۆ بهێلیت، و هندیكە زەنگینە دبیت پێڤە بچیت ژ یا خودێ دایێ بمەزێخیت).**

٦ ـ باب: ما تتصدق به الزوجة والخادم.

**بابەتێ: ئەوا هەڤژین و خزمەتكار دكەنە خێر.**

١٧٦٦ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا أَنْفَقَتِ المَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا، غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، كانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتْ، وَلِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا كَسَبَ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذلِكَ، لاَ يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرَ بَعْضٍ شَيْئاً). [خ١٤٢٥/ م١٠٢٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ژنێ ژ خورانا مالا خۆ كرە خێر بێی دەست دریان و پویچكرنا مالی بۆ وێ خێر یا هەی ب دانا وێ، و بۆ زەلامێ وێ ژی خێر یا هەی ب دەستڤەئینانا مالی، و بۆ خزمەتكارێ وێ مالێ دپارێزیت وەكی وێ خێرێیە و كەس ژ وان خێرا یێ دی كێم ناكەت).**

٧ ـ باب: الصدقة فيما استطاع وعدم إحصائها.

**بابەتێ: سەدەقە ل دویڤ شیانان و نەهژمارتنا وان.**

١٧٦٧ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (سَبَقَ دِرْهَمٌ مِائَةَ أَلْفٍ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَكَيْفَ؟ قَالَ: (رَجُلٌ لَهُ دِرْهَمَانِ، فَأَخَذَ أَحَدَهُمَا فَتَصَدَّقَ بِهِ، وَرَجُلٌ لَهُ مَالٌ كَثِيرٌ، فَأَخَذَ مِنْ عُرْضِ مَالِهِ مِائَةَ أَلْفٍ فَتَصَدَّقَ بِهَا). [ن٢٥٢٦، ٢٥٢٧].

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەرهەمكی د بەری سەد هزارانڕا كر) گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ چاوا؟! گۆت: (زەلامەكی دو دەرهەم پێت هەین، ئێك ژ وان هەلگرت كرە خێر، و زەلامەكی مالەكێ مەزن هەبیت ژ رەخەكێ مالێ خۆ سەد هزار راكرن و خێر پێ كر).**

١٧٦٨ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: كُنَّا يَوْماً فِي الْمَسْجِدِ جُلُوساً وَنَفَرٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ، فَأَرْسَلْنَا رَجُلاً إِلَى عَائِشَةَ لِيَسْتَأْذِنَ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهَا، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ سَائِلٌ مَرَّةً وَعِنْدِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَأَمَرْتُ لَهُ بِشَيْءٍ، ثُمَّ دَعَوْتُ بِهِ فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَمَا تُرِيدِينَ أَنْ لاَ يَدْخُلَ بَيْتَكِ شَيْءٌ، وَلاَ يَخْرُجَ إِلاَّ بِعِلْمِكِ)** ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: **(مَهْلاً، يَا عَائِشَةُ! لاَ تُحْصِي، فَيُحْصِيَ اللهُ عزّ وجل عَلَيْكِ)**. [ن٢٥٤٨].

* حسن.

**ژ ئەبی ئومامەیێ كوڕێ سەهلێ كوڕێ ئەحنەفی (ﷺ) گۆت:** رۆژەكێ ئەم **هندەك ئەنساری و مشەختی ل مزگەفتێ د روینشتی بووین، ئینا مە زەلامەك هنارتە دەڤ عائیشایێ دا دەستویرییێ بخوازیت، ئەم چۆینە دەڤ، گۆت: جارەكێ خوازخوازۆكەك هاتە دەڤ من و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل دەڤ من بوو، من فەرمان ب تشتەكی بۆ كر، پاشی من گازی كر وی تشتی بۆ من بینن و من بەرێ خۆ داییێ، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ما تە دڤێت تشتەك نەهێتە د مالا تەڤە و چو ژێ نەدەركەڤیت ب ئاگەهییا تە نەبیت)؟** من گۆت: بەلێ، گۆت: **(هشیار بی ئەی عائیشا نەڤەگرە (و نەهەژمێرە هەژمارا چرویكێ گرتی) هەكە خودێ دێ ژ تە ڤەگریت).**

## ٨ ـ باب: الصدقة عن ظهر غنى.

## بابەتێ: سەدەقە د كراسێ بێمنەتییێدایە.

١٧٦٩ - (ق) عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، وَخَيْرُ الصَّدَقَةِ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ)**. [خ١٤٢٧/ م١٠٣٤].

**ژ حەكیمێ كوڕێ حیزامی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەستێ بلند و ددەت ژ دەستێ نزم و دخوازیت و وەردگریت چێترە، و دەست ب یێ**

**نێزیکی خۆ پێ تو ژ خودانکرنا وی بەرپرس بکە، و باشترین سەدەقە ئەوە یا مرۆڤ د کراسێ بێمنەتییێدا ددەت[1] و هەر کەسێ قەناعەت و دلپاکییێ بخوازیت، خودێ دێ دلپاك و قەناعەت ئێخیت، و هەر کەسێ زەنگینییێ ل خۆ ئاشکرا کەت خودێ دێ (دلێ وی) زەنگین کەت).**

## ٩ . باب: من أَجر نفسه ثم تصدق بأُجرته.

### بابەتێ: یێ پالەتییێ بکەت پاشی پالەتیا خۆ بکەتە خێر.

١٧٧٠ - (خ) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا أَمَرَ بِالصَّدَقَةِ، انْطَلَقَ أَحَدُنَا إِلَى السُّوقِ فَيُحَامِلُ فَيُصِيبُ المُدَّ، وَإِنَّ لِبَعْضِهِمْ لَمِائَةَ أَلْفٍ. قَالَ: ما نَرَاهُ إِلاَّ نَفْسَهُ. [خ٢٢٧٣ (١٤١٥)].

**ژ ئەبی مەسعودێ ئەنساری (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان ب سەدقەدانێ کربا ئێك ژ مە دا چیتە بازاری و حەمالی دکر، ڤێجا دا مستەك گەهیتێ و هندەکان سەد هزار هەبوون و مە بەس خۆ ددیت و مە چو پێ دی نەبوو.**

١٧٧١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (**جُهْدُ الْمُقِلِّ، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ**). [د١٦٧٧].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ کیژ سەدەقە باشترە؟ گۆت: (خێرا ل دویڤ شیانا و یا دەستەنگی، و ژ وان دەست پێ بکە یێت تو ژ خودانکرنا وان بەرپرس).**

## ١٠ . باب: الصدقة على الأَقارب.

### بابەتێ: خێرا د گەل کەسوکاران.

١٧٧٢ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ الأَنْصَارِ بِالمَدِينَةِ مالاً مِنْ نَخْلٍ، وَكَانَ أَحَبَّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرُحَاءُ، وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ المسْجِدِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَدْخُلُهَا، وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ.

---

[1] ئانكو: خێرترین سەدەقە ئەوە یا مرۆڤ ژ مالێ خۆ دەردئێخیت، پشتی تێرا خۆ و مالا خۆ دهێلیت.

قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا أُنْزِلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾[آل عمران:٩٢] قامَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾، وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرُحَاءُ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لله، أَرْجُو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللهِ، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللهِ حَيْثُ أَرَاكَ اللهُ.

قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**بَخٍ، ذلِكَ مالٌ رَابِحٌ، ذلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، وَقَدْ سَمِعْتُ ما قُلْتَ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ**). فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَبَنِي عَمِّهِ. [خ١٤٦١/ م٩٩٨].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: ئەبو تەلحەی (ﷺ) ژ ئەنساران پتری هەمیان دار قەسپ ل مەدینێ هەبوون، و مالێ وی یێ ژ هەمیان خۆشڤیتر بۆ وی بیستانێ بەیروحاء بوو، و دكەفتە قیبلا مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ)، و پێغەمبەرێ خودێ ﷺ دچۆ د ناڤدا و ژ ئاڤا وی ڤەدخوار، ئاڤەكا شرین بوو، ئەنەسی گۆت: دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ:** ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾[1]. **ئەبو تەلحە ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو و گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ، خودایێ مەزن ل سەر تە ئینایە خوارێ:** ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ **ب راستی، هوین ناگەهنە راستییا قەنجییێ، هەتا هوین وی نەمەزێخن [د رێكا خودێدا] یێ هوین گەلەك حەژێ دكەن. و مالێ من یێ پتر ئەز حەژێ دكەم بەیروحائە و ئەز بۆ خودێ دكەمە سەدەقە هیڤیا خێرا وێ و شوینا وێ ل دەڤ خودێ دكەم، بێخە د وی جهیدا یێ خودێ نیشا تە دای، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئوو ئەڤە مالەكێ ب فایدەیە، ئەڤە مالەكێ ب فایدەیە، (ئانكو: خێرا ڤی مالی چەندا مەزنە) من گوھ لێ بوو كا تە چ گۆت؛ و ئەز دبینم تو بدەیە مرۆڤێت خۆ)، ئەبو تەلحەی گۆت: دێ وەكەم یا پێغەمبەرێ خودێ، ئینا ل سەر مرۆڤێت خۆ و پسمامێت خۆ بەلاڤ كر.**

١٧٧٣ - (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قالتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلِيَ أَجْرٌ أَنْ أُنْفِقَ عَلَى بَنِي أَبِي سَلَمَةَ، إِنَّمَا هُمْ بَنِيَّ؟ فَقَالَ: (**أَنْفِقِي عَلَيْهِمْ، فَلَكِ أَجْرُ ما أَنْفَقْتِ عَلَيْهِمْ**). [خ١٤٦٧/ م١٠٠١].

---

(١) ئانكو: ب راستی، هوین ناگەهنە راستییا قەنجییێ، هەتا هوین وی نەمەزێخن [ د رێكا خودێدا ] یێ هوین گەلەك حەژێ دكەن.

وفي رواية لهما: ولستُ بتارِكَتِهِمْ هكذا وهكذا، إنّما هم بَنِيّ. [خ٥٣٦٩].

**ژ ئوم سەلەمەیی (ڕەزیاللەهو عەنها) گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەرێ خێر بۆ من هەیە ئەز مەزاختنێ ل عەیالێ ئەبی سەلەمەیی بكەم، ب ڕاستی ئەو عەیالێ منن؟ گۆت: (مەزختنێ ل وان بكە ئەو مەزختنا تو ل وان دكەی بۆ تە خێرە).**

**و د ڤەگێڕەكا دی یا واندا: ئەز وان هۆسا و هۆسا ناهێلم ئەو عەیالێ منن.**

١٧٧٤ - (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ قَالَ: جاءَت زَيْنَبُ، امْرَأَةُ ابْنِ مَسْعُودٍ، تَسْتَأْذِنُ عَلَيْهِ [(ﷺ)]، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! هذِهِ زَيْنَبُ، فَقَالَ: (**أَيُّ الزَّيَانِبِ**)؟ فَقِيلَ: امْرَأَةُ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: (**نَعَمْ، ائْذَنُوا لَهَا**). فَأُذِنَ لَهَا، قَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ! إِنَّكَ أَمَرْتَ الْيَوْمَ بِالصَّدَقَةِ، وَكَانَ عِنْدِي حُلِيٌّ لِي، فَأَرَدْتُ أَنْ أَتصَدَّقَ بِهِ، فَزَعَمَ ابْنُ مَسْعُودٍ: أَنَّهُ وَوَلَدَهُ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**صَدَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ، زَوْجُكِ وَوَلَدُكِ أَحَقُّ مَنْ تَصَدَّقْتِ بِهِ عَلَيْهِمْ**). [خ١٤٦٢ (٣٠٤)].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ڕەزیاللەهو عەنهو) گۆت: زەینەب هەڤژینا ئیبن مەسعودی هات** دەستویری خواست بچیتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، ئێكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەڤە زەینەبە، ئینا گۆت: **(كیژ زەینەبە)؟** گۆت: هەڤژینا ئیبن مەسعودی، گۆت: **(بەلێ دەستویرییێ بدەنێ)** ئینا دەستویری دایێ و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تە ئەڤرۆ فەرمان ب خێرێ كر، و چەكێ من ل دەڤ من بوو، من ڤیا ئەز خێرێ پێ بكەم، ئیبن مەسعودی گۆت: ئەو و عەیالێ وی ژ هەمیان هەژیترن تو خێرێ د گەل بكەی، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئیبن مەسعود ڕاست دبێژیت، زەلامێ تە و عەیالێ تە ژ هەمیان هەژیترن تو خێرێ د گەل بكەی).**

١٧٧٥ - عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ الصَّدَقَةَ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَعَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ**: صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ). [ت٦٥٨/ ن٢٥٨١/ جه١٨٤٤/ مي١٧٢٢، ١٧٢٣].

* صحيح.

ژ سەلمانێ كوڕێ عامری (ڕەزیاللەهو عەنهو)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب ڕاستی سەدەقە ل سەر بەلنگازی سەدەقە ب تنێیە، و سەدەقە ل سەر مرۆڤێت مرۆڤی سەدەقەیە و مرۆڤانییە).**

## ١١ ـ باب: وصول ثواب الصدقة إلى الميت.

### بابەتێ: گەهشتنا خێرێ بۆ مری.

١٧٧٦ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ رضي الله عنه تُوُفِّيَتْ أُمُّهُ وَهُوَ غائِبٌ عَنْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ وَأَنَا غائِبٌ عَنْهَا، أَيَنْفَعُهَا شَيءٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْهَا؟ قَالَ: (نَعَمْ) . قَالَ: فَإِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّ حائِطِيَ المِخْرَافَ صَدَقَةٌ عَلَيْهَا. [خ٢٧٥٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دایكا سەعدێ كورێ عوبادەیی مر و ئەو ل وێرێ نەبوو، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دایكا من مر و ئەز ل دەڤ نەبووم، دێ خێر گەهیتە وێ ئەگەر ئەز پێشڤە سەدەقەیێ بدەم؟ گۆت: (بەلێ) گۆت: ئەز تە دكەمە شاهد ئەو بیستانێ من یێ ب بەر و فێقی بۆ دكەمە خێر.**

١٧٧٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنبِيِّ (ﷺ): إِنَّ أَبِي مَاتَ وَتَرَكَ مَالاً وَلَمْ يُوصِ، فَهَلْ يُكَفِّرُ عَنْهُ أَنْ أَتَصَدَّقَ عَنْهُ؟ قَالَ: (نَعَمْ) . [م١٦٣٠]

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) زەلامەكی گۆتە پێغەمبەری (ﷺ) بابێ من یێ مری و مالێ پاش خۆ هێلا و وەسیەت نەكرییە، ئەرێ گونەهێت وی دێ هێنە ژێبرن ئەگەر ئەز پێشڤە خیرێ بدەم؟ گۆت: (بەلێ).**

## ١٢ ـ باب: فضل الصدقة بالماء.

### بابەتێ: خێرا ئاڤێ.

١٧٧٨ - عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمَّ سَعْدٍ مَاتَتْ، فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (الْمَاءُ) ، قَالَ: فَحَفَرَ بِئْراً وَقَالَ: هَذِهِ لِأُمِّ سَعْدٍ. [د١٦٨١].

* حسن.

**ژ سەعدێ كورێ عوبادەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ چ سەدقە باشترە؟ گۆت: (ئاڤ) گۆت: ئینا بیرەك كۆلا و گۆت: ئەڤە بۆ دایكا سەعدییە.**

## ١٣ ـ باب: في حق السائل.

### بابەتێ: مافێ داخوازكەری.

١٧٧٩ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ بُجَيْدٍ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ بُجَيْدٍ . وَكَانَتْ مِمَّنْ بَايَعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) . أَنَّهَا قَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْكَ إِنَّ الْمِسْكِينَ لَيَقُومُ عَلَى بَابِي، فَمَا أَجِدُ لَهُ شَيْئاً أُعْطِيهِ إِيَّاهُ،

فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنْ لَمْ تَجِدِي لَهُ شَيْئاً تُعْطِينَهُ إِيَّاهُ؛ إِلاَّ ظِلْفاً مُحْرَقاً، فَادْفَعِيهِ إِلَيْهِ فِي يَدِهِ).
[د١٦٦٧/ ت٦٦٥/ ن٢٥٦٤]

* صحيح.

ژ عەبدولرەحمانێ كورێ بوجەیدی (رضي الله عنه) ژ داپیرا خۆ دایكا بوجەیدی، و ئەو ژ وان بوو یێت پەیمان دایە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، وێ گۆتە وی: ئەی پێغەمبەرێ خودێ سەلەواتێت خودێ ل سەر تە بن، ب ڕاستی بەلنگاز دهێتە بەر دەرێ من دراوەستیت، و ئەز چو نابینم بدەمێ، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: **(ئەگەر تە چو نەدیت بدەییێ سمەكا سۆتی نەبیت، بكە د ناڤ دەستێ ویدا).**

## ١٤ ـ باب: من سأل بالله تعالى.

**بابەتێ: یێ ب خودێ داخوازییێ بكەت.**

١٧٨٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللهِ فَأَعِيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَ بِاللهِ فَأَعْطُوهُ، وَمَنْ دَعَاكُمْ فَأَجِيبُوهُ، وَمَنْ صَنَعَ إِلَيْكُمْ مَعْرُوفاً فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُونَهُ، فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ). [د١٦٧٢/ ن٢٥٦٦].

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان ڕازی بیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ هەوارا خۆ ب خودێ گەهاندە هەوە هوین بپارێزن، وی بپارێزن، و هەر كەسێ ب ناڤێ خودێ بخوازیت بدەنێ، و یێ هوین گازیكرن قەبویل بكەن، و هەر كەسێ قەنجییەك د گەل هەوە كر خەلات بكەن، و هەكە هەو چو نەدیت پێ خەلات بكەن، دوعا بۆ بكەن هەتا هوین ببینن هەوە خەلات كر).**

## ١٥ ـ باب: الصدقة بالرديء والحرام.

**بابەتێ: خێركرنا ب مالێ خراب و حەرام.**

١٧٨١ – عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْمَسْجِدَ وَبِيَدِهِ عَصَا، وَقَدْ عَلَّقَ رَجُلٌ قِناً حَشَفاً، فَطَعَنَ بِالْعَصَا فِي ذَلِكَ الْقِنْوِ، وَقَالَ: (لَوْ شَاءَ رَبُّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ تَصَدَّقَ بِأَطْيَبَ مِنْهَا) ! وَقَالَ: (إِنَّ رَبَّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ يَأْكُلُ الْحَشَفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).[د١٦٠٨/ ن٢٤٩٢/ جه١٨٢١].

* صحيح.

ژ عەوفێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) هاتە دەڤ مە ل مزگەفتێ و دارەك د دەستیدا بوو، و زەلامەكی ئویشییەكێ قەسپێت هشك و خراب هەلاویستبوو، ئینا دارێ خۆ ل وی ئویشی دا و گۆت: **(ئەگەر خودانێ ڤێ خێرێ ڤیابا دا ژ ڤێ باشتر كەتە خێر)** و گۆت: **(خودانێ ڤێ خێرێ رۆژا قیامەتێ دێ قەسپێت هشك و خراب خۆت).**

١٧٨٢ - عنْ أبي هُريْرة قال: قال رسُولُ الله (ﷺ): (منْ جمع مالاً حراما، ثُمَّ تصدَّق بِهِ، لمْ يكُنْ لهُ فيهِ أجْرٌ، وكان إصْرُهُ عليْه). [حب٣٢١٦/ك١٤٤٠]

*إسناده حسن.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: **(هەر كەسێ مالەكێ حەرام كۆم بكەت، پاشی بكەتە خێر، چو خێر بۆ وی تێدا نینە، و گونەها وی یا ل سەر وی).**

## ١٦ ـ باب: المستحق للصدقة.

## بابەتێ: ئەوێت هەژی خێرێ.

١٧٨٣ - عنْ عبْد الله بن مسْعُود قال: قَال رسُولُ الله (ﷺ): (منْ سأل ولَهُ مَا يُغْنيهِ، جاءتْ يوْم الْقيامة خُمُوشٌ ـ أوْ خُدُوشٌ ، أوْ كُدُوحٌ ـ في وَجْهه) ، فَقال: يَا رَسُول الله، وَمَا الْغِنَى؟ قال: (خمْسُون دِرْهما أوْ قيمَتُها من الذَّهبِ) .[د١٦٢٦/ ت٦٥٠/ ن٢٥٩١/ جه١٨٤٠/ مي١٦٨٠]

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: **(هەر كەسێ خازۆكیێ بكەت و هند هەبیت وی ژ خازۆكیێ بێ منەت بكەت رۆژا قیامەتێ دێ هێت و سەروچاڤێت وی جەلخاندی و رویچاندی و بریندار)** ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بێمنەتی د چەندێدایە؟ گۆت: **(پێنجی دەرهەم یان بهایێ وی ژ زێری).**



الفصل الرابع: أحكام المسألة.

**پشكا چارێ: فەرمانێت خازۆكییێ.**

١ ـ باب: الحث على العمل والاستعفاف عن المسألة.

**بابەتێ: پالدانا ل سەر كاركرنێ و خۆدویركرنا ژ خازۆكییێ.**

١٧٨٤ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه: إِنَّ نَاساً مِنَ الأَنْصَارِ، سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى نَفِدَ ما عِنْدَهُ، فَقَالَ: **(ما يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عطَاءً خَيْراً وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ)**. [خ١٤٦٩/ م١٠٥٣].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، هندەك مرۆڤێت خەلكێ مەدینێ، ژ ئەنساران مال ژ پێغەمبەری (ﷺ) خواست، دا وان، پاشی ژێ خواستەڤە، دا وان، هەتا نەمای، و دەمێ هەمی تشتێ د دەستێ خۆدا مەزخاندی گۆتە وان **(چو خێر د دەستێ مندا بیت ئەز ل هەوە ناڤەگرم و ڤەشێرم، و هەر كەسێ قەناعەت و دلپاكییێ بخوازیت، خودێ دێ دلپاك و ب قەناعەت ئێخیت، و هەر كەسێ زەنگینییێ ل خۆ ئاشكرا كەت خودێ دێ (دلێ وی) زەنگین كەت، و هەر كەسێ سەبرخواز بیت خودێ دێ سەبری دەتێ، و خودێ چو دان نەداینە كەسێ ژ هەمی خێران ژ سەبری ب قەدرتر و ب بەرمكەتتر)**.

١٧٨٥ - (ق) عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ: **(يَا حَكِيمُ! إِنَّ هَذَا المَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى)**. [خ١٤٧٢/ م١٠٣٥].

ژ حەكیمێ كورێ حیزامی (رضي الله عنه) گۆت: من ژ پێغەمبەرێ خودێ خواست ئینا دا من، پاشی من ژێ خواست ئینا دا من، پاشی من ژێ خواست دا من، پاشی گۆت: **(ئەی حەكیم ئەڤ ماله یێ تەڕ و شرینە، هەر كەسێ ب دلفرەهی و نە ژ تەماعی وەرگرت بەركەت دێ كەڤیتێ و هەر كەسێ ژ چاڤبرسی و چاڤزلی ل سەر و ب خازخازۆكییا زێدە وەربگریت بەركەت بۆ ناكەڤیتێ، و دێ وەكی وی بیت یێ دخۆت و تێر نەبیت، و دەستێ بلند و ددەت ژ دەستێ نزم و دخوازیت و وەردگریت چێترە)**.

١٧٨٦ – (خ) عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ حَبْلَهُ، فَيَأْتِيَ بِحُزْمَةِ الْحَطَبِ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَبِيعَهَا، فَيَكُفَّ اللهُ بِهَا وَجْهَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ، أَعْطَوْهُ أَوْ مَنَعُوهُ**). [خ١٤٧١].

ژ زوبەیرێ كوڕێ عەوامی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەكە ئێك ژ هەوە وەریسێ خۆ هەلگریت و پاشی بچیتە چیای، و پشتیيەكێ دارا ل سەر پشتا خۆ بینیت و بفرۆشیت و خودێ روییێ وی پێ (ژ رەزیلییا خواستنێ) بپارێزیت، بۆ وی چێترە ئەو ژ خەلكی بخوازیت بدەنێ یان نەدەنێ).**

## ٢ ـ باب: النهي عن المسألة تكثراً.

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ خوازۆكییێ بۆ زێدەكرنێ.

١٧٨٧ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**ما يَزَالُ الرَّجُلُ يَسْأَلُ النَّاسَ، حَتَّى يَأْتِيَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ**). [خ١٤٧٤/ م١٠٤٠].

ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئێك ژ هەوە بەردەوام دێ خوازۆكییێ كەت، هەتا دگەهیتە خودێ و پشكەكا گۆشتی ب سەر و چاڤێت ویڤە نە).**

١٧٨٨ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ سَأَلَ النَّاسَ أَمْوَالَهُمْ تَكَثُّراً، فَإِنَّمَا يَسْأَلُ جَمْراً؛ فَلْيَسْتَقِلَّ أَوْ لِيَسْتَكْثِرْ**). [م١٠٤١].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ بۆ زێدەكرنا مالێ خۆ ژ خەلكی بخوازیت، ب راستی ئەو پەلا دخوازیت، ڤێجا بلا خوازۆكییێ كێم كەت یان زێدەكەت).**

## ٣ ـ باب: من تحل له المسألة.

## بابەتێ: بۆ كێ دورستە خوازۆكییێ بكەت.

١٧٨٩ – (م) عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ الْهِلاَلِيِّ قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَسْأَلُهُ فِيهَا، فَقَالَ: (**أَقِمْ حَتَّى تَأْتِيَنَا الصَّدَقَةُ، فَنَأْمُرَ لَكَ بِهَا**). قَالَ: ثُمَّ قَالَ: (**يَا قَبِيصَةُ، إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لاَ تَحِلُّ إِلاَّ لأَحَدِ ثَلاَثَةٍ: رَجُلٌ تَحَمَّلَ حَمَالَةً فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَهَا، ثُمَّ يُمْسِكُ. وَرَجُلٌ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ اجْتَاحَتْ مَالَهُ فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَاماً مِنْ عَيْشٍ ـ أَوْ قَالَ: سِدَاداً مِنْ عَيْشٍ ـ وَرَجُلٌ**

صَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَقُومَ ثَلاَثَةٌ مِنْ ذَوِي الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ: لَقَدْ أَصَابَتْ فُلاناً فَاقَةٌ، فَحَلَّتْ لَهُ نْمَسْأَلَةُ، حَتَّى يُصِيبَ قِوَاماً مِنْ عَيْشٍ . أَوْ قَالَ: سِدَاداً مِنْ عَيْشٍ . فَمَا سِوَاهُنَّ مِنَ الْمَسْأَلَةِ يَا قَبِيصَةُ سُحْتاً! يَأْكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحْتاً). [م١٠٤٤].

ژ ئەبی بیشری، قەبیسەیێ كوڕێ موخاریقی (ﷺ)، گۆت: من مالەك ژ بەر پێكئینانێ ب ستۆیێ خۆڤە گرتبوو، ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) من ژێ خواست، ئینا گۆت: **(خۆ بگرە هەتا زەكات بۆ مە دهێت و ئەم فەرمانێ بۆ تە پێ ددەین)**، پاشی گۆت: **(یا قەبیسە ب راستی خواستن، نەیا دورستە بۆ ئێك ژ سێیان نەبیت: مرۆڤەكی مالەك ژ بەر پێكئینانێ ب ستۆیێ خۆڤە گرتبیت، خواستن بۆ وی دورستە هەتا هەوجەییا پێڤی دگەهیتێ، پاشی خواستنێ بەس دكەت، و مرۆڤەكی ئاتافەك ب سەری هاتبیت مالێ وی هەمییێ بگریت، خواستن بۆ وی دورستە هەتا هند دگەهیتێ خۆ بدەتە بەر خۆ (ئانكو: خۆ ل سەر پێت خۆ بگریت) یان گۆت: هەوجەییا وی بقەتییێت، و مرۆڤەكی هەژارییەك گەهشتبیتێ هەتا سێ پێت خودان ئەقل و د سەر وێدا (شادەییێ بۆ ددەن) بێژن: هەژارییەكا گەهشتییە بێڤانی، خواستن بۆ وی دورستە هەتا هند دگەهیتێ خۆ بدەتە بەر خۆ (ئانكو: خۆ ل سەر پێت خۆ بگریت) یان گۆت: هەوجەییا وی بقەتییێت، ژ بلی ڤان خواستنان یا قەبیسە یا حەرامە، خودانێ وێ حەرامی دخۆت)**.

١٧٩٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ، وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ). [ن٢٥٩٦/ جه١٨٣٩].

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(زەكات نەیا دورستە بۆ زەنگینی و نە بۆ یێ ب هێز و ساخلەم)**.

١٧٩١ – عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ الْخِيَارِ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَجُلاَنِ أَنَّهُمَا أَتَيَا النَّبِيَّ (ﷺ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَهُوَ يَقْسِمُ الصَّدَقَةَ، فَسَأَلاَهُ مِنْهَا، فَرَفَّعَ فِينَا الْبَصَرَ وَخَفَّضَهُ، فَرَآنَا جَلْدَيْنِ ، فَقَالَ: (إِنْ شِئْتُمَا أَعْطَيْتُكُمَا، وَلاَ حَظَّ فِيهَا لِغَنِيٍّ وَلاَ لِقَوِيٍّ مُكْتَسِبٍ). [د١٦٣٣/ ٢٥٩٧٥].

* صحيح.

**ژ عوبەیدوللایێ كورێ عەدییێ كورێ ئەلخیاری (ﷺ) گۆت: دو زەلامان گۆتە من ئەو د حەجا خاترخواستنێدا هاتنە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و وی زەكات لێكڤە دكر، ئینا وان ئەو ژێ خواست، پێغەمبەری چاڤ ل مە بلند كر و نزم كر، ئینا ئەم ب هێز دیتین، ئینا گۆت: (ئەگەر هەوە بڤێت دێ دەمە هەوە بەلێ ڤێ زەكاتێ نە زەنگینی بار تێدا هەیە و نە كاسبكارێ ب هێز).**

## ٤ . باب: ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾

## بابەتێ: ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾ چیڕدرێژییێ د خازۆكییێدا د گەل خەلكی ناكەن.

١٧٩٢ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ، تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلكِنِ الْمِسْكِينُ: الَّذِي لاَ يَجِدُ غِنى يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ بِهِ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، وَلا يَقُومُ فَيَسْأَلُ النَّاسَ**) . [خ١٤٧٩ (١٤٧٦)/ م١٠٣٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەلنگازێ راست و دورست نەئەوە یێ دگەریت و قەسپەك و دو قەسپ یان پارییەك دو پاری وی بزڤرینن، بەلێ ب راستی بەلنگازێ راست و دورست و هەژی خێرێ و سەدەقێ ئەوە یێ زەنگینەكی نەبینیت وی بێ منەت كەت، و كەس پێ نەحەسییێت ژی سەدەقێ بدەتێ، و ئەو ژی نارابیت ژ خەلكی بخوازیت).**

١٧٩٣ – عَن عبدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ سَأَلَ وَلَهُ أَرْبَعُونَ دِرْهَماً، فَهُوَ الْمُلْحِفُ). [ن٢٥٩٣].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ خوازۆكییێ بكەت و وی پێنجی دەرهەم هەبن ئەو چیڕدرێژە د خوازۆكییێدا).**

## ٥ . باب: من أعطي من غير مسألة

## بابەتێ: یێ بێ خواستن تشتەك بگەهیتێ

١٧٩٤ – عَنْ خَالِدِ بْنِ عَدِيٍّ الْجُهَنِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (مَنْ بَلَغَهُ مَعْرُوفٌ عَنْ أَخِيهِ مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ، وَلاَ إِشْرَافِ نَفْسٍ؛ فَلْيَقْبَلْهُ وَلاَ يَرُدَّهُ، فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ سَاقَهُ اللهُ عزّ وجل إِلَيْهِ). [حم١٧٩٣٦].

* إسناده صحيح.

**ژ خالدێ كوڕێ عەدییێ جوهەنی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (هەر كەسێ خێرەك ژ برایێ وی بۆ هات بێی خواستن و نە دلێ وی ل سەر و دچیتێ وەرگریت و نەدزڤرینیت ئەو رزقەكە خودایێ هەر ب هێز و مەزن بۆ هنارتی).**

١٧٩٥ - عنْ قبيْصة بْن ذُؤيْب: أنّ عُمر بْن الخطّاب أعْطى ابْن السّعْديّ ألْف دينار، فأبى أنْ يقْبلها وقال: أنا عنها غنيٌّ، فقال لهُ عُمرُ: إنّي قائلٌ لك ما قال لي رسُولُ الله (ﷺ): **(إذا ساق اللهُ إليْك رزْقاً منْ غيْر مسْألة ولا إشْراف نفْس؛ فخُذْهُ، فإنّ الله أعْطاكهُ).**　　　　[حب٣٤٠٣].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

[وانظر: ١٧٤٥].

**ژ قەبیسەیێ كوڕێ زوئەیبی (رضي الله عنه) عومەرێ كوڕێ خەتتابی هزار دینار دانە كوڕێ سەعدی، نەڤیا وەرگریت و گۆتێ: من منەت پێ نینە، ئینا عومەری گۆتێ: ئەز دێ وێ بێژمە تە یا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتییە من (ئەگەر خودێ رزقەك بۆ تە هنارت، نە ژ داخوازكرنێ و نە دلێ تە ل سەرە و نە دچیتێ وەرگرە ئەو خودێ دا تە).**



## الفصل الخامس: احكام الصدقة بالنسبة لآل النَّبِيِّ (ﷺ).

## پشكا پێنجێ: فەرمانێت زەكاتێ و سەدەقەیێ بۆ مالا پێغەمبەری (ﷺ).

### ١ . باب: إذا تحولت الصدقة

### بابەتێ: ئەگەر سەدەقە هاتە گوهرین

١٧٩٦ – (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أُتِيَ بِلَحْمٍ، تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: (**هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ لَنَا هَدِيَّةٌ**). [خ١٤٩٥/ م١٠٧٤].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: هندەك گۆشتێ خێرێ بۆ بەریرەیێ هاتبوو، وێ ژی بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا، گۆت: (ئەو بۆ وێ سەدەقەیە و بۆ مە دیارییە).**

### ٢ . باب: تحريم الصدقة على النبي (ﷺ) وآله.

### بابەتێ: حەرامییا زەكاتێ ل سەر پێغەمبەری (ﷺ) و مالا وی.

١٧٩٧ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: أَخَذَ الحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ رضي الله عنهما تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (كِخْ كِخْ) . لِيَطْرَحَهَا، ثُمَّ قَالَ: (أَمَا شَعَرْتَ أَنَّا لاَ نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ) . [خ١٤٩١ (١٤٨٥)/ م١٠٦٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: حەسەنێ كوڕێ عەلی خودێ ژ هەدووان رازی بیت قەسپەك ژ قەسپێت زەكاتێ راكر و كرە دەڤێ خۆ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كخ كخ)، دا باڤێژیت، پاشی گۆت: (ما تە نەزانییە ئەم زەكاتێ ناخۆین).**

١٧٩٨ – (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ (ﷺ) بِتَمْرَةٍ فِي الطَّرِيقِ، قَالَ: (**لَوْلاَ أَنِّي أَخاف أَن تكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لأَكَلْتُهَا**). [خ٢٤٣١ (٢٠٥٥)/ م١٠٧١].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كەتەكا قەسپێ د رێكێدا دیت ئینا گۆت: (هەكە ئەز نەترسیابامە كو ئەڤە ژ زەكاتێ بیت دا خۆم).**

١٧٩٩ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ سَأَلَ عَنْهُ: (أَهَدِيَّةٌ أَمْ صَدَقَةٌ) ؟ فَإِنْ قِيلَ صَدَقَةٌ، قالَ لأَصْحَابِهِ: (كلُوا) ، وَلَمْ يَأْكُلْ، وَإِنْ قِيلَ هَدِيَّةٌ، ضَرَبَ بِيَدِهِ (ﷺ) فَأَكَل مَعَهُمْ. [خ٢٥٧٦/ م١٠٧٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر خوارنەك بۆ هاتبا پرسیار ژێ دكر (ئەرێ دیارییە یان سەدەقەیە)؟ ئەگەر گۆتبایێ سەدەقەیە، دگۆتە**

**هەڤالێت خۆ: (بخۆن)** و وی نەدخوار، و ئەگەر گۆتبایێ دیارییە دەستێ خۆ دكێشایێ و د گەل وان دخوار.

**٣ ـ باب: لا يستعمل آل النبي (ﷺ) على الصدقة.**

**بابەتێ: مالا پێغەمبەری (ﷺ) ناهێنە ب كارئینان بۆ كۆمكرنا زەكاتێ.**

١٨٠٠ - عَنْ أَبِي رَافِعٍ مولى النبي (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) بَعَثَ رَجُلاً عَلَى الصَّدَقَةِ مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ، فَقَالَ لِأَبِي رَافِعٍ: اصْحَبْنِي، فَإِنَّكَ تُصِيبُ مِنْهَا، قَالَ: حَتَّى آتِيَ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَسْأَلَهُ، فَأَتَاهُ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: (مَوْلَى الْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، وَإِنَّا لاَ تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ) .[د١٦٥٠/ ت٦٥٧/ ن٢٦١١]

* صحيح. *

**ژ ئەبی رافعی ئازاكرییێ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) زەلامەك ژ بەنی مەخزووم بۆ وەرگرتنا زەكاتێ هنارت، ئینا گۆتە ئەبی رافعی د گەل من وەرە دێ ژێ گەهیتە تە ژی، گۆت: هەتا دچمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و پرسیارێ ژێ بكەم، ئینا هاتە دەڤ و پرسیار ژێ كر، ئینا گۆت: (ئازاكرییێ هندەكان ژ وانە و ب راستی زەكات بۆ مە نەدورستە).**



## الفصل الأول: صيام رمضان

## پشکا ئێکێ: رۆژییا رەمەزانێ

### ١ . باب: فرض الصيام وفضله.

### بابەتێ: فەرزبوونا رۆژییێ و بهایێ وێ.

[انظر في فرض الصيام: ١، ٤٩، ٥٨٧-٥٨٩]

١٨٠١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**قَالَ اللهُ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلاَّ الصِّيَامَ، فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ ، وَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَصْخَبْ ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ. لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا: إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ، وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ**). [خ١٩٠٤ (١٨٩٤)/ م١١٥١].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودایێ مەزن و ب هێز گۆت: هەمی کار و کریارێت کورێ ئادەمی بۆ وینە رۆژی نەبیت، ب راستی ئەو بۆ منە و ئەز دێ خەلاتێ وێ دەم، و رۆژی پەرجانە (ژ ئاگری و گونەهان) ڤێجا هەکە رۆژا رۆژییا ئێکی ژ هەوە بیت، بلا ئاخفتنێت کرێت نەبێژیت و دەنگێ خۆ بلند نەکەت، و هەکە ئێکی خەبەر گۆتنێ یان شەرێ وی کر بلا بێژیتێ: ئەز یێ ب رۆژیمە. ئەز ب وی کەمە یێ جانێ موحەممەدی ددەستیدا، گوهۆرینا بێهنا دەڤێ وی ل دەڤ خودێ ژ بێهنا مسکێ خۆشترە. رۆژیگری دو کەیف یێت هەین بۆ دلخۆش دبیت: دەمێ ڤتارە کر کەیفا وی هات و ئەگەر گەهشتە خودایێ خۆ کەیفا وی ب رۆژییا وی هات)**.

١٨٠٢ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ فِي الجَنَّةِ بَاباً يُقَالُ** لَهُ: الرَّيَّانُ، يَدْخُلُ مِنْهُ الصَّائِمُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، يُقَالُ: أَيْنَ الصَّائِمُونَ، فَيَقُومُونَ لاَ يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، فَإِذَا دَخَلُوا أُغْلِقَ، فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أَحَدٌ).[خ١٨٩٦/ م١١٥٢].

ژ سەهلێ کورێ سەعدی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی ل بەحەشتێ دەرگەهەکێ هەی: دبێژنێ رەیان، رۆژا قیامەتێ رۆژیگر دێ تێرا چنە ژۆر و ژ بلی وان کەسێ دی تێرا ناچیت، دێ بێژیت: کانێنە رۆژیگر؟ دێ رابن کەسێ دی ژ بلی وان تێرا ناچیت، ڤێجا هەکە ب ژۆر کەفتن دێ هێتە گرتن: و کەس تێرا ناچیت)**.

١٨٠٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ). [خ٣٨ (٣٥)/ م٧٦٠].

ژ ئەبی هورەیره (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ ژ باوەری و ب هیڤییا خێرێ رەمەزانێ بگریت گونەهێت وی یێت بۆرین هاتنە ژێبرن).**

١٨٠٤ - وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَتَاكُمْ رَمَضَانُ شَهْرٌ مُبَارَكٌ، فَرَضَ اللهُ عزّ وجل عَلَيْكُمْ صِيَامَهُ، تُفْتَحُ فِيهِ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَتُغْلَقُ فِيهِ أَبْوَابُ الْجَحِيمِ، وَتُغَلُّ فِيهِ مَرَدَةُ الشَّيَاطِينِ ، لِلَّهِ فِيهِ لَيْلَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ، مَنْ حُرِمَ خَيْرَهَا فَقَدْ حُرِمَ). [ن٢١٠٥].

* صحيح.

ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(رەمەزان هەیڤا پڕ خێر و پیرۆز بۆ هەوە هات، خودایێ هەر ب هێز و مەزن رۆژیگرتنا ڤێ هەیڤێ ل سەر هەوە فەرز كرییە، دەرگەهێت عەسمانان تێدا دهێنە ڤەكرن، و دەرگەهێت جەهنەمێ تێدا دهێنە گرتن، و خرابكارێت شەیتانان تێدا دهێنە گرێدان، خودێ شەڤەكا تێدا هەی ژ هزار هەیڤان ب خێرترە، هەر كەسێ ژ خێرا ڤێ شەڤێ زڕبار بوو ئەوە یێ زڕبار ژ خێرێ).**

١٨٠٥ - وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ، فَلاَ يَرْفُثْ يَوْمَئِذٍ وَلاَ يَصْخَبْ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ، أَوْ قَاتَلَهُ أَحَدٌ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ) . [حم٢٦٠٦٩].

* اسناده صحيح على شرط الشيخين.

ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەكە ئێك ژ هەوە یێ ب رۆژی بیت، بلا ئاخفتنێت كرێت نەبێژیت و قەرەبالغێ نەكەت، و هەكێ ئێكی خەبەر گۆتنێ یان شەڕێ وی كر بلا بێژیتێ: ئەز مرۆڤەكێ ب رۆژیمە).**

## ٢ . باب: فضل شهر رمضان.

## بابەتێ: بهایێ هەیڤا رەمەزانێ.

١٨٠٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ).[خ٣٢٧٧ (١٨٩٨)/ م١٠٧٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر رەمەزان هات دەرگەهێت بەحەشتێ هاتنە ڤەكرن، و دەرگەهێت جەهنەمێ هاتنە گرتن، و شەیتان هاتنە زنجیركرن).**

١٨٠٧ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وَكَانَ جِبْرِيلُ عليه السلام يَلْقَاهُ كُلَّ لَيْلَةٍ فِي رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ، يَعْرِضُ عَلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ) الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عليه السلام كَانَ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ المُرْسَلَةِ. [خ١٩٠٢ (٦)/ م٢٣٠٨].

**ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ هەمی خەلكی مەردتر بوو، و مەردتر بوو د رەمەزانێدا دەمێ دگەهشتە جبریلی، و جبریل هەمی شەڤان ژ رەمەزانێ دگەهشتێ قورئان د گەل دخواند، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ جبریل دگەهشتێ مەردتر بوو ژ بایێ هورِ[1].**

١٨٠٨ - عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(احْضُرُوا المِنْبَرَ)** ، فَحَضَرْنَا، فَلَمَّا ارْتَقَى دَرَجَةً قَالَ: **(آمِينْ)** ، فَلَمَّا ارْتَقَى الدَّرَجَةَ الثَّانِيَةَ قَالَ: **(آمِينْ)** ، فَلَمَّا ارْتَقَى الدَّرَجَةَ الثَّالِثَةَ قَالَ: **(آمِينْ)** .

فَلَمَّا نَزَلَ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَقَدْ سَمِعْنَا مِنْكَ اليَوْمَ شَيْئاً مَا كُنَّا نَسْمَعُهُ! قَالَ: **(إِنَّ جِبْرِيلَ (ﷺ) عَرَضَ لِيْ فَقَالَ: بُعْداً لِمَنْ أَدْرَكَ رَمَضَانَ فَلَمْ يُغْفَرْ لَهُ، قُلْتُ: آمِيْن، فَلَمَّا رَقِيْتُ الثَّانِيَةَ قَالَ: بُعْداً لِمَنْ ذُكِرْتَ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْكَ، قُلْتُ: آمِيْن، فَلَمَّا رَقِيْتُ الثَّالِثَةَ قَالَ: بُعْداً لِمَنْ أَدْرَكَ أَبَوَاهُ الكِبَرُ عِنْدَهُ أَوْ أَحَدُهُمَا فَلَمْ يُدْخِلاَهُ الجَنَّةَ، قُلْتُ: آمِيْن)**. [ك٧٢٥٦].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ كەعبێ كورێ عوجرەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (وەرنە دەڤ مینبەرێ) ئەم هاتین، ڤێجا دەمێ پەیسكەكێ سەركەفتی گۆت: (ئەی خودا قەبویل بكە) و دەمێ پەیسكا دووێ سەركەفتی گۆت: (ئەی خودا قەبویل بكە) و دەمێ پەیسكا**

---

(١) ئانكو: هندی یێ ب لەز بوو د مەردینیێدا.

**سێیێ سەرکەفتی گۆت: (ئەی خودا قەبویل بکە)، ڤێجا دەمێ هاتییە خوار مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ مە ئەڤرۆ تشتەك ژ تە گوه لێ بوو بەری نوکە مە ژ تە گوه لێ نەبوویە! گۆت: ب راستی جبریلی خۆ بۆ من ئاشکرا کر و گۆت: دویراتی بۆ وی کەسی بیت یێ بگەهیتە رەمەزانێ و گونەهێت وی نەهێنە ژێبرن، من گۆت: (ئەی خودا قەبویل بکە) و دەمێ ئەز ل یا دوویێ سەرکەفتیم گۆت: دویری بۆ وی کەسی بیت یێ ناڤێ تە ل دەڤ بهێت و سەلەواتا نەدەتە سەر تە، من گۆت: (ئەی خودا قەبویل بکە) و دەمێ ئەز ل یا سێیێ سەرکەفتیم گۆت: دویری بۆ وی کەسی بیت یێ بگەهیتە دایبابێت خۆ دەمێ ئەو پیر یان ئێك ژ وان و ئەو وی نەبەنە بەحەشتێ، من گۆت: (ئەی خودا قەبویل بکە).**

٣ . باب: (صوموا لرؤيته وأفطروا لرؤيته).

**بابەتێ: ب دیتنا هەیڤێ ب رۆژی بن و ب دیتنا وێ بخۆن و بکەنە جەژن.**

١٨٠٩ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ) . [خ١٩٠٠/ م١٠٨٠]

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ئەگەر هەوە هەیڤا رەمەزانێ دیت ب رۆژی بن و ئەگەر هەوە هەیڤا شەعبانێ دیت بخۆن (بکەنە جەژن) و ئەگە عەور کەفتە د ناڤبەرا دیتنا هەوەدا هەیڤا رەمەزانێ تمام کەن و بکەنە سیه رۆژ).**

١٨١٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) . أَوْ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ) .: (صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُبِّيَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلاثِينَ). [خ١٩٠٩/ م١٠٨١].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب رۆژی بن هەکە هەوە هەیڤا رەمەزانێ دیت و بخۆن هەکە هەوە هەیڤا شەوالێ دیت و هەکە عەور کەفتە مابەینا هەوە و دیتنا هەیڤا رەمەزانێ شەعبانێ بکەنە سیه).**

١٨١١ - عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَمَا صُمْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) تِسْعاً وَعِشْرِينَ، أَكْثَرُ مِمَّا صُمْنَا مَعَهُ ثَلاثِينَ. [د٢٣٢٢/ ت٦٨٩].

* صحيح.

**ژ ئبن مەسعودی (ﷺ) گۆت: بەهرا پتر مە رۆژی د گەل پێغەمبەری (ﷺ) گرتین بیست و نەهـ بوون، و كێم جاران مە سیهـ گرتینە.**

١٨١٢ - عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: اخْتَلَفَ النَّاسُ فِي آخِرِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ، فَقَدِمَ أَعْرَابِيَّانِ، فَشَهِدَا عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِاللهِ: لَأَهَلاَّ الْهِلاَلَ أَمْسِ عَشِيَّةً، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) النَّاسَ أَنْ يُفْطِرُوا. زَادَ خَلَفٌ فِي حَدِيثِهِ: وَأَنْ يَغْدُوا إِلَى مُصَلاَّهُمْ. [د٢٣٣٩].

* صحيح.

**ژ ریبعییێ كوڕێ حیراشی (ﷺ)، ژ زەلامەكی ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: خەلك د رۆژا دویماهییا هەیڤا رەمەزانیدا جوداهی كەفتن، دو كۆچەرە عەرەب هاتن و شاهدەیی ب خودێ ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) دا: كو وان دوهی ئێڤاری هەیف یا دیتی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان ل خەلكی كر رۆژییا خۆ بخۆن و خەلەفی ئەڤە د فەرموودەیێدا زێدە كریە: و سوبەهی سپێدێ بچنە نڤێژگەها خۆ.**

## ٤ . باب: لكل بلد رؤية.

### بابەتێ: هەر وەلاتەكی دیتنا خۆ یا هەی.

١٨١٣ - (م) عَنْ كُرَيْبٍ: أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ بَعَثَتْهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ بِالشَّامِ، قَالَ: فَقَدِمْتُ الشَّامَ فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا، وَاسْتُهِلَّ عَلَيَّ رَمَضَانُ وَأَنَا بِالشَّامِ، فَرَأَيْتُ الْهِلاَلَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي آخِرِ الشَّهْرِ، فَسَأَلَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، ثُمَّ ذَكَرَ الْهِلاَلَ، فَقَالَ: مَتَى رَأَيْتُمُ الْهِلاَلَ؟ فَقُلْتُ: رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: أَنْتَ رَأَيْتَهُ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، وَرَآهُ النَّاسُ، وَصَامُوا وَصَامَ مُعَاوِيَةُ. فَقَالَ: لَكِنَّا رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ، فَلاَ نَزَالُ نَصُومُ حَتَّى نُكْمِلَ ثَلاَثِينَ، أَو نَرَاهُ. فَقُلْتُ: أَوَ لاَ تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ؟ فَقَالَ: لاَ، هَكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) [م١٠٨٧]

**ژ كورەیبی (ﷺ) گۆت: ئوم فەزلی كچا حارسی ئەو هنارتە دەڤ موعاوییەی ل شامێ، گۆت: ئەز هاتمە شامێ من هەوجەییا وێ قەتاند، و رەمەزان ل شامێ ل من بوو، و من شەڤا خوتبە هەیف دیت، پاشی دویماهییا هەیڤێ ئەز هاتمە مەدینەیێ، عەبدوللایێ**

**کورێ عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) پرسیار ژ من کر، پاشی بەحسێ هەیڤێ کر، ئینا گۆت: هەوە کەنگی هەیڤ دیت؟ من گۆتێ: مە شەڤا خوتبە دیت، ئینا گۆت: تە ب خۆ دیت؟ من گۆت: بەلێ، و خەلکی ژی دیت، و رۆژی گرتن، و موعاوییەی ژی رۆژی گرت، ئینا گۆت: بەلێ پا مە شەڤا شەمبی یا دیتی، و ئەم بەردەوام دێ ب رۆژی بین هەتا ئەم سیه رۆژا تمام دکەین یان هەیڤێ ببینین، من گۆت: ما رۆژیگرتنا موعاوییەی و دیتنا وی بەسی تە نینە؟ ئینا گۆت: نەخێر هۆسا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا مە یا کری.**

**٥ . باب: شهرا عيدٍ لا ينقصان**

**بابەتێ: دو هەیڤێت جەژنێ کێم نابن.**

١٨١٤ - . (ق) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**شَهْرَانِ لاَ يَنْقُصَانِ، شَهْرَا عِيدٍ**: رَمَضَانُ، وَذُو الحِجَّةِ). [خ١٩١٢/ م١٠٨٩].

ژ ئەبی بەکرەیی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(دو هەیڤ کێم ناکەن، هەردو هەیڤێت جەژنێ: رەمەزان و زیلحیججە)**[1].

**٦ . باب: بدء الصوم من الفجر.**

**بابەتێ: دەستپێکرنا رۆژیگرتنێ ژ هاتنا سپێدێیە.**

١٨١٥ - (ق) عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ﴾[البقرة:١٨٧] عَمَدْتُ إِلَى عِقَالٍ أَسْوَدَ وَإِلَى عِقَالٍ أَبْيَضَ، فَجَعَلْتُهُمَا تَحْتَ وِسَادَتِي، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ فِي اللَّيْلِ فَلاَ يَسْتَبِينُ لِي، فَغَدَوْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَذَكَرْتُ لَهُ ذلِكَ، فَقَالَ: (**إِنَّمَا ذلِكَ سَوَادُ اللَّيْلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ**) . [خ١٩١٦/ م١٠٩٠].

**ژ عەدییێ کورێ حاتەمی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ئەڤ ئایەتە** ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ﴾ **هاتییە خوارێ، من بەندکەکێ سپی و ئێکێ رەش ئینان و دانانە بن بالیفکا خۆ، ڤێجا من ب شەڤێ بەرێ خۆ ددایێ بەلێ بۆ من دیار نەبوون، سپێدێ ئەز چۆمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و من ئەو بەحس بۆ کر، ئینا گۆت: (ئەو رەشاتییا شەڤێیە و سپیاتییا رۆژێیە).**

---

(١) نانکو: خێرا وان ئێکە چ بیست و نەه رۆژ بن یان سیه رۆژن بن، و خێرا وان کێم نابیت.

١٨١٦ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: **(إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ)**. [خ٦٢٢/ م١٠٩٢].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) ژ پێغەمبەری (ﷺ) وی گۆت: (ب ڕاستی بیلال ب شەڤ بانگ ددەت ڤێجا بخۆن و ڤەخۆن هەتا ئیبن ئوم مەكتووم بانگ ددەت).**

**٧ . باب: متى يفطر الصائم.**

**بابەتێ: كەنگی رۆژیگر دێ رۆژییێ خۆت.**

١٨١٧ - (ق) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ مِنْ هَاهُنَا، وَأَدْبَرَ النَّهَارُ مِنْ هَاهُنَا، وَغَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ)** . [خ١٩٥٤/ م١١٠٠].

**ژ عومەرێ كوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر شەڤ ئها ژ ڤێرێ هات، و رۆژ ئها ژ ڤێرێ بۆری و رۆژ ئاڤا بوو، رۆژیگر چۆ د دەمێ رۆژیخوارنێدا).**

**٨ . باب: استحباب السحور وتأخيره.**

**بابەتێ: باشدانانا پاشیڤێ و گیرۆكرنا وێ.**

١٨١٨ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(تَسَحَّرُوا، فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً)** . [خ١٩٢٣/ م١٠٩٥].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پاشیڤێ بخۆن، ب راستی بەرەكەتا د خوارنا پاشیڤێدا هەی).**

١٨١٩ - (خ) عَنْ سهلِ بنِ سعدٍ قال: كُنْتُ أَتَسَحَّرُ فِي أَهْلِي، ثُمَّ يَكُونُ سُرْعَةٌ بِي أَنْ أُدْرِكَ صَلاَةَ الْفَجْرِ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [خ٥٧٧].

**ژ سەهلێ كوڕێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: من پاشیڤ د گەل مالا خۆ دخوار پاشی من لەز دكر بگەهمە نڤێژا سپێدێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ).**

١٨٢٠ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّا مَعْشَرَ الأَنْبِيَاءِ أُمِرْنَا أَنْ نُؤَخِّرَ سُحُورَنَا وَنُعَجِّلَ فِطْرَنَا، وَأَنْ نُمْسِكَ بِأَيْمَانِنَا عَلَى شَمَائِلِنا فِي صَلاتِنَا)**. [حب١٧٧٠].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

ژ ئيبن عەباسى (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەم دەستەيا پێغەمبەران فەرمانا ل مە هاتييە كرن پاشيڤا خۆ گيرۆ بكەين و لەزێ ل فتارا خۆ بكەين و ئەم د نڤێژێت خۆدا ب دەستێت خۆ يێت راستێ دەستێت خۆ يێت چەپێ بگرين).**

**٩ . باب: استحباب تعجيل الفطر.**

**بابەتێ: باشدانانا لەزكرنێ د فتارێدا.**

١٨٢١ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ)** . [خ١٩٥٧/ م١٠٩٨].

ژ سەهلێ كورێ سەعدى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خەلك دێ هەر د خێرێدا بيت هندى ئەو لەزێ ل فتارێ بكەن).**

١٨٢٢ - وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لا تَزَالُ أُمَّتِي عَلَى سُنَّتِي مَا لَمْ تَنْتَظِرْ بِفِطْرِهَا النُّجُومَ)** . قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا كَانَ صَائِماً، أَمَرَ رَجُلاً فَأَوْفَى عَلَى شَيْءٍ، فَإِذَا قَالَ: غَابَتِ الشَّمْسُ، أَفْطَرَ. [مه٢٠٦١/حب٣٥١٠/ك١٥٨٤]

* إسناده صحيح.

و ژ وى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئوممەتا من دێ ل سەر رێكا من مينيت هندى ئەو د فتارەكرنا خۆدا خۆ ل ستێرا نەگريت)** و گۆت: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر يێ ب رۆژى با دا فەرمانا زەلامەكى كەت ل سەر تشتەكى بەرێ خۆ بدەتە رۆژێ، ڤێجا ئەگەر گۆتبا: رۆژ ئاڤا بوو فتارە دكر.

**١٠ . باب: من أكل ناسياً.**

**بابەتێ: يێ ژ بيكرن تشتەكى بخۆت.**

١٨٢٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ أَكَلَ نَاسِياً . وَهُوَ صَائِم . فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ)** . [خ٦٦٦٩ (١٩٣٣)/ م١١٥٥].

ژ ئەبى هورەيرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەكە ئێكى ژ هەوە ژبير كر خوار (يان ڤەخوار)، بلا رۆژيا خۆ تمام كەت، ب راستى ئەو خودێ خوارن و ڤەخوارن دايێ).**

١٨٢٤ - وعَنْه: أَنَّ النَّبِي (ﷺ) قَالَ: **(مَن أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ نَاسِياً فَلاَ قَضَاءَ عَلَيْهِ، وَلاَ كَفَّارَةَ)** .
[مه١٩٩٠/حب٣٥٢١/ك١٥٦٩]

* إسناده حسن.

و ژ وی (رضي الله عنه) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ ژبیر كر رۆژی خوار نە ڤەزاكرن ل سەرە و نە كەفارەت).**

## ١١ . باب: لا يُتقدم رمضان بصوم.

## بابەتێ: رۆژیگرتن پێش رەمەزانێ ناكەڤیت.

١٨٢٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ يَتَقَدَّمَنَّ أَحَدُكُمْ رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ؛ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمَهُ، فَلْيَصُمْ ذلِكَ الْيَوْمَ)**.[خ١٩١٤/ م١٠٨٢].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(كەس ژ هەوە پێش رەمەزانێ نەكەڤیت ب رۆژیا رۆژەكێ یان دو رۆژان، ئەو نەبیت مرۆڤەك بیت رۆژیا خۆ بگریت، بلا وێ رۆژێ بگریت).**

## ١٢ . باب: النهي عن الوصال

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا گەهاندنا ئێك د رۆژیێدا[1].

١٨٢٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ الْوِصَالِ فِي الصَّوْمِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: إِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(وَأَيُّكُمْ مِثْلِي! إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ)**. فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ، وَاصَلَ بِهِمْ يَوْماً، ثُمَّ يَوْماً، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلاَلَ، فَقَالَ: **(لَوْ تَأَخَّرَ لَزِدْتُكُمْ)** . كَالتَّنْكِيلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوا أَنْ يَنْتَهُوا.[خ١٩٦٥/ م١١٠٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان ل بەردەوامی پێدانا رۆژیێ كر. ئینا زەلامەكی ژ موسلمانان گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بەلێ تو بەردەوامییێ ب رۆژیێ ددەی: گۆت: (ما كی ژ هەوە وەكی منە، شەڤ ل من دبیت خودایێ من هێزا خوارنێ و ڤەخوارنێ ددەتە من)، ڤێجا دەمێ وان نەڤیای ئەو دەستبەردانێ ژ بەردەوامیدانا رۆژیێ بدەن، بەردەوامی ب وان دا كرن رۆژەكێ پاشی رۆژەكا دی پاشی هەیڤا ئێك شەڤی یا هەیڤا دی دیت ئینا گۆت: ( ئەگەر هەیف گیرۆ ببا**

---

(١) ئانكو: دو رۆژان یان پتر سەرێك ب رۆژی بیت و د ناڤبەرا واندا نە ب خۆت نە ڤەخۆت.

دا ل سەر هەوە زێدەكەم) وەك سزادانەك بۆ وان دەمێ نەڤیاین بەردەوامبوونێ د رۆژیگرتنێدا بهێلن.

## ١٣ . باب: الوصال إلى السحر

**بابەتێ: گەهاندنا رۆژییێ هەتا پاشیڤێ.**

١٨٢٧ - (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(لا تُوَاصِلُوا، فَأَيُّكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُوَاصِلَ؛ فَلْيُوَاصِلْ حَتَّى السَّحَرِ)** . قَالوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إِنِّي أَبِيتُ لِي مُطْعِمٌ يُطْعِمُنِي وَسَاقٍ يَسْقِينِ)** . [خ١٩٦٣].

ژ ئەبی سەعیدی (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: **(رۆژییێ نەگەهینە رۆژییێ، و ئەگەر ئێكی ژ هەوە ڤیا بەردەوامییێ بدەتێ بلا بەردەوام بیت هەتا پاشیڤێ)** گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بەلێ تو بەردەوامییێ ددەییێ! گۆت: **(ئەز نەوەكی هەوەمە ئەز دنڤم و من ئێك یێ هەی خوارنێ ددەتە من و ئاڤێ ژی ددەتە من)**.

## ١٤ . باب: المباشرة والقبلة للصائم.

**بابەتێ: دەستكرن و ماچیكرن بۆ رۆژیگری.**

١٨٢٨ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُقَبِّلُ وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ. [خ١٩٢٧/ م١١٠٦].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ماچی دكر و دەست دكر و ئەو یێ ب رۆژی و ئەو ل سەر هەوجیییا خۆ ژ هەوە هەمیان ب هێزتر بوو[1].**

١٨٢٩ - عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: هَشَشْتُ فَقَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! صَنَعْتُ الْيَوْمَ أَمْراً عَظِيماً، قَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ، قَالَ: **(أَرَأَيْتَ لَوْ مَضْمَضْتَ مِنَ الْمَاءِ وَأَنْتَ صَائِمٌ)**؟ قُلْتُ: لاَ بَأْسَ، قَالَ: **(فَمَهْ)**. [د٢٣٨٥/ مي١٧٦٥].

* صحيح.

**ژ عومەرێ كورێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز سڤك و چالاك و گەرم بووم، من ماچی كر و ئەز یێ ب رۆژی بووم، ئینا من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من ئەڤرۆ**

---

(١) هەوجەییا خۆ ئانكو: نڤینا خۆ و پتر ژ هەوە دشیا خۆ و خۆ ڤەگریت، لەوا زانا دبێژن: دڤێت رۆژیگر خۆ ژ ماچیكرن و دەستكرنێ دویر بگریت، چونكی یێ ژ خۆ پشتراست نینە نەكەڤیتە د خوازییا خۆدا و كەس ژ مە وەكی پێغەمبەری (ﷺ) نینە.

**تشتەكێ مەزن كر، من ماچی كر و ئەز یێ ب رۆژی بووم؟ گۆت: (بێژە من ئەگەر تو یێ ب رۆژی بی و ئاڤێ د دەڤێ خۆ وەردەی) من گۆت: چو نینە، گۆت: (پا ڤێجا بۆچی ل دەڤ تە یا مەزنە).**

## ١٥ . باب: الصائم يصبح جنباً.

**بابەتێ: ئەگەر سپێدە ل رۆژیگری ببیت و ئەو یێ ب جەنابەت.**

١٨٣٠ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ جُنباً فِي رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ حُلْمٍ، فَيَغْتَسِلُ وَيَصُومُ. [خ١٩٣٠ (١٩٢٥)/ م١١٠٩].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: د رەمەزانێدا ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دبوو سپێدە و ئەو یێ ب جەنابەت نەكو خەون دیتی، سەرێ خۆ دشویشت و ب رۆژی دبوو.**

## ١٦ . باب: إذا جامع في رمضان أو أفطر لغير علة

**بابەتێ: ئەگەر د رەمەزانێدا چۆ نڤینا خۆ یان رۆژییا خۆ بێی ئەگەرەك خوار.**

١٨٣١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ هَلَكْتُ! قَالَ: (**مَا لَكَ**) ؟ قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي وَأَنَا صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**هَلْ تَجِدُ رَقَبَةً تُعْتِقُهَا**)؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: (**فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ**) ؟ قَالَ: لاَ. فَقَالَ: (**فَهَلْ تَجِدُ إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِيناً**) ؟ قَالَ: لا. قَالَ: فَمَكَثَ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَلِكَ أُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ . وَالْعَرَقُ الْمِكْتَلُ . قَالَ: (**أَيْنَ السَّائِلُ**) ؟ فَقَالَ: أَنَا. قَالَ: (**خُذْ هذَا فَتَصَدَّقْ بِهِ**) ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَعَلَى أَفْقَرَ مِنِّي يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَوَاللهِ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا . يُرِيدُ: الحَرَّتَيْنِ . أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي. فَضَحِكَ النَّبِيُّ (ﷺ) حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: (**أَطْعِمْهُ أَهْلَكَ**).

[خ١٩٣٦/ م١١١١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: د دەمەكیدا ئەم ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) د روینشتی بووین، من هند دیت زەلامەك هاتە دەڤ، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز تێچۆم! گۆت: (تە چییە)؟ گۆت: ئەز چۆمە دەڤ ژنا خۆ و ئەز یێ ب رۆژی: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تە بەندەیەك هەیە ئازا بكەی)؟ گۆت: نەخێر، گۆت: (پا تو دشێی دو هەیڤان ل سەرێك ب رۆژی بی)؟ گۆت: نەخێر، ئینا گۆت: (تە هەیە خوارنێ بدەیە شێست بەلنگازان)؟ گۆت: نەخێر، گۆت: پێغەمبەر ما و ئەم د وەسا بووین سەلكەك**

**قەسپ تێدا بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هات، گۆت: (كا ئەو پرسیاركەر)؟ ئینا گۆت: ئەزم، گۆت: (ئەڤێ ببە بكە خێر) ئینا زەلامی گۆت، ئەی پێغەمبەرێ خودێ بدەمە ئێكی ژ خۆ هەژارتر؟! ئەز ب خودێ كەمە د ناڤبەرا هەردو لاییێت وێدا خەلكێ مالەكێ ژ خەلكێ مالا من هەژارتر نینە، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) پێ كەنی هەتا ددانێت بەرێ دەڤێ وی دەركەفتین، پاشی گۆت: (هەرە بدە مالا خۆ).**

## ١٧ . باب: الحجامة للصائم.

## بابەتێ: خوینبەردانێ بۆ رۆژیگری.

١٨٣٢ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: احْتَجَمَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَهُوَ صَائِمٌ.[خ١٩٣٩ (١٨٣٥)].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) خوینا خۆ بەردا و ئەو یێ ب رۆژی بوو.**

١٨٣٣ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى: حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ الْحِجَامَةِ وَالْمُوَاصَلَةِ، وَلَمْ يُحَرِّمْهُمَا إِبْقَاءً عَلَى أَصْحَابِهِ، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ تُوَاصِلُ إِلَى السَّحَرِ، فَقَالَ: (**إِنِّي أُوَاصِلُ إِلَى السَّحَرِ، وَرَبِّي يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِي**) . [د٢٣٧٤].

* صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ ئەبی لەیلایی (رحمه الله) گۆت: زەلامەكی ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە من، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان یا كری ژ خوینبەردانێ و بەردەوامیدان ب رۆژییێ هەتا رۆژیا دی و ب دورستی حەرام نەكرینە ژ دلپێڤەبوون ب هەڤالێت خۆ، گۆتنێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو بەردەوامییێ ددەیێ هەتا پاشیڤێ، ئینا گۆت: (ئەز بەردەوامییێ ددەمە رۆژییێ هەتا پاشیڤێ و خودایێ من خوارنێ و ڤەخوارنێ ددەتە من).**

## ١٨ . باب: صوم الصبيان.

## بابەتێ: رۆژیگرتنا بچویكان.

١٨٣٤ - (ق) عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قَالَتْ: أَرْسَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الأَنْصَارِ: (**مَنْ أَصْبَحَ مُفْطِراً فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ أَصْبَحَ صَائِماً فَلْيَصُمْ**) . قَالَتْ: فَكُنَّا نَصُومُهُ بَعْدُ، وَنُصَوِّمُ

صِبْيَانَنَا، وَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطَّعَامِ أَعْطَيْنَاه ذَاكَ حَتَّى يَكُون عِنْدَ لإِفْطَارِ. [خ١٩٦٠/ م١١٣٦].

**ژ رەبیعەیا کچا موعەوزی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سپێدەیا عاشوورایێ ئێك هنارتە گوندێت ئەنساران (هەر کەسێ سپێدە لێ بوویە و یێ ب رۆژی نەبوویە بلا ئەوا مایی ژ رۆژا خۆ یێ ب رۆژی بیت، و هەر کەسێ سپێدە لێ بوویە و ئەو یێ ب رۆژی بلا یێ ب رۆژی بیت) گۆت: دویڤرا ئەم ل عاشوورایێ یێت ب رۆژی بوون و مە بچویکێت خۆ ژی ب رۆژی دکرن، و مە بویکێت هریێ بۆ چێ دکرن و ئەگەر ئێك ژ وان بۆ خوارنێ کربا گری مە ئەو ددا ڤێ هەتا دەمێ فتارێ هاتبا.**

**١٩ ـ باب: قضاء رمضان.**

**بابەتێ: قەزاکرنا رەمەزانێ.**

١٨٣٥ - (ق) عَنْ يَحْيى، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها تَقُولُ: كَانَ يَكُونُ عَلَيَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَ إِلاَّ فِي شَعْبَانَ. [خ١٩٥٠/ م١١٤٦].

**ژ یەحیایی (ﷺ) ژ ئەبی سەلەمەیی گۆت: من گوه ل عائیشایێ بوو (ﷺ) د گۆت: رۆژیێت رەمەزانێ ل سەر من بوون و ئەز نەدشیام قەزا بکەم د شەعبانێدا نەبا.**

١٨٣٦ - عَنِ الْقَاسِمِ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ كَانَ عَلَيْهِ قَضَاءُ رَمَضَانَ فَلَمْ يَقْضِهِ، وَهُوَ قَوِيٌّ عَلَى صِيَامِهِ، حَتَّى جَاءَ رَمَضَانُ آخَرُ، فَإِنَّهُ يُطْعِمُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً مُدّاً مِنْ حِنْطَةٍ، وَعَلَيْهِ مَعَ ذَلِكَ الْقَضَاءُ.

وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ.. مِثْلُ ذَلِكَ. [ط٦٨٥].

* إسناده صحيح.

**ژ قاسمی (ﷺ) وی دگۆت: هەر کەسێ قەزایا رەمەزانێ ل سەر بیت و قەزا نەکربیت و ئەو دشیا بگریت هەتا رەمەزانا دی هاتی، ئەو دێ شوینا هەر رۆژەکێ خوارنا بەلنگازەکی دەت مستەکا دەخلی و د گەل ڤێ قەزاکرن یا ل سەر.**

**و ژ سەعیدێ کوڕێ جوبەیری... وەکی ڤێ هاتییە.**

## ٢٠ . باب: من مات وعليه صوم

**بابەتێ: یێ بمریت و رۆژی ل سەر بن.**

١٨٣٧ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ، صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ**). [خ١٩٥٢/ م١١٤٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ مر و رۆژی ل سەر بن بلا مرۆڤێ وی (ج میراتگر بیت یان نە) پێش ویڤە بگریت).**

١٨٣٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا؟ قَالَ: (**نَعَمْ، فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضى**).

[خ١٩٥٣/ م١١٤٨].

**ژ ئیبن عەباس (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی دایكا من مر و رۆژییێت هەیڤەكێ ل سەر بوون، ئەز پێشڤە قەزاكەم؟ گۆت: (بەلێ و دەینێ خودێ هەژیترە بهێتە دان).**

## ٢١ . باب: من أفطر خطأً.

**بابەتێ: یێ ب خەلەتیڤە رۆژی خوار.**

١٨٣٩ - (خ) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ: أَفْطَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) يَوْمَ غَيْمٍ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ. قِيلَ لِهِشَامٍ: فَأُمِرُوا بِالْقَضَاءِ؟ قَالَ: بُدٌّ مِنْ قَضَاءٍ؟. وَقَالَ مَعْمَرٌ: سَمِعْتُ هِشَاماً: لا أَدْرِي أَقْضَوْا أَمْ لاَ. [خ١٩٥٩].

**ژ ئەسمایا كچا ئەبی بەكری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: مە ل سەردەمێ پێغەمبەری (ﷺ) و ل رۆژەكا ب عەور فتارە كر و پاشی رۆژ دەركەفتەڤە، گۆتە هیشامی: ئەرێ فەرمانا وان ب قەزاكرنێ هاتە كرن؟ گۆت: هەر دڤێت قەزا بكەن؟ و مەعمەری گۆت: من گوه ل هیشامی بوو: ئەز نوزانم وان قەزا كر یان نە.**

## ٢٢ . باب: جواز الصوم والفطر للمسافر.

## بابەتێ: رۆژیگرتن و رۆژیخوارن بۆ رێڤینگی دورستە.

١٨٤٠ - (ق) عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِنَ المدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَرَفَعَه إِلى يَدَيْهِ لِيُرِيَهُ النَّاسَ، فَأَفْطَرَ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ.

فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ: قَدْ صَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأَفْطَرَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ.

[خ١٩٤٨ (١٩٤٤)/ م١١١٣].

**ژ تاووسی (رحمه الله) ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ مەدینەیێ بۆ مەکەهێ دەرکەفت و یێ ب رۆژی بوو، هەتا گەهشتییە عوسفانێ، پاشی داخوازا ئاڤێ کر، و بلند کر دا خەلك وی ببینن و هەتا هاتییە مەکەهێ وی رۆژییێت خۆ دخوارن، و ئەڤە د رەمەزانێدا بوو.**

**هەروەکی ئیبن عەباس دبێژیت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژی گرت و خوار یێ بڤێت ب رۆژی ببیت و یێ بڤێت بخۆت.**

١٨٤١ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى المفْطِرِ، وَلاَ المفْطِرُ عَلى الصَّائِمِ. [خ١٩٤٧/ م١١١٨].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: مە وەغەر د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دکر نە رۆژیگری لۆمەی رۆژیخۆری دکر و نە رۆژیخۆری لۆمەی رۆژیگری دکر.**

## ٢٣ . باب: النية في الصيام.

## بابەتێ: ئنیەتێ د رۆژییێدا.

١٨٤٢ - عَنْ حَفْصَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) .: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ لَمْ يُجْمِعْ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ، فَلاَ صِيَامَ لَهُ)** . [د٢٤٥٤/ ت٧٣٠/ ن٢٣٠/ جه١٧٠٠/ مي١٧٤٠],

* صحيح.

**ژ حەفسایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ ژ دل بەری سپێدێ ئنیەتا رۆژییێ نەئینا بیت رۆژی بۆ وی نینە)**[1].

(١) هەلەبەت ئەڤە د راستا رۆژییا فەرزدا نە د یا سونەتدا، بۆ یا سونەت هەتا بەری نیڤرۆ ژی ئنیەت ئینان دورستە.

## ٢٤ . باب: صوم يوم الشك.

**بابەتێ: رۆژییا رۆژا ب گۆمان.**

١٨٤٣ - عَنْ صِلَةَ بْنِ زُفَرَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارٍ فِي الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، فَأُتِيَ بِشَاةٍ، فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ، فَقَالَ عَمَّارٌ: مَنْ صَامَ هَذَا الْيَوْمَ، فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ (ﷺ).[د٢٣٣٤/ ت٦٨٦/ ن٢١٨٧/ جه١٦٤٥/ مي١٧٢٤].

* صحيح.

**ژ سیلەیێ كورێ زوفەری (رضي الله عنه) گۆت: وێ رۆژا گۆمان تێدا[1] كا رەمەزانە یان نە، ئەم ل دەڤ عەمماری بووین، كافرەك بۆ هاتە پێشكێشكرن، ئینا هندەكان خۆ دا پاش، عەمماری گۆت: هەر كەسێ ئەڤرۆ یێ ب رۆژی بیت ب راستی وی نەگوهدارییا بابێ قاسمی كر (ﷺ).**

## ٢٥ . باب: إذا أخطأ القوم الهلال.

**بابەتێ: ئەگەر خەلك د دیتنا هەیڤا ئێك شەڤیدا خەلەت بوون.**

١٨٤٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (وَفِطْرُكُمْ يَوْمَ تُفْطِرُونَ، وَأَضْحَاكُمْ يَوْمَ تُضَحُّونَ، وَكُلُّ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ، وَكُلُّ مِنًى مَنْحَرٌ، وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ مَنْحَرٌ، وَكُلُّ جَمْعٍ مَوْقِفٌ) .

[د٢٣٢٤/ ت٦٩٧/ جه١٦٦٠].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (جەژنا رەمەزانا هەوە ئەو رۆژە یا هوین رۆژییێ تێدا دخۆن، و جەژنا حەجییا یا هەوە ئەوە رۆژە یا هوین قوربانان تێدا ددەن[2]، و هەر جهێ ل عەرەفێ راوەستی دورستە، و ل هەر جهێ مینایێ قوربانی ڤەكوژن دورستە، و هەمی رێكێت بەرفرەه یێت مەكەهێ جهێ ڤەكوشتنێنە، و هەر جهێ موزدەلیفەیێ لێ راوەستی دورستە).**

---

(١) رۆژا شكێ رۆژا دویماهییێ یا هەیڤا شەعبانێیە، رۆژا سیهێ و هێژ دیار نەبووی كا ئەو شەعبان (بیست و نەهە) و رۆژا دی رەمەزانە، یان ژی ئەو شەعبان (سیهە) و رۆژا پاشتر ئەرەمەزانە و هەیڤ ب دورستی دیار نەبوویە سوبەهێ رەمەزانە یان نە.

(٢) زانا دبێژن: رامان ئەوە: ئەگەر هوین د هژمارا هەیڤا رەمەزانێدا خەلەت بوون جەژنا هەوە یا دورستە و چو گونەه ل سەر هەوە نینە، و د جەژنا حەجییاندا ئەگەر هوین د دیتنا هەیڤا زیلحیججەدا خەلەت بوون قوربانێ هەوە یێ دورستە گونەه ل سەر هەوە نینە.

**٢٦ . باب: ما يفطر عليه الصائم.**

**بابەتێ: رۆژیگر فتارێ ل سەر چ دكەت.**

١٨٤٥ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُفْطِرُ عَلَى رُطَبَاتٍ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَعَلَى تَمَرَاتٍ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مَاءٍ. [د٢٣٥٦/ ت٦٩٦].

* حسن صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەری نڤێژێ بكەت فتارە ل سەر چەند روتەبان دكر، و هەكە روتەب نەبان ل سەر چەند قەسپەكان، و هەكە قەسپ نەبان چەند فرێ ژ ئاڤێ ڤەدخوارن.**

**٢٧ . باب: ما يقول الصائم عند الإفطار.**

**بابەتێ: ئەوا رۆژیگر ل فتارەكرنێ دبێژیت.**

١٨٤٦ - عَنْ مَرْوَانَ بْنِ سَالِمٍ الْمُقَفَّعِ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ يَقْبِضُ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَيَقْطَعُ مَا زَادَ عَلَى الْكَفِّ، وَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا أَفْطَرَ قَالَ: (**ذَهَبَ الظَّمَأُ، وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ، وَثَبَتَ الْأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللهُ**). [د٢٣٥٧].

* حسن.

**ژ مەروانێ كورێ سالمێ موقەففەعی (رحمه الله) گۆت: من ئیبن عومەر دیت دەستێ خۆ دهاڤێتە ریهێت خۆ و یێت ژ دەستێ وی زێدەبوون دبڕین، و گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر فتارە كربا دگۆت: (تێناتی چۆ و گەه و بار تەڕ بوون و خێر ب ئانەهییا خودێ مسۆگەر بوو).**

**٢٨ . باب: دعاء الصائم لمن يفطر عنده.**

**بابەتێ: دوعایا رۆژیگری بۆ وی یێ فتارێ ل دەڤ دكەت.**

١٨٤٧ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا أَفْطَرَ عِنْدَ أُنَاسٍ قَالَ: (**أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الْأَبْرَارُ، وَتَنَزَّلَتْ عَلَيْكُمُ الْمَلَائِكَةُ**) . [مي١٨١٣].

* إسناده صحيح.

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ڕەزیاڵڵاهو عەنهو) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ئەگەر فتارە ل دەڤ هندە مرۆڤان كربا دگۆت: **(خودێ خێرا وی بدەتە هەوە یێ خوارنێ ددەتە رۆژیگران، و چاك و خۆپارێزكار خوارنا هەوە بخۆن و ملیاكەت بۆ هەوە ل سەر هەوە بهێنە خوارێ).**

**٢٩ ـ باب: ما يقال عند رؤية الهلال**

**بابەتێ: كا دێ چ هێتە گۆتن دەمێ هەیڤ دهێتە دیتن.**

١٨٤٨ - عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا رَأَى الْهِلاَلَ قَالَ: **(اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالْيُمْنِ وَالْإِيمَانِ، وَالسَّلاَمَةِ وَالْإِسْلاَمِ، رَبِّي وَرَبُّكَ اللهُ).**

- وعند الدارمي: **(بِالْأَمْنِ وَالْإِيمَانِ)** . [ت١٣٤٥١/ مي١٧٣٠].

* صحيح.

ژ تەلحەیێ كورێ عوبەیدوللایی (ڕەزیاڵڵاهو عەنهو) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەیڤ ددیت دگۆت: **(یا خودێ ب بەرەكەت و ب باوەرییێ و ب سلامەتی و ب ئیسلامێ هەیڤێ ب سەر مەدا بهەلینە، خودایێ من و خودایێ تە ئێكە، یا خودێ بكە هەیڤا هیدایەت و خێر و بەرەكەتێ).**

- **و ل دەڤ دارەمی: (ب ئێمناهی و ب باوەرییێ).**

**٣٠ ـ باب: من فطّر صائماً.**

**بابەتێ: یێ فتارێ بدەتە رۆژیگرەكی.**

١٨٤٩ - عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ فَطَّرَ صَائِماً كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئاً)** . [ت٨٠٧/ جه١٧٤٦/ مي١٧٤٤].

* صحيح.

ژ زەیدێ كورێ خالدێ جوهەنی (ڕەزیاڵڵاهو عەنهو) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ فتارێ بدەتە رۆژیگرەكی، هندی خێرا وی بۆ وییە بێی تشتەك ژ خێرا رۆژیگری كێم ببیت).**

## ٣١ . باب: الإفطار للحامل والمرضع.

**بابەتێ: رۆژیخوارنا ژنا ب دوگیان و یا بچویكشیر.**

١٨٥٠ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: رُخِّصَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْعَجُوزِ الْكَبِيرَةِ فِي ذَلِكَ، وَهُمَا يُطِيقَانِ الصَّوْمَ أَنْ يُفْطِرَا إِنْ شَاءَا، وَيُطْعِمَا مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً، ثُمَّ نُسِخَ ذَلِكَ فِي هَذِهِ الآيَةِ ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُۖ﴾ وَثَبَتَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْعَجُوزِ الْكَبِيرَةِ: إِذَا كَانَا لاَ يُطِيقَانِ الصَّوْمَ، وَالْحَامِلُ وَالْمُرْضِعُ إِذَا خَافَتَا أَفْطَرَتَا، وَأَطْعَمَتَا مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً. [هق٤/ ٢٣٠].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەستویری بۆ زەلامێ پیر و ژنا پیر ئەوێت شیانا گرتنا رۆژیگرتنێ هەبیت ئەو بخۆن ئەگەر وان بڤێت و بەرامبەر هەر رۆژییەكێ خوارنا بەلنگازەكی بدەن، پاشی ئەڤە ب ڤێ ئایەتێ هاتە نەسخكرن** ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُۖ﴾ **و ئەڤ دەستویرییە بەردەوام بوو بۆ پیرەمێری و پیرەژنێ ئەگەر نەشێن رۆژییێ بگرن، و ژنا ب دوگیان و یا بچویكشیر ئەگەر ژ رۆژیگرتنێ بترسن (چ ژ خۆ چ ژ بچویكێ خۆ) دێ رۆژییێ خۆن و بەرامبەر هەر رۆژەكێ دێ خوارنا بەلنگازەكی دەن.**

١٨٥١ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَامِلِ إِذَا خَافَتْ عَلَى وَلَدِهَا، فَقَالَ: تُفْطِرُ وَتُطْعِمُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً مُدّاً مِنْ حِنْطَةٍ. [هق٤/ ٢٣٠].

**ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: پرسیارا رۆژیگرتنا ژنا ب حال ژ ئیبن عومەری هاتە كرن ئەگەر ژ بچویكێ خۆ ترسیا، ئینا گۆت: دێ خۆت و ل جهێ هەر رۆژەكێ خوارنا بەلنگازەكێ مستەكا گەنمی دەت.**

## ٣٢ . باب: ما جاء في حكم القيء للصائم.

**بابەتێ: ئەوا د راستا دلرابوونا رۆژیگریدا هاتی.**

١٨٥٢ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ ذَرَعَهُ قَيْءٌ وَهُوَ صَائِمٌ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَإِنِ اسْتَقَاءَ؛ فَلْيَقْضِ)** . [د٢٣٨٠/ ت٧٢٠/ جه١٦٧٦/ مي١٧٧٠].

- ولفظ الترمذي: **(وَمَنِ اسْتَقَاءَ عَمْداً؛ فَلْيَقْضِ)** .

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ نەشیا خۆ دلێ وی رابوو و ئەو یێ ب رۆژی بیت[1] قەزاكرن ل سەر وی نینە، و ئەگەر وی دلێ خۆ راكر بلا قەزا بكەت).**

- و بێژەیا ترمزی: **(یێ ب دەست و ب مەبەست دلێ خۆ راكەت بلا قەزا بكەت).**



(١) بلا رۆژییا خۆ بەردەوام بكەت و رۆژییا وی یا دورستە و رۆژییا وی نەكەفتییە.

## الفصل الثاني: التراويح وليلة القدر.

## پشكا دوویێ: تەراویح و شەڤا ب قەدر.

### ١ . باب: فضل صلاة التراويح

### بابەتێ: خێرا نڤێژا تەراویحێ.

١٨٥٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ قَامَ رَمَضَانَ، إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ**). [خ٢٠٠٩ (٣٥)/ م٧٥٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ژ باوەری و ب هیڤییا خێرێ، رەمەزانێ رابیت (ئانكو تەراویحان بكەت) گونەهێت وی یێت بۆرین هاتنە ژێبرن).**

١٨٥٤ - (ق) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمنِ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ رضي الله عنها: كَيْفَ كَانَتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلاَ فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً: يُصَلِّي أَرْبعاً، فَلاَ تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعاً، فَلاَ تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلاَثاً. قَالَتْ عائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ: (**يَا عَائِشَةُ إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي**) .[خ١١٤٧/ م٧٣٨].

**ژ ئەبی سەلەمەیێ كورێ عەبدولرەحمانی (ﷺ) گۆت: من پرسیارا عائیشایێ (ﷺ)، كر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چاوا نڤێژ د رەمەزانێدا دكر؟ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نە ل رەمەزانێ و نە ل غەیری رەمەزانێ ژ یازدە ركعەتان زێدە نەدكرن، چار دكرن و پرسیارا باشییا وان و درێژییا وان نەكە (هندی هند د باش و درێژ بوون) پاشی چار دكرن و پرسیارا باشییا وان و درێژییا وان نەكە، پاشی سێ دكرن، من گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ تو دنڤی بەری تو ویترێ بكەی؟ ئینا گۆت: (یا عائیشە چاڤێت من دنڤن، و دلێ من نانڤیت).**

١٨٥٥ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَرَجَ ذَاتَ لَيْلَةٍ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي المسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلاتِهِ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ فَصَلُّوا مَعَهُ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ فَتَحَدَّثُوا، فَكَثُرَ أَهْلُ المسْجِد مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَصَلَّوْا بِصَلاَتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ، عَجَزَ المسْجِد عَنْ أَهْلِهِ، حَتَّى خَرَجَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَلَمَّا قَضى الْفَجْرَ أَقْبَلَ

عَلَى النَّاسِ فَتَشَهَّدَ، ثُمَّ قَالَ: (**أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ مَكَانُكُمْ، لكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ، فَتَعْجِزُوا عَنْهَا**). [خ٩٢٤ (٧٢٩)/ م٧٦١].

- وفي رواية لهما: وذلكَ فِي رَمَضَانَ.[خ١١٢٩].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل شەڤەكێ د نیڤا وێدا دەركەفت و نڤێژ ل مزگەفتێ كر، ئینا هندە زەلامان نڤێژ ل دوی وی كرن، سپێدە ل خەلكی بوو و بەحسێ هندێ كرن، ئینا پتر ژ وان خەلك كۆم بوون و نڤێژ د گەل وی كرن، و سپێدە ل خەلكی بوو و بەحسێ هندێ كرن ئینا شەڤا سێیێ خەلكێ مزگەفتێ پتر لێ هاتن، پێغەمبەر (ﷺ) دەركەفت و خەلكی پشت نڤێژا وی نڤێژ كرن، ڤێجا دەمێ بوویە شەڤا چارێ مزگەفت پڕ بوو و ل خەلكێ خۆ بەرتەنگ بوو، و پێغەمبەر (ﷺ) دەرنەكەفت هەتا بوویە نڤێژا سپێدێ، ڤێجا دەمێ نڤێژا سپێدی كری، بەرێ خۆ دا خەلكی شەهدە دا و پاشی گۆت: (پشتی ڤێ ب ڕاستی هاتنا هەوە ل بەر من نە یا بەرزە بوو (من دزانی هوین یێت هاتین) بەلێ ئەز دترسیام ل سەر هەوە فەرز بیت و نەشیان هەوە بگریت و ژ دەرهەق نەدەركەڤن).**

- **و د ڤەگێرەكا واندا: و ئەڤە د رەمەزانێدا بوو.**

١٨٥٦ – (خ) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الخطَّابِ رضي الله عنه لَيْلَةً فِي رَمَضَانَ إِلَى المسْجِدِ، فَإِذَا النَّاسُ أَوْزَاعٌ مُتَفَرِّقُونَ، يُصَلِّي الرَّجُلُ لِنَفْسِهِ، وَيُصَلِّي الرَّجُلُ فَيُصَلِّي بِصَلاَتِهِ الرَّهْطُ، فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي أَرَى لَوْ جَمَعْتُ هؤُلاءِ عَلَى قَارِىءٍ وَاحِدٍ لَكَانَ أَمْثَلَ، ثُمَّ عَزَمَ فَجَمَعَهُمْ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ. ثُمَّ خَرَجْتُ مَعَهُ لَيْلَةً أُخْرَى وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ قَارِئِهِمْ، قَالَ عُمَرُ: نِعْمَ الْبِدْعَةُ هذِهِ، وَالَّتِي يَنَامُونَ عَنْهَا أَفْضَلُ مِنَ الَّتِي يَقُومُونَ . يُرِيدُ آخِرَ اللَّيْلِ . وَكَانَ النَّاسُ يقُومُونَ أَوَّلَهُ. [خ٢٠١٠].

**ژ عەبدولرەحمانێ كوڕێ عەبدلقاری (ﷺ) گۆت: ئەز د گەل عومەرێ كوڕێ خەتتابی د شەڤەكا رەمەزانێدا بۆ مزگەفتێ دەركەفتم، خەلك تێدا كۆم كۆمە بەلاڤ ببوون، زەلام هەبوو بۆ خۆ ب تنێ نڤێژ دكر، و زەلام هەبوو چەندەكا نڤێژێت خۆ د دویڤ نڤێژا ویڕا دكرن، ئینا عومەری گۆت: ئەز دبینم ئەگەر مە ئەڤە ل سەر خواندەڤانەكێ قورئانێ كۆم كربان دا باشتر بیت، پاشی بریار دا كۆم بكەت، و ئەو ل سەر ئوبەیێ كوڕێ كەعبی كۆم كرن، پاشی ئەز شەڤەكا دی د گەل دەركەفتم، و خەلكێ ل**

**پشت خواندەڤانێ خۆ نڤێژا خۆ دکرن، عومەری گۆت: ئەڤە باشترین بیدعەیە[1]، و ئەوا ئەو لێ دنڤن و پاشی رادبن دکەن باشترە ژ وێ ئەوا ڤێ گاڤێ پێ رادبن، مەبەستا وی دویماهییا شەڤێیە، و خەلک دەستپێکا شەڤێ ڕادبوون.**

## ٢ ـ باب: فضل ليلة القدر والحث على طلبها.

## بابەتێ: بهایێ شەڤا ب رێز و پالدان ل سەر داخوازییا وێ.

١٨٥٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَاناً واحْتِساباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ). [خ٢٠١٤ (٣٥)/ م٧٦٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ ژ باوەری و ب هیڤییا خێرێ رەمەزانێ بگریت گونەهێت وی یێت بۆرین هاتنە ژێبرن، و هەر کەسێ شەڤا ب رێز و رویمەت ژ باوەری و ب هیڤییا خێرێ رابیت، گونەهێت وی یێت بۆرین هاتنە ژێبرن).**

١٨٥٨ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِنَ العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ). [خ٢٠١٧/ م١١٦٩].

**ژ عائیشایێ (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د کەتێت دەهێت دویماهییێدا ژ رەمەزانێ ل شەڤا ب رێز و رویمەت بگەڕن).**

١٨٥٩ - (م) عَنْ زِرِ بنِ حُبَيْشٍ قَالَ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ رضي الله عنه، فَقُلْتُ: إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ. فَقَالَ: رحمه الله، أَرَادَ أَنْ لاَ يَتَّكِلَ النَّاسُ، أَمَّا إِنَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي رَمَضَانَ، وَأَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ، وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ. ثُمَّ حَلَفَ لاَ يَسْتَثْنِي، أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، فَقُلْتُ: بِأَيِّ شَيْءٍ تَقُولُ ذَلِكَ يا أَبَا الْمُنْذِرِ؟ قَالَ: بِالْعَلاَمَةِ، أَوْ بِالآيَةِ الَّتِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنَّهَا تَطْلُعُ يَوْمَئِذٍ، لاَ شُعَاعَ لَهَا. [م: الصيام ٧٦٢ (٢٢٠)]

---

(١) بیدعە: ئەو تشتە یێ نوی د شەریعەتێدا و چو بنیات و بەلگەیێ شەرعی بۆ نەبیت، بەلێ کرنا تەراویحان ب جەماعەت بنیات یێ بۆ هەی هۆسا نابیتە بیدعە، پا بۆچی عومەری ب بیدعەیێ ناڤ کر؟ چونکی پشتی پێغەمبەری (ﷺ) ئەو یێ نێکێ بوو کۆم کرین و ب جەماعەت بهێنە کرن، و هۆسا هەر تشتەکێ بکەڤیتە بن شەنگستەکێ شەرعیڤە نابیتە بیدعە، و هەرتشتەکێ بێ بنیات و بەلگە بیت و نەکەڤیتە بن شەنگستەکێ شەرعیڤە بیدعەیە.

**ژ زەرێ کورێ حوبەیشی (ﷺ) گۆت: من پرسیارا ئوبەیێ کورێ کەعبی کر (ﷺ) ئینا من گۆتێ: برایێ تە ئیبن مەسعود دبێژیت: هەر کەسێ سالێ هەمییێ رابیت دێ کەڤیتە د شەڤا ب رێزدا. ئینا گۆت: خودێ دلۆڤانییێ پێ ببەت، ئەوی دڤیا خۆ ب هیڤییا ویڤە نەهێلن، ب راستی وی یا زانی ئەو یا د رەمەزانێدا و ئەو یا د دەهکێت دویماهییێدا و ئەو یا د شەڤا بیست و حەفتێدا، پاشی سویند خوار ڤدەرکرن بۆ نەکر[1] ئەو یا د شەڤا بیست و حەفتێدا، ئینا من گۆت: ئەی بابێ مونزری تو ب چ تشت ڤێ دبێژی؟ گۆت: ب نیشانێ، ب وێ نیشانا پێغەمبەری (ﷺ) بۆ مە گۆتی رۆژا وێ دێ هەلیت یا بێ تیرۆژکە.**

## ٣ ـ باب: الدعاء ليلة القدر.

## بابەتێ: دوعایا شەڤا ب رێز.

١٨٦٠ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمْتُ أَيَّ لَيْلَةٍ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، مَا أَقُولُ فِيهَا؟ قَالَ: (قُولِي: **اللَّهُمَّ إِنَّكَ عُفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ، فَاعْفُ عَنِّي**) . [ت٣٥١٣/ جه٣٨٥٠].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: من گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ هەکە من زانی کیژ شەڤ (لیلة القدر)ـە، ئەز تێدا چ بێژم؟ گۆت: بێژە: (یا خودێ ب راستی تو لێبۆری و حەژ لێبۆرینێ دکەی ل من ببۆرە).**

## ٤ ـ باب: صلاة الرجال بالنساء في التراويح.

## بابەتێ: نڤێژکرنا زەلامان ب ژنان د تەراویحاندا.

١٨٦١ – عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّ ذَكْوَانَ أَبَا عَمْرٍو ـ وَكَانَ عَبْداً لِعَائِشَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَأَعْتَقَتْهُ عَنْ دُبُرٍ مِنْهَا ـ كَانَ يَقُومُ يَقْرَأُ لَهَا فِي رَمَضَانَ. [ط٢٥٦م].

**ژ عوروەیی (ﷺ) گۆت: زەکوانێ بابێ عەمروی ـ و ئەو بەندەیێ عائیشایێ بوو**

(١) نانکو: سویندەکا ڤەبڕ خوار و نەگۆت: (ان شاء الله).

**هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) پاشی وێ ئازا كر پشتی وەعد دانێ[1] ـ وی تەراویح د رەمەزانێدا بەری وێ دكرن.**

١٨٦٢ - عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رضي الله عنه جَمَعَ النَّاسَ عَلَى قِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ، الرِّجَالَ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَالنِّسَاءَ عَلَى سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ. [هق٢/٤٩٣ ـ ٤٩٤].

**ژ عوروەیی (رضي الله عنه) گۆت: عومەرێ كورێ خەتتابی خەلك بۆ نڤێژێت تەراویحێت رەمەزانێ كۆم كرن، زەلام ل پشت ئوبەیێ كورێ كەعبی كۆم كرن، و ژن ل پشت سولەیمانێ كورێ ئەبی حەسمە كۆم كرن.**

## ٥ ـ باب: عدد ركعات التراويح.

## بابەتێ: هژمارا ركعەتێت تەراویحان.

١٨٦٣ - عَنْ يَزِيدَ بْنِ رُومانَ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَقُومُونَ فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه فِي رَمَضَانَ بِثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ رَكْعَةً. [هق٢/٤٩٦].

**ژ یەزیدێ كورێ روومانی (رضي الله عنه) گۆت: ل سەردەمێ عومەرێ كورێ خەتتابی (رضي الله عنه) خەلكی د رەمەزانێدا بیست و سێ ركعەت دكرن.**

١٨٦٤ - عَنْ أَبِي الْخَصِيبِ قَالَ: كَانَ يَؤُمُّنَا سُوَيْدُ بْنُ غَفَلَةَ فِي رَمَضَانَ فَيُصَلِّي خَمْسَ تَرْوِيحَاتٍ عِشْرِينَ رَكْعَةً. [هق٢/٤٩٦].

**ژ ئەبی خەسیبی (رضي الله عنه) گۆت: سوومیدێ كورێ غەفلەیی د رەمەزانێدا ئیمامەتی بۆ مە دكر و پێنج بێهنڤەدان ددان و بیست ركعەت نڤێژ دكرن.**



(١) (فَأَعْتَقَتْهُ عَنْ دُبُرٍ مِنْهَا) ئانكو: ئازا كر پشتی ژڤان داییێ، و ئەو ژ وان بوو پێت عائیشایێ ژڤان داییێ و پاشی ئازا كرین، بەلێ دەمێ نڤێژ ل بەری وێ دكر نە بێ ئازاكری بوو.

## الفصل الثالث: الاعتكاف

## پشكا سێیێ: ئعتیكاف: (مانا ل مزگەفتێ ب ئنیەتا پەرستنێ).

### ١ ـ باب: الاعتكاف في العشر الأَواخر.

### بابەتێ: ئعتیكافێ د دەهكێت دویماهییێدا.

١٨٦٥ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ. [خ٢٠٢٥/ م١١٧١].

**ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەهێت دویماهییێ ژ رەمەزانێ ئعتیكاف تێدا دكرن و ساخ دكرن.**

١٨٦٦ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ عَاماً، فَلَمَّا كَانَ فِي الْعَامِ الْمُقْبِلِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ. [ت٨٠٣].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د دەهكێت دویماهییێدا ژ رەمەزانێ ئعتیكاف تێدا دكرن و ساخ دكرن، و سالەكێ ئعتیكاف تێدا نەكرن، فێجا دەمێ سالا پاشتر هاتی ئعتیكاف د بیستاندا كر و ساخ دكرن.**

### ٢ ـ باب: لا يدخل البيت إلا لحاجة.

### بابەتێ: ئعتیكافكار ناهێتە مال بۆ هەوجەیێ نەبیت.

١٨٦٧ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ قَالَتْ: وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ، وَهوَ فِي المسْجِدِ، فَأُرَجِّلهُ، وَكَانَ لاَ يَدْخُلُ الْبَيْتَ؛ إِلاَّ لِحَاجَةٍ إِذَا كَانَ مُعْتَكِفاً.

[خ٢٠٢٩ (٢٩٥)/ م٢٩٧]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: جار هەبوو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سەرێ خۆ بۆ لایێ من دئینا ژۆرڤە و ئەو د مزگەفتێڤە بوو و من سەرێ وی شە دكر، و ئەگەر ئەو د ئعتیكافێدا با نەدهاتە مال بۆ هەوجەییەكێ نەبا.**

١٨٦٨ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: السُّنَّةُ عَلَى الْمُعْتَكِفِ أَنْ لاَ يَعُودَ مَرِيضاً، وَلاَ يَشْهَدَ جَنَازَةً، وَلاَ يَمَسَّ امْرَأَةً، وَلاَ يُبَاشِرَهَا، وَلاَ يَخْرُجَ لِحَاجَةٍ إِلاَّ لِمَا لاَ بُدَّ مِنْهُ، وَلاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ بِصَوْمٍ، وَلاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ فِي مَسْجِدٍ جَامِعٍ. [د٢٤٧٣]

* حسن صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: سونەتە ل سەر ئعتیكافچی ئەو سەرا نەساخەكی نەدەت و ل جەنازەی ئامادە نەبیت و نەچیتە نڤینا ژنێ و دەستكرنا وێ ب شەهوەت نەكەت، و بۆ چو هەوجەییان دەرنەكەڤیت ئەو نەبیت هەر دڤێت بۆ دەركەڤیت، و ئعتیكاف ناهێتە كرن ب رۆژی نەبیت، و ئعتیكاف ناهێتە كرن ل مزگەفتەكا كۆمكەر نەبیت.**

**٣ ـ باب: اعتكاف النساء**

**بابەتێ: ئعتیكافا ژنان.**

١٨٦٩ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَكُنْتُ أَضْرِبُ لَهُ خِبَاءً، فَيُصَلِّي الصُّبْحَ ثُمَّ يَدْخُلُهُ، فَاسْتَأْذَنَتْ حَفْصَةُ عَائِشَةَ أَنْ تَضْرِبَ خِبَاءً فَأَذِنَتْ لَهَا، فَضَرَبَتْ خِبَاءً، فَلَمَّا رَأَتْهُ زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ ضَرَبَتْ خِبَاءً آخَرَ، فَلَمَّا أَصْبَحَ النَّبِيُّ (ﷺ) رَأَى الأَخْبِيَةَ، فَقَالَ: (مَا هذَا) ؟ فَأُخْبِرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (آلْبِرَّ تُرَوْنَ بِهِنَّ) ؟ فَتَرَكَ الاِعْتِكَافَ ذَلِكَ الشَّهْرَ، ثُمَّ اعْتَكَفَ عَشْراً مِنْ شَوَّالٍ. [خ٢٠٣٣ (٢٠٢٩)/ م١١٧٣]

- ولفظ مسلم: (آلْبِرَّ تُرِدْنَ) ؟.
- وللبخاري: (آلْبِرَّ أَرَدْنَ بِهَذَا) ؟ [خ٢٠٤٥]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د دەهكێت دویماهییێدا ژ رەمەزانێ ئعتیكاف دكر و ساخ دكرن، و من خیڤەتەك بۆ ڤەددا، ڤێجا دا نڤێژا سپێدێ كەت پاشی چیتە تێڤە، حەفسایێ دەستویر ژ عائیشایێ خواست ئەو ژی خیڤەتەكێ ڤەدەت، ئینا دەستویری دایێ، ئینا خیڤەتەك ڤەدا، ڤێجا دەمێ زەینەبا كچا جەحشی دیتی وێ ژی خیڤەتەكا دی ڤەدا، ڤێجا دەمێ بوویە سپێدە و پێغەمبەری (ﷺ) خیڤەت دیتین، ئینا گۆت: (ئەڤە چییە)؟ بۆ هاتە گۆتن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەرێ ئەو ڤێ خێر و باشی دبینن)؟ ئینا وێ هەیڤێ ئعتیكاف هێلا، پاشێ د دەهێت شەوالێدا ئعتیكاف كر.**

- **و بێژەیا موسلمی ( ئەرێ هەوە خێر دڤێت).**
- **و یا بوخاری: (ئەرێ وان خێر ب ڤێ دڤێت).**

١٨٧٠ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: اعْتَكَفَتْ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) امْرَأَةٌ مِنْ أَزْوَاجِهِ مُسْتَحَاضَةٌ، فَكَانَتْ تَرَى الحُمْرَةَ وَالصُّفْرَةَ، فَرُبَّمَا وَضَعْنَا الطَّسْتَ تَحْتَهَا وَهِيَ تُصَلِّي.[خ٢٠٣٧ (٣٠٩)].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ژنەکێ ژ هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) د گەل وی ئعتیکاف دکر و د ئستیحازێدا بوو و سۆراتی و زەراتی ددیت، و دبیت هندە جاران مە تەست ددانا بن وێ و وێ نڤێژ دکر.**

## ٤ ـ باب: هل يخرج المعتكف لحوائجه

## بابەتێ: ئەرێ ئەوێ ئعتیکافێ دکەت دێ بۆ هەوجەیییا خۆ دەرکەڤیت.

١٨٧١ - (ق) عَنْ عَلِيِّ بْنِ الحُسَيْنِ رضي الله عنهما: أَنَّ صَفِيَّةَ ـ زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ أَخْبَرَتْهُ: أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) تَزُورُهُ فِي اعْتِكَافِهِ فِي المسْجِدِ، فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً، ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ، فَقَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَعَهَا يَقْلِبُهَا، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ المسْجِدِ عِنْدَ بَابِ أُمِّ سَلَمَةَ، مَرَّ رَجُلَانِ مِنَ الأَنْصَارِ، فَسَلَّمَا عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ لَهُمَا النَّبِيُّ (ﷺ): **(عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّمَا هِيَ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ)** ، فَقَالَا: سُبْحَانَ اللهِ يَا رَسُولَ اللهِ! وَكَبُرَ عَلَيْهِمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّ الشَّيْطَانَ يَبْلُغُ مِنَ الإِنْسَانِ مَبْلَغَ الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُما شَيْئاً)**.[خ٢٠٣٥/ م٢١٧٥]

**ژ عەلیێ کوڕێ حوسەینی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: سەفیایا هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە وی: ئەو هات سەرا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بدەت دەمێ ئەو د ئعتیکافا خۆدا د مزگەفتێڤە د دەهکێت دویماهییێدا ژ رەمەزانێ، دەمەکی د گەل ئاخفت پاشی رابوو دا بزڤریت، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) د گەل وێ رابوو دا وێ بزڤرینیت، هەتا گەهشتییە دەرگەهێ مزگەفتێ ل دەڤ دەرگەهێ ئوم سەلەمەیێ، دو زەلامێت خەلکێ مەدینەیێ بۆرین و سلاڤ کرنە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هێدی هێدی ئەڤە سەفیا کچا حویەیە)، گۆتن: پاکی و پاقژی بۆ خودێ بیت ئەی پێغەمبەرێ خودێ، و ئەڤە ل سەر وان یا گران بوو[1]، ئینا گۆت: (ب راستی شەیتان د جهێ خوینێدا د ناڤ مرۆڤیدا دهێت و دچیت[2] و ئەز ترسیام خەلەتییەکێ باڤێژیتە د دلێت هەوەدا. یان گۆت: تشتەکی).**

---

(١) نانکو: چاوا ئەم دێ هزرەکا نەدورست د راستا تەدا کەین.

(٢) نانکو: هندی شەیتان مرۆڤی ل بەر سەردابرنێدا دبەت دێ بێژی خوینە د ناڤ دەمارێت مرۆڤیدا دهێت و دچیت.

## ٥ . باب: الاجتهاد في العشر الأَواخر.

## بابەتێ: پتر عیبادەتكرن د دەهكێت دویماهیییێدا.

١٨٧٢ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ، شَدَّ مِئْزَرَهُ، وَأَحْيَا لَيْلَهُ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ . [خ٢٠٢٤/ م١١٧٤].

- وعند مسلم: وَجَدَّ وَشَدَّ الْمِئْزَرَ.
- وفي رواية لمسلم: قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَجْتَهِدُ فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ، مَا لا يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهِ. [م١١٧٥]

**ژ عائیشایێ، (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ دچۆ د دەهكێت دویماهیییێدا ژ رەمەزانێ، كارێ خۆ بۆ عیبادەتی دكر و خۆ ژ نڤینا مالا خۆ ددا پاش، و شەڤا خۆ هەمی ب عیبادەتی ساخ دكر، و مالا خۆ هشیار دكر.**

- **و ل دەڤ موسلمی: و بۆ عیبادەتی رژد بوو و خۆ ژ نڤینا مالا خۆ ددا پاش.**
- **و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو عیبادتێ د دەهێت دویماهیییێدا دكر د غەیری واندا نەدكر.**



## الفصل الرابع: صيام التطوع

## پشكا چوارێ: رۆژیيا سونەت

### ١ ـ باب: صومه (ﷺ) في غير رمضان.

### بابەتێ: رۆژیيا پێغەمبەری (ﷺ) د غەیری رەمەزانێدا.

١٨٧٣ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَصُومُ حَتَّى نَقول لاَ يُفْطِرُ، وَيفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يَصُومُ، فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ إِلاَّ رَمَضَانَ، وَمَا رَأَيْتُهُ أَكْثَرَ صِيَاماً مِنْهُ فِي شَعْبَانَ. [خ١٩٦٩/ م١١٥٦]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب رۆژی بوو هەتا مە دگۆت ئەو رۆژییێ ناخۆت، و ب رۆژی نەدبوو هەتا مە دگۆت: ئەو ب رۆژی نابیت، و من پێغەمبەر (ﷺ) نەدیتییە هەیڤەك تمام كربیت هەیڤا رەمەزانێ نەبیت، و من ئەو نەدیتییە پتر رۆژی گرتبن وەكی د شەعبانێدا گرتین.**

### ٢ ـ باب: النهي عن صوم الدهر والعيدين وأيام التشريق.

### بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ رۆژیگرتنا هەر و هەر و هەردو جەژنان و رۆژێت تەشریقێ[1].

١٨٧٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العاصِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَا عَبْدَ اللهِ، أَلَمْ أُخبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ النَّهارَ، وَتَقُومُ اللَّيْلَ**) ؟ فَقُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**فَلاَ تَفْعَلْ، صُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ، فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإِنَّ لِعَيْنِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإِنَّ لِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَإِنَّ بِحَسْبِكَ أَنْ تَصُومَ كُلّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ لَكَ بِكُلِّ حسَنةٍ عَشْرَ أَمْثالِهَا، فَإِنّ ذلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ كُلّه**).

(١) رۆژێت تەشریقێ: رۆژێت دانەتاڤێ یان هلێخستنا بەر تاڤێ، ئەو سێ رۆژن، یێت پشتی رۆژا ئێكێ ژ رۆژا جەژنا قوربانی ـ جەژنا حەجییا ـ دهێن، و دبێژنێ رۆژێت تەشریقێ، (رۆژێت دانەتاڤێ ) و ب ڤی ناڤی هاتینە ناڤكرن: چونكی گۆشتێ قوربانی د ڤان رۆژاندا دهاتە هشككرن، و گۆشت ددا تاڤێ، و د بۆچۆنەكا دیدا هاتییە: ئەڤ ناڤە دانایە سەر، چونكی نڤێژا جەژنێ پشتی رۆژهەلاتنێ و تێشتەگەهێ دهێتە كرن، و ئەڤ هەرسێ رۆژە دویڤرا دهێن، لەوا دبێژنێ رۆژێت تەشریقێ (دانەتاڤێ)، و بۆچۆنەكا دی دبێژیت: ئەڤ ناڤە یێ ژ هندێ هاتی، قوربان ناهێنە ڤەكوشتن هەتا رۆژ نەهەلێت و نەدەركەڤیت لەوا ڤی ناڤی دبێژنێ، و بۆچۆنا ئێكێ بهێزترە..

فَشَدَّدْتُ فَشُدِّدَ عَلَيَّ. قُلْت: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِي أَجِدُ قُوَّةً؟ قَالَ: (**فَصُمْ صِيَامَ نَبِيِّ اللهِ دَاوُدَ عليه السلام وَلاَ تَزِدْ عَلَيْهِ**) . قُلْت: وَمَا كَانَ صِيَامُ نَبِيِّ اللهِ دَاوُدَ عليه السلام؟ قَالَ: (**نِصْفَ الدَّهْرِ**) . فَكَانَ عَبْدُ اللهِ يَقُولُ بَعْدَمَا كَبِرَ: يَا لَيْتَنِي قَبِلْتُ رُخْصَةَ النَّبِيِّ (ﷺ). [خ١٩٧٥ (١١٣١)/ م١١٥٩].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمرێ كوڕێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (ئەی عەبدوللا ئەرێ بۆ من نەهاتییە گۆتن تو ب رۆژێ ب رۆژی دبی و ب شەڤێ رادبی)؟ من گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ. گۆت: (وەنەكە، ب رۆژیبە و بخۆ، و بنڤە و رابە، ب راستی لەشێ تە حەق یێ ل سەر تە، و چاڤێ تە حەق یێ ل سەر تە، و ژنا تە حەق یێ ل سەر تە، و یێت سەرا تە ددەن حەق یێ ل سەر تە، و بەسی تەیە هەر هەیڤەكێ تو سێ رۆژان ب رۆژی بی، ب راستی هەر خێرەك بۆ تە دێ ب دەهان بیت، ئەڤە رۆژیگرتنا هەمی عەمرییە). من گرانی خواست، و ل سەر من هاتە گرانكرن، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز یێ ب هێزم، گۆت: (رۆژییا پێغەمبەرێ خودێ داوودی بگرە و ل سەر زێدە نەكە) من گۆت: و رۆژییا داوودی یا چاوا بوو؟ گۆت: (رۆژییەك دگرت و ئێك دخوار). عەبدوللا پشتی مەزن بووی دگۆت: خۆزی من دەستویرییا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەرگرتبا.**

١٨٧٥ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ، وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهم، قَالاَ: لَمْ يُرَخَّصْ فِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ أَنْ يُصَمْنَ؛ إِلاَّ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ الْهَدْيَ. [خ١٩٩٧، ١٩٩٨]

**ژ عائیشایێ و ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: دەستویری نەهاتییە دان رۆژی د رۆژێت تەشریقێدا بهێنە گرتن، بۆ وی نەبیت یێ قوربان ل سەر بیت و نەبیت یان ب دەست نەكەڤیت.**

١٨٧٦ - (م) عَنْ نُبَيْشَةَ الْهُذَلِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ**). [م١١٤١].

**ژ نوبەیشەیێ هوزەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رۆژێت تەشریقێ رۆژێت خوارن و ڤەخوارنێنە).**

١٨٧٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ الأَضْحَى، وَيَوْمِ الْفِطْرِ. [م١١٣٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا كری ژ رۆژیگرتنا دو رۆژان: رۆژا جەژنا حەجییان، و رۆژا جەژنا رەمەزانێ.**

١٨٧٨ - عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ فُلاَناً لاَ يُفْطِرُ نَهَاراً الدَّهْرَ، قَالَ: (**لاَ صَامَ وَلاَ أَفْطَرَ**). [ن٢٣٧٨].

* صحيح.

**ژ عیمرانێ كورێ (حصين)ی (ﷺ) گۆت: هاتە گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی فلان درێژییا رۆژان یێ ب رۆژییە و رۆژییا ناخۆت، گۆت: (نە یێ ب رۆژییە[1] و نە رۆژی خوارییە)[2].**

### ٣ ـ باب: كراهة صيام الجمعة منفرداً.

### بابەتێ: نەباشییا رۆژیگرتنا ئەینییێ ب تنێ.

١٨٧٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**لاَ يَصُومُ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الجُمُعَةِ؛ إِلاَّ يَوْماً قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ**) . [خ١٩٨٥/ م١١٤٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (كەس ژ هەوە رۆژا خوتبە رۆژییێ نەگریت، هەكە رۆژەك بەری وێ یان پشتی وێ نەبیت).**

١٨٨٠ - (خ) عَنْ جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الحَارِثِ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) دَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَهِيَ صَائِمَةٌ، فَقَالَ: (**أَصُمْتِ أَمْسِ**) ؟ قَالَتْ: لاَ، قَالَ: (**تُرِيدِينَ أَنْ تَصُومِي غَداً**) ؟ قَالَتْ: لاَ، قَالَ: (**فَأَفْطِرِي**). [خ١٩٨٦].

**ژ جوویرییا كچا حارسی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا خوتبە چۆ دەڤ و ئەو یا ب رۆژی بوو، ئینا گۆت: (تو دوهی یا ب رۆژی بووی)؟ گۆت: نەخێر، گۆت: (تە ل بەرە سوبەهی یا ب رۆژی بی)؟ گۆت: نەخێر، گۆت: (رۆژییا خۆ بخۆ).**

---

(١) ئانكو: خێرا رۆژییێ ناگەهیتێ، چونكی بەروڤاژییا رێكا پێغەمبەری (ﷺ) كرییە.

(٢) ئانكو: خێرا فتارێ ناگەهیتێ، چونكی بەروڤاژییا رێكا پێغەمبەری (ﷺ) كرییە.

## ٤ ـ باب: صوم يوم عاشوراء.

## بابەتێ: رۆژییا رۆژا عاشوورایێ.

١٨٨١ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَصُومُهُ فِي الجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا قَدِمَ المدِينَةَ صَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَانُ تَرَكَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ. [خ٢٠٠٢ (١٥٩٢)/ م١١٢٥].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: قورەیشییان د نەزانینێدا رۆژییا عاشوورایێ[١] دگرت و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د دەمێ نەزانینێدا دگرت، ڤێجا دەمێ هاتییە مەدینەیێ گرت و فەرمان ب رۆژیگرتنا وێ کر، ڤێجا دەمێ رەمەزان فەرز بووی رۆژیگرتنا عاشوورایێ هێلا، یێ ڤیابا دا گریت و یێ ڤیابا دا هێلیت.**

١٨٨٢ – (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه قَالَ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ تَعُدُّهُ الْيَهُودُ عِيداً، قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (فصومُوهُ أَنْتُمْ) . [خ٢٠٠٥/ م١١٣١]

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: رۆژا عاشوورایێ جوهییان ب جەژن دهەژمارت و ددانا، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هوین تێدا ب رۆژی بن).**

١٨٨٣ – (م) عَنْ أَبِي غطفانَ بنِ طريفٍ المريّ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَقُولُ: حِينَ صَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُ يَوْمٌ تُعَظِّمُهُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**فَإِذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ، إِنْ شَاءَ اللهُ، صُمْنَا الْيَوْمَ التَّاسِعَ**) . قَالَ: فَلَمْ يَأْتِ الْعَامُ الْمُقْبِلُ، حَتَّى تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [م١١٣٤]

**ژ ئەبی غەتەفانێ کورێ تەریفێ مری (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل عەبدوللایێ کورێ عەباسی بوو (خودێ ژ وان رازی بیت) دگۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژییا عاشوورایێ گرتی و فەرمان ب رۆژیگرتنا وێ کری، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ب راستی ئەو رۆژەکە جوهی و مەسیحی مەزن ددانن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر سالا بهێت هات ب ئانەهییا خودێ رۆژا نەهێ ژی (ئانکو رۆژا نەهی موحەرەمێ) دێ ب رۆژی بین) و سالا دویڤرا نەهات هەتا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر کری.**

---

(١) عاشوورا: رۆژا دەهی موحەرەمێیە.

١٨٨٤ - عَنْ أَبِي قَتَادَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ**). [ت٧٥٢/ جه١٧٣٨].

* صحيح.

**ژ ئەبی قەتادەیی (رضي الله عنه) پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (رۆژیا رۆژا عاشوورایێ ئەز وەسا ل دەڤ خودێ ددانم گونەهێت سالا چۆیی ژێ ببەت).**

٥ . باب: صيام ثلاثة أيام من كل شهر وغيرها.

**بابەتێ: رۆژیگرتنا سێ رۆژان ژ هەر هەیڤەکێ و غەیری وێ.**

١٨٨٥ - (م) عَنْ مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ: أَنَّهَا سَأَلَتْ عَائِشَةَ . زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) .: أَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، فَقُلْتُ لَهَا: مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ كَانَ يَصُومُ؟ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ يُبَالِي مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ يَصُومُ. [م١١٦٠].

**ژ موعازەیا عەدەوی، وێ پرسیار ژ عائیشایێ کر (رضي الله عنها) گۆت: ئەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سێ رۆژی دگرتن ژ هەمی هەیڤان؟ گۆت: بەلێ، من گۆت: ژ کیرا هەیڤێ رۆژی دگرتن؟ گۆت: خەم نەدخوار کا ژ کیرا هەیڤێ یێ ب رۆژی بیت.**

١٨٨٦ - عَنْ هُنَيْدَةَ بْنِ خَالِدٍ، عَنِ امْرَأَتِهِ، عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَصُومُ تِسْعَ ذِي الْحِجَّةِ، وَيَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَثَلاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، أَوَّلَ اثْنَيْنِ مِنَ الشَّهْرِ وَالْخَمِيسَ وَالْخَمِيسَ. [د٢٤٣٧/ ن٢٣٧١].

* صحيح.

**ژ هونەیدەیێ کورێ خالدی ژ هەڤژینا خۆ ژ هندە هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهکێت زیلحیججەیێ و رۆژا عاشوورایێ و سێ رۆژ ژ هەمی هەیڤان و دوشەمبا ئێکێ ژ هەمی هەیڤان و پێنج شەمب و پێنج شەمب ب رۆژی دبوو.**

١٨٨٧ - عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ صَامَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، فَذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ**) . فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل تَصْدِيقَ ذَلِكَ فِي كِتَابِهِ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾ [الأنعام:١٦٠] ، الْيَوْمُ بِعَشْرَةِ أَيَّامٍ. [ت٧٦٢/ ن٢٤٠٨/ جه١٧٠٨].

* صحيح.

**ژ ئەبی زەرِی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ، سێ رۆژان ژ هەمی هەیڤان ب رۆژی بیت، هەروەکی ژیێ خۆ هەمییێ ب رۆژی)، ئینا خودایێ هەردەم ب هێز و مەزن بۆ راستدەرێخستنا ڤێ چەندی ئینا خوارێ** ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ﴾ **رۆژەك ب دەھ رۆژانە.**

١٨٨٨ - وعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يَا أَبَا ذَرٍّ، إِذَا صُمْتَ مِنَ الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَصُمْ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ) . [ت٧٦١/ ن٢٤٢١].

* حسن.

**ژ ئەبی زەرِی ﷺ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گۆت: (هەکە تە سێ رۆژی ژ هەیڤێ گرتن، رۆژا سێزدێ و چاردێ و پازدێ ب رۆژی بە).**

## ٦ . باب: فضل الصيام في سبيل الله.

## بابەتێ: خێرا رۆژیا د رێکا خودێدا[1].

١٨٨٩ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سَبِيلِ اللهِ، بَعَّدَ اللهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفاً) . [خ٢٨٤٠/ م١١٥٣].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ رۆژەکێ بۆ خودێ ب رۆژی بیت، خودێ دێ روییێ وی حەفتێ سالان ژ ئاگری دویر ئێخیت).**

## ٧ . باب: استحباب صوم ستة أيام من شوال.

## بابەتێ: باشدانانا رۆژیگرتنا شەش رۆژان ژ شەوالێ.

١٨٩٠ - (م) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتّاً مِنْ شَوَّالٍ، كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ) . [م١١٦٤].

**ژ ئەبی ئەیووبی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ رەمەزانێ بگریت پاشی شەش رۆژان ژ شەوالێ بدەتە د گەل هەروەکی هەمی دەمی یێ ب رۆژی).**

---

(١) گەلەك زانا دبێژن: مەبەست (د رێکا خودێدا) د جیهادێدا، ئانکو: رۆژی بیت و د جیهادێدا بیت، بەلێ پا یا ئاشکەرا فەرمانا هەی رۆژی د جیهادێدا بهێتە خوارن نەکو بهێتە گرتن و خودێ چێتر دزانیت.

## ٨ . باب: فضل الصوم في المحرَّم

**بابەتێ: خێرا رۆژیا د موحەرڕەمێدا.**

١٨٩١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلاَةُ اللَّيْلِ**) . [م١١٦٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (باشترین رۆژی پشتی هەیڤا رەمەزانێ هەیڤا خودێیە یا موحەرڕەمێ، و باشترین نڤێژ پشتی یا فەرز یا شەڤێیە).**

## ٩ . باب: نية الصوم من النهار وجواز الفطر في النافلة.

**بابەتێ: ئنیەتئینانا رۆژییێ د رۆژێدا و دورستییا رۆژیخوارنا رۆژیا سونەت.**

١٨٩٢ - (م) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤمِنِينَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ: (**يَا عَائِشَةُ هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ**) ؟ قالتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا عِنْدَنَا شَيْءٌ، قَالَ: (**فَإِنِّي صَائِمٌ**) . قَالَتْ: فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَأُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ . أَوْ جَاءَنَا زَوْرٌ . قَالَتْ: فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ . أَوْ جَاءَنَا زَوْرٌ . وَقَدْ خَبَأْتُ لَكَ شَيْئاً، قَالَ: (**مَا هُوَ**) ؟ قُلْتُ: حَيْسٌ، قَالَ: (**هَاتِيهِ**) ، فَجِئْتُ بِهِ فَأَكَلَ، ثُمَّ قَالَ: (**قَدْ كُنْتُ أَصْبَحْتُ صَائِماً**) . [م١١٥٤].

وفي رواية: (**فَإِنِّي إِذاً صَائِمٌ**) ، وفيها: (**أَرِينِيهِ، فَلَقَدْ أَصْبَحْتُ صَائِماً**) .

**ژ عائیشایێ دایكا باوەریداران (ﷺ) گۆت: رۆژەكێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (ئەی عائیشا تشتەك ل دەڤ هەوە هەیە)؟ گۆت: ئینا من گۆت: چو ل دەڤ مە نینە ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (پا ئەز یێ ب رۆژیمە) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفت، ئینا دیارییەك بۆ مە هات - یان مێڤان بۆ مە هاتن - گۆت: ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ زڤرییەڤە، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دیارییەك بۆ مە هات - یان مێڤان بۆ مە هاتن - و من تشتەك یێ بۆ تە هەلگرتی، گۆت چییە من گۆت: قەسپێت روینی و كەشكی، گۆت: (بینە) من بۆ ئینا و خوار و پاشی گۆت: (سپێدە ل من ببوو و ئەز یێ ب رۆژی بووم).**

## ١٠ ـ باب: الصائم يدعى لطعام فليقل: إني صائم.

**بابەتێ: ئەگەر رۆژیگر بۆ خوارنەكێ هاتە گازیكرن بلا بێژیت: ئەز یێ ب رۆژیمە.**

١٨٩٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ، وَهُوَ صَائِمٌ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ**). [م١١٥٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە بۆ خوارنەكێ هاتە گازیكرن و ئەو یێ ب رۆژی بیت بلا بێژیت: ب راستی ئەز یێ ب رۆژیمە).**

## ١١ ـ باب: صوم عشر ذي الحجة وعرفة.

**بابەتێ: رۆژییا دەهكا و رۆژا عەرەفەیێ.**

١٨٩٤ - (م) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) صَائِماً فِي الْعَشْرِ قَطُّ. [م١١٧٦].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بنیڕا د دەهەكاندا ب رۆژی نەدیتییە.**

١٨٩٥ - (م) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ): (**صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ على اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ والَّتِي بَعْدَهُ**) . لفظ ابن ماجه. [م١١٦٢/د٢٤٢٥/جه١٧٣٠]

* صحيح .

[وانظر: ١٨٨٦] .

**ژ ئەبی قەتادەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رۆژییا رۆژا عەرەفێ ئەز ل دەڤ خودێ ددانم گونەهێت سالا بەری خۆ و یا پشتی خۆ ژێ دبەت).**

## ١٢ ـ باب: الصوم في شعبان.

**بابەتێ: رۆژی د شەعبانێدا.**

١٨٩٦ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ أَحَبَّ الشُّهُورِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنْ يَصُومَهُ شَعْبَانُ، ثُمَّ يَصِلُهُ بِرَمَضَانَ. [د٢٤٣١/ ت٧٣٧/ ن٢٣٤٩/ جه١٦٤٩]

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: خۆشڤیترین هەیڤ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژییا تێدا بگریت شەعبانە، پاشی د گەهاندە رەمەزانێ.**

١٨٩٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانُ، فَلاَ تَصُومُوا)** .

[د٢٣٣٧/ ت٧٣٨/ جه١٦٥١/ مي١٧٨١]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر شەعبان ب نیڤی بوو، ب رۆژی نەبن).**

## ١٣ . باب: في صوم الاثنين والخميس.

## بابەتێ: رۆژییا رۆژا دوشەمبێ و پێنج شەمبێ.

١٨٩٨ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَتَحَرَّى صَوْمَ الاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ.

[ت٧٤٥/ ن٢٣٥٩/ جه١٧٣٩].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر رۆژیگرتنا دوشەمب و پێنج شەمبان یێ هشیار بوو.**

١٨٩٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(تُعْرَضُ الْأَعْمَالُ يَوْمَ الاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ، فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ)** . [ت٧٤٧/ مي١٧٩٢]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كار و كریار رۆژا دوشەمبی و پێنج شەمبی بۆ خودێ دهێنە گۆتن[1] و ئەز حەز دكەم كارێ من بێتە گۆتن و ئەز یێ ب رۆژی).**

## ١٤ . باب: من تطوع وعليه صوم واجب

## بابەتێ: یێ رۆژییەكا سونەت بگریت و رۆژییەكا واجب ل سەر بیت.

١٩٠٠ – عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ نَذَرَ صِيَامَ شَهْرٍ، هَلْ لَهُ أَنْ يَتَطَوَّعَ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ: لِيَبْدَأْ بِالنَّذْرِ قَبْلَ أَنْ يَتَطَوَّعَ. وعَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ...مِثْلُ ذَلِكَ. [ط٦٧٤].

---

(١) ژ لایێ ملیاكەتێت زێرەڤانڤە، و خودێ چێتر دزانیت.

**ژ سەعیدێ کوڕێ موسەییەبی: پرسیار ژ وی هاتە کرن زەلامەکی رۆژیگرتنا هەیڤەکێ نەزر کربیت، بۆ هەیە ئەو سونەتا بگریت؟ سەعیدی گۆت: بلا دەست ب نەزرێ بکەت بەری سونەتا بگریت، و وەکی ڤێ ژ سولەیمانێ کوڕێ یەساری ژی هاتییە ڤەگوهاستن.**



## الفصل الأول: أعمال الحج وأحكامه

## پشكا ئێكێ: كارێت حەجێ و فەرمانێت وێ

### ١ . باب: فرض الحج وتعليمه عملياً

### بابەتێ: فەرزا حەجێ و فێركرنا وێ ب كریار.

١٩٠١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**أَيُّهَا النَّاسُ! قَدْ فَرَضَ اللهُ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ، فَحُجُّوا**) ، فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟! فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلاَثاً. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ**) . ثُمَّ قَالَ: (**ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ وَاخْتِلاَفِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ؛ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ؛ فَدَعُوهُ**) . [م١٣٣٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ خوتبە بۆ مە خواند، ئینا گۆت: (گەلی مرۆڤان خودێ حەج ل سەر هەوە فەرز كر، هەرنە حەجێ)، ئینا زەلامەكی گۆت: هەرسال ئەی پێغەمبەرێ خودێ ؟ پێغەمبەر بێدەنگ بوو، هەتا سێ جاران گۆتی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر من گۆتبا بەلێ دا واجب بیت و هوین نەدشیان)، پاشی گۆت: (من بهێلن هندی ئەز چو ئەمر و نەهیا ل هەوە نەكەم، ب راستی یێت بەری هەوە گەلەك پرسیاركرنا وان[1] و ژێكجودابوونا وان د گەل پێغەمبەرێت وان ئەو برنە هیلاكێ، ڤێجا هەكە من نەهیا هەوە ژ تشتەكی كر و هوین ژێ دانە پاش خۆ ژێ دویر بێخن و خۆ ژێ بدەنە پاش، و هەكە من ئەمرێ هەوە ب تشتەكی كر هندی هوین ژێ دشێن بكەن).**

١٩٠٢ - (م) عَنْ جَابِرٍ قال: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَرْمِي عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ، وَيَقُولُ: (**لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّي لاَ أَدْرِي لَعَلِّي لاَ أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هَذِهِ**) . [م١٢٩٧].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: رۆژا جەژنێ من پێغەمبەر (ﷺ) ل سەر دەوارێ وی دیت رەجم دكر و دگۆت: (رێكارێت خۆ ژ من وەرگرن ب راستی ئەز نوزانم دبیت پشتی حەجا خۆ ڤێ حەجێ نەكەم).**

---

(١) وەكی پرسیارا وان بۆ دیتنا خودێ و دویچۆنا وان بۆ ڤەكوشتنا چێلێ.

١٩٠٣ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ أَرَادَ الْحَجَّ؛ فَلْيَتَعَجَّلْ) .

[د١٧٣٢/ جه٢٨٨٣/ مي١٨٢٥].

- وزاد ابن ماجه: (فَإِنَّهُ قَدْ يَمْرَضُ الْمَرِيضُ، وَتَضِلُّ الضَّالَّةُ، وَتَعْرِضُ الْحَاجَةُ) .

* حسن.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ حەج بڤێت بلا لەزێ بکەت).**

- **و ئیبن ماجەیی زێدەکرییە: (چونکی دبیت یێ خودێ نەساخی بۆ نڤیسیبیت نەساخ ببیت و یێ بەرزەکرن بۆ نڤیسی بەرزە بکەت و هەوجەیی بۆ بێتە پێش).**

١٩٠٤ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَيْسَ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَعَلَيْهِ حِجَةٌ وَعُمْرَةٌ وَاجِبَتَانِ لا بُدَّ مِنْهُمَا، فَمَنْ زَادَ بَعْدَ ذَلِكَ، خَيْرٌ وَتَطَوُّعٌ. [مه٣٠٦٦/ك١٧٣٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: کەس نینە ئەگەر حەج و عومرەیەك ل سەر واجب نەبن دڤێت بکەت، و هەر کەسێ پاشی ژ ڤێ زێدە بکەت ئەو خێر و سونەتە.**

١٩٠٥ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَيُّمَا صَبِيٍّ حَجَّ ثُمَّ أَدْرَكَ؛ فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ حِجَّةً أُخْرَى، وَأَيُّمَا أَعْرَابِيٍّ حَجَّ ثُمَّ هَاجَرَ؛ فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ حِجَّةً أُخْرَى، وَأَيُّمَا عَبْدٍ حَجَّ ثُمَّ أُعْتِقَ؛ فَعَلَيْهِ أَنْ يَحُجَّ حِجَّةً أُخْرَى) . [مخ٩/٥٣٧، ٥٣٨]

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر زارۆکەکێ حەج کربیت پاشی بالغ ببیت ل سەر وییە ئەو حەجەکا دی بکەت، و هەر کۆچەرە عەرەبەکێ حەج کربیت پاشی مشەخت ببیت ل سەر وییە ئەو حەجەکا دی بکەت، و هەر بەندەیەکێ حەج کربیت پاشی هاتبیتە ئازاکرن، ل سەر وییە ئەو حەجەکا دی بکەت).**

## ٢ ـ باب: فضل الحج والعمرة.

## بابەتێ: خێرا حەج و عومرەیێ.

١٩٠٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ حَجَّ هَذَا الْبَيْتَ، فَلَمْ يَرْفُثْ، ولَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ). [خ١٨١٩ (١٥٢١)/ م١٣٥٠].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(هەر کەسێ حەجێ بکەت، و ئاخفتنێت کرێت و ب گونەهـ نەبێژیت و کریارێت خەلەت نەکەت، دێ ژ حەجا خۆ زڤریت هەروەکی ژ نوی ژ دایکا خۆ بووی).**

١٩٠٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ؛ إِلا الجَنَّةُ) . [خ١٧٧٣/ م١٣٤٩].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(عومرە بۆ عومرێ ژێبرنە بۆ گونەهێت د ناڤبەرا خۆدا و حەجا مەبروور[1] (راست و دورست) چو خەلات نینن بەحەشت نەبیت).**

١٩٠٨ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللهُ فِيهِ عَبْداً مِنَ النَّارِ، مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ. وَإِنَّهُ لَيَدْنُو، ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلاَئِكَةَ، فَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلاءِ)؟. [م١٣٤٨].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(چو رۆژ نینن وەکی رۆژا عەرەفەیێ، خودێ پترین بەندەیان تێدا ژ ئاگری ئازا بکەت و ئەو ژ وان نێزیك دبیت و پاشی ب وان شانازییێ ب سەر ملیاکەتان دبەت و دبێژیت: ئەڤان چ دڤیا)؟**

١٩٠٩ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ) . [ن٢٦٢٩]

* صحيح.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(حەجێ و عومرەیێ دویڤێکرا بکەن، ب راستی ئەو هەردو هەژارییێ و گونەهان ناهێلن کا چاوا کویرهە ژەنگ و ڤرێژا ئاسنی ناهێلیت).**

---

(١) ئانكو: یا دورست هاتییە کرن و خودێ قەبویل کری.

١٩١٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (وَفْدُ اللهِ عزّ وجل ثَلَاثَةٌ: الْغَازِي، وَالْحَاجُّ، وَالْمُعْتَمِرُ). [ن٢٦٢٤].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مێڤانێت خودایێ هەر ب هێز و مەزن سێنە: (خەزاكەر و حەجی و عومرەچی).**

١٩١١ – عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الحَجُّ جِهَادُ كُلِّ ضَعِيف). [جه٢٩٠٢].

* حسن.

[انظر: ٢٠٣٨] .

**ژ ئوم سەلەمەیێ (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (حەج جیهادا هەر لاوازەكییە).**

## ٣ . باب: المواقيت.

### بابەتێ: جهێت گرێدانا ئیحرامان.

١٩١٢ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لأَهْلِ المدِينَةِ ذَا الحُلَيْفَةِ، وَلأَهْلِ الشَّامِ الجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ المَنَازِلِ، وَلأَهْلِ الْيَمْنِ يَلَمْلَمَ، فَهُنَّ لَهُنَّ، وَلِمنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ، لمنْ كَانَ يُرِيدُ الحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمُهَلُّهُ مِنْ أَهْلِهِ، وَكَذَاكَ حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا. [خ١٥٢٦ (١٥٢٤)/ م١١٨١].

- وفي رواية لمسلم: وقال (ﷺ): (هُنَّ لَهُمْ..) .

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ خەلكێ مەدینەیێ زیلحولەیفە[1] و بۆ خەلكێ شامێ جوحفە[2] و بۆ خەلكێ نەجدێ قەرن ئەلمەنازل[3] و بۆ خەلكێ یەمەنێ یەلەملەم[4] وەك جهێ گرێدانا ئیحرامان دەستنیشان كر و ئەو بۆ وانن و بۆ یێت د وێرێرا دهێن نە ژ خەلكێ وێرێ بۆ یێ حەج یان عومرە دڤێت**

---

(١) نەفرۆ دبێژنێ ئەبیار عەلی، و ئەو میقاتا خەلكێ مەدینەیێیە و یێ د وێرێرا دهێت، و دویرترین جهە و میقاتە ژ مەكەهێ (٤٥٠) كلم ژێ دویرە و (١٤) كیلۆمەتران ژ مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) ل مەدینەیێ دویرە.

(٢) دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ مەكەهێ، (١٨٧) كیلۆمەتران ژێ دویرە.

(٣) ئەو جیایەكە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ مەكەهێ هنداڤ عەرەفێ، (٩٤) كیلۆمەتران ژ مەكەهێ دویرە.

(٤) ئەو جیایەكە دكەڤیتە باشوورێ مەكەهێ، (٥٤) كیلۆمەتران ژێ دویرە.

**و هەر كەسێ بەری ڤان جهان بیت جهێ وی یێ گرێدانا ئیحرامان ژ مالا وییە، و هەروەسا هەتا خەلكێ مەكەهێ ژ وێرێ دێ ئیحرامان گرێدەن).**

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەو جهـ بۆ وانن....).**

١٩١٣ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا فُتِحَ هذَانِ الْمِصْرَانِ، أَتَوْا عُمَرَ، فَقَالُوا: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ! إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) حَدَّ لأَهْلِ نَجْدٍ قَرْناً، وَهُوَ جَوْرٌ عَنْ طَرِيقِنَا، وَإِنَّا إِنْ أَرَدْنَا قَرْناً شَقَّ عَلَيْنَا. قَالَ: فَانْظُرُوا حَذْوَهَا مِنْ طَرِيقِكُمْ، فَحَدَّ لَهُمْ ذَاتَ عِرْقٍ. [خ١٥٣١]

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ ئەڤ هەردو باژێرە[1] هاتینە ڤەكرن هاتنە دەڤ عومەری، و گۆتن ئەی میرێ باوەریداران پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) قەرن بۆ خەلكێ نەجدێ وەك جهێ گرێدانا ئیحرامان دەستنیشان كر، و ئەو یا خوارە ل سەر رێكا مە، و ئەگەر مە ڤیا رێكا قەرن بگرین بۆ مە ب زەحمەت دكەڤیت، ئینا گۆت بەرێ خۆ بدەنە ئێكا راستا وێ ل سەر رێكا خۆ، ئینا زاتە عیرق[2] بۆ وان دەستنیشان كر.**

١٩١٤ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لا يُحْرِمُ بِالحَجِّ إِلاَّ في أَشْهُرِ الحَجِّ، فَإِنَّ مِنْ سُنَّةِ الحَجِّ أَنْ تُحْرِمَ بِالحَجِّ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ. [مه ٢٥٩٦/ك١٦٤٢]

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئیحرام بۆ حەجێ ناهێنە گرێدان د هەیڤێت حەجێدا نەبن[3] و ب راستی ژ رێكارا حەجێ ئەوە، حەج د هەیڤێت حەجێدا بێتە كرن.**

## ٤ ـ باب: لباس المحرم وما يباح له فعله.

## بابەتێ: جلكێت ئیحرامگری و كا چ بۆ وی دورستە بكەت.

١٩١٥ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ قَالَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): (لا يَلْبَسُ الْقُمُصَ، وَلاَ الْعَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ

---

(١) مەبەست پێ بەسرە و كووفەنە.

(٢) دكەڤیتە باكوورێ مەكەهێ، (١١٠) كیلۆمەتران ژێ دویرە.

(٣) ئەو ژی ئەڤەنە: شەوال و زیلقەعیدە و زیلحیجەیە.

الْبَرَانِسَ، وَلاَ الْخِفَافَ؛ إِلاَّ أَحَدٌ لاَ يَجِدُ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئاً مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ، أَوْ وَرْسٌ) . [خ١٥٤٢ (١٣٤)/ م١١٧٧].

- وفي رواية للبخاري: (ولا تَنْتَقِبِ المرأةُ المحرِمَةُ، وَلاَ تَلْبَسِ القُفَّازَيْنِ) . [خ١٨٣٨].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئیحرامگر چ ژ جلكان ب كەتە بەر خۆ؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نە قەمیسان و نە شاشكان و نە شەلوالان و نە خۆففان ناكەتێ، ئەو نەبیت یێ شمك نەبن بلا خوففان بكەتێ و بلا د بن هەردو گۆزەكانڕا ببڕیت، و چو ژ جلكان نەكەنێ زەعفران[1] یان وەرس[2] پێدا كربیت).**

- **و د ڤەگێڕا بوخاریدا: (و ژنا ئیحرامگر پێچێ ناگرێدەت و دەزگۆركان ناكەتێ).**

١٩١٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَخْطُبُ بِعَرَفَاتٍ: (مَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ؛ فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَاراً؛ فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ لِلْمُحْرِمِ).[خ١٨٤١ (١٧٤٠)/ م١١٧٨].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) خوتبە ل عەرەفاتێ دخواند دگۆت: (یێ شمك نەدیتن بكەتێ بلا خوففان بكەتێ، و یێ ئیزار پارچا ناڤتەنگێ پێدا نەدیت بلا شەلوالی بكەتێ بۆ ئیحرامگری).**

**٥ ـ باب: الاغتسال للمحرم.**

**بابەتێ: سەرشویشتنێ بۆ ئیحرامگری.**

١٩١٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُنَيْنٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ الْعَبَّاسِ وَالمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ اخْتَلَفَا بِالأَبْوَاءِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبَّاسٍ: يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، وَقَالَ الْمِسْوَرُ: لاَ يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، فَأَرْسَلَنِي عَبْدُ اللهِ بْنُ الْعَبَّاسِ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصارِيِّ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ، وَهُوَ يُسْتَرُ بِثَوبٍ، فَسَلَّمتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَنْ هذَا؟ فَقُلْتُ: أَنَا عَبْدُ اللهِ بنُ حُنَينٍ، أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ عَبْدُ اللهِ بنُ العَبَّاسِ، أَسْأَلُكَ كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ فَوَضَعَ أَبُو أَيُوبَ يَدَهُ عَلَى الثَّوبِ فَطَأْطَأَهُ حَتَّى بَدَا لِي رَأْسُهُ، ثُمَّ قَالَ لإِنْسَانٍ يَصُبُّ عَلَيْهِ: اصْبُبْ، فَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُهُ (ﷺ) يَفْعَلُ. [خ١٨٤٠/ م١٢٠٥]

---

(١) گیایەكێ بێهنخۆشە و بۆیاغ پێ دهێتە كرن.

(٢) گیایەكێ زەرە و بێهنخۆشە و بۆیاغ پێ دهێتە كرن.

ژ عەبدوللایێ كورێ حونەینی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: عەبدوللایێ كورێ عەباسی و میسوەرێ كورێ مەخرەمەیی ل ئەبوائێ ژێك جودا بوون، عەبدوللایێ كورێ عەباسی گۆت: ئیحرامگر دێ سەرێ خۆ شۆت، و میسوەرێی گۆت: ئیحرامگر سەرێ خۆ ناشۆت: ئینا عەبدوللایێ كورێ عەباسی ئەز هنارتمە دەڤ ئەبی ئەیووبێ ئەنساری، من دیت یێ د ناڤبەرا دو شەقلاندا سەرێ خۆ دشۆت و وی خۆ ب پاتەكی دپاراست، من سلاڤ كرێ ئینا گۆت: ئەو كییە؟ من گۆت: ئەز عەبدوللایێ كورێ حونەینیمە، عەبدوللایێ كورێ عەباسی ئەز یێ ڤرێكریمە دەڤ تە، پرسیارێ ژ تە بكەم پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سەرێ خۆ دشویشت و ئەو ئیحرامگر؟ ئینا ئەبو ئەیووبی دەستێ خۆ دانا سەر وی پاتەی و چەماند هەتا سەرێ وی بۆ من دەركەفتی، پاشی گۆتە مرۆڤەكی ئاڤ لێ دكر، ئاڤێ ل من بكە، ئاڤ ل سەرێ وی كر، پاشی دەستێ خۆ ب سەرێ خۆدا ئینا و بر بۆ سینگی و پشتێ و گۆت: هۆسا من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت دكر.

## ٦ ـ باب: مداواة المحرم عينه.

## بابەتێ: ئیحرامگر چاڤێ خۆ دەرمان بكەت.

١٩١٨ - (م) عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ أَبَانَ بنِ عُثْمَانَ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِمَلَلٍ، اشْتَكَى عُمَرُ بنُ عُبَيْدِ اللهِ عَيْنَيْهِ. فَلَمَّا كُنَّا بِالرَّوْحَاءِ اشْتَدَّ وَجَعُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبَانِ بنِ عُثْمَانَ يَسْأَلُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ أَنِ اضْمِدْهُمَا بِالصَّبِرِ، فَإِنَّ عُثْمَانَ رضي الله عنه حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فِي الرَّجُلِ إِذا اشْتَكَى عَيْنَيْهِ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، ضَمَّدَهُمَا بِالصَّبِرِ. [م١٢٠٤].

ژ نوبەیهێ كورێ وەهبی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: ئەم د گەل ئەبانێ كورێ عوسمانی دەركەفتین هەتا گەهشتینە مەلەل[١] چاڤێت عومەرێ كورێ عەبدوللایی ئێشیان، ڤێجا دەمێ ئەم گەهشتینە ڕەوحائێ[٢] ئێشانا وان دژوار بوو، ڤرێكرە دەڤ ئەبانێ كورێ عوسمانی پرسیارێ ژێ بكەت، بەرسڤ بۆ هنارت ب شینكاتییا سەبرێ[٣] دەرمان بكە،

---

(١) جهەكە دكەڤیتە ڕۆژئاڤایێ مەدینەیێ، (٥٠) كلم ژێ دویرە.

(٢) جهەكە دكەڤیتە د ناڤبەرا مەكەهێ و مەدینەییدا، (٨٠) كلم ژ مەدینەیێ دویرە.

(٣) سەبر: شینكاتییەكە دبێژنێ: هژیرا كویفی، یا تەحلە، ڤێجا چ بەلگێ وێ داننە سەر چاڤی یان ئاڤا وی بكەنە چاڤی یان د گەل ئاڤێ تێكەل بكەن و بكەنە چاڤی وەك قەترێ.

**چونكی عوسمانی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەگوهاستییە بەحسێ زەلامەكی د كر چاڤێ وی ئێشا و ئەو د ئیحراماندا بوو، گۆتێ ب شینكاتییا سەبر دەرمان بكە.**

## ٧ ـ باب: اشتراط المحرم التحلل بعذر.

### بابەتێ: مەرجكرنا ئیحرامگری ب دەستویرییەكێ ژ ئیحرامان دەركەڤیت.

١٩١٩ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ لَهَا: (**لَعَلَّكِ أَرَدْتِ الحَجَّ**)؟ قَالَتْ: وَاللهِ! لاَ أَجِدُنِي إِلاَّ وَجِعَةً، فَقَالَ لَهَا: (**حُجِّي وَاشْتَرِطِي، قُولِي: اللَّهُمَّ! مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي**) . وَكَانَتْ تَحْتَ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ. [خ٥٠٨٩/ م١٢٠٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ زوباعەیا كچا زوبەیری، ئینا گۆتێ: (بەلكی تە دڤێت بچییە حەجێ). گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەز یا نەخۆشم و دئێشم ئینا گۆتێ: (حەجێ بكە و مەرجی بگرە، بێژە: یا خودێ جهێ ئەز ژ ئیحرامان دەركەڤم ئەو جهە یێ من لێ رادگری[1]) و ئەو هەڤژینا میقدادێ كوڕێ ئەسوەد بوو.**

## ٨ ـ باب: إحرام النفساء والحائض.

### بابەتێ: ئیحرام گرێدانا ژنا د چلكاندا و یا د بێنڤێژییێدا.

١٩٢٠ - عَنْ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّهُ خَرَجَ حَاجّاً مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حَجَّةَ الْوَدَاعِ، وَمَعَهُ امْرَأَتُهُ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ الْخَثْعَمِيَّةُ، فَلَمَّا كَانُوا بِذِي الْحُلَيْفَةِ، وَلَدَتْ أَسْمَاءُ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَتَى أَبُو بَكْرٍ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَخْبَرَهُ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ يَأْمُرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ، ثُمَّ تُهِلَّ بِالْحَجِّ وَتَصْنَعَ مَا يَصْنَعُ النَّاسُ؛ إِلاَّ أَنَّهَا لاَ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ. [ن٢٦٦٣/ جه٢٩١٢]

* صحيح.

**ژ ئەبی بەكری (رضي الله عنه) گۆت: ئەو سالا حەجا خاترخواستنێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە حەجێ و هەڤژینا وی ئەسمائا كچا عومەیسێ خەسعەمی ژی د گەل بوو، ڤێجا دەمێ گەهشتینە زیلحولەیفەیێ ئەسمائێ موحەممەدێ كوڕێ ئەبوبەكری بوو، ئینا ئەبوبەكر هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و بۆ گۆت: ئینا پێغەمبەری (ﷺ) فەرمانا وی**

[1] نازار و نەخۆشی نەهێلیت ئەز بەردەوامییێ بدەمە حەجێ.

کر ئەو فەرمانا وێ بکەت سەرێ خۆ بشۆت پاشی دەست ب چۆنا حەجێ بکەت (ئانکو ئنیەتێ بینیت) و دێ وێ کەت یا خەلك دکەت بەلێ ئەو تەوافێ ناکەت.

**٩ ـ باب: الطيب وترجيل الشعر عند الإحرام.**

**بابەتێ: بێهنخۆشی و سەرشەکرنێ د ئیحرامێدا.**

١٩٢١ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لإِحْرَامِهِ حِينَ يُحْرِمُ، وَلِحِلِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ. [خ١٥٣٩/ م١١٨٩ و١١٩١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: من بێهنخۆشی ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ددا بۆ ئیحراما وی دەمێ ئیحرام گرێدا، و هەروەسا دەمێ ژ ئیحرامان دەردکەفت بەری تەواف ل دۆر کەعبێ کربا.**

١٩٢٢ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ، فِي مَفْرِقِ النَّبِيِّ (ﷺ) وَهُوَ مُحْرِمٌ.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: هەروەکی ئەز یا بەرێ خۆ ددەمە برسقینا بێهنخۆشییا پێغەمبەری (ﷺ) ل سەر سەرێ وی و ئەو د ئیحرامێدا بوو.**

١٩٢٣ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنَّا نَخْرُجُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى مَكَّةَ، فَنُضَمِّدُ جِبَاهَنَا بِالسُّكِّ الْمُطَيَّبِ عِنْدَ الإِحْرَامِ، فَإِذَا عَرِقَتْ إِحْدَانَا سَالَ عَلَى وَجْهِهَا، فَيَرَاهُ النَّبِيُّ (ﷺ) فَلاَ يَنْهَاهَا. [د١٨٣٠].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دچۆینە مەکەهێ، مە د گەل ئیحرامان ناڤچاڤێت خۆ ب بێهنخۆشییا مسکێ دوهن ددا، و ئەگەر ئێکی ژ مە خوهێ دابا ئەو ب ناڤچاڤێت وێ دهاتە خوارێ و پێغەمبەری (ﷺ) ئەم ددیتین و ئەم ژێ نەددداینە پاش.**

**١٠ ـ باب: الحجامة والحلق للمحرم وبيان الفدية.**

**بابەتێ: حوجامەیێ و تراشتنێ بۆ ئیحرامگری و دیارکرنا فیدیێ.**

١٩٢٤ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ مُحْرِمٌ. [خ١٨٣٥/ م١٢٠٢]

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حوجام بۆ خۆ چێ کر و ئەو د ئیحرامێدا بوو.**

١٩٢٥ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مَعْقِلٍ قَالَ: قَعَدْتُ إِلَى كَعْبِ بنِ عُجْرَةَ فِي هذَا المسْجِدِ ـ يَعْنِي: مَسْجِدَ الكُوْفَةِ ـ فَسَأَلْتُهُ عَنْ: ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ﴾[البقرة: ١٩٦] ؟ فَقَالَ: حُمِلْتُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي، فَقَالَ: **(مَا كُنْتُ أُرَى أَنَّ الجَهْدَ قَدْ بَلَغَ بِكَ هَذَا، أَمَا تَجِدُ شَاةً)** ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: **(صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ لِكُلِّ مِسْكِينٍ نِصْفُ صَاعٍ مِنْ طَعَامٍ، وَاحْلِقْ رَأْسَكَ)** . فَنَزَلَتْ فِيَّ خَاصَّةً، وَهِيَ لَكُمْ عامَّةً. [خ٤٥١٧ (١٨١٤)/ م١٢٠١].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەعقیلی گۆت: ئەز ل دەڤ كەعبێ كوڕێ عوجرەیی ل ڤێ مزگەفتێ روینشتم ـ ئانكو مزگەفتا كووفەیێ ـ من پرسیارا ڤێ ئایەتێ ژێ كر ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ﴾؟ ئینا گۆت: ئەز برمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و سپیە ب ناڤچاڤێت مندا دهاتنە خوار، ئینا گۆت: (من نەدزانی سەروبەرێ تە ب ڤی رەنگییە، تە پەزەك هەیە)؟ من گۆت: نەخێر، گۆت: (سێ رۆژان ب رۆژیبە، یان خوارنێ بدە شەش بەلنگازان هەر ئێكی نیڤ منا خوارنێ، و سەرێ خۆ بتراشە) و ئەو ئایەت تایبەت د راستا مندا هاتە خوارێ و بۆ هەوە ب گشتییە.**

١٩٢٦ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِهِ شَيْئاً أَوْ تَرَكَهُ؛ فَلْيُهْرِقْ دَماً. قَالَ أَيُّوبُ: لاَ أَدْرِي، قَالَ: تَرَكَ أَوْ نَسِيَ. [ط٩٥٧].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەباسی (رضي الله عنهما) گۆت: هەر كەسێ تشتەك ژ رێكارێت خۆ یێت حەجێ ژبیركرن یان هێلان بلا پەزەكێ ڤەكوژیت.**

**ئەیووبی گۆت: ئەز نوزانم، گۆت: هێلا یان ژبیر كر.**

١٩٢٧ - عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: الصِّيَامُ لِمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، لِمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْياً، مَا بَيْنَ أَنْ يُهِلَّ بِالْحَجِّ إِلَى يَوْمِ عَرَفَةَ، فَإِنْ لَمْ يَصُمْ صَامَ أَيَّامَ مِنًى. [ط٩٧٢].

* إسناده صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) دایكا باوەریداران وێ دگۆت: رۆژیگرتن بۆ وییە یێ خۆشی ب عومرێ بربیت هەتا حەجێ و قوربان نەبیت بدەت ژ وی دەمێ ئنیەتا حەجێ ئینایی هەتا رۆژا عەرەفەیێ و ئەگەر نەگرتبیت رۆژێت مینایێ دێ ب رۆژی بیت.**

## ١١ ـ باب: تحريم الصيد على المحرم.

## بابەتێ: حەرامکرنا نێچیرێ ل سەر ئیحرامگری.

١٩٢٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: انْطَلَقَ أَبِي عَامَ الحُدَيْبِيَةِ، فَأَحْرَمَ أَصْحَابُهُ وَلَمْ يُحْرِمْ، وَحُدِّثَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنَّ عَدُوّاً يَغْزُوهُ بِغَيْقَةَ، فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَبَيْنَمَا أَنَا مَعَ أَصْحَابِهِ يَضْحَكُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا أَنَا بِحِمَارِ وَحْشٍ، فَحَمَلْتُ عَلَيْهِ فَطَعَنْتُهُ فَأَثْبَتُّهُ، وَاسْتَعَنْتُ بِهِمْ فَأَبَوْا أَنْ يُعِينُونِي، فَأَكَلْنَا مِنْ لَحْمِهِ، وَخَشِينَا أَنْ نُقْتَطَعَ، فَطَلَبْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، أَرْفَعُ فَرَسِي شَأْواً وَأَسِيرُ شَأْواً، فَلَقِيتُ رَجُلاً مِنْ بَنِي غِفَارٍ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ قُلْتُ: أَيْنَ تَرَكْتَ النَّبِيَّ (ﷺ)؟ قَالَ: تَرَكْتُهُ بِتَعْهَنَ، وَهوَ قَائِلٌ السُّقْيَا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَهْلَكَ يَقْرَؤُونَ عَلَيْكَ السَّلاَمَ وَرَحْمَةَ الله، إِنَّهُمْ قَدْ خَشُوا أَنْ يُقْتَطَعُوا دُونَكَ فَانْتَظِرْهُمْ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَصَبْتُ حِمَارَ وَحْشٍ، وَعِنْدِي مِنْهُ فاضِلَةٌ؟ فَقَالَ لِلْقَوْمِ: **(كُلُوا)**، وَهُمْ مُحْرِمُونَ. [خ١٨٢١/ م١١٩٦].

**ژ عەبدوللایێ کورێ ئەبی قەتادەیی (رضي الله عنه) گۆت: بابێ من سالا حودەیبییێ دەرکەفت، هەڤالێت وی ئیحرام گرێدان و وی نەگرێدان، و بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە گۆتن دژمنەك ل غیقەیێ[١] دێ هێرشێ کەتە وان، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) دا رێ و چۆ، و د دەمەکێدا ئەز د گەل هەڤالێت وی بووم هندەکان بۆ هندەکان دکرە کەنی، من هۆ بەرێ خۆ دایێ من کەرەکێ کویڤی دیت، من ب سەردا گرت و دربەك دانایێ و ئێخست، و من هاریکاری ژ وان خواست نەڤیان هاریکارییا من بکەن، ئینا مە ژ گۆشتێ وێ خوار، و ئەم ترسیاین ژ پێغەمبەری (ﷺ) ڤەقەتین، ئینا ئەز د دویف پێغەمبەریڕا (ﷺ) چۆم، هندەك جاران من هەسپێ خۆ رادکرە غارێ، و هندەك جاران ژی هێدی دچۆم، ئینا نیڤا شەڤێ من زەلامەك ژ بەنی غیفار دیت، من گۆتێ: تە پێغەمبەر (ﷺ) ل کیرێ هێلایە؟ گۆت: من ل تەغهون یێ هێلایی[٢] و ئەو دێ ل سەقیا قەیلوولێ کەت، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ هەڤالێت تە سلاڤ و دلۆڤانی بۆ تە هەبوون، و ئەو دترسن ژ تە ڤەقەتن ڤێجا خۆ ل هیڤییا وان بگرە، و من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من کەرەکێ**

---

(١) جهەکە د ناڤبەرا مەکەهێ و مەدینەیێدا.

(٢) کانییەکا ناڤێیە، سێ میلان ژ سەقیایێ دویرە.

**كویڤی یێ نێچیر كری، و هندەك ژێ یێ ل دەڤ من مای؟ ئینا گۆتە ئەوێت د گەل خۆ: (بخۆن) و ئەم د ئیحرامانـدا بووین.**

١٩٢٩ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَهْدَى الصَّعْبُ بنُ جَثَّامَةَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) حِمَارَ وَحْشٍ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: (**لَوْلا أَنَّا مُحْرِمُونَ، لَقَبِلْنَاهُ مِنْكَ**).[م١١٩٤].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: سەعبێ كورێ جوسامەیی كەرەكێ كویڤی دیاری پێشكێشی پێغەمبەری (ﷺ) كر و ئەو د ئیحرامانـدا بوو، بۆ زڤراندەڤە، و گۆت: (ئەگەر ئەم د ئیحرامانـدا نەباین دا ژ تە وەرگرم).**

## ١٢ . باب: تقليد الهدي وإشعاره عند الإحرام.

## بابەتێ: هەلاویستنا تشتەكی ب ستۆیێ قوربانیڤە و نیشانكرنا وی د گرێدانا ئیحرامانـدا.

١٩٣٠ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الظُّهْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، ثُمَّ دَعَا بِنَاقَتِهِ فَأَشْعَرَهَا فِي صَفْحَةِ سَنَامِهَا الأَيْمَنِ، وَسَلَتَ الدَّمَ، وَقَلَّدَهَا نَعْلَيْنِ، ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتَهُ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ، أَهَلَّ بَالحَجِّ. [م١٢٤٣].

- زاد في رواية للنسائي: وَأَحْرَمَ عِنْدَ الظُّهْرِ، وَأَهَلَّ بِالْحَجِّ.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا نیڤرۆ ل زیلحولەیفە كر، پاشی داخوازا حێشترا خۆ كر و رەخێ راستێ یێ گومبەتكێ پشتا وێ بریندار كر و خوین ڤێدا هات، و دو نەعل كرنە ستۆیی، پاشی ل حێشترا خۆ سویار بوو، ڤێجا دەمێ حێشترا وی یا بەیداء ب وی رابوویەڤە، ئنیەتا حەجێ ئینا.**

- **و د ڤەگێرەكا نەسائیدا زێدە كرییە: نیڤرۆ ئیحرام گرێدان و دەست ب حەجێ كر.**

١٩٣١ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: فَتَلْتُ قَلائِدَ هَدْيِ النَّبِيِّ (ﷺ)، ثُمَّ أَشْعَرَهَا وَقَلَّدَهَا، أَوْ قَلَّدْتُهَا، ثُمَّ بَعَثَ بِهَا إِلَى الْبَيْتِ، وَأَقَامَ بِالمَدِينَةِ، فَمَا حَرُمَ عَلَيْهِ شَيْءٌ كَانَ لَهُ حِلٌّ.[خ١٦٩٩ (١٦٩٦)/ م١٣٢١].

وفي رواية لهما: ثُمَّ قَلَّدَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِيَدِيه، ثُمَّ بَعَثَ بِهَا مَعَ أَبِي. [خ٢٣١٧]

ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: من رستك[1] بۆ قوربانێت پێغەمبەری (ﷺ) دورست دكرن، پاشی وی جەلخاندن دا خوین پێدا بهێت و كرنە ستۆیێ وان یان وێ كرنە ستۆیێت وان، پاشی هنارتنە مەكەهێ و ما ل مەدینەیێ و چو تشت ل سەر خۆ حەرام نەكرن ژ ئەوێت بۆ وی حەلال.

و د ڤەگێرەكا واندا: پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب دەستێت خۆ ب ستۆیێت وانڤە كرن و پاشی د گەل بابێ من هنارتن.

## ١٣ ـ باب: ما يفعل بالهدي إذا عطب.

## بابەتێ: دێ چ ل قوربانی كەت ئەگەر بێچارە ببیت.

١٩٣٢ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ ذُؤَيْباً أَبَا قَبِيصَةَ حَدَّثَهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَبْعَثُ مَعَهُ بِالْبُدْنِ، ثُمَّ يَقُولُ: **(إِنْ عَطِبَ مِنْهَا شَيْءٌ، فَخَشِيتَ عَلَيْهِ مَوْتاً، فَانْحَرْهَا. ثُمَّ اغْمِسْ نَعْلَهَا فِي دَمِهَا، ثُمَّ اضْرِبْ بِهِ صَفْحَتَهَا، وَلاَ تَطْعَمْهَا أَنْتَ وَلاَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ رُفْقَتِكَ)**. [م١٣٢٦].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) زوئەیبێ بابێ قەبیسەیی گۆتە وی: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) قوربان د گەل وی دهنارتن پاشی دگۆت: **(ئەگەر ئێك ژ وان بێچارە بوو و ترسیای بمریت سەرژێ بكە، پاشی نەعلێت وێ[2] د خوینا وێ بهەلینە پاشی د تەنشتا وێ بدە و چو ژێ نەخۆ و چو ژێ نەدە خەلكێ د گەل خۆ)**.

## ١٤ ـ باب: جواز ركوب البُدن المهداة.

## بابەتێ: دورستییا سویاربوونا ل حێشترا بۆ قوربانی دەستنیشان كری.

١٩٣٣ - (م) عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بنَ عَبْدِ اللهِ سُئِلَ عَنْ رُكُوبِ الْهَدْيِ؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(ارْكَبْهَا بِالْمَعْرُوفِ إِذَا أُلْجِئْتَ إِلَيْهَا، حَتَّى تَجِدَ ظَهْراً)**. [م١٣٢٤].

ژ بابێ زوبەیری گۆت: من گوه ل جابرێ كورێ عەبدوللایی بوو پرسیارا سویاربوونا قوربانی ژێ هاتە كرن؟ ئینا گۆت من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: **(ب چاكی لێ سویار ببە، ئەگەر تو نەچار بووی، هەتا تو دەوارەكی بۆ خۆ دبینی)**.

---

(١) ژ هریێ و رەنگا و رەنگ دهاتنە بادان و رێسان و ب ستۆیێ قوربانانڤە دكرن دا ببیتە نیشان نەڤ گیانەوەرە بۆ قوربانی دەستنیشانكرینە.

(٢) نەڤێت د ستۆیێ ویدا.

## ١٥ . باب: الإهلال (الإحرام).

## بابەتێ: گرێدانا ئیحرامان.

١٩٣٤ - (خ) عَنْ جَابِرِ بنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ إِهْلاَلَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مِنْ ذِي الحُلَيْفَةِ، حِينَ اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ. [خ١٥١٥].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) چۆنا چۆنە د ئیحرامانڤدا و ئینانا ئنیەتا حەجا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ زیلحولەیفە بوو، دەمێ دەوارێ وی ب ویڤە رابووی.**

١٩٣٥ - (خ) عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: إِذَا أَرَادَ الخُرُوجَ إِلَى مَكَّةَ ادَّهَنَ بِدُهْنٍ لَيْسَ لَهُ رَائِحَةٌ طَيِّبَةٌ، ثُمَّ يَأْتِي مَسْجِدَ ذِي الْحُلَيْفَةِ فَيُصَلِّي، ثُمَّ يَرْكَبُ، وَإِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةً أَحْرَمَ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَفْعَلُ. [خ١٥٥٤ (١٥٥٣)].

**ژ نافعی (رەحمەتلێبیت) گۆت: ئیبن عومەر (خودێ ژ وان رازی بیت) ئەگەر ڤیابا بۆ مەكەهێ دەركەڤیت دوهنەك د خۆ ددا بێهن نەی، پاشی دهاتە مزگەفتا زیلحولەیفە و نڤێژ دكر، پاشی سوار دبوو و دەمێ حێشترا وی ب ویڤە راستببا ئنیەت دئینا، پاشی گۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) دیت ئەڤە دكر.**

١٩٣٦ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَنَحْنُ مَعَهُ، بِالمدِينَةِ الظُّهْرَ أَرْبَعاً، وَالْعَصْرَ بِذِي الحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ بَاتَ بِهَا حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ، حَمِدَ اللهَ وَسَبَّحَ وَكَبَّرَ، ثُمَّ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهِمَا، فَلَمَّا قَدِمْنَا، أَمَرَ النَّاسَ فَحَلُّوا، حَتَّى كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ أَهَلُّوا بالحَجِّ. قَالَ: وَنَحَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) بَدَنَاتٍ بِيَدِهِ قِيَاماً، وَذَبَحَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِالمدِينَةِ كَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ. [خ١٥٥١ (١٠٨٩)].

**ژ ئەنەسی (رەحمەتلێبیت) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ)، نڤێژا نیڤرۆ ل مەدینەیێ چوار ركعەت و ل زیلحولەیفە دو ركعەت كرن، پاشی ب شەڤ ل وێرێ ما هەتا بوویە سپێدە، پاشی سوار بوو هەتا ل بەیداء ب ویڤە رابووی حەمدا خودێ كر، و تەسبیح كر، و تەكبیر كر، پاشی ئنەتا حەجێ و عومرێ ئینا، و خەلكی ژی ئنیەت ب وان هەردوكان ئینا، ڤێجا دەمێ ئەم گەهشتین فەرمانا خەلكی كر (پشتی عومرە كرین) ژ ئیحرامان دەركەڤن، هەتا بوویە رۆژا هەشتێ، رۆژا تەروییێ ل جهێت خۆ ئنیەتا حەجێ**

**ئینان، و گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هندە حێشتر ل سەر پیان ب دەستێت خۆ ڤەكوشتن، و ل مەدینەیێ ژی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دو بەرانێت سپیتالە سەرژێكرن.**

## ١٦ ـ باب: التلبية.

## بابەتێ: تەلبییێ.

١٩٣٧ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: إِنِّي لأَعْلَمُ كَيْفَ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُلَبِّي: (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ**). [خ١٥٥٠].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەز دزانم پێغەمبەری (ﷺ) تەلبییە چەوا دكر، گۆت: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ).**

**رامان: بەرسڤدان دویڤ بەرسڤدانێ بۆ گازییا تە ئەی خودایێ من (ئەڤە ئەز بەر ب ئەمرێ تەڤە هاتم، ئەی خودا، ئەو تشتێ تو دبێژی ئەڤە ئەز هاتم ب جھ بینم، بەرسڤدان بۆ گازییا تە چو شریك و هەڤپشك بۆ تە نینن، ب راستی پەسن و سوپاسی هەر بۆ تەیە، و نیعمەت هەمی ل دەڤ تەنە و یێت تەنە).**

١٩٣٨ - عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**جَاءَنِي جِبْرِيلُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! مُرْ أَصْحَابَكَ فَلْيَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ، فَإِنَّهَا مِنْ شِعَارِ الْحَجِّ**). [جه٢٩٢٣].

* صحيح.

**ژ زەیدێ كورێ خالدێ جوهەنی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جبریل هاتە دەڤ من، ئینا گۆت: ئەی موحەممەد فەرمانێ ل هەڤالێت خۆ بكە بلا دەنگێ خۆ ب تەلبییێ بلند بكەن، چونكی ب راستی ئەو ژ دروشمێت حەجێیە).**

## ١٧ ـ باب: التمتع[1] (أحد وجوه الإحرام).

## بابەتێ: خۆشیبرن ئێك ژ رەنگێت گرێدانا ئیحرامایە.

١٩٣٩ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَأَهْلَلْنَا بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُهِلَّ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ لاَ يَحِلَّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعاً)**. فَقَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذٰلِكَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: **(انْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي، وَأَهْلِي بِالحَجِّ، وَدَعِي الْعُمْرَةَ)**. ففَعَلْتُ، فَلَمَّا قَضَيْنَا الحَجَّ، أَرْسَلَنِي النَّبِيُّ (ﷺ) مَعَ عَبْدِ الرحمنِ بنِ أَبِي بَكْرٍ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَاعْتَمَرْتُ، فَقَالَ: **(هٰذِهِ مَكَانَ عُمْرَتِكِ)**.

قَالَتْ: فَطَافَ الَّذِينَ كَانُوا أَهَلُّوا بِالْعُمْرَةِ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ ثُمَّ حَلُّوا، ثُمَّ طَافُوا طَوَافاً وَاحِداً بَعْدَ أَنْ رَجَعُوا مِنْ مِنى، وأَمَّا الَّذِينَ جَمَعُوا الحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَإِنَّمَا طَافُوا طَوَافاً وَاحِداً.[خ١٥٥٦ (٢٩٤)/ م١٢١١].

- وفي رواية لهما: وأهلَّ رسول الله (ﷺ) بالحَجِّ. [خ١٥٦٢].
- وفي رواية لهما أيضاً: قَالَتْ: خَرَجْنَا مُوَافِينَ لِهِلاَلِ ذِي الْحِجَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهْلِلْ، فَإِنِّي لَوْلاَ أَنِّي أَهْدَيْتُ لأَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ)**. فَأَهَلَّ بَعْضُهُمْ بِعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ بَعْضُهُمْ بِحَجٍّ. [خ٣١٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: سالا حەجا خاترخواستنێ ئەم د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دەرکەفتین، مە دست ب عومرێ کر (ئانکو: مە ئنیەتا عومرێ ئینا) پاشی پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ قوربان د گەل بیت بلا ئنیەتا حەج و عومرێ بینیت پاشی ژ ئیحرامان دەرنەکەڤیت هەتا هەردوکان هەمییێ تمام دکەت) ئەز هاتمە مەکەهێ و ئەز یا بێنڤێژ بووم، و من نە تەواف ل دۆر کەعبێ کر و نە د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا، من گازندا خۆ بۆ پێغەمبەرێ خودێ کر (ﷺ) ئینا گۆت: (پرچا خۆ**

---

(١) حەجا تەمەتوع نەڤەیە: بەروەخت بزییە مەکەهێ بەری رۆژا هەشتێ ژ دەهکان ب چار پێنج رۆژەکان، یان سەرێ دەهکان یان رۆژا دووێ یان رۆژا سێیێ، و دەست ب عومرێ بکەی و ب دویماهی بینی، دەست ب تەوافێ بکەی حەفت جاران ل دۆر کەعبێ بزڤری، پاشی قەستا سەفا و مەروایێ بکەی، حەفت جاران د ناڤبەرا واندا بێی و بچی، دەست ب سەعفایێ بکەی و مەروایێ ب دویماهی بینی، پاشی سەرێ خۆ کورت بکەی یان بتراشی، و ژ ئیحرامان دەرکەڤی و بێهنا خۆ بدەی هەتا دبیتە رۆژا هەشتێ ژ دەهکان، کو دبێژنێ رۆژا تەروییێ، دێ ئیحرامێت خۆ ل جهێ تو لێ کەیە بەر خۆ و قەستا مینایێ کەی، و هۆسا دێ حەجا خۆ بەیە سەری.

**ڤەكە، و خۆ شەكە و ئنیەتا حەجێ بینە و عومرێ بهێلە)** ئینا من ئەو كر، ڤێجا دەمێ مە حەج ب دویماهی ئینایی پێغەمبەری (ﷺ) ئەز د گەل عەبدولرەحمانێ كورێ ئەبوبەكری هنارتمە تەنعیمێ و من عومرە كر و گۆت: **(ئەڤ عومرە شوینا عومرا تەیە)**.

گۆت: ئینا ئەوێت ئنیەتا عومرێ ئینایین تەواف ل دۆر كەعبێ و د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا كرن، پاشی ژ ئیحرامان دەركەفتن، پاشی وان پشتی ل مینایێ زڤرین تەوافەك تنێ كرن، بەلێ ئەوێت حەج و عومرە د گەلێك كۆم كرین وان تەوافەك تنێ كرن.

- و د ڤەگێرەكا واندا: و پێغەمبەری (ﷺ) ئنیەتا حەجێ ئینابوو.
- و د ڤەگێرەكا واندا دیسا: گۆت: ئەم ل دەستپێكا شەڤا ئێكێ ل زیلحیجەیێ دەركەفتین، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ بڤێت دەست ب عومرێ بكەت بلا پێ دەست پێ بكەت، ب راستی ئەگەر من قوربان د گەل خۆ نەئینابا دا دەست ب عومرێ كەم)**، ئینا هندەكان ئنیەتا عومرێ ئینان و هندەكان ئنیەتا حەجێ ئینان.

١٩٤٠ - (ق) عَنْ عَطَاءٍ: سَمِعْتُ جَابِرَ بنَ عَبْدِ اللهِ فِي أُنَاسٍ مَعَهُ قَالَ: أَهْلَلْنَا أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي الحَجِّ خَالِصاً لَيْسَ مَعَهُ عُمْرَةٌ. قَالَ عَطَاءٌ: قالَ جَابِرٌ: فَقَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) صُبْحَ رَابِعَةٍ مَضَتْ مِنْ ذِي الحِجَّةِ، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَنَا النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ نَحِلَّ، وَقَالَ: **(أَحِلُّوا، وَأَصِيبُوا مِنَ النِّسَاءِ)**. قَالَ عَطَاءٌ: قَالَ جَابِرٌ: وَلَمْ يَعْزِمْ عَلَيْهِمْ، ولكِنْ أَحَلَّهُنَّ لَهُمْ.

فَبَلَغَهُ أَنَّا نَقُولُ: لَمَّا لَمْ يَكُنْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلاَّ خَمْسٌ، أَمَرَنَا أَنْ نَحِلَّ إِلَى نِسَائِنَا، فَنَأْتِي عَرَفَةَ تَقْطُرُ مَذَاكِيرُنَا المَنِيَّ، قَالَ: وَيَقُولُ جَابِرٌ بِيَدِهِ هكَذَا، وَحَرَّكَهَا.

فَقَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: **(قَدْ عَلِمْتُمْ أَنِّي أَتْقَاكُمْ للهِ، وَأَصْدَقُكُمْ وَأَبَرُّكُمْ، وَلَوْلاَ هَدْيِي لَحَلَلْتُ كَمَا تَحِلُّونَ؛ فَحِلُّوا، فَلَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ)**. فَحَلَلْنَا وَسَمِعْنَا وَأَطَعْنَا.

[خ٧٣٦٧ (١٥٥٧)/ م١٢١٦].

ژ عەتائی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: من گوه ل جابرێ كورێ عەبدوللایی بوو د ناڤ هەندە خەلكیدا د گەل وی بوون گۆت: مە هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) ئنیەتا حەجێ ب تنێ ئینا، و عومرە د گەل نەبوو، عەتائی گۆت: جابری گۆت: سپێدا رۆژا چوارێ ژ زیلحیجەیێ پێغەمبەر (ﷺ) هات، ڤێجا دەمێ ئەم ژی هاتین پێغەمبەری (ﷺ) فەرمانا مە كر ئەم ژ ئیحرامان دەركەڤین و گۆت: **(ئیحرامان بشكێنن و هەرنە دەڤ هەڤژینێت**

**خۆ)**، عەتائی گۆت: جابری گۆت: ل سەر وان پێدڤی نەكر، بەلێ نڤینا وان بۆ وان حەلال كر.

**گەهشتە پێغەمبەری (ﷺ) مە دگۆت: دەمێ د ناڤبەرا مە و عەرەفێدا چو نەمایی پێنج رۆژ نەبن فەرمانا مە كر ئەم بچینە دەڤ ژنێت خۆ و ئەم دهێنە عەرەفێ و د ناڤبەرا مە و نڤینا ژناندا دەمەكێ كێمە و گۆت: جابر هۆ ب دەستێ خۆ گۆت و لڤلڤاند[1].**

**ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو و گۆت: (ب راستی هوین دزانن ئەز ژ هەوە بۆ خودێ پارێزكارتر و راستگۆتر و گوهدارتر و چاكترم، و ئەگەر من ژ بەر قوربانێ خۆ نەبا ئەز ژی دا ژ ئیحرامان دەركەڤم كا چاوا هوین دەركەفتن، ڤێجا ژ ئیحرامان دەركەڤن، و ئەگەر ئەڤا بۆری هاتبا پێشییا من، من قوربان د گەل خۆ نەدئینا)، ئینا ئەم هەمی ژ ئیحرامان دەركەفتین و مە بهیست و مە گوهداری كر.**

١٩٤١ - (ق) عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ: كَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ الْعُمْرَةَ فِي أَشْهُرِ الحَجِّ مِنْ أَفْجَرِ الْفُجُورِ فِي الأَرْضِ، وَيَجْعَلُونَ الْمُحَرَّمَ صَفَراً، وَيَقُولُونَ: إِذَا بَرَا الدَّبَرْ، وَعَفَا الأَثَرْ، وَانْسَلَخَ صَفَرْ، حَلَّتِ العُمْرَةُ لمِنِ اعْتَمَرَ. قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مُهِلِّينَ بِالحَجِّ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً، فَتَعَاظَمَ ذلِكَ عِنْدَهُمْ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ الحِلِّ؟ قَالَ: (حِلٌّ كُلُّه).[خ١٥٦٤ (١٠٨٥)/ م١٢٤٠].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عەرەبان ل سەردەمێ نەزانینێ ددیتن عومرە د هەیڤێت حەجێدا (هەیڤا شەوال و زیلقیعدە و زیلحیججەیێدا) ژ خرابترین گونەهایە ل سەر ئەردی، و هەیڤا موحەرەم دكرنە (صفر) و دگۆتن: ئەگەر پشتا حێشترێ خۆش بوو و شوینپێ نەمان و (صفر) دەرباز بوو عومرە حەلال بوو بۆ یێ عومرەیێ بكەت[2]. پێغەمبەر (ﷺ) و هەڤالێت وی سپێدەیا چوارێ ژ زیلحیججەیێ هاتن و دەست ب حەجێ كربوون (ئانكو: ئنیەتا حەجێ ب تنێ ئینا بوون)، ئینا پێغەمبەری**

---

(١) عەرەبان دو تشت مەزن ددانان: كرنا عومرەیێ د دەمێ حەجێدا و ئیحرام شكاندن و چۆنا دەڤ ژنان، لەوا ئەو ئاخفتن گۆتن یا گۆتی، و مەبەست پێ ئەو نینە ئاڤا زەلامی ب واندا دهاتە خوارێ، بەلێ مەبەست ئەوە دەمەكێ درێژ نەچۆ و پشتی ژ نڤینا خۆ خلاس بووین سەرێت خۆ شویشتن و بەرێ خۆ دانە مینایێ.

(٢) ئانكو: پشتی حێشتر ژ وەغەرا حەجێ دزڤریت و پشتا وێ یا كول ژ بەر بار و سویاربوونا د دەمێ حەجێدا چێ دبیت و سویاربوونا وێ خۆش دبیت و شوین پێت حێشترێ و حەجیان نەوێت د وەغەرا حەجێدا دورست بووین نەمان و بای تۆز نینا سەر وان، و هەیڤا (صفر)ێ ب دویماهی هات ژ نوی دورستە عومرە بهێتە كرن.

(ﷺ) فەرمانا وان كر بكەنە عومرە، ئەڤە ل دەڤ وان یا مەزن بوو، ئینا گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ: (ئەگەر مە كرە عومرە و ئەم ژ ئیحرامان دەركەفتین) چ حەلالە؟ گۆت: (هەمی یێ حەلالە).

١٩٤٢ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (هَذِهِ عُمْرَةٌ اسْتَمْتَعْنَا بِهَا، فَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ الْهَدْيُ فَلْيَحِلَّ الْحِلَّ كُلَّهُ، فَإِنَّ الْعُمْرَةَ قَدْ دَخَلَتْ فِي الْحَجِّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ). [م١٢٤١].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەڤە عومرەكە مە خۆشی یا پێ بری[1]، ڤێجا هەر كەسێ قوربان د گەل خۆ نەئینا بیت بلا ژ ئیحرامان دەركەڤیت و هەمی حەلالی حەلال بزانیت، چونكی ب راستی هەتا رۆژا قیامەتێ عومرە چۆ د ناڤ حەجێدا).

## ١٨ . باب: في القارن.

## بابەتێ: گرێدانا حەج و عومرەیێ پێكڤە[2].

١٩٤٣ - (ق) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما أَرَادَ الحَجَّ عَامَ نَزَل الحَجَّاجُ بِابْنِ الزُّبَيْرِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ النَّاسَ كَائِنٌ بَيْنَهُمْ قِتَالٌ، وَإِنَّا نَخَافُ أَنْ يَصُدُّوكَ، فَقَالَ: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[الأحزاب:٢١] إذاً أَصْنَعُ كما صَنَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، إِنِّي أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ عُمْرَةً.

ثُمَّ خَرَجَ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِظَاهِرِ الْبَيْدَاءِ، قَالَ: ما شَأْنُ الحَجِّ وَالْعُمْرَةِ إِلاَّ وَاحِدٌ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ حَجّاً مَعَ عُمْرَتِي، وَأَهْدَى هَدْياً اشْتَرَاهُ بِقُدَيْدٍ، وَلَمْ يَزِدْ عَلَى ذلِكَ، فَلَمْ يَنْحَرْ، وَلَمْ يَحِلَّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، وَلَمْ يَحْلِقْ وَلَمْ يُقَصِّرْ، حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ، فَنَحَرَ وَحَلَقَ، وَرَأَى أَنْ قَدْ قَضَى طَوَافَ الحَجِّ وَالْعُمْرَةِ بِطَوَافِهِ الأَوَّلِ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: كَذَلِكَ فَعَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ).

---

(١) خۆشیبرن: ئانكو: پشتی عومرە ب دویماهی هاتی ئەم ژ ئیحرامان دەركەفتین و تشتێ ل سەر مە حەرام ژ بەر گرێدانا ئیحرامان بۆ مە حەلال بوو.

(٢) حەجا پێكڤە گرێدایی و قیران: ئەڤەیە تو حەجێ و عومرەیێ پێكڤە بكەی و ب ئێك ئیحرام، دەستپێكێ عومرەیێ بكەی و ئیحرامان بهێلیبە بەر خۆ و ژ ئیحرامان دەرنەكەڤی و سەرێ خۆ كورت نەكەی و نەتراشی هەتا دبیتە رۆژا هەشتێ ژ دەهكان، و وێ رۆژێ هەر ب وان ئیحرامانڤە بەرێ خۆ بدەیە مینایێ و هۆسا هەتا حەجا خۆ دبەیە سەری و دبێژنە ڤێ حەجێ حەجا قیران، چونكی حەج و عومرە ب ئێك ئیحرام دئێنە كرن و پێكڤە دئێنە گرێدان.

[خ١٦٤٠ (١٦٣٩)/ م١٢٣٠].

**ژ نافعی (رضي الله عنه) گۆت: ل وێ سالا حەجاج هاتییە شەڕێ ئیبن زوبەیری، ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ڤیا بچیتە حەجێ، ئینا گۆتنێ: شەڕ یێ د ناڤبەرا خەلكیدا هەی و ئەم دترسین رێكێ ل تە بگرن، ئینا گۆت: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ وی دەمی ئەز دێ وێ كەم یا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كری[1]، ئەز هەوە دكەمە شاهد من ئنیەتا عومرێ ئینا. (ئانكو: من دەست ب عومرەیێ كر).**

**پاشی دەركەفت هەتا گەهشتییە دەشتا بەیدائێ[2]، گۆت: مانێ كاروبارێ حەج و عومرەیێ ئێكە[3]، ئەز هەوە دكەمە شاهد من حەج د گەل عومرەیا خۆ واجب كر، و قوربان ل قودیدێ[4] كری و ژ ڤێ زێدە نەكر و قوربان نەڤەكوشت و ژ ئیحرامان دەرنەكەفت و سەرێ خۆ نەتراشی و كورت نەكر هەتا بوویە رۆژا جەژنێ (قوربان ڤەكوشتنێ) قوربانێ خۆ ڤەكوشت و سەرێ خۆ تراشت و وی دیت تەوافا حەجێ و عومرەیێ ب تەوافا خۆ یا ئێكێ كر، و ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ب ڤی رەنگی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر.**

١٩٤٤ - عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَرَنَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَطَافَ لَهُمَا طَوَافاً وَاحِداً. [ت٩٤٧].

* صحيح.

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەج و عومرە پێكڤە گرێدان و تەوافەك ب تنێ بۆ هەردوكان كر.**

١٩٤٥ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، وَابْنِ عُمَرَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لَمْ يَطُفْ هُوَ وَأَصْحَابُهُ لِعُمْرَتِهِمْ وَحَجَّتِهِمْ، حِينَ قَدِمُوا؛ إِلاَّ طَوَافاً وَاحِداً. [جه٢٩٧٢].

* صحيح.

---

(١) ئانكو: هەر جهێ رێگری ل من هاتە كرن ئەز دێ ژ ئیحرامان دەركەڤم، وەكی پێغەمبەری (ﷺ) ل سالا حودەیبییێ كری.

(٢) جهەكە نێزیكی زیلحولەیفەیە و چو ئاڤاهی لێ نینن و بیرەكا ئاڤێ لێ بوو، (٤٢٠)كم ژ مەكەهێ دویرە.

(٣) ئانكو: ئەگەر دورست بیت ئەز ژ ئیحرامان بۆ عومرەیێ دەركەڤم ئەگەر رێك ل من هاتە گرتن دورستە ژ ئیحرامێت حەجێ ژی دەركەڤم ئەگەر رێك ل من هاتە گرتن.

(٤) جهەكە نێزیكی مەكەهێ، (١٠)كم ژێ دویرە.

ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی و ئیبن عومەری و ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەڤالێت وی تەواف بۆ عومرەیا خۆ و حەجا خۆ دەمێ هاتین نەکرن تەوافەك نەبیت.

## ١٩ ـ باب: الإفراد بالحج وأنواع النسك.

## بابەتێ: کرنا حەجێ ب تنێ و رەنگێت حەجێ.

١٩٤٦ - (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أَهْلَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بِالْحَجِّ مُفْرَداً.

- وَفِي رِوَايَةٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَداً. [م١٢٣١].

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: مە د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئنیەتا حەجێ ب تنێ ئینا.

- و د ڤەگێڕەکێدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەج ب تنێ کر.

١٩٤٧ - (م) عَنِ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَفْرَدَ الحَجَّ. [م١٢١١/ ١٢٢].

- وفي رواية: قَالَتْ: مِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَداً، وَمِنَّا مَنْ قَرَنَ، وَمِنَّا مَنْ تَمَتَّعَ. [م١٢١١/ ١٢٤].

ژ عائیشایێ: (رضي الله عنها) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەج ب تنێ کر.

- و د ڤەگێڕەکێدا گۆت: هندەکا ژ مە دەست ب حەجێ ب تنێ کر، و هندەکان ژ مە حەج و عومرە پێکڤە کرن، و هندەکان ژ مە تەمەتوع کر عومرە کر و ژ ئیحرامان دەرکەفتن و پاشی دەست ب حەجێ کرن.

١٩٤٨ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) لِلْحَجِّ عَلَى أَنْوَاعٍ ثَلاثَةٍ: فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ مَعاً، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ مُفْرَدٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مُفْرَدَةٍ، فَمَنْ كَانَ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ مَعاً، لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ مِمَّا حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى يَقْضِيَ مَنَاسِكَ الْحَجِّ، وَمَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَداً، لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ مِمَّا حَرُمَ مِنْهُ، حَتَّى يَقْضِيَ مَنَاسِكَ الْحَجِّ، وَمَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مُفْرَدَةٍ فَطَافَ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، حَلَّ مَا حَرُمَ عَنْهُ، حَتَّى يَسْتَقْبِلَ حَجّاً. [جه٣٠٧٥].

* حسن الإسناد.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ب سێ رەنگان ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ حەجێ دەرکەفتین، ژ مە هەبوون دەست ب حەج و عومرەیێ پێکڤە کرن، و ژ مە هەبوون دەست ب حەجێ ب تنێ کرن، و ژ مە هەبوون دەست ب عومرەیێ ب تنێ کرن،

ڤێجا یێ دەست ب حەج و عومرەیێ پێکڤە کری ژ ئیحرامان دەرنەکەڤت و چو بۆ حەلال نەبوو ژ وان یێ ژێ هاتییە حەرامکرن هەتا ئەو رێکارێت حەجێ ب دویماهی دئینیت، و یێ حەج ب تنێ کری، چو بۆ حەلال نەبوو ژ وان یێ ژێ هاتییە حەرامکرن هەتا ئەو رێکارێت حەجێ ب دویماهی دئینیت، و هەر کەسێ دەست ب عومرەیێ ب تنێ کری توافا ل دۆر کەعبێ و د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا کر و ئەو تشتێ ل سەر حەرام بوویی بۆ حەلال بوو هەتا دەست ب حەجێ دکەت.

## ٢٠ ـ باب: وجوب الدم على المتمتع.

## بابەتێ: واجببونا قوربانی ل سەر وی یێ عومرێ دکەت و ژ ئیحرامان دەردکەڤیت و پاشی حەجێ دکەت.

١٩٤٩ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: تَمَتَّعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الحَجِّ، وَأَهْدَى، فَسَاقَ مَعَه الهَدْيَ مِنْ ذِي الحُلَيْفَةِ، وَبَدأَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، فَتَمَتَّعَ النَّاسُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِالْعُمْرَةِ إِلَى الحجِّ، فَكَانَ مِنَ النَّاسِ مَنْ أَهْدَى فَسَاقَ الْهَدْيَ، وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ يُهْدِ، فَلَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَكَّةَ، قالَ لِلنَّاسِ: (**مَنْ كَانَ مِنْكُمْ أَهْدَى، فَإِنَّهُ لا يَحِلُّ لِشَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، حَتَّى يَقْضِيَ حَجَّهُ، وَمَنْ لَمْ يكنْ مِنكُمْ أَهْدَى؛ فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَبِالصَّفَا وَالمَرْوَةِ، وَلْيُقَصِّرْ وَلْيَحْلِلْ، ثُمَّ لِيُهِلَّ بِالحَجِّ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْياً؛ فَلْيَصُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ فِي الحجِّ وَسَبْعَةً إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ**).

[خ١٦٩١/ م١٢٢٧].

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د حەجا خاترخواستنێدا خۆشی ب عومرێ هەتا حەجێ بر، و قوربان دا و ژ زیلحولەفەیێ بەری خۆ ئێخستن و د گەل خۆ ئینان، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستپێکێ دەست ب عومرەیێ کر، پاشی ئنیەتا حەجێ ب تنێ ئینا و خەلکێ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) خۆشی ب عومرێ بر هەتا حەجێ، و ژ خەلکی هەبوون قوربان د گەل خۆ ئینابوون و ژ خەلکی هەبوون بێ قوربان و قوربان نەئینابوون، ڤێجا دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) هاتییە مەکەهێ گۆت: (**هەر کەسێ ژ هەوە قوربان ئینایی ب راستی بۆ وی چو یێ حەلال نینە ژ وان یێ ل سەر هاتییە حەرامکرن هەتا حەجا خۆ تمام نەکەت، و هەر کەسێ ژ هەوە قوربان نەدایی بلا تەوافێ ل دۆر کەعبێ و د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا بکەت و بلا سەرێ**

**خۆ كورت بكەت و ژ ئیحرامان دەركەڤیت پاشی بلا دەست ب حەجێ بكەت، ڤێجا یێ قوربان ب دەست نەكەفت بلا سێ رۆژییان ل حەجێ بگریت و حەفتان پشتی دزڤریتە مالا خۆ).**

## ٢١ ـ باب: طواف القدوم وركعتا الطواف.

### بابەتێ: تەوافا هاتنێ و هەردو ركعەتێت تەوافێ.

١٩٥٠ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ الطَّوَافَ الأَوَّلَ، يَخُبُّ ثَلاثَةَ أَطْوَافٍ، وَيَمْشِي أَرْبَعَةً، وَأَنَّهُ كَانَ يَسْعى بَطْنَ المسِيلِ، إِذَا طَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ.

[خ١٦١٧ (١٦٠٣)/ م١٢٦١].

وفي رواية لهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا طَافَ فِي الحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ، أَوَّلَ مَا يَقْدَمُ: سَعى ثَلاثَةَ أَطْوَافٍ، وَمَشى أَرْبَعَةً، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالمرْوَةِ. [خ١٦١٦].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر تەواف ل دۆر كەعبەیێ كربا تەوافا ئێكێ سێ گەران ب هەروەلە دچۆ و چواران ئاسایی دچۆ، و ئەگەر د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا هاتن و چۆن كربا وی لەز د نیڤا واندا دكر.**

**و د ڤەگێرەكا واندا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر تەواف بۆ حەجێ یان بۆ عومرەیێ كربا دەستپێكا ئەو دهاتە مەكەهێ: لەز د سێیاندا دكر و د چواراندا ئاسایی دچۆ، پاشی دو ركعەت دكرن پاشی چۆنا د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا دكر.**

١٩٥١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَأَصْحَابَهُ اعْتَمَرُوا مِنَ الْجِعْرَانَةِ، فَرَمَلُوا بِالْبَيْتِ، وَجَعَلُوا أَرْدِيَتَهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، قَدْ قَذَفُوهَا عَلَى عَوَاتِقِهِم الْيُسْرَى. [د١٨٨٤].

وفي رواية: فَرَمَلُوا بِالْبَيْتِ ثَلاَثاً، وَمَشَوْا أَرْبَعاً. [د١٨٩٠].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەڤالێت وی ژ جیعرانەیێ[1] دەست ب عومرەیێ كرن و پارچێت سەر ملان دئێخستنە بن كەفشێت خۆ یێت راستێ و لفكێت وان دهاڤێتنە سەر ملێت خۆ یێت چەپێ.**

(١) جهەكێ نێزیكی مەكەهێیە، (٢٢)كم ژێ دویرە.

- **و د ڤەگێرەكا دیدا: سێ گەران ل دۆر كەعبەیێ هەروێل كرن و چاران ژی ب ئاسایی چۆن.**

١٩٥٢ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ السَّائِبِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ مَا بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[البقرة:٢٠١]. [د١٨٩٢].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ سائیبی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د ناڤبەرا كوژییێ یەمانی و بەرێ رەشدا دگۆت: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾.**

١٩٥٣ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ الله قَالَ: لَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِنْ طَوَافِ الْبَيْتِ، أَتَى مَقَامَ إِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا مَقَامُ أَبِينَا إِبْرَاهِيمَ الَّذِي قَالَ اللهُ سُبْحَانَهُ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ [البقرة:١٢٥]. [جه٢٩٦٠].

* صحيح.

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ تەوافا كەعبەیێ ب دویماهی هاتی، هاتە جهێ ئیبراهیمی، ئینا عومەری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەڤە جهێ بابێ مە ئیبراهیمییە ئەوێ خودایێ پاك ژ هەمی كێماسییان د راستدا ویدا گۆتی: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾.**

١٩٥٤ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَمَلَ ثَلَاثَةَ أَطْوَافٍ مِنَ الْحَجَرِ إِلَى الْحَجَرِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ عَادَ إِلَى الْحَجَرِ، ثُمَّ ذَهَبَ إِلَى زَمْزَمَ فَشَرِبَ مِنْهَا وَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ رَجَعَ فَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الصَّفَا، فَقَالَ: (**ابْدَؤُوا بِمَا بَدَأَ اللهُ عزّ وجل بِهِ**). [حم١٥٢٤٣]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: سێ گەرێت ئێكێ ژ بەری هەتا بەری پێغەمبەری (ﷺ) هەروەلە كر و دو ركعەت كرن، پاشی زڤری بەری، پاشی چۆ ئاڤا زەمزەمێ و ژێ ڤەخوار و ل سەرێ خۆ كر، پاشی زڤری دەست كرە كوژییێ بەرێ**

**رەش، پاشی زڤری سەفایێ و گۆت: (ب وێ دەست پێ بكەن یا خودایێ هەر ب هێز و مەزن دەست پێ كری)[1].**

١٩٥٥ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) طَافَ بِالْبَيْتِ فَرَمَلَ مِنَ الْحَجَرِ الأَسْوَدِ ثَلاَثاً، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَرَأَ فِيهِمَا: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ و﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾.[هق٥/٩١].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: سێ گەرێت ئێكێ ژ بەری هەتا بەری پێغەمبەری (ﷺ) هەروەلە كر پاشی دو ركعەت كرن ئەڤە تێدا خواندن: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾.**

## ٢٢ ـ باب: استلام الحجر وتقبيله.

## بابەتێ: دەستكرنا بەرێ رەش و ماچیكرنا وی.

١٩٥٦ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لَمْ أَرَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَسْتَلِمُ مِنَ الْبَيْتِ؛ إِلاَّ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ. [خ١٦٠٩ (١٦٦)/ م١٢٦٧].

- وفي رواية لهما: قَالَ: ما تَرَكْتُ اسْتِلاَمَ هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ، فِي شِدَّةٍ وَلاَ رَخَاءٍ، مُنْذُ رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَسْتَلِمُهُمَا. [خ١٦٠٦/ م١٢٦٨]
- وفي رواية للبخاري: قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ اسْتِلاَمِ الحَجَرِ، فَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَسْتَلِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ. قالَ: قُلْتُ: أَرَأَيْتَ إِنْ زُحِمْتُ، أَرَأَيْتَ إِنْ غُلِبْتُ؟ قَالَ: اجْعَلْ أَرَأَيْتَ بِالْيَمَنِ، رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَسْتَلِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ. [خ١٦١١]
- ولمسلم: قَالَ نَافِعٌ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَبَّلَ يَدَهُ...

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) نەدیتییە دەستێ خۆ دكەتە تشتەكی ژ كەعبێ هەردو كوژییێت یەمانی نەبن[2].**

- **و د ڤەگێرەكا واندا گۆت: من دەستكرنا ڤان هەردو كوژییان نەهێلایە نە د تەنگاڤییێدا و نە د بەرفرەهییێدا ئەڤە ل وی دەمێ من پێغەمبەر (ﷺ) دیتی دەستكرییە وان.**
- **و د ڤەگێرەكا بوخاریدا: گۆت: زەلامەكی پرسیارا دەستكرنا بەرێ رەش ژ ئیبن عومەری كر؟ ئینا گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت دەست دكرێ و ماچی دكر، گۆت: بێژە**

---

(١) ئانكو: ب سەفایێ دەست پێ بكەن، چونكی خودێ دبێژیت ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾.

(٢) مەبەست پێ كوژییێ یەمانییە و كوژییێ بەرێ رەشە.

**من ئەگەر قەربالغێ ئەز تەنگاڤ كرم (و نەشیام بگەهمێ چ بكەم)، بێژە من ئەگەر ب بن كەفتم (نەشیام بگەهمێ چ بكەم)؟ ئینا ئیبن عومەری گۆت: بێژە من، بهێلە یەمەنێ[1]، من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت دەست دكرە بەرێ رەش و ماچی دكر.**

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: نافعی گۆت: من ئیبن عومەر دیت دەستێ خۆ كرە بەرێ رەش پاشی دەستێ خۆ ماچی كر.**

١٩٥٧ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: طَافَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى بَعِيرٍ، يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ. [خ١٦٠٧/ م١٢٧٢].

- وفي رواية للبخاري: أَن رَسُولَ اللهِ (ﷺ) طَافَ بِالْبَيْتِ، وَهُوَ عَلَى بَعِيرٍ، كُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ فِي يَدِهِ، وَكَبَّرَ. [خ١٦٣٢].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ل حەجا خاترخواستنێ پێغەمبەری (ﷺ) ل سەر حێشترەكێ تەواف كر و ب چەلاكەكی دەست دكرە كوژییێ بەرێ رەش.**

- **و د ڤەگێرەكا بوخاریدا: پێغەمبەری (ﷺ) تەواف ل دۆر كەعبەیێ كر، و ئەو ل سەر حێشترەكێ بوو و هەر گاڤا هاتبا راستا كوژییێ بەرێ رەش ب دەستی نیشان كرێ و دگۆت الله أكبر.**

## ٢٣ ـ باب: السعي بين الصفا والمروة.

### بابەتێ: هاتنوچۆنا د نڤبەرا سەفا و مەروایێدا.

١٩٥٨ - (ق) عَنْ عَاصِمِ بْنِ سُلَيْمَانَ الأَحْوَل قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَكُنْتُمْ تَكْرَهُونَ السَّعْيَ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ؟ قَالَ: نَعَمْ، لِأَنَّهَا كَانَتْ مِنْ شَعَائِرِ الجَاهِلِيَّةِ، حَتَّى أَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ﴾ [البقرة:١٥٨]. [خ١٦٤٨/ م١٢٧٨].

**ژ عاسمێ كورێ سولەیمانێ ئەحوەل (رحمه الله) گۆت: من گۆتە ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) ئەرێ ب دلێ هەوە نەبوو هوین هاتنوچۆنێ د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا بكەن؟**

---

(١) دیارە ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) هەست كر پرسیاركەر خەلكێ یەمەنێیە لەوا وەگۆتێ دا بۆچۆنا خۆ نەدانیتە بەرامبەر فەرموودەیێ.

گۆت: بەلێ، چونكی ئەو ژ درویشمێت نەزانینێ بوو هەتا خودێ ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ ئینایە خوارێ.

١٩٥٩ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: لَمْ يَطُفِ النَّبِيُّ (ﷺ) وَلاَ أَصْحَابُهُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ إِلاَّ طَوَافاً وَاحِداً. [م١٢٧٩]

- وزاد في رواية: إلا طوافاً واحداً، طوافه الأول.

ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: نە پێغەمبەری (ﷺ) و نە هەڤالێت وی هاتنوچۆن د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا نەكرییە هاتنوچۆنەك نەبیت[1].

و د ڤەگێرەكێدا زێدە كرییە: ئێك هاتنوچۆن نەبیت هاتنوچۆنا وی یا ئێكێ.

١٩٦٠ - عَنْ كَثِيرِ بْنِ جُمْهَانَ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي أَرَاكَ تَمْشِي وَالنَّاسُ يَسْعَوْنَ، قَالَ: إِنْ أَمْشِ فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَمْشِي، وَإِنْ أَسْعَ فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَسْعَى، وَأَنَا شَيْخٌ كَبِيرٌ. [د١٩٠٤/ ت٨٦٤/ ن٢٩٧٦/ جه٢٩٨٨].

* صحيح.

ژ كەسیرێ كوڕێ جومهانی (رحمه الله) گۆت: زەلامەكی د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا گۆتە عەبدوللایێ كوڕێ عومەری: ئەی بابێ عەبدولرەحمانی ئەز دبینم تو هێدی یێ دچی و خەلك یێ ب لەز دچیت؟ گۆت: ئەگەر هێدی بچم من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ دیتی هێدی دچۆ، و ئەگەر ب لەز بچم من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ دیتی ب لەز دچۆ و ئەز پیرەمێرەكێ دانعەمرم.

١٩٦١ - عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ، عَنِ امْرَأَةٍ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَسْعَى فِي بَطْنِ الْمَسِيلِ، وَيَقُولُ: (لاَ يُقْطَعُ الْوَادِي إِلاَّ شَدّاً). [ن٢٩٨٠].

* صحيح.

---

(١) فەرمووده بەحسێ پێغەمبەری (ﷺ) و هەڤالێت وی دكەت سالا حەجا خاترخواستنێ، چونكی حەجا وی و یا هندە هەڤالێت وی یا ب عومرێڤە گرێدای بوو (قیران بوو)، و حەج و عومرە ب ئێك ئیحرام بوون، یێ هۆسا جارەكێ تنێ دێ هاتنوچۆنێ د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا كەت، چونكی جارەك تنێ ل سەرە، بەلێ نەوێ عومرێ جودا دكەت و پاشی حەجێ دكەت و د ناڤبەرا واندا خۆشییێ دبەت دڤێت نەو دو جاران هاتنوچۆنێ بكەت، جارەكێ بۆ عومرەیێ و جارا دی بۆ حەجێ.

**ژ سەفیيا كچا شەیبەیی (رضي الله عنها) ژ ژنەكێ گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل نهالا نیڤا سەفا و مەروایێدا[1] دیت ب لەز دچۆ و دگۆت: (ئەڤ نهاله ب لەز نەبیت ناهێتە برین).**

١٩٦٢ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ وَهُوَ عَلَى الصَّفَا يَدْعُو يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ قُلْتَ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ، وَإِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ، وَإِنِّي أَسْأَلُكَ كَمَا هَدَيْتَنِي لِلإِسْلاَمِ أَنْ لاَ تَنْزِعَهُ مِنِّي حَتَّى تَتَوَفَّانِي وَأَنَا مُسْلِمٌ. [ط٨٣٧].

* إسناده صحيح.

**ژ نافعی (رضي الله عنه) وی گوه ل عەبدوللایێ كوڕێ عومەری بوو، و وی ل سەر سەفایێ دوعا دكرن و دگۆت: ئەی خودێ تە فەرمان كرییە دوعا ژ من بكەن ئەز دێ بەرسڤا هەوە دەم و تو ل پەیمانێت خۆ لێڤەنابی و ئەز داخوازێ ژ تە دكەم كا چاوا تە بەرێ من دا ئیسلامێ تو ژ من نەستینی هەتا من دمرینی و ئەز موسلمان.**

## ٢٤ ـ باب: يوم التروية.

## بابەتێ: رۆژا تەروییێ (رۆژا هەشتێ ژ دەهكان).

١٩٦٣ - (ق) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الثَّقَفِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَساً ـ وَنَحْنُ غَادِيَانِ مِنْ مِنى إِلَى عَرَفَاتٍ ـ عَنِ التَّلْبِيَةِ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ قَالَ: كَانَ يُلَبِّي الملَبِّي لاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ المكَبِّرُ فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ. [خ٩٧٠/ م١٢٨٥].

**ژ موحەممەدێ كوڕێ ئەبی بەكرێ سەقەفی (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیارا ئەنەسی كر و ئەم سپێدەیێ ژ مینایێ دچۆینە عەرەفێ ژ تەلبییێ، هەوە چاوا دكر د گەل پێغەمبەری (ﷺ)؟ گۆت: تەلبییەكەری تەلبییە دكر و نەدورست نەددانا و تەكبیركەری تەكبیر دكر و نەدورست نەددانا.**

١٩٦٤ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ وَالْفَجْرَ يَوْمَ عَرَفَةَ بِمِنًى. [د١٩١١/ ت٨٧٩/ جه٣٠٠٤].

---

(١) مەبەست نیڤا سەفا و مەروایێیە، نەڤرۆ نەو جهە یێ رۆناهییا كەسك لێ، و نەو نیشانە دڤێت دەستپێكا رۆناهییا كەسك هەتا رۆناهییا كەسك چۆن ب لەز بیت.

- وفي رواية للترمذي، وهي رواية ابن ماجه: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِمِنًى: الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، وَالْفَجْرَ، ثُمَّ غَدَا إِلَى عَرَفَاتٍ.
- وعند الدارمي: صَلَّى بِمِنًى خَمْسَ صَلَوَاتٍ. [مي١٩١٣].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژا نیڤرۆ و نڤێژا سپێدێ یا رۆژا عەرەفێ ل مینایێ کرن.**

- **و د ڤەگێرا ترمزیدا: و ئەو ڤەگێرەکا ئیبن ماجەیە: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاری و مەغرەب و عەیشا و سپێدێ ل مینایێ ل بەرای مە کرن و پاشی سپێدێ چۆ عەرەفاتێ.**
- **و ل دەڤ دارەمی: پێغەمبەری (ﷺ) پێنج نڤێژ ل مینایێ کرن.**

١٩٦٥ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَت: قُلتُ: يا رسولَ اللهِ، أَلَا نَبني لك بِمِنًى بَيتًا، أو بِناءً، يُظِلُّكَ من الشمسِ؟ فقال: **(لا، إنَّما هو مُناخُ مَن سبَقَ إليه)**.[د٢٠١٩/ ت٨٨١/ جه٣٠٠٦/ مي١٩٨٠]

* ضعيف، وقال الترمذي: حسن صحيح.

**ژ عائیشایێ (خودێ ژێ رازی بیت) گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەرێ ئەم بۆ تە خانییەکی ل مینایێ ئاڤانەکەین؟ یان ئاڤاهیەکی سیبەرێ ژ رۆژێ ل تە بکەت؟ ئینا گۆت: (نەخێر ب راستی ئەو جهێ وییە یێ بەری بکەهیتێ)[1].**

## ٢٥ ـ باب: الوقوف بعرفة.

## بابەتێ: راوەستانا ل عەرەفێ.

١٩٦٦ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: كَانَتْ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ، وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَاتٍ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلَامُ، أَمَرَ اللهُ نَبِيَّهُ (ﷺ) أَنْ يَأْتِيَ

---

(١) **شێخ سالحی ژ بەر لاوازییا ڤێ فەرمووده‌یێ نەڤە د مالپەرێ خۆدا شینێ ئینایە:** ١٩٦٥ - (م) عن عبدِ اللهِ بن عمرَ، قالَ: غَدَوْنَا مَعَ رسولِ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم مِنْ مِنى إلى عَرَفَاتٍ، مِنَّا الملَبِّي، وَمِنَّا المكَبِّر.[م١٢٨٤].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: سپێدێ ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مینایێ چۆینە عەرەفاتێ تەلبییە کەر (ئانکو: لەببەیکە لەببەیکە بێژیت) ژ مە هەبوون و تەکبیرکەر (ئانکو: ئەللاه ئەکبەر ئەللاه ئەکبەر بێژیت) ژ مە هەبوون.**

عَرَفَاتٍ، ثُمَّ يَقِفَ بِهَا، ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا، فَذلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾[البقرة:١٩٩] [خ٤٥٢٠/ م١٢١٩].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: قورەیشی و ئەوێت ل سەر دینێ قورەیشییان ل موزدەلیفەیێ رادوەستان[١] و دگۆتنە وان حومس[٢] و عەرەبێت دی هەمی ل عەرەفێ رادوەستان، ڤێجا دەمێ ئیسلام هاتی خودێ فەرمان ل پێغەمبەرێ خۆ کر ئەو بهێتە عەرەفێ پاشی ل وێرێ راوەستیت پاشی ژ وێرێ دارژیت و ئەڤەیە رامانا گۆتنا خودێ:** ﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾[٣].

١٩٦٧ - (م) عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(نَحَرْتُ هَاهُنَا، وَمِنى كُلُّهَا مَنْحَرٌ، فَانْحَرُوا فِي رِحَالِكُمْ. وَوَقَفْتُ هَاهُنَا، وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ. وَوَقَفْتُ هَاهُنَا، وَجَمْعٌ كُلُّهَا مَوْقِفٌ)**.[م١٢١٨/ (١٤٩)]

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (من ل ڤێرێ قوربان ڤەکوشت و مینا هەمی جهێ قوربان ڤەکوشتنێیە، ڤێجا ل جهێت خۆ قوربانان ڤەکوژن، و ئەز ل ڤێرێ راوەستام و عەرەفە هەمی جهێ راوەستانێیە، و ئەز ل ڤێرێ راوەستام و موزدەلیفە هەمی جهێ راوەستانێیە).**

١٩٦٨ - عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ الطَّائِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بِالْمَوْقِفِ ـ يَعْنِي: بِجَمْعٍ ـ قُلْتُ: جِئْتُ يَا رَسُولَ اللهِ مِنْ جَبَلِ طَيِّءٍ، أَكْلَلْتُ مَطِيَّتِي، وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي، وَاللهِ مَا تَرَكْتُ مِنْ حَبْلٍ إِلاَّ وَقَفْتُ عَلَيْهِ، فَهَلْ لِي مِنْ حَجٍّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ أَدْرَكَ مَعَنَا هَذِهِ الصَّلاَةَ، وَأَتَى عَرَفَاتٍ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلاً أَوْ نَهَاراً، فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ وَقَضَى تَفَثَهُ)**.[د١٩٥٠/ ت٨٩١/ ن٣٠٣٩/ جه٣٠١٦/ مي١٨٨]

* صحيح.

**ژ عوروەیێ کوڕێ موزەریسێ تائی گۆت: ئەز ل جهێ راوەستانێ هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ـ ئانکو ل موزدەلیفەیێ ـ من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز یێ ژ چیایێ تەیی[٤] دهێم، من دەوارێ خۆ وەستاند و من خۆ ژی وەستاند و من چو گرک نەهێلاینە**

---

**(١) د گەل خەلکی نەدچۆنە عەرەفەیێ و ژ موزدەلیفەیێ دهاتنە مینایێ و خۆ جوداهی خەلکێ گشتی ددانان.**

**(٢) نەو ژی قورەیشینە و کینانە و جەدیلە و دگۆتنێ حومس ژ بەر وێ حەماس و توندی و رژدییا وان بۆ دینێ خۆ هەی.**

**(٣) ئانکو: پاشی دارژنە خوارێ ژ وی جهێ خەلك ژێ دادرژتە خوارێ.**

**(٤) چیایەکە دکەڤیتە رۆژهەلاتێ مەدینەیێ.**

ل سەر نەراوەستابم، ئەرێ حەجا من یا دورستە؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(یێ د گەل مە بگەهیتە ڤێ نڤێژێ[1]، و بەری هینگێ ب شەڤ یان رۆژ هاتبیتە عەرەفەیێ، ب راستی حەجا وی تمام و دورست بوو و پیساتییێ ژ خۆ ڤەكەر[2]).**

١٩٦٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**خَيْرُ الدُّعَاءِ دُعَاءُ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَخَيْرُ مَا قُلْتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**). [ت٣٥٨٥].

* حسن.

ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(باشترین دوعا دوعایا رۆژا عەرەفێیە، و باشترین دوعا من و پێغەمبەرێت بەری من گۆتبیت: ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت و یێ بێ شریك و بێ هەڤاله، و هەمی مولك و سەروەری و پەسن و حەمد بۆ وینە و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە).**

١٩٧٠ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اعْلَمُوا أَنَّ عَرَفَةَ كُلَّهَا مَوْقِفٌ؛ إِلاَّ بَطْنَ عُرَنَةَ، وَأَنَّ الْمُزْدَلِفَةَ كُلَّهَا مَوْقِفٌ؛ إِلاَّ بَطْنَ مُحَسِّرٍ. [ط ٨٨٤]

* إسناده صحيح.

ژ عەبدوللایێ كوڕێ زوبەیری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی دگۆت: **بزانن عەرەفە هەمی جهێ راوەستانێیە، نهالا عورەنە نەبیت[3] و موزدەلیفە هەمی جهێ راوەستانێیە نهالا موحەسسیر نەبیت[4].**

(١) بەحسێ نڤێژا سپێدێیە ل موزدەلیفەیێ.

(٢) ئانكو: نینۆك و پرچێ خۆ ژێڤەكەت.

(٣) مزگەفتا نەمیرەیە نەڤرۆ یا ل وی جهی.

(٤) نهالا موحەسسیر: دكەڤیتە د ناڤبەرا موزدەلیفە و میناییدا، و ب وی ناڤی هاتە ناڤكرن چونكی نەبرەهەیێ حەبەشی ل وێرێ وەستا و كەسیرە بوو و ب خەم كەفت و خەم و پەشێمانی بۆ هەڤالێت خۆ چێ كر و نێخستنە د پەشێمانییاندا، ڤێجا دبێژنێ نهالا پەشێمانییێ.

## ٢٦ . باب: صوم يوم عرفة بعرفة.

## بابەتێ: رۆژیگرتنا رۆژا عەرەفێ ل عەرەفێ.

١٩٧١ - (ق) عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ بِنْتِ الحَارِثِ: أَنَّ نَاسَاً اخْتَلَفُوا عِنْدَهَا يَوْمَ عَرَفَةَ فِي صَوْمِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ صَائِمٌ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ بِصَائِمٍ، فَأَرْسَلْتُ إِلَيْهِ بِقَدَحِ لَبَنٍ، وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ، فَشَرِبَهُ. [خ١٦٦١ (١٦٥٨)/ م١١٢٣].

**ژ ئوم فەزلا كچا حارسی (رضي الله عنها) گۆت: هندەك خەلك ل دەڤ وێ ل سەر رۆژیگرتنا پێغەمبەری (ﷺ) ل رۆژا عەرەفێ ژێك جودا بوون، هندكان ژ وان گۆت: ئەو یێ ب رۆژییە، و هندەكان ژ وان گۆت: ئەو نە یێ ب رۆژییە، ئینا من ترارەكێ شیری بۆ هنارت و ئەو ل سەر حێشترا خۆ یێ راوەستای بوو، ئینا ڤەخوار.**

## ٢٧ . باب: الصلاة والخطبة يوم عرفة

## بابەتێ: نڤێژ و خوتبەیا رۆژا عەرەفەیێ.

١٩٧٢ - (خ) عَنْ سَالِمٍ قَالَ: كَتَبَ عَبْدُ المَلِكِ إِلَى الحَجَّاجِ: أَنْ لاَ يُخَالِفَ ابْنَ عُمَرَ فِي الحَجِّ، فَجَاءَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنه وَأَنَا مَعَهُ يَوْمَ عَرَفَةَ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، فَصَاحَ عِنْدَ سُرَادِقِ الحَجَّاجِ، فَخَرَجَ وَعَلَيْهِ مِلْحَفَةٌ مُعَصْفَرَةٌ، فَقَالَ: مَا لَكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمنِ؟ فَقَالَ: الرَّوَاحَ إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ، قَالَ: هذِهِ السَّاعَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْظِرْنِي حَتَّى أُفِيضَ عَلَى رَأْسِي ثُمَّ أَخْرُجَ. فَنَزَلَ حَتَّى خَرَجَ الحَجَّاجُ، فَسَارَ بَيْنِي وَبَيْنَ أَبِي، فَقُلْتُ: إِنْ كُنْتَ تُرِيدُ السُّنَّةَ فَاقْصُرِ الخُطْبَةَ وَعَجِّلِ الْوُقُوف. فَجَعَلَ يَنْظُرُ إِلَى عَبْدِ اللهِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ قَالَ: صَدَقَ. [خ١٦٦٠].

**ژ سالمی (رحمه الله) گۆت: عەبدولمەلكی بۆ حەججاجی نڤیسی: ئەو جوداهییا ئیبن عومەری د حەجێدا نەكەت، ئینا ل رۆژا عەرەفێ پشتی رۆژ ل نیڤا عەسمانی خوارکەفتی ئیبن عومەر (رضي الله عنه) هات و ئەز د گەل وی بووم، و ل دەڤ خیڤەتا حەججاجی گازی كرێ، ئینا حەجاج دەركەفت و چارچەفەكا زەركری د خۆ وەركربوو و گۆت: تە خێرە ئەی بابێ عەبدولرەحمانی؟ ئینا گۆت: دا بچین ئەگەر تە سونەت دڤێت، ئینا گۆت: ڤێ گاڤێ؟ گۆت: بەلێ، گۆت: خۆ ل من بگرە هەتا ئەز هندە ئاڤێ ل خۆ دكەم، و پاشی دێ دەركەڤم، ئینا روینشت هەتا حەججاج هاتی، و ئەو د ناڤبەرا من و بابێ مندا دچۆ، ئینا**

من گۆتێ: ئەگەر تە سونەت دڤێت گۆتارێ كورت بكە و لەزێ ل راوەستانا عەرەفێ بكە، ئینا دەستهاڤێتێ بەرێ خۆ دا عەبدوللایی، ڤێجا دەمێ عەبدوللایی ئەو دیتی گۆت: راست دبێژیت.

١٩٧٣ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَارَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ، فَنَزَلَ بِهَا حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ، أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ فَرُحِلَتْ لَهُ، حَتَّى إِذَا انْتَهَى إِلَى بَطْنِ الْوَادِي خَطَبَ النَّاسَ، ثُمَّ أَذَّنَ بِلاَلٌ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئاً. [ن٦٠٣، ٦٥٤]

* صحيح.

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: (پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ هەتا هاتییە عەرەفێ، گومبەتەك دیت ل نەمیرەیێ یا بۆ ڤەدایی، تێدا ما هەتا رۆژ ژ نیڤا عەسمانی خواركەفتی، پاشی فەرمان كر حێشترا وی بۆ بینن، و بۆ ئینان و زین لێ كر، و لێ سویار بوو هەتا گەهشتییە نهالا عورەنە گۆتار بۆ خەلكی دا، پاشی بیلالی بانگ دا، پاشی قامەت گرت و نڤێژا نیڤرۆ كر، پاشی قامەت گرت و نڤێژا ئێڤاری كر، و چو نڤێژ د ناڤبەرا واندا نەكرن.

### ٢٨ ـ باب: الإفاضة من عرفات.

### بابەتێ: دارژیان ژ عەرەفێ.

١٩٧٤ - (ق) عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عن أَبِيه أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ أُسَامَةُ وَأَنَا جَالِسٌ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَسِيرُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ حِينَ دَفَعَ؟ قَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ.

قَالَ هِشَامٌ: وَالنَّصُّ فَوْقَ الْعَنَقِ. [خ١٦٦٦/ م١٢٨٦].

ژ هیشامێ كورێ عوروەیی (رحمه الله) ژ بابێ خۆ گۆت: پرسیار ژ ئوسامەیی هاتە كرن و ئەز ل دەڤ وی یێ روینشتی بووم، ئەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل حەجا خاترخواستنێ چاوا دچۆ دەمێ ژ عەرەفێ بۆ موزدەلیفەیێ چۆیی؟ گۆت: چۆنەكا نافنجی دچۆ و ئەگەر بیاڤ دیتبا لەز دكر.

هیشامی گۆت: (نص) د سەر عەنەڤێدایە (ئانكو بلەزترە).

١٩٧٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّهُ دَفَعَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) يَوْمَ عَرَفَةَ، فَسَمِعَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَرَاءَهُ زَجْراً شَدِيداً، وَضَرْباً وَصَوْتاً لِلإِبِلِ، فَأَشَارَ بِسَوْطِهِ إِلَيْهِمْ، وَقَالَ: **(أَيُّهَا النَّاسُ، عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِالإِيضَاعِ)**. [خ١٦٧١].

**و ژ ئیبن عەباسی خودێ ژ هەردووان رازی بیت، ئەو د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا عەرەفێ بۆ موزدەلیفەیێ دچۆ، پالدانەكا ب هێز و پێدادان و دەنگێ حێشتران ل پشت خۆ گوه لێ بوو، بەرێ قامچییا خۆ دا وان و گۆت: (گەلی خەلكی ل سەر خۆ بن (رەحەت وەرن) ب راستی خێر نە ب لەزكرنێیە).**

١٩٧٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: جَمَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) بَيْنَ المَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ، كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا بِإِقَامَةٍ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا، وَلاَ عَلَى إِثْرِ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا. [خ١٦٧٣، م١٢٨٨].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ناڤبەرا مەغرب و عەیشادا ل موزدەلیفەیێ كۆم كر، هەر ئێك ژ وان ب قامەتەكێ، و چو سونەت د ناڤبەرا واندا نەكرن و نە پشتی كرنا وان هەردوكان ژی.**

## ٢٩ ـ باب: صلاة الفجر بمزدلفة والدفع منها.

## بابەتێ: نڤێژا سپێدێ ل موزدەلیفەیێ و ژێ دەركەفتن.

١٩٧٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى صَلاَةً بِغَيْرِ مِيقَاتِهَا إِلاَّ صَلاَتَيْنِ: جَمَعَ بَيْنَ المَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، وَصَلَّى الْفَجْرَ قَبْلَ مِيقَاتِهَا.[خ١٦٨٢ (١٦٧٥)/ م١٢٨٩].

- ولفظ مسلم: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) صَلَّى صَلاَةً إِلاَّ لِمِيقَاتِهَا؛ إِلاَّ صَلاَتَيْنِ: صَلاَةَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ، وَصَلَّى الْفَجْرَ يَوْمَئِذٍ قَبْلَ مِيقَاتِهَا.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) نەدیتییە نڤێژەك نە د دەمێ وێدا كربیت دو نڤێژ نەبن (ل موزدەلیفەیێ) د ناڤبەرا مەغرەب و عەیشادا كۆم كر و نڤێژا سپێدێ بەری دەمێ وێ كر[1].**

---

(١) مەبەست نەوە د دەمێ واندا یێ هەرجار نەكرن، و مەبەست نەو نینە ژ دەمی دەرێخستن، و نڤێژا سپێدێ ل رۆژا موزدەلیفەیێ د گەل دەركەفتنا سپێدێ كر و خۆ نەگرت وەكی هەرجار پیچەك خۆ بگریت و پاشی نڤێژا سپێدێ بكەت.

- و بێژەیا موسلمی: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەدیتییە نڤێژەك كربیت ئەگەر د دەمێ وێدا نەبیت دو نڤێژ نەبن، نڤێژا مەغرەب و عەیشا ل موزدەلیفەیێ و نڤێژا سپێدێ ل وێ رۆژێ بەری دەمێ وێ كر.

١٩٧٨ - (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ قَالَ: شَهِدْتُ عُمَرَ رضي الله عنه صَلَّى بِجَمْعٍ الصُّبْحَ، ثُمَّ وَقَفَ فَقَالَ: إِنَّ الْمُشْرِكِينَ كَانُوا لاَ يُفِيضُونَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَيَقُولُونَ: أَشْرِقْ ثَبِيرُ، وَأَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَالَفَهُمْ، ثُمَّ أَفَاضَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ. [خ١٦٨٤].

ژ عومەرێ كورێ مەیموونی (رحمه الله) گۆت: من ل موزدەلیفەیێ نڤێژا سپێدێ د گەل عومەری كر، پاشی راوەستا و گۆت: ب راستی موشرك نەدچۆن هەتا رۆژ دەرنەكفتبا و دگۆتن: ئەی چیایێ سەبیر[1] رۆن ببە، و پێغەمبەری (ﷺ) بەروڤاژی وان كر، پاشی بەری رۆژ بهەلێت دارژیا و بۆ مینایێ چۆ.

## ٣٠ ـ باب: تقديم الضعفة من مزدلفة إلى منى.

## بابەتێ: پێشئێخستنا لاوازان ژ موزدەلیفەیێ بۆ مینایێ.

١٩٧٩ - (ق) عَنْ سَالِمٍ قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما يُقَدِّمُ ضَعَفَةَ أَهْلِهِ، فَيَقِفُونَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ بِالْمُزْدَلِفَةِ بِلَيْلٍ، فَيَذْكُرُونَ اللهَ مَا بَدَا لَهُمْ، ثُمَّ يَرْجِعُونَ قَبْلَ أَنْ يَقِفَ الإِمَامُ وَقَبْلَ أَنْ يَدْفَعَ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ مِنىً لِصَلاَةِ الْفَجْرِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ بَعْدَ ذلِكَ، فَإِذَا قَدِمُوا رَمَوْا الْجَمْرَةَ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما يَقُولُ: أَرْخَصَ فِي أُولئِكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [خ١٦٧٦/ م١٢٩٥].

ژ سالمی (رحمه الله) گۆت: عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) لاوازێت خەلكێ خۆ بەری خۆ دئێخستن، ب شەڤێ ل موزدەلیفەیێ رادوەستان و زكرێ خودێ دكرن هندی وان دڤیان، پاشی دزڤرین بەری ئیمام راوەستیت دەست ب چۆنێ بكەت، ڤێجا ژ وان هەبوون نڤێژا سپێدێ دهاتە مینایێ، و ژ وان هەبوون پشتی هینگێ دگەهشتن، ڤێجا دەمێ دگەهشتن بەرك دهاڤێتن، و ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستویری یا دایە ڤان.

---

(١) مەبەست پێ چیایێ موزدەلیفەیە بۆ لایێ چەپێ یێ وی دكەڤیتە بەرامبەر وان ئەوێت بەرێ خۆ ددەنە مینایێ و مەزنترین چیایێ مەكەهێیە.

١٩٨٠ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَنَا مِمَّنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ (ﷺ) ليلة المُزْدَلِفَةِ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ. [خ١٦٧٨ (١٦٧٧)/ م١٢٩٣].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەز ژ وان بووم یێت پێغەمبەری (ﷺ) ل شەڤا موزدەلیفەیێ د گەل لاوازێت مالا خۆ پێشئێخستیم.**

## ٣١ . باب: التلبية حتى الرمي.

## بابەتێ: تەلبییەكرن هەتا بەرك هاڤێتنێ.

١٩٨١ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ رضي الله عنهما كَانَ رِدْفَ النَّبِيِّ (ﷺ) مِنْ عَرَفَةَ إِلَى المُزْدَلِفَةِ، ثُمَّ أَرْدَفَ الْفَضْلَ مِنَ المُزْدَلِفَةِ إِلَى مِنىً. قَالَ: فَكِلاَهُمَا قَالاَ: لَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ (ﷺ) يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ. [خ١٥٤٣ و١٥٤٤/ م١٢٨١].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئوسامەیێ كورێ زەیدی ل عەرەفەیێ هەتا موزدەلیفەیێ ل پشت پێغەمبەری (ﷺ) سوار بوو، پاشی فەزل ل موزدەلیفەیێ هەتا مینایێ ل پشت پێغەمبەری (ﷺ) سوار بوو، گۆت: هەردوكان گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) بەردەوام تەلبییە دكر هەتا بەرك هاڤێتینە جهێ بەرهاڤێتنا عەقەبەیێ.**

## ٣٢ . باب: رمي الجمار.

## بابەتێ: هاڤێتنا بەركا.

١٩٨٢ – (ق) عَنْ عَبْدِ الرحْمنِ بْنِ يَزِيدَ: أَنَّهُ حَجَّ مَعَ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، فَرَآهُ يَرْمِي الجَمْرَةَ الْكُبْرَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، فَجَعَلَ الْبَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ، وَمِنىً عَنْ يَمِينِهِ، ثُمَّ قَالَ: هذَا مَقَامُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ. [خ١٧٤٩ (١٧٤٧)/ م١٢٩٦].

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ یەزیدی (رحمه الله): وی حەج د گەل ئیبن مەسعوودی (رضي الله عنه) كر، و وی ئەو دیت حەفت بەرك هاڤێتنە جهێ بەرهاڤێتنا مەزن (ئەلجەمرەت ئەلكوبری یان جەمرەت ئەلعەقەبە) و كەعبە ئێخستە چەپێ خۆ، و مینا ئێخستە راستێ خۆ، پاشی گۆت: ئەڤە جهێ وییە یێ سۆرەتا بەقەرە بۆ هاتییە خوارێ.**

١٩٨٣ – (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ كَانَ يَرْمِي الجَمْرَةَ الدُّنْيَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ عَلَى إِثْرِ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ يَتَقَدَّمُ حَتَّى يُسْهِلَ، فَيَقُومُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، فَيَقُومُ طَوِيلاً، وَيَدْعُو وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ، ثُمَّ يَرْمِي الْوُسْطَى، ثُمَّ يَأْخُذُ ذَاتَ الشِّمَالِ فَيُسْهِلُ، وَيَقُومُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبلَةِ، فَيَقُومُ طَوِيلاً، وَيَدْعُو وَيَرْفَعُ

يَدَيْهِ، وَيَقُومُ طَوِيلاً، ثُمَّ يَرْمِي جَمْرَةَ ذَاتِ الْعَقَبَةِ مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، وَلاَ يَقِفُ عِنْدَهَا، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَيَقُولُ: هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَفْعَلُهُ. [خ١٧٥١].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی حەفت بەرك دهاڤێتنە جهێ بەرهاڤێتنا ئێكێ یا نێزیك، و د دویف هەر بەرکەکێڕا دگۆت: الله أكبر، پاشی پێش دکەفت ژ وی جهی دچۆ هەتا گەهشتبا جهەکێ ب ساناهی و بێ قەرەبالغ، ڤێجا دا بەرێ خۆ دەتە قیبلەیێ و درێژ دا دوعایان کەت و دەستێت خۆ بلند کەت، و پاشی دا بەرکان هاڤێژیتە جهێ ناڤنجی و پاشی دا رەخێ چەپێ گریت هەتا گەهشتبا جهەکێ ب ساناهی و بێ قەرەبالغ و دا راوەستیت و بەرێ خۆ دەتە قیبلەیێ و درێژ رادوەستا و دوعا دکر و دەستێت خۆ بلند دکرن و درێژ دما، پاشی بەرك دهاڤێتنە جهێ ئەلعەقەبێ ل بنێ نهالێ و ل دەڤ نەرادوەستا پاشی دچۆ و دگۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) یێ دیتی ئەڤە دکر.**

١٩٨٤ - (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: رَمَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ ضُحىً، وَأَمَّا بَعْدُ، فَإِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ. [م١٢٩٩].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرك ل رۆژا جەژنا قوربانی تێشتەگەهێ هاڤێتن و یێت دی پشتی رۆژ ژ نیڤا عەسمانی خوارکەفتبا.**

١٩٨٥ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ أَنْ نَرْمِيَ الْجَمْرَةَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ. [مي١٩٣٩].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ کوڕێ عوسمانێ تەیمی (رضي الله عنه) گۆت: د حەجا خاترخواستنێدا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا مە کر بەرکا باڤێژین وەکی بەرکێت بچویك[1].**

١٩٨٦ - عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: رَجَعْنَا فِي الْحَجَّةِ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) وَبَعْضُنَا يَقُولُ: رَمَيْتُ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، وَبَعْضُنَا يَقُولُ: رَمَيْتُ بِسِتٍّ، فَلَمْ يَعِبْ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ. [ن٣٠٧٧].

* صحيح الإسناد.

(١) زانایان ئەو بچویکێ ب ڤی رەنگی دەستنیشان کرییە بکەڤیتە د ناڤبەرا نۆك و باقلکێدا.

**ژ سەعیدێ کورێ ئەبی وەققاسی (رضي الله عنه) گۆت: ل حەجەکێ ئەم د گەل پێغەمبەری (ﷺ) زڤرین و هندەکان ژ مە دگۆت: من حەفت بەرك هاڤێتن و هندەکان ژ مە دگۆت: من شەش هاڤێتن و کەسێ ژ وان گازندە ژ ئێك و دو نەکرن.**

١٩٨٧ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يُكَبِّرُ عِنْدَ رَمْيِ الْجَمْرَةِ، كُلَّمَا رَمَى بِحَصَاةٍ.[ط ٩٣٠].

* إسناده صحيح.

**ژ نافعی (رضي الله عنه) گۆت: هەر گاڤا عەبدوللایێ کورێ عومری بەرکەك هاڤێتبا دگۆت: الله أكبر.**

## ٣٣ . باب: الحلق والتقصير عند التحلل.

## بابەتێ: سەرتراشین و کورتکرنێ د ئیحرام دەرکەفتنێدا.

١٩٨٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) حَلَقَ رَأْسَهُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.

[خ٤٤١٠ (١٧٢٦)/م١٣٠٤]

- وفي رواية لهما: قَالَ: حَلَقَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَطَائِفَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَقَصَّرَ بَعْضُهُمْ.

[خ١٧٢٩ (١٦٣٩)، ٤٤١١/ م١٣٠١].

- وفي رواية لهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ**). قَالُوا: وَالمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ**). قَالُوا: وَالمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**وَالْمُقَصِّرِينَ**). [خ١٧٢٧/ م١٣٠١].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت): پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د حەجا خاترخواستنێدا سەرێ خۆ تراشت.**

- **و د ڤەگێرەکا دیدا یا وان: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سەرێ خۆ تراشت و هندەکان ژ هەڤالێت وی ژی و هندەکان کورت کر.**
- **و د ڤەگێرەکا واندا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یا خودێ دلۆڤانییێ ب سەرتراشییان ببە) گۆتن و سەرکورتکرییان ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (یا خودێ دلۆڤانییێ ب سەرتراشییان ببە) گۆتن: و سەرکورتکرییان ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (و سەرکورتکرییان).**

١٩٨٩ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَتَى مِنًى، فَأَتَى الْجَمْرَةَ فَرَمَاهَا، ثُمَّ أَتَى مَنْزِلَهُ بِمِنًى وَنَحَرَ، ثُمَّ قَالَ لِلْحَلَّاقِ: (**خُذْ**)، وَأَشَارَ إِلَى جَانِبِهِ الأَيْمَنِ، ثُمَّ الأَيْسَرِ، ثُمَّ جَعَلَ يُعْطِيهِ النَّاسَ.[م١٣٠٥].

وفي رواية: نَاوَلَ الْحَالِقَ شِقَّهُ الأَيْمَنَ فَحَلَقَهُ، ثُمَّ دَعَا أَبَا طَلْحَةَ الأَنْصَارِيَّ، فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ الشِّقَّ الأَيْسَرَ، فَقَالَ: (**احْلِقْ**)، فَحَلَقَهُ، فَأَعْطَاهُ أَبَا طَلْحَةَ، فَقَالَ: (**اقْسِمْهُ بَيْنَ النَّاسِ**).

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە مینایێ و هاتە جهێ بەرهاڤێتنێ و بەرك هاڤێتن، پاشی هاتە جهێ خۆ ل مینایێ، پاشی گۆتە سەرتراشی: (بتراشە) و نیشان كرە لایێ خۆ یێ راستێ پاشی یێ چەپێ پاشی پرچا خۆ هەلگرت دا خەلكی.**

**و د ڤەگێرەكێدا: بەرێ رەخێ یێ راستێ دا سەرتراشی و تراشت پاشی گازی ئەبو تەلحەیێ ئەنساری كر و پرچا خۆ دا ڤێ، پاشی لایێ خۆ یێ چەپێ دایێ ئینا گۆت: (بتراشە) ئینا تراشت، دیسا داڤ ئەبو تەلحەیی و گۆتێ: (د ناڤ خەلكیدا بەلاڤ بكە).**

١٩٩٠ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ حَلْقٌ، إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ**). [د١٩٨٤/ مي١٩٤٦]

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ل سەر ژنان سەرتراشتن نینە و تنێ سەركورتكرن ل سەر ژنانە).**

## ٣٤ ـ باب: التقديم والتأخير في الرمي والنحر والحلق.

## بابەتێ: پێشئێخستن و پاشئێخستن د بەركهاڤێتن و ڤەكوشتن و سەرتراشینێدا.

١٩٩١ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قِيلَ لَهُ: فِي الذَّبْحِ وَالْحَلْقِ وَالرَّمْيِ، وَالتَّقْدِيمِ وَالتَّأْخِيرِ، فَقَالَ: (**لاَ حَرَجَ**). [خ١٧٣٤ (٨٤)/ م١٣٠٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: گۆتنە پێغەمبەری (ﷺ) د ڤەكوشتن و سەرتراشین و بەركهاڤێتنێدا پێشئێخستن و پاشئێخستنا وان؟ ئینا گۆت: (چو نینە).**

١٩٩٢ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَقَفَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِمِنًى لِلنَّاسِ يَسْأَلُونَهُ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ فَقَالَ: (**اذْبَحْ وَلاَ حَرَجَ**). فَجَاءَ آخَرُ فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: (**ارْمِ وَلاَ حَرَجَ**). فَمَا سُئِلَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلاَ أُخِّرَ إِلاَّ قَالَ: (**افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ**). [خ٨٣/ م١٣٠٦]

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمرێ كوڕێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل حەجا خاترخواستنێ ل مینایێ بۆ خەلكی راوەستا پرسیار ژێ دكرن، زەلامەك هاتە دەڤ و گۆت: من نەزانی من سەرێ خۆ تراشت بەری ئەز قوربانی ڤەكوژم. ئینا گۆت: (ڤەكوژە و چو نینە) ئینا ئێكێ دی هات، گۆت: من نەزانی من قوربان ڤەكوشت بەری ئەز بەركا باڤێژم؟ گۆت: (باڤێژە و چو نینە) و پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) ژ تشتەكێ پێشئێخستی و پاشئێخستی نەهاتە كرن ئەگەر نەگۆتبا: (بكە و چو نینە).**

٣٥ ـ باب: نحر الهدي والأكل والتصدق منه.

**بابەتێ: ڤەكوشتنا قوربانی و خوارن و سەدەقەكرن ژێ.**

١٩٩٣ - (ق) عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَمَرَه أَنْ يَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ يَقْسِمَ بُدْنَهُ كُلَّهَا، لُحُومَهَا وَجُلُودَهَا وَجِلاَلَهَا، وَلاَ يُعْطِيَ فِي جِزَارَتِهَا شَيْئاً. [خ١٧١٧ (١٧٠٧)/ م١٣١٧].

- وفي رواية للبخاري قال: أَهْدَى النَّبِيُّ (ﷺ) مِائَةَ بَدَنَةٍ، فَأَمَرَنِي بِلُحُومِهَا فَقَسَمْتُهَا...الحديث.[خ١٧١٨].

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) فەرمانا وی كر ئەو ل سەر حێشترێت وی كرینە قوربان راوەستیت و هەمی قوربانی بكەتە خێر، گۆشتێ وان و كەڤلێ وان و جلێت وان، و چو ژێ نەكەتە كریا سەرژێكرنا وان.**

- **و د ڤەگێرا بوخاریدا گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) سەد حێشتر كرنە قوربان و فەرمانا من ب گۆشتێ وان كر من بەلاڤ كر.**

١٩٩٤ - (ق) عَنْ زِيَادِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما أَتَى عَلَى رَجُلٍ قَدْ أَنَاخَ بَدَنَتَهُ يَنْحَرُهَا، قَالَ: ابْعَثْهَا قِيَاماً مُقَيَّدَةً، سُنَّةَ مُحَمَّدٍ (ﷺ). [خ١٧١٣/ م١٣٢٠].

**ژ زیادێ كوڕێ جوبەیری (رضي الله عنه) گۆت: من ئیبن عومەر (خودێ ژ وان رازی بیت) دیت هاتە دەڤ زەلامەكی حێشترا خۆ دانا بوو دا ڤەكوژیت، گۆت: راكەڤە و گرێدایی ئەڤە سونەتا موحەممەدییە (ﷺ).**

١٩٩٥ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: كُنَّا لاَ نَأْكُلُ مِنْ لُحُومِ بُدْنِنَا فَوْقَ ثَلاَثِ مِنىً، فَرَخَّصَ لَنَا النَّبِيُّ (ﷺ) قَالَ: (**كُلُوا وَتَزَوَّدُوا**)، فَأَكَلْنَا وَتَزَوَّدْنَا. [خ١٧١٩/ م١٩٧٢].

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: مە گۆشتێ حێشترێت خۆ یێت قوربانی پتر ژ سێ رۆژان ل مینایێ نەدخوار، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) دەستویری دا مە و گۆت: (بخۆن و بۆ خۆ بهەلگرن) ئینا مە خوار و مە بۆ خۆ هەلگرت.

### ٣٦ ـ باب: الاشتراك في الهدي.

### بابەتێ: هەڤپشكییێ د قوربانیدا.

١٩٩٦ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ. [م١٣١٨].

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: مە د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سالا حودەیبییێ حێشتر پێش حەفتانڤە ڤەكوشتن و چێل پێش حەفتانڤە.

١٩٩٧ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: ذَبَحَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَمَّنِ اعْتَمَرَ مِنْ نِسَائِهِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بَقَرَةً بَيْنَهُنَّ. [د١٧٥١/ جه٣١٣٣]

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سالا حەجا خاترخواستنێ چێلەك پێش هەڤژینێت خۆڤە یێت عومرە كرین ڤەكوژت.

### ٣٧ ـ باب: طواف الإفاضة وأحكامه.

### بابەتێ: تەوافا ئیفازێ[1] و فەرمانێت وێ.

١٩٩٨ - (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنِّي أَشْتَكِي، قَالَ: (طُوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ). فَطُفْتُ وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُصَلِّي إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ، يَقْرَأُ بِالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ. [خ٤٦٤/ م١٢٧٦].

ژ ئوم سەلەمەیێ (ﷺ) گۆت: من گازندا خۆ گەهاندە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز یا نەساخم، گۆت: (ب سواری پشت خەلكی تەوافێ بكە) من تەواف كر و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب رەخ كەعبێڤە نڤێژ دكر و (والطور وكتاب مسطور) تێدا دخواند.

---

(١) تەوافا ئیفازێ ژ شەنگستێت حەجێیە و رۆژا جەژنا قوربانی دهێتە كرن، و پشتی ئەو كارێت رۆژا ئێكێ ل جەژنێ دهێنە كرن بەرهاڤێتن و سەرژێكرنا قوربانی و سەرتراشین یان كورتكرن.

١٩٩٩ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) مَرَّ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ بِإِنْسَانٍ رَبَطَ يَدَهُ إِلَى إِنْسَانٍ بِسَيْرٍ . أَوْ بِخَيْطٍ، أَوْ بِشَيْءٍ غَيْرِ ذَلِكَ . فَقَطَعَهُ النَّبِيُّ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: (**قُدْهُ بِيَدِهِ**).[خ١٦٢٠].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر مرۆڤەكیڕا بۆری و وی تەواف ل دۆر كەعبەیێ دكر، دەستێ خۆ ب دەستێ مرۆڤەكی ب بەندكەكی یان ب دەزییەكیڤە گرێدا بوو یان ب تشتەكێ دی ژ بلی وان، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ب دەستێ خۆ بڕی و پاشی گۆت: (ب دەستێ خۆ ببە).**

٢٠٠٠ - (خ) عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٍ . إِذْ مَنَعَ ابْنُ هِشَامٍ النِّسَاءَ الطَّوَافَ مَعَ الرِّجَالِ . قَالَ: كَيْفَ يَمْنَعُهُنَّ، وَقَدْ طَافَ نِسَاءُ النَّبِيِّ (ﷺ) مَعَ الرِّجَالِ؟ قُلْتُ: أَبَعْدَ الْحِجَابِ أَوْ قَبْلُ؟ قَالَ: إِي لَعَمْرِي! لَقَدْ أَدْرَكْتُهُ بَعْدَ الْحِجَابِ. قُلْتُ: كَيْفَ يُخَالِطْنَ الرِّجَالَ؟ قَالَ: لَمْ يَكُنَّ يُخَالِطْنَ، كَانَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها تَطُوفُ حَجْرَةً مِنَ الرِّجَالِ، لاَ تُخَالِطُهُمْ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ: انْطَلِقِي نَسْتَلِمْ يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، قَالَتْ: انْطَلِقِي عَنْكِ، وَأَبَتْ، وَكُنَّ يَخْرُجْنَ مُتَنَكِّرَاتٍ بِاللَّيْلِ، فَيَطُفْنَ مَعَ الرِّجَالِ، وَلكِنَّهُنَّ كُنَّ إِذَا دَخَلْنَ الْبَيْتَ، قُمْنَ، حَتَّى يَدْخُلْنَ، وَأُخْرِجَ الرِّجَالُ. [خ١٦١٨].

**ژ ئیبن جورەیجی (رحمه الله) گۆت: عەتائی گۆتە من دەمێ ئیبن هیشامی نەهێلایی ژن د گەل زەلامان تەوافێ بكەن، ئەو چاوا رێگرییێ ل وان دكەت، و هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) تەواف د گەل زەلامان دكرن؟ من گۆت: ئەڤە بەری پەردەپۆشییێ بوو یان بەری وێ؟ گۆت: بەلێ ب راستی پشتی پەردەپۆشییێ ئەز گەهشتمە وان، ئینا من گۆت: چاوا تێكەلییا زەلامان دكرن؟ گۆت: تێكەلییا زەلامان نەدكرن، عائیشایێ تەواف ل دویری زەلامان دكر و تێكەلی وان نەدبوو، ژنەكێ گۆتێ ئەی دایكا باوەریداران وەرە بچین دەستێ خۆ ب بەرێ رەشدا بینین، گۆت: بۆ خۆ هەرە و نەڤیا بچیت، و هەڤژینێت پێغەمبەری شەڤێ خۆ دگوهۆری و دەردكەفتن و د گەل زەلامان تەواف دكر، و ئەگەر ڤیابان بچنە د كەعبێڤە ل سەر پییان رادوەستان هەتا زەلام دەركەفتبان پاشی چۆبانە د ژۆرڤە.**

٢٠٠١ - (خ) عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما يَطُوفُ بَعْدَ الْفَجْرِ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ. [خ١٦٣٠]

**ژ عەبدولعەزیزێ كورێ روفەیعی (ﷺ) گۆت: من عەبدوللایێ كورێ زوبەیری (خودێ ژ وان رازی بیت) دیت پشتی نڤێژا سپێدێ تەواف دكر و دو ركعەت نڤێژ كرن.**

٢٠٠٢ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، اسْمَعُوا مِنِّي مَا أَقُولُ لَكُمْ، وَأَسْمِعُونِي مَا تَقُولُونَ، وَلاَ تَذْهَبُوا فَتَقُولُوا: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ؛ فَلْيَطُفْ مِنْ وَرَاءِ الْحِجْرِ، وَلاَ تَقُولُوا الحَطِيمُ، فَإِنَّ الرَّجُلَ فِي الجَاهِلِيَّةِ كَانَ يَحْلِفُ، فَيُلْقِي سَوْطَهُ أَوْ نَعْلَهُ أَوْ قَوْسَهُ. [خ٣٨٤٨].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: گەلی مرۆڤان گوهێ خۆ بدەنە من یا ئەز بۆ هەوە دبێژم، و ئەوا هوین دبێژن و بلا من ژی گوه ل هەوە ببیت[1]، و نەچن و هوین بێژن: ئیبن عەباسی گۆت و ئیبن عەباسی گۆت: هەر كەسێ تەوافێ بكەت بلا پشت حیجرێ تەوافێ بكەت و نەبێژن: (الحطيم) ب راستی د نەزانینێدا زەلام هەڤپەیمانی ل وێرێ دكر، ڤێجا دا قامچییا خۆ یان شمكا خۆ یان كڤانێ خۆ هاڤێژیتە د ناڤدا.**

٢٠٠٣ - (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ رَجَعَ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمِنًى.

قَالَ نَافِعٌ: فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُفِيضُ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُصَلِّي الظُّهْرَ بِمِنًى. وَيَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) فَعَلَهُ. [م١٣٠٨].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا جەژنا قوربانی تەوافا ئیفازێ كر، پاشی زڤری نڤێژا نیڤرۆ ل مینایێ كر.**

**نافعی گۆت: ئیبن عومەری ل رۆژا جەژنێ تەوافا ئیفازێ دكر، پاشی دزڤری ل مینایێ نڤێژا نیڤرۆ دكر، و دگۆت پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤە دكر.**

٢٠٠٤ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) طَافَ طَوَافاً وَاحِداً. [ن٢٩٣٤].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ئێك تەواف ب تنێ كر[2].**

(١) ئانكو: باش گوهدارییا من بكەن و ئەوا هەوە ژ من وەرگرتی بۆ من بێژنەڤە دا بزانم هەوە دورست وەرگرتییە نان نە، كو هوین بێژن ئیبن عەباسی ئەڤە و ئەڤە گۆت و من نەگۆت بیت.

(٢) مەبەست ئێك جار هاتن و چۆن د ناڤبەرا سەفا و مەروایێدا كر، چونكی سالا حەجا خاترخواستنێ حەجا پێغەمبەری (ﷺ) ب عومرێڤە یا گرێدای بوو (قیران بوو) و حەج و عومرە ب ئێك ئیحرام بوون، بێ هۆسا جارەكێ ب تنێ دێ هاتنوچۆنێ د ناڤبەرا

٢٠٠٥ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمْ يَرْمُلْ فِي السَّبْعِ الَّذِي أَفَاضَ فِيهِ.[د٢٠٠١/ جه٣٠٦٠]

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەروەلە د حەفت گەراندا د تەوافا ئیفازێدا نەكر.**

٢٠٠٦ – وعَنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**الطَّوَافُ حَوْلَ الْبَيْتِ مِثْلُ الصَّلاَةِ، إِلاَّ أَنَّكُمْ تَتَكَلَّمُونَ فِيهِ، فَمَنْ تَكَلَّمَ فِيهِ فَلاَ يَتَكَلَّمَنَّ إِلاَّ بِخَيْرٍ**). [ت٩٦٠/ مي١٨٨٩].

* صحيح.

**و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (تەواف ل دۆر كەعبەیێ وەكی نڤێژێیە بەلێ هوین تێدا دئاخڤن، ڤێجا یێ تێدا ئاخفت ب خێرێ نەبیت بلا نەئاخڤیت).**

٢٠٠٧ – عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لاَ تَمْنَعُوا أَحَداً يَطُوفُ بِهَذَا الْبَيْتِ وَيُصَلِّي، أَيَّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ**).[د١٨٩٤/ ت٨٦٨/ ن٥٨٤/ جه١٢٥٤/ مي١٩٦٧]

* صحيح.

**ژ جوبەیرێ كورێ موتعیمی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) ڤەدگوهێزیت: گۆت: (گەلی مالا عەبد مەنافی رێكێ ل كەسێ نەگرن تەوافێ ل دۆر كەعبێ بكەت و نڤێژێ بكەت، ل هەر دەمەكێ ژ شەڤێ یان ژ رۆژێ وی بڤێت).**

٢٠٠٨ – عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍ الْقَارِيِّ: أَنَّهُ طَافَ بِالْبَيْتِ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، فَلَمَّا قَضَى عُمَرُ طَوَافَهُ، نَظَرَ فَلَمْ يَرَ الشَّمْسَ طَلَعَتْ، فَرَكِبَ حَتَّى أَنَاخَ بِذِي طُوًى، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ. [ط ٨٢٦].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ عەبدلقاری (رضي الله عنه): وی د گەل عومەرێ كورێ خەتتابی پشتی نڤێژا سپێدێ تەواف كر، ڤێجا دەمێ عومەری تەواف كری بەرێ خۆ دا رۆژێ هێژ**

---

سەڤا و مەروایێدا كەت، چونكی جارەكێ ب تنێ ل سەرە، بەلێ نەوێ عومرێ جودا دكەت و پاشی حەجێ دكەت و د ناڤبەرا واندا خۆشییێ دبەت دڤێت نەو دو جاران هاتنوچۆنێ بكەت، جارەكێ بۆ عومرەیێ و جارا دی بۆ حەجێ.

دەرنەکەتبوو سوار بوو هەتا گەهشتییە (ذي طوى) حێشترا خۆ دانا و دو رکعەت ل وێرێ کرن.

## ٣٨ ـ باب: المبيت بمنى ليالي أيام التشريق وأمر السقاية.

**بابەتێ: مانا ل شەڤێت رۆژێت تەشریقێ ل مینایێ و کاروبارێ ئاڤدانێ.**

٢٠٠٩ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: اسْتَأْذَنَ الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ المطَّلِبِ رضي الله عنه رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَنَّ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنىً مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأَذِنَ لَهُ.[خ١٦٣٤/ م١٣١٥].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عەباسێ کورێ عەبدولموتتەلبی (رضي الله عنه) دەستویری ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خواست ئەو شەڤێت مینایێ ل مەکەهێ بمینیت دا ئاڤێ بینیت، ئینا دەستویری دایێ.**

٢٠١٠ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) جَاءَ إِلَى السِّقَايَةِ فَاسْتَسْقَى، فَقَالَ الْعَبَّاسُ: يَا فَضْلُ، اذْهَبْ إِلَى أُمِّكَ، فَأْتِ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بِشَرَابٍ مِنْ عِنْدِهَا، فَقَالَ: (**اسْقِنِي**). قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّهُمْ يَجْعَلُونَ أَيْدِيَهُمْ فِيهِ، قَالَ: (**اسْقِنِي**) فَشَرِبَ مِنْهُ. ثُمَّ أَتَى زَمْزَمَ، وَهُمْ يَسْقُونَ وَيَعْمَلُونَ فِيهَا، فَقَالَ: (**اعْمَلُوا، فَإِنَّكُمْ عَلَى عَمَلٍ صَالِحٍ**)، ثُمَّ قَالَ: (**لَوْلاَ أَنْ تُغْلَبُوا لَنَزَلْتُ حَتَّى أَضَعَ الحَبْلَ عَلَى هذِهِ**)؛ يَعْنِي: عَاتِقَهُ، وَأَشَارَ إِلَى عَاتِقِهِ. [خ١٦٣٥].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ ئاڤگێری و ئاڤ خواست، ئینا عەباسی گۆت: ئەی فەزل هەرە دەڤ دایکا خۆ و هندە ئاڤێ ژ دەڤ وێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بینە، ئینا گۆت: (ئاڤێ بدە من) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو دەستێت خۆ دکەنە تێدا، گۆت: (ئاڤێ بدە من) ئینا ژێ ڤەخوار، پاشی هاتە دەڤ ئاڤا زمزمێ و وان ئاڤ ژێ ددان و ئاڤ دەردئێخست، ئینا گۆت: (کار بکەن، ب راستی هوین یێ ل سەر کارەکێ چاك)، و پاشی گۆت: (ئەگەر من ژ بەر هندێ نەبایە ل سەر هەوە ببیتە ڤەرمبالغ و خەلکەکێ زۆر خۆ ب شۆلێ هەوە بکەن دا هێمە خوار هەتا من وەریس دانابا ل سەر ڤێ) ئانکو: ستۆیێ خۆ و نیشان کرە ستۆیێ خۆ.**

٢٠١١ – عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُعَاذٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ (ﷺ) النَّاسَ بِمِنًى، وَنَزَّلَهُمْ مَنَازِلَهُمْ، فَقَالَ: (**لِيَنْزِلِ الْمُهَاجِرُونَ هَاهُنَا**) وَأَشَارَ إِلَى مَيْمَنَةِ الْقِبْلَةِ، (**وَالأَنْصَارُ هَاهُنَا**) وَأَشَارَ إِلَى مَيْسَرَةِ الْقِبْلَةِ، (**ثُمَّ لِيَنْزِلِ النَّاسُ حَوْلَهُمْ**). [د١٩٥١]

* صحيح.

[وانظر قصر الصلاة بمنى: ١٥٥٤، ١٥٥٥].

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ مەعازی (ﭬ) ژ زەلامەكی ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆتار بۆ خەلكێ ل مینایێ خواند و خەلك دانانە جهێت وان، ئینا گۆت: (بلا مشەختی ل ڤێرێ روینن) و نیشان كرە لایێ راستێ یێ قیبلەیێ (و ئەنسار بلا ل ڤێرێ روینن) و نیشان كرە لایێ چەپێ یێ قیبلەیێ، (پاشی بلا خەلك دۆرماندۆرێت وان روینن).**

## ٣٩ . باب: طواف الوداع.

### بابەتێ: تەوافا خاترخواستنێ.

٢٠١٢ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ؛ إِلاَّ أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الحَائِضِ. [خ١٧٥٥ (٣٢٩)/ م١٣٢٨)].

- وفي رواية للبخاري: قال: رُخِّصَ للحائض أن تنفر إذا حاضت. [خ٣٢٩].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: فەرمان ل خەلكێ هاتە كرن دویماهی كارێ وان د گەل كەعبێ بیت، بەلێ ل سەر ژنا بێنڤێژ هاتە سڤككرن.**

- **و د ڤەگێرەكا بوخاریدا: گۆت: دەستویری بۆ ژنا بێنڤێژ هاتە دان ئەو بزڤریت ئەگەر بێنڤێژ بوو.**

٢٠١٣ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) . أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ): يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ قَدْ حَاضَتْ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَعَلَّهَا تَحْبِسُنَا، أَلَمْ تَكُنْ طَافَتْ مَعَكُنَّ**) ؟ فَقَالُوا: بَلَى، قَالَ: (**فَاخْرُجِي**). [خ٣٢٨ (٢٩٤)/ م١٢١١].

**ژ عائیشایێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: وێ گۆتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی سەفیيا كچا حویەیی كەفتە د بێنڤێژیيێدا؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەلكی ئەو مە گیرۆ بكەت، ما وێ تەواف د گەل هەوە نەكربوو)؟ گۆتن: بەلێ، ئینا گۆت: (دەركەڤە هەرە).**

٢٠١٤ - عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ كَانَتْ إِذَا حَجَّتْ، وَمَعَهَا نِسَاءٌ تَخَافُ أَنْ يَحِضْنَ، قَدَّمَتْهُنَّ يَوْمَ النَّحْرِ فَأَفَضْنَ، فَإِنْ حِضْنَ بَعْدَ ذَلِكَ لَمْ تَنْتَظِرْهُنَّ، فَتَنْفِرُ بِهِنَّ وَهُنَّ حُيَّضٌ إِذَا كُنَّ قَدْ أَفَضْنَ. [ط ٩٤٤].

* إسناده صحيح.

**ژ عەمرەیا كچا عەبدولرەحمانی (رحمها الله) گۆت: عائیشا دایكا باوەریداران حەج كر و هندەك ژن د گەل بوون و دترسیان بكەڤنە د بێنڤێژیێدا، ئینا رۆژا جەژنێ پێشئێخستن تەوافا ئیفازێ كرن، چونكی ئەگەر ئەو پشتی هینگێ كەفتنە د بێنڤێژیێدا ئەو خۆ ناگرن و دێ چەنە مالێت خۆ و ئەو د بێنڤێژ ئەگەر وان تەوافا ئیفازێ كربیت.**

## ٤٠ . باب: إقامة المهاجر بمكة بعد النسك.

## بابەتێ: مانا مشەختی ل مەكەهێ پشتی كرنا حەجێ.

٢٠١٥ - (ق) عَنِ العَلاءِ بْنِ الحَضْرَمِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(ثَلاَثٌ لِلْمُهَاجِرِ بَعْدَ الصَّدَرِ)**. [خ٣٩٣٣/ م١٣٥٢].

- وفي رواية لمسلم: **(مُكْثُ الْمُهَاجِرِ بِمَكَّةَ، بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ، ثَلاَثاً)**.

**ژ عەلائێ كورێ حەزرەمی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سێ شەڤ بۆ مشەختینە بمینیت پشتی ژ مینایێ دزڤریت و تەوافا ئیفازێ دكەت).**

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: (مانا مشەختی ل مەكەهێ پشتی حەجا خۆ دكەت سێ شەڤن)[1].**

## ٤١ . باب: التواضع في الحج.

## بابەتێ: خۆشكاندنێ ل حەجێ.

٢٠١٦ - (خ) عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَنَسٍ قَالَ: حَجَّ أَنَسٌ عَلَى رَحْلٍ، وَلَمْ يَكُنْ شَحِيحاً، وَحَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) حَجَّ عَلَى رَحْلٍ، وَكَانَتْ زَامِلَتَهُ. [خ١٥١٧].

ولفظ ابن ماجه: قَالَ أَنَسٌ: حَجَّ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى رَحْلٍ رَثٍّ، وَقَطِيفَةٍ تُسَاوِي أَرْبَعَةَ دَرَاهِمَ أَوْ لاَ تُسَاوِي، ثُمَّ قَالَ: **(اللَّهُمَّ حَجَّةٌ لاَ رِيَاءَ فِيهَا وَلاَ سُمْعَةَ)**. [جه٢٨٩٠].

---

(١) نەڤ فەرمانە بەس بۆ مشەختییە نە بۆ هەر كەسێ هەبیت، چونكی مشەختیاتییێ فەرمانێت خۆ یێت تایبەت یێت هەین، و دڤێت نەوێ ل مەكەهێ مشەخت بوویی هند نەمینیتە ل وێرێ بێهنا هندێ ژێ بهێت ل وێرێ ناكنجی بوو.

**ژ سومامەیێ كورێ عەبدوللایێ كورێ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: ئەنەسی ل سەر جلێ حێشترەكێ حەج كر و نە یێ قەلس بوو و گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەج ل سەر جلێ حێشترەكێ كر و ئەو بارهەلگرا وی ژی بوو.**

**و د بێژەیا ئیبن ماجەدا: ئەنەسی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەج ل سەر جلەكێ كەڤن یێ حێشترەكێ كر چوار دەرهەم دئینان یان نەدئینان، پاشی دگۆت: (یا خودێ حەجەك بیت نە رویمەتی و نە ناڤ تێدا نەبیت).**

## ٤٢ ـ باب: الإحصار.

## بابەتێ: ئاسێبوونێ.

٢٠١٧ - (خ) عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: قَدْ أُحْصِرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَحَلَقَ رَأْسَهُ، وَجَامَعَ نِسَاءَهُ، وَنَحَرَ هَدْيَهُ، حَتَّى اعْتَمَرَ عَاماً قَابِلاً. [خ١٨٠٩].

**ژ عیكریمەیی (ﷺ) گۆت: ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە ئاسێكرن، ئینا سەرێ خۆ تراشت و ژ ئیحرامان دەركەفت و چۆ نڤینا هەڤژینا خۆ و قوربانێ خۆ ڤەكوشت، هەتا سالا هاتی عومرەیا خۆ كری.**

٢٠١٨ - عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ بْنَ عَمْرٍو الْأَنْصَارِيَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ كُسِرَ، أَوْ عَرِجَ؛ فَقَدْ حَلَّ، وَعَلَيْهِ الْحَجُّ مِنْ قَابِلٍ)**. قَالَ عِكْرِمَةُ: فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا هُرَيْرَةَ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالاَ: صَدَقَ. [د١٨٦٢/ ت٩٤٠/ ن٢٨٦٠/ جه٣٠٧٧/ مي١٩٣٦]

* صحيح.

**ژ عیكریمەیی (ﷺ) گۆت: من گوهـ ل حەججاجێ كورێ عەمرێ ئەنساری بوو گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ بشكێت یان لەنگ ببیت بۆ هەیە ئەو ژ ئیحرامان دەركەڤیت و حەجا سالا بهێت ل سەر وییە)[1]، عیكریمەیی گۆت: من پرسیارا ڤێ چەندێ ژ ئیبن عەباسی و ئەبو هورەیرە كر، گۆتن: راست دبێژیت.**

---

(١) نەڤە بۆ وییە یێ شكەستنەك بۆ پەیدا ببیت یان خەلیان بۆ چێ ببیت و حەجا فەرز بیت و نەشێت حەجێ ببەتە سەری، بەلێ نەگەر بشێت ب خۆ یان ب هاریكارییا غەیری خۆ ببەتە سەری دێ بەردەوام بیت و حەجا خۆ كەت و ژ ئیحرامان دەرناكەڤیت.

## ٤٣ . باب: حج النساء والصبيان.

## بابەتێ: حەجا ژنان و بچویكان.

٢٠١٩ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(لاَ يَخْلُوَنَّ رجل بِامْرَأَةٍ، ولا تُسَافِرَنَّ امرأةٌ إِلاَّ وَمَعَهَا مَحْرَمٌ)**. فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، وَخَرَجَتِ امْرَأَتِي حاجَّةً، قالَ: **(اذْهَبْ، فَاحْجُجْ مَعَ امْرَأَتِكَ)**. [خ٣٠٠٦ (١٨٦٢)/ م١٣٤١].

**ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، وی گوه ل پێغەمبەری بوو ﷺ دگۆت: (چو زەلام ب تنێ نەمیننە د گەل چو ژنان ژ بلی كو مەحرەمەك د گەل بیت)، و ژن وەغەرێ نەكەت ژ بلی كو مەحرەمەك د گەل بیت، زەلامەكی گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ، ب راستی ژنا من یا دەركەفتی حەجێ بكەت، و من خۆ بۆ خەزا هە و خەزا هە یێ نفیسی؟ گۆت: (هەرە حەجێ د گەل ژنا خۆ بكە).**

٢٠٢٠ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): لَقِيَ رَكْباً بِالرَّوْحَاءِ، فَقَالَ: **(مَنِ الْقَوْمُ)** ؟ قَالُوا: الْمُسْلِمُونَ، فَقَالُوا: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: **(رَسُولُ اللهِ)**، فَرَفَعَتْ إِلَيْهِ امْرَأَةٌ صَبِيّاً فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: **(نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ)**. [م١٣٣٦].

**ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) هندە سویار ل رەوحائێ[1] دیتن، ئینا گۆت: (هوین كینە)؟ گۆتن: ئەم موسلمانین، و گۆتن: تو كی؟ گۆت: (ئەز پێغەمبەرێ خودێمە)، ئینا ژنەكێ بچویكەك ب بەرڤە بلند كر و گۆت: خێرا حەجێ بۆ ڤی هەیە؟ گۆت: (بەلێ و بۆ تە خێرە).**

## ٤٤ . باب: الحج عن العاجز والميت.

## بابەتێ: حەجا بێچارەیی و مری.

٢٠٢١ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ رَدِيفَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، وَجَعَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الحَجِّ، أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً، لاَ يَثْبُتُ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: **(نَعَمْ)**. وَذلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ. [خ١٥١٣/ م١٣٣٤]

---

(١) رەوحاء نهالەكە د كەڤیتە د ناڤبەرا مەكەه و مەدینەیێدا و بۆ مەدینەیێ نێزیكترە و دبێژنێ بیرا رەوحاء و ئەو جهەك بوو كاروانییان بێهنا خۆ لێ ڤەددان

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: فەزل ل پشت پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) ژنەك ژ خەسعەمییان هات، ئینا فەزلی بەرێ خۆ دایێ و پێغەمبەری (ﷺ) بەرێ فەزلی وەرگێرا لایێ دی، ئینا وێ ژنێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرزا خودێ ل سەر بەندەیێت وی حەج ل سەر بابێ من واجب بوو و ئەو پیرەمێرەكێ مەزن بوو خۆ ل سەر حێشترێ ناگریت، ئەز پێشڤە حەجێ بكەم؟ گۆت: (بەلێ)، و ئەڤە د حەجا خاترخواستنێدا بوو.**

٢٠٢٢ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ، جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ، فَلَمْ تَحُجَّ حَتَّى مَاتَتْ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: **(نَعَمْ، حُجِّي عَنَها، أَرَأَيْتِ لَو كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ، أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟ اقْضُوا اللهَ، فَاللهُ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ)**. [خ١٨٥٢].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنەكا ژ جوهەینە هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: ب راستی دایكا من نەزر كربوو حەجێ بكەت، و حەج نەكر هەتا مری، ئەرێ ئەز پێشڤە بچمە حەجێ؟ گۆت: (بەلێ پێشڤە هەرە حەجێ، بێژە من ئەگەر قەرەك ل سەر دایكا تە با دا پێشڤە دەی؟ قەرێ خودێ بدەن خودێ فەرترە قەرێ وی بهێتە دان).**

٢٠٢٣ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) سَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: لَبَّيْكَ عَنْ شُبْرُمَةَ، قَالَ: **(مَنْ شُبْرُمَةُ)** ؟ قَالَ: أَخٌ لِي . أَوْ قَرِيبٌ لِي . قَالَ: **(حَجَجْتَ عَنْ نَفْسِكَ)** ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: **(حُجَّ عَنْ نَفْسِكَ، ثُمَّ حُجَّ عَنْ شُبْرُمَةَ)**. [د١٨١١/ جه٢٩٠٣]

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوهـ ل زەلامەكی بوو دگۆت: لەبەیكە ژ پێش شوبرومەیڤە، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (شوبرومە كییە)؟ گۆت: برایێ منە یان مرۆڤەكێ منە، گۆت: (تە حەج پێش خۆڤە كرییە)؟ گۆت: نەخێر، گۆت: (پێش خۆڤە بكە پاشی حەجێ پێش شوبرومەیڤە بكە).**

## ٤٥ ـ باب: خطبة حجة الوداع.

## بابەتێ: گۆتارا حەجا خاترخواستنێ.

٢٠٢٤ - (ق) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: **(الزَّمَانُ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْراً مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ: ثَلاَثَةٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدَةِ وَذُو الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبُ مُضَرَ، الَّذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ. أَيُّ شَهْرٍ هَذَا)** ؟

قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: **(أَلَيْسَ ذَا الْحِجَّةِ)** ؟ قُلْنَا: بَلَى.

قَالَ: **(فَأَيُّ بَلَدٍ هَذَا)** ؟ قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: **(أَلَيْسَ الْبَلْدَةَ)** ؟ قلنا: بَلَى.

قَالَ: **(فَأَيُّ يَوْمٍ هَذَا)** ؟ قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: **(أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ)** ؟ قُلْنَا: بَلَى.

قَالَ: **(فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ** . قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: **وَأَعْرَاضَكُمْ . عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، وَسَتَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ، فَسَيَسْأَلُكُمْ عَنْ أَعْمَالِكُمْ، أَلاَ فَلاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي ضُلاَّلاً، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَلَعَلَّ بَعْضَ مَنْ يُبَلَّغُهُ أَنْ يَكُونَ أَوْعَى لَهُ مِنْ بَعْضِ مَنْ سَمِعَهُ)** . فَكَانَ مُحَمَّدٌ إِذَا ذَكَرَهُ يَقُولُ: صَدَقَ مُحَمَّدٌ (ﷺ) . ثُمَّ قَالَ: **(أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ)** مَرَّتَيْنِ. [خ٤٤٠٦ (٦٧)/ م١٦٧٩].

**ژ ئەبی بەكرەتە (رضي الله عنه)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی زەمان ژ رۆژا خودێ عەرد و عەسمان چێكرین هەتا ئەڤرۆ وەكی خۆ دزڤریت، سال دوازدە هەیڤن، چار ژ وان ب رێز و رویمەتن، سێ دویڤ ئێكن: زولقەعیدە و زولحیججە و موحەڕەم و رەجەب، ئەوا مابەینا جومادییێ و شەعبانێ، ئەڤە چ هەیڤە)؟** مە گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، و بێ دەنگ بوو هەتا مە هزر كر، دێ ب ناڤەكی نەیێ وێ ناڤ كەت، گۆت: **(ما نە زولحیججەیە)**؟ مە گۆت: بەلێ.

گۆت: **(پا ئەڤە چ باژێرە)**؟ مە گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، و بێ دەنگ بوو هەتا مە هزر كر دێ ب ناڤەكی نە یێ وێ ناڤ كەت، گۆت: **(ما نە بەلەدولحەرامە)**؟ **(ئانكو مەكەهە)** مە گۆت: بەلێ.

گۆت: **(پا ئەڤە چ رۆژە)**؟ مە گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، و بێ دەنگ بوو هەتا مە هزر كر، دێ ب ناڤەكێ نە یێ وێ ناڤ كەت، گۆت: **(ما نە رۆژا قوربانییە)**؟ مە گۆت: بەلێ.

گۆت: **(ب راستی خودێ خوینا هەوە و مالێ هەوە و نامویسا هەوە ل سەر هەوە یێت حەرام كرین وەكی حورمەتا رۆژا هەوە ئەڤرۆ د ڤی باژێرێ هەوەدا، د ڤێ هەیڤا هەوەدا[1] هوین دێ گەهنە خودایێ خۆ و دێ پرسیارا هەوە ژ كار و كریارێت هەوە كەت، هشیار بن پشتی من نەزڤرنەڤە كارێ گاورییێ، هندەك ژ هەوە ئێك و دو بكوژن. هۆ بلا یێ حازر بگەهینیتە یێ غایب و نەحازر، دبیت هندەك ژ وان یێت دگەهیتێ ژ هندەكێت گوهـ لێ بووی تێگەهشتیتر بن). و موحەممەدێ كوڕێ سیرینی (ڤەگێرێ فەرموودەیێ) دەمێ ئەڤ فەرموودە دگۆت دا بێژیت: موحەممەدی (ﷺ) راست گۆت[2]، پاشی گۆت: (ئەرێ من گەهاند، ئەرێ من گەهاند)**، دو جاران.

## ٤٦ . باب: أحكام العمرة وفضلها.

### بابەتێ: فەرمانێت عومرەیێ و خێرا وێ.

٢٠٢٥ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا رَجَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنْ حَجَّتِهِ، قَالَ لأُمِّ سِنَانٍ الأَنْصَارِيَّةِ: **(مَا مَنَعَكِ مِنَ الحَجِّ)** ؟ قَالَتْ: أَبُو فُلاَنٍ ـ تَعْنِي: زَوْجَهَا ـ، كَانَ لَهُ نَاضِحَانِ: حَجَّ عَلَى أَحَدِهِمَا، والآخَرُ يَسْقِي أَرْضاً لَنَا. قَالَ: **(فَإِنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ، تَقْضِي حَجَّةً مَعِي)**.

[خ١٨٦٣ (١٧٨٢)/ م١٢٥٦].

ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ هەردووان رازی بیت)، گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ حەجا خۆ زڤرییەڤە گۆتە دایكا سینانێ ئەنساری: **(چ نەهێلا تو حەجێ د گەل مە بكەی)**؟ گۆت بابێ بێڤانی ئانكو: زەلامێ وێ، دو حێشترێت ئاڤكێش هەبوون، ل سەر ئێك ژ وان حەج كر و ئەوا دی زەڤیا مە بۆ مە ئاڤ ددا، گۆت: **(عومرەكا د رەمەزانێدا بەرامبەری حەجەكێیە د گەل من)**.

---

(١) ئانكو: بەرهنگارییا هەوە بۆ مال و خوین و نامویسا ئێك و دو د هەمی رۆژێت سالێدا وەكی بەرهنگاربوونا ڤێ رۆژێیە كو عەرەفەیە د ڤی باژێریدا كو مەكەهە د ڤێ هەیڤێدا كو هەیڤا حەجێیە و ژ هەیڤێت ب رێز و رویمەتە.

(٢) ئانكو: د ئاخفتنا خۆدا: هۆ بلا یێ حازر بگەهینیتە یێ غایب و نەحازر، دبیت هندەك ژ وان یێت دگەهیتێ ژ هندەكێت گوهـ لێ بووی تێگەهشتیتر بن، و وەسا دەركەفت وەكی پێغەمبەری (ﷺ) گۆتی.

٢٠٢٦ - (ق) عَنْ قَتَادَةَ: أَنَّ أَنَساً رضي الله عنه أَخْبَرَهُ قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَرْبَعَ عُمَرٍ، كُلَّهُنَّ فِي ذِي الْقَعْدَةِ؛ إِلاَّ الَّتِي كَانَتْ مَعَ حَجَّتِهِ: عُمْرَةً مِنَ الحُدَيْبِيَةِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مِنَ الْعَامِ المُقْبِلِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مِنَ الجِعْرَانَةِ، حَيْثُ قَسَمَ غَنَائِمَ حُنَيْنٍ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مَعَ حَجَّتِهِ. [خ٤١٤٨ (١٧٧٨)/ م١٢٥٣].

- وفي رواية لهما: قُلْتُ: كَمْ حَجَّ؟ قَالَ: وَاحِدَةً. [خ١٧٧٨].

**ژ قەتادەیی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: ئەنەسی (خودێ ژێ ڕازی بیت) گۆتە وی: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چوار عومرە پێت کرین هەمی د زیلقەعدەیێدا ئێك نەبیت ئەوا د گەل حەجا خۆ کری: عومرەیەك ژ حودەیبییێ د زیلقەعدەیێدا و عومرەك ژ سالا پشتی وێ د زیلقەعدەیێدا و عومرەیەك ژ جیعرانەیێ دەمێ دەسکەفتێت حونەینێ بەلاڤ کرین د زیلقەعدەیێدا و عومرەیەك ژی د گەل حەجا خۆ.**

- **و د ڤەگێڕەکا واندا: من گۆتێ: چەند حەج کرینە؟ گۆت: ئێك.**

٢٠٢٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بنِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَمَرَهُ أَنْ يُرْدِفَ عَائِشَةَ وَيُعْمِرَهَا مِنَ التَّنْعِيمِ. [خ١٧٨٤/ م١٢١٢].

**ژ عەبدولرەحمانێ کوڕێ ئەبوبەکری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا وی کر ئەو عائیشایێ ل پشت خۆ سویار بکەت و ژ تەنعیمێ[1] عومرەیێ پێ بکەت[2].**

٢٠٢٨ - (خ) قَالَ ابْنُ عُمَرَ: لَيْسَ أَحَدٌ إِلاَّ وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ وَعُمْرَةٌ.

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّهَا لَقَرِينَتُهَا فِي كِتَابِ اللهِ ﴿ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾[البقرة:١٩٦].[خ. العمرة، باب١]

**ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: کەس نینە ئەگەر حەجەك و عومرەیەك ل سەر نەبن.**

**و ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومرە د قورئانێدا جۆتکێ حەجێیە و پێڤە گرێدایە ﴿ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾.**

---

(١) نەڤرۆ گەلەك دبێژنێ مزگەفتا عائیشایێ، (٧)کم ژ کەعبەیێ دویرە.

(٢) ئانکو: بلا ل وێرێ ئیحرامان گرێدەت و نیەتا خۆ بینیت.

٢٠٢٩ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَا أَعْمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَائِشَةَ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ؛ إِلاَّ قَطْعاً لِأَمْرِ أَهْلِ الشِّرْكِ، فَإِنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا بَرَأَ الدَّبَرْ، وَعَفَا الْأَثَرْ، وَدَخَلَ صَفَرْ؛ فَقَدْ حَلَّتِ الْعُمْرَةُ لِمَنِ اعْتَمَرْ. [حم٢٣٦١].

* صحيح، وإسناده حسن.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل شەڤا مانا ل حەسبەیێ[1] عومرە ب عائیشایێ نەکر بۆ هندێ نەبیت دا کارێ خودان هەڤپشکان بشکێنیت و ببریت، وان دگۆت: ئەگەر پشتا حێشترێ خۆش بوو و شوینپێ نەمان و (صفر) دەرباز بوو عومرە حەلال بوو بۆ یێ عومرەیێ بکەت[2].**

## ٤٧ ـ باب: ما جاء في يوم الحج الأكبر.

### بابەتێ: ئەوا د راستا رۆژا حەجا مەزندا هاتی.

٢٠٣٠ – عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ يَوْمِ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ؟ فَقَالَ: (**يَوْمُ النَّحْرِ**).[ت٩٥٧]

* صحيح.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیارا رۆژا حەجا مەزن ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر: ئینا گۆت: (رۆژا جەژنێیە).**

## ٤٨ ـ باب: فضل الطواف.

### بابەتێ: خێرا تەوافێ.

٢٠٣١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَانَ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ**). [جه٢٩٥٦].

* صحيح.

---

(١) موحەسیب: ئەو جهە یێ پشتی ل مینایێ دەرکەفتین لێ ماین، دکەڤیتە د ناڤبەرا مەکەهێ و مینایێدا، جهەکێ بەرفرەهە دبێژنێ (محصب) چونکی جۆکێت ناڤێ حەسحاس ل وێرێ پێ کۆم کری، و دبێژێ نەبتوح و نوکە دبێژنێ جەعفەرییە و یا د گەل جوممێزە.

(٢) ئانکو: پشتی حێشتر ژ وەغەرا حەجێ دزڤریت و پشتا وێ یا کول ژ بەر بار و سواربوونا د دەمێ حەجێدا چێ دبیت و سواربوونا وێ خۆش دبیت و شوین پێت حێشترێت حەجیان ئەوێت د وەغەرا حەجێدا دورست بووین نەمان و بای تۆز ئینا سەر و هەیڤا (صفر)ێ ب دویماهی هات ژ نوی دورستە عومرە بهێتە کرن.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر کەسێ تەوافێ ل دۆر کەعبەیێ بکەت و دو رکعەتان نڤێژێ بکەت ئەو وەکی ئازاکرنا بەندەکییە).**

**٤٩ ـ باب: ماء زمزم.**

**بابەتێ: ئاڤا زمزم.**

٢٠٣٢ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّهَا كَانَتْ تَحْمِلُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ. وَتُخْبِرُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَحْمِلُهُ. [ت٩٦٣].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها): وێ ئاڤا زمزم هەلدگرت، و دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەلدگرت.**

٢٠٣٣ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ**).[جه٣٠٦٢].

* صحيح.

**ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ئاڤا زمزم بۆ وی تشتییە یێ بۆ دهێتە ڤەخوارن).**

**٥٠ ـ باب: من أصاب أهله وهو محرم أو قبل الإفاضة.**

**بابەتێ: یێ د ئیحرامێدا یان بەری تەوافا ئیفازێ بچیتە نڤینا ژنا خۆ.**

٢٠٣٤ – عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى عَبْدَ الله بْنَ عَمْرٍو يَسأَلُهُ عَنْ مُحْرِمٍ وَقَعَ بِامْرَأَةٍ، فَأَشَارَ إِلَى عَبْدِ الله بْنِ عُمَرَ فَقَالَ: اذْهَبْ إِلَى ذَلِكَ فَسَلْهُ. قَالَ: شُعَيْبٌ: فَلَمْ يَعْرِفْهُ الرَّجُلُ، فَذَهَبْتُ مَعَهُ فَسَأَلَ ابْنَ عُمَرَ فَقَالَ: بَطَلَ حَجُّكَ، فَقَالَ الرَّجُلُ: فَمَا أَصْنَعُ؟ قَالَ: اخْرُجْ مَعَ النَّاسِ وَاصْنَعْ مَا يَصْنَعُونَ، فَإِذَا أَدْرَكْتَ قَابِلاً فَحُجَّ وَأَهْدِ. فَرَجَعَ إِلَى عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو وَأَنَا مَعَهُ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ: اذْهَبْ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَلْهُ. قَالَ شُعَيْبٌ: فَذَهَبْتُ مَعَهُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ ابْنُ عُمَرَ، فَرَجَعَ إِلَى عَبْد الله بْنِ عَمْرٍو وَأَنَا مَعَهُ، فَأَخْبَرَهُ بِمَا قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ثُمَّ قَالَ: مَا تَقُولُ أَنْتَ؟ فَقَال: قَوْلِي مِثْلَ مَا قَالاَ. [ك٢٢٧٥/هق١٦٧١/٥].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ عەمرێ کورێ شوعەیبی ژ بابێ خۆ (ﷺ) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ عەبدوللایێ کورێ عەمری پرسیارا زەلامەکی ژێ کر د ئیحرامانداا چۆبیتە نڤینا ژنەکێ؟ ئینا نیشان کرە عەبدوللایێ کورێ عومەری و گۆت: هەرە دەڤ وێهە پرسیارێ ژ وی بکە، شوعەیبی گۆت: وی زەلامی ئەو نەدنیاسی ئەز د گەل چۆم، پرسیارا ئیبن عومەری کر، ئینا ئیبن عومەری گۆت: حەجا تە پویچ بوو، ئینا زەلامی گۆتێ پا ئەز چ بکەم؟ گۆت: د گەل خەلکی هەرە وێ بکە یا ئەو دکەن ئەگەر تو گەهشتییە سالا بهێت حەجێ بکە و قوربانەکی بدە، ئینا زڤری دەڤ عەبدوللایێ کورێ عەمری و ئەز د گەل وی بووم و گۆتێ، ئینا گۆتێ هەرە دەڤ ئیبن عەباسی پرسیارێ ژێ بکە، شوعەیبی گۆت: ئەز د گەل وی چۆمە دەڤ ئیبن عەباسی، ئینا پرسیارا وی کر، ئەو گۆتە وی یا ئیبن عومەری گۆتییێ، و زڤریڤە دەڤ عەبدوللایێ کورێ عەمری و ئەز د گەل وی بووم، یا ئیبن عەباسی گۆتییە وی بۆ وی گۆت، پاشی گۆت: و تو چ دبێژی؟ ئینا گۆت: گۆتنا من وەکی وێیە یا وان گۆتی.**

٢٠٣٥ - عَنْ عِكْرِمَةَ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَجُلاً وَامْرَأَتَهُ مِنْ قُرَيْشٍ لَقِيَا ابْنَ عَبَّاسٍ بِطَرِيقِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: أَصَبْتُ أَهْلِي، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَمَّا حَجُّكُمَا هَذَا فَقَدْ بَطَلَ، فَحُجَّا عَاماً قَابِلاً ثُمَّ أَهِلاً مِنْ حَيْثُ أَهْلَلْتُمَا، حَتَّى إِذَا بَلَغْتُمَا حَيْثُ وَقَعْتَ عَلَيْهَا فَفَارِقْهَا، فَلاَ تَرَاكَ وَلاَ تَرَاهَا حَتَّى تَرْمِيَا الْجَمْرَةَ وَأَهْدِ نَاقَةً وَلْتُهْدِ نَاقَةً. [هق٥/١٦٨].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ عیکریمەیی ئازاکرییێ ئیبن عەباسی (ﷺ) گۆت: زەلامەك و ژنەکا قوریشی ل سەر رێکا مەدینەیێ گەهشتنە ئیبن عەباسی، ئینا گۆت: ئەز چۆمە نڤینا ژنا خۆ؟ ئینا ئیبن عەباسی گۆت: هندی حەجا هەوەیە پویچ بوو، سالا بهێت حەجێ بکەن و ل ئەو جهێ هەوە ئنیەت لێ ئینایی هەر ل وی جهی ئنیەتێ بینن هەتا هوین دگەهنە وی جهێ تو تێدا چۆیە نڤینا ژنا خۆ، ل وێرێ ژێکڤە ببن نە تو وێ ببینی و نە ئەو تە ببینیت هەتا هوین بەرکان دهاڤێژن، و تو حێشترەکێ بکە قوربان و بلا ئەو حێشترەکێ بکەتە قوربان.**

٢٠٣٦ - عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: جَاءَ ابْنَ عَبَّاسٍ رَجُلٌ فَقَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي قَبْلَ أَنْ أَزُورَ، فَقَالَ: إِنْ كَانَتْ أَعَانَتْكَ فَعَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنْكُمَا نَاقَةٌ حَسْنَاءُ جَمْلاَءُ، وَإِنْ كَانَت لَمْ تُعِنْكَ فَعَلَيْكَ نَاقَةٌ حَسْنَاءُ جَمْلاَءُ. [هق٥/١٦٨].

* قال النووي في المجموع (٧/٣٨٧): إسناده صحيح.

**ژ سەعیدێ کوڕێ جوبەیری (ﷺ) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ ئیبن عەباسی، گۆت: ئەز چۆمە نڤینا ژنا خۆ بەری تەوافا ئیفازێ بکەم؟ گۆت: ئەگەر وێ هاریکارییا تە کربیت ئەڤە هەر ئێك ژ هەوە حێشترەکا مێ یا باش و بێ کێماسی ل سەرە، و ئەگەر هاریکارییا تە نەکربیت حێشترەکا مێ و باش و بێ کێماسی ل سەر تەیە.**

## ٥١ . باب: من فاته الحج.

## بابەتێ: یێ حەج ژێ چۆ.

٢٠٣٧ - عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ خَرَجَ حَاجّاً، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالنَّازِيَةِ مِنْ طَرِيقِ مَكَّةَ أَضَلَّ رَوَاحِلَهُ، وَإِنَّهُ قَدِمَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ يَوْمَ النَّحْرِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ عُمَرُ: اصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الْمُعْتَمِرُ، ثُمَّ قَدْ حَلَلْتَ، فَإِذَا أَدْرَكَكَ الْحَجُّ قَابِلاً فَاحْجُجْ، وَأَهْدِ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ.[ط ٨٧٠].

* إسناده صحيح.

**ژ سولەیمانێ کوڕێ یەساری (ﷺ) گۆت: ئەبو ئەیووبێ ئەنساری بۆ حەجێ دەرکەفت هەتا گەهشتییە نازییێ[1] ل سەر رێکا مەکەهێ حێشترێت خۆ بەرزەکرن، و ئەو ل رۆژا جەژنێ هاتە دەڤ عومەرێ کوڕێ خەتتابی و ئەوا ب سەری هاتی بۆ ڤەگێرا، ئینا عومەری گۆتێ: وێ بکە یا عومرەچی دکەت و پاشی تو ژ ئیحرامان دەرکەفتی، و ئەگەر تو گەهشتییە حەجا سالا بهێت وەرە حەجێ و چ ب دەست تە کەفت بکە قوربان.**

## ٥٢ . باب: الحج كل خمس سنوات.

## بابەتێ: حەجکرن ل هەر پێنج سالان جارەکێ.

٢٠٣٨ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**قَالَ اللهُ: إِنَّ عَبْداً صَحَّحْتُ لَهُ جِسْمَهُ، وَوَسَّعْتُ عَلَيْهِ فِي الْمَعِيْشَةِ، يَمْضِي عَلَيْهِ خَمْسَةُ أَعْوَامٍ لا يَفِدُ إِلَيَّ لَمَحْرُومٌ**).[حب٣٧٠٣/ هق٥/٢٦٢].

* حديث صحيح.

---

(١) جهەکە ل سەر رێکا مەکەهێ، کانییەکا ئاڤێ لێ بوو.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ گۆت: بەندەیەكی من لەشێ وی ساخلەم كربیت و ژیارا وی بەرفرەھ كربیت پێنج سال ب سەرڤە بچن و نەھێتە دەڤ من ب راستی ئەو بێ زڕبارە).**

## ٥٣ . باب: من نسي من نسكه شيئاً.

## بابەتێ: بێ تشتەك ژ كارێت حەجێ ژبیر كربیت.

٢٠٣٩ – عن عَبْدِ الله بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِهِ شَيْئاً أَوْ تَرَكَهُ، فَلْيُهْرِقْ دَماً.[هق٥/١٥٢].

* قال النووي: صحيح موقوفاً.

[وانظر: ١٩٢٦].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەر كەسێ تشتەك ژ كارێت حەجێ ژبیر كربیت یان نەكربیت بلا قوربانەكی بدەت.**

## ٥٤ . باب: حجة النبي (ﷺ).

## بابەتێ: حەجا پێغەمبەری (ﷺ).

٢٠٤٠ – (م) عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، فَسَأَلَ عَنِ الْقَوْمِ حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ، فَقُلْتُ: أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، فَأَهْوَى بِيَدِهِ إِلَى رَأْسِي فَنَزَعَ زِرِّي الأَعْلَى، ثُمَّ نَزَعَ زِرِّي الأَسْفَلَ، ثُمَّ وَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ غُلاَمٌ شَابٌّ، فَقَالَ: مَرْحَباً بِكَ يَا ابْنَ أَخِي! سَلْ عَمَّا شِئْتَ. فَسَأَلْتُهُ وَهُوَ أَعْمَى، وَحَضَرَ وَقْتُ الصَّلاَةِ، فَقَامَ فِي نِسَاجَةٍ مُلْتَحِفاً بِهَا، كُلَّمَا وَضَعَهَا عَلَى مَنْكِبِهِ رَجَعَ طَرَفَاهَا إِلَيْهِ مِنْ صِغَرِهَا، وَرِدَاؤُهُ إِلَى جَنْبِهِ، عَلَى الْمِشْجَبِ، فَصَلَّى بِنَا.

فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَجَّةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ بِيَدِهِ، فَعَقَدَ تِسْعاً، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَكَثَ تِسْعَ سِنِينَ لَمْ يَحُجَّ، ثُمَّ أَذَّنَ فِي النَّاسِ فِي الْعَاشِرَةِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) حَاجٌّ. فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ، كُلُّهُمْ يَلْتَمِسُ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَيَعْمَلَ مِثْلَ عَمَلِهِ.

فَخَرَجْنَا مَعَهُ، حَتَّى أَتَيْنَا ذَا الْحُلَيْفَةِ، فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ): كَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ: (**اغْتَسِلِي، وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ، وَأَحْرِمِي**).

فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ، حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ عَلَى الْبَيْدَاءِ، نَظَرْتُ إِلَى مَدِّ بَصَرِي بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ رَاكِبٍ وَمَاشٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ مِثْلَ ذلِكَ، وَعَنْ يَسَارِهِ مِثْلَ ذلِكَ، وَمِنْ

خَلْفِهِ مِثْلَ ذلِكَ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) بَيْنَ أَظْهُرِنَا، وَعَلَيْهِ يَنْزِلُ الْقُرْآنُ، وَهُوَ يَعْرِفُ تَأْوِيلَهُ، وَمَا عَمِلَ بِهِ مِنْ شَيْءٍ عَمِلْنَا بِهِ.

فَأَهَلَّ بِالتَّوْحِيدِ (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ**). وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهَذَا الَّذِي يُهِلُّونَ بِهِ، فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَيْهِمْ شَيْئاً مِنْهُ، وَلَزِمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) تَلْبِيَتَهُ.

قَالَ جَابِرٌ رضي الله عنه: لَسْنَا نَنْوِي إِلاَّ الْحَجَّ، لَسْنَا نَعْرِفُ الْعُمْرَةَ، حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا الْبَيْتَ مَعَهُ، اسْتَلَمَ الرُّكْنَ، فَرَمَلَ ثَلاَثاً، وَمَشَى أَرْبَعاً، ثُمَّ نَفَذَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ عليه السلام، فَقَرَأَ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ﴾ [البقرة:١٢٥] فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، فَكَانَ أَبِي يَقُولُ ـ وَلاَ أَعْلَمُهُ ذَكَرَهُ إِلاَّ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ: كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾، وَ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ.

ثُمَّ خَرَجَ مِنَ الْبَابِ إِلَى الصَّفَا، فَلَمَّا دَنَا مِنَ الصَّفَا قَرَأَ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ﴾ [البقرة:١٥٨] (**أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللهُ بِهِ**). فَبَدَأَ بِالصَّفَا، فَرَقِيَ عَلَيْهِ حَتَّى رَأَى الْبَيْتَ، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَوَحَّدَ اللهَ وَكَبَّرَهُ، وَقَالَ: (**لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ**). ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذلِكَ، قَالَ مِثْلَ هَذَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. ثُمَّ نَزَلَ إِلَى الْمَرْوَةِ، حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِي بَطْنِ الْوَادِي سَعَى، حَتَّى إِذَا صَعِدَتَا مَشَى، حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ، فَفَعَلَ عَلَى الْمَرْوَةِ كَمَا فَعَلَ عَلَى الصَّفَا.

حَتَّى إِذَا كَانَ آخِرُ طَوَافِهِ عَلَى الْمَرْوَةِ فَقَالَ: (**لَوْ أَنِّي اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ لَمْ أَسُقِ الْهَدْيَ، وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً، فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ لَيْسَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيَحِلَّ، وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً**).

فَقَامَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلِعَامِنَا هَذَا أَمْ لِأَبَدٍ؟ فَشَبَّكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَصَابِعَهُ وَاحِدَةً فِي الأُخْرَى، وَقَالَ: (**دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِي الْحَجِّ**) مَرَّتَيْنِ (**لاَ، بَلْ لِأَبَدِ أَبَدٍ**).

وَقَدِمَ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ بِبُدْنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَوَجَدَ فَاطِمَةَ رضي الله عنها مِمَّنْ حَلَّ، وَلَبِسَتْ ثِيَاباً صَبِيغاً، وَاكْتَحَلَتْ، فَأَنْكَرَ ذلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: إِنَّ أَبِي أَمَرَنِي بِهَذَا. قَالَ: فَكَانَ عَلِيٌّ يَقُولُ بِالْعِرَاقِ: فَذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مُحَرِّشاً عَلَى فَاطِمَةَ لِلَّذِي صَنَعَتْ، مُسْتَفْتِياً لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِيمَا ذَكَرَتْ عَنْهُ، فَأَخْبَرْتُهُ

أَنِّي أَنْكَرْتُ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: (**صَدَقَتْ صَدَقَتْ، مَاذَا قُلْتَ حِينَ فَرَضْتَ الْحَجَّ**) ؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُكَ، قَالَ: (**فَإِنَّ مَعِيَ الْهَدْيَ، فَلاَ تَحِلُّ**).

قَالَ: فَكَانَ جَمَاعَةُ الْهَدْيِ الَّذِي قَدِمَ بِهِ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ وَالَّذِي أَتَى بِهِ النَّبِيُّ (ﷺ) مَائَةً.

قَالَ: فَحَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ وَقَصَّرُوا؛ إِلاَّ النَّبِيَّ (ﷺ) وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ. فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ تَوَجَّهُوا إِلَى مِنىً، فَأَهَلُّوا بِالْحَجِّ، وَرَكِبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَصَلَّى بِهَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ، ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلاً حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَأَمَرَ بِقُبَّةٍ مِنْ شَعْرٍ تُضْرَبُ لَهُ بِنَمِرَةً.

فَسَارَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَلاَ تَشُكُّ قُرَيْشٌ إِلاَّ أَنَّهُ وَاقِفٌ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ، كَمَا كَانَتْ قُرَيْشٌ تَصْنَعُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَجَازَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ، فَنَزَلَ بِهَا.

حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ، فَرُحِلَتْ لَهُ، فَأَتَى بَطْنَ الْوَادِي، فَخَطَبَ النَّاسَ وَقَالَ:

**(إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ، وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ، وَإِنَّ أَوَّلَ دَمٍ أَضَعُ مِنْ دِمَائِنَا دَمُ ابْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ، كَانَ مُسْتَرْضِعاً فِي بَنِي سَعْدٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ. وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ رِباً أَضَعُ رِبَانَا، رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ. فَاتَّقُوا اللهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللهِ، وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لاَ يُوْطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَداً تَكْرَهُونَهُ، فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْباً غَيْرَ مُبَرِّحٍ، وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ. وَقَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ: كِتَابُ اللهِ، وَأَنْتُمْ تُسْأَلُونَ عَنِّي، فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ)**؟.

قَالُوا: نَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ وَأَدَّيْتَ وَنَصَحْتَ.

فَقَالَ بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ، يَرْفَعُهَا إِلَى السَّمَاءِ وَيَنْكُتُهَا إِلَى النَّاسِ: (**اللَّهُمَّ اشْهَدْ. اللَّهُمَّ اشْهَدْ**) ثَلاَثَ مَرَّاتٍ.

ثُمَّ أَذَّنَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئاً.

ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ، فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ الْقَصْوَاءِ إِلَى الصَّخَرَاتِ، وَجَعَلَ حَبْلَ الْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفاً حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ قَلِيلاً حَتَّى غَابَ الْقُرْصُ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ خَلْفَهُ، وَدَفَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَقَدْ شَنَقَ لِلْقَصْوَاءِ الزِّمَامَ حَتَّى إِنَّ رَأْسَهَا لَيُصِيبُ

مَوْرِكَ رَحْلِهِ، وَيَقُولُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى: (**أَيُّهَا النَّاسُ، السَّكِينَةَ السَّكِينَةَ**) كُلَّمَا أَتَى حَبلاً مِنَ الْحِبَالِ أَرْخَى لَهَا قَلِيلاً، حَتَّى تَصْعَدَ.

حَتَّى أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ، فَصَلَّى بِهَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شَيْئاً، ثُمَّ اضْطَجَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، وَصَلَّى الْفَجْرَ، حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ، بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ.

ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ، حَتَّى أَتَى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَدَعَاهُ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ وَوَحَّدَهُ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفاً حَتَّى أَسْفَرَ جِدّاً، فَدَفَعَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ بْنَ عَبَّاسٍ، وَكَانَ رَجُلاً حَسَنَ الشَّعْرِ أَبْيَضَ وَسِيماً. فَلَمَّا دَفَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مَرَّتْ بِهِ ظُعُنٌ يَجْرِينَ، فَطَفِقَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهِنَّ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَدَهُ عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ، فَحَوَّلَ الْفَضْلُ وَجْهَهُ إِلى الشِّقِّ الآخَرِ يَنْظُرُ، فَحَوَّلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَدَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ، يَصْرِفُ وَجْهَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ يَنْظُرُ، حَتَّى أَتَى بَطْنَ مُحَسِّرٍ، فَحَرَّكَ قَلِيلاً.

ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى الَّتِي تَخْرُجُ عَلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى، حَتَّى أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ، فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا، حَصَى الْخَذْفِ، رَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي.

ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمَنْحَرِ، فَنَحَرَ ثَلاَثاً وَسِتِّينَ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَعْطَى عَلِيّاً، فَنَحَرَ مَا غَبَرَ، وَأَشْرَكَهُ فِي هَدْيِهِ. ثُمَّ أَمَرَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ، فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ، فَطُبِخَتْ، فَأَكَلاَ مِنْ لَحْمِهَا وَشَرِبَا مِنْ مَرَقِهَا. ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَأَفَاضَ إِلَى الْبَيْتِ، فَصَلَّى بِمَكَّةَ الظُّهْرَ، فَأَتَى بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ يَسْقُونَ عَلَى زَمْزَمَ، فَقَالَ: (**انْزِعُوا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ! فَلَوْلاَ أَنْ يَغْلِبَكُمُ النَّاسُ عَلَى سِقَايَتِكُمْ، لَنَزَعْتُ مَعَكُمْ**)، فَنَاوَلُوهُ دَلْواً، فَشَرِبَ مِنْهُ. [م١٢١٨].

**ژ جەعفەرێ كوڕێ موحەممەدی (رحمه الله) ژ بابێ خۆ، گۆت: ئەم چۆینە دەڤ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی، پرسیار ژ وان كر كا كینە هەتا گەهشتییە من، ئینا من گۆت ئەز موحەممەدێ كوڕێ عەلییێ كوڕێ حوسەینیمە، ئینا دەستێ خۆ هاڤێتە سەرێ من و قومچكا من یا سەری پاشی یا بنی ڤەكر، پاشی دەستێ خۆ دانا د ناڤبەرا هەردو چچكێت مندا و ئەز هینگێ گەنجەكێ بسپۆر بووم، ئینا گۆت: ب خێر بهێی ئەی برازایێ من، تشتێ تە ژ من بڤێت پرسیار بكە، من پرسیار ژێ كر و ئەو یێ كۆرە بوو، و دەمێ نڤێژێ هات رابوو پارچەكا پاتەیێ رێسایی د خۆ وەركربوو، هەر گاڤا لفكا وێ دانابا سەر ملێ خۆ دزڤریڤە هندی یا بچویك بوو، و پارچا ناڤتەنگا سلال ل بەر تەنشتا وی ل سەر هندە**

چیڤكان بوو سەرێت وان پێكڤە گرێدایی و بنێت وان ل عەردی چكلاندی و نڤێژ بەراهییا مە كر.

ئینا من گۆت: بۆ من بەحسێ حەجا پێغەمبەرێ خودێ بكە (ﷺ)، ئینا ب دەستێ خۆ نەهـ دورست كر[1] و گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهـ سالان ما و حەج نەكر، پاشی سالا دەهێ د ناڤ خەلكیدا گازی كر كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە ساله دێ حەجێ كەت، لەوا خەلكەكێ گەلەك هاتنە مەدینەیێ هەمیان دخواست چاڤ ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بكەن و ئەو وەكی كارێ وی بكەن.

ئینا ئەم د گەل وی دەركەفتین هەتا هاتینە زیلحولەیفەیێ[2]، ل وێرێ ئەسمائا كچا عومەیسی موحەممەدێ كوڕێ ئەبی بەكری بوو، ئینا هنارتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كا ئەو چ بكەت؟ گۆت: **(سەرێ خۆ بشۆ و خۆ ب جلكەكی بپێچە و ئیحرامان گرێدە و ئنیەتێ بینە).**

پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل مزگەفتێ كر پاشی ل حێشترا قەسواء سویار بوو هەتا ل دەشتا بەیدائێ[3] ل سەر پشتێ راوەستایی، من بەرێ خۆ دایێ هندی چاڤ دبینن من سویار و پەیادە ل پێشییا وی دیتن، و ل رەخێ وی یێ راستێ هەروەسا، و ل رەخێ وی یێ چەپێ هەروەسا، و ل پشت وی هەروەسا، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ناڤ مەدا بوو و قورئان بۆ وی دهاتە خوارێ و وی راڤەكرنا وێ دزانی و هەر كارەكێ پێ كربیت مە ژی كار پێ كری.

ب ئێكینییا خودێ دەست ب حەجێ كر (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ) (بەرسڤدان دویڤ بەرسڤدانێ بۆ گازییا تە ئەی خودایێ من[4] بەرسڤدان بۆ گازییا تە چو شریك و هەڤپشك بۆ تە نینن، ب راستی پەسن و سوپاسی هەر بۆ تەیە، و نیعمەت هەمی ل دەڤ تەنە و یێت تەنە). و خەلكی ژی ب

---

(١) ئانكو: نەهـ تلێت خۆ ژ دەستێ خۆ گەهاندنە ئێك و مچاندن.

(٢) ڤێ گاڤێ ب ئەبیار عەلی ناڤدارە، نێزیكی (١٠)كم ژ مەدینەیێ دویرە و (٤٢٠) كم ژ مەكەهێ.

(٣) جهەكە نێزیكی زیلحولەیفەیە، و چو ئاڤاهی لێ نینن، و بیرەكا ئاڤێ لێ بوو، (٤٢٠)كم ژ مەكەهێ دویرە.

(٤) ئانكو: ئەڤە ئەز بەر ب ئەمرێ تەڤە هاتم، ئەی خودا ئەو تشتێ تو دبێژی ئەڤە ئەز هاتم ب جهـ بینم.

ئەوا دەست پێ دکەن دەست ب حەجێ کرن و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چو ژ وان نەزڤراند یا وان دگۆت[1]، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ما ب تەلبییا خۆڤە.

جابری (رضي الله عنه) گۆت: مە ئنیەت نەئینابوو بۆ حەجێ ب تنێ نەبیت، و مە عومرە نەدزانی هەتا ئەم د گەل هاتینە کەعبەیێ[2]، دەست کرە بەرێ رەش و سێ گەڕان هەروەلە کر و چواران ئاسایی چۆ، پاشی بۆ لایێ جهێ ئیبراهیمی چۆ، ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ﴾ و جهێ ئیبراهیمی هێلا د ناڤبەرا خۆ و کەعبەیێدا، و جەعفەری گۆت: بابێ من موحەممەدی دگۆت: و ئەز هزر ناکەم ئەگەر ژ پێغەمبەری (ﷺ) نەبیت گۆتبیت: د هەردو رکعەتاندا ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ دخواند پاشی زڤری کوژییێ بەرێ رەش و بەر ڤەمالی.

پاشی د دەرگەهێڕا بۆ سەفایێ دەرکەفت، ڤێجا دەمێ ژ سەفایێ نێزیك بووی ئەڤە ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ﴾ خواند و گۆت: **(ئەز ب وێ دەست پێ دکەم یا خودێ دەست پێ کری)**، دەست ب سەفایێ کر ب لێ ب سەرکەفت هەتا کەعبە دیتی و بەرێ خۆ دا رویگەهێ و ئێکینییا خودێ کر و مەزن راگرت و تەکبیر کر و گۆت: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ) (ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت، و یێ بێ شریك و بێ هەڤالە، و هەمی مولك و سەروەری و پەسن و حەمد بۆ وینە، و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە، چو پەرستی یێت راست و دورست نینن ئەو ب تنێ نەبیت، پەیمانا خۆ ب جه ئینا و بەندەیێ خۆ ب سەر ئێخست و وی ب تنێ هەڤپەیمان شکاندن)، پاشی د ناڤبەرا ڤێدا دوعا کرن، و وەکی ڤێ سێ جاران گۆت: پاشی هاتە خوار چۆ مەروایێ هەتا پێت وی گەهشتینە نیڤا نهالێ لەز

(١) ئانکو: هندەکان ب تەکبیرێ دەست پێ دکر و هندەکان نەڤە ل سەر زێدە دکر (لبيك لبيك، وسعديك، والخير بيديك لبيك، والرغباء إليك والعمل) و پێغەمبەری ل کەسێ نەدزڤراند وەسا دەست پێ نەکە.

(٢) نیشانە بۆ هندێ وان هزر دکر وەکی عەرەبان بەرێ هزر دکر عومرە د هەیڤێت حەجێدا نەدورستە هەتا پێغەمبەری (ﷺ) نەڤ شاشییە راکری.

كر هەتا ژێ سەركەفتی ئاسایی چۆ، هەتا هاتی گەهشتییە مەروایێ ئەو ل سەر مەروایێ كر یا ل سەر سەفایێ كری.

هەتا چۆنا خۆ یا دویماهییێ ل سەر مەروایێ كری، گۆت: **(ئەگەر ئەڤا من ل پاشییێ زانی ل پێشییێ زانیبایە، من قوربان د گەل خۆ نەدئینان، و دا كەمە عومرە، ڤێجا هەر كەسێ ژ هەوە قوربان د گەل نەبیت بلا ژ ئیحرامان دەركەڤیت و بلا بكەتە عومرە).**

ئینا سوراقەیێ كوڕێ مالكێ جوعشەمی رابوو و گۆت: (ئەڤە بەس بۆ سالا مەیە، یان بۆ هەتا هەتایە؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تلێت خۆ كرنە د ناڤێكدا و گۆت: **(عومرە چۆ د ناڤ حەجێدا)** دو جاران **(نەخێر بۆ هەتا هەتایە).**

و عەلی ژ یەمەنێ ب قوربانێت پێغەمبەری (ﷺ) هات، ئینا فاتما دیت (رضي الله عنها) یا ژ ئیحرامان دەركەفتی و جلكەكێ رەنگكری یێ كرییە بەر خۆ و یا خۆ كلدایی، ئەڤە نەدورستی ژێ دیت، ئینا گۆت: بابێ من فەرمانا من ب ڤێ یا كری، گۆت: علی ل عیراقێ دگۆت: ئەز چۆمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر فاتیمایێ گەرم كەم و گازندێ لێ بكەم و پرسیارا وێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) یا وێ ژێ ڤەگوهاستی بكەم، من گۆت: من ئەڤە ژ وێ دورست نەدیت، ئینا گۆت: **(دورست كر دورست كر، تە چ گۆتییە دەمێ تە حەج ل سەر خۆ ئێخستی (تە چ ئنیەت ئینایە و چاوا ئینایە؟)** گۆت: (من گۆت ئەی خودا ئەز وێ ئنیەتێ دئینم یا پێغەمبەرێ خودێ ئینایی) ئینا گۆت: **(پا قوربانی د گەل من ژ بەر هندێ ژ ئیحرامان دەرنەكەڤە).**

گۆت: هژمارا وان قوربانییان ئەوێت عەلی ژ یەمەنێ ئینایین و یێت پێغەمبەری (ﷺ) ژ مەدینەیێ ئینایین سەد بوون.

گۆت: هەمی خەلكی ئیحرام شكاندن و سەرێت خۆ كورت كرن[1]، ڤێجا دەمێ بوویە رۆژا تەروییێ[2] پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوێت قوربان د گەل نەی، بەرێ خۆ دانە مینایێ و ئنیەتا حەجێ ئینان، و دەست ب حەجێ كرن و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سویار بوو و

---

(١) هەلبەت مەبەست ئەو خەلكن ئەوێت قوربان د گەل خۆ نەئینایین.

(٢) رۆژا هەشتێ ژ دەهكان رۆژا چۆنا مینایێ.

نڤێژا نیڤرۆ و ئێڤاری و مەغرەب و عەیشا و سپێدێ ل وێرێ كرن، پاشی كێمەكێ خۆ گرت هەتا رۆژ دەركەفتی و فەرمان كر گومبەتەكێ ل نەمیرە بۆ ڤەدەن.

ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ و قورەیشی ب گۆمان نەبوون ئەو دێ ل موزدەلیفەیێ راوەستیت هەروەكی قورەیشییان ئەڤە د نەزانینێدا دكر، پێغەمبەرێ خودێ ژێ بۆری هەتا هاتییە عەرەفێ و گومبەت دیت یا بۆ هاتییە ڤەدان چۆ تێڤە.

هەتا رۆژ ژ نیڤا عەسمانی خوارکەفتی، فەرمان کر حێشترا وی بۆ بینن، و بۆ ئینان و زین لێ کر، و لێ سویار بوو هەتا گەهشتییە نیڤا نهالێ (مەبەست پێ نهالا عورەنەیە) گۆتار بۆ خەلكی دا و گۆت:

**(ب راستی خوینا هەوە و مالێ هەوە ل سەر هەوە د حەرامکرینە وەکی حورمەتا رۆژا هەوە ئەڤرۆ، د ڤێ هەیڤا هەوەدا، د ڤی باژێرێ هەوەدا[1]، بزانن هەمی كاروبارێت نەزانینێ د بن پێت منڤە دانایینە، و خوینێت نەزانینێ د دانایینە، و خوینا ئێكێ ئەز ددانم (نە تۆلڤەكرن و نە خوین وەرگرتن تێدایە) ژ خوینا مە خوینا كورێ رەبیعەیێ كورێ حارسییە، بەنی سەعد شیر ددایێ، و هوزەیلێ كوشت، و سەلەڤا نەزانینێ زێدەهییا وێ ناهێتە وەرگرتن، و ب راستی سەلەڤا ئێكێ زێدەیێ ژێ ددانم سەلەڤا مامێ من عەباسێ كورێ عەبدولموتتەلبییە، ئەو زێدەهی هەمی یا ژێئێخستییە، و د ژناندا[2] ژ خودێ بترسن، ب راستی هەوە ب پەیمانا خودێ ب نەرمی و چاكییێ د گەل بن وەرگرتینە، و ب فەرمانا خودێ هەوە دەمانا وان بۆ خۆ حەلال كرییە، و حەقێ هەوە ل سەر وانە یێ هەوە نەڤێت نەهێتە سەر نڤینێت هەوە، و ئەگەر وەنەكرن[3] لێ بدەن لێدانەكا بێ ئێش و خوارنا وان و جلكێ وان ب چاكی ل سەر هەوەیە، و من ئەو یێ د ناڤ هەوەدا هێلایی یا هوین ئەگەر خۆ پێڤە بگرن بەرزە نەبن كتێبا خودێ، و دێ پرسیارا من ژ هەوە هێتە كرن[4]، هوین دێ چ بێژن)؟**

---

(١) ئانكو: بەرهنگارییا هەوە بۆ مال و خوین و نامویسا ئێك و دو د هەمی رۆژێت سالێدا وەكی بەرهنگاربوونا ڤێ رۆژێیە كو عەرەفەیە د ڤی باژێریدا كو مەكەهە د ڤێ هەیڤێدا كو هەیڤا حەجێیە و ژ هەیڤێت ب رێز و رویمەتە.

(٢) د هەمی كاروبارێ واندا.

(٣) ـ ئانكو: رێك دا وان یێ هەوە نەڤێت بهێتە مالێت هەوە.

(٤) كا من گەهاندە هەوە یان نە.

گۆتن: ئەم شەهدەیێ ددەین ب راستی تە گەهاند و تە ئەمانەت ب جه ئینا و تە شیرەت کر.

ئینا ب تلا خۆ یا شەهدێ سێ جاران گۆت و بلندکرە عەسمانی و ب لایێ خەلکیڤە خوار دکر: **(ئەی خودێ شاهد بە، ئەی خودێ شاهدبە)**.

پاشی فەرمان ب بانگی کر، پاشی ب قامەتێ، و نڤێژا نیڤرۆ کر پاشی قامەت هاتە گرتن و نڤێژا ئێڤاری کر، و چو نڤێژ د ناڤبەرا واندا نەکرن.

پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سویار بوو هەتا هاتییە جهێ راوەستانێ و زکێ حێشترا خۆ قەسوائێ ئێخستە کەڤران و کنفێ هەڤساری بەردا بەر سینگێ خۆ و بەرێ خۆ دا لایێ قیبلەیێ، و بەردەوام ما راوەستای هەتا رۆژ ئاڤا بووی و زەراتی پیچەك چۆیی و هەتا رۆژ ب دورستی ئاڤا بووی، ئوسامە ل پشت خۆ سویار کر و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەست ب چۆنێ کر، و هەڤسارێ قەسوائێ ب رەخێ خۆڤە کێشا هەتا نێزیك بووی سەرێ وێ ب جهێ پێت وی ل سەر زینی بکەڤیت، و ب دەستێ خۆ یێ راستێ دگۆت: **(گەلی خەلکی ل سەر خۆ بن ل سەر خۆ بن (رەحەت وەرن))** هەر گاڤا هاتبا جهەکێ فەرە و گرك هەڤسار پیچەك سست دکر دا ب سەرکەڤیت.

حەتا هاتییە موزدەلیفەیێ نڤێژا مەغرەب و عەیشا ب بانگەکی و دو قامەتان ل وێرێ کر، و چو سونەت د ناڤبەرا واندا نەکرن، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەتا سپێدێ رازا، و دەمێ سپێدە بۆ دیار بووی ب بانگەکی و قامەتەکێ نڤێژا سپێدێ کر.

پاشی ل قەسوائێ سویار بوو هەتا هاتییە جهێ مزگەفتا موزدەلیفەیێ، بەرێ خۆ دا قیبلەیێ، دوعا کرن و تەکبیر و تەهلیل و تەوحیدا خودێ کر (اللهُ أكبر)، ( لا إلهَ إلا اللهُ) (لا إلهَ إلا اللهُ وَحدَه لا شَريكَ له) بەردەوام یێ راوەستای بوو هەتا دنیا باش سپیتالە بووی و بەری رۆژ دەرکەڤیت دەست ب چۆنێ کر، و فەزلێ کورێ عەباسی ل پشت خۆ سویار کر، و زەلامەکێ پرچ جوان بوو و سپی و خوشکۆك بوو، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دچۆ هندەك ژن د بەررا بۆرین و لەز دکرن، فەزلی دەستهاڤێتێ بەرێ خۆ دا وان، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) دەستێ خۆ دا بەر چاڤێت فەزلی، ئینا فەزلی بەرێ خۆ وەرگێرا

**لایێ دى بەرێ خۆ ددایێ، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێ خۆ برە رەخێ دى و بەرێ فەزلى وەرگێرا، هەتا گەهشتییە نهالا موحەسسیر[١] ل وێرێ پیچەكێ لەز كر.**

**پاشى رێكا نیڤەكێ گرت[٢] ئەوا ئێكسەر ل جهێت بەرهاڤێتنا مەزن دەردكەڤیت[٣] هەتا هاتییە دەڤ جهێ بەرهاڤێتنێ ل دەڤ دارێ حەفت بەركێت بچویك[٤] هاڤێتنێ د گەل هەر بەركەكى دگۆت: (الله أكبَر) ل بنێ نهالێ بەرك دهاڤێتنێ.**

**پاشى چۆ جهێ قوربان ڤەكوشتنێ و سیه و شەش ب دەستێ خۆ ڤەكوشتن، پاشى داف عەلى و وى ئەوێت ماین ڤەكوشتن، و ئەو د قوربانێ خۆدا پشكدار كر، پاشى فەرمان كر ژ هەر حێشترەكێ هندەك ئینا و كرنە د قازانەكێدا و لێنان و ژ گۆشتێ وان خوار و ژ ئاڤكا وان ڤەخوار، پاشى پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سویار بوو و چۆ كەعبەیێ، و تەوافا ئیفازێ كر، و نڤێژا نیڤرۆ ل مەكەهێ كر، هاتە دەڤ بنەمالا عەبدولموتتەلبى و وان ئاڤا زمزمێ ددا خەلكى، ئینا گۆت: (ئەى بنەمالا عەبدولموتتەلبى ئاڤێ بهەلكێشن و ئەگەر من ژ بەر هندێ نەبایە ل سەر هەوە ببیتە ڤەربالغ خەلكەكێ زۆر خۆ ب شۆلێ هەوە بكەن، دا ئاڤێ د گەل هەوە هەلكێشم) ئینا دۆلكەك دا ڤێ و ژێ ڤەخوار.**



(١) نهالا موحەسسیر دكەڤیتە د ناڤبەرا موزدەلیفە و مینایێدا و ب وى ناڤى هاتە ناڤكرن چونكى نەبرهەیێ حەبەشى ل وێرێ وەستیا و كەسیرە بوو و ب خەم كەفت و خەم و پەشێمانى بۆ هەڤالێت خۆ چێ كر و نێخستنە د پەشێمانییاندا، ڤێجا دبێژنێ نهالا پەشێمانییێ.

(٢) ل وى دەمى مینایێ سێ رێك دچۆنێ: رێكا رۆژئاڤایێ و یا رۆژهەلاتێ و یا نیڤەكێ.

(٣) ئانكو: بۆ نێزیكتر.

(٤) زانایان ئەو بەركێت بچویك ب ڤى رەنگى دەستنیشان كرینە د ناڤبەرا نۆكێ و باقلكێدا.

## الفصل الثاني: فضائل مكة.

## پشكا دووێ: قەدرێ مەكەهێ.

### ١ ـ باب: دخول مكة والخروج منها.

### بابەتێ: چوون و دەركەفتنا ژ مەكەهێ.

٢٠٤١ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمَّا جاءَ إِلَى مَكَّةَ، دَخَلَ مِنْ أَعْلاَهَا، وَخَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا. [خ١٥٧٧/ م١٢٥٨].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) دەمێ هاتییە مەكەهێ ژ لایێ سەریڤە هاتە تێدا و ژ لایێ بنیڤە ژێ دەركەفت.**

٢٠٤٢ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) دَخَلَ مَكَّةَ نَهَاراً. [ت٨٥٤/ جه٢٩٤١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ب رۆژ هاتە د مەكەهێدا.**

### ٢ ـ باب: دخول مكة بغير إحرام.

### بابەتێ: هاتنا د مەكەهێدا بێ ئیحرام.

٢٠٤٣ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) دَخَلَ مَكَّةَ ـ وَقَالَ قُتَيْبَةُ: دَخَلَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ ـ وعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ. [م١٣٥٨].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایێ ئەنساری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە د مەكەهێدا ـ قوتەیبەیی گۆت: ل رۆژا ڤەكرنێ هاتە د مەكەهێدا و شاشكەكا رەش د سەری بوو و یێ بێ ئیحرام بوو.**

٢٠٤٤ – عَنْ مَالِك، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ أَقْبَلَ مِنْ مَكَّةَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِقُدَيْدٍ، جَاءَهُ خَبَرٌ مِنَ الْمَدِينَةِ فَرَجَعَ فَدَخَلَ مَكَّةَ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ. [ط ٩٦٥].

* إسناده صحيح.

**ژ مالكی (ﷺ) ژ نافعی، گۆت: عەبدوللایێ كورێ عومەری ژ مەكەهێ دهات هەتا گەهشتییە قەدید[1]، دەنگوباسەك بۆ ژ مەدینەیێ هات ئینا زڤری و بێ ئیحرام چۆ د مەكەهێدا.**

## ٣ ـ باب: حرمة مكة.

## بابەتێ: حورمەتا مەكەهێ.

٢٠٤٥ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَوْمَ افْتَتَحَ مَكَّةَ: **(لاَ هِجْرَةَ، ولكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا، فَإِنَّ هَذَا بَلَدٌ حَرَّمَهُ اللهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّماوَاتِ وَالأَرْضَ، وَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَإِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ الْقِتَالُ فِيهِ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَلَمْ يَحِلَّ لِي إِلاَّ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، فَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، لاَ يُعْضَدُ شَوْكُهُ، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهُ، وَلاَ يَلْتَقِطُ لُقَطَتَهُ إِلاَّ مَنْ عَرَّفَهَا، وَلاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا)**. قَالَ العَبَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِلاَّ الإِذْخِرَ، فَإِنَّهُ لِقَيْنِهِمْ وَلِبُيُوتِهِمْ، قَالَ: قَالَ: **(إِلاَّ الإِذْخِرَ)**. [خ١٨٣٤ (١٣٤٩)/ م١٣٥٣].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا مەكەه ڤەكری گۆت: (مشەختبوون نەما[2]، بەلێ جیهاد و نیەتە[3]، و هكە ژ وە خواست هەمی پێكڤە بۆ جیهادێ رابن پێكڤە رابن، ب راستی ئەڤە باژێرەكە خودێ یێ حەرام كری[4] ل رۆژا خودێ عەرد و عەسمان دورست كرین و ئەو یێ حرامە ب حرامكرنا خودێ هەتا رۆژا قیامەتێ، و شەڕ تێدا بۆ كەسێ بەری من دورست نەبوویە و بۆ من دورست نەبوویە دەمەك ژ رۆژێ نەبیت و ئەو یێ حەرامە ب حەرامكرنا خودێ هەتا رۆژا قیامەتێ، سترییێ وی ناهێتە شكاندن و بڕین[5] و نێچیرا وی ناهێتە ترساندن و ڤەجنقاندن، تشتێ تێدا بەرزە ناهێتە هەلگرتن ئەو نەبیت بدەتە نیاسین و گیایێ وی**

---

(١) جهەكە دكەڤیتە سەر رێكا مەكەهێ بۆ مەدینەیێ، نەو رێكا ناڤدار ب رێكا پێغەمبەران (سلاڤێت خودێ ل سەر وان بن) و پێغەمبەرێ مە ژی (ﷺ) د وێ رێكێرا هاتییە.

(٢) مەخسەد نەوە مشەختبوون پشتی ڤەكرنا مەكەهێ بۆ مەدینەیێ نەما.

(٣) نانكو: هێلانا وەلاتی بۆ جیهادێ و ننیەتا خێرێ یا بەردەوامە.

(٤) شەڕ تێدا بهێتە كرن.

(٥) نەگەر ستری دورست نەبیت پا ژ بلی ستری هێژ پتر.

**ناهێتە بڕین)، ئینا عەباسی گۆت: ئیزخر نەبیت ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەو بۆ ئاسنگەر و بانێت وانن[1] گۆت: (ئیزخر تێ نەبیت).**

## ٤ ـ باب: النهي عن حمل السلاح بمكة.

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ هەلگرتنا چەكی د مەكەهێدا.

٢٠٤٦ – (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**لاَ يَحِلُّ لأَحَدِكُمْ أَنْ يَحْمِلَ بِمَكَّةَ السِّلاَحَ**).[م١٣٥٦]. [وانظر: ١٥٠٢].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ لێ بوو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (بۆ كەسێ ژ هەوە دورست نینە چەكی ل مەكەهێ هەلگریت)[2].**

## ٥ ـ باب: بنيان الكعبة.

## بابەتێ: ئاڤاكرنا كەعبەیێ.

٢٠٤٧ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ لَهَا: (**أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ قَوْمَكِ لَمَّا بَنَوُا الْكَعْبَةَ، اقْتَصَرُوا عَنْ قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ**)، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ تَرُدُّهَا عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ؟ قَالَ: (**لَوْلاَ حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ؛ لَفَعَلْتُ**). فَقَالَ عَبْدُ اللهِ رضي الله عنه: لَئِنْ كَانَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها سَمِعَتْ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، ما أُرَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) تَرَكَ اسْتِلاَمَ الرُّكْنَيْنِ اللَّذَيْنِ يَلِيَانِ الحِجْرَ، إِلاَّ أَنَّ الْبَيْتَ لَمْ يُتَمَّمْ عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ. [خ١٥٨٣ (١٢٦)/ م١٣٣٣].

- وفي رواية لهما: قَالَتْ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنِ الجَدْرِ، أَمِنَ الْبَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**). قُلْتُ: فَمَا لَهُمْ لَمْ يُدْخِلُوهُ فِي الْبَيْتِ؟ قَالَ: (**إِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ**). قُلْتُ: فَمَا شَأْنُ بَابِهِ مُرْتَفِعاً؟ قَالَ: (**فَعَلَ ذلِكَ قَوْمُكِ، لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاؤُوا وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاؤُوا، وَلَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِالْجَاهِلِيَّةِ، فَأَخَافُ أَنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ، أَنْ أُدْخِلَ الجَدْرَ فِي الْبَيْتِ، وَأَنْ أُلْصِقَ بَابَهُ بِالأَرْضِ**). [خ١٥٨٤].
- وفي رواية لمسلم: عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: لَمَّا احْتَرَقَ الْبَيْتُ زَمَنَ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ، حِينَ غَزَاهَا أَهْلُ الشَّامِ، فَكَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا كَانَ، تَرَكَهُ ابْنُ الزُّبَيْرِ، حَتَّى قَدِمَ النَّاسُ الْمَوْسِمَ، يُرِيدُ أَنْ يُجَرِّئَهُمْ ـ أَوْ يُحَرِّبَهُمْ ـ عَلَى أَهْلِ الشَّامِ. فَلَمَّا صَدَرَ النَّاسُ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَشِيرُوا عَلَيَّ فِي الْكَعْبَةِ، أَنْقُضُهَا ثُمَّ أَبْنِي بِنَاءَهَا، أَوْ أُصْلِحُ مَا وَهَى

---

(١) ئانكو: ئاسنگەر ئاگرێ خۆ ب وان هەل دكەن، و خەلك ددانن سەر بانێت خۆ پشتی دار دكەن و بەری ئاخ بكەن نەم دبێژینێ (نیرە)، ئانكو: دنێخنە د ناڤبەرا گاریتا و ئاخێدا.

(٢) هەلبەت ئەگەر هەوجەیی بۆ نەبیت ب بەلگەیێ هندێ پێغەمبەر (ﷺ) د گەل هەڤالێت خۆ سالا قەزاكرنا عومرەیێ پشتی پێكهاتنا حودەیبییێ ب چەكەكێ سڤكڤە هاتنە مەكەهێ و عومرەیا خۆ كرن.

مِنْهَا؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَإِنِّي قَدْ فُرِقَ لِي رَأْيٌ فِيهَا، أَرَى أَنْ تُصْلِحَ مَا وَهَى مِنْهَا، وَتَدَعَ بَيْتاً أَسْلَمَ النَّاسُ عَلَيْهِ، وَأَحْجَاراً أَسْلَمَ النَّاسُ عَلَيْهَا، وَبُعِثَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ (ﷺ). فَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: لَوْ كَانَ أَحَدُكُمُ احْتَرَقَ بَيْتُهُ، مَا رَضِيَ حَتَّى يُجِدَّهُ، فَكَيْفَ بَيْتُ رَبِّكُمْ؟ إِنِّي مُسْتَخِيرٌ رَبِّي ثَلاَثاً، ثُمَّ عَازِمٌ عَلَى أَمْرِي. فَلَمَّا مَضَى الثَّلاَثُ أَجْمَعَ رَأْيَهُ عَلَى أَنْ يَنْقُضَهَا، فَتَحَامَاهُ النَّاسُ أَنْ يَنْزِلَ بِأَوَّلِ النَّاسِ يَصْعَدُ فِيهِ أَمْرٌ مِنَ السَّمَاءِ، حَتَّى صَعِدَهُ رَجُلٌ فَأَلْقَى مِنْهُ حِجَارَةً، فَلَمَّا لَمْ يَرَهُ النَّاسُ أَصَابَهُ شَيْءٌ تَتَابَعُوا، فَنَقَضُوهُ حَتَّى بَلَغُوا بِهِ الأَرْضَ، فَجَعَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ أَعْمِدَةً، فَسَتَّرَ عَلَيْهَا السُّتُورَ، حَتَّى ارْتَفَعَ بِنَاؤُهُ.وَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: إِنِّي سَمِعْتُ عَائِشَةَ تَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(لَوْلاَ أَنَّ النَّاسَ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكُفْرٍ، وَلَيْسَ عِنْدِي مِنَ النَّفَقَةِ مَا يُقَوِّي عَلَى بِنَائِهِ، لَكُنْتُ أَدْخَلْتُ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ خَمْسَ أَذْرُعٍ، وَلَجَعَلْتُ لَهَا بَاباً يَدْخُلُ النَّاسُ مِنْهُ، وَبَاباً يَخْرُجُونَ مِنْهُ)**. قَالَ: فَأَنَا الْيَوْمَ أَجِدُ مَا أُنْفِقُ، وَلَسْتُ أَخَافُ النَّاسَ. قَالَ: فَزَادَ فِيهِ خَمْسَ أَذْرُعٍ مِنَ الْحِجْرِ، حَتَّى أَبْدَى أُساً نَظَرَ النَّاسُ إِلَيْهِ، فَبَنَى عَلَيْهِ الْبِنَاءَ. وَكَانَ طُولُ الْكَعْبَةِ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ ذِرَاعاً، فَلَمَّا زَادَ فِيهِ اسْتَقْصَرَهُ، فَزَادَ فِي طُولِهِ عَشَرَ أَذْرُعٍ، وَجَعَلَ لَهُ بَابَيْنِ: أَحَدُهُمَا يُدْخَلُ مِنْهُ، وَالآخَرُ يُخْرَجُ مِنْهُ. فَلَمَّا قُتِلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ كَتَبَ الْحَجَّاجُ إِلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ يُخْبِرُهُ بِذَلِكَ، وَيُخْبِرُهُ أَنَّ ابْنَ الزُّبَيْرِ قَدْ وَضَعَ الْبِنَاءَ عَلَى أُسٍّ نَظَرَ إِلَيْهِ الْعُدُولُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ. فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ الْمَلِكِ: إِنَّا لَسْنَا مِنْ تَلْطِيخِ ابْنِ الزُّبَيْرِ فِي شَيْءٍ؛ أَمَّا مَا زَادَ فِي طُولِهِ فَأَقِرَّهُ، وَأَمَّا مَا زَادَ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ فَرُدَّهُ إِلَى بِنَائِهِ، وَسُدَّ الْبَابَ الَّذِي فَتَحَهُ. فَنَقَضَهُ، وَأَعَادَهُ إِلَى بِنَائِهِ. [م١٣٣٣ (٤٠٢)].

**ژ عائیشایێ (﵂) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە وێ: (تو نوزانی مرۆڤێت تە دەمێ كەعبە ئاڤا كری ل سەر هەمی بنیاتێ ئیبراهیمی ئاڤا نەكر)[1]، ئینا من گۆت: ما تو نازڤرینییەڤە سەر بنیاتێ ئیبراهیمی؟ گۆت: (ئەگەر مرۆڤێت تە نە ژ نێزیك گاوری هێلا با ، دا وەكەم) عەبدوللایی (﵁) گۆت: ئەگەر عائیشایێ ئەڤە ژ پێغەمبەری (ﷺ) گوە لێ ببیت ئەز نابینم پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستكرنا ئەو كوژییێت رەخێ حیجرێ هێلا بن، ژبەر هندێ نەبیت كەعبە ل سەر بنیاتێ تمام یێ ئیبراهیمی نەهاتییە تمامكرن.**

---

(١) و هندەك ژێ هێلا ژ بەر كێم دراڤێ د دەستێ واندا یێ یا وان گۆمان د حەلالییا ویدا نەی، چونكی كەعبە ب مالێ وان یێ حەلال حەلال و شك و گۆمان د حەلالییا ویدا نەی هاتە ئاڤاكرن.

- و د ڤەگێرەكا واندا: گۆت: من پرسیارا جەدرێ[1] ژ پێغەمبەری (ﷺ) كر، ژ كەعبێیە؟ گۆت: **(بەلێ)**، من گۆت: وان خێر بوو بۆچی نەكرنە د گەل؟ گۆت: **(مرۆڤێت تە دراڤێ وان تێرا وان نەكر)**، من گۆت: ئەرێ پا بۆچی دەرگەهێ وێ یێ بلندە؟ گۆت **(مرۆڤێت تە وەلێ كر دا ئەو كەسێ وان بڤێت بكەنە د ژۆرڤە و یێ وان بڤێت نەهێلن، و ئەگەر مرۆڤێت تە نە ژ نێزیك مەزانین هێلا با و ئەز دترسم دلێت وان خراب ببینن، ئەز دا حیجرێ ئێخمە د ناڤ كەعبەیێدا و دا دەرگەهێ وێ ب عەردیڤە نم)**.
- و د ڤگێرەكا موسلمیدا: ژ عەتائی (رحمه الله) گۆت: دەمێ كەعبە ل سەر دەمێ یەزیدی سۆتی، دەمێ خەلكێ شامێ غەزوا وێ كری، ڤێجا ئەو چێ بوو یا چێ بووی، ئیبن زوبەیری وەكی خۆ هێلا هەتا دەمێ حەجێ هاتی، وی دڤیا جەسارەتێ بۆ خەلكی ل سەر شەڕێ خلكێ شامێ دورست بكەت، یان بۆ شەڕی گەرم بكەت و دلێ وان ل سەر خەلكێ شامێ ب كەرب بێخیت، ڤێجا دەمێ خەلك هاتی گۆت: گەلی خەلكی بۆچۆنا خۆ د كەعبەیێدا بۆ من بێژن، ئەز بهەڕفینم پاشی ئاڤاهیێ وێ ئاڤا بكەم، یان ئەوا ژێ خراب بووی چێ كەم؟ ئیبن عەباسی گۆت: بۆچۆنەك بۆ من تێدا رۆن بوویە ئەو ژی ئەوا ژێ خراب بوویی تو چێ كەی و تو كەعبەیەكێ خەلك ل سەر موسلمان بوویی و بەران خەلك ل سەر موسلمان بوویی و پێغەمبەر ل سەر هاتییە هنارتن بهێلی.

ئیبن زوبەیری گۆت: ئەگەر ئێك ژ هەوە مالا وی بسوژیت رازی نابیت هەتا نوی نەكەت، ڤێجا پا چاوا مالا خودایێ هەوە؟ سێ رۆژان ئەز دێ یا خێرتر ژ خودێ خوازم، پاشی دێ كارێ خۆ ئێكلا كەم، ڤێجا پشتی سێ رۆژ تمام بووین خۆ كرە ئێك بۆچۆن، ئەو بهەڕفینیت، هەر كەسەكی خۆ ژێ پاراست یێ ئێكێ بیت بچیتە سەر نەكو تشتەك بۆ ژ عەسمانا بهێت، هەتا زەلامەك سەركەفتی بەرەك ژێ هاڤێژت، ڤێجا دەمێ خەلكێ دیتی چو ب سەرێ وی نەهات دانە دویڤ ئێك و هەڕافت، هەتا گەهاندییە عەردی، ئیبن زوبەیری ستوینك چكلاندن و پەردە ئێختێ (دا خەلك ناڤا وێ نەبینن) هەتا ئاڤاهیێ وێ بلند كری.

---

(١) جیدرە: ئانكو: حیجرە، ئەو ژی ئەو كڤانەیە یا پشت كەعبەیێ ژ لایێ كوژییێ شامێ و عیراقێڤە.

ئیبن زوبەیری گۆت: ب راستی من گوه ل عائیشایێ بوو دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ژ بەر هندێ نەبا خەلك یێ نێزیکی گاورییێیە**[1] **و من هند دراڤ نینە هاریکار بیت ل سەر ئاڤاکرنا وێ ئەز دا پێنج گەزان ژ حیجرێ دەمە د گەل کەعبەیێ، و دا دەرگەهەکی ئێخمێ خەلك تێرا چۆبانە ژۆر و دەرگەهەك ژێ دەرکەفتبان)** گۆت: من ئەڤرۆ هند دراڤ یێ هەی لێ بمەزێخم و ژ خەلکی ژێ ناترسم.

گۆت: پێنج گەز ژ حیجرێ لێ زێدە کرن، و هەتا بنیاتێ وێ دەرکەفتی و خەلکی بەرێ خۆ دایێ ل سەر ئاڤا کر و بلنداهییا کەعبەیێ هەژدە گەز بوو، ڤێجا دەمێ ئەو لێ زێدە کری نزم دیت ئینا دەه گەزێت دی لێ زێدە کرن، و دو دەرگەه ئێخستنێ د دەرگەهەکێڕا دچۆنە ژۆر و د دەرگەهەکێڕا دەردکەفتن.

ڤێجا دەمێ ئیبن زوبەیر هاتییە کوشتن، حەجاجی د راستا ڤێ چەندێدا بۆ عەبدولەلکێ کوڕێ مەروان نڤیسی و ئاخفتن گەهاندێ ئیبن زوبەیری ئاڤاهی ل سەر بنیاتەکی ئاڤا کرییە مرۆڤێت راست ژ خەلکێ مەکەهێ دیتییە، ئینا عەبدولەلکی بۆ نڤیسی ئەم ژ وێ یا ئیبن زوبەیری کری ژ هەرڤاندنا کەعبەیێ د پاکین، ئەو بلندییا لێ زێدە کری وەسا بهێلە، بەلێ ئەوا ژ حیجرێ لێ زێدە کری بزڤرینەڤە ئاڤاهییێ وێ، و ئەو دەرگەهێ لێ ڤەکری بگرە، ئینا حەجاجی هەرڤاند و زڤراندە ئاڤاهییێ وێ.

### ٦ ـ باب: هدم الكعبة.

### بابەتێ: هەرڤاندنا کەعبەیێ.

٢٠٤٨ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يُخَرِّبُ الْكَعْبَةَ ذُو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الحَبَشَةِ**). [خ١٥٩١/ م٢٩٠٩].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودانێ دو لنگۆکان (یان د زراڤن یان د درێژن) ژ حەبەشەیێ دێ کەعبەیێ هەرڤینیت)**[2].

---

(١) ئانکو: گەلەك ژ مێژە نینە باوەری ئینایی و ژ گاورییێ دویرکەفتین و هێلاین.

(٢) هەلبەت ئەڤە ل دویماهییا دنیایێ دێ رویدەت، پشتی چو باوەریدار ل سەر عەردی نەمینن، و ئەڤە ئێك ژ نیشانێت قیامەتێنە.

### ٧ - باب: فضل الحجر الأسود.

### بابەتێ: قەدر و بهایێ بەرێ رەش.

٢٠٤٩ - (ق) عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: أَنَّهُ جاءَ إِلَى الحَجَرِ الأَسْوَدِ فَقَبَّلَهُ، فَقَالَ: إِنِّي أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لاَ تَضُرُّ وَلاَ تَنْفَعُ، وَلَوْلاَ أَنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يُقَبِّلُكَ ما قَبَّلْتُكَ. [خ١٥٩٧/ م١٢٧٠].

**ژ عومەری (رضي الله عنه) دەمێ هاتییە دەڤ بەرێ رەش، ماچی کر، ئینا گۆت: ب راستی ئەز دزانم تو بەری نە مفای ددەی و نە زیانێ دکەی، و ئەگەر ب راستی من پێغەمبەر (ﷺ) نەدیتبا تە ماچی دکەت من تو ماچی نەدکری.**

٢٠٥٠ - (خ) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخطَّابِ رضي الله عنه قَالَ لِلرُّكْنِ: أَمَا وَاللهِ، إِنِّي لأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لاَ تَضُرُّ وَلاَ تَنْفَعُ، وَلَوْلاَ أَنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) اسْتَلَمَكَ ما اسْتَلَمْتُكَ، فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ قَالَ: فَمَا لَنَا وَلِلرَّمَلِ، إِنَّمَا كُنَّا رَاءَيْنَا بِهِ المشْرِكِينَ، وَقَدْ أَهْلَكَهُمُ اللهُ، ثُمَّ قَالَ: شَيْءٌ صَنَعَهُ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَلاَ نُحِبُّ أَنْ نَتْرُكَهُ. [خ١٦٠٥ (١٥٩٧)].

**ژ یەزیدێ کورێ ئەسلەمی (رضي الله عنه) ژ بابێ خۆ، گۆت: عومەرێ کورێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆتە بەرێ رەش، ئەز ب خودێ کەمە ب راستی ئەز دزانم تو بەری نە مفای ددەی و نە زیانێ دکەی و ئەگەر ب راستی من پێغەمبەر (ﷺ) نەدیتبا دەستێ خۆ ب تەدا دئینا من ژی دەستێ خۆ ب تەدا نەدئینا و دەستێ خۆ تێدا ئینا، پاشی گۆت: و ما مە و هەروێلێ چ د گەلێکە[1]، مە بەس هێزا خۆ تێدا نیشا هەڤپشکچێکەران ددا، و خودێ ئەو ژ ناڤ برن، پاشی گۆت: ئەڤە تشتەکە پێغەمبەری (ﷺ) یێ کری و مە نەڤێت بهێلین.**

٢٠٥١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**نَزَلَ الْحَجَرُ الْأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَهُوَ أَشَدُّ بَيَاضاً مِنَ اللَّبَنِ، فَسَوَّدَتْهُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ**). [ت٨٧٧/ ن٢٩٣٥].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەرێ رەش ژ بەحەشتێ هاتە خوار و ئەو ژ شیری سپیتر بوو، و گونەهێت دویندەها ئادەمی ئەو رەش کر).**

---

(١) مەبەست ئەو هەرسێ گەرێت ئێکێ یێت هەرویل ل دور کەعبەیێ تێدا دهێتە کرن.

٢٠٥٢ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لَيَأْتِيَنَّ هَذَا الْحَجَرُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ، يَشْهَدُ عَلَى مَنْ يَسْتَلِمُهُ بِحَقٍّ)**. [ت٩٦١/ جه٢٩٤٤/ مي١٨٨١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب سویند ئەڤ بەرە رۆژا قیامەتێ دێ هێت دو چاڤێت هەین و پێ دبینیت و ئەزمان یێ هەی پێ دئاخڤیت، شادەییێ بۆ وی ددەت یێ ب دورستی دەستێ خۆ پێدا ئینابیت و كربیتێ).**

## ٨ ـ باب: مال الكعبة.

## بابەتێ: مالێ كەعبەیێ.

٢٠٥٣ - (خ) عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: جَلَسْتُ مَعَ شَيْبَةَ عَلَى الْكُرْسِيِّ فِي الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: لَقَدْ جَلَسَ هَذَا الْمَجْلِسَ عُمَرُ رضي الله عنه، فَقَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لاَ أَدَعَ فِيهَا صَفْرَاءَ وَلاَ بَيْضَاءَ؛ إِلاَّ قَسَمْتُهُ. قُلْتُ: إِنَّ صَاحِبَيْكَ لَمْ يَفْعَلاَ، قَالَ: هُمَا الْمَرْآنِ أَقْتَدِي بِهِمَا. [خ١٥٩٤].

**ژ ئەبی وائلی (رحمه الله) گۆت: ئەز د گەل شەیبەیی ل سەر كورسیكەكێ د كەعبێدا روینشتم، ئینا گۆت: ب راستی ل ڤی جهی عومەر (رضي الله عنه) روینشت، و گۆت: من كرە دلێ خۆ نە چو زێری و نە چو زیڤی تێدا نەهێلم ئەگەر ئەز بەلاڤ نەكەم، من گۆت: بەلێ هەردو هەڤالێت تە ومنەكرییە، گۆت: ئەو دو زەلامن ئەز ل دویڤ وان دچم و چاڤ ل وان دكەم.**

## ٩ ـ باب: إخراج الصور والأَصنام من الكعبة.

## بابەتێ: دەرێخستنا وێنە و بوتان ژ كەعبەیێ.

٢٠٥٤ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لَمَّا قَدِمَ، أَبَى أَنْ يَدْخُلَ الْبَيْتَ وَفِيهِ الآلِهَةُ، فَأَمَرَ بِهَا فَأُخْرِجَتْ، فَأَخْرَجُوا صُورَةَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ فِي أَيْدِيهِمَا الأَزْلاَمُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(قَاتَلَهُمُ اللهُ! أَمَا وَاللهِ قَدْ عَلِمُوا أَنَّهُمَا لَمْ يَسْتَقْسِمَا بِهَا قَطُّ)**. فَدَخَلَ الْبَيْتَ، فَكَبَّرَ فِي نَوَاحِيهِ، وَلَمْ يُصَلِّ فِيهِ. [خ١٦٠١ (٣٩٨)].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ هاتی نەڤیا بچیتە د كەعبێڤە و بوت تێڤە بن، فەرمان پێ كر، دەرئێخستن، ڤێجا وێنەیێ**

ئیبراهیم و ئیسماعیل دەرئێخست و دارکێت پشککێشانێ بۆ ئیغبال زانینێ د دەستێت واندا بوون، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ وان بکوژیت ئەز ب خودێ کەمە بێ گۆمان ئەو دزانن ئیبراهیم و ئیسماعیلی بەخت و ئێغبالا خۆ چو جاران ژ فالڤەگرتنێ نەخواستینە)[1]، ئینا هاتە د کەعبێڤە و هەمی لایێت وێ تەکبیر کر (گۆت: الله أکبر) و نڤێژ تێڤە نەکر.

## ١٠ ـ باب: دخول الكعبة والصلاة فيها.

## بابەتێ: چۆنا د کەعبەیێڤە و نڤێژکرن تێدا.

٢٠٥٥ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) دَخَلَ الْكَعْبَةَ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَبلاَلٌ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ الْحَجَبِيُّ، فَأَغْلَقَهَا عَلَيْهِ، وَمَكَثَ فِيهَا. فَسَأَلْتُ بِلاَلاً، حِينَ خَرَجَ: مَا صَنَعَ النَّبِيُّ (ﷺ)؟ قَالَ: جَعَلَ عَمُوداً عَنْ يَسَارِهِ، وَعَمُوداً عَنْ يَمِينِه، وَثَلاَثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ ـ وَكَانَ الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ ـ ثُمَّ صَلَّى. [خ٥٠٥ (٣٩٧)/ م١٣٢٩].

- وفي رواية لمسلم: قَالَ: أَقبَلَ رَسُولُ الله (ﷺ) عَامَ الْفَتْحِ، عَلَى نَاقَةٍ لأُسَامةَ بْنِ زَيْدٍ، حَتَّى أَنَاخَ بِفِنَاءِ الْكَعْبَةِ. ثُمَّ دَعَا عُثْمَانَ بْنَ طَلْحَةَ فَقَالَ: (ائْتِنِي بِالْمِفْتَاحِ)، فَذَهَبَ إِلَى أُمِّهِ، فَأَبَتْ أَنْ تُعْطِيَهُ، فَقَالَ: وَالله لَتُعْطِيِنِيهِ، أَوْ لَيَخْرُجَنَّ هَذَا السَّيْفُ مِنْ صُلْبِي! قَالَ: فَأَعْطَتْهُ إِيَّاهُ، فَجَاءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَدَفَعَهُ إِلَيْهِ، فَفَتَحَ الْبَابَ.

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئوسامەیێ کورێ زەیدی و بیلال و عوسمانێ کورێ تەلحەیێ دەرگەڤان[2] چۆنە د کەعبەیێڤە و دەرگەهێ وێ گرت و مانە تێدا، ئینا من پرسیارا بیلالی کر دەمێ دەرکەفتی: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چ کر؟ گۆت: ستوینەك ئێخستە لایێ خۆ یێ راستێ و ستوینەك لایێ خۆ یێ چەپێ و سێ ستوین ل پشت خۆ ـ کەعبەیێ هینگێ شەش ستوین هەبوون ـ پاشی نڤێژ کر.

---

(١) ژ رێز و سەروبەرێت عەرەبان ئەو بوو ئەگەر وان کارەك ل بەر بایە ج وەغەر بایە ج ژنئینان یان هەر تشتەکێ دی، بەختێ خۆ ب رێکا فالڤەگرتنێ دجەرباندن، سێ تیر هەبوون ل سەر ئێکێ نڤیسی بوو، (خودێ فەرمانا من دکەت)، یا دووێ (خودێ من ناهێلیت) و یا سێیێ یا بێ نڤیسین بوو، و دا ئێکی ژ کافلانکی کێشن، ئەگەر دەرکەفتبایە (بکە)، دا کەت و ئەگەر دەرکەفتبا (نەکە)، نەدکر، و ئەگەر یا بێ نڤیسین بایە دا کەتە د نافدا و جارەکا دی کێشیت.

(٢) حەجبی: ناسناڤە بۆ وان، چونکی مالا وان دەرگەڤانێت کەعبەیێ بوون و بەرپەس بوون ژ گرتن و ڤەکرنا وێ.

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سالا ڤەكرنا مەكەهێ ل سەر حێشترەكا ئوسامەیێ كورێ زەیدی هات هەتا ل حەوشا كەعبەیێ دانایی، پاشی گازی عوسمانێ كورێ تەلحەیی كر، و گۆت: (كلیلێ بۆ من بینە) ئینا چۆ دەڤ دایكا خۆ، و دەیكا وی نەڤیا بدەتە ڤێ، ئینا گۆت: ئەز ب خودێ كەمە یان دێ دەیەڤە یان بێ گۆمان ئەڤ شیرە دێ ژ پشتا من دەركەڤیت، گۆت: ئینا دا ڤێ، و كلیل بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا و داڤێ و دەرگەهـ ڤەكر.**

## ١١ . باب: النزول بالمحصب

## بابەتێ: روینشتن ل موحەسبێ.

٢٠٥٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَيْسَ التَّحْصِيبُ بِشَيءٍ، إِنَّمَا هُوَ مَنْزِلٌ نَزَلَهُ رَسُولُ الله (ﷺ). [خ١٧٦٦/ م١٣١٢].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: روینشتن ل موحەسب[1] نە ژ رێكارێت حەجێنە، ئەو بەس جهەك بوو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لێ روینشتییە خوارێ.**

٢٠٥٧ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: إِنَّمَا كَانَ مَنْزِلٌ يَنْزِلُهُ النَّبِيُّ (ﷺ)، لِيَكُونَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ. تَعْنِي: بِالأَبْطَحِ. [خ١٧٦٥/ م١٣١١].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: ئەو بەس جهەك بوو پێغەمبەر (ﷺ) لێ دروینشتە خوارێ دا بۆ دەركەفتن و چۆنا وی خۆشتر بیت. مەبەستا وێ ئەبتوحە[2].**

٢٠٥٨ - (م) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: قَالَ أَبُو رَافِعٍ: لَمْ يَأْمُرْنِي رَسُولُ الله (ﷺ) أَنْ أَنْزِلَ الأَبْطَحَ حِينَ خَرَجَ مِنْ مِنًى، وَلكِنِّي جِئْتُ فَضَرَبْتُ فِيهِ قُبَّتَهُ، فَجَاءَ فَنَزَلَ. [م١٣١٣].

**ژ سولەیمانێ كورێ یەساری (ﷺ) گۆت: ئەبو رافعی گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) فەرمان ل من نەكربوو ئەز ل ئەبتوحێ روینم دەمێ ژ مینایێ دەركەفتی، بەلێ من ژ دەڤ خۆ گومبەتەك (خیڤەتەكا سەر گومبەت) ل وێرێ بۆ ڤەدا، ئینا هات لێ روینشتە خوارێ.**

---

(١) جهەكە دكەڤیتە د ناڤبەرا مەكەهێ و مینایێدا و دگۆتنێ موحەسب، چونكی جۆكێت ناڤێ شیشە بەرك ل وێرێ كۆم كربوون.

(٢) ئەبتوح: ناڤەكێ دییە یێ موحەسب.

## ١٢ ـ باب: ما يقتل المحرم من الدواب.

## بابەتێ: ئەو گیانەوەرێت ئیحرامگر دکوژیت.

٢٠٥٩ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ، مَنْ قَتَلَهُنَّ وَهْوَ مُحْرِمٌ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ: الْعَقْرَبُ، وَالفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ، وَالْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ**). [خ٣٣١٥ (١٨٢٦)/ م١١٩٩].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پێنج ژ گیانەوەران یێ بکوژیت و ئەو د ئیحراماندا بیت گونەھ ل سەر نینە: دووپشك و مشك و سەیێ دوڕندە و قەلەڕەش و کۆرارە).**

٢٠٦٠ - (م) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسعودٍ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) أَمَرَ مُحْرِماً بِقَتْلِ حَيَّةٍ بِمِنًى. [م٢٢٣٥].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا ئیحرامگرەکی کر مارەکی ل مینایێ بکوژیت.**

## ١٣ ـ باب فضل الصلاة في المسجد الحرام.

## بابەتێ: خێرا نڤێژا د مزگەفتا کەعبێڤە.

**بەرێ خۆ بدە: (١٠٧٩ ـ ١٠٨١).**

## ١٤ ـ باب: أجرة بيوت مكة.

## بابەتێ: کرێیا خانییێت مەکەهێ.

٢٠٦١ - عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَكَّةُ مُنَاخٌ، لا تُبَاعُ رِبَاعُها، وَلا تُؤَاجَرُ بُيُوتُهَا**). [ك٢٣٢٦، ٢٣٢٧].

* قال الذهبي: صحيح.

- وفي رواية: (**مَكَّةُ حَرَامٌ، وَحَرَامٌ بَيْعُ رِبَاعِها، وَحَرَامٌ أَجْرُ بُيُوتِها**).

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مەکەھ جهەکێ ڤەکرییە یان جهێ مەخەلکرنا حێشترایە یان جهێ ئاکنجیبوونێیە، خانییێت وێ ناهێنە فرۆتن و خانییێت وێ ناهێنە کرێکرن)**[1].

(١) زانا ل سەر فرۆتن و کرێکرنا خانییێت مەکەهێ نەئێکن و بۆچۆنا دورستتر ژ گۆتنێت زانایان دورستە و مەرەما پێغەمبەری (ﷺ) جهێت رێکارێت حەجێنە وەکی مینایێ و موزدەلیفەیێ و عەرەفەیێ نەڤە د حەرامن بهێنە فرۆتن و کرێکرن.

**و د ڤەگێرەكێدا: (مەكەهـ یا حەرامكرییە[1] و فرۆتنا خانییێت وێ یا حەرامە و كرێیا خانییێت وێ یا حەرامە).**

## ١٥ ـ باب: لا تغزى مكة بعد الفتح.

## بابەتێ: غەزوا مەكەهێ پشتی ڤەكرنێ ناهێتە كرن.

٢٠٦٢ – عَنِ الحَارِثِ بْنِ مَالِكِ بْنِ الْبَرْصَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ يَقُولُ: (**لاَ تُغْزَى** هَذِهِ بَعْدَ الْيَوْمِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ). [ت١٦١١].

* صحيح.

**ژ حارسێ كورێ مالكێ كورێ بەرسائی (رضي الله عنه) گۆت: من ل رۆژا ڤەكرنا مەكەهێ گوهـ ل** پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ئەڤ جهە (مەكەهـ) پشتی ئەڤرۆ هەتا رۆژا قیامەتێ ناهێتە هێرشكرن).**



(١) حەرامكرییە نێچیر تێدا بهێتە كرن، دارا وێ بهێتە برین، و بەرزەكرییێ وێ بهێتە راكرن.

## الفصل الثالث: فضل المدينة

## پشکا سێیێ: خێرا مەدینەیێ

### ١. باب: تحريم المدينة ودعاء النبي (ﷺ) لها.

### بابەتێ: حەرامکرنا مەدینەیێ و دوعایا پێغەمبەری (ﷺ) بۆ.

٢٠٦٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): (أَنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ وَدَعَا لَهَا، وَحَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ كما حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ، وَدَعَوْتُ لَهَا فِي مُدِّهَا وَصَاعِهَا مِثْلَ مَا دَعَا إِبْرَاهِيمُ عليه السلام لِمَكَّةَ). [خ٢١٢٩/ م١٣٦٠].

- وفي رواية لمسلم: (بِمِثْلَيْ مَا دَعَا بِهِ إِبْرَاهِيمُ لِأَهْلِ مكَّةَ). [خ١٨٦٧/ م١٣٦٦].

**ژ عەبدوللایێ کورێ زەیدی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ): (ب راستی ئیبراهیمی مەکەھ حەرام کر[1] و دوعا بەرەکەتێ بۆ کر، و مەدینە من حەرام کر ھەروەکی ئیبراهیمی مەکەھ حەرام کری، و من دوعا بۆ کر خودێ بەرەکەتێ بێخیتە مستا وان و منا وان[2] ھەروەکی ئیبراهیمی (ﷺ) دوعا بۆ مەکەھێ کری).**

- **و د ڤەگێرەکا موسلمیدا: (دو ھندی ئەوا ئیبراهیمی دوعا بۆ خەلکێ مەکەھێ کری).**

٢٠٦٤ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مِنْ كَذَا إِلَى كَذَا، لاَ يُقْطَعُ شَجَرُهَا، وَلاَ يُحْدَثُ فِيهَا حَدَثٌ، مَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثاً فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ).

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مەدینە یا ب رێز و رویمەتە[3] ژ ڤی جهی ھەتا ڤی جهی، دارا وێ ناھێتە برین، و تشتێ نوی د دینیدا تێدا ناھێتە کرن یان خرابکاری تێدا ناھێتە کرن، و ھەر کەسێ تشتەکێ نوی یان خرابکارییەکێ د دینیدا بکەت، لەعنەتێت خودێ و یێت ملیاکەتان و یێت خەلکی ھەمیان ل سەر وی بن).**

---

(١) حەرامکرنا وێ ئەوە: ئەوێ دچیتە تێدا ژ خۆ یێ ئێمنە و گیانەوەرێ وێ ناھێتە نێچیرکرن و دارا وێ ناھێتە برین و ھەلکێشان ئەو نەبیت یا ب دەستێ مرۆڤان ھاتییە چاندن، و مرۆڤ گونەھێ تێدا نەکەت، و چو ستەم و زۆرداریێ تێدا نەکەت.

(٢) ب وان ھەردوکان تشت دھاتنە پیڤان، ئانکو: بەرکەت بکەڤیتە پیڤانا وان ج ب مستا بیت ج ب منان بیت ج ب ھەر تشتەکێ دی بیت.

(٣) وەکی رێز و حورمەتا مەکەھێ.

٢٠٦٥ - (م) عَنْ سَعدِ بنِ أَبِي وقاصٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (إِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لاَبَتَي الْمَدِينَة؛ أَنْ يُقْطَعَ عِضَاهُهَا، أَوْ يُقْتَلَ صَيْدُهَا). وَقَالَ: (الْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، لاَ يَدَعُهَا أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا؛ إِلاَّ أَبْدَلَ الله فِيهَا مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ، وَلاَ يَثْبُتُ أَحَدٌ عَلَى لأْوَائِهَا وَجَهْدِهَا؛ إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَفِيعاً، أَوْ شَهِيداً، يَوْمَ الْقِيَامَةِ). [م١٣٦٣].

**ژ سەعدێ کورێ ئەبی وەقاسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی ئەز د ناڤبەرا هەردو لاپێت مەدینەیێدا حەرام دکەم دارێت وێ پێت مەزن و ب ستری بهێنە برین یان نێچیرا وێ بهێتە کوشتن) و گۆت: (مەدینە بۆ وان چێترە ئەگەر ئەو بزانن، کەس نینە ژ نەڤیان بهێلیت ئەگەر خودێ شوینا وی یێ ژ وی چێتر بۆ تێدا پەیدا نەکەت، و کەس نینە بێهنا خۆ ل سەر نەخۆشی و برس و زەحمەتا وێ فرەه بکەت ئەگەر ئەز رۆژا قیامەتێ بۆ نەبمە بەرڤان یان شاهد).**

٢٠٦٦ - (م) عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: أَهْوَى رَسُولُ الله (ﷺ) بِيَدِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: (إِنَّهَا حَرَمٌ آمِنٌ). [م١٣٧٥].

**ژ سەهلێ کورێ حونەیفی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرێ دەستێ خۆ دا مەدینەیێ، ئینا گۆت: (ب راستی ئەو یا ب رێز و رویمەتە و ئێمنە)[1].**

## ٢ ـ باب: الإيمان يأرز إلى المدينة.

## بابەتێ: باوەری کۆم دبیتە مەدینەیێ.

٢٠٦٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ الإِيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَةِ، كما تَأْرِزُ الحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا). [خ١٨٧٦/ م١٤٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی باوەری دێ ل مەدینەیێ کۆم بیت کا چاوا مار د کونا خۆڤە کۆم دبیت)[2].**

---

(١) وەکی رێز و حورمەت و ئێمناهییا مەکەهێ.

(٢) نەڤە دو رامانان دگریت: ئێک: یان مەبەستا پێغەمبەری (ﷺ) دەمێ وی بوو، موسلمانان مشەختبوونێ و هەر کەسێ هەوجەیێ پرسێت ئیسلامێ بوو بەرێ خۆ ددانە وێرێ یان مەبەست پێ نەڤە دێ ل دویماهییا دنیایێ روی دەت پشتی دەجال دهێت، ئیماندار دێ بەرێ خۆ دەنە وێرێ و ل وێرێ کۆم بن، و دوروی دێ ژێ دەرکەڤن، چونکی دەجال نەشێت بچیتە تێدا.

## ٣ . باب: الترغيب في سكنى المدينة

## بابەتێ: هاندان ل سەر ئاکنجیبوونا مەدینەیێ

٢٠٦٨ - (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِي (ﷺ) قَالَ: (إِنَّهَا طَيْبَةُ، تَنْفِي الخَبَثَ كَمَا تَنْفِي النَّارُ خَبَثَ الفِضَّةِ). [خ٤٥٨٩ (١٨٨٤)/ م١٣٨٤].

**ژ زەیدێ کوڕێ سابتی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مەدینە یا خۆشە یان مەدینە تیبەیە و پیساتی و خرابییا خۆ دەردئێخیت کا چاوا ئاگر ژەنگ و قرێژا ئاسنی دەرئێخیت).**

٢٠٦٩ - (م) عَنْ يُحَنَّسَ مَوْلَى الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ كَانَ جَالِساً عِنْدَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ فِي الْفِتْنَةِ، فَأَتَتْهُ مَوْلاَةٌ لَهُ تُسَلِّمُ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَرَدْتُ الْخُرُوجَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمنِ، اشْتَدَّ عَلَيْنَا الزَّمَانُ، فَقَالَ لَهَا عَبْدُ اللهِ: اقْعُدِي لَكَاعِ! فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (لاَ يَصْبِرُ عَلَى لأْوَائِهَا وَشِدَّتِهَا أَحَدٌ؛ إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَهِيداً، أَوْ شَفِيعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ). [م١٣٧٧].

**ژ یوحەننەسێ ئازاکرییێ زوبەیری (رضي الله عنه)، ئەو ل دەڤ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری یێ روینشتی بوو د سەردەمێ بەلایێدا[1]، ئینا ئازاکرییەکا وی هاتە دەڤ، سلاڤ کرێ و گۆت: ئەی بابێ عەبدولرەحمانی: من دڤێت دەرکەڤم ب راستی ئەڤ دەمە ل سەر مە دژوار بوو، ئینا عەبدوللایی گۆتێ: روینە خوارێ بێخێرێ، ب راستی من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (کەس نینە بێهنا خۆ ل سەر نەخۆشی و برس و دژوارییا وێ فرەه بکەت ئەگەر ئەز رۆژا قیامەتێ بۆ نەبمە بەرەڤان یان شاهد).**

٢٠٧٠ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَدْعُو الرَّجُلُ ابْنَ عَمِّهِ وَقَرِيبَهُ: هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ يَخْرُجُ مِنْهُمْ أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا؛ إِلاَّ أَخْلَفَ اللهُ فِيهَا خَيْراً مِنْهُ. أَلاَ إِنَّ الْمَدِينَةَ كَالْكِيرِ تُخْرِجُ الْخَبِيثَ، لا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَنْفِيَ الْمَدِينَةُ شِرَارَهَا، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ). [م١٣٨١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەمەك دێ ب سەر خەلکیدا هێت دێ مرۆڤ پسمام و مرۆڤێ خۆ گازی کەت وەرە بەرفرەهییێ وەرە بەرفرەهییێ، و مەدینە بۆ وان چێترە ئەگەر ئەو بزانن، و ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من**

(١) مەخسەد پێ شەرێ حەرەیە د ناڤبەرا خەلکێ مەدینەیێ و لەشکەرێ یەزیدێ کوڕێ موعاوییەی سالا شێست و سێیێ مشەختی.

**د دەستیدا کەس نینە ژ نەڤیان ژێ دەرکەڤیت ئەگەر خودێ شوینا وی یێ ژ وی چێتر بۆ تێدا پەیدا نەکەت، بزانن ب راستی هندی مەدینەیە وەکی کویرها ئاسنگەرییە پیساتییێ دەردئێخیت، و قیامەت نارابیت هەتا مەدینە خرابێت خۆ دەرنەئێخیت کا چاو کویرهە ژەنگ و ڤرێژا ئاسنی دەردئێخیت).**

٢٠٧١ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَمُوتَ بِالْمَدِينَةِ فَلْيَمُتْ بِهَا، فَإِنِّي أَشْفَعُ لِمَنْ يَمُوتُ بِهَا). [ت٣٩١٧/ جه٣١١٢].

- وعند ابن ماجه: (فَإِنِّي أَشْهَدُ لِمَنْ مَاتَ بِهَا).

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ بشێت ل مەدینەیێ بمریت بلا ل وێرێ بمریت[1] ئەز دێ بەرمڤانییێ[2] بۆ وی کەم یێ ل وێرێ دمریت).**

- **و ل دەڤ ئیبن ماجەی: (ب راستی ئەز شەهدەیێ بۆ وی ددەم یێ ل وێرێ بمریت).**

٤ ـ باب: حفظ المدينة من الدجال والطاعون.

**بابەتێ: پاراستنا مەدینەیێ ژ دەجالی و تاعوونێ.**

٢٠٧٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (عَلَى أَنْقَابِ المَدِينَةِ مَلاَئِكَةٌ، لاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلاَ الدَّجَّالُ). [خ١٨٨٠/ م١٣٧٩].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ملیاکەت یێت ل سەر رێکێت مەدینەیێ[3] نە تاعوون و نە دەجال ناچنە تێدا).**

٢٠٧٣ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلاَّ سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ؛ إِلاَّ مَكَّةَ وَالمَدِينَةَ، لَيْسَ لَهُ مِنْ نِقَابِهَا نَقْبٌ؛ إِلاَّ عَلَيْهِ المَلاَئِكَةُ صَافِّينَ يَحْرُسُونَهَا، ثُمَّ تَرْجُفُ المَدِينَةُ بِأَهْلِهَا ثَلاَثَ رَجَفَاتٍ، فَيُخْرِجُ اللهُ كُلَّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ). [خ١٨٨١/ م٢٩٤٣].

---

(١) ئانکو: یێ بێهنا خۆ فرەهـ بکەت و ژ مەدینەیێ دەرنەکەڤیت هەتا ل وێرێ دمریت یان دا ل وێرێ بمریت ئەز دێ رۆژا قیامەتێ بەرمڤانییێ بۆ کەم.

(٢) مەبەست پێ بەرمڤانییا تایبەتە نە یا گشتی.

(٣) زێرمڤانییێ لێ دکەن و دپارێزن.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (﵁)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (باژێرەك نینە هەكە دەجال نەچیتێ مەكەھ و مەدینە تێ نەبن[1]، چو رێك نینن ژ رێكێت وان هەكە ملیاكەت رێز ل سەر نەبن و زێرەڤانییێ لێ نەكەن، پاشی سێ هژیان دێ كەڤنە مەدینەیێ خودێ دێ هەمی گاور و دوروییان ژێ دەرێخیت).**

٥ . باب: إثم من كاد أهل المدينة.

**بابەتێ: گونەها یێ خرابكارییێ بۆ خەلكێ وێ بكێریت.**

٢٠٧٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ): (مَنْ أَرَادَ أَهْلَ هَذِهِ الْبَلْدَةِ بِسُوءٍ . يَعْنِي: الْمَدِينَةَ . أَذَابَهُ اللهُ كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ). [م١٣٨٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (﵁) گۆت: بابێ قاسمی (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ خرابی بۆ خەلكێ ڤی با ژێری ـ ئانكو مەدینەیێ ـ بڤێت، خودێ دێ وی حەلینیت هەروەكی خوێ د ئاڤێدا دحەلییێت).**

٦ . باب: حب المدينة.

**بابەتێ: حەژێكرنا مەدینەیێ.**

٢٠٧٥ - (ق) عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ، حَتَّى إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى المدِينَةِ قَالَ: (هذِهِ طَابَةُ، وَهذَا أُحُدٌ، جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ). [خ٤٤٢٢ (١٤٨١)/ م١٣٩٢]

**ژ ئەبی حومەیدێ ساعدی (﵁) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ شەرێ تەبووكێ دزڤرین هەتا ئەم نێزیكێ مەدینەیێ بووین و مە دیتی، گۆت: (ئەڤە تابەیە[2] و ئەڤە ئوحودە چیایەكە حەژ مە دكەت و ئەم حەژێ دكەین).**

٢٠٧٦ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ، فَنَظَرَ إِلَى جُدُرَاتِ المدِينَةِ، أَوْضَعَ رَاحِلَتَهُ، وَإِنْ كَانَ عَلَى دَابَّةٍ حَرَّكَهَا، مِنْ حُبِّهَا. [خ١٨٨٦ (١٨٠٢)].

- وفي رواية: فَأَبْصَرَ دَرَجَاتِ الْمَدِينَةِ.[خ١٨٠٢].

---

(١) و قودس و مزگەفتا توور ژی نەبیت هەروەكی د حەدیسەكا دیدا هاتی.

(٢) ناڤەكە ژ ناڤێت مەدینەیێ.

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ وەغەرەکێ زڤریبایە بەرێ خۆ ددا دیوارێت مەدینەیێ و لەز ل حێشترا خۆ دکر، و ئەگەر ل دەوارەکی یێ سویاربا ب لەز دهاژۆت ژ حەژێکرنا وی بۆ مەدینەیێ.**

- **و د ڤەگێرەکێدا: رێکێت وێ یێت بلند دیتن.**

٢٠٧٧ – (خ) عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ، وَاجْعَلْ مَوْتِي فِي بَلَدِ رَسُولِكَ (ﷺ). [خ١٨٩٠].

**ژ عومەری (ﷺ) وی دگۆت: (ئەی خودا شەهیدبوونێ د رێکا خۆدا ب رزقێ من بکە و مرنا من بێخە بازێرێ پێغەمبەرێ خۆ (ﷺ).**

## ٧ ـ باب: فضل الصلاة في المسجد النبوي و مسجد قباء

## بابەتێ: خێرا کرنا نڤێژێ ل مزگەفتا پێغەمبەری و ل مزگەفتا ڤوبائێ

**[بەرێ خۆ بدە: ١٠٧٤، ١٠٧٥، ١٠٧٩، ١٠٨١]**

## ٨ ـ باب: ما جاء في دور المدينة

## بابەتێ: ئەوا د راستا خانییێت مەدنەیێدا هاتی.

٢٠٧٨ – عَنْ زَيْنَبَ: أَنَّهَا كَانَتْ تَفْلِي رَأْسَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَعِنْدَهُ امْرَأَةُ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، وَنِسَاءٌ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ، وَهُنَّ يَشْتَكِينَ مَنَازِلَهُنَّ، أَنَّهَا تَضِيقُ عَلَيْهِنَّ وَيُخْرَجْنَ مِنْهَا، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ تُوَرَّثَ دُورَ الْمُهَاجِرِينَ النِّسَاءُ، فَمَاتَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ فَوُرِّثَتْهُ امْرَأَتُهُ دَاراً بِالْمَدِينَةِ. [د٣٠٨٠].

- ولفظ المسند : كَانَتْ زَيْنَبُ تَفْلِي رَأْسَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، وَعِنْدَهُ امْرَأَةُ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ، وَنِسَاءٌ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ يَشْكُونَ مَنَازِلَهُنَّ، وَأَنَّهُنَّ يُخْرَجْنَ مِنْهُ، وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِنَّ فِيهِ، فَتَكَلَّمَتْ زَيْنَبُ وَتَرَكَتْ رَأْسَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّكِ لَسْتِ تَكَلَّمِينَ بِعَيْنَيْكِ، تَكَلَّمِي وَاعْمَلِي عَمَلَكِ)**. فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَوْمَئِذٍ أَنْ يُوَرَّثَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ النِّسَاءُ، فَمَاتَ عَبْدُ اللهِ فَوَرِثَتْهُ امْرَأَتُهُ دَاراً بِالْمَدِينَةِ. [٢٧٠٥٠].

* صحيح الاسناد.

**ژ زەینەبێ (ﷺ) وێ ب دەستی بەرێ خۆ ددا سەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەڤژینا عوسمانێ کورێ عەففانی و هندە ژنێت مشەختان ل دەڤ بوون و وان گازندا**

خانییێت خۆ دکرن، و ل سەر وان دهێتە بەرتەنگکرن و لێ دهێنە دەرئێخستن[1]، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان دا خانییێت زەلامێت مشەختان ب میراتی بدەنە ژنان، و عەبدوللایێ کورێ مەسعودی مر و ژنا وی خانییێ وی ل مەدینەیێ ب میراتی وەرگرت.

- و د بێژەیا موسنەدێدا: زەینەبێ ب دەستی بەرێ خۆ ددا سەرێ پێغەمبەری (ﷺ) و هەڤژینا عوسمانێ کورێ مەزعوونی و هندە ژنێت مشەختییان ل دەڤ بوون گازندەیا خانییێت خۆ دکرن، و ژێ دهێنە دەرئێخستن ل سەر وان دهێتە بەرتەنگکرن، ئینا زەینەب ئاخفت و سەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هێلا، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(تو ب چاڤێت خۆ نائاخڤی باخڤە و ب دەستێ خۆ کار بکە)** وێ رۆژێ پێغەمبەری (ﷺ) فەرمان کر ژن ژ مشەختان خانی ب میرات وەرگرن، عەبدوللایێ کورێ مەسعودی مر و ژنا وی خانییێ وی ل مەدینەیێ ب میراتی وەرگرت.

## ٩ ـ باب: زيارة قبر النبي (ﷺ).

## بابەتێ: سەردەدانا گۆڕێ پێغەمبەری (ﷺ).

٢٠٧٩ – عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ، دَخَلَ الْمَسْجِدَ ثُمَّ أَتَى الْقَبْرَ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ الله، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا أَبَا بَكْرٍ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا أَبَتَاهُ. [هق٥/٢٤٥].

ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: ئەگەر ئیبن عومەر ژ وەغەرەکێ زڤریبایە دچۆ مزگەفتێ و پاشی دهاتە دەڤ گۆڕی و دگۆت: سلاڤ ل سەر تە بن ئەی پێغەمبەرێ خودێ، سلاڤ ل سەر تە بن ئەی ئەبا بەکر، و سلاڤ ل سەر تە بن ئەی بابێ من.

٢٠٨٠ – عَنْ عَبْدِ الله بْنِ دِينَارٍ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ الله بْنَ عُمَرَ يَقِفُ عَلَى قَبْرِ النبي (ﷺ) ثُمَّ يُسَلِّمُ عَلَى النبي (ﷺ) وَيَدْعُو، ثُمَّ يَدْعُو لأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ رضي الله عنهما. [هق٥/٢٤٥].

ژ عەبدوللایێ کورێ دیناری (رحمه الله) گۆت: من عەبدوللایێ کورێ عومەری دیت ل دەڤ گۆڕێ پێغەمبەری (ﷺ) د رادوەستا و پاشی سلاڤ دکرە پێغەمبەری (ﷺ) و دوعا دکرن پاشی دوعا بۆ ئەبوبەکری و عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) دکرن.



[1] ئانکو: دەمێ زەلامێت وان دمرن ل وان بەرتەنگ دکەن و میراتخۆر وان ژ خانییێت وان دەردئێخن.

پەرستن

# الكتاب الثالث عشر

# الجهاد في سبيل الله

# كتێبا سێزدێ

# جیهادا د رێكا خودایێ مەزندا

## الفصل الأول: احكاك الجهاد

## پشكا ئێكێ: فەرمانێت جیهادێ

### ١ ـ باب: لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين.

### بابەتێ: بەردەوام كۆمەك ژ ئوممەتا من دێ بنەجھ و سەركەفتی بن.

٢٠٨٢[١] – (ق) عَنِ المغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ يَزَالُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ، حَتَّى يَأْتِيَهُمْ أَمْرُ اللهِ وَهُمْ ظَاهِرُونَ). [خ٣٦٤٠/ م١٩٢١].

**ژ موغیرەیێ كورێ شوعبەیی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (دەستەیەك ژ ئوممەتا من بەردەوام دێ ل سەر دینێ خۆ د بنەجھ و سەركەفتی بن هەتا فەرمانا خودێ دهێت[٢] و ئەو هەر د بنەجھ و سەركەفتینە).**

٢٠٨٣ – عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا فَسَدَ أَهْلُ الشَّامِ فَلاَ خَيْرَ فِيكُمْ، لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي مَنْصُورِينَ، لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ).

- ولم يذكر ابن ماجه: أَهْلَ الشَّامِ. [ت٢١٩٢/ جه٦].

* صحيح.

**ژ موعاوییەیێ كورێ قورەیی (رضي الله عنه) ژ بابێ خۆ، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر خەلكێ شامێ[٣] د دینێ خۆدا خراب بوون خێر د هەودا نینە[٤] و دەستەیەك ژ ئوممەتا من بەردەوام دێ د بنەجھ و سەركەفتی بن و ئەوێت ئەو ب تنێ هێلاین و پشتەڤانیا وان نەكری زیانێ ناگەهیننە وان[٥] هەتا قیامەت رادبیت).**

- **و ئیبن ماجەیی: بەحسێ خەلكێ شامێ نەكرییە.**

٢٠٨٤ – عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (لَيَبْلُغَنَّ هَذَا الْأَمْرُ مَا بَلَغَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ، وَلاَ يَتْرُكُ اللهُ بَيْتَ مَدَرٍ وَلاَ وَبَرٍ؛ إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللهُ هَذَا الدِّينَ، بِعِزِّ عَزِيزٍ، أَوْ بِذُلِّ ذَلِيلٍ، عِزّاً

---

(١) فەرموودەیا ژمارە (٢٠٨١) د بنیاتدا نینە.

(٢) ئەوەوی (رحمه الله) دبێژیت: ئەو فەرمان بایەكە بەری قیامەتێ ب دەمەكێ كێم دهێت و جانێ هەمی باوەریداران ژ ژن و مێران دهێتە كێشان، چونكی قیامەت نارابیت ل سەر سەرێ گاوران نەبیت.

(٣) شام ئەڤرۆ ل ئوردن و لوبنان و سوریێ و فلەستینێ دگریت.

(٤) ئانكو: موسلمانێت دیدا.

(٥) كو ئەو رێكا خۆ بهێلن یان سست ببن.

يُعِزُّ اللهُ بِهِ الْإِسْلَامَ، وَذُلاً يُذِلُّ اللهُ بِهِ الْكُفْرَ). وَكَانَ تَمِيمٌ الدَّارِيُّ يَقُولُ: قَدْ عَرَفْتُ ذَلِكَ فِي أَهْلِ بَيْتِي، لَقَدْ أَصَابَ مَنْ أَسْلَمَ مِنْهُمُ الخَيْرُ وَالشَّرَفُ وَالْعِزُّ، وَلَقَدْ أَصَابَ مَنْ كَانَ مِنْهُمْ كَافِراً الذُّلُّ وَالصَّغَارُ وَالْجِزْيَةُ. [حم١٦٩٥٧].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ تەمیمێ داری (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (ئەڤ دینە دێ گەهیتە ئەو جهێ شەڤ و رۆژ دگەهنێ، و خودێ خانییەکێ ژ ئاخێ یان ژ هریێ و موی ناهێلیت[1] هەتا ڤی دینی دکەتە تێدا ب سەربلندییا سەربلندی و ب شکاندنا شکەستی، سەربلندییەکە خودێ ئیسلامێ پێ ب هێز دئێخیت و شکەستنەکە خودێ گاوران پێ دشکێنیت)[2].**

**و تەمیمێ داری دگۆت: من ئەڤە د خەلکێ مالا خۆدا دیت ئەڤێت ژ وان باوەری ئینایـن خێر و سەرفەرازی و سەربلندی گەهشتێ و ئەوێت ژ وان گاور ماین شکەستن و رسوایی و دانا زێرەسەرێ ژێ گرت.**

### ٢ . باب: فضل الجهاد.

### بابەتێ: خێرا جیهادێ.

٢٠٨٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ الله (ﷺ) فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَعْدِلُ الْجِهَادَ، قَالَ: (لاَ أَجِدُهُ). قَالَ: (هَلْ تَسْتَطِيعُ إِذَا خَرَجَ الْمُجَاهِدُ أَنْ تَدْخُلَ مَسْجِدَكَ، فَتَقُومَ وَلاَ تَفْتُرَ، وَتَصُومَ وَلاَ تُفْطِرَ)؟ قَالَ: وَمَنْ يَسْتَطِيعُ ذَلِكَ؟ [خ٢٧٨٥/ م١٨٧٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: کارەکی نیشا من بدە جهێ جیهادێ بگریت و بەرامبەری وێ بیت؟ گۆت: (ئەز چو کاران نابینم)، پاشی گۆت: (ما تو دشێی هەکە موجاهد دەرکەفت، تو بچییە د مزگەفتا خۆڤە رابی نڤێژان بکەی و نەراوەستی و رۆژییان بگری و نەخۆی)؟. گۆت: ماکی ڤێ دشێت.**

---

(١) مەخسەد چو باژێر و گوندان ناهێلیت ئیسلامەتی نەگەهیتێ.

(٢) ئانکو: یێ ئەڤ دینە وەرگرت و باوەری پێ ئینا ئەو سەرکەفت و سەر بلند بوو، و یێ پشتا خۆ داییێ و نەوەرگرت ئەو شکەست و شکەستن د دنیا و ئاخرەتێدا هەلبژارت.

٢٠٨٦ – (ق) وَعَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**انْتَدَبَ اللهُ عزّ وجل لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ، لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ إِيمَانٌ بِي وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي، أَنْ أُرْجِعَهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ، أَوْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ. وَلَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي مَا قَعَدْتُ خَلْفَ سَرِيَّةٍ، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ**). [خ٣٦/ م١٨٧٦].

و ژ وی ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(خودێ ب خۆڤە یێ گرتی، یێ د رێكا ویدا دەركەڤیت، چو وی دەرنەئێخیت ژ باوەرییا ب من و ب پێغەمبەرێت من پێڤەتر ، ئەز وی ب خێرا گەهشتییێ یان ب دەستكەفتییا گەهشتییێ بزڤرینمەڤە، یان ئەز وی ببەمە بەحەشتێ، و هەكە من ژ بەر زەحمەتێ نەبا بۆ ئوممەتا من چێ ببیت، ئەز ل چو سریا، نەڤەدمام[1] و من حەز دكر د رێكا خودێدا بێمە كوشتن، پاشی ساخ ببم پاشی بێمە كوشتن پاشی ساخ ببم پاشی بێمە كوشتن).**

٢٠٨٧ – (خ) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمٰنِ بْنِ جَبْرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**ما اغْبَرَّتْ قَدَما عَبْدٍ في سَبِيلِ اللهِ فَتَمَسَّهُ النَّارُ**). [خ٢٨١١ (٩٠٧)]

[وانظر: (حتى يقولوا: لا إله إلا الله) ٢٢].

ژ عەبدولرەحمانێ كوڕێ جوبەیری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(پێت چو بەندەیان تۆزێ د رێكا خودێدا ناگرن و ئاگر بگەهیتێ بسۆژیت).**

### ٣ ـ باب: فضل الرباط في سبيل الله.

### بابەتێ: خێرا سەنگەرگیرییا د رێكا خودێدا.

٢٠٨٨ – (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ خَيْرٌ منَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَمَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ منَ الجَنَّةِ خَيْرٌ منَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا، وَالرَّوْحَةُ يَرُوحُهَا الْعَبْدُ في سَبِيلِ اللهِ أَوِ الْغَدْوَةُ، خير مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا**).

- واقتصر مسلم على ذكر الغدوة والروحة. [خ٢٨٩٢ (٢٧٩٤)/ م١٨٨١]

ژ سەهلێ كوڕێ سەعدێ ساعدی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خێرا سەنگەرگیرییا رۆژەكێ د رێكا خودێدا چێترە ژ دنیایێ و ژ تشتێت ل سەر دنیایێ، و جهێ**

---

(١) زەحمەت د ڤێرێدایە، ڤیابا هینگێ ئەو ژی هەمی هەر د گەلبانە و نەڤەمابانە و هینگێ دا بیتە فەرز عەین و ل سەر هەمیان هێتە نڤیسین و دا یا ب زەحمەت بیت.

**ڤامچیا ئێكی ژ هەوە د بەحەشتێدا ژ دنیایێ و ژ تشتێت ل سەر دنیایێ چێترە، چۆنەكا ئێڤاری بەندە بۆ خودێ دەركەڤیت یان چۆنەكا سپێدێ بەندە بۆ خودێ دەركەڤیت ژ دنیایێ و ژ تشتێت ل سەر دنیایێ چێترە).**

- و موسلمی بەحسێ چۆنەكا ئێڤاری و سپێدەیەكێ ب تنێ كرییە.

٢٠٨٩ - (م) عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ، وَإِنْ مَاتَ جَرَى عَلَيْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُهُ، وَأُجْرِيَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ، وَأَمِنَ الْفَتَّانَ).[م١٩١٣].

ژ سەلمانی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(خێرا سەنگەگیرییا شەڤ و رۆژەكێ د رێكا خودێدا ژ رۆژیگرتنا هەیڤەكێ و رابوون و ساخكرنا وێ چێترە، و هەكە ئەو د وێ خۆراگرتنێدا مر خێرا كارێ وی دێ بۆ هێتە بەردەوامكرن و رزقێ وی دێ بۆ هێتە بەردەوامكرن[1] و ژ نەكیری و مونكیری هاتە ئێمنكرن).**

## ٤ . باب: درجات المجاهدين.

## بابەتێ: پلەیێت موجاهدان.

٢٠٩٠ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (مَنْ آمَنَ بالله وَبِرَسُولِهِ، وَأَقَامَ الصَّلاَةَ، وَصَامَ رَمَضَانَ، كانَ حَقّاً عَلَى الله أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، جاهَدَ فِي سَبِيلِ الله أَوْ جَلَسَ فِي أَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ فِيهَا). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ الله، أَفَلاَ نُبَشِّرُ النَّاسَ؟ قَالَ: (إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ، أَعَدَّهَا الله لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ الله، ما بَيْنَ الدَّرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ الله فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ، وَأَعْلَى الْجَنَّةِ ـ أُرَاهُ قالَ: وفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمنِ ـ وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ). [خ٢٧٩٠].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی بینیت، و نڤێژان ب رەنگێ پێدڤی و بەردەوام بكەت، و رەمەزانێ ب رۆژی بیت، حەقە ل سەر خودێ ئەو وی ببەتە بەحەشتێ، چ ئەو د رێكا خودێدا جیهادێ بكەت، یان ل ئەردێ خۆ یێ تێدا بوویی روینیتە خوارێ)،** گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەرێ مزگینییێ نەدەینە خەلكی؟ گۆت: **(ب راستی سەد دەرەجە یێ د بەحەشتێدا هەین، خودێ بۆ موجاهدێت د رێكا خودێدا یێت بەرهەڤ كرین، د**

(١) د بەحەشتێدا، چونكی ژ شەهیدان حسێبە.

**ناڤبەرا دەرەجە و دەرەجێدا هندی مابەینا عەرد و عەسمانانە، و ئەگەر هەوە داخواز ژ خودێ كر داخوازا فیردەوسێ بكەن، ب راستی ئەو نیڤا بەحەشتێیە و بالاترینێ بەحشتێیە، و ئەمز دبێژم گۆت: و عەرشێ دلۆڤانی یێ ل هنداڤی و ل وێرێ رووبارێت بەحەشتێ دەردكەڤن).**

٢٠٩١ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**يَا أَبَا سَعِيدٍ، مَنْ رَضِيَ بِاللهِ رَبّاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيّاً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ**)، فَعَجِبَ لَهَا أَبُو سَعِيدٍ، فَقَالَ: أَعِدْهَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللهِ! ففَعَلَ. ثُمَّ قَالَ: (**وَأُخْرَى يُرْفَعُ بِهَا الْعَبْدُ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِي الْجَنَّةِ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ**)، قَالَ: وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ، الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ**).[م١٨٨٤].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**هەر كەسێ ب خودێ، خودان رازی بیت، و ب موحەممەدی پێغەمبەر، و ب ئیسلامێ دین، بەحەشت بۆ واجب بوو**)، ئەبو سەعید پێ خۆش بوو، گۆت: بۆ من بێژەڤە یا پێغەمبەرێ خودێ، بۆ گۆتەڤە، پاشی گۆت: (**و ئێكا دی: خودێ بەندەی پێ سەد دەرەجەیان بلند دكەت، د ناڤبەرا دەرەجە و دەرەجێدا هندی مابەینا عەرد و عەسمانانە**)، گۆت: ئەو چییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (**جیهادا د رێكا خودێدایە، جیهادا د رێكا خودێدایە**).

## ٥ ـ باب: فضل الشهادة واستحباب طلبها.

## بابەتێ: خێرا شەهیدبوونێ و باشە بهێتە خواستن.

٢٠٩٢ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَا مِنْ عَبْدٍ يَمُوتُ، لَهُ عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ، يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، وَأَنَّ لَهُ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا؛ إِلاَّ الشَّهِيدُ، لِمَا يَرَى مِنْ فَضْلِ الشَّهَادَةِ، فَإِنَّهُ يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، فَيُقْتَلَ مَرَّةً أُخْرَى**). [خ٢٧٩٥/ م١٨٧٧].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (**نینە بەندەیك بمریت و وی خۆشییەك ژ دەڤ خودێ هەبیت، و پێخۆش بیت بزڤریتەڤە دنیایێ بلا دنیا و تشتێ تێدا یا وی بیت شەهید نەبیت، ژ بەر ئەوا ژ قەدر و بهایێ شەهیدبوونێ دبینیت، ب راستی وی پێ خۆشە بزڤریتەڤە دنیایێ و جارەكا دیتە بهێتە كوشتن**).

٢٠٩٣ - (م) عَنْ سَهلِ بنِ حُنَيْفٍ: أَنَّ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ سَأَلَ اللهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ**). [م١٩٠٩].

**ژ سەهلێ كوڕێ حونەیفی (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ژ دل و ژ راستی داخوازا شەهیدبوونێ ژ خودێ بكەت، خودێ دێ وی گەهینیتە خێرا شەهیدان خۆ ئەگەر ئەو ل سەر جهێت خۆ ژی بمریت).**

٢٠٩٤ – عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لِلشَّهِيدِ عِنْدَ اللهِ سِتُّ خِصَالٍ: يُغْفَرُ لَهُ فِي أَوَّلِ دَفْعَةٍ، وَيَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُجَارُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَيَأْمَنُ مِنَ الْفَزَعِ الْأَكْبَرِ، وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ الْوَقَارِ، الْيَاقُوتَةُ مِنْهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَيُزَوَّجُ اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ زَوْجَةً مِنَ الْحُورِ الْعِينِ، وَيُشَفَّعُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَقَارِبِهِ**).　　[ت١٦٦٣/ جه٢٧٩٩]

- والذي عند ابن ماجه: (**وَيُحَلَّى حُلَّةَ الْإِيمَانِ، وَيُزَوَّجُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ**)، ولم يذكر التاج، وكذا عدد الزوجات.

* صحيح.

**ژ میقدامێ كوڕێ مەعدیەكروب (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (شەش خەلات ل دەڤ خودێ بۆ شەهیدی یێت هەین: (دەستپێكێ گونەهێت وی دهێنە ژێبرن، و جهێ خۆ ل بەحەشتێ دبینیت، و ژ ئیزایا گۆڕی دهێتە پاراستن، و ژ ترسا مەزنا رۆژا قیامەتێ ئێمن دبیت، و تاجا رێزدارییێ ددانن سەر سەرێ وی یاقوتەك ژێ چێترە ژ دنیایێ و ژ تشتێ تێدا، و حەفتێ و دو حۆرییێت چاڤرەش و مەزن لێ دهێنە مارەكرن، و بەرهڤانییێ بۆ حەفتێیا ژ مرۆڤێت خۆ دكەت).**

- **و ئەوا ل دەڤ ئیبن ماجەیی: (و جلكێ باوەرییێ دێ كەنە بەر و دێ هەڤژینییێ د گەل حۆرییێن چاڤرەش و مەزن كەت).**

٦ ـ باب: الشهداء أَحياء عند ربهم.

**بابەتێ: شەهید ل دەڤ خودایێ خۆ د ساخن.**

٢٠٩٥ – (م) عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْنَا عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ عَنْ هذِهِ الآيَةِ: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًاۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴿١٦٩﴾﴾ [آل عمران] ؟ قَالَ: أَمَا إِنَّا قَدْ سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: (**أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلَى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ. فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ ربهم اطِّلَاعَةً، فَقَالَ: هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئاً؟ قَالُوا: أَيَّ شَيْءٍ نَشْتَهِي؟ وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا! فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ. فَلَمَّا رَأَوْا**

أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا، قَالُوا: يَا رَبِّ، نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى، فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ، تُرِكُوا). [م١٨٨٧].

ژ مەسروقی (رحمه الله) گۆت: مە پرسیار ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی ژ ڤێ ئایەتێ كر: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًاۢ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ گۆت: ب راستی مە پرسیارا وێ چەندێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) یا كری، ئینا گۆت: **(جانێت وان یێت د لەشێ بالندەیێت كەسكدا، وان هێلینێت ب عەرشیڤە یێت هەین، هەر جهێ بڤێت ژ بەحەشتێ لێ دچەرن و دگەریێن، پاشی دزڤرنەڤە وان هێلینان، خودایێ وان، ب بەرێخۆدانەكێ بەرێ خۆ ددەتە وان، ئینا گۆت: دلێ هەوە دچیتە تشتەكی؟ دێ بێژن: ما دلێ مە دچیتە چ؟ و ل هەر جهێ مە ژ بەحەشتێ دڤێت ئەم لێ دگەرین و دچەرین، سێ جاران دێ ڤێ د گەل وان كەت، ڤێجا دەمێ وان زانی ئەو وان ناهێلیت دێ هەر پرسیار ژ وان هێتە كرن، گۆتن: ئەی خودا مە دڤێت تو جانێت مە بزڤرینییەڤە د لەشێت مەدا دا جارەكا دی د رێكا تەدا بهێینە كوشتن، ڤێجا دەمێ دیتی وان چ داخوازی نینە هاتنە هێلان).**

٧ ـ باب: الجنة تحت ظلال السيوف.

**بابەتێ: بەحەشت یا ل بن سیبەرا شیران (ئانكو د جیهادێدا).**

٢٠٩٦ – (م) عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ أنه قَالَ وَهُوَ بِحَضْرَةِ الْعَدُوِّ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(إِنَّ أَبْوَابَ الْجَنَّةِ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ)**، فَقَامَ رَجُلٌ رَثُّ الْهَيْئَةِ، فَقَالَ: يَا أَبَا مُوسَى، آنْتَ سَمِعْتَ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ هذَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَرَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَقْرَأُ عَلَيْكُمُ السَّلَامَ، ثُمَّ كَسَرَ جَفْنَ سَيْفِهِ، فَأَلْقَاهُ، ثُمَّ مَشَى بِسَيْفِهِ إِلَى الْعَدُوِّ، فَضَرَبَ بِهِ حَتَّى قُتِلَ. [م١٩٠٢].

ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری، گۆت: من گوهـ ل بابێ خۆ بوو (رضي الله عنه)، و ئەو بەرامبەر دژمنان بوو، دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی دەرگەهێت بەحەشتێ یێت ل بن سیبەرا شیرانڤە)**، زەلامەكێ بێ سەر و بەر (ئانكو جلك كەڤن) رابوو و گۆت: ئەی ئەبو مووسا ئەرێ تە گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوویە ئەڤە گۆتی؟ گۆت: بەلێ، زڤری دەڤ هەڤالێت خۆ و گۆت: سلاڤ ل هەوە بن پاشی كاڤلانێ شیرێ خۆ شكاند و هاڤێت، پاشی ب شیرێ خۆڤە چۆ دژمنی و شەڕ پێ كر هەتا هاتییە كوشتن.

## ٨ . باب: الشهادة تكفر الخطايا إلا الدَّين.

## بابەتێ: شەهیدبوون گونەهان ژێ دبەت دەین تێ نەبیت.

٢٠٩٧ - (م) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ الله يُكَفِّرُ كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ الدَّيْنَ**). [م١٨٨٦].

- وفي رواية: (يُغْفَرُ للشهيدِ كلُّ ذَنْبٍ إلاَّ الدَّيْنَ).

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمرێ كوڕێ عاسی (خودێ ژ هەردووان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (كوشتنا د رێكا خودێدا هەمی تشتان ژێ دبەت دەین تێ نەبیت).**

**و د ڤەگێڕەكێدا: (خودێ هەمی تشتان بۆ شەهیدی ژێ دبەت دەین تێ نەبیت).**

## ٩ . باب: من قتل دون ماله فهو شهيد.

## بابەتێ: یێ سەرا مالێ خۆ بهێتە كوشتن شەهیدە.

٢٠٩٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْن عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيِّ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ**). [خ٢٤٨٠/ م١٤١]

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمرێ كوڕێ عاسی (خودێ ژ هەردووان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ سەرا مالێ خۆ بێتە كوشتن شەهیدە).**

٢٠٩٩ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ الله (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله، أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخذَ مَالِي؟ قَالَ: (**فَلاَ تُعْطِهِ مَالَكَ**). قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي؟ قال: (**قَاتِلْهُ**). قال: أرأيتَ إِنْ قَتَلَنِي؟ قَالَ: (**فَأَنْتَ شَهِيد**). قال: أرأيتَ إِنْ قَتَلْتُهُ؟ قَالَ: (**هُوَ فِي النَّارِ**). [م١٤٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ بێژە من هەكە زەلامەك هات ڤیا مالێ من ژ من وەرگریت چ بكەم؟ گۆت: (مالێ خۆ نەدەڤێ)، گۆت: بێژە من هەكە شەڕێ من كر؟ گۆت: (شەڕێ وی بكە)، گۆت: بێژە من هەكە ئەز كوشتم؟ گۆت: (تو شەهیدی)، گۆت: بێژە من هەكە من ئەو كوشت؟ گۆت: (ئەو یێ د ئاگریدا).**

٢١٠٠ - عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ، أَوْ دُونَ دَمِهِ، أَوْ دُونَ دِينِهِ؛ فَهُوَ شَهِيدٌ**). [د٤٧٧٢/ ت١٤٢١/ ن٤١٠١٠/ جه٢٥٨٠]

* صحيح.

ژ سەعیدێ كوڕێ زەیدی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ سەرا مالێ خۆ بێتە كوشتن شەهیدە، و هەر كەسێ سەرا بەرەڤانییێ ژ مالا خۆ بێتە كوشتن شەهیدە، هەر كەسێ سەرا بەرەڤانییێ ژ خۆ بێتە كوشتن شەهیدە، و هەر كەسێ سەرا دینێ خۆ بێتە كوشتن شەهیدە).

## ١٠ ـ باب: من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا.

## بابەتێ: هەر كەسێ شەڕی بكەت دا دینێ خودێ یێ بلند بیت.

٢١٠١ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قالَ أَعْرَابِيٌّ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): الرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُذْكَرَ، وَيُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، مَنْ في سَبِيلِ الله؟ فَقَال: (**مَنْ قَاتَلَ لِتكُونَ كَلِمَةُ الله هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله**). [خ ٣١٢٦ (١٢٣)/ م١٩٠٤].

- وفي رواية لهما: قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: الرَّجُلُ يُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، فَأَيُّ ذلِكَ فِي سَبِيلِ الله؟ قَالَ: (**مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ الله هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله**). [خ٧٤٥٨].

ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (ﷺ)، گۆت: كۆچەرە عەرەبەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: یا پێغەمبەرێ خودێ زەلام: شەڕی بۆ دەستكەفتی دكەت، و زەلام شەڕی دكەت دا مەدحێت وی بێنە كرن، و زەلام شەڕی دكەت دا جهێ وی بێتە دیتن (ئانكو بۆ رویمەتییێ)؟ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (**هەر كەسێ شەڕی بكەت دا دینێ خودێ یێ بلند بیت ئەو بۆ خودێیە**).

- و د ریوایەتەكا واند: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: زەلام یێ هەی شەڕی بۆ عەشیركییێ دكەت، (ئانكو بۆ عینادا عەشیركی و تەعەسسوبێ) و بۆ مێرینییێ شەڕی دكەت، و بۆ رویمەتییێ شەڕی دكەت، كی ژ ڤان د رێكا خودێدایە؟ ئینا گۆت: (**هەر كەسێ شەڕی بكەت دا دینێ خودێ یێ بلند بیت ئەو بۆ خودێیە**).

٢١٠٢ - (م) عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللهِ البَجَلِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**مَنْ قُتِلَ تَحْتَ رَايَةٍ عُمِّيَّةٍ، يَدْعُو عَصَبِيَّةً، أَوْ يَنْصُرُ عَصَبِيَّةً، فَقِتْلَةٌ جَاهِلِيَّةٌ**). [م١٨٥٠].

ژ جوندبێ كوڕێ عەبدوللایێ بەجەلی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**هەر كەسێ ل بن ئالایەكێ كۆرەڤە بهێتە كوشتن، داخوازێ بۆ عەشیرگیرییا كۆرە بكەت، یان عەشیرگیرییا كۆرە سەربێخیت كوشتنا وی یا نەزانینێیە**).

**١١ ـ باب: بيان الشهداء.**

**بابەتێ: دیاركرنا شەهیدان.**

**٢١٠٣ ـ** (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: المَطْعُونُ، وَالمَبْطُونُ، وَالْغَرِقُ، وَصَاحِبُ الْهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ الله**) [خ٢٨٢٩ (٦٥٣)/ م١٩١٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (شەهید پێنجن: یێ ب تاعوونێ مری و ب ئێشێت هناڤان مری و یێ خەندقی و یێ تشتەك سەردا هاتی و مری و یێ د رێكا خودێدا شەهید بووی).**

٢١٠٤ – عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**خَمْسٌ مَنْ قُبِضَ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ فَهُوَ شَهِيدٌ: الْمَقْتُولُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ، وَالْغَرِقُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ، وَالْمَبْطُونُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ، وَالْمَطْعُونُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ، وَالنُّفَسَاءُ فِي سَبِيلِ اللهِ شَهِيدٌ**) . [ن٣١٦٣].

* صحيح.

**ژ عوقبەیێ كورێ عامری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پێنج تشت هەر كەسێ د تشتەكی د واندا بمریت ئەو شەهیدە، كوشتییێ د جیهادێدا شەهیدە، و خەندقین د ئاڤێدا د رێكا خودێدا[1] شەهیدە، مرن ب ئێشێن هناڤا د رێكا خودێدا شەهیدە، و مرن ب تاعوونێ د رێكا خودێدا شەهیدە، و مرن د زارۆكبوونێدا د رێكا خودێدا شەهیدە).**

**١٢ ـ باب: من قاتل رياء.**

**بابەتێ: یێ بۆ رویمەتییێ شەڕی بكەت.**

٢١٠٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولُ اللهِ، أَخْبِرْنِي عَنِ الجِهَادِ والغَزْوِ؟ فَقَالَ: (**يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو، إِنْ قَاتَلْتَ صَابِراً مُحْتَسِباً، بَعَثَكَ اللهُ صَابِراً مُحْتَسِباً، وَإِنْ قَاتَلْتَ مُرائِياً مُكَاثِراً بَعَثَكَ اللهُ مُرائِياً مُكَاثِراً. يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرٍو، عَلَى أَيِّ حَالٍ قَاتَلْتَ أَوْ قُتِلْتَ، بَعَثَكَ اللهُ عَلَى تِلْكَ الحَالِ**). [ك٢٤٣٧، ٢٥٢٩].

* قال الذهبي: صحيح.

[وانظر: ٥، ٧] .

---

(١) رستەیا نێكێ (د رێكا خودێدا)، ئانكو: د جیهادێدا، و یێت دی هەمی رامان ئەوە د ئیسلامێدا، ئانكو: یێ موسلمان بیت نە هەر كەسێ هەبیت.

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆ من بەحسێ جیهادێ و خەزایێ بكە، ئینا گۆت: **(ئەی عەبدوللایێ كورێ عەمری، ئەگەر تە ب بێهنفرەهی و ب دلسۆزی (ئانكو: ئنیەتا تە بۆ خودێ بیت) شەڕ كر خودێ دێ بێهنفرەه و دلسۆز تە ساخ كەت، و ئەگەر تە بۆ رویمەتییێ و ل خۆزێدەكرنێ (مالی یان مەدحان) شەڕ كر، خودێ دێ تە رویمەتكار و ل خۆزێدەكەر ساخ كەت، ئەی عەبدوللایێ كورێ عەمری ل سەر چ رەوش تو شەڕی بكەی، خودێ دێ تە ل سەر وێ رەوشێ ساخ كەت).**

## ١٣ ـ باب: تحريم قتل الكافر إذا أسلم.

## بابەتێ: حەرامكرنا كوشتنا گاوری ئەگەر موسلمان بوو.

٢١٠٦ – (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيدِ بْنِ حَارِثَةَ رضي الله عنهما قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ الله (ﷺ) إِلَى الْحُرَقَةِ مِنْ جُهَيْنَةَ، قَالَ: فَصَبَّحْنَا الْقَوْمَ فَهَزَمْنَاهُمْ، قَالَ: وَلَحِقْتُ أَنَا وَرَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ رَجُلاً مِنْهُمْ، قَالَ: فَلَمَّا غَشِيْنَاهُ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله، قَالَ: فَكَفَّ عَنْهُ الأَنْصَارِيُّ، فَطَعَنْتُهُ بِرُمْحِي حَتَّى قَتَلْتُهُ. قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا بَلَغَ ذلِكَ النَّبِيَّ (ﷺ)، قَالَ: فَقَالَ لِي: **(يَا أُسَامَةُ، أَقَتَلْتَهُ بَعْدَمَا قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله)** ؟ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله، إِنَّمَا كَانَ مُتَعَوِّذاً، قَالَ: **(أَقَتَلْتَهُ بَعْدَمَا قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله)** ؟ قَالَ: فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا عَلَيَّ، حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ أَسْلَمْتُ قَبْلَ ذلِكَ الْيَوْمِ. [خ٦٨٧٢ (٤٢٦٩)/ م٩٦].

ژ ئوسامەیێ كورێ زەیدی (خودێ ژ هەردووان رازی بیت)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەم هنارتینە بابكێ حورەقەتێ ژ جوهەینییان، ئەم سپێدێ ل سەر ئاڤا وان گەهشتینێ ئەز و زەلامەكێ ئەنساری چۆینە زەلامەكی ژ وان، وەختێ ئەم چۆینە هنداڤ گۆت: (لا إلهِ إلا الله) چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت، هەڤالێ من یێ ئەنساری خۆ ژێ ڤەگرت، و من روما خۆ لێدا هەتا من كوشتی، و وەختێ ئەم زڤرینە مەدینێ ئەڤە گەهشتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من **(یا ئوسامە ئەرێ تە كوشت پشتی گۆتی: لا إلهَ إلاّ اللهُ)**؟ من گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ وی بەس خۆ پێ دپاراست، گۆت: **(ئەرێ تە كوشت پشتی گۆتی: لا إلهَ إلاّ اللهُ)**؟ بەردەوام گۆت و دگۆتەڤە، هەتا من خۆزی كر ئەز بەری ئەڤرۆكە موسلمان نەببام.

## ١٤ ـ باب: النهي عن الإغارة إذا سمع الأذان.

### بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ هێرشكرنێ ئەگەر بانگ هاتە بهیستن.

٢١٠٧ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُغِيرُ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، وَكَانَ يَسْتَمِعُ الأَذَانَ، فَإِنْ سَمِعَ أَذَاناً أَمْسَكَ؛ وَإِلاَّ أَغَارَ. فَسَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**عَلَى الْفِطْرَةِ**) ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، فقالَ رسول اللهِ (ﷺ): (**خَرَجْتَ مِنَ النَّارِ**) ، فَنَظَرُوا فَإِذا هُوَ رَاعِي مِعْزَى. [م٣٨٢].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر سپێدە دەركەفتبا هێرش دكر، و گوهێ خۆ ددا بانگی، ڤێجا ئەگەر گوه ل بانگی ببا خۆ ڤەدگرت، و ئەگەر نە هێرش دكر، گوه ل زەلامەكی بوو دگۆت:** اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، **ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( ئەو موسلمانە) پاشی گۆت:** أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، **ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تو ژ ئاگری دەركەفتی)، ئینا بەرێ خۆ دانێ دیت ئەو شڤانێ بزنایە.**

## ١٥ ـ باب: الدعوة إلى الإسلام قبل القتال.

### بابەتێ: داخوازكرنا وان بۆ ئیسلامێ بەری شەڕی.

٢١٠٨ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَا قَاتَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قَوْماً قَطُّ حَتَّى يَدْعُوهُمْ. [مي٢٤٨٨/هق٩/١٠٧]

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ د بنیڕا شەڕێ كەسێ نەكرییە هەتا ئەو داخواز نەكربانە ئیسلامەتییێ.**

## ١٦ ـ باب: لا يستعان بمشرك.

### بابەتێ: هاریكاری ژ هەڤپشكچێكەری ناهێتە وەرگرتن.

٢١٠٩ - (م) عَنْ عَائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قِبَلَ بَدْرٍ، فَلَمَّا كَانَ بِحَرَّةِ الْوَبَرَةِ أَدْرَكَهُ رَجُلٌ، قَدْ كَانَ يُذْكَرُ مِنْهُ جُرْأَةٌ وَنَجْدَةٌ، فَفَرِحَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حِينَ رَأَوْهُ، فَلَمَّا أَدْرَكَهُ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ): جِئْتُ لأَتَّبِعَكَ وَأُصِيبَ مَعَكَ، قَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**تُؤْمِنُ بِاللهِ وَرَسُولِهِ**) ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: (**فَارْجِعْ، فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ**) . قَالَتْ: ثُمَّ مَضَى، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالشَّجَرَةِ

أَدْرَكَهُ الرَّجُلُ، فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ؛ قَالَ: (**فَارْجِعْ، فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ**) . قَالَ: ثُمَّ رَجَعَ فَأَدْرَكَهُ بِالْبَيْدَاءِ، فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ: (**تُؤْمِنُ بِاللهِ وَرَسُولِهِ**)؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**فَانْطَلِقْ**). [م١٨١٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) وێ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ لایێ بەدرێ دەركەفت، ڤێجا دەمێ گەهشتییە حورەتولوەبرە (جهەكە چوار میلان ژ مەدینەیێ دویرە) زەلامەك گەهشتێ و بەحسێ وێرەكی و مێرینییا وی د هاتەكرن، ئینا دەمێ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) ئەو دیتی كەیفا وان هات، ڤێجا دەمێ گەهشتییێ گۆتە پێغەمبەرێ خودێ: ئەز یێ هاتیم د گەل تە بهێم و تشتەكی د گەل تە ب دەستخۆڤە بینم، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (تو باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی دئینی)؟ گۆت: نەخێر، گۆت: (بزڤرە ئەز هاریكارییێ ژ هەڤپشكچێكەری ناوەرگرم)، گۆت: پاشی چۆ هەتا گەهشتییە دارێ (جهەكە بەری ئەبیار عەلی) ئەو زەلام ڤێرا گەهشت، و ئەو گۆت یا جارا ئێكێ گۆتی، ئینا پێغەمبەری ژی (ﷺ) ئەو گۆتێ یا جارا ئێكێ گۆتی، گۆت: (بزڤرە ئەز هاریكارییێ ژ هەڤپشكچێكەری ناوەرگرم)، گۆت: ئینا زڤری و ل بەیدائێ (جهەكە ب ئەبیار عەلیڤە گرێدایە) ڤێرا گەهشتەڤە، و ئەو گۆت یا جارا ئێكێ گۆتی، ئینا گۆتێ: (تو باوەرییێ ب خودێ و پێغەمبەرێ وی دئینی) گۆت: بەلێ، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (وەرە).**

## ١٧ - باب: إخراج غير المسلمين من الجزيرة.

## بابەتێ: دەرئێخستنا نەموسلمانان ژ گزیرتەیێ.

٢١١٠ - (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**لأُخْرِجَنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، حَتَّى لاَ أَدَعَ إِلاَّ مُسْلِماً**) . [م١٧٦٧].

**ژ عومەرێ كورێ خەتتابی (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (بێ گۆمان ئەز دێ جوهی و فەلەیان ژ گزیرتەیا عەرەبی دەرئێخم هەتا كەسێ تێدا نەهێلم موسلمان نەبیت).**

## ١٨. باب: عقوبة الجاسوس.

## بابەتێ: سزایێ سیخورى.

٢١١١ - (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكوَعِ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) عَيْنٌ مِنَ المشْرِكِينَ وَهوَ فِي سَفَرٍ، فَجَلَسَ عِنْدَ أَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُ، ثُمَّ انْفَتَلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(اطْلُبُوهُ وَاقْتُلُوهُ)** . فَقَتَلْتُهُ، فَنَفَّلَهُ سَلَبَهُ.[خ٣٠٥١/م١٧٥٤].

- ولفظ مسلم: قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ) هَوَازِنَ، فَبَيْنَا نَحْنُ نَتَضَحَّى مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ) إِذْ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ أَحْمَرَ، فَأَنَاخَهُ، ثُمَّ انْتَزَعَ طَلَقاً مِنْ حَقَبِهِ، فَقَيَّدَ بِهِ الْجَمَلَ. ثُمَّ تَقَدَّمَ يَتَغَدَّى مَعَ الْقَوْمِ، وَجَعَلَ يَنْظُرُ، وَفِينَا ضَعْفَةٌ وَرِقَّةٌ فِي الظَّهْرِ، وَبَعْضُنَا مُشَاةٌ. إِذْ خَرَجَ يَشْتَدُّ، فَأَتَى جَمَلَهُ فَأَطْلَقَ قَيْدَهُ، ثُمَّ أَنَاخَهُ وَقَعَدَ عَلَيْهِ، فَأَثَارَهُ، فَاشْتَدَّ بِهِ الْجَمَلُ، فَاتَّبَعَهُ رَجُلٌ عَلَى نَاقَة وَرْقَاءَ. قَالَ سَلَمَةُ: وَخَرَجْتُ أَشْتَدُّ، فَكُنْتُ عِنْدَ وَرِكِ النَّاقَةِ، ثُمَّ تَقَدمْتُ، حَتَّى كُنْتُ عِنْدَ وَرِكِ الْجَمَلِ، ثُمَّ تَقَدَّمْتُ حَتَّى أَخَذْتُ بِخِطَامِ الجَمَلِ فَأَنَخْتُهُ، فَلَمَّا وَضَعَ رُكْبَتَهُ فِي الأَرْضِ، اخْتَرَطْتُ سَيْفِي، فَضَرَبْتُ رَأْسَ الرَّجُلِ، فَنَدَرَ، ثُمَّ جِئْتُ بِالْجَمَلِ أَقُودُهُ، عَلَيْهِ رَحْلُهُ وَسِلاَحُهُ، فَاسْتَقْبَلَنِي رَسُولُ الله (ﷺ) وَالنَّاسُ مَعَهُ، فَقَالَ: **(مَنْ قَتَلَ الرَّجُلَ)** ؟ قَالُوا: ابْنُ الأَكْوَعِ. قَالَ: **(لَهُ سَلَبُهُ أَجْمَعُ)**.

**ژ سەلەمەیێ كورێ ئەكوەعى (رضي الله عنه) گۆت: سیخورەك ژ هەڤپشكچێكەران هاتە دەڤ پێغەمبەرى (ﷺ) و ئەو ل وەغەرێ بوو، ئینا ل دەڤ هەڤالێت وى روینشتە خوارێ و د گەل وان ئاخفت پاشى زڤرى، ئینا پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: (بگرن و بكوژن) ئینا سەلەمەیى ئەو كوشت و پێغەمبەرى تشتێت وى دانە وى.**

- **و د بێژەیا موسلمیدا: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ چۆینە شەرێ هەوازن، و د دەمێ تێشتەگەهێدا مە بێهنا خۆ د گەل پێغەمبەرى (ﷺ) ڤەدا، د وى دەمیدا زەلامەك ل سەر حێشترەكا سۆر هات و دانا و پاشى كنفەك ژ چەنتكا خۆ دەرئێخست و حێشتر پێ گرێدا، پاشى پێشڤە هات خوارنێ د گەل خەلكى بخۆت، و هەر بەرێ خۆ ددا وارا، و لاواز د ناڤمەدا هەبوون و دەوارێت مە یێت سویاربوونێ د كێم بوون و هندەك ژ مە پەیادەبوون، ژ نیشكەكێڤە دەركەفت و لەز كر و هاتە دەڤ حێشترا خۆ و كنفا وێ بەردا، پاشى داناند و لێ سویار بوو و هاژۆت و حێشتر ب لەز چۆ، ئینا زەلامەك ل سەر حێشترەكا سپى د دویڤرا چۆ، و ئەز ژى ب پێیان ب لەز دویڤرا چۆم هەتا ئەز گەهشتیمە رانێ حێشترا ئێكێ یا سپى، پاشى ئەز پێشڤە چۆم هەتا گەهشتیمە رانێ حێشترا وى زەلامى، پاشى ئەز**

**پێشفە چۆم هەتا من هەفسارێ وێ گرتی و من دانا، فێجا دەمێ چۆكێت خۆ داناینە عەردی من شیرێ خۆ ژ كافلانكی دەرئێخست و من ل سەرێ زەلامی دا و سەرێ وی ژێڤە بوو و كەفت، پاشی من حێشتر و تشتێ ل سەر و چەكێ وی ئینان، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە پێشیا من و خەلك د گەل وی بوو، ئینا گۆت: (كێ ئەڤ زەلامە كوشت)؟ گۆتن: كورێ ئەكوەعی: گۆت: (تشتێت وی بۆ وینە).**

## ١٩ . باب: وصية الإمام بآداب الجهاد.

## بابەتێ: فەرمانا مەزنی ب رەوشتێت جیهادێ.

٢١١٢ - (م) عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله (ﷺ) إِذَا أَمَّرَ أَمِيراً عَلَى جَيْشٍ أَوْ سَرِيَّةٍ، أَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى الله، وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْراً. ثُمَّ قَالَ: **(اغْزُوا بِاسْمِ الله، فِي سَبِيلِ الله، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِالله. اغْزُوا وَلاَ تَغُلُّوا، وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تَمْثُلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيداً. وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ ـ أَوْ خِلاَلٍ ـ فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ.**

**ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، فَإِنْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ. ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ، فَلَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ وعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ. فَإِنْ أَبَوْا أَنْ يَتَحَوَّلُوا مِنْهَا، فَأَخْبِرْهُمْ: أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسلِمِينَ، يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ الله الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَلاَ يَكُونُ لَهُمْ فِي الْغَنِيمَةِ وَالْفَيْءِ شَيْءٌ؛ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ.**

**فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَسَلْهُمُ الجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ. فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِالله وَقَاتِلْهُمْ. وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ، فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ الله وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ، فَلاَ تَجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّةَ الله وَلاَ ذِمَّةَ نَبِيِّهِ، وَلكِنِ اجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ. فَإِنَّكُمْ، أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَمَكُمْ وَذِمَمَ أَصْحَابِكُمْ، أَهْوَنُ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ الله وَذِمَّةَ رَسُولِهِ.**

**وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ، فَأَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ الله، فَلا تُنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِ الله، وَلكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ؛ فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَتُصِيبُ حُكْمَ الله فِيهِمْ أَمْ لاَ).** [م١٧٣١].

**ژ بورەیدەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر سەرلەشكەرەك ل سەر لەشكەرەكی یان سریەكێ دانبایە، فەرمانا وی تایبەت ب ترسا خودێ و یێت د گەل وی ژ موسلمانان دكر، پاشی دگۆت: (ب نافێ خودێ شەرێ د رێكا خودێدا بكەن، شەرێ وان بێت گاور بووین و باوەری ب خودێ نەئینایین بكەن، و خیانەتێ د دەستكەفتیدا نەكەن، و**

غەدرێ نەکەن و پەیمانان نەشکێنن، و کوشتییان کرێت نەکەن تشتەکی ژ وان ژێڤە بکەن، و بچویکی نەکوژن، و ئەگەر تو گەهشتییە دژمنێ خۆ ژ هەڤپشکچێکەران داخوازا وان بۆ سێ خەسلەتان بکە[1] هەچییا ژ وان سێیان وەرگرت ژ وان قەبویل بکە و وان بهێلە.

پاشی وان داخواز بکە ئیسلامێ، ئەگەر گوهێ خۆ دانە تە ژێ قەبویل بکە و وان بهێلە، پاشی ژ وان بخوازە ئەو مشەخت ببن و جهێ خۆ ڤەگوهێزن[2]، و ئەگەر وان ئەو کر کا چ بۆ مشەختان هەیە ئەو بۆ وانە، و ئەوا ل سەر مشەختان ل سەر وانە، و ئەگەر نەڤیان مشەخت ببن، بگەهینە وان ئەو وەکی کۆچەرە عەرەبێت موسلمانن فەرمانا خودێ ل سەر وان دێ هێتە ب جهئینان ئەوا ل سەر باوەریداران دهێتە ب جهئینان و وان چو پشك د دەستکەفت و فەیئێدا[3] نینە ئەو نەبیت ئەوا د گەل موسلمانان جیهادێ بکەن.

ئەگەر وان ئەڤە نەڤیا و گوهداری نەکر داخوازا زێرەسەرێ ژێ بکە، و ئەگەر وان گوهێ خۆ دا تە ژ وان وەرگرە و وان بهێلە، و ئەگەر وان ئەڤە نەکر هینگێ هاریکارییێ ژ خودێ بخوازە و شەڕێ وان بکە.

و ئەگەر تە کەلهەك دۆرپێچ کر و خەلکێ وێ ڤیا تو بەختێ خودێ و پێغەمبەرێ وی بدەیێ بەختێ خودێ و پێغەمبەرێ وی نەدەیێ، بەلێ بەختێ خۆ و یێ هەڤالێت خۆ بدەیێ، چونکی ئەگەر هوین بەختێ خۆ و یێ هەڤالێت خۆ بشکێنن ساناهیترە ژ هوین بەختێ خودێ و پێغەمبەرێ وی بشکێنن.

و ئەگەر تە کەلهەك دۆرپێچ کر و ڤیان تو وان ل سەر حوکمێ خودێ بینییە خوارێ وان ل سەر حوکمێ خودێ نەئینە خوار، بەلێ ل سەر فەرمانا خۆ بینە خوار، چونکی تو نوزانی دێ دورست فەرمانا خودێ د راستا واندا کەی یان نە).

٢١١٢ – م ـ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ بَعَثَ جُيُوشاً إِلَى الشَّامِ، فَخَرَجَ يَمْشِي مَعَ يَزِيدَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، وَكَانَ أَمِيرَ رُبْعٍ مِنْ تِلْكَ الْأَرْبَاعِ، فَزَعَمُوا أَنَّ يَزِيدَ قَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: إِمَّا أَنْ تَرْكَبَ، وَإِمَّا

---

(١) خصلە و خلال: نێك رامانن، بەلێ ڤەگێر ب گۆمان کەتییە د ناڤبەرا هەردوواندا.

(٢) هینگێ مشەختبوون فەرز بوو، بەلێ پشتی مەکەهـ هاتییە ڤەکرن ئەو حوکم نەما.

(٣) ئەو دەستکەفتا نە ب شەڕ ب دەست موسلمانانڤە دهێت.

أَنْ أَنْزِلَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَا أَنْتَ بِنَازِلٍ، وَمَا أَنَا بِرَاكِبٍ، إِنِّي أَحْتَسِبُ خُطَايَ هَذِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ.ثُمَّ قَالَ لَهُ: إِنَّكَ سَتَجِدُ قَوْماً زَعَمُوا أَنَّهُمْ حَبَّسُوا أَنْفُسَهُمْ لِلَّهِ، فَذَرْهُمْ وَمَا زَعَمُوا أَنَّهُمْ حَبَّسُوا أَنْفُسَهُمْ لَهُ. وَسَتَجِدُ قَوْماً فَحَصُوا عَنْ أَوْسَاطِ رُؤُوسِهِمْ مِنَ الشَّعْرِ، فَاضْرِبْ مَا فَحَصُوا عَنْهُ بِالسَّيْفِ. وَإِنِّي مُوصِيكَ بِعَشْرٍ: لاَ تَقْتُلَنَّ امْرَأَةً، وَلاَ صَبِيّاً، وَلاَ كَبِيراً هَرِماً، وَلاَ تَقْطَعَنَّ شَجَراً مُثْمِراً، وَلاَ تُخَرِّبَنَّ عَامِراً، وَلاَ تَعْقِرَنَّ شَاةً، وَلاَ بَعِيراً إِلاَّ لِمَأْكَلَةٍ، وَلاَ تَحْرِقَنَّ نَحْلاً، وَلاَ تُغَرِّقَنَّهُ، وَلاَ تَغْلُلْ، وَلاَ تَجْبُنْ. [ط٩٨٢/ هق٩/٨٩].

* فيه انقطاع.

**ژ یەحیایێ كورێ سەعیدی (رحمه الله) گۆت: ئەبوبەكر ئەلسەدیق، لەشكەرەك فرێكرە شامێ، و د گەل زەیدێ كورێ ئەبی سوفیان دەركەفت، و ئەو سەرلەشكەرێ چارێكەكێ بۆ ژ وان چوار پشكان و وان گۆت: یەزیدی گۆتە ئەبی بەكری: یان سویار ببە یان ئەز دێ هێمە خوار، ئینا ئەبوبەكری گۆت: نە تو دهێیە خوارێ و نە ئەز سویار دبم، ئەز پێنگاڤێت خۆ ڤان د رێكا خودێدا دهەژمێرم، پاشی گۆتە وی: ب راستی تو دێ هندەك كەسان بینی دبێژن وان خۆ یا بۆ خودێ ڤالا كری، وان بهێلە و یا وان گۆتی وان خۆ بۆ خودێ یا ڤالا كری، و دێ هندە كەسان بینی نیڤا سەرێ خۆ ژ موی یێ تراشتی، ئەو جهێ تراشتی شیری لێ بدە[1]، و ئەز فەرمانا تە ب دەھ تشتان دكەم: چو ژن و زارۆك و دانعومران نەكوژە، و چو دارێت ب فێقی نەبرە و چو ئاڤاهییا نەهەرفینە، و چو پەزی و حێشترا نەڤەكوژە بۆ خوارنێ نەبیت، و چو مێشان نەكوژە و بەلاڤ نەكە، و خیانەتێ د دەستكەفتیدا نەكە و ترسێ نەهەلگرە.**

## ٢٠ . باب: القائد يتفقد جنده.

## بابەتێ: سەركردە ل سەربازێت خۆ دگەریێت.

٢١١٣ - (م) عَنْ أَبِي بَرْزَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ فِي مَغْزًى لَهُ، فَأَفَاءَ الله عَلَيْهِ، فَقَالَ لأَصْحَابِهِ: (**هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ**)؟ قَالُوا: نَعَمْ، فُلاَناً وَفُلاناً وَفُلاَناً. ثُمَّ قَالَ: (**هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ**)؟ قَالُوا: نَعَمْ، فُلاَناً وَفُلاَناً وَفُلاَناً. ثُمَّ قَال: (**هَلْ تَفْقِدُونَ مِنْ أَحَدٍ**)؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: (**لَكِنِّي أَفْقِدُ جُلَيْبِيباً، فَاطْلُبُوهُ**) . فَطُلِبَ فِي الْقَتْلَى، فَوَجَدُوهُ إِلَى جَنْبِ سَبْعَةٍ قَدْ قَتَلَهُمْ، ثُمَّ قَتَلُوهُ. فَأَتَى النَّبِيُّ (ﷺ)، فَوَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ:

---

(١) ئانكو: وان بكوژە، و ئەو شەماسێت وانن یێت ئەو وان بۆ شەڕی پالددەن و بەرێ وان ددەنە خرابییێ.

(قَتَلَ سَبْعَةً، ثُمَّ قَتَلُوهُ! هذَا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ ، هَذَا مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ) . قَالَ: فَوَضَعَهُ عَلَى سَاعِدَيْهِ، لَيْسَ لَهُ إِلاَّ سَاعِدَا النَّبِيِّ (ﷺ). قَالَ: فَحُفِرَ لَهُ وَوُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَلَمْ يَذْكُرْ غَسْلاً. [م٢٤٧٢].

ژ ئەبی بەرزەیی (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د وەغەرەكا شەڕەكێ خۆدا بوو، خودێ سەركەفتن دایێ، ئینا گۆتە هەڤالێت خۆ: **(ئەرێ ئێك ژ هەوە بەرزەیە)**؟ گۆتن: بەلێ فلان و فلان و فلان، پاشی گۆت: **(ئەرێ ئێك ژ هەوە بەرزەیە)**؟ گۆتن: بەلێ فلان و فلان و فلان، پاشی گۆت: **(ئەرێ ئێك ژ هەوە بەرزەیە)**؟ گۆتن: نەخێر، گۆت: **(بەلێ یا جولەیبیب یێ ل من بەرزەیە، لێ بگەریێن)**، لێ گەریان د ناڤ كوشتییاندا دیت، پێغەمبەر (ﷺ) هات و ل هنداڤ راوەستا، ئینا گۆت: **(حەفت پێت كوشتین پاشی یێ كوشتی، ئەڤە ژ منە و ئەز ژ ویمە[1])**، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دانا سەر دەستێت خۆ: كار بۆ هاتە كرن و دانا د گۆڕێ ویدا و بەحسێ شویشتنێ نەهاتە كرن.

٢١١٤ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَتَخَلَّفُ فِي الْمَسِيرِ، فَيُزْجِي الضَّعِيفَ، وَيُرْدِفُ، وَيَدْعُو لَهُمْ. [د٢٦٣٩].

* صحيح.

ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل چۆنا لەشكەری خۆ ڤەدهێلا، یێ لاواز و یێ دەوار نەی ل پشت خۆ سویار دكر و دوعا بۆ وان دكر.

## ٢١ ـ باب: لا تمنوا لقاء العدو.

## بابەتێ: داخوازا بەرهنگاربوونا دژمنی نەكەن.

٢١١٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا) . [م١٧٤١].

وفي رواية لأحمد: (لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ مَا يَكُونُ فِي ذَلِكَ) .[حم٩١٩٦].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خۆزییا بەرهنگاربوونا دژمنی نەكەن، و هەكە هوین بەرهنگاری ئێك بوون سەبری بكێشن)**.

(١) نانكو: ئەم زێدە ل سەر رێكەكێینە.

**و د ڤەگێرەكا ئەحمەددا: (خۆزییا بەرهنگاربوونا دژمنی نەكەن، چونكی هوین نوزانن دێ چ پشتی هینگێ چێ بیت).**

## ٢٢ . باب: ذم من مات ولم يغز.

**بابەتێ: عەیبدارییا وی كەسێ بمریت و خەزا نەكری.**

٢١١٦ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ، مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ**). [م١٩١٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ بمریت و جیهاد نەكربیت و ئنیەتا جیهادێ نەئینابیت، ئەو ل سەر خسلەتەكا دوروياتییێ مر).**

## ٢٣ . من حبسه العذر عن الغزو

**بابەتێ: بێ دەستوی وی ژ خەزایێ ڤەگریت**

٢١١٧ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) رَجَعَ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَدَنَا مِنَ المدِينَةِ، فَقَالَ: (**إِنَّ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَاماً، ما سِرْتُمْ مَسِيراً، وَلاَ قَطَعْتُمْ وَادِياً إِلاَّ كَانُوا مَعَكُمْ**) ، قَالُوا: يا رَسُولَ الله! وَهُمْ بِالمدِينَةِ؟ قَالَ: (**وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ، حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ**). [خ٤٤٢٣ (٢٨٣٨)].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ژ خەزایا تەبووكێ زڤری، ئینا نێزیكی مەدینەیێ بوو، گۆت: **(ب راستی هندە كەس ل مەدینێ یێت ماین، هوین چو رێكا ناچن و چو نهالا نابڕن، هەكە ئەو (ب ئنیەتێت خۆ) د گەل هەوە نەبن)** گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ و ئەو ل مەدینەیێ؟ گۆت: **(و ئەو ل مەدینەیێ، هەجەتێ (عوزرێ) ئەو یێت ئاسێ كرین).**

## ٢٤ . باب: فضل من جهز غازياً أو خلفه بخير.

**بابەتێ: خێرا وی كەسێ خەزاكەرەكی كار بكەت یان چاڤدانا مالا وی بكەت.**

٢١١٨ - (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ خالِدٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ جَهَّزَ غازِياً فِي سَبِيلِ الله فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غازِياً فِي سَبِيلِ الله بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا**) . [خ٢٨٤٣/ م١٨٩٥].

ژ زەیدێ كورێ خالدی (ڕەزی خودێ لێ بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ كارێ خەزاكەرەكی بكەت، ب راستی وی خەزا كر[1]، و هەر كەسێ ب باشی پاش خەزاكەرەكی د مالا ویدا بمینیت[2] ب راستی وی خەزا كر)[3].**

**٢٥ . باب: فضل النفقة في سبيل الله.**

**بابەتێ: خێرا مەزاختنا د رێكا خودێدا.**

٢١١٩ - (م) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فَقَالَ: هذِهِ فِي سَبِيلِ الله، فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(لَكَ بِهَا، يَوْمَ الْقِيَامَةِ: سَبْعُمِائَةِ نَاقَةٍ، كُلُّهَا مَخْطُومَةٌ)** . [م١٨٩٢].

ژ ئەبی مەسعودێ ئەنساری (ڕەزی خودێ لێ بیت)، گۆت: زەلامەكی حێشترەكا سەرهەفساركری ئینا دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆتێ: ئەڤە بۆ جیهادا د رێكا خودێدا، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(رۆژا قیامەتێ بۆ تە ب ڤێ حەفت سەد حێشتر هەنە هەمی د سەرهەفساركری).**

٢١٢٠ - عَنْ خُرَيْمِ بْنِ فَاتِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللهِ، كُتِبَتْ لَهُ بِسَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ)** . [ت١٦٢٥/ ن٣١٨٦].

* صحيح.

ژ خورەیمێ كورێ فاتكی (ڕەزی خودێ لێ بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ مەزاختنەكێ د رێكا خودێدا بمەزێخیت، بۆ وی حەفت سەد قات دێ هێتە نڤیسین).**

**٢٦ . باب: حرمة نساء المجاهدين.**

**بابەتێ: حورمەتا هەڤژینێت خەزاكەران.**

٢١٢١ - (م) عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ، كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ. وَمَا مِنْ رَجُلٍ مِنَ الْقَاعِدِينَ يَخْلُفُ رَجُلاً مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فِي أَهْلِهِ، فَيَخُونُهُ فِيهِمْ؛ إِلاَّ وُقِفَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَأْخُذُ مِنْ عَمَلِهِ مَا شَاءَ. فَمَا ظَنُّكُمْ)؟** [م١٨٩٧].

---

(١) ئانكو: خێرا دورست یا خەزاكەری بۆ هاتە نڤیسین.

(٢) چاڤێ خۆ شوینا وی بدەتە مال و عەیالێ وی.

(٣) ئانكو: خێرا دورست یا خەزاكەری بۆ هاتە نڤیسین.

ژ بورەیدەی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(حەرامیيا ژنێت خەزاكەران ل سەر روینشتییان وەكی حەرامیيا دایكێت وانە ل سەر وان، زەلامەك نینە ژ روینشتییان پاش خەزاكەرەكی د مالا ویدا بمینیت[1] و خیانەتێ د واندا بكەت، هەكە خودێ رۆژا قیامەتێ بۆ نەراوەستیت، دێ ژ خێرێت وی هندی حەزكەت راكەت هەتا خەزاكەر رازی دبیت، ئەرێ پا هوین چ هزر دكەن)؟**

## ٢٧ . باب: مشاركة النساء في الجهاد.

## بابەتێ: پشكدارییا ژنان د جیهادێدا.

٢١٢٢ - (خ) عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قَالَتْ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) نَسْقِي وَنُدَاوِي الجَرْحَى، وَنَرُدُّ الْقَتْلَى إِلَى المدِينَةِ. [خ٢٨٨٢].

**ژ رەبیعا كچا موعەوزی (رضي الله عنها) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەری بووین (ﷺ) مە ئاڤ ددا وان و بریندار دەرمان دكرن و كوشتی مە دزڤراندنە مەدینەیێ.**

٢١٢٣ - (م) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الأَنْصَارِيَّةِ قَالَتْ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) سَبْعَ غَزَوَاتٍ، أَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ، فَأَصْنَعُ لَهُمُ الطَّعَامَ، وَأُدَاوِي الْجَرْحَى، وَأَقُومُ عَلَى الْمَرْضَى. [م: الجهاد ١٨١٢ (١٤٢)].

**ژ ئوم عەتییە یا ئەنساری (رضي الله عنها) گۆت: مە حەفت خەزا د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كرن، ئەز دمامە ل دەڤ بارێت وان و من خوارن بۆ وان چێ دكر و بریندار دەرمان دكرن و چاڤێ خۆ ددا نەساخان.**

## ٢٨ . باب: فضل الغزو في البحر.

## بابەتێ: خێرا خەزایێ د دەریایێدا.

٢١٢٤ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ فَتُطْعِمُهُ، وَكَانَتْ أُمُّ حَرَامٍ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَأَطْعَمَتْهُ، وَجَعَلَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، فَنَامَ رَسُولُ اللهِ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالتْ: فَقُلْتُ: وَمَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: (**نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ مُلُوكاً عَلَى الأَسِرَّةِ . أَوْ: مِثْلَ المُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ**) شَكَّ إِسْحَاقُ . قالتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَدَعَا لَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ). ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقُلْتُ:

(١) چاڤێ خۆ شوینا وی بدەتە مال و عەیالێ وی.

وَمَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قالَ: (**نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي، عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللهِ**) . كما قالَ في الأَوَّلِ، قالتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: (**أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ**) .فَرَكِبَتِ الْبَحْرَ فِي زَمَانِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ، فَهَلَكَتْ.

[خ٢٧٨٨، ٢٧٨٩/ م١٩١٢].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دچۆ دەڤ ئوم حەرام كچا ملحانی**[1]**، خوارن ددایێ، و ئوم حەرام هەڤژینا عوبادەیێ كوڕێ سامتی بوو، پێغەمبەرێ خودێ چۆ دەڤ خوارن دایێ و دەست هاڤێتێ سەحكرە سەرێ وی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤست، پاشی هشیار بوو و دكرە كەنی، گۆت: من گۆت: ئەو چییە كەنیا تە ئینا ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (هندە مرۆڤێت خەزاكەر ژ ئوممەتا من نیشا من دان شاهن ل سەر تەختان دێ ل سەر پشت و نیڤا ڤێ دەریایێ سویار بن، یان وەكی شاهێت سەر تەختانە). ئیسحاقی گۆمان بۆ دورست بوو، وێ گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دوعا ژ خودێ بكە ئەز ئێك ژ وان بم، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دوعا بۆ كرن، پاشی سەرێ خۆ داناڤە و پاشی رابووڤە و ئەو یێ دكەنیت، ئینا من گۆت: ئەو چییە كەنییێ تە دئینیت ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (خەلكەك ژ ئوممەتا من نیشا من دان خەزاكەرن د رێكا خودێدا) كا جارا ئێكێ چ گۆت ئەو گۆتەڤە، ئینا وێ گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دوعا ژ خودێ بكە ئەز ئێك ژ وان بم، گۆت: (تو ژ یێت ئێكێیی). و ل سەر دەمێ موعاویەیێ كوڕێ سوفیانی ل دەریایێ سویار بوو و دەمێ ژ دەریایێ دەركەفتی د دەوارێ خۆدا كەفت و مر.**

**٢٩ ـ باب: ما جاء في قتال الروم والفرس.**

**بابەتێ: تشتێ د راستا شەڕێ رۆمێ و فورسێدا هاتی.**

٢١٢٥ - (خ) عَنْ عُمَيْرِ بْنِ الأَسْوَدِ الْعَنْسِيِّ: أَنَّهُ أَتَى عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ، وَهُوَ نَازِلٌ فِي سَاحَةِ حِمْصَ، وَهُوَ فِي بِنَاءٍ لَهُ، وَمَعَهُ أُمُّ حَرَامٍ. قَالَ عُمَيْرٌ: فَحَدَّثَتْنَا أُمُّ حَرَامٍ: أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ الْبَحْرَ قَدْ أَوْجَبُوا**) . قَالَتْ أُمُّ حَرَامٍ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَنَا فِيهِمْ؟ قَالَ:

---

(١) نوم حەرام د بۆچۆنا دورستتدا ژ گۆتنێت زانایان مەحرەما پێغەمبەری بوو (ﷺ) و دبوو خالەتا وی یا شیری.

(أَنْتِ فِيهِمْ) . ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (أَوَّلُ جَيْشٍ مِنْ أُمَّتِي يَغْزُونَ مَدِينَةَ قَيْصَرَ، مَغْفُورٌ لَهُمْ) ، فَقُلْتُ: أَنَا فِيهِمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (لَا) .                [خ٢٩٢٤ (٢٧٨٩)]

**ژ عومەیرێ كورێ ئەسوەدێ عەنسی: ئەو هاتە دەڤ عوبادەیێ كورێ سامتی و ئەو هاتبوو مەیدانا حمسێ د ئاڤاهییەكێ خۆدا بوو، و ئوم حەرام ژی د گەل بوو، عومەیری گۆت: ئوم حەرام بۆ مە ئاخفت، گۆت: وێ گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (لەشكەرێ ئێكێ ژ ئوممەتا من خەزایێ د دەریایێدا دكەن ب بەحەشت بۆ وان واجب بوو)[1]، ئوم حەرامێ گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز ژ وانم؟ گۆت: (تو ژ وانی) پاشی پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (لەشكەرێ ئێكێ ژ ئوممەتا من خەزا باژێرێ قەیسەری بكەت[2] گونەهێت وان د ژێبرینە)، ئینا من گۆت: ئەز ژ وانم ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (نەخێر).**

## ٣٠ ـ باب: النهي عن قتل النساء والصبيان.

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ كوشتنا ژن و بچویكان.

٢١٢٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: وُجِدَتِ امْرَأَةٌ مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَنَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ.        [خ٣٠١٥ (٣٠١٤)/ م١٧٤٤].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: د هندە خەزایێت پێغەمبەرێ خودێدا (ﷺ) من ژنەكا كوشتی دیت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان ژ كوشتنا ژن و بچویكان كر.**

## ٣١ ـ باب: قتل النساء والصبيان من غير قصد

## بابەتێ: كوشتنا ژن و بچویكان بێ مەبەست.

٢١٢٧ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ رضي الله عنهم قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِالأَبْوَاءِ ـ أَوْ بِوَدَّانَ ـ وَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنَ المشْرِكِينَ، فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ، قَالَ: (هُمْ مِنْهُمْ).        [خ٣٠١٢، ٣٠١٣/ م١٧٤٥].

---

(١) ئانكو: وان كارەك كر بەحەشت بۆ وان مسۆگەر ببیت.

(٢) مەبەست قوستەنتینییە، و ڤێ گاڤێ دبێژنێ ئستەنبوول.

وفي رواية لمسلم: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قِيلَ لَهُ: لَوْ أَنَّ خَيْلاً أَغَارَتْ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَصَابَتْ مِنْ أَبْنَاءِ الْمُشْرِكِينَ؟ قَالَ: (هُمْ مِنْ آبَائِهِمْ) .

**ژ ئیبن عەباسی ژ سەعبێ كورێ جەسامەیی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ل ئەبوائێ یان ل وەددانێ[1] د بەر منرا بۆری، پرسیارا سەرداگرتنا ب شەڤ ل سەر خەلكێ جهێ دژمن لێ بهێتەكرن ژ هەڤپشكچێكەران و ژنێت وان و دویندەها وان بەر بكەڤن، گۆت: (ئەو ژ وانن).**

**و د ڤەگێرا موسلمیدا: بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە گۆتن: ئەگەر ب شەڤ سویارچاك سەرداگرنێ بكەن و هندەك ژ زارۆكێت هەڤپشكچێكەران ب بەر بكەڤن؟ گۆت: (ئەو ژ بابێت خۆنە).**

## ٣٢ ـ باب: الرجل يقتل الآخر ويدخلان الجنة.

## بابەتێ: زەلام زەلامی بكوژیت و هەردو بچنە بەحەشتێ.

٢١٢٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (يَضْحَكُ اللهُ إِلَى رَجُلَيْنِ، يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ، يَدْخُلاَنِ الْجَنَّةَ: يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللهِ فَيُقْتَلُ، ثُمَّ يَتُوبُ اللهُ عَلَى الْقَاتِلِ، فَيُسْتَشْهَدُ) [خ٢٨٢٦/م١٨٩٠].

**ژ ئەبی هورەیرە، (رضي الله عنه)، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (خودێ ب دو زەلامان دكەتە كەنی[2]، ئێك یێ دی دكوژیت، و هەردو دچنە بەحەشتێ، ئەڤە بۆ خودێ دێ شەرێ كەت دێ هێتە كوشتن، پاشی خودێ دێ تەوبێ دەتە سەر كوژەكی دێ موسلمان بیت و دێ شەهید بیت).**

## ٣٣ ـ باب: عمل قليلاً وأُجِرَ كثيراً.

## بابەتێ: یێ كارەكێ كێم بكەت و خێرەكا مەزن بگەهیتێ.

٢١٢٩ - (خ) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ مُقَنَّعٌ بِالْحَدِيدِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُقَاتِلُ وَأُسْلِمُ؟ قَالَ: (أَسْلِمْ ثُمَّ قَاتِلْ) . فَأَسْلَمَ ثُمَّ قَاتَلَ فَقُتِلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (عَمِلَ قَلِيلاً وَأُجِرَ كَثِيراً). [خ٢٨٠٨].

---

(١) دو جهن دكەڤنە د ناڤبەرا مەكەهێ و مەدینەییدا و د ناڤبەرا واندا هەشت میلن.

(٢) نانكو: خودێ ژ دو مرۆڤان یێ رازییە.

ژ بەرائی (ﷺ) گۆت: زەلامەكێ زریكومزری هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) **گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ شەڕی بكەم یان موسلمان ببم؟ گۆت: (موسلمان ببە پاشی شەڕی بكە)، ئینا موسلمان بوو، پاشی شەڕ كر و هاتە كوشتن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كێم كر و گەلەك خێر گەهشتێ).**

٣٤ ـ باب: التسبيح والتكبير أثناء السير.

**بابەتێ: تەسبیح و تەكبیر د گەل چۆنێ.**

٢١٣٠ – (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا غَزَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) خَيْبَرَ . أَوْ قَالَ: لَمَّا تَوَجَّهَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) . أَشْرَفَ النَّاسُ عَلَى وَادٍ، فَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّكْبِيرِ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، إِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِباً، إِنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعاً قَرِيباً، وَهُوَ مَعَكُمْ**) . وَأَنَا خَلْفَ دَابَّةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَسَمِعَنِي وَأَنَا أَقُولُ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، فَقَالَ لِي: (**يَا عَبْدَ اللهِ بْنَ قَيْسٍ**) ، قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ مِنْ كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الجَنَّةِ**)؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي! قَالَ: (**لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ**).
[خ٤٢٠٥ (٢٩٩٢)/ م٢٧٠٤].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (ﷺ)، گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەزایا خەیبەرێ كری، یان گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرێ خۆ دایە خەیبەرێ، خەلك گەهشتنە هنداڤی نهالەكێ، ئینا دەنگێ خۆ ب (الله أكبر) بلند كرن:** الله اكبر الله اكبر لا إله إلا الله، **ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دلۆڤانییێ ب خۆ ببەن، هوین نە گازی ئێكێ كەڕ دكەن و نە ئێكێ نەیێ بەرهەڤ، ب راستی ئەو یێ گوهدێر و نێزیكە و ئەو یێ د گەل هەوە). و ئەز ل پشت دەوارێ پێغەمبەرێ خودێ بووم (ﷺ)، گوھ ل من بوو و ئەز یێ دبێژم** (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ) **ئینا گۆتە من: (ئەی عەبدوللایێ كوڕێ قەیسی) من گۆت: لەبێ پاشی لەبێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (ئەز خزینەكێ ژ خزینێت بەحەشتێ نیشا تە نەدەم)؟ من گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ دایك و بابێت من گۆری تە بن، گۆت: (**لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ**) چو بزاڤ و شیان و چو هێز نینن ب خودێ نەبن).**

## ٣٥ . باب: نصرت بالرعب.

**بابەتێ: ئەز ب ترسێ هاتمە سەرئێخستن.**

٢١٣١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**بُعِثْتُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، فَبَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الأَرْضِ فَوُضِعَتْ فِي يَدِي**) . قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَقَدْ ذَهَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأَنْتُمْ تَنْتَثِلُونَهَا. [خ٢٩٧٧/ م٥٢٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب پەیڤێت كورتێت پڕ رامان یێ هاتیمە هنارتن، و ئەز ب ترسێ هاتیمە سەرئێخستن، و د دەمەكیدا ئەز یێ نڤستی بووم كلیلێت خزینەیێت عەردی بۆ من ئینان و كرنە د دەستێت مندا). ئەبو هورەیرە گۆت: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ و ئەوا تێدا هوین دەردئێخن.**

## ٣٦ . باب: هل تنصرون إلا بضعفائكم.

**بابەتێ: هوین سەرناكەڤن ب بێ چارە و بەلنگازێت خۆ نەبن.**

٢١٣٢ - (خ) عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: رَأَى سَعْدٌ رضي الله عنه أَنَّ لَهُ فَضْلاً عَلَى مَنْ دُونَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إِلاَّ بِضُعَفَائِكُمْ**) . [خ٢٨٩٦].

**ژ موسعەبێ كوڕێ سەعدێ كوڕێ وەققاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: سەعدی دیت وی قەدرەك ل سەر یێت بن خۆدا یێ هەی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گۆت: (ما هوین ب چ سەر دكەڤن و ب رزق دكەڤن ب بێ چارە و بەلنگازێت خۆ نەبن).**

٢١٣٣ - عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**ابْغُونِي الضُّعَفَاءَ، فَإِنَّمَا تُرْزَقُونَ وَتُنْصَرُونَ بِضُعَفَائِكُمْ**). [د٢٥٩٤/ ت١٧٠٢/ ن٣١٧٩].

* صحيح.

**ژ ئەبی دەردائی (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) گۆت: (نێزیكیا من ب نێزیكبوونا خۆ ژ بێچارە و هەژاران بخوازن، ب راستی هوین ب بێچارە و هەژارێت خۆ ب سەر دكەڤن و ب رزق دكەڤن)[1].**

---

(١) ئانكو: ب بەرەكەتا دوعایێت وان.

## ٣٧ ـ باب: الحرب خدعة

## بابەتێ: شەڕ خاپەكرنە

٢١٣٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمَّى النَّبِيُّ (ﷺ) الحَرْبَ خَدْعَةً.[خ٣٠٢٨، ٣٠٢٩/م١٧٤٠].

ولفظ مسلم: قال (ﷺ): (الْحَرْبُ خُدْعَةٌ).

**ژ ئەبی هورەیرە (ڕەزی خودێ لێ بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) شەڕ ب خاپاندنێ ناڤ كرییە.**

**و دبێژەیا موسلمیدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (شەڕ خاپەكرنە).**

## ٣٨ ـ باب: لا تعذبوا بعذاب الله.

## بابەتێ: ب ئیزایا خودێ ئیزا نەدەن.

٢١٣٥ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي بَعْثٍ، فَقَالَ: **(إِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَناً وَفُلاَناً، فَأَحْرِقُوهُما بِالنَّارِ)** . ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِينَ أَرَدْنَا الخُرُوجَ: **(إِنِّي كُنْتُ أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحْرِقُوا فُلاَناً وَفُلاَناً، وَإِنَّ النَّارَ لاَ يُعَذِّبُ بِهَا إِلاَّ اللهُ، فَإِنْ وَجَدْتُمُوهُما فَاقْتُلُوهُمَا)**.

[خ٣٠١٦ (٢٩٥٤)].

**ژ ئەبی هورەیرە (ڕەزی خودێ لێ بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەم هنارتنەكێ هنارتین و گۆت: (هەكە هەوە فلان و بێڤان دیتن، ناڤێ دو زەلامێت قورەیشییان ئینا، ب ئاگری بسۆژن). پاشی دەمێ مە ڤیای دەركەڤین پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب ڕاستی من ئەمرێ هەوە كربو فلانی و بێڤانی بسۆژن، و ب ڕاستی كەس كەسێ ب ئاگری ئیزا نادەت خودێ نەبیت، هەكە هەوە دیتن بكوژن).**

## ٣٩ ـ باب: استقبال الغزاة.

## بابەتێ: پێشوازییا خەزاكەران.

٢١٣٦ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ تُلُقِّيَ بِصِبْيَانِ أَهْلِ بَيْتِهِ. قَالَ: وَإِنَّهُ قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ فَسُبِقَ بِي إِلَيْهِ، فَحَمَلَنِي بَيْنَ يَدَيْهِ، ثُمَّ جِيءَ بِأَحَدِ ابْنَيْ فَاطِمَةَ، فَأَرْدَفَهُ خَلْفَهُ. قَالَ: فَأُدْخِلْنَا الْمَدِينَةَ، ثَلاَثَةً عَلَى دَابَّةٍ. [م٢٤٢٨].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ جەعفەری (خودێ ژ وان ڕازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ژ وەغەرەكێ زڤریبا ژ لایێ زارۆكێت خەلكێ مالا خۆ دهاتە پێشوازیكرن، گۆت: و ئەو ژ وەغەرەكێ زڤری ئەز بەراهیكێ برمە دەڤ وی و ئەز ل بەر سینگێ خۆ**

**سویارکرم، پاشی ئێك ژ كورێت فاتمایێ بۆ ئینا، و ئەو ل پشت خۆ سویار كر، گۆت: ئەم چۆینە ناڤ مەدینەیێ سێ ل سەر دەوارەكی.**

٤٠ ـ باب: الجهاد بالكلمة وجهاد النفس.

**بابەتێ: جیهاد ب پەیڤێ و جهاد ب جانی.**

٢١٣٧ - عَنْ أَنَسِ بنِ مالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ، وَأَنْفُسِكُمْ، وَأَلْسِنَتِكُمْ**). [د٢٥٠٤/ ن٣٠٩٦/ مي٢٤٧٥]

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب مالێ خۆ و ب خۆ و ب ئەزمانێت خۆ جیهادێ د گەل هەڤپشكچێكەران بكەن).**

٢١٣٨ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الْجِهَادِ: كَلِمَةَ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ**). [د٤٣٤٤/ ت٢١٧٤/ جه٤٠١١].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ)، ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (باشترین جیهاد: ئاخفتنا عادل و راستە ل دەڤ حوكمدارەكێ زالم و زۆردار).**

٢١٣٩ - عَن عَبْد الرَّحْمَنِ بْن عَبْدِ اللهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ حِينَ أَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي الشِّعْرِ مَا أَنْزَلَ، أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: إِنَّ اللهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَدْ أَنْزَلَ فِي الشِّعْرِ مَا قَدْ عَلِمْتَ، وَكَيْفَ تَرَى فِيهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنَّ الْمُؤْمِنَ يُجَاهِدُ بِسَيْفِهِ وَلِسَانِهِ**) . [حم١٥٧٨٥].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ عەبدوللایێ كورێ كەعبێ مالكی (ﷺ): دەمێ خودایێ پاك و بلند ئەوا دەربارەی هۆزانێ ئینایە خوار، هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: ب راستی خودایێ پاك و بلند ئەو د راستا هۆزانێدا ئینا خوار یا تو دزانی، تو چ تێدا دبینی؟ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی باوەریدار جیهادێ ب شیرێ خۆ و ب ئەزمانێ خۆ دكەت).**

٢١٤٠ - عَنْ فُضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ**).[ت١٦٢١].

* صحيح.

ژ فوزالەیێ كوڕێ عوبەیدی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(جیهادكەر ئەوە یێ جیهادێ د گەل خۆ بكەت).**

## ٤١ ـ باب: الجهاد في وقت الشدة.

## بابەتێ: جیهاد د دەمێ تەنگافییێدا.

٢١٤١ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ أَرَادَ أَنْ يَغْزُوَ فَقَالَ: **(يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ، إِنَّ مِنْ إِخْوَانِكُمْ قَوْماً لَيْسَ لَهُمْ مَالٌ وَلاَ عَشِيرَةٌ، فَلْيَضُمَّ أَحَدُكُمْ إِلَيْهِ الرَّجُلَيْنِ أَوْ الثَّلاَثَةِ)**. فَمَا لِأَحَدِنَا مِنْ ظَهْرٍ يَحْمِلُهُ إِلاَّ عُقْبَةٌ كَعُقْبَةِ ـ يَعْنِي: أَحَدِهِمْ ـ قَالَ: فَضَمَمْتُ إِلَيَّ اثْنَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً، قَالَ: مَا لِي إِلاَّ عُقْبَةٌ كَعُقْبَةِ أَحَدِهِمْ مِنْ جَمَلِي. [د٢٥٣٤].

* صحيح.

ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەدگێریت وی دڤیا بچیتە خەزایێ، ئینا گۆت: **(گەلی مشەخت و پشتەڤانان (ئەنساران) ب راستی ژ برایێت هەوە هندەكێت هەین، نە مال هەیە و نە عەشیرەت، بلا هەر ئێك ژ هەوە دووا یان سێیا د گەل خۆ ببەت)**، ڤێجا هەر كەسێ ژ مە دەوار هەی وی ژی گەڕا سویاربوونێ هەبوو وەكی ئێكی ژ وان گەڕا سویاربوونێ هەی، گۆت: ئینا من دو یان سێ ئینانە د گەل خۆ، و گۆت: ئەز ژی ب گەر وەكی ئێك ژ وان ل حێشترا خۆ سویار دبووم.

## ٤٢ ـ باب: الدعاء قبل اللقاء.

## بابەتێ: دوعاكرن بەری رویبەروبوونێ.

٢١٤٢ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا غَزَا قَالَ: **(اللَّهُمَّ أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيرِي، بِكَ أَحُولُ، وَبِكَ أَصُولُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ)** . [د٢٦٣٢/ ت٣٥٨٤].

* صحيح.

ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ خەزا دكر دگۆت: **(یا خودێ تویی جهێ پشتراستییا من، و تویی هاریكارێ من و ب تە ئەز دهێم و دچم، و ب تە ئەز ب سەر دژمنیدا دگرم، و ب تە ئەز شەڕی دكەم).**

٢١٤٣ – عَنْ صُهَيْبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَدْعُو أَيَّامَ حُنَيْنٍ: **(اللَّهُمَّ بِكَ أُحَاوِلُ، وَبِكَ أُصَاوِلُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ)** . [مي٢٤٨٥].

* صحيح.

**ژ سوهەیبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا حونەینێ ئەڤ دوعایە دکر: (ئەی خودا ب تە ئەز بەرهنگاربوونێ دکەم و دژمنان پاشڤە دبەم، و ب تە ئەز دهێم و دچم، و ب تە ئەز ب سەر دژمنیدا دگرم، و ب تە ئەز شەڕی دکەم).**

## ٤٣ ـ باب: ما يجد الشهيد من الألم.

### بابەتێ: ئەو ئێشانا شەهید هەست پێ دکەت.

٢١٤٤ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ مِنْ مَسِّ الْقَتْلِ؛ إِلاَّ كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمْ مِنْ مَسِّ الْقَرْصَةِ**). [ت١٦٦٨/ ن٣١٦١/ جه٢٨٠٢/ مي٢٤٥٢].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (شەهید هەست ب ئێشانا کوشتنێ ناکەت وەسا نەبیت وەکی ئێك ژ هەوە هەست ب ئێشانا ڤورنجیکێ دکەت).**

## ٤٤ ـ باب: في الرايات والألوية والشعار.

### بابەتێ: ئالا و نیشان و درویشمان.

٢١٤٥ – عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ: أنه سئل عَنْ رَايَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَا كَانَتْ؟ فَقَالَ: كَانَتْ سَوْدَاءَ مُرَبَّعَةً مِنْ نَمِرَةٍ. [د٢٥٩١/ ت١٦٨٠].

* صحيح.

**ژ بەرائێ کوڕێ عازبی (رضي الله عنه)، پرسیار ژ ئالایێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ وی هاتە کرن یێ چاوا بوو؟ ئینا گۆت: یێ رەش و چارگۆشە و خەت خەت بوو، ژ هریێ بوو[1].**

٢١٤٦ – عَنْ جَابِرٍ يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ لِوَاؤُهُ يَوْمَ دَخَلَ مَكَّةَ أَبْيَضَ.

[د٢٥٩٢/ ت١٦٧٩/ ن٢٨٦٦/ جه٢٨١٧]

* صحيح.

**ژ جابری (رضي الله عنه) دگەهینیتە پێغەمبەری (ﷺ): ئالایێ وی رۆژا هاتییە د مەکەهێدا یێ سپی بوو.**

٢١٤٧ – عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه زَمَنَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَكَانَ شِعَارُنَا: أَمِتْ، أَمِتْ. [د٢٥٩٦/ جه٢٨٤٠].

---

(١) رستەیا (من نمرة): دیارە دکەت رەشێ تاری نەبوو، بەلکی وەکی رەنگێ پلنگییە رەش و سپی بوو.

* حسن.

ژ سەلەمێ کورێ ئەکوەعی (ﷺ) گۆت: مە خەزا د گەل ئەبی بەکری (ﷺ) ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) کر و درویشمێ مە ئەڤە بوو: بمرە بمرە[1].

٢١٤٨ - عَنِ الْمُهَلَّبِ بْنِ أَبِي صُفْرَةَ: قَالَ أَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنْ بُيِّتُّمْ فَلْيَكُنْ شِعَارُكُمْ: حم لاَ يُنْصَرُونَ**). [د٢٥٩٧/ ت١٦٨٢].

* صحيح.

ژ موهەللەبێ کورێ ئەبی سوفرەیی (ﷺ) گۆت: ئێکێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) گوھ لێ بوویی گۆتە من: (**ئەگەر دژمنی ب شەڤ هێرش کرە هەوە بلا درویشمێ هەوە (حم لا ینصرون) حامیم ئەو سەرناکەڤن[2]**).

## ٤٥ . باب: تنظيم المعسكر وفضل الحراسة.

## بابەتێ: ڕێکێخستنا سەربازگەهێ و خێرا زێرەڤانییێ.

٢١٤٩ - عَن أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ قَالَ: كَانَ النَّاسُ إِذَا نَزَلُوا مَنْزِلاً . قَالَ عَمْرٌو: كَانَ النَّاسُ إِذَا نَزَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مَنْزِلاً . تَفَرَّقُوا فِي الشِّعَابِ وَالْأَوْدِيَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ تَفَرُّقَكُمْ فِي هَذِهِ الشِّعَابِ وَالْأَوْدِيَةِ، إِنَّمَا ذَلِكُمْ مِنَ الشَّيْطَانِ**). فَلَمْ يَنْزِلْ بَعْدَ ذَلِكَ مَنْزِلاً؛ إِلاَّ انْضَمَّ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، حَتَّى يُقَالَ: لَوْ بُسِطَ عَلَيْهِمْ ثَوْبٌ لَعَمَّهُمْ. [د٢٦٢٨]

* صحيح.

ژ بابێ سەعلەبەیێ خوشەنی (ﷺ) گۆت: ئەگەر خەلك ل جهەکی مابانە. عەمری گۆت: ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مابا ل جهەکی خەلەك ل وان شیف و نهالان بەلاڤ دبوون، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**ب ڕاستی بەلاڤبوونا هەوە د ڤان شیف و نهالاندا، ئەڤە ژ کارێت شەیتانییە**)، و پشتی ڤێ ئەو ل جهەکی نەمایە ئەگەر هندەکان خۆ نەدابا د گەل هندەکێت دی، هەتا دهاتە گۆتن: ئەگەر جلکەك ب سەر وان دادابا دا هەمیان گریت.

---

(١) نەڤە پەیڤا نهێنی بوو، چونکی شەڕ د دەمێ شەڤێدا بوو و دا نێکدو بنیاسن و ڕامانا (امت): بۆ خودێ بمرە.

(٢) ئانکو: ژ بەر قەدر و بهایێ وان سۆرەتێت ب حامیم دەست پێ دکەن ئەو سەرناکەڤن.

٢١٥٠ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**عَيْنَانِ لاَ تَمَسُّهُمَا النَّارُ: عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ، وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ اللهِ**) . [ت١٦٣٩].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (دو چاڤان ئاگر ناسۆژت: چاڤەك ژ ترسێت خودێدا كربیتە گری، و چاڤەك ب شەڤ مابیت زێرەڤانی د رێكا خودێدا كربیت).**

٢١٥١ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ النبي (ﷺ) قَالَ: (**أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِلَيْلَةٍ أَفْضَلَ مِنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، حَارِسٌ حَرَسَ فِي أَرْضِ خَوْفٍ، لَعَلَّهُ أَنْ لاَ يَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهِ**). [ك٢٤٢٤/هق١٤٩/٩]

* قال الذهبي: على شرط البخاري.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز بۆ هەوە شەڤەكا ژ شەڤا (ليلة القدر) ب خێرتر نەبێژم، زێرەڤانەك زێرەڤانییێ د عەردەكێ ب ترسدا بكەت و دبیت ئەو نەزڤریتەڤە ناڤ مالا خۆ).**

## ٤٦ . باب: في الرسل.

## بابەتێ: هنارتییان.

٢١٥٢ - عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُعَيْمِ بْنِ مَسْعُودٍ الْأَشْجَعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ نُعَيْمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ لَهُمَا حِينَ قَرَأَ كِتَابَ مُسَيْلِمَةَ: (**مَا تَقُولاَنِ أَنْتُمَا**) ؟ قَالاَ: نَقُولُ كَمَا قَالَ، قَالَ: (**أَمَا وَاللهِ، لَوْلاَ أَنَّ الرُّسُلَ لاَ تُقْتَلُ، لَضَرَبْتُ أَعْنَاقَكُمَا**). [د٢٧٦١].

* صحيح.

**ژ سەلەمەیێ كورێ نوعەیمێ ئەشجەعی (رضي الله عنه) ژ بابێ خۆ نوعەیمی گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دەمێ نامەیا موسەیلەمەیی خواندی دگۆتە وان: (هوین هەردو چ دبێژن)؟ گۆتن: ئەم وێ دبێژین یا ئەو دبێژیت: گۆت: (ئەز ب خودێ كەمە ئەگەر ژ بەر هندێ نەبایە هنارتی ناهێنە كوشتن دا ل ستۆیێ هەوە دەم).**

## ٤٧ . باب: في الخيلاء في الحرب.

## بابەتێ: خۆشاهیكرن د شەرِیدا.

٢١٥٣ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: **(مِنَ الْغَيْرَةِ مَا يُحِبُّ اللهُ، وَمِنْهَا مَا يُبْغِضُ اللهُ، فَأَمَّا الَّتِي يُحِبُّهَا اللهُ: فَالْغَيْرَةُ فِي الرِّيبَةِ، وَأَمَّا الْغَيْرَةُ الَّتِي يُبْغِضُهَا اللهُ: فَالْغَيْرَةُ فِي غَيْرِ رِيبَةٍ. وَإِنَّ مِنَ الْخُيَلاَءِ مَا يُبْغِضُ اللهُ، وَمِنْهَا مَا يُحِبُّ اللهُ، فَأَمَّا الْخُيَلاَءُ الَّتِي يُحِبُّ اللهُ: فَاخْتِيَالُ الرَّجُلِ نَفْسَهُ عِنْدَ الْقِتَالِ، وَاخْتِيَالُهُ عِنْدَ الصَّدَقَةِ، وَأَمَّا الَّتِي يُبْغِضُ اللهُ: فَاخْتِيَالُهُ فِي الْبَغْيِ)** . قَالَ مُوسَى: **(وَالْفَخْرِ)** . [د٢٦٥٩/ ن٢٥٥٧/ مي٢٢٧٢].

* حسن.

ژ جابرێ كورێ عەتیكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: **(هندە غیرەت یا هەیی خودێ حەژێ دكەت و هندەك ژێ خودێ نەڤێت، ئەوا خودێ حەژێ دكەت غیرەتا د گۆمانێدایە، بەلێ ئەو غیرەتا خودێ حەژێ نەكەت، غیرەتا بێ گۆمانە، و هندەك ژ خۆشاهیبوونێ یا هەی خودێ حەژێ دكەت، و هندەك ژ خۆشاهیبوونێ یا هەی خودێ نەڤێت، ئەو خۆشاهیبوونا خودێ حەژێ دكەت خۆشاهیبوونا زەلامییە ب خۆ د جیهادێدا و خۆشاهیبوونا وییە د دانا سەدەقێدا، و ئەوا خودێ نەڤێت خۆشاهیبوونا وییە د زۆرداریییێدا)**. مووسا دبێژیت: ئەو، ئانكو: (خیلاء) خۆشاهیبوونە.

## ٤٨ . باب: الإقامة في بلاد الكفار.

## بابەتێ: ئاكنجیبوونێ ل وەلاتێ گاوران.

٢١٥٤ - عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَنا بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُشْرِكِينَ)** ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لِمَ؟ قَالَ: **(لا تَرَاءَى نَارَاهُما)** . [د٢٦٤٥/ ت١٦٠٤].

* صحيح.

ژ جەریرێ كورێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز بێ بەریمە ژ ـ خوین و هاریكرنا ـ هەر موسلمانەكێ د ناڤ هەڤپشكچێكەراندا ئاكنجی ببیت)**[1] گۆت: بۆچی ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: **(ئاگرێ وان ئێكدو نەبینن)**[1].

---

(١) نەڤ فەرمووده هندە زانایان لاواز و مورسەل دانایە وەكی بوخاری و رازی، و ئەگەر یا دوورست بیت ژی سەرهاتییا خۆ یا هەی، ئەو ژی وی دەمی هەر كەسێ موسلمان ببا ل سەر وی واجب بوو ئەو مشەخت ببیت و د ناڤ گاوراندا نەمینیت، و نەڤرۆ مشەختبوون

## ٤٩ . باب: تداعي الأمم على المسلمين.

**بابەتێ: ملەت خۆ ل سەر موسلمانان بكەنە ئێك.**

٢١٥٥ - عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يُوشِكُ الْأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ، كَمَا تَدَاعَى الْأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا**) . فَقَالَ قَائِلٌ: وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: (**بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ، وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ، وَلَيَنْزِعَنَّ اللهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ، وَلَيَقْذِفَنَّ اللهُ فِي قُلُوبِكُمُ الْوَهْنَ**) ، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَمَا الْوَهْنُ؟ قَالَ: (**حُبُّ الدُّنْيَا، وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ**) . [د٤٢٩٧].

* صحيح.

**ژ سەوبانی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نێزیكە ملەت ل هەوە لێك كۆم ببن، كا چاوا خۆرە ل سەر سێنییا خوارنا خۆ لێك كۆم دبن)، ئێكی گۆت: ئەم وێ رۆژێ هندی د كێمین؟ گۆت: (نەخێر، بەلكی وێ رۆژێ هوین گەلەكن، بەلێ هوین قرشن وەكی قرشێ ل سەر جۆكێ، و خودێ ترسا ژ هەوە دێ ژ دلێ نەیارێت هەوە دەرئێخیت، و خودێ دێ لاوازییێ هاڤێژیتە د ناڤ دلێت هەوەدا)، ئێكی گۆت: لاوازی چ تشتە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (حەژێكرنا دنیایێ و نەڤیانا مرنێ).**

## ٥٠ . باب: الجهاد ماض.

**بابەتێ: جیهاد یا بەردەوامە.**

٢١٥٦ - عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُفَيْلٍ الْكِنْدِيِّ قَالَ: كُنْتُ جَالِساً عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَذَالَ النَّاسُ الْخَيْلَ، وَوَضَعُوا السِّلاَحَ، وَقَالُوا: لاَ جِهَادَ، قَدْ وَضَعَتِ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا! فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِوَجْهِهِ وَقَالَ: (**كَذَبُوا، الْآنَ الْآنَ جَاءَ الْقِتَالُ، وَلاَ يَزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ، وَيُزِيغُ اللهُ لَهُمْ قُلُوبَ أَقْوَامٍ، وَيَرْزُقُهُمْ مِنْهُمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، وَحَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللهِ، وَالْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَهُوَ يُوحَى إِلَيَّ أَنِّي مَقْبُوضٌ، غَيْرَ مُلَبَّثٍ، وَأَنْتُمْ تَتَّبِعُونِي أَفْنَاداً ، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، وَعُقْرُ دَارِ الْمُؤْمِنِينَ الشَّامُ**) . [ن٣٥٦٣].

* صحيح.

---

وەك واجب نەمایە، و د گەل هندێ ژی ئیبن حەجەر و هەیتەمی دبێژن: نەڤە بۆ وییە یێ نەشێت دینێ خۆ د ناڤ واندا ئاشكرا بكەت، و دینێ خۆ د ناڤ واندا بپارێزیت.

(١) ئانكو: هند نێزیكی ئێك نەبن ناگرێ ئێك و دو ببینن، چونكی ئەگەر ئەو هند نێزیكی ئێك بن ژێك ناهێنە نیاسین.

ژ سەلەمەیێ كورێ نوفەیلێ كندی (ﷺ) گۆت: ئەز ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ روینشتی بووم، ئینا زەلامەكی گۆت: خەلكی هەسپ بێبهاكرن و چەك دانان و گۆتن: جیهاد نەما، و شەڕ ب دویماهی هات، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرێ خۆ دایێ، گۆت: **(درەو كرن، نوكە نوكە جیهاد یا هاتی، و بەردەوام د ئوممەتا مندا هندەك دێ هەبن ل سەر حەقییێ جیهادێ بكەن و خودێ دێ بەرێ دلێ خەلكی ددەتە وان، و دێ رزقێ وان ژ وان دەت هەتا رۆژا قیامەتێ دهێت، و هەتا ژڤانێ خودێ دهێت و بەرەكەتا د هەسپێ جیهادێدا هەتا رۆژا قیامەتێ، و وەحی یا بۆ من هاتی ئەز دێ مرم و د ناڤ هەوەدا نامینم بۆ هەر و هەر، و هوین ژی كۆمێت جودا جودا دێ د دویڤ مندا هێن، و هندەك ژ هەوە دێ ل ستۆیێ هندەكێت دی دەن[1]، و بنگەهێ باوەریدار تێدا ئێمن ببن شامە).**



(١) شەڕێ نێكدو بكەن و فتنە دێ د ناڤ هەوەدا زێدە بن.

## الفصل الثاني: احكام الغنائم

## پشكا دووێ: فەرمانێت دەستكەفتان.

### ١ ـ باب: حل الغنائم.

### بابەتێ: حەلالییا دەستكەفتان.

٢١٥٧ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ اللهَ فَضَّلَنِي عَلَى الْأَنْبِيَاءِ . أَوْ قَالَ: أُمَّتِي عَلَى الْأُمَمِ . وَأَحَلَّ لَنَا الْغَنَائِمَ). [ت١٥٥٣].

* صحيح.

[وانظر: ١٠٦٦، ٢١٣١، ٣٧٧٩].

**ژ ئەبی ئومامە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ ئەز ب سەر پێغەمبەران ئێخستم، یان گۆت: ئوممەتا من ب سەر ئوممەتان ئێخست، و دەستكەفت بۆ مە دورست كرن)[1].**

### ٢ ـ باب: ثواب من غزا فغنم.

### بابەتێ: خێرا وی یێ خەزایێ دكەت و دگەهیتە دەستكەفتی.

٢١٥٨ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فَتَغْنَمُ وَتَسْلَمُ؛ إِلاَّ كَانُوا قَدْ تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أُجُورِهِمْ. وَمَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تَخْفِقُ وَتُصَابُ؛ إِلاَّ تَمَّ أُجُورُهُمْ) .

- وفي رواية قَالَ: (مَا مِنْ غَازِيَةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللهِ فَيُصِيبُونَ الْغَنِيمَةَ؛ إِلاَّ تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أَجْرِهِمْ مِنَ الآخِرَةِ، وَيَبْقَى لَهُمُ الثُّلُثُ. وَإِنْ لَمْ يُصِيبُوا غَنِيمَةً تَمَّ لَهُمْ أَجْرُهُمْ) . [م١٩٠٦].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە هندە خەزاكەر یان سریەك (كۆمەكا سەربازان) خەزایێ بكەن ڤێجا بگەهنە دەسكەفتان، و ب سلامەت بن ئەگەر سێ پشكێت خێرا وان بۆ وان نەهێنە پێشئێخستن، و نینە خەزاكەرەك یان سریەك (كۆمەكا سەربازان) خەزایێ بكەن، ڤێجا بشكێن یان بەرهنگار ببن (بریندار ببن یان شەهید ببن) ئەگەر خێرا وان تمامەتی بۆ نەهێتە دان).**

---

(١) دەستكەفت بۆ ئوممەتێت دی دورست نەبوون و ڤیابا دەستكەفت كۆم كربان و ئاگر بەردابانێ، و بۆ ئیسلامێ هاتنە دورستكرن، ئانكو: حەلالكرن.

- **و د ڤەگێرەکێدا گۆت: (نینە هندە خەزاکەر د رێکا خودێدا خەزایێ بکەن و بگەهنە دەستکەفتی ئەگەر خودێ سێکا خێرا وان یا ئاخرەتێ بۆ وان پێش نەئێخیت، و سێکا خێرێ بۆ وان دێ مینیت، و ئەگەر نەگەهنە دەستکەفتی خێرا وان تمامتی دێ بۆ وان هێتە دان).**

٣ ـ باب: قسمة الغنيمة.

**بابەتێ: لێکڤەکرنا دەستکەفتان.**

٢١٥٩ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) جَعَلَ لِلفَرَسِ سَهْمَيْنِ، وَلِصَاحِبِهِ سَهْماً. [خ٢٨٦٣/ م١٧٦٢].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دو پشك بۆ هەسپی یێت دانایین و پشکەك بۆ خودانێ وی.**

٤ ـ باب: مراعاة مصلحة عامة المسلمين في القسم.

**بابەتێ: بەرچاڤوەرگرتنا بەرژەوەندییا گشت موسلمانان د لێکڤەکرنێدا.**

٢١٦٠ - (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلاَ أَنْ أَتْرُكَ آخِرَ النَّاسِ بَبَّاناً لَيْسَ لَهُمْ شَيْءٌ، ما فُتِحَتْ عَلَيَّ قَرْيَةٌ إِلاَّ قَسَمْتُهَا، كَمَا قَسَمَ النَّبِيُّ (ﷺ) خَيْبَرَ، وَلكِنِّي أَتْرُكُهَا خِزَانَةً لَهُمْ يَقْتَسِمُونَهَا. [خ٤٢٣٥ (٢٣٣٤)].

**ژ عومەرێ کورێ خەتتابی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا، ئەگەر من ژ هندێ نەبا پاشهاتییێت خەلکی هەژار ببن و چ تشت وان نەبن، چو گوند ل سەر من ڤەنەدبوون ئەگەر من لێکڤەنەکربا هەروەکی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەیبەر لێکڤە کری، بەلێ ئەز بۆ وان خەزینە دهێلم بۆ دەستێت بهێن لێکڤە بکەن.**

٥ ـ باب: ما يعطى للمؤلفة قلوبهم.

**بابەتێ: ئەوا ددەنە وان یێت دلێت وان بۆ ئیسلامێ دهێنە کرین.**

٢١٦١ - (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ تَغْلِبَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أُتِيَ بِمَالٍ ـ أَوْ بِسَبْيٍ ـ فَقَسَمَهُ، فَأَعْطَى رِجَالاً وَتَرَكَ رِجَالاً، فَبَلَغَهُ أَنَّ الَّذِينَ تَرَكَ عَتَبُوا، فَحَمِدَ اللهَ ثُمَّ أَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**أَمَّا بَعْدُ، فَوَاللهِ إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ وَأَدَعُ الرَّجُلَ، وَالَّذِي أَدَعُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الَّذِي أُعْطِي، وَلكِنْ أُعْطِي أَقْوَاماً لِمَا أَرَى فِي**

**قُلُوبِهِمْ مِنَ الجَزَعِ وَالْهَلَعِ، وَأَكِلُ أَقْوَاماً إِلَى مَا جَعَلَ اللهُ فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الْغِنَى وَالْخَيْرِ، فِيهِمْ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ)** . فَوَاللهِ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِكَلِمَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حُمْرَ النَّعَمِ. [خ٩٢٣].

**ژ عەمرێ كوڕێ تەغلبی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مال و ئێخسیر بۆ هاتن، لێكڤە كرن، دا هندە زەلامان و هندە زەلام هێلان، گەهشتە وی ئەوێت هێلاین گازندە كرن، ئینا حەمدا خودێ كر و پەسن و مەدحێت وی كرن، پاشی گۆت: (ئەڤە و پشتی ڤێ، ئەز ب خودێ كەم ئەز نادەمە زەلامی و زەلامی دهێلم، و یێ ئەز نەدەمێ ئەو خۆشڤیترە ژ وی یێ ئەز ددەمێ، بەلێ ب راستی ئەز ددەمە هندەكان ژ بەر وێ ترسا زێدە ئەز د دلێت واندا دبینم، و هندەكان ئەز ب هیڤیا وێڤە دهێلم یا خودێ كرییە د دلێت واندا ژ زەنگینییێ و خێرێ، ژ وان عەمروێ كوڕێ تەغلبی). عەمروێ كوڕێ تەغلبی گۆت: ب خودێ من نەڤێت من حێشترێت سۆر ل شوینا ئاخفتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەبن.**

٦ ـ باب: ما يكون من الطعام في الغنيمة.

**بابەتێ: خوارن د دەستكەفتیدا دێ یێ چاوا بیت.**

٢١٦٢ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى: أنه سئل هَلْ كُنْتُمْ تُخَمِّسُونَ ـ يَعْنِي: الطَّعَامَ ـ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)؟ فَقَالَ: أَصَبْنَا طَعَاماً يَوْمَ خَيْبَرَ، فَكَانَ الرَّجُلُ يَجِيءُ فَيَأْخُذُ مِنْهُ مِقْدَارَ مَا يَكْفِيهِ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ.[د٢٧٠٤].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ ئەبی ئەوفایی (رضي الله عنه) پرسیار ژێ هاتە كرن ئەرێ هەوە خوارن ل سەردەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پێنجیك دكر؟ ئینا گۆت: رۆژا خەیبەرێ خوارن ب دەست مە كەفت، ڤێجا زەلام دا هێت كا چەندێ تێرا وی دكر دا راكەت و پاشی دا چیت.**

٧ ـ باب: من وجد ماله في الغنيمة.

**بابەتێ: ئەو كەسێ مالێ خۆ د ناڤ دەستكەفتیدا ببینیت.**

٢١٦٣ – (خ) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْداً لابْنِ عُمَرَ أَبَقَ فَلَحِقَ بِالرُّومِ، فَظَهَرَ عَلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الوليدِ، فَرَدَّهُ عَلَى عَبْدِ اللهِ. وَأَنَّ فَرَساً لابْنِ عُمَرَ عَارَ فَلَحِقَ بِالرُّومِ، فَظَهَرَ عَلَيْهِ، فَرَدُّوه عَلَى عَبْدِ اللهِ.[خ٣٠٦٨ (٣٠٦٧)].

**ژ نافعی (رضي الله عنه) گۆت: بەندەیەكێ ئیبن عومەری رەڤی بوو و گەهشتە رۆمێ، و خالدێ كوڕێ وەلیدی ب سەر وان كەفت، و ئەو بۆ عەبدوللایی زڤراندەڤە، و هەسپەكێ**

**ئیبن عومەری تەقیا بوو گەهشتبوو رۆمێ ب سەر وان كەفت و بۆ عەبدوللایی زڤراندەڤە.**

## ٨ ـ باب: سلب القتيل للقاتل.

## بابەتێ: تشتێت كوشتی بۆ بكوژینە.

٢١٦٤ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَوْمَئِذٍ . يَعْنِي: يَوْمَ حُنَيْنٍ .: (**مَنْ قَتَلَ كَافِراً فَلَهُ سَلَبُهُ**) ، فَقَتَلَ أَبُو طَلْحَةَ يَوْمَئِذٍ عِشْرِينَ رَجُلاً، وَأَخَذَ أَسْلاَبَهُمْ. [د٢٧١٨/ مي٢٥٢٧].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (ڕەزای خودێ لێ بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وێ رۆژێ ـ ئانكو رۆژا حونەینێ ـ گۆت: (هەر كەسێ گاورەكی بكوژیت كەلوپەلێت وی بۆ وینە) وێ رۆژێ ئەبو تەلحەی بیست زەلام كوشتن و كەلوپەلێت وان بۆ خۆ برن.**

٢١٦٥ – عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ قَتَلَ فَلَهُ السَّلَبُ**).[جه٢٨٣٨].

* صحيح.

**ژ سەمورەیێ كوڕێ جوندەبی (ڕەزای خودێ لێ بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ (گاورەكی د جیهادێدا) بكوژیت كەلوپەلێت وی بۆ وینە).**

## ٩ ـ باب: ما ينفله الإمام للمجاهدين.

## بابەتێ: ئەوا حاكمدار زێدە ددەتە خەزاكەری.

٢١٦٦ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بَعَثَ سَرِيَّةً فِيهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ قِبَلَ نَجْدٍ، فَغَنِمُوا إِبِلاً كَثِيرَةً، فَكَانَتْ سِهَامُهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيراً، أَوْ أَحَدَ عَشَرَ بَعِيراً، وَنُفِّلُوا بَعِيراً بَعِيراً. [خ٣١٣٤/ م١٧٤٩].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سریەك بۆ لایێ نەجدێ هنارت و عەبدوللایێ كوڕێ عومەری تێدا بوو، گەلەك حێشتر وەك دەستكەفت ب دەستخۆڤە ئینان، بارا هەر ئێكی ژ وان دوازدە حێشتر بوون یان یازدە حێشتر، و هەر ئێكی حێشترەكا زێدە ژی پێ هاتە دان.**

## ١٠ ـ باب: حكم الفيء.

**بابەتێ: فەرمانا دەستكەفتێ نە ب شەڕ ب دەست موسلمانان دكەڤیت.**

٢١٦٧ - (ق) عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ، عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ (ﷺ)، مِمَّا لَمْ يُوجِفِ المسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ، فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) خَاصَّةً، وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَتِهِ، ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي السِّلاَحِ وَالْكُرَاعِ، عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللهِ. [خ٢٩٠٤/ م١٧٥٧].

**ژ مالكێ كوڕێ ئەوسی (رضي الله عنه) ژ عومەری (رضي الله عنه) گۆت: مال و سامانێ بەنی نەزیر ژ وی دەستكەفتی بوو یێ خودێ دایە پێغەمبەرێ خۆ (ﷺ) و ژ وی مال و سامانی بوو یێ موسلمانان بەز بۆ نەكری نە ب هەسپان و نە ب پێیان و ئەو تایبەت بۆ پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) مەزاختنا سالەكێ ژ وی مالێ خۆ دكر، پاشی یێ مایی د كرە د چەك و هەسپانڕا وەك ئامویرێت جیهادا د رێكا خودێدا.**

٢١٦٨ - عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا أَتَاهُ الْفَيْءُ قَسَمَهُ فِي يَوْمِهِ، فَأَعْطَى الْآهِلَ: حَظَّيْنِ، وَأَعْطَى الْعَزَبَ: حَظّاً. زَادَ ابْنُ الْمُصَفَّى: فَدُعِينَا، وَكُنْتُ أُدْعَى قَبْلَ عَمَّارٍ، فَدُعِيتُ فَأَعْطَانِي حَظَّيْنِ وَكَانَ لِي أَهْلٌ، ثُمَّ دُعِيَ بَعْدِي عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ، فَأَعْطَى لَهُ حَظّاً وَاحِداً. [د٢٩٥٣].

* حسن الإسناد.

**ژ عەوفێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر دەسكەفتێ نە یێ ب رێكا شەڕی هاتییە وەرگرتن بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتبا، د رۆژا خۆدا لێكڤە دكر، ڤێجا یێ ب ژن با دو پشك و بار ددانێ، و یێ زوگرد پشك و بارەك ددایێ، ئیبن موسەففایی زێدە كر: ئەز بەری عەمماری هاتمە گازی كرن دو پشك و بار دانە من، و ئەز یێ ب ژن بووم، پاشی پشتی من گازی عەمماری كرن ئێك پشك و بار تنێ دا وی.**

## ١١ ـ باب: تحريم الغلول.

**بابەتێ: حەرامكرنا خیانەتكرنا د دەستكەفتیدا.**

٢١٦٩ - (م) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ خَيْبَرَ، أَقْبَلَ نَفَرٌ مِنْ صَحَابَةِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالُوا: فُلاَنٌ شَهِيدٌ، فُلاَنٌ شَهِيدٌ، حَتَّى مَرُّوا عَلَى رَجُلٍ فَقَالُوا: فُلاَنٌ شَهِيدٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(كَلاَّ، إِنِّي رَأَيْتُهُ فِي النَّارِ، فِي بُرْدَةٍ غَلَّهَا، أَوْ عَبَاءَةٍ)** . ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(يَا ابْنَ الْخَطَّابِ،**

**اذْهَبْ فَنَادِ فِي النَّاسِ: إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ الْمُؤْمِنُونَ)** . قَالَ: فَخَرَجْتُ فَنَادَيْتُ: أَلاَ إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ الْمُؤْمِنُونَ. [م١١٤].

**ژ عومەری (رضي الله عنه)، گۆت: وەختێ بوویە شەڕێ خەیبەرێ هندە مرۆڤ ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) هاتن، گۆتن: بێڤان شەهیدە، و بێڤان شەهیدە، هەتا د بەر زەلامەكیڕا بۆرین گۆتن: بێڤان شەهیدە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نەخێر ب راستی من دیت ئەو یێ د ئاگریدا، ب عەبایەكی خیانەت یا كری بەری لێكڤەكرنا دەستكەفتییان). پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی كوڕێ خەتتابی هەرە د ناڤ خەلكیدا گازی بكە ب راستی كەس ناچیتە بەحەشتێ باوەریدار نەبن) گۆت: ئەز چۆم من گازی كر: بزانن ب راستی كەس ناچیتە بەحەشتێ باوەریدار نەبن.**

## ١٢ . باب: فداء الأسرى.

### بابەتێ: خوینا ئێخسیران.

٢١٧٠ – عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) فَدَى رَجُلَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ بِرَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ.[ت١٥٦٨].

* صحيح.

[وانظر: ٣٦٢٢، ٣٦٢٣] .

**ژ عیمرانێ كوڕێ (حصین)ی (رضي الله عنه) پێغەمبەری (ﷺ) خوینا دو زەلامان ژ موسلمانان ب زەلامەكی ژ هەڤپشكچێكەران دا.**

## ١٣ . باب: ما جاء في الخمس.

### بابەتێ: ئەوا د راستا پێنجێكێدا هاتی.

٢١٧١ – **(خ)** قال البخاري: بَاب: وَمِنَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْخُمُسَ لِلْإِمَامِ، وَأَنَّهُ يُعْطِي بَعْضَ قَرَابَتِهِ دُونَ بَعْضٍ: مَا قَسَمَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِبَنِي الْمُطَّلِبِ، وَبَنِي هَاشِمٍ مِنْ خُمُسِ خَيْبَرَ. قَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: لَمْ يَعُمَّهُمْ بِذَلِكَ، وَلَمْ يَخُصَّ قَرِيباً دُونَ مَنْ هُوَ أَحْوَجُ إِلَيْهِ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي أَعْطَى لِمَا يَشْكُو إِلَيْهِ مِنَ الْحَاجَةِ، وَلِمَا مَسَّتْهُمْ فِي جَنْبِهِ مِنْ قَوْمِهِمْ وَحُلَفَائِهِمْ. [خ. الخمس، باب ١٧].

**بوخاری (رحمه الله) گۆت: بابەت: ژ وان بەلگەیێت ل سەر هندێ پێنجێك بۆ ئیمامییە، و ئەو دێ دەتە هندەك مرۆڤێت خۆ و نادەتە هندەكێت دی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ پێنجێكا خەیبەرێ نەدا بەنی موتتەلب و بەنی هاشم. عومەرێ كوڕێ عەبدولعەزیزی**

**گۆت: د وێ لێكڤەكرنێدا هەمی نەگرتن، و مرۆڤەكێ خۆ تایبەت نەكر ل سەر وی یێ هەوجەتر، ژ بەر گازندا هەوجەییا بۆ دهاتە كرن، و ژ بەر وێ یا ژ بەر وی گەهشتییە وان ژ قورەیشییان و هەڤپەیمانێت وان ژ بەر ئیسلاما وان.**

٢١٧٢ - عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى بَعِيرٍ مِنَ الْمَغْنَمِ، فَلَمَّا سَلَّمَ أَخَذَ وَبَرَةً مِنْ جَنْبِ الْبَعِيرِ، ثُمَّ قَالَ: (**وَلاَ يَحِلُّ لِي مِنْ غَنَائِمِكُمْ مِثْلُ هَذَا؛ إِلاَّ الْخُمُسُ، وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ فِيكُمْ**) .[د٢٧٥٥].

* صحيح.

**ژ عەمرێ كورێ عەبسەیی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ لایێ حێشترەكا ژ دەستكەفتی نڤێژ ب مە كر، ڤێجا دەمێ سلاڤ ڤەدایی هندە موییێ حێشترێ ژ تەنشتا وێ وەرگرت و گۆت: (هندی ڤێ ژ دەستكەفتێ هەوە بۆ من حەلال نینە، پێنجێك نەبیت و پێنجێك ژی هەر دێ بۆ هەوە زڤریتەڤە).**

٢١٧٣ - عَن أَبِي الزُّبَيْرِ قَالَ: سُئِلَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَصْنَعُ بِالْخُمُسِ؟ قَالَ: كَانَ يَحْمِلُ الرَّجُلَ مِنْهُ فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ الرَّجُلَ، ثُمَّ الرَّجُلَ. [حم١٤٩٣٢].

* إسناده حسن.

**ژ بابێ زوبەیری (رحمه الله) گۆت: پرسیار ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی هاتە كرن پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چ ل پێنجێكێ دكر؟ گۆت: زەلام بۆ جیهادا د رێكا خودێدا ئامادە دكر پاشی زەلام و پاشی زەلام.**

٢١٧٤ - عَنْ عَطَاءٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿**وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ**﴾ قَالَ: خُمُسُ الله وَرسُولِهِ وَاحِدٌ كَانَ النَّبِي (ﷺ) يَصْنَعُ فِيهِ مَا شَاءَ. [هق٦/٣٣٨].

**ژ عەتائی (رحمه الله) د گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزندا ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ﴾[1]. گۆت: پێنجێكا خودێ و پێغەمبەرێ وی ئێكە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چاوا ڤیابا ئەو تێدا دكر.**



(١) رامان: و بزانن ب راستی هەر دەستكەفتییەكێ ب دەست هەوە بكەڤیت، پێنجێك ژێ بۆ خودێ و پێغەمبەرییە.

## الفصل الثالث: الجزية والموادعة

## پشکا سێیێ: زێرسەر ئاشتییاتی و هێلانا شەڕی.

### ١ ـ باب: الوفاء بالعهد.

### بابەتێ: ب جهئینانا پەیمانێ.

٢١٧٥ - (م) عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ قَالَ: مَا مَنَعَنِي أَنْ أَشْهَدَ بَدْراً إِلاَّ أَنِّي خَرَجْتُ أَنَا وَأَبِي، حُسَيْلٌ، قَالَ: فَأَخَذَنَا كُفَّارُ قُرَيْشٍ، قَالُوا: إِنَّكُمْ تُرِيدُونَ مُحَمَّداً؟ فَقُلْنَا: مَا نُرِيدُه، مَا نُرِيدُ إِلاَّ الْمَدِينَةَ. فَأَخَذُوا مِنَّا عَهْدَ اللهِ وَمِيثَاقَهُ لَنَنْصَرِفَنَّ إِلَى الْمَدِينَةِ وَلاَ نُقَاتِلُ مَعَهُ. فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَأَخْبَرْنَاهُ الْخَبَرَ، فَقَالَ: (انْصَرِفَا، نَفِي لَهُمْ بِعَهْدِهِمْ، وَنَسْتَعِينُ اللهَ عَلَيْهِمْ) . [م١٧٨٧]

**ژ حوزەیفەیێ کوڕێ یەمانی (ﷺ) گۆت: چو رێگری ل من نەکر ئەز پشکدارییێ د بەدرێدا بکەم ئەو نەبیت ئەز و بابێ خۆ حوسەیل دەرکەفتین، گۆت: و گاورێت قورەیشییان ئەم گرتین، گۆتن هەوە دڤێت بچنە دەڤ موحەممەدی؟ مە گۆتێ نەخێر مە ئەو نەڤێت، و مە چو نەڤێت مەدینە نەبیت، ئینا پەیمانا خودێ و بەلێنا وی ژ مە وەرگرت ئەم دێ چینە مەدینەیێ و ئەم د گەل وی شەڕی ناکەین، ئینا ئەم هاتینە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و مە سەرهاتی بۆ گۆت: ئینا گۆت: (هەرن، ئەم دێ پەیمانا د گەل وان پارێزین، و هاریکارییێ ژ خودێ خوازین ل سەر وان).**

### ٢ ـ باب: المسلمون يسعى بذمتهم أدناهم.

### بابەتێ: نزمترینێ موسلمانان پەیمانا وی رێزلێگرتییە.

٢١٧٦ - عَنْ عبدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العاصِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ، يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، وَيُجِيرُ عَلَيْهِمْ أَقْصَاهُمْ، وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، يَرُدُّ مُشِدُّهُمْ عَلَى مُضْعِفِهِمْ، وَمُتَسَرِّيهِمْ عَلَى قَاعِدِهِمْ، لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلاَ ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ**). [د٢٧٥١/ جه٢٦٨٥].

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمرێ کوڕێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خوینا موسلمانان بەرامبەری ئێکە[1]، و پەیمانا نزمترینێ وان یا**

---

(١) نانکو: خوینا هەمییا وەکی ئێکە، کوڕێ سەرۆک عەشیری و هەژارێ عەشیرێ، و ماقویلی و پالەی و جۆتیاری وەکی ئێکە و جوداهی د ناڤبەرا واندا نینە نە د تۆلڤەکرنێدا و نە د خوینێدا.

**ڕێزلێگرتییە، و پەنادانا دویرتریێ وان دهێتە وەرگرتن، و پێكڤە ئێكن ل سەر غەیری خۆ، و هێزداریێ وان د دەستكەفتیدا هاریكارییا لاوازێ وان دكەت، و پشكداریێ د سرێدا دەسكەفتی بۆ یێ ڕوینشتی ژ لەشكەری دزڤرینیت[1]، و باوەریدار ب گاوری و خودان پەیمان د پەیمانا خۆدا ناهێنە كوشتن).**

## ٣ . باب: أَمان النساء وجوارهن

## بابەتێ: ئێمناهییا ژن ددەن و خەواندنا وان.

٢١٧٧ - (ق) عَنْ أَبِي مُرَّةَ . مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ .: أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ تَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عَامَ الْفَتْحِ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ، وَفَاطِمَةُ ابْنَتُهُ تَسْتُرُهُ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: **(مَنْ هذِهِ)** ؟ فَقُلْتُ: أَنَا أُمُّ هَانِئٍ بِنْتُ أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ: **(مَرْحَباً بِأُمِّ هَانِئٍ)** . فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ، قَامَ فَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، مُلْتَحِفاً فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، زَعَمَ ابْنُ أُمِّي، عَلِيٌّ، أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلاً قَدْ أَجَرْتُهُ، فُلاَنُ ابْنُ هُبَيْرَةَ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ)** . قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ: وَذلِكَ ضحى.    [خ٣١٧١ (٢٨٠)/ م: صلاة المسافرين ٣٣٦ (٨٢)]

**ژ ئەبی مورەیی (ڕەزی خودێ لێ بیت) ئازاكرییێ ئوم هانیێ كچا ئەبی تالبی: وی گوه ل ئوم هانیێ كچا ئەبی تالبی بوو (ڕەزی خودێ لێ بیت) دگۆت: سالا ڤەكرنا مەكەهێ ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) من دیت سەرێ خۆ دشویشت و فاتمایا كچا وی دپاراست، من سلاڤ كرێ، گۆت: (ئەو كییە)؟ من گۆت: ئەز ئوم هانیمە كچا ئەبی تالبی، ئینا گۆت: (ئوم هانیێ ب خێر هاتی) ڤێجا دەمێ ژ سەرشویشتنا خۆ ب دویماهی هاتی، ڕابوو هەشت ركاعەت نڤێژ كرن، و جلكەك د خۆ وەركربوو، ئینا من گۆت ئەی پێغەمبەرێ خودێ، كوڕێ دایكا من عەلی یێ دبێژیت: ئەو دێ زەلامەكێ كوژیت من ئەو یێ حەواندی و ئێمناهی یا دایێ، فلانێ كوڕێ هوبەیرەیی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مە ئێمناهی دا وی یێ تە ئێمناهی دایێ ئەی ئوم هانیێ) ئوم هانیێ گۆت: و ئەو تێشتەگەه بوو.**

---

(١) ڕامان ئەوە سەربازێ ب هێز دەسكەفتی پتر ژ یێ بێ هێز وەرناگریت، و ب هێزا خۆ هاریكارییا یێ لاواز دكەت و د دەستكەفتیدا پشكدار دكەت و هاری دكەت، و پشكداریێ د هێرشێدا و یێ نەپشكدار، بەلێ ب مەرجەكی نێك بیت ژ وی لەشكەری نە كو یێ ڤەمایی بیت، هاریكارە یێ ڕوینشتی دەسكەفتی وەرگریت و تێدا پشكدار بیت.

٢١٧٨ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنْ كَانَتِ الْمَرْأَةُ لَتُجِيرُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ فَيَجُوزُ. [د٢٧٦٤].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: دەمێ ژنێ ئێمناهی دا، پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) ل سەر موسلمانان دورست دكر[1].**

## ٤ ـ باب: إثم من قتل معاهداً.

## بابەتێ: گونەها ئەوێ هەڤپەیمانەكی دكوژیت.

٢١٧٩ – (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: **(مَنْ قَتَلَ مُعَاهَداً لَمْ يَرَحْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا تُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَاماً)** . [خ٣١٦٦].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (هەر كەسێ هەڤپەیمانەكی بكوژیت ئەو بێهن ناكەتە بەحەشتێ و بێهنا بەحەشتێ ڤۆناغا چل سالان دچیت).**

## ٥ ـ باب: تحريم الغدر.

## بابەتێ: حەرامكرنا غەدرێ.

٢١٨٠ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: **(إِنَّ الْغَادِرَ يُنْصَبُ لَهُ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُقَالُ: هذِهِ غَدْرَةُ فُلاَنِ بْنِ فُلاَنٍ)** . [خ٦١٧٨ (٣١٨٨)/ م١٧٣٥].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (ب راستی بۆ هەر غەدرەچییەكی دێ ئالایەك[2] رۆژا قیامەتێ هێتە چكلاندن و دێ هێتە گۆتن: ئەڤە نیشانا غەدرا بێڤانییە).**

٢١٨١ – (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): **(لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُرْفَعُ لَهُ بِقَدْرِ غَدْرِهِ، أَلاَ وَلاَ غَادِرَ أَعْظَمُ غَدْراً مِنْ أَمِيرِ عَامَّةٍ)** . [م١٧٣٨].

**ژ ئەبی سەعیدی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (هەر غەدرەچییەكی ل رۆژا قیامەتێ ئالایەك یێ هەی، (ئانكو: نیشانەكا ئاشكرا یا هەی ب رەنگەكی وەسا خەلكێ مەحشەرێ هەمی وی بنیاسن)، دویڤ غەدرا وی دێ بلند بیت، و بزانن چ غەدرە ژ غەدرا كاربدەستێ گشتی مەزنتر نینە).**

---

(١) ئانكو: دهاتە وەرگرتن و دڤێت موسلمان ئێمناهییا وێ دایی نەشكێنن.

(٢) ئانكو: نیشانەكا ئاشكرا یا هەی ب رەنگەكێ وەسا خەلكێ مەحشەرێ هەمی وی بنیاسن.

٢١٨٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (الْإِيمَانُ قَيَّدَ الْفَتْكَ، لاَ يَفْتِكُ مُؤْمِنٌ).[د٢٧٦٩].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (باوەری رێگرییێ ل كوشتنا ب خافلەتی و ئێمناهی پێدایی دگریت، و باوەریدار كوشتنا ب خافلەتی و ئێمناهی پێدایی ناكەت).**

## ٦ ـ باب: في الجزية.

## بابەتێ: زێرەسەرێ.

٢١٨٣ – عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْجِزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ الْبَحْرَيْنِ، وَأَخَذَهَا عُمَرُ مِنْ فَارِسَ، وَأَخَذَهَا عُثْمَانُ مِنَ الْفُرْسِ. [ت١٥٨٨].

* صحيح.

**ژ سائبێ كوڕێ یەزیدی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زێرەسەر ژ ئاگرپەرێسێت بەحرەینێ وەرگرت و عومەری ژ فارس وەرگرت و عوسمانی ژ فورسێ وەرگرت[1].**

٢١٨٤ – عَنْ أَسْلَمَ ـ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ـ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ضَرَبَ الْجِزْيَةَ عَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَرْبَعَةَ دَنَانِيرَ، وَعَلَى أَهْلِ الْوَرِقِ أَرْبَعِينَ دِرْهَماً، مَعَ ذَلِكَ أَرْزَاقُ الْمُسْلِمِينَ وَضِيَافَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ.[ط٦١٨].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەسلەمی ئازاكرییێ عومەرێ كوڕێ خەتتابی، (ﷺ) گۆت: عومەرێ كوڕێ خەتتابی چوار دینار زێرەسەر دانانە سەر خودانێت زێری، و چل دەرهەم سەر خودانێت زیڤی، د گەل ڤێ ژی ئەرزاقێ موسلمانان[2] و مێڤانداریيا سێ رۆژان[3].**

٢١٨٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بن العاصِ: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) فَرَضَ الْجِزْيَةَ، عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ دِينَاراً دِينَاراً. [هق٩/١٩٤].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمرێ كوڕێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دینارەك زێرەسەر دانا سەر هەر بالغەكێ خەلكێ یەمەنێ.**

---

(١) فورس و فارس ئێكە، و رامانا فارس ئانكو: وەلاتێ فارس، و فورس كۆما فارسە، ئانكو: كەسێت فارس.

(٢) مەبەست ئەو سەربازێت ل ویرێ.

(٣) ئانكو: ئەو موسلمانێ بۆ كارەكی یان كاروانەكی د ویرێرا بچیت و ل وان ببیتە مێڤان ئەگەر ما ل ویرێ ماڤێ وییە ل سەر وان ئەو وی سێ رۆژان مێڤان بكەن، پشتی سێ رۆژان ل سەر وان نەنەركە و ئەو ب دلێ خۆنە.

## الفصل الرابع: الخيل والرمي والسبق

## پشكا چوارێ: هەسپ و تیرهاڤێتن و بەریكانە

### ١ ـ باب: الخيل معقود في نواصيها الخير.

### بابەتێ: بەركەت یا د هەسپێ جیهادێدا.

٢١٨٦ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ**). [خ٢٨٤٩/ م١٨٧١].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەركەت یا د هەسپێ جیهادێدا هەتا رۆژا قیامەتێ).**

٢١٨٧ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**مَنِ احْتَبَسَ فَرَساً فِي سَبِيلِ اللهِ، إِيمَاناً بِاللهِ، وَتَصْدِيقاً بِوَعْدِهِ، فَإِنَّ شِبَعَهُ وَرِيَّهُ وَرَوْثَهُ وَبَوْلَهُ فِي مِيزَانِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [خ٢٨٥٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ب باوەرییا ب خودێ و ب باوەرییا ژڤانا وی هەسپەكی بۆ جیهادێ ب خودان بكەت و راگریت، ب راستی تێر خوارنا وی و تێر ڤەخوارنا وی و زبلێ وی و میزا وی هەمی دێ د ترازییا ویدا بن رۆژا قیامەتێ).**

٢١٨٨ - (م) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَلْوِي نَاصِيَةَ فَرَسٍ بِإِصْبَعِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: (**الْخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالْغَنِيمَةُ**). [م١٨٧٢].

**ژ جەریرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت ب تبلا خۆ ناڤچاڤێت هەسپەكی خوار دكر، و وی دگۆت: (بەركەتا د هەسپێ جیهادێدا هەتا رۆژا قیامەتێ. و ئەو بەرەكەت: خێر و دەستكەفتییە).**

### ٢ ـ باب: الخيل ثلاثة.

### بابەتێ: هەسپ سێنە.

٢١٨٩ - عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْخَيْلُ ثَلاَثَةٌ: فَرَسٌ يَرْبُطُهُ الرَّجُلُ فِي سَبِيلِ اللهِ تَعَالَى، فَثَمَنُهُ أَجْرٌ، وَرُكُوبُهُ أَجْرٌ، وَعَارِيَتُهُ أَجْرٌ، وَعَلَفُهُ أَجْرٌ. وَفَرَسٌ يُغَالِقُ عَلَيْهَا الرَّجُلُ وَيُرَاهِنُ، فَثَمَنُهُ وِزْرٌ، وَعَلَفُهُ وِزْرٌ، وَرُكُوبُهُ وِزْرٌ. وَفَرَسٌ لِلْبِطْنَةِ فَعَسَى أَنْ يَكُونَ سَدَّاداً مِنَ الْفَقْرِ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى**). [حم٢٣٢٣٠].

* إسناده صحيح.

ژ ئەبی عەمرێ شەیبانی (رحمه الله) ژ زەلامەكێ ئەنساری ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەسپ سێنە: هەسپەك زەلامەك بۆ جیهادێ گرێدەت، بهایێ وی خێرا تێدا و سویاربوونا وی خێرا تێدا و بدەتەڤ ئێكی خێرا تێدا و ئالفێ وی خێرا تێدا، و هەسپەك زەلامەك گەرەوێ (ریهانێ) و قوماریێ ل سەر بكەت، بهایێ وی گونەهە، و ئالفێ وی گونەهە، و سویاربوونا وی گونەهە، و ماهینەك بۆ زێدەییێیە بهێتە خودانكرن من هیڤییە ئەڤە جهێ هەژارییێ بگریت).**

## ٣ ـ باب: المسابقة بين الخيل والإبل.

## بابەتێ: بەریكانێ د ناڤبەرا هەسپان و حێشتراندا.

٢١٩٠ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) سَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي أُضْمِرَتْ: مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَأَمَدُهَا ثَنِيَّةُ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضْمَرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وَأَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ فِيمَنْ سَابَقَ بِهَا. [خ٤٢٠/ م١٨٧٠].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەریكانە د ناڤبەرا كۆمەكا هەسپاندا دورست كر، ئەوێت بۆ جیهادێ هاتینە زەعیفكرن و بەرهەڤكرن[1] ژ حەفیائێ[2] هەتا رێكا د چاییدا یا خاترخواستنێ[3] و بەریكانە د ناڤبەرا هەسپێت گران و نەزەعیفكریدا دورست كر ژ رێكا چیایدا هەتا مزگەفتا بەنی زوریق[4]، و عەبدوللایێ كوڕێ عومەری د ڤێ بەریكانێدا بوو.**

٢١٩١ - (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَتْ نَاقَةٌ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) تُسَمَّى: الْعَضْبَاءَ، وَكَانَتْ لاَ تُسْبَقُ، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ لَهُ، فَسَبَقَهَا، فَاشْتَدَّ ذٰلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، وَقَالُوا: سُبِقَتِ الْعَضْبَاءُ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ حَقّاً عَلَى اللهِ أَنْ لاَ يَرْفَعَ شَيْئاً مِنَ الدُّنْيَا؛ إِلاَّ وَضَعَهُ). [خ٦٥٠١ (٢٨٧١)].

---

(١) رێكا بەرهەڤكرنێ ژی ب ڤی رەنگی بوو: هەسپ دهاتنە راگرتن، تێر ئالف ددانێ هەتا قەلەو ببان، پاشی دكرنە د جهەكیڤە و ئالف ژێ ڤەدگرت و جلەك ددانانە سەر پشتا وان هەتا خوهێ باش دابان، و پشتی خوها وان هشك دبوو سڤك دبون و بۆ غارێ ب هێز دكەفتن.

(٢) جهەكە دكەڤیتە رۆژئاڤایێ چیایێ ئوحودێ.

(٣) (دبێژنێ رێكا خاترخواستنێ، چونكی ئەو رێكا دەركەفتنێ بوو ژ مەدینەیێ، و خەلكی وان هەتا وێرێ دهاتن خاترا خۆ ژ مرۆڤێت خۆ دخواستن، و د ناڤبەرا وێ و حەفیائێدا نێزیكی هەشت كیلۆمەترانە.

(٤) بەنی زەریق: عەشیرەتەكە ژ ئەنساران، دویراتییا د ناڤبەرا واندا كیلۆمەترەكە.

ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: حێشترا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) عەزباء د بەری وێڕا نەدهاتە كرن، یان نێزیك بوو د بەری وێڕا نەئێتە كرن ، كۆچەرە عەرەبەك هات ل حێشترەكێ سویار د بەری وێڕا كر، ئەڤێ موسلمان ئێشاندن هەتا پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤە زانی ئینا گۆت: **(حەقە ل سەر خودێ تشەك د دنیایێدا بلند نەبیت هەكە نەئینیتە خوارێ).**

٢١٩٢ - عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ سَبَقَ إِلاَّ فِي خُفٍّ، أَوْ حَافِرٍ، أَوْ نَصْلٍ**).
[د٢٥٧٤/ ت١٧٠٠/ ن٣٥٨٧/ جه٢٨٧٨]

* صحيح.

ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(مال و پارە وەرگرتن د بەریكانێدا نەیا دورستە ئەو نەبیت د بەریكانا حێشتراندا بیت یان هەسپاندا یان تیرڤانییێدا بیت).**

## ٤ ـ باب: فضل الرمي.

## بابەتێ: خێرا تیرڤانییێ.

٢١٩٣ - (خ) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ رضي الله عنه قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى نَفَرٍ مِنْ أَسْلَمَ يَنْتَضِلُونَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**ارْمُوا بَنِي إِسْمَاعِيلَ، فَإِنَّ أَبَاكُمْ كَانَ رَامِياً، ارْمُوا وَأَنَا مَعَ بَنِي فُلاَنٍ**). قَالَ: فَأَمْسَكَ أَحَدُ الْفَرِيقَيْنِ بِأَيْدِيهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا لَكُمْ لاَ تَرْمُونَ**) ؟ قَالُوا: كَيْفَ نَرْمِي وَأَنْتَ مَعَهُمْ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ: (**ارْمُوا، فَأَنَا مَعَكُمْ كُلِّكُمْ**). [خ٢٨٩٩].

ژ سەلەمەیێ كورێ ئەكوەعی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) د بەر هندەك زەلامێت ئەسلەمیڕا بۆری ئارمانجا تیرانێ دكر، ئینا گۆت: **(باڤێژن كورێت ئسماعیلی، ب راستی بابێ هەوە تیرڤان بوو، باڤێژن و ئەز یێ د گەل فلان بنەمالێ)**، ئینا دەستەیەكێ ژ وان دەست ژ تیرهاڤێتنێ بەردا، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت **(هەوە خێرە بۆچی هوین ناهاڤێژن)؟** گۆتن: چاوا دێ هاڤێژین و تو یێ د گەل وان؟ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(باڤێژن ئەز یێ د گەل هەوە هەمیان).**

٢١٩٤ - (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، يَقُولُ: (**وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ. أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ**). [م١٩١٧].

ژ عوقبەیێ كورێ عامری (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت و ئەو ل سەر مینبەرێ بوو: **(و هندی هەوە پێ چێ ببیت ژ هێزێ بۆ وان بەرهەڤ بكەن، بزانن ب راستی هێز رەمی و هاڤێتنە، بزانن ب راستی هێز رەمی و هاڤێتنە، بزانن ب راستی هێز رەمی و هاڤێتنە)**[1].

٢١٩٥ - (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمْ أَرَضُونَ، وَيَكْفِيكُمُ اللهُ، فَلاَ يَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ**). [م١٩١٨].

ژ عوقبەیێ كورێ عامری (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(دێ عەرد بۆ هەوە ڤەبن و خودێ دێ هەوە بێ منەت كەت، بەس بلا كەس ژ هەوە بێچارە نەبیت هەر خۆ ب تیرێت خۆڤە مژویل بكەت)**.

٢١٩٦ - عَنْ أَبِي نَجِيحٍ السَّلَمِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ بَلَغَ بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَهُوَ لَهُ دَرَجَةٌ فِي الْجَنَّةِ**)، فَبَلَّغْتُ يَوْمَئِذٍ سِتَّةَ عَشَرَ سَهْماً.قَالَ: وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (**مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَهُوَ عِدْلُ مُحَرَّرٍ**). [د٣٩٦٥/ ت١٦٣٨/ ن٣١٤٣].

* صحيح.

ژ ئەبی نەجیحێ سەلەمی(رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(هەر كەسێ تیرەكێ باڤێژیت و بگەهینیتە دژمنی ئەو بۆ وی پلەیەكە د بەحەشتێدا)** وێ رۆژێ من شازدە تیر هاڤێتن و گەهاندن و گۆت: و من گوه لێ بوو دگۆت: **(هەر كەسێ تیرەكێ د رێكا خودێدا باڤێژیت ئەو بۆ وی بەرامبەر كۆلەیەكێ ئازاكرییە)**[2].

---

(١) دبیت مەبەست ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) ژ (رەمییێ) رمزانی و تیرڤانی بیت، بەلێ دڤێت ئەم بزانین هەر دەمەكی چەكێ خۆ یێ هەی، و نەڤرۆ كا چ جهێ رمێ و تیرێ دگرن دڤێت موسلمان ل سەر پەیداكرن و ئامادەكرن و بەرهەڤكرنا وان د هشیار و رژد بن.

(٢) ئانكو: خێرا وی وەكی خێرا ئازاكرنا بەندەكییە.

## ٥ ـ باب: مراعاة مصلحة الدواب في السير

## بابەتێ: بەرچاڤوەرگرتنا بەرژەوەندیا دەواری د چوونێدا

٢١٩٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ؛ فَأَعْطُوا الإِبِلَ حَظَّهَا مِنَ الأَرْضِ. وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي السَّنَةِ؛ فَأَسْرِعُوا عَلَيْهَا السَّيْرَ. وَإِذَا عَرَّسْتُمْ بِاللَّيْلِ؛ فَاجْتَنِبُوا الطَّرِيقَ، فَإِنَّهَا مَأْوَى الْهَوَامِّ بِاللَّيْلِ)**. [م١٩٢٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە هەوە وەغەر ل جهەكێ قەلەو كر، بارا حێشترێ ژ ئەردی بدەنێ[1]، و هەكە هەوە وەغەر ل جهەكێ رویت كر، لەزێ ل چۆنا خۆ بكەن و لەزێ لێ بكەن، دا بگەهنە قۆناغا خۆ، و هەكە هەوە شەڤێ دانا، خۆ ژ ڕێكێ بدەنە پاش، ب راستی ئەو ب شەڤ جهێ خشخشۆكانە)[2].**

٢١٩٨ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا إِذَا نَزَلْنَا مَنْزِلاً لاَ نُسَبِّحُ حَتَّى تُحَلَّ الرِّحَالُ. [د٢٥٥١].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ مە ددانا جهەكی، مە سونەت نەدكر[3] هەتا مە بار ڤەكربان و دانابان.**

## ٦ ـ باب: في الدلجة

## بابەتێ: وەغەركرنا ب شەڤ

٢١٩٩ - عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(عَلَيْكُمْ بِالدُّلْجَةِ، فَإِنَّ الأَرْضَ تُطْوَى بِاللَّيْلِ)**.[د٢٥٧١].

* صحيح.

[وانظر: ٦٢].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب شەڤ وەغەرێ بكەن ب راستی عەرد ب شەڤ دگەهیتە ئێك)[4].**

---

(١) ئانكو: لەزێ ل حێشترێ نەكەن و بهێلن بلا بچەریت.

(٢) وەكی مار و دووپشك و سپیە و كێچان.

(٣) د گەل كو گەلەك پێت گرێدای بوون ب سونەتانڤە و حەزێ دكرن.

(٤) ئانكو: یا ب بەرەكەتە زوی رێ دئێتە برین.

## ٧ ـ باب: الرجل أحق بصدر دابته.

## بابەتێ: خودان هەژیترە ل پێشییا دەوارێ خۆ سویار بیت.

٢٢٠٠ - عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَمْشِي، جَاءَ رَجُلٌ وَمَعَهُ حِمَارٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ارْكَبْ، وَتَأَخَّرَ الرَّجُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ، أَنْتَ أَحَقُّ بِصَدْرِ دَابَّتِكَ مِنِّي؛ إِلاَّ أَنْ تَجْعَلَهُ لِي**). قَالَ: فَإِنِّي قَدْ جَعَلْتُهُ لَكَ، فَرَكِبَ. [د٢٥٧٢/ ت٢٧٧٣]

* حسن صحيح.

**ژ بورەیدەیی (رضي الله عنه) گۆت: د دەمەکێدا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب پێیان دچۆ، زەلامەك هات و کەرەك د گەل بوو، ئینا گۆت: سویاربە ئەی پێغەمبەرێ خودی، و زەلام هاتە پاشییێ، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نەخێر تو ژ من پێشتری ل پێشییا دەواری سویار ببی ئەو نەبیت تو بدەیە من)، گۆت: ب راستی من دا تە سویاربە.**



## الفصل الأول: فضل الذكر

## پشکا ئێکێ: خێرا زکری

### ١ ـ باب: فضل الذكر.

### بابەتێ: خێرا زکری.

٢٢٠١ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ للهِ مَلاَئِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ، يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ، فَإِذَا وَجَدُوا قَوْماً يَذْكُرُونَ اللهَ تَنَادَوْا: هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ. قَالَ: فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، قَالَ: فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ، وَهُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ، مَا يَقُولُ عِبَادِي؟ قَالَ: تَقُولُ: يُسَبِّحُونَكَ وَيُكَبِّرُونَكَ وَيَحْمَدُونَكَ وَيُمَجِّدُونَكَ، قَالَ: فَيَقُولُ: هَلْ رَأَوْنِي؟ قَالَ: فَيَقُولُونَ لاَ، وَاللهِ مَا رَأَوْكَ! قَالَ: فَيَقُولُ: وَكَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْكَ كَانُوا أَشَدَّ لَكَ عِبَادَةً، وَأَشَدَّ لَكَ تَمْجِيداً، وَأَكْثَرَ لَكَ تَسْبِيحاً.قَالَ: يَقُولُ: فَمَا يَسْأَلُونِي؟ قَالَ: يَسْأَلُونَكَ الجَنَّةَ، قَالَ: يَقُولُ: وَهَلْ رَأَوْهَا؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لاَ، وَاللهِ يَا رَبِّ! مَا رَأَوْهَا، قَالَ: يَقُولُ: فَكَيْفَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصاً، وَأَشَدَّ لَهَا طَلَباً، وَأَعْظَمَ فِيهَا رَغْبَةً. قَالَ: فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ؟ قَالَ: يَقُولُونَ: مِنَ النَّارِ، قَالَ: يَقُولُ: وَهَلْ رَأَوْهَا؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لاَ، وَاللهِ يَا رَبِّ! مَا رَأَوْهَا، قَالَ: يَقُولُ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا؟ قَالَ: يَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ مِنْهَا فِرَاراً، وَأَشَدَّ لَهَا مَخَافَةً، قَالَ: فَيَقُولُ: فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ. قَالَ: يَقُولُ مَلَكٌ مِنَ المَلاَئِكَةِ: فِيهِمْ فُلاَنٌ لَيْسَ مِنْهُمْ، إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ. قَالَ: هُمُ الجُلَسَاءُ لاَ يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ).** [خ٦٤٠٨/ م٢٦٨٩].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودێ هندە ملیاکەتێت هەین ل رێکان دهێن و دچن ل خەلکێ زکری دگەڕن، فێجا هەکە هندەك دیتن زکرێ خودایێ ب هێز و مەزن دکەن، گازی ئێك و دو دکەن، وەرنە هەوەجەیی و داخوازییا خۆ، و ب پەرێت خۆ دێ دۆرماندۆر هێن هەتا عەسمانێ دنیایێ، خودایێ وان دێ پرسیارا وان کەت، و ئەو ژ وان زاناترە، بەندەیێت من چ دگۆتن؟ گۆت: دێ بێژن: تە ژ کێماسییان پاك دکەن و تەکبیرا تە دکەن و شوکر و حەمدا تە دکەن و تە مەزن دانن، دێ بێژیت: ما وان ئەز دیتیمە؟ دێ بێژن: نە ب خودێ تو نەدیتییە، دێ بێژیت: پا چاوا هەکە وان ئەز دیتبام؟ گۆت: دێ بێژن: دا پتر پەرستنا تە کەن، و پتر تە مەزن دانن و دا پتر تە ژ کێماسییان پاك و پاقژ کەن، دێ بێژیت: چ دخوازن؟ گۆت: دێ**

**بێژن: داخوازا بەحەشتێ ژ تە دکەن، گۆت: دێ بێژیت: ما وان دیتییە؟ گۆت: دێ بێژن: نە ب خودێ یا پەروەردگار نەدیتییە، گۆت: دێ بێژیت: چاوا هەکە وان دیتبا؟ گۆت: دێ بێژن: هەکە دیتبا دا ل سەر رژدتر بن و دا پتر خوازن و دا دلێ وان پتر ل سەر بیت، گۆت: پاراستنا خۆ ژ چ دکەن؟ گۆت: دێ بێژن: خۆ ژ جەهنەمێ دپارێزن، گۆت: دێ بێژیت: ما وان دیتییە؟ گۆت: دێ بێژن: نە ب خودێ وان نەدیتییە، گۆت: دێ بێژیت: چاوا هەکە وان دیتبا؟ گۆت: دێ بێژن: هەکە دیتبا دا پتر ژێ رەڤن و دا پتر ژێ ترسن، گۆت: دێ بێژیت: ئەز هەوە دکەمە شاهد ب راستی من گونەهێت وان ژێ برن، گۆت: ملیاکەتەك ژ ملیاکەتان دێ بێژیت: بێڤان د ناڤ واندا نە ژ وانە و بەس ژ بەر هەوجەیەکێ یێ هاتییە دەڤ وان، گۆت: ئەو هندە روینشتینە روینشتییێ د گەل وان بەرهنگاری نەخۆشییێ نابیت).**

٢٢٠٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلأٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلأٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ شِبْراً تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعاً، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعاً تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعاً، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً). [خ٧٤٠٥/ م٢٦٧٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودایێ هەر ب هێز و مەزن دبێژیت: ئەز یێ ل دویڤ هزرا بەندەیێ من ب من، و ئەز یێ د گەل وی هەر جهێ ئەو بیرا خۆ ل من بینیت، ڤێجا هەکە ئەو د دلێ خۆدا بیرا من ل خۆ بینیت، ئەز دێ ژێ قەبویل کەم، و هەکە زکرێ من ل دیوانەکێ بکەت، ئەز دێ بەحسێ وی ل دیوانەکا باشتر کەم، و ئەگەر ئەو ب بهۆستەکێ ب گوهدارییێ خۆ نێزیکی من کر، ئەز دێ ب گەزەکێ ب دلۆڤانییێ خۆ نێزیك کەم، هەکە ب گەزەکێ ب گوهدارییێ خۆ نێزیکی من کر، ئەز دێ ب قایمەکێ ب دلۆڤانییێ خۆ نێزیك کەم، و هەکە خۆ ل سەر گوهدارییا خۆ راگرت، خێرا من ب لەز دێ بۆ هێت و ئێتە نڤیسین)[1].**

(١) ئانکو: ئەو چەند خۆ نێزیکی من بکەت ئەز دێ پتر خێرا دەمێ هەتا خێرێ بۆ ژ ئێکێ دکەمە دەھ و دەھا بۆ دکەمە حەفت سەد و پتر.

٢٢٠٣ - (ق) وَعَنْهُ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ للهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْماً، مِائَةً إِلاَّ وَاحِداً، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الجَنَّةَ**). [خ٢٧٣٦/ م٢٦٧٧].

**و ژ وى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستى خودێ نۆت و نەه ناڤ یێت هەین، سەد كێم ئێك، هەر كەسێ ژبەر بكەت و باوەرییێ پێ بینیت و كار پێ بكەت ئەو چۆ بەحەشتێ).**

٢٢٠٤ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: خَرَجَ مُعَاوِيَةُ عَلَى حَلَقَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: مَا أَجْلَسَكُمْ؟ قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللهَ. قَالَ: آللهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ؟ قَالُوا: وَاللهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَمَا كَانَ أَحَدٌ بِمَنْزِلَتِي مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَقَلَّ عَنْهُ حَدِيثاً مِنِّي، وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَرَجَ عَلَى حَلَقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: (**مَا أَجْلَسَكُمْ**) ؟ قَالُوا: جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللهَ وَنَحْمَدُهُ عَلَى مَا هَدَانَا لِلإِسْلاَمِ، وَمَنَّ بِهِ عَلَيْنَا. قَالَ: (**آللهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ**) ؟ قَالُوا: وَاللهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: (**أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ، وَلَكِنَّهُ أَتَانِي جِبْرِيلُ فَأَخْبَرَنِي: أَنَّ اللهَ عزّ وجل يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلاَئِكَةَ**). [م٢٧٠١].

**ژ ئەبى سەعیدێ خودرى (رضي الله عنه)، گۆت: معاویە (رضي الله عنه) چۆ دەڤ خەلەكەكى ل مزگەفتێ، ئینا گۆت: چ هوین داینە روینشتن؟ گۆتن: ئەم یێت روینشتین زكرێ خودێ دكەین. گۆت: هوین ب خودێ كەن چ هوین نەداناینە ئەو نەبیت؟ گۆتن: بۆ هندێ نەبیت ئەم نەروینشتینە خوارێ، گۆت: بزانن ب راستى من هوین نەداینە سویندێ ژبەر كو هوین جهێ گۆمانێنە و كەس ژ من كێمتر حەدیس نەبوو ژ یێت وەكى من نێزیكى پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)،[1] ب راستى پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ دەڤ خەلەكەكا هەڤالێت خۆ، گۆتە وان: (چ هوین داینە روینشتن)؟ گۆتن: ئەم یێت روینشتین زكرێ خودێ دكەین و شوكر و حەمدا وى دكەین ل سەر راستەرێكرنا وى بۆ مە بۆ ئیسلامێ و ئەو منەت د گەل مە كرى. گۆت: (هوین ب خودێ كەن چ هوین نەداناینە خوارێ ئەو نەبیت)؟ گۆتن: ب خودێ بۆ هندێ نەبیت ئەم نەروینشتینە خوارێ، گۆت: (بزانن ب راستى من هوین نەداینە سویندێ ژبەر كو هوین جهێ گۆمانێنە، بەلێ جبریل هاتە دەڤ من گۆتە من: ب راستى، خودێ خۆ د ناڤ ملیاكەتاندا ب هەوە مەزن دكەت).**

(١) جارەكێ ئەو ئێك ژ نڤیسەرێت وەحییێ بوو، و یا دووێ برایێ نوم حەبیبە بوو دایكا موسلمانان.

٢٢٠٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: **(لاَ يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللهَ عزّ وجل ؛ إِلاَّ حَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ)**. [م٢٧٠٠].

**ژ ئەبی هورەیرە و ئەبی سەعیدی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆتن: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە هندە كەس روینن خوارێ و زكرێ خودێ بكەن هەكە ملیاكەتێت[1] دۆرمەندۆری وان نەگرن، و دلۆڤانی ب سەر واندا نەهێت[2] و دلرەحەتی ب سەر واندا نەئێتە خوارێ و خودێ بەحسێ وان ل نك ئەوێت ل دەڤ خۆ نەكەت).**

## ٢ ـ باب: فضل دوام الذكر.

## بابەتێ: خێرا بەردەوامبوونا ل سەر زكرێ.

٢٢٠٦ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَذْكُرُ اللهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ. [م٣٧٣].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەمی وەختێ خۆ و د هەمی كراساندا زكرێ خودێ دكر.**

٢٢٠٧ - (م) عَنْ حَنْظَلَةَ الأُسَيِّدِيِّ. وَكَانَ مِنْ كُتَّابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). قَالَ: لَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: كَيْفَ أَنْتَ يَا حَنْظَلَةُ؟! قالَ: قُلْتُ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ. قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ! مَا تَقُولُ؟ قالَ: قُلْتُ: نَكُونُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، يُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالْجَنَّةِ، حَتَّى كَأَنَّا رَأْيَ عَيْنٍ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالأَوْلاَدَ وَالضَّيْعَاتِ، فَنَسِينَا كَثِيراً. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَوَاللهِ! إِنَّا لَنَلْقَى مِثْلَ هَذَا. فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ، حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، قُلْتُ: نَافَقَ حَنْظَلَةُ يَا رَسُولَ اللهِ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(وَمَا ذَاكَ)** ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! نَكُونُ عِنْدَكَ، تُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالْجَنَّةِ، حَتَّى كَأَنَّا رَأْيَ عَيْنٍ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِكَ، عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالأَوْلاَدَ وَالضَّيْعَاتِ، نَسِينَا كَثِيراً. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! إِنْ لَوْ تَدُومُونَ عَلَى مَا تَكُونُونَ عِنْدِي، وَفِي الذِّكْرِ، لَصَافَحَتْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ عَلَى فُرُشِكُمْ وَفِي طُرُقِكُمْ، وَلكِنْ، يَا حَنْظَلَةُ! سَاعَةً وَسَاعَةً)** ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. [م٢٧٥٠].

**ژ حەنزەلەیێ ئوسەیدی، ئێك ژ نڤیسەرێت پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) گۆت: ئەبوبەكر (رضي الله عنه) گەهشتە من، گۆت: تو یێ چاوانی یا حەنزەلە؟ من گۆت: حەنزەلە**

---

(١) نەو ملیاكەتێت ل خەلەكێت زكری دگەڕن.

(٢) نانكو: دلۆڤانی وان هەمیان نەگریت.

یێ بوویە دوڕوی، گۆت: پاکی و پاقژی بۆ خودێ بن ئەڤە تو چ دبێژی؟ من گۆت: وەختێ ئەم ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بیرا مە ل بەحەشتێ و جەهنەمێ دئینیت، هەروەکی ئەم ب چاڤێت خۆ دبینین، و هەکە ئەم ژ دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەرکەفتین ئەم ژنێت خۆ و عەیالێت خۆ و ژیارا خۆ چارەسەر دکەین ئەم گەلەك ژبیر دکەین، ئەبوبەکری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ب خودێ کەمە ئەز ژی یێ وەسامە، ئەز و ئەبوبەکر چۆین، هەتا ئەم چۆینە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، من گۆت: حەنزەلە یێ بوویە دوڕوی یا پێغەمبەرێ خودێ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ئەو چاوایە؟ من گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ، وەختێ ئەم ل دەڤ تە تو بیرا مە ل بەحەشتێ و جەهنەمێ دئینی، هەروەکی ئەم ب چاڤێت خۆ دبینین، و هەکە ئەم ژ دەڤ تە دەرکەفتین ئەم ژنێت خۆ و عەیالێت خۆ و ژیارا خۆ چارەسەر دکەین ئەم گەلەك ژبیر دکەین، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وی کەمە یێ رحا من د دەستیدا هەکە هوین ل سەر وێ بن یا هوین ل دەڤ من ل سەر و ژ زکری د بەردوام بانە، دا ملیاکەت ل سەر جهێت هەوە و د رێکێت هەوەدا هێنە دەستێت هەوە، بەلێ یا حەنزەلە سەعەتەك ب سەعەتەکێ (ئانکو: سەعەتەکێ هۆسا و سەعەتەکێ هۆسا) سێ جاران گۆت).

٢٢٠٨ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ شَرَائِعَ الْإِسْلاَمِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ، فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ، قَالَ: (لاَ يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْباً مِنْ ذِكْرِ اللهِ عزّ وجل).[ت٣٣٧٥/ جه٣٧٩٣].

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ کوڕێ بوسری (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکی گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ، ب راستی فەرمانێت ئیسلامێ بوونە گەلەك، بۆ من تشتەکی بێژە ئەز خۆ پێڤە بگرم، گۆت: (بلا بەردوام ئەزمانێ تە ب زکرێ خودێ یێ تەڕ بیت).

٢٢٠٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزاً مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ؛ إِلاَّ أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذلِكَ).[خ٣٢٩٣/ م٢٦٩١].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ د رۆژەكێدا سەد جاران بێژیت: چو خودێ و پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت چو هەڤال و هۆگر بۆ نینن، هەمی مولك و سەرومری و پەسن و حەمد بۆ وینە و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە، دێ بۆ بیتە بەرامبەر ئازاكرنا دەه بەندیان و سەد خێر دێ بۆ هێنە نڤیسین، و سەد گونەه دێ بۆ ئێنە ژێبرن، و دێ بۆ بیتە پاراستن ژ شەیتانی وێ رۆژا وی هەتا لێ دبیتە ئێڤار، و كەس ب یا ژ وی ئیناى باشتر نائێت زەلامەك نەبیت پتر ژ وی گۆتبیت).**

٣ ـ باب: فضل التهليل.

**بابەتێ: خێرا گۆتنا (لا إله إلا الله).**

٢٢١٠ - (ق) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ قَالَ عَشْراً كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ). [خ٦٤٠٤/ م٢٦٩٣].

- ولفظ مسلم: (مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، عَشْرَ مِرَارٍ، كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ أَرْبَعَةَ أَنْفُسٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ).

ژ ئەبی ئەیووبێ ئەنساری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ دەه جاران بێژیت هەروەكی گەردەنا كورەكێ ئیسماعیلی ئازا كری).**

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: (هەر كەسێ دەه جاران بێژیت:** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير) **چو خودێ و پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت، چو هەڤال و هۆگر بۆ نینن، هەمی مولك و سەرومری و پەسن و حەمد بۆ وینە و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە، ئەو وەكی وییە یێ چار ژ زارۆكێت ئیسماعیلی ئازاكرین).**

٢٢١١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، مَنْ قَالَهَا عَشْرَ مَرَّاتٍ حِينَ يُصْبِحُ، كُتِبَ لَهُ بِهَا مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَ عَنْهُ بِهَا مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ عَدْلَ رَقَبَةٍ، وَحُفِظَ بِهَا يَوْمَئِذٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَمَنْ قَالَ مِثْلَ ذَلِكَ حِينَ يُمْسِي، كَانَ لَهُ مِثْلُ ذَلِكَ). [حم٨٧١٩].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ بێژیت: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) چو خودێ و پەرستی بێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت، چو هەڤال و هۆگر بۆ نینن، هەمی مولك و سەروەری و پەسن و حەمد بۆ وینە و ئەو ل سەر هەمی تشتان یێ خودان شیانە، دەه جاران دەمێ سپێدە لێ دبیت سەد خێر دێ بۆ پێ ئێنە نڤیسین، و سەد گونەه دێ بۆ پێ ئێنە ژێبرن، دێ بۆ بیتە بەرامبەر ئازاکرنا بەندیەکی، و دێ پێ ئێتە پاراستن هەتا لێ دبیتە ئێڤار، و یێ هەر وێ بێژیت ئەگەر لێ بوو ئێڤار، هەر هندی وێ دێ بۆ وی بیت).**

٢٢١٢ – عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ حَدَّثَهُ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ لَهُ: **(يَا مُعَاذُ بْنَ جَبَلٍ)**، قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: **(لاَ يَشْهَدُ عَبْدٌ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، ثُمَّ يَمُوتُ عَلَى ذَلِكَ؛ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ)** قَالَ: قُلْتُ: أَفَلاَ أُحَدِّثُ النَّاسَ؟ قَالَ: **(لاَ، إِنِّي أَخْشَى أَنْ يَتَّكِلُوا عَلَيْهِ)**. [حم٢٢٠٠٩].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

[وانظر حديث البطاقة: ١٩٤].

و ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: مەعازی گۆتە وی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: **(یا مەعازێ کورێ جەبەلی)**، گۆت: لەبێ دویڤ لەبێ و هاریکاری دویڤ هاریکارییێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(نینە بەندیەك راست ژ دلێ خۆ شەهدە بدەت کو ب راستی چو پەرستی بێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت، پاشی بمریت، ئەگەر خودێ وی نەبەتە بەحەشتێ)**، گۆت: ئەز ڤێ بۆ خەلکی نەبێژم؟ گۆت: **(نە، دێ خۆ ب هیڤییا هندێڤە هێلن).**

## ٤ ـ باب: فضل التسبيح والتحميد والتكبير.

## بابەتێ: خێرا (سبحان الله) و (الحمد لله) و (الله اکبر).

٢٢١٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ**).[خ٦٤٠٥/ م٢٦٩١، ٢٦٩٢].

وفي رواية لمسلم: (**مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ، لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ؛ إِلاَّ أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ، أَوْ زَادَ عَلَيْهِ**). [م٢٦٩٢].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ د رۆژەكێدا سەد جاران بێژیت، (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ) ئەز خودێ ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ دكەم و ب هاریكارییا وی، (یان: پاكی و پاقژی و حەمد و پەسن بۆ خودێ بن)، گونەهێت وی هاتنە ژێبرن خۆ هەكە وەكی كەفزا دەریایێ بن).**

- و د ڤەگێرا موسلمیدا: **(هەر كەسێ لێ بوو ئێڤار یان لێ بوو سپێدە سەد جاران بێژیت: ئەز خودێ ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ دكەم و ب هاریكارییا وی، (یان: پاكی و پاقژی و حەمد و پەسن بۆ خودێ بن) كەس رۆژا قیامەتێ ناهێت ب یا ژ وی چێتر ئێك نەبیت وەكی وی گۆتبیت یان ژ وی زێدەتر گۆتبیت).**

٢٢١٤ - (ق) وعَنْهُ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (كَلِمَتَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ).[خ٧٥٦٣ (٦٤٠٦)/ م٢٦٩٤].

و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دو پەیڤ ل سەر ئەزمانی سڤكن و د ترازییێدا گرانن و بۆ خودایێ دلۆڤان خۆشتڤینە: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ)، ئەز خودێ ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ دكەم و ب هاریكارییا وی، ئەز خودێ مەزن ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ دكەم. (یان: پاكی و پاقژی و حەمد و پەسن بۆ خودێ بن، (سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ) پاكی و پاقژی بۆ خودایێ مەزن بن).**

٢٢١٥ - (م) وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لأَنْ أَقُولَ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ). [م٢٦٩٥].

و ژ وی، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەكە ئەز بێژم :سبْحانَ اللَّهِ، پاكی و پاقژی بۆ خودێ بیت، وَالحَمْدُ للَّهِ، و هەمی سوپاسی بۆ خودێ، ولا إِلَه إلاَّ اللَّه، و چو خودێ و پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت، وَاللَّه أكبرُ، و خودێ یێ مەزنە، خۆشڤیترە بۆ من ژ هەر تشتێ رۆژ لێ بدەت).**

٢٢١٦ - (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ) ؟ فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ: كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ؟ قَالَ: (يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ، فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ، أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ). [م٢٦٩٨].

ژ سەعدێ كورێ ئەبی وەققاسی (رضي الله عنه)، گۆت: ئەم ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ)، گۆت: **(ما ئێك ژ هەوە نەشێت هەرۆژ هزار خێران ب دەست خوڤە بینیت)**، پرسیارکەرەكێ روینشتی ل دەڤ پرسیار ژێ كر، چاوا دێ گەهیتە هزار خێران، گۆت: **(سەد جارن خودێ ژ كێم و كاسییان پاك و پاقژ بكەت (بێژیت: سبحان الله)، هزار خێر دێ بۆ هێنە نڤیسین یان هزار گونەه دێ بۆ هێنە ژێبرن)**.

٥ ـ باب: التسبيح أول النهار وعند النوم.

**بابەتێ: (سبحان الله) گۆتن ل سەرێ رۆژێ و ل دەمێ نڤستنێ.**

٢٢١٧ - **(ق)** عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه: أَنَّ فَاطِمَةَ رضي الله عنها اشْتَكَتْ مَا تَلْقَى مِنَ الرَّحى مِمَّا تَطْحَنُ، فَبَلَغَهَا أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أُتِيَ بِسَبْيٍ، فَأَتَتْهُ تَسْأَلُهُ خَادِماً فَلَمْ تُوَافِقْهُ، فَذَكَرَتْ لِعَائِشَةَ، فَجَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَذَكَرَتْ ذلِكَ عَائِشَةُ لَهُ، فَأَتَانَا وَقَدْ دَخَلْنَا مَضَاجِعَنَا، فَذَهَبْنَا لِنَقُومَ، فَقَالَ: **(عَلَى مَكَانِكُمَا)**، حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْهِ عَلَى صَدْرِي، فَقَالَ: **(أَلاَ أَدُلُّكُمَا عَلَى خَيْرٍ مِمَّا سَأَلْتُمَاهُ، إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا: فَكَبِّرَا اللهَ أَرْبَعاً وَثَلاَثِينَ، وَاحْمَدَا ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ، وَسَبِّحَا ثَلاَثاً وَثَلاَثِينَ، فَإِنَّ ذلِكَ خَيْرٌ لَكُمَا مِمَّا سَأَلْتُمَاهُ)**. [خ٣١١٣/ م٢٧٢٧].

ژ عەلی (رضي الله عنه)، گۆت: فاتیمایێ (رضي الله عنها) گازندە ژ بەر دستاری و تشتێ دهێرا كر، و گەهشتە وێ هندە كۆلە بۆ پێغەمبەرێ خودێ یێت هاتین، ئینا هاتە دەڤ داخوازا خزمەتكاركی ژێ بكەت، بەلێ نەدیت، ئینا ئەڤە بۆ عائیشایێ گۆت، پێغەمبەر (ﷺ) هات و عائیشایێ گۆتێ، ئینا هاتە دەڤ مە و هاتە سەر نڤینێت مە، مە كارێ خۆ كر رابین، گۆت: **(ل جهێت خۆ بن)** هەتا من هەست ب تەزاتییا پێت وی ل سەر سینگێ خۆ كری، ئینا گۆت: **(هەوە دڤێت باشتر ژ وێ یا هەوە هەردوكان داخواز كری نیشا هەوە بدەم؟ هەكە هوین چۆنە سەر نڤینێت خۆ یان ژی هەكە هەوە جهێت خۆ گرتن، سیه و چوار جاران خودێ مەزن بدانن (بێژن: الله اكبر) و سیه و سێ جاران خودێ ژ كێم و كاسییان پاك و پاقژ بكەن (بێژن: سبحان الله) و سیه و سێ جاران شوكرا خودێ بكەن (بێژن: الحمد لله)، ئەڤە ژ وێ باشترە یا هەوە هەردوكان داخواز كری)**.

٢٢١٨ - **(م)** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ جُوَيْرِيَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا بُكْرَةً حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ، وَهْيَ فِي مَسْجِدِهَا، ثُمَّ رَجَعَ بَعْدَ أَنْ أَضْحَى، وَهْيَ جَالِسَةٌ، فَقَالَ: **(مَا زِلْتِ عَلَى الْحَالِ الَّتِي**

فَارَقْتُكِ عَلَيْهَا) ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ). [م٢٧٢٦].

ژ جوەیریایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) سپێدێ ژ دەڤ وێ دەركەفت پشتی نڤێژا سپێدێ كری و ئەو ل جهێ خۆ یێ نڤێژان بوو، پاشی زڤڕی پشی چۆیە د تێشتەگەهێدا و ئەو یا روینشتی بوو، گۆت: **(هێژ تو یا وەسایی وەكی من تو هێلای)؟** گۆت: بەلێ، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی پشتی تە من چار پەیڤ سێ جاران پێت گۆتین هەكە بێنە بەرامبەركرن د گەل یا ئەڤە تە ژ سپێدێ وەرە گۆتی، دێ بەرامبەر هێن: ئەز خودێ ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ دكەم و ب هاریكارییا وی، ب هەژمارا چێكرییێت وی و هندی ئەو رازی و هندی عەرشێ وی و هندی پەیڤێت وی).**

٦ ـ باب: فضل (لا حول ولا قوة إلاَّ بالله).

**بابەتێ: خێرا (لا حول ولا قوه الا بالله).**

٢٢١٩ – عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ) ؟ قُلْتُ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ). [جه٣٨٢٥].

* صحيح.

ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: **(ئەز خزینەكێ ژ خزینێت بەحەشتێ نیشا تە نەدەم)؟** من گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(چو بزاڤ و شیان و چو هێز نینن ب خودێ نەبن).**

٧ ـ باب: رضيت بالله رباً.

**بابەتێ: رازیمە خودێ پەروەردگارێ من بیت.**

٢٢٢٠ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ قَالَ: رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً، وَبِالْإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ). [د١٥٢٩].

* صحيح.

[وانظر: ٣٨].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ بێژیت: ئەز ب خودێ رازیمە خودان، و ب ئیسلامێ دین، و ب موحەممەدی پێغەمبەر، بەحەشت بۆ هاتە نڤیسین).**

## ٨ ـ باب: عقد التسبيح باليد.

### بابەتێ: هەژمارتنا تەسبیحان ب دەستی.

٢٢٢١ – عَنْ يُسَيْرَةَ بِنْتِ يَاسِرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَمَرَهُنَّ أَنْ يُرَاعِينَ بِالتَّكْبِيرِ وَالتَّقْدِيسِ وَالتَّهْلِيلِ، وَأَنْ يَعْقِدْنَ بِالْأَنَامِلِ، فَإِنَّهُنَّ مَسْؤولاَتٌ مُسْتَنْطَقَاتٌ. [د١٥٠١/ ت٣٥٨٣].

* حسن.

**ژ یوسەیرەیا کچا یاسری (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان ل وان کر ئەو تەکبیر** (الله اكبر) **و تەقدیس** (سبحان الملك القدوس أو سبوح قدوس رب الملائكة والروح) **و تەهلیلێ** (لا إله إلا الله) **بپارێزن، و ب تلان بهەژمێرن، چونکی ب راستی تل بەرپرسن و ئاخفتنکەرن)[1].**

٢٢٢٢ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَعْقِدُ التَّسْبِيحَ.[د١٥٠٢/ت٣٤١١/ن١٣٥٤].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت ب تلان تەسبیح (سبحان الله) دکر.**

## ٩ ـ باب: المجلس الذي لا يذكر الله فيه.

### بابەتێ: ئەو دیوانا زکرێ خودێ تێدا نەهێتە کرن.

٢٢٢٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَا مِنْ قَوْمٍ يَقُومُونَ مِنْ مَجْلِسٍ لاَ يَذْكُرُونَ اللهَ فِيهِ؛ إِلاَّ قَامُوا عَنْ مِثْلِ جِيفَةِ حِمَارٍ، وَكَانَ لَهُمْ حَسْرَةً).** [د٤٨٥٥].

* صحيح.

[وانظر: ٢٢٧٦، ٣٤٣٠].

---

(١) ئانکو: رۆژا قیامەتێ دێ پرسیار ژ وان هێتە کرن چ پێ هاتییە کرن و چ پێ هاتییە گۆتن، و ب فەرمانا خودێ دێ ئاخفن و شەهدەییێ بۆ خودانێ خۆ یان ل سەر وی ددەن.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نینە هندە مرۆڤ روینشتنەكێ روینە خوارێ و زكرێ خودێ تێدا نەكەن و خودێ ل بیرا خۆ نەئینن، هەكە ئەو نەرابن هەروەكی ل سەر كەلەخەكێ وەكی یێ كەری رادبن و ئەو روینشتن دێ بۆ وان بیتە پەشێمانی).**



## الفصل الثاني: فضل الدعاء

## پشکا دووێ : خێرا دوعایێ.

### ١ ـ باب: لكل نبي دعوة مستجابة.

### بابەتێ: هەر پێغەمبەرەکی دوعایەکا قەبویلکری یا هەی.

٢٢٢٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ يَدْعُو بِهَا، وَأُرِيدُ أَنْ أَخْتَبِئَ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي فِي الآخِرَةِ**). [خ٦٣٠٤/ م١٩٨].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بۆ هەر پێغەمبەرەکی دوعایەکا قەبویلکری هەبوو پێغەمبەران یا کری، و من دڤێت دوعا خۆ بۆ ئوممەتا خۆ ل ئاخرەتێ شەفاعەت هەلگرم).**

### ٢ ـ باب: دعاء النبي (ﷺ) لأُمّته

### بابەتێ: دوعا پێغەمبەری (ﷺ) بۆ ئوممەتا وی.

٢٢٢٥ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) تَلاَ قَوْلَ اللهِ عزّ وجل فِي إِبْرَاهِيمَ: ﴿ **رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا من الناس فَمَنْ تَبِعَنِي فإنه مِنِّي** ﴾ الآية [إبراهيم:٣٦]، وَقَالَ عِيسَى عليه السلام: ﴿ **إن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لهم فَإِنَّكَ أنت الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ** ﴾ [المائدة:١١٨] فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَقَالَ: (**اللَّهُمَّ أُمَّتِي أُمَّتِي**) وَبَكَى. فَقَالَ اللهُ عزّ وجل: يَا جِبْرِيلُ، اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ، وَرَبُّكَ أَعْلَمُ، فَسَلْهُ مَا يُبْكِيكَ؟ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ فَسَأَلَهُ، فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِمَا قَالَ، وَهُوَ أَعْلَمُ. فَقَالَ اللهُ: يَا جِبْرِيلُ، اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ فَقُلْ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ وَلاَ نَسُوؤُكَ. [م٢٠٢].

ژ عەبدوللایێ کورێ عەمرێ کورێ عاسی خودێ ژ هەردووان رازی بیت گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئاخفتنا خودێ یا د راستا ئیبراهیمیدا (عليه السلام) خواند: **(خودێوۆ ب راستی وان بوتان گەلەك مرۆڤ یێت سەردابرین، ڤێجا هەچییێ ل دویڤ من هات و رێکا من گرت ئەو ژ منە)**. و گۆتنا عیسایی (عليه السلام): **(ئەگەر تو وان ئیزا بدەی ئەو بەندەیێت تەنە، و ئەگەر تو ل وان نەگری ب راستی تو یێ دەستهەلاتدار و کاربنەجهی)**. پاشی دەستێت خۆ بلندکرن و گۆت: **(ئەی خودا ئوممەتا من ئوممەتا من)**، و کرە گری. خودایێ مەزن گۆت: ئەی جبریل هەرە دەڤ موحەممەدی، و خودایێ تە چێتر دزانیت، پرسیارا وی بکە ئەو بۆچی دکەتە گری؟ جبریل هاتە دەڤ و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ

**گۆت. و خودێ چێتر دزانیت، و خودێ گۆت: یا جبریل هەرە دەڤ موحەممەدی بێژێ: ئەم دێ تە د ئوممەتا تەدا رازی کەین، و دلێ تە ناهێلین.**

### ٣ ـ باب: العزم في المسألة.

### بابەتێ: رژدبوون د دوعاکرنێدا.

٢٢٢٦ – (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا دَعا أَحَدُكُمْ؛ فَلْيَعْزِمِ المَسْأَلَةَ، وَلاَ يَقُولَنَّ: اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِنِي، فَإِنَّهُ لاَ مُسْتَكْرِهَ لَهُ). [خ٦٣٣٨/ م٢٦٧٨].

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەکە ئێکی ژ هەوە دوعا کرن، بلا ئێکتا بکەت و دوعایێ سست نەکەت، و نەبێژیت: یا خودێ هەکە تە بڤێت، بدە من، چونکی ب راستی کەس نینە کۆتەکییێ لێ بکەت).**

### ٤ ـ باب: (ومطعمه حرام.. فأنّى يستجاب له).

### بابەتێ: و خوارنا وی یا حەرامە.. ڤێجا چاوا دێ ژێ هێتە قەبویلکرن.

٢٢٢٧ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّباً، وَإِنَّ اللهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ، فَقَالَ: ﴿يا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا من الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ [المؤمنون: ٥١]، وَقَالَ: ﴿ يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا من طَيِّبَاتِ ما رَزَقْنَاكُمْ ﴾[البقرة:١٧٢]. ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ، أَشْعَثَ أَغْبَرَ، يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ، يَا رَبِّ! يَا رَبِّ! وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ؟). [م١٠١٥].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(گەلی خەلکی، ب راستی خودێ یێ پاك و پاقژە ژ کێماسییان و یێ حەلال و پاك و پاقژ نەبیت قەبویل ناکەت، و خودێ فەرمانا باوەریداران ب وێ یا کری یا فەرمانا پێغەمبەران پێ کری، هەر یێ بلند گۆت: (گەلی پێغەمبەران ژ پاك و پاقژێ حەلال بخۆن، و کار و کریارێت باش بکەن). و هەر یێ بلند گۆت: (گەلی خودان باوەران ژ وی حەلالێ مە ب رزقێ هەوە کری بخۆن).** پاشی بەحسێ زەلامی کر یێ وەغەر درێژە و سەر ڤژەڤژە و تۆزەکییە، دەستێت خۆ بلند دکەتە عەسمانی خودێوۆ خودێوۆ و خوارنا وی یا حەرامە و ڤەخوارنا وی یا حەرامە و جلکێ وی یێ حەرامە، و ب حەرامی یێ رابووی، ڤێجا ما چاوا دێ ژێ هێتە قەبویلکرن).

٥ ـ باب: في الليل ساعة يستجاب الدعاء فيها.

**بابەتێ: د شەڤێدا دەمەك یێ هەی دوعا تێدا دهێنە قەبویلكرن.**

٢٢٢٨ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدِ اللهِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّ فِي اللَّيْلِ لَسَاعَةً، لاَ يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ، يَسْأَلُ اللهَ خَيْراً مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ؛ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ). [م٧٥٧].

ژ جابرى (ﷺ)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(د شەڤێدا دەمەك یێ هەی، نینە دوعایا مرۆڤەكێ موسلمان بكەڤیتە تێدا تشتەكی ژ خێرا دنیایێ و ئاخرەتێ بخوازیت هەكە خودێ نەدەتێ، و ئەڤە یا د هەمی شەڤاندا هەی).**

٦ ـ باب: يستجاب للعبد ما لم يعجل.

**بابەتێ: دێ بۆ بەندەی هێتە قەبویلكرن هندی لەزێ نەكەت.**

٢٢٢٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي). [خ٦٣٤٠/ م٢٧٣٥].

- وفي رواية لمسلم: قَالَ: (لاَ يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ، مَا لَمْ يَسْتَعْجِلْ). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الاِسْتِعْجَالُ؟ قَالَ: (يَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ، وَقَدْ دَعَوْتُ، فَلَمْ أَرَ يَسْتَجِيبُ لِي، فَيَسْتَحْسِرُ عِنْدَ ذَلِكَ، وَيَدَعُ الدُّعَاءَ).

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بەردەوام خودێ دێ دوعایا ئێك ژ هەوە قەبویل كەت هندی ئەو لەزێ نەكەت، بێژیت: من دوعا ژ خودایێ خۆ كرن، و ژ من قەبویل نەكرن).**

- **و د ڤەگێڕەكا موسلمیدا: (بەردەوام خودێ دوعایا بەندەیی قەبویل دكەت هندی ئەو دوعا ب گونەهێ یان ب بڕینا مرۆڤانییێ نەكەت، و هندی ئەو لەزێ نەكەت)**، گۆتنێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ لەزكرن چاوایە؟ گۆت: **(بێژیت: من دوعا كرن، و من دوعا كرن، و من نەدیت بۆ من هاتنە قەبویلكرن، ڤێجا هینگێ دێ وەستیت و دوعا دێ هێلیت).**

٧ ـ باب: أكثر دعاء النبي (ﷺ).

**بابەتێ: پترین دوعایا پێغەمبەری (ﷺ).**

٢٢٣٠ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَاءِ النَّبِيِّ (ﷺ): (اللَّهُمَّ! رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ). [خ٦٣٨٩ (٤٥٢٢)/ م٢٦٩٠].

ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: بارا پتر دوعا پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤە بوو: **(خودێوۆ د دنیایێدا باشی و خۆشییێ بدە مە، و ل ئاخرەتێ ژی باشی و خۆشییێ بدە مە، و مە ژ ئاگرێ جەهنەمێ بپارێزە).**

٢٢٣١ - وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: (**اللَّهُمَّ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ**)، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، تَخَافُ عَلَيْنَا، وَقَدْ آمَنَّا بِكَ وَصَدَّقْنَاكَ بِمَا جِئْتَ بِهِ؟! فَقَالَ: (**إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ عزّ وجل يُقَلِّبُهَا**). [ت٢١٤٠/ جه٣٨٣٤].

* صحيح.

و ژ وی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گەلەك دگۆت: **(ئەی خودا دلێ من ل سەر دینێ خۆ رابگرە)**، ئینا زەلامەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو ل سەر مە دترسی، و ب راستی مە باوەری یا ب تە ئینای و مە باوەری یا ب ئەوا تو پێ هاتی ئینای؟ ئینا گۆت: **(دل یێت د ناڤ دو تلێت پڕدلۆڤانێ هەر ب هێز و مەزندا وەردگێڕیت).**

## ٨ . باب: من دعائه (ﷺ).

## بابەتێ: ژ دوعایێت وی (ﷺ).

٢٢٣٢ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الْأَشْعَرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ: (**رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي، وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي كُلِّهِ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطَايَايَ، وَعَمْدِي وَجَهْلِي وَهَزْلِي، وَكُلُّ ذلِكَ عِنْدِي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**). [خ٦٣٩٨/ م٢٧١٩].

ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (ﷺ)، گۆت: **(پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤ دوعایە دکر: یا خودێ گونەها من ژ زانین و ژ نەزانین کری و زێدەگاڤییا من د کار و بارێ مندا ژێ ببە، و یا تو پێ ژ من ب ئاگەهتر، یا خودێ گونەهێت من ب رژد و ب ترانەڤە و خەلەتیڤە و ژ قەستا کرین ژێ ببە، و ئەڤە هەمی یێت ل دەڤ من، یا خودێ بۆ من بفەفرینە و ژێ ببە یا من ل پێشییا خۆ کری، و یا من ب پاش خۆڤە هێلایی، و یا من ب بەرزەییڤە کری و یا من ب ئاشکەرایی کری، و یا تو پێ ژ من ب ئاگەهتر، تێ پێ ئێکێ و پێ دویماهییێ هەر تویی، و تو ل سەر هەمی تشتان پێ دەستهەلاتدار و خودان شیانی).**

٢٢٣٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِيَ الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي، وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرٍّ**). [م٢٧٢٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د گۆت: (خودێوۆ دینێ من بۆ من راست و دورست بكە ئەوێ پاراستنا من تێدا، و دنیا من بۆ من خۆش بكە ئەوا ژیارا من تێدا، و ئاخرەتا من بۆ من باش بكە ئەوا ڤەگەڕیانا من تێدا، و ژیانێ بۆ من بكە ئەگەرێ هندێ هەمی خێر ل من زێدە ببن، و مرنێ بۆ من بكە رەحەتی ژ هەمی خرابییان).**

٢٢٣٤ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى**). [م٢٧٢١].

**ژ ئیبن مەسعودی، (ﷺ)، پێغەمبەری (ﷺ) دگۆت: (ئەی خودا ئەز داخوازا راستەڕێیی و تەقوا و پارێزكاری و دەهمەن پاقژی و بێمنەتی و زەنگینییێ ژ تە دكەم).**

٢٢٣٥ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): (**اللَّهُمَّ! إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ**). [م٢٧٣٩].

**ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: ژ دوعا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە بوو: (خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ نەمانا كەرەمێت تە و ژ نەمانا سلامەتییا تە، و ژ هاتنا ئیزایا تە یا ژ نیشكەكێڤە دئێت، و ژ هەمی كەربا تە).**

٢٢٣٦ - (م) عَنْ سَعْدِ بْنِ طَارِقِ بْنِ أَشْيَمَ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) وَقَدْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ أَقُولُ حِينَ أَسْأَلُ رَبِّي؟ قَالَ: (**قُلْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي**). وَجَمَعَ أَصَابِعَهُ الْأَرْبَعَ إِلاَّ الْإِبْهَامَ. (**فَإِنَّ هَؤُلاَءِ يَجْمَعْنَ لَكَ دِينَكَ وَدُنْيَاكَ**). [م٢٦٩٧/ جه٣٨٤٥].
[وانظر: ٢٢٥٢].

**ژ سەعدێ كوڕێ تارقێ كوڕێ ئەشیەمی ژ بابێ خۆ (ﷺ) وی گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) و زەلامەك هاتبوو دەڤ و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز چ بێژم ئەگەر من داخواز ژ خودایێ خۆ كر؟ گۆت: (بێژە: ئەی خودا گونەهێت من ژێ ببە و دلۆڤانییێ ب**

**من ببە و من سلامەت بکە و رزقێ من بدە)، هەر چوار تلێت خۆ هەژمارتن یا بەرانی نەبیت ( ب راستی ئەڤە دین و دنیا تە بۆ تە کۆم دکەن).**

٢٢٣٧ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَلَّمَهَا هَذَا الدُّعَاءَ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ**، عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ، عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَاذَ بِهِ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَسْأَلُكَ أَنْ تَجْعَلَ كُلَّ قَضَاءٍ قَضَيْتَهُ لِي خَيْراً). [جه٣٨٤٦].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤ دوعایە نیشا وێ دا: (یا خودێ ئەز داخوازا هەمی خێر و باشییان ژ تە دکەم، یا دویر و یا نێزیك یا ئەز دزانم و یا ئەز نەزانم، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ هەمی خرابییێ، یا دویر و یا نێزیك، یا ئەز دزانم و یا ئەز نەزانم. و ئەز داخوازا وێ خێرێ ژ تە دکەم یا بەندەیێ تە و پێغەمبەرێ تە ژ تە خواستی، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ وێ خرابیا بەندەیێ تە و پێغەمبەرێ تە ژ تە خواستی تو ژێ بپارێزی، ئەی خودا ئەز داخوازا بەحەشتێ ژ تە دکەم و هەر تشتێ مرۆڤی نێزیکی بەحەشتێ دکەت ژ گۆتن و کریاران، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ جەهنەمێ و هەر تشتێ مرۆڤی نێزیکی وێ دکەت ژ گۆتن و کریاران، و ئەز داخوازێ ژ تە دکەم هەر قەزایەکا تە بۆ من نڤیسی یا خێرێ بیت).**

## ٩ ـ باب: الدعاء عند النوم والاستيقاظ.

## بابەتێ: دوعا ل دەمێ نڤستنێ و هشیاربوونێ.

٢٢٣٨ - (ق) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ، فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلِ: اللَّهُمَّ! أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَى مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ. اللَّهُمَّ! آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ، فَأَنْتَ عَلَى الْفِطْرَةِ، وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ**). قَالَ: فَرَدَّدْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَلَمَّا بَلَغْتُ: اللَّهُمَّ! آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، قُلْتُ: وَرَسُولِكَ، قَالَ: (**لاَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ**). [خ٢٤٧/ م٢٧١٠].

ژ بەرائێ كورێ عازبی (ﵔ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، گۆت: **(ئەگەر تو چۆیە سەر نڤینێت خۆ، دەستنڤێژێ بگرە و خۆ ل سەر تەنشتا راستێ درێژ بكە و پاشی بێژە: یا خودێ من خۆ سپارتە تە و من خۆ تەسلیمی فەرمانا تە كر، و من بەرێ دلێ خۆ و ئاراستەیا خۆ دا تە (یان مەخسەدا من ب پەرستنا من توویی)، و من كار و بارێت خۆ ب هیڤییا تەڤە هێلان، و من پشتا خۆ ب تە گەرم كر و راست كر، د هیڤییێت دلۆڤانییا تەدا و د ترسێت ئیزایا تەدا، ب راستی زڤرین و رەڤین ژ تە نینە هەر بۆ دەڤ تە نەبیت، من باوەری ب وێ كتێبا تە ئینایە خوارێ و ب پێغەمبەرێ تە هنارتی ئینا، ئەگەر تو د شەڤا خۆدا مری تو ل سەر ئیسلامێ مری و ڤان بكە دویماهی ئاخفتن تو پێ دئاخڤی)** گۆت: ئینا بۆ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: هەتا ئەز گەهشتیمە: ئەی خودێ من باوەری ب كتێبا تە ئینا یا تە ئینایە خوارێ، من گۆت: و (رسولك) گۆت: **(نە، (ونبيك) پێ تە هنارتی).**

٢٢٣٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ؛ فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُ: بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ).** [٦٣٢٠/ م٢٧١٤].

ژ ئەبی هورەیرە (ﵔ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەكە ئێك ژ هەوە چۆ سەر نڤینێت خۆ بلا ب لێڤكا ئیزارێ خۆ داڤوتیت، ئەو نوزانیت چ كەتییە سەر، پاشی بلا بێژیت: ب ناڤێ تە خودایێ من، (ئانكو ب تە و ب هاریكاری و ب هێزا تە) من تەنشتا خۆ دانا و ب تە ئەز دێ راكەم، هەكە تە ئەز مراندم و جانێ من كێشا دلۆڤانییێ پێ ببە، و هەكە تە بەردا و تە هێلا بپارێزە ب وێ یا تو بەندەیێت خۆ پێت راستكار دپارێزی).**

٢٢٤٠ - (خ) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ، وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ خَدِّهِ، ثُمَّ يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ! بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا)**. وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: **(الحَمْدُ للهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَمَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ).** [خ٦٣١٤ (٦٣١٢)].

ژ حوزەیفەی (ﵔ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ دچۆ سەر نڤینێت خۆ دەستێ خۆ ددانا بن روییێ خۆ و دگۆت: **(ئەی خودا ب تە ئەز دنڤم و رادبم).** و دەمێ

**رادبوو دگۆت: (حەمد و شوكر بۆ خودێ ئەوێ ئەم هشیاركرین پشتی ئەم نڤاندین، و زڤڕین هەر بۆ دەڤ وییە).**

٢٢٤١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ رضي الله عنه قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مُرْنِي بِكَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ إِذَا أَصْبَحْتُ وَإِذَا أَمْسَيْتُ، قَالَ: (**قُلْ: اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ**). قَالَ: (**قُلْهَا إِذَا أَصْبَحْتَ، وَإِذَا أَمْسَيْتَ، وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ**).

- ولفظ الترمذي: (**اللَّهُمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، فَاطِرَ..**). [د٥٠٦٧/ ت٣٣٩٢/ مي٢٧٣١]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، گۆت: ئەبوبەكری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەمرێ من ب هندە ئاخفتنان بكە هەكە ل من بوو سپێدە یان ل من بوو ئێڤار ئەز بێژم، ئینا گۆت: بێژە: (ئەی خودا چێكەرێ عەرد و عەسمانان زانایێ نهێنی و بەرچاڤان، خودان و سەروەرێ هەمی تشتان، ئەز شادەییێ ددەم چو خودایێت ڕاست و دورست و هەژی نینن تو نەبی، ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خارابییا شەیتانی و تۆڕ و داڤكێت وی). گۆت: (ڤێ بێژە هەكە ل تە بوو سپێدە یان ل تە بوو ئێڤار یان تو چوویە سەر جهێت خۆ).**

- **و بێژەیا ترمزی: (ئەی خودا زانایێ نهێنی و بەرچاڤان چێكەرێ .....)**

## ١٠ ـ باب: سؤال الهداية والسداد.

## بابەتێ: داخوازییا ڕاستەڕێ و ڕاستكرنێ.

٢٢٤٢ – (م) عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**قُلْ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي وَسَدِّدْنِي، وَاذْكُرْ بِالْهُدَى هِدَايَتَكَ الطَّرِيقَ، وَالسَّدَادِ سَدَادَ السَّهْمِ**). [م٢٧٢٥].

[وانظر: ٧٢].

**ژ عەلی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من (بێژە: ئەی خودا من ڕاستەڕێ بكە، و من ناڤنجی و دورستی خوازێ نەزێدەكەر و نەكێمكەر ڕابگرە و ب ڕاستەڕێییێ بیرا خۆ ل ڕاستەڕێیا خۆ بۆ ڕێكێ بینە و ب ڕاستكرنێ بیرا خۆ ل ڕاستییا تیرێ بینە).**

## ١١ ـ باب: الدعاء إذا نزل منزلاً.

## بابەتێ: دوعایا ئەگەر ل جهەكی دانا.

٢٢٤٣ – (م) عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ حَكِيمٍ السُّلَمِيَّةِ: أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِذَا نَزَلَ أَحَدُكُمْ مَنْزِلاً؛ فَلْيَقُلْ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، فَإِنَّهُ لاَ يَضُرُّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْهُ).[م٢٧٠٨].

ژ خەولا كچا حەكیمی یا سولەمی (رضي الله عنها)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(هەر كەسێ دانا جهەكی، پاشی بێژیت: ئەز خۆ ب پەیڤێت خودێ یێت تمام و بێ كێماسی دپارێزم ژ خرابییا تشێ وی دایی، چو تشت زیانێ ناگەهیننێ هەتا ژ وی جهێ خۆ دچیت).**

## ١٢ ـ باب: الدعاء عند الكرب.

## بابەتێ: دوعا ل تەنگاڤییێ.

٢٢٤٤ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَرَبُّ الأَرْضِ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ). [خ٦٣٤٦ (٦٣٤٥)/ م٢٧٣٠]

ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) د نەخۆشییێدا دگۆت: **(چو پەرستییێت دورست و هەژی نینن خودێ مەزن و نەرم و حەلیم نەبیت، چو پەرستییێت دورست و هەژی نینن خودانێ عەرشێ مەزن نەبیت، چو پەرستییێت دورست و هەژی نینن خودانێ عەسمانان و خودانێ عەردی و خودانێ عەرشێ پیرۆز نەبیت).**

٢٢٤٥ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا كَرَبَهُ أَمْرٌ قَالَ: (يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ). [ت٣٥٢٤].

* حسن.

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر كارەكی ب خەم ئێخستبا دگۆت: **(هەی ئەوێ هەر ساخ و رێبەرێ هەمی كاروباران ئەز هەوارێ ب دلۆڤانییا تە دكەم).**

## ١٣ ـ باب: التعوذ من جهد البلاء

## بابەتێ: خۆپاراستن ژ گرانییا بەلا و موسیبەتان.

٢٢٤٦ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَتَعَوَّذُ مِنْ جَهْدِ الْبَلاَءِ، وَدَرَكِ الشِّقَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ. قَالَ سُفْيَانُ: الحَدِيثُ ثَلاَثٌ، زِدْتُ أَنَا وَاحِدَةً، لاَ أَدْرِي أَيَّتُهُنَّ هِيَ.[خ٦٣٤٧/ م٢٧٠٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خۆ ب خودێ دپاراست: ژ گرانی و زێدەییا بەلایێ و ژ نەخۆشی گەهشتنێ و ژ قەزا و قەدەرا نەخۆش و ژ كەیف ل سەرهاتنا دژمنان. سوفیانی گۆت: فەرموودە سێنە، من ئێكا ژێ زێدە كری، ئەز نوزانم كیژك ژ وانە.**

## ١٤ ـ باب: التعوذ من العجز والجبن والبخل وغيرها.

## بابەتێ: خۆپاراستن ژ نەچاری و ترس و چرویكییێ.

٢٢٤٧ – (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالجُبْنِ وَالهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالمَمَاتِ)**. [خ٦٣٦٧ (٢٨٢٣)/ م٢٧٠٦]

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ نەچاری و بێخیرەتی و ترسنۆكی، و پیراتییێ، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ ئیزایا گۆڕی، و ژ بەلایێت دنیایێ و ژ بەلایا مرنێ).**

٢٢٤٨ – (م) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: لاَ أَقُولُ لَكُمْ إِلاَّ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: كَانَ يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ وَعَذَابَ الْقَبْرِ. اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلاَهَا. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجَابُ لَهَا)**. [م٢٧٢٢].

**ژ زەیدێ كوڕێ ئەرقەمی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (خودێوۆ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ نەچاری و بێخیرەتی و فەلسی و پیراتی و ئیزایا گۆڕی، یا خودێ؛ ترسا ژ خودێ نیشا نەفسا من بدە و پاقژ بكە، تو ژ هەمیان چێتری پاقژ بكەی، تو سەمیان و خودانێ وێیی، یا خودێ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ هەر زانینەكا**

**مفاییی نەدەت، و ژ هەر دلەکێ نەترسیت و نەفسەکا تێر نەبیت، و ژ هەر دوعایەکا نەئێتە قەبویلکرن).**

٢٢٤٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْأَرْبَعِ: مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لاَ يُسْمَعُ**).

[د١٥٤٨/ ن٥٤٨٢/ جه٢٥٠، ٣٨٣٧].

* صحيح.

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (ئەی خودێ ئەز خۆ ب تە ژ ڤان هەر چواران دپارێزم: ژ زانینەکا مفاییی نەدەت، و ژ دلەکێ نەترسیت و ژ نەفسەکا تێر نەبیت، و ژ دوعایەکا نەئێتە قەبویلکرن).**

٢٢٥٠ - وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَاسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، اسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَاسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ**). [ت٣٦٠٤].

* صحيح.

**و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خۆ ب خودێ ژ ئیزایا جەهنەمێ بپارێزن، خۆ ب خودێ ژ ئیزایا گۆڕی بپارێزن، خۆ ب خودێ ژ بەلایا دەجالی بپارێزن، خۆ ب خودێ ژ بەلایا دنیایێ و مرنێ بپارێزن).**

٢٢٥١ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ سَأَلَ اللهَ الْجَنَّةَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ الْجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَمَنِ اسْتَجَارَ مِنَ النَّارِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ النَّارُ: اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنَ النَّارِ**).

[ت٢٥٧٢/ن٥٥٣٦/جه٤٣٤٠]

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ کوڕێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ سێ جاران بەحەشتێ ژ خودێ بخوازیت، بەحەشت دێ بێژیت: ئەی خودا وی بکە د بەحەشتێدا، و هەر کەسێ سێ جاران داخوازا خۆپاراستنا ژ جەهنەمێ بکەت، جەهنەم دێ بێژیت: ئەی خودێ وی ژ ئاگری بپارێزە).**

## ١٥ ـ باب: ما يعلَّم الرجل من الدعاء إذا أسلم.

**بابەتێ: ئەوا نیشا زەلامی دهێتەدان ژ دوعایێ ئەگەر موسلمان بوو.**

٢٢٥٢ – (م) عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا أَسْلَمَ عَلَّمَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) الصَّلاَةَ، ثُمَّ أَمَرَهُ أَنْ يَدْعُوَ بِهَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ: (**اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَاهْدِنِي وَعَافِنِي وَارْزُقْنِي**) . [م٢٦٩٧].

- زاد في رواية: (**فَإِنَّ هَؤُلاَءِ تَجْمَعُ لَكَ دُنْيَاكَ وَآخِرَتَكَ**) .[وانظر: ٢٢٣٦].

**ژ ئەبی مالكێ ئەشجەعی، ژ بابێ خۆ (رضي الله عنه)، گۆت: دەمێ ئێك موسلمان ببا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ نیشا ددا، پاشی ئەمرێ وی دكر دوعا ب ڤان پەیڤان بكەت: (یا خودێ گونەهێت من ژێ ببە، و دلۆڤانییێ ب من ببە، و من راستەرێ بكە، و من سلامەت بكە، و رزقێ من بدە).**

- **و د ڤەگێرەكێدا زێدە كر: (ب راستی ئەڤە دنیا تە و ئاخرەتا تە بۆ تە كۆم دكەن).**

## ١٦ ـ باب: الدعاء عند صياح الديكة.

**بابەتێ: دوعاكرن دەمێ دیكل بانگی ددەن.**

٢٢٥٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ؛ فَاسْأَلُوا اللهَ مِنْ فَضْلِهِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكاً. وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الحِمَارِ؛ فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهُ رَأَى شَيْطَاناً**) . [خ٣٣٠٣/م٢٧٢٩]

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە هەوە گوه ل بانگێ دیكلی بوو داخوازێ ژ خودێ بكەن ژ كەرەما وی، (ئانكو: بۆ خۆ دوعا بكەن) وی ملیاكەتەك دیت، و هەكە هەوە زرینا كەری گوه لێ بوو داخوازا خۆپاراستنێ ب خودێ ژ شەیتانی بخوازن (ئانكو: بێژن: ئەز خۆ ب خودێ ژ شەیتانی دپارێزم) وی شەیتانەك دیت).**

## ١٧ ـ باب: فضل الدعاء للمسلمين بظهر الغيب.

**بابەتێ: بهایێ دوعایێ بۆ موسلمانان ب نەیەنی.**

٢٢٥٤ – (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَدْعُو لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ؛ إِلاَّ قَالَ الْمَلَكُ: وَلَكَ بِمِثْلٍ**) . [م٢٧٣٢].

**ژ ئەبی دەرداء (رضي الله عنه) گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نینە موسلمانەك ب نەپەنی برایێ خۆ دوعا بۆ بكەت هەكە ملیاكەت نەبێژیتێ خودێ وەكی وێ دوعایێ بدەتە تە ژی).**

## ١٨ ـ الدعاء في الصلاة وبعدها

## دوعا د نڤێژێدا و پشتی وێ

[بەرێ خۆ بدە پشكا سالوخەتێت نڤێژێ : ١١٨٩ و پشتی وێ]

## ١٩ ـ باب: رفع اليدين في الدعاء ومسح الوجه بهما.

## بابەتێ: بلندكرنا دەستان د دوعایێدا و ناڤچاڤان پێ ڤەمالیت.

٢٢٥٥ - عَنْ سَلْمَانَ الفارِسِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ رَبَّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَسْتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ إِلَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْراً)** . [د١٤٨٨/ ت٣٥٥٦/ جه٣٨٦٥].

* صحيح.

**ژ سەلمانێ فارسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودایێ هەوە پاك و بلند بوو، پێ شەرمین و مەردە، شەرمێ ژ بەندەیێت خۆ دكەت ئەو دەستێت خۆ بەر ب وی ڤە بلند بكەن و ئەو چو نەكەتە تێدا و ڤالا بزڤرینیت).**

٢٢٥٦ - عَنْ مَالِكِ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا سَأَلْتُمُ اللهَ؛ فَاسْأَلُوهُ بِبُطُونِ أَكُفِّكُمْ، وَلاَ تَسْأَلُوهُ بِظُهُورِهَا)**. [د١٤٨٦].

* حسن صحيح.

**ژ مالكێ كورێ یەساری (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر هەوە دوعا ژ خودێ كرن ب بەرێ دەستێ خۆ دوعا ژێ بكەن و ب پشتا دەستێ خۆ دوعا ژێ نەكەن).**

٢٢٥٧ — عَن عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قال: كانَ رسولُ اللهِ (ﷺ) إذا رفعَ يديهِ في الدُّعاءِ، لم يحطَّهما حتَّى يمسحَ بِهما وجهَهُ. [ت٣٣٨٦][1].

---

(١) **شیخ سالحی ژ بەر لاوازیا ڤێ فەرموودەیێ ئەڤە د مالپەرێ خۆدا شینێ نیناپە:** ٢٢٥٧ . عن ابن عباس قال: المَسألَةُ أَنْ تَرفَعَ يَدَيْكَ حَذْوَ مَنكِبَيْكَ، أَوْ نَحوِهما، والاسْتغفارُ أَنْ تُشيرَ بِأُصْبُعٍ واحدةٍ، والابْتِهَالُ أَنْ تَمُدَّ يَدَيْكَ جَميعاً.[د١٤٨٩].

* صحيح.

[وانظر: ٢٢٢٧] .

* ضعيف، وقال الترمذي حسن غريب.

**ژ عومەرێ كورێ خەتتابی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر دەستێت خۆ د دوعایێدا بلنكربان نەددانان هەتا نافچاڤێت خۆ پێ نەڤەمالیبان.**

٢٢٥٧ . عن ابن عباس قال: المسألةُ أَنْ تَرفَعَ يَدَيْكَ حَذْوَ مَنكِبَيْكَ، أَوْ نَحوِهما، والاسْتغفارُ أَنْ تُشِيرَ بِأُصْبُعٍ واحدةٍ، والابْتِهَالُ أَنْ تَمُدَّ يَدَيْكَ جَميعاً. [د١٤٨٩].

* صحيح.

[وانظر: ٢٢٢٧] .

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: رەوشت د دوعایێدا ئەوە تو دەستێت خۆ هەتا راستا ملێت خۆ بلند بكەی یان هندی وان و د خواستنا ژێبرنا گونەهاندا ئەوە تو ب تلەكێ ئیشارەتێ بكەی، و د لاڤلاڤێدا تو هەردو دەستێت خۆ پێكڤە باش بلند بكەی.**

## ٢٠ . باب: فضل الدعاء.

### بابەتێ: بهایێ دوعایێ.

٢٢٥٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللهِ تَعَالَى مِنَ الدُّعَاءِ) . [ت٣٣٧٠/ جه ٣٨٢٩]

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (چو تشت ل دەڤ خودایێ بلند ژ دوعایێ ب رێزتر نینە).**

٢٢٥٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّه مَنْ لَمْ يَسْأَلِ اللهَ يَغْضَبْ عَلَيْهِ). [ت٣٣٧٣/ جه٣٨٢٧]

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی هەر كەسێ دوعا ژ خودێ نەكەت خودێ ژێ تۆرە دبیت).**

٢٢٦٠ – عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (مَا مِنْ أَحَدٍ يَدْعُو بِدُعَاءٍ؛ إِلاَّ آتَاهُ اللهُ مَا سَأَلَ، أَوْ كَفَّ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهُ، مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ، أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ) . [ت٣٣٨١].

* حسن.

ژ جابری (ﷺ)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: **(نینە کەسەك دوعایەکێ بکەت، ئەگەر خودێ وێ نەدەتێ یا داخوازکری، یان نەخۆشییەکا وەکی وێ پێ ژێ نەدەتە پاش، هندی ئەو دوعا ب گونەهێ یان برینا مرۆڤانییێ نەکەت).**

**٢١ ـ باب: الدعاء مع اليقين بالإجابة.**

**بابەتێ: دوعاکرن د گەل پشتراستبوونا قەبویلکرنێ.**

٢٢٦١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(ادْعُوا اللهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالْإِجَابَةِ، وَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ لاَ يَسْتَجِيبُ دُعَاءً مِنْ قَلْبٍ غَافِلٍ لاَهٍ)** . [ت٣٤٧٩].

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دوعا ژ خودێ بکەن و هوین د پشتراست ژ قەبویلکرنێ، و بزانن ب راستی خودێ دوعایێ ژ دلەکێ بێ ئاگەه و مژویل قەبویل ناکەت).**

**٢٢ ـ باب: الدعاء باسم الله الأعظم.**

**بابەتێ: دوعا ب ناڤێ خودێ یێ مەزن.**

٢٢٦٢ – عَنْ بُرَيْدَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) سَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ، أَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللهُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، الْأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ. فَقَالَ: **(لَقَدْ سَأَلْتَ اللهَ بِالِاسْمِ الَّذِي إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، وَإِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ)** . [د١٤٩٣/ ت٣٤٧٥/ جه٣٨٥٧].

* صحيح.

**ژ بورەیدەیی (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه ل زەلامەکی بوو دگۆت: یا خودێ ئەز داخوازێ ژ تە دکەم و ئەز شادەیێ ددەم کو ب راستی چو پەرستییێت راست و دورست و هەژی نینن تو نەبی، تو تاك و تەنیایی، و تو ئەوی یێ هەمی هەوجەی تە، و هەمی هەوجەیان دڤەتینی، و هەوجەی کەسێ نە، کەس ژێ نەبوویە، و ژ کەسێ نەبوویە، و چو هەڤکویف ژی بۆ نەی، ئینا گۆت: (ب راستی وی داخواز ژ خودێ ب وی ناڤی کر ئەوێ ئەگەر پێ هاتە داخوازکرن پێ ددەت، و ئەگەر دوعا پێ هاتە کرن هاتە قەبویلکرن).**

## ٢٣ ـ باب: الدعاء بالجوامع من الدعاء.

## بابەتێ: دوعاكرن ب دوعایێت تەڤگر.

٢٢٦٣ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَسْتَحِبُّ الْجَوَامِعَ مِنَ الدُّعَاءِ، وَيَدَعُ مَا سِوَى ذَلِكَ. [د١٤٨٢].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دوعایێت تەڤگر ژ لایێ وی پەسەند بوون، و ژ بلی وان دهێلان.**

## ٢٤ ـ باب: عدم التنطع في الدعاء.

## بابەتێ: نەدرێژكرن د دوعایێدا.

٢٢٦٤ – عَنْ ابْنٍ لِسَعْدِ بن أَبِي وقاصٍ قَالَ: سَمِعَنِي أَبِي وَأَنَا أَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَنَعِيمَهَا وَبَهْجَتَهَا وَكَذَا وَكَذَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَسَلاَسِلِهَا وَأَغْلاَلِهَا وَكَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: يَا بُنَيَّ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ**) فَإِيَّاكَ أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ، إِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَ الْجَنَّةَ أُعْطِيتَهَا وَمَا فِيهَا مِنَ الْخَيْرِ، وَإِنْ أُعِذْتَ مِنَ النَّارِ أُعِذْتَ مِنْهَا وَمَا فِيهَا مِنْ الشَّرِّ. [د١٤٨٠].

* حسن صحيح.

**ژ كوڕەكێ سەعدێ كوڕێ ئەبی وەققاسی (رضي الله عنه) گۆت: بابێ من گوهـ ل من بوو و من دگۆت: یا خودێ ئەز داخوازا بەحەشتێ و خۆشیيا وێ و جوانییا وێ و ڤی و ڤی ژ تە دكەم، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ ئاگری و زنجیرێت وێ و قەیدێت وێ و ڤێ و ڤێ، ئینا گۆت: ئەی كوڕێ من ب راستی من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هندەك دێ هەبن زێدەگاڤییێ د دوعایێدا كەن)، هشیاربی تو ژ وانان بی، ئەگەر بەحەشت ب تە هاتە دان، ئەوا تێدا ژ خێرێ دێ ب تە هێتە دان، و ئەگەر تو ژ ئاگری هاتییە پاراستن، تو ژ وێ و ئەوا تێدا ژ خرابیێ هاتییە پاراستن.**

٢٢٦٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ: أنه سَمِعَ ابْنَهُ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْقَصْرَ الْأَبْيَضَ عَنْ يَمِينِ الْجَنَّةِ، إِذَا دَخَلْتُهَا، فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ، سَلِ اللهَ الْجَنَّةَ، وَعُذْ بِهِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ**) [د٩٦/ جه٣٨٦٤].

- ولفظ أبي داود: (**فِي الطُّهُورِ وَالدُّعَاءِ**) .

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ موغەففەلی (ﷺ) وی گوھ ل كوڕێ خۆ بوو دگۆت: ئەی خودا ئەز داخوازا كۆچكا سپی ژ لایێ راستێ یێ بەحەشتێ ژ تە دكەم، ئینا گۆت: ئەی كوڕێ من داخوازا بەحەشتێ ژ خودێ بكە و خۆ ب وی ژ ئاگری بپارێزە، ب راستی من گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هندەك دێ هەبن زێدەگاڤییێ د دوعایێدا كەن).**

- **و بێژەیا ئەبی داوودی: (د سەرشویشتن و دەستنڤێژشویشتن و دوعایێدا).**

**٢٥ ـ باب: دعوات لا ترد.**

**بابەتێ: هندە دوعا ناهێنە زڤراندن.**

٢٢٦٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لاَ شَكَّ فِيهِنَّ: دَعْوَةُ الْوَالِدِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ**) . [د١٥٣٦/ ت١٩٠٥/ جه٣٨٦٢]

- وعند الترمذي: (**دَعْوَةُ الْوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ**).
- وعند ابن ماجه: (**لِوَلَدِهِ**) .

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سێ دوعا بێ گۆمان د قەبویلن: دوعایا بابێ، و دوعایا رێڤینگی و دوعایا ستەملێكری).**

- **و ل دەڤ ترمزی: (دوعایا بابێ ل عەیالێ خۆ).**
- **و ل دەڤ ئیبن ماجەی: ( بۆ عەیالێ خۆ).**

٢٢٦٧ - عَنْ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**دَعْوَةُ ذِي النُّونِ إِذْ دَعَا وَهُوَ فِي بَطْنِ الْحُوتِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَيْءٍ قَطُّ؛ إِلاَّ اسْتَجَابَ اللهُ لَهُ**) .[ت٣٥٠٥]

* صحيح.

**ژ سەعدی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دوعایا یوونسی دەمێ كری و ئەو د زكێ نەھنگیدا: (چو خودا و پەرستییێت راست و دورست نین تو نەبی، پاكی و پاقژی ژ هەمی كێماسییان هەر بۆ تەیە، ئەز هێژایی ڤی سزایمە، ب راستی من ستەم ل خۆ كر، ب راستی هەر مرۆڤەكێ موسلمان د چ تشتدا بیت ڤێ دوعایێ ناكەت ئەگەر خودێ ژێ قەبویل نەكەت).**

## ٢٦ ـ باب: الداعي يبدأ بنفسه.

**بابەتێ: دوعاكەر ب خۆ دەست پێ بكەت.**

٢٢٦٨ - عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا ذَكَرَ أَحَداً فَدَعَا لَهُ، بَدَأَ بِنَفْسِهِ.[د٣٩٨٤/ت٣٣٨٥].

* صحيح.

**ژ ئوبەیێ كورێ كەعبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ناڤێ ئێكی ئینابا و دوعا بۆ كربان ب خۆ دەست ب دوعایێ دكر.**

## ٢٧ ـ باب: ما يقول إذا خرج من بيته.

**بابەتێ: دێ چ بێژیت ئەگەر ژ مالا خۆ دەركەفت.**

٢٢٦٩ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا خَرَجَ الرَّجُلُ مِنْ بَيْتِهِ فَقَالَ: بِاسْمِ اللهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، يُقَالُ حِينَئِذٍ: هُدِيتَ وَكُفِيتَ وَوُقِيتَ، فَتَتَنَحَّى لَهُ الشَّيَاطِينُ، فَيَقُولُ شَيْطَانٌ آخَرُ: كَيْفَ لَكَ بِرَجُلٍ قَدْ هُدِيَ وَكُفِيَ وَوُقِيَ**) ؟. [د٥٠٩٥/ ت٣٤٢٦].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر مرۆڤ ژ مالا خۆ دەركەفت و گۆت: ب ناڤێ خودێ، من پشتا خۆ ب خودێ راست كر، چو بزاڤ و شیان و چو هێز نینن ب خودێ نەبن. هینگێ دێ بۆ هێتە گۆتن: تو هاتییە راستەرێكرن و بەسی تە ب تە هاتە دان، و تو هاتییە پاراستن، و شەیتان دێ خۆ ژێ دەتە پاش. و شەیتانەك دێ بێژیتە شەیتانەكێ دی: تو چ دبێژی بۆ زلامەكی هاتییە راستەرێكرن، و بەسی وی بۆ هاتییە دان، و هاتییە پاراستن).**

## ٢٨ ـ باب: ما يقول إذا رأى مبتلى.

**بابەتێ: دێ چ بێژیت ئەگەر بەلادارەك دیت.**

٢٢٧٠ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ رَأَى مُبْتَلًى فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلاَكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلاً، لَمْ يُصِبْهُ ذَلِكَ الْبَلاَءُ**) . [ت٣٤٣٢].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ تووشبوویەكی ببینیت بێژیت: حەمد و شوكر بۆ خودێ ئەوێ ئەز سلامەت كریم ژ وێ**

**یا تو پێ جەرباندی، و ئەز ب سەر گەلەك جێكرییێت هاتینە جێكرن ئێخستیم و ب قەدرتر لێ كریم، ئەو بەلا وی ناگریت).**

**٢٩ ـ باب: دعاء الحاجة.**

**بابەتێ: دوعایا هەوجەیێ.**

٢٢٧١ – عَنْ عُثْمَانَ بْنِ حُنَيْفٍ: أَنَّ رَجُلاً ضَرِيرَ الْبَصَرِ، أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: ادْعُ اللهَ أَنْ يُعَافِيَنِي، قَالَ: (**إِنْ شِئْتَ دَعَوْتُ، وَإِنْ شِئْتَ صَبَرْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ**) ، قَالَ: فَادْعُهْ، قَالَ: فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ، وَيَدْعُوَ بِهَذَا الدُّعَاءِ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ، نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِيَ، اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ**) . [ت٣٥٧٨/ جه١٣٨٥].

* صحيح.

**ژ عوسمانێ كورێ حونەیفی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەكێ كۆرە هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: بۆ من دوعا بكە من سلامەت بكەت، گۆت: (ئەگەر تە بڤێت دێ دوعا بۆ تە كەم، و ئەگەر تە بڤێت ژی بێهنا خۆ فرەه بكە و ئەو بۆ تە چێترە) گۆت: بۆ من دوعایێ بكە، گۆت: فەرمانا وی كر ئەو دەستنڤێژا خۆ بشۆت و باش بشۆت، و دوعا ب ڤێ دوعایێ بكەت: (ئەی خودا ئەز داخوازێ ژ تە دكەم و بەرێ خۆ ددەمە تە ب پێغەمبەرێ تە موحەممەدی پێغەمبەرێ دلۆڤانییێ، ب راستی ئەز ب تە بەرێ خۆ ددەمە خودایێ خۆ د هەوجەییا خۆدا دا بۆ من ب جە بهێت، یا خودێ بەرڤانییا وی بۆ من وەرگرە).**

**٣٠ ـ باب: ما يقول إذا خاف قوماً.**

**بابەتێ: دێ چ بێژیت ئەگەر ژ هندەكان ترسیا.**

٢٢٧٢ – عَنْ أَبِي مُوسَى: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا خَافَ قَوْماً، قَالَ: (**اللَّهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ**) . [د١٥٣٧].

* صحيح.

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه)، گۆت: هەكە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ هندەكان ترسیابایە دگۆت: (یا خودێ تو بەرسینگێ وان بگرە، و ئەم خۆ ب تە دپارێزین ژ خرابییێت وان).**

## ٣١ ـ باب: الدعاء بحفظ السمع والبصر.

## بابەتێ: دوعاكرن ب پاراستنا گوهـ و چاڤان.

٢٢٧٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَدْعُو فَيَقُولُ: (**اللَّهُمَّ مَتِّعْنِي بِسَمْعِي وَبَصَرِي، وَاجْعَلْهُمَا الْوَارِثَ مِنِّي، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ يَظْلِمُنِي، وَخُذْ مِنْهُ بِثَأْرِي**) .		[ت ملحق ٣٦٨١]

* حسن.

[وانظر: ٢٢٧٦] .

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: **(یا خودێ من ب گوهێ من و ب چاڤێ من خۆش بکە، و بۆ من ساخلەم بهێلە هەتا دمرم، و من ب سەر وی بێخە یێ ستەم ل من کری، و تۆلێت من ژ وی ڤەکە).**

## ٣٢ ـ باب: الدعاء بالعفو والعافية.

## بابەتێ: دوعاكرن بۆ لێبۆرین و سلامەتییێ.

٢٢٧٤ – عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلِّمْنِي شَيْئاً أَسْأَلُهُ اللهَ عزّ وجل، قَالَ: (**سَلِ اللهَ الْعَافِيَةَ**) ، فَمَكَثْتُ أَيَّاماً، ثُمَّ جِئْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ عَلِّمْنِي شَيْئاً أَسْأَلُهُ اللهَ، فَقَالَ لِي: (**يَا عَبَّاسُ، يَا عَمَّ رَسُولِ اللهِ، سَلِ اللهَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ**) .		[ت٣٥١٤].

* صحيح.

ژ عەباسێ کورێ عەبدولموتتەلبی (رضي الله عنه)، گۆت: من گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ تشتەکی نیشا من بدە ئەز بۆ خۆ ژ خودێ بخوازم، گۆت: **(ژ خودێ بخوازن، هەوە ژ بەلا و نەخۆشییان سلامەت بکەت)**، چەند رۆژان ئەز مام پاشی ئەز هاتم من گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ تشتەکی نیشا من بدە ئەز بۆ خۆ ژ خودێ بخوازم، گۆت: **(یا عەباس یا مامێ پێغەمبەرێ خودێ، ژ خودێ بخوازن، هەوە د دنیا و ئاخرەتێدا ژ بەلا و نەخۆشییان سلامەت بکەت).**

٢٢٧٥ – عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رافِعِ بْنِ مَالِكٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَامَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ عَلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ بَكَى، فَقَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَامَ الْأَوَّلِ عَلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: (**اسْأَلُوا اللهَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ، فَإِنَّ أَحَداً لَمْ يُعْطَ بَعْدَ الْيَقِينِ خَيْراً مِنَ الْعَافِيَةِ**) .		[ت٣٥٥٨].

* حسن صحيح.

ژ ریفاعەیێ کوڕێ رافعێ کوڕێ مالکێ ئەنساری (رضي الله عنه) گۆت: ئەبوبەکر رابوو سەر مینبەرێ، پاشی گری، ئینا گۆت: سالا ئێکێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر مینبەرێ راوەستا و پاشی گری و گۆت: **(دوعا لێبۆرین و سلامەتییێ ژ خودێ بکەن، چونکی ب راستی پشتی باوەرییا راست و دورست و بێ گۆمان چو تشت باشتر و خێرتر ژ عافیەتێ خودێ نەدایە کەسێ).**

## ٣٣ ـ باب: دعاء ختام المجلس.

## بابەتێ: دوعایا دویماهییا روینشتنێ.

٢٢٧٦ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُومُ مِنْ مَجْلِسٍ حَتَّى يَدْعُوَ بِهَؤُلاَءِ الدَّعَوَاتِ لِأَصْحَابِهِ: **(اللَّهُمَّ! اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعَاصِيكَ، وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ، وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَا مُصِيبَاتِ الدُّنْيَا، وَمَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا، وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا ، وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا، وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا، وَلاَ تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا، وَلاَ تَجْعَلْ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا، وَلاَ مَبْلَغَ عِلْمِنَا، وَلاَ تُسَلِّطْ عَلَيْنَا مَنْ لاَ يَرْحَمُنَا)** . [ت٣٥٠٢].

* حسن.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: کێم جار نەبا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل دیوانەکێ رابا ئەگەر دوعا ب ڤان دوعایان بۆ هەڤالێت خۆ نەکربان: **(یا خودێ هند ترسا خۆ ب رزقێ مە بکە، خۆ ژ نەگوهدارییا تە بدەینە پاش، و هند گوهدارییا خۆ ب رزقێ مە بکە مە بگەهینیتە بەحەشتا تە، و هند باوەرییا راست و دورست ب رزقێ مە بکە ئاتاف و نەخۆشییێت دنیایێ ل سەر مە سڤك بکەت، و مە ب چاڤ و گوه و هێزێ خۆش بکە هندی تو مە بهێلییە ساخ، و ڤان دوعایان و ڤان داخوازان بدە وێرسێت مە، و مە ب سەر وی بێخە یێ دژمناهییا مە دکەت، و نەخۆشییا مە نەکە د دینێ مەدا و دنیایێ نەکە مەزنترین خەما مە و نەکە دویماهییا زانینا مە، و کەسێ ل سەر مە زال نەکە دلۆڤانییێ ب مە نەبەت).**

٢٢٧٧ – عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا جَلَسَ مَجْلِساً، أَوْ صَلَّى تَكَلَّمَ بِكَلِمَاتٍ، فَسَأَلَتْهُ عَائِشَةُ عَنِ الْكَلِمَاتِ فَقَالَ: **(إِنْ تَكَلَّمَ بِخَيْرٍ كَانَ طَابِعاً عَلَيْهِنَّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَإِنْ تَكَلَّمَ بِغَيْرِ ذَلِكَ كَانَ كَفَّارَةً لَهُ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)** . [ن١٣٤٣].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ل دیوانەكێ روینشتبا یان نڤێژ كربا ب هندە پەیڤان دئاخفت، عائیشایێ پرسیارا وی ژ وان پەیڤان كر، ئینا گۆت: (ئەگەر ب خێرێ ئاخفت ئەو دێ بۆ بیتە سەردەرك هەتا رۆژا قیامەتێ، و ئەگەر ب تشتەكێ دی ئاخفت ئەو دێ بۆ بیت گونەهژێبرن؛ ئەز تە ژ هەمی كێماسییان پاك و پاقژ دكەم یا خودێ و ب هاریكارییا تە، ئەز داخوازا گونەهژێبرنێ ژ تە دكەم و تەوبە دكەمە تە).**

## ٣٤ ـ باب: الإشارة بإصبع في الدعاء.

## بابەتێ: نیشانكرن ب تلەكێ د دوعایێدا.

٢٢٧٨ – عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: مَرَّ عَلَيَّ النَّبِيُّ (ﷺ) وَأَنَا أَدْعُو بِأُصْبُعَيَّ فَقَالَ: (أَحِّدْ، أَحِّدْ) وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ. [د١٤٩٩/ ن١٢٧٢].

* صحيح.

**ژ سەعدێ كورێ ئەبی وەققاسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) د بەر منڕا بۆری و من ب دو تلێت خۆ دوعا دكرن ئینا گۆت: (تەك بكە تەك بكە). و نیشان ب تلا شەهدێ كر.**



## الفصل الثالث: فضل الاستغفار والتوبة

## پشكا سێیێ: بهایێ ئستیغفارێ داخوازا گونەهژێبرنێ و تەوبەیێ

### ١ ـ باب: استحباب كثرة الاستغفار.

### بابەتێ: باشییا زێدە داخوازا گونەهژێبرنێ بهێتە كرن.

٢٢٧٩ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (وَاللهِ! إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللهَ، وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً) . [خ٦٣٠٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) گۆت: **(ئەز ب خودێ كەمە ئەز رۆژێ پتر ژ حەفتێ جاران داخوازا گونەهژێبرن و لێبۆرینێ ژ خودایێ خۆ دخوازم و ل خودێ دزڤرم و تۆبە دكەم).**

٢٢٨٠ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي الْمَجْلِسِ الْوَاحِدِ مِائَةَ مَرَّةٍ (رَبِّ! اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ) . [د١٥١٦/ ت٣٤٣٤/ جه٣٨١٤].

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: مە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ئێك روینشتنێدا دهەژمارت سەد جاران دگۆت: **(یا خودێ گونەهێت من ژێ ببە و تۆبەیا من قەبویل بكە، و ب راستی تویی یێ هەر تۆبە وەرگر و دلۆڤان).**

٢٢٨١ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ! إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِي وَرَجَوْتَنِي، غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ فِيكَ وَلاَ أُبَالِي. يَا ابْنَ آدَمَ! لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ، ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي، غَفَرْتُ لَكَ وَلاَ أُبَالِي. يَا ابْنَ آدَمَ! إِنَّكَ لَوْ أَتَيْتَنِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطَايَا، ثُمَّ لَقِيتَنِي لاَ تُشْرِكُ بِي شَيْئاً، لأَتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً). [ت٣٥٤٠]

* صحيح.

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(خودایێ بلند گۆت: یا كورێ ئادەمی ب راستی هندی تو دوعا ژ من بكەی و هیڤییا ژ من بكەی دێ گونەهێت تە بۆ تە ژێ بەم د گەل وێ یا ل دەڤ تە[1] و من خەم نینە[2]، یا**

(١) ئانكو: د گەل وان گونەهێت تو دكەی.

(٢) ئانكو: ل دەڤ من نەڤە یا مەزن نینە.

**كورێ ئادەمی هەكە گونەهێت تە بگەهنە هندی چاڤێت تە فەتره بكەن ژ عەسمانی، پاشی تو داخوازا گونەهژێبرنێ ژ من بكەی، دێ بۆ تە ژێ بەم، یا كورێ ئادەمی هەكە تو نێزیكی تژی عەردی ب گونەهان بێیە دەڤ من، پاشی بگەهییە من و تو چو تشتان بۆ من نەكەیە هەڤپشك، ئەز دێ نێزیكی تژی عەردی گونەهژێبرنێ دەمە تە).**

٢ ـ باب: سيد الاستغفار.

**بابەتێ: سەرداریێ دوعایا داخوازییا گونەهژێبرنێ.**

٢٢٨٢ - (خ) عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): (سَيِّدُ الاِسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ: اللَّهُمَّ! أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ.

قَالَ: وَمَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِناً بِهَا، فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ) . [خ٦٣٠٦].

ژ شەددادێ كورێ ئەوسی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(سەردارا دوعایا گونەهژێبرنێ تو بێژی: خودێوۆ تو خودانێ منی، ژ بلی تە من چو خودان نینن، تە ئەز یێ چێكریم و ئەز بەندەیێ تەمە، و ئەز یێ ل سەر وێ سۆز و پەیمانا تە ژ مە وەرگرتی، هندی ئەز بشێم، ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خرابییا من كری، و ئەز كەرەمێت تە ل سەر خۆ ئاشكەرا دكەم و ئەز دانپێدانێ (ئعتیرافێ) ب گونەهێت خۆ ژی دكەم، ڤێجا گونەهێت من ژێ ببە، ب راستی كەس گونەهان ژێ نابەت تو نەبی. و هەر كەسێ ڤێ دوعایێ ب باوەرییەكا موكوم ب رۆژ بێژیت و پاشی د رۆژا خۆدا بمریت بەری ئێڤار لێ ببیت، ئەو خەلكێ بەحەشتێیە، و هەر كەسێ ڤێ دوعایێ ب باوەرییەكا موكوم ب شەڤ بێژیت، و پاشی بمریت بەری رۆژ لێ ببیت، ئەو خەلكێ بەحەشتێیە).**

٣ ـ باب: (لجاء بقوم يذنبون فيستغفرون).

**بابەتێ: (دا هندەكێت دی ئینیت گونەه كربان و داخوازا گونەهژێبرنێ كربان).**

٢٢٨٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ اللهُ بِكُمْ، وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ، فَيَسْتَغْفِرُونَ اللهَ، فَيَغْفِرُ لَهُمْ) . [م٢٧٤٩].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز ب وی کەمە یێ رحا من د دەستیدا، هەکە هەوە گونەه نەکربان، دا خودێ هەوە بەت و هندەکێت دی ئینیت گونەهان بکەن، و داخوازا گونەهژێبرنێ ژ خودێ بکەن، و ئەو گونەهێت وان ژێ ببەت).**

٤ ـ باب: قبول التوبة حتى تطلع الشمس من مغربها.

**بابەتێ: قەبویلکرنا تەوبەیێ هەتا رۆژ ل رۆژئاڤایێ دهەلێت.**

٢٢٨٤ - (م) عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ اللهَ عزّ وجل يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ، لِيَتُوبَ مسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ، لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا).[م٢٧٥٩]. [وانظر: ٢٣، ١٤٠] .

ژ ئەبی مووسا، (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودایێ مەزن دەستێ خۆ ب شەڤ ڤەدکەت، دا گونەهکارێ رۆژێ (بۆ خۆ تێدا) تەوبە بکەت، و ب رۆژ دەستێ خۆ ڤەدکەت، دا گونەهکارێ شەڤێ (بۆ خۆ تێدا) تەوبە بکەت. ئانكو: یێ ب شەڤ تەوبە بکەت یان ب رۆژ تەوبە بکەت خودێ دێ تەوبەیا وی قەبویل کەت).**

٥ ـ باب: الحض على التوبة والفرح بها.

**بابەتێ: پالدان بۆ تەوبەکرنێ و دلخۆشی پێ.**

٢٢٨٥ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (اللهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ أَحَدِكُمْ، سَقَطَ عَلَى بَعِيرِهِ، وَقَدْ أَضَلَّهُ فِي أَرْضِ فَلاَةٍ) . [خ٦٣٠٩/ م٢٧٤٧].

وفي رواية لمسلم: (للهُ أَشَدُّ فَرَحاً بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ، حِينَ يَتُوبُ إِلَيْهِ مِنْ أَحَدِكُمْ، كَانَ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِأَرْضِ فَلاَةٍ، فَانْفَلَتَتْ مِنْهُ وعَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ، فَأَيِسَ مِنْهَا، فَأَتَى شَجَرَةً، فَاضْطَجَعَ فِي ظِلِّهَا، قَدْ أَيِسَ مِنْ رَاحِلَتِهِ، فَبَيْنَا هُوَ كَذَلِكَ إِذَا هُوَ بِهَا، قَائِمَةً عَنْدَهُ، فَأَخَذَ بِخِطَامِهَا، ثُمَّ قَالَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ: اللَّهُمَّ! أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَا رَبُّكَ، أَخْطَأَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ).

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(خودێ پتر ژ ئێك ژ هەوە كەیفا وی ب تەوبەیا بەندەیێ وی دهێت، ل سەر حێشترا خۆ کەتبیت، و ئەردەکێ چۆل و بەردای بەرزە کربیت).**

د ڤەگێرەکا دیدا یا موسلمی: **(خودێ پتر ژ ئێك ژ هەوە كەیفا وی ب تەوبەیا بەندەیێ وی دهێت، دەمێ ل وی دزڤریت و تەوبە دکەت، و ئەو ل سەر پشتا دەوارێ خۆ بیت ل**

**عەردەكێ چۆلستان و ژ دەستا دەركڤیت و خوارنا وی و ئاڤا وی ل سەر بن، و ژێ بێ هیڤی ببیت، ڤێجا بێتە بن دارەكێ خۆ ل بن سیبەرا وێ درێژ بكەت، و ب دورستی ژ دەوارێ خۆ بێ هیڤی ببیت، و ئەو یێ د ڤی حالیدا، هۆ ببینیت ل دەڤ وی یا راوەستایە، هەڤسارێ وێ بگریت و د كەیفا زێدەدا بێژیت: یا خودێ تو بەندەیێ منی و ئەز خودایێ تەمە، خەلەت ببیت هندی هند كەیفا وی یا هاتی).**

٢٢٨٦ - عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ)**.[ت٢٤٩٩/ جه٤٢٥١/ مي٢٧٦٩].

* حسن.

ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەمی مرۆڤ زێدە خەلەتكارن و باشترین خەلتكار تۆبەدارن).**

٢٢٨٧ - عَنِ ابْنِ مَعْقِلٍ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي عَلَى عَبْدِ اللهِ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(النَّدَمُ تَوْبَةٌ)** ، فَقَالَ لَهُ أَبِي: أَنْتَ سَمِعْتَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(النَّدَمُ تَوْبَةٌ)** ؟ قَالَ: نَعَمْ.[جه٤٢٥٢].

* صحيح.

**ژ كورێ مەعقیلی (ﷺ) گۆت: ئەز و بابێ خۆ چۆینە دەڤ عەبدوللایی، من گوه ل وی بوو دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پەشێمانی تەوبەیە)، ئینا بابێ من گۆتێ: تە ئەڤە ژ پێغەمبەری (ﷺ) گوه لێ بوویە دگۆت: (پەشێمانی تەوبەیە)؟ گۆت: بەلێ.**

## ٦ ـ باب: تكرر المغفرة بتكرر التوبة.

## بابەتێ: دوبارەكرنا گونەهژێبرنێ ب دوبارەكرنا تەوبەیێ.

٢٢٨٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عزّ وجل قَالَ: **(أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْباً، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْباً، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْباً، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْباً، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبّاً يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، اعْمَلْ مَا شِئْتَ؛ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ)** . اللفظ لمسلم. [خ٧٥٠٧/ م٢٧٥٨].

ژ ئەبی هورەیرە (ﭬ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ خودایێ خۆ یێ پاك و بلند ڤەدگێریت، گۆت: **(بەندەیەكی گونەهەك كر، گۆت: یا خودێ گونەها من ژێ ببە، خودایێ پاك و بلند گۆت: بەندەیێ من گونەهەك كر، و زانی وی خودایەكێ هەی گونەهێ ژێ دبەت، و ل سەر گونەهێ ئیزا ددەت، پاشی جارەكا دی زڤری گونەه كرەڤە، گۆت: یا خودێ گونەها من ژێ ببە، خودایێ پاك و بلند گۆت: بەندەیێ من گونەهەك كر، و زانی وی خودایەكێ هەی گونەهێ ژێ دبەت، و ل سەر گونەهێ ئیزا ددەت، پاشی جارەكا دی زڤری گونەه كرەڤە، گۆت: یا خودێ گونەها من ژێ ببە، خودایێ پاك و بلند گۆت: بەندەیێ من گونەهەك كر، و زانی وی خودایەكێ هەی گونەهێ ژێ دبەت، و ل سەر گونەهێ ئیزا ددەت، وێ بكە یا تە دڤێت ب راستی من گونەهێت تە ژێ برن)**[1]. و بێژە یا موسلمییە.

## ٧ ـ باب: قبول التوبة وإن كثرت الذنوب

## بابەتێ: ڤەبویلكرنا تەوبێ خۆ گونەه چەند گەلەك بن.

٢٢٨٩ – (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْساً، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ فَدُلَّ عَلَى رَاهِبٍ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْساً، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَتَلَهُ، فَكَمَّلَ بِهِ مَائَةً.

ثُمَّ سَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ عَالِمٍ، فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ مِائَةَ نَفْسٍ، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَمَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ التَّوْبَةِ؟ انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنَّ بِهَا أُنَاساً يَعْبُدُونَ اللهَ، فَاعْبُدِ اللهَ مَعَهُمْ، وَلاَ تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ، فَإِنَّهَا أَرْضُ سَوءٍ.

فَانْطَلَقَ حَتَّى إِذَا نَصَفَ الطَّرِيقَ أَتَاهُ الْمَوْتُ، فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ. فَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ: جَاءَ تَائِباً مُقْبِلاً بِقَلْبِهِ إِلَى اللهِ. وَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ: إِنَّهُ لَمْ يَعْمَلْ خَيْراً قَطُّ، فَأَتَاهُمْ مَلَكٌ فِي صُورَةِ آدَمِيٍّ فَجَعَلُوهُ بَيْنَهُمْ، فَقَالَ: قِيسُوا مَا بَيْنَ الأَرْضَيْنِ، فَإِلَى أَيَّتِهِمَا كَانَ أَدْنَى، فَهُوَ لَهُ. فَقَاسُوهُ فَوَجَدُوهُ أَدْنَى إِلَى الأَرْضِ الَّتِي أَرَادَ، فَقَبَضَتْهُ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ) . اللفظ لمسلم. [خ٣٤٧٠/ م٢٧٦٦].

---

(١) ئانكو: هندی تەوبە بكەت و ل خۆ بزڤریت خودێ دێ گونەهێت وی ژێ بەت.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری، (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(زەلامەك د ناڤ پێت بەری وەدا هەبوو، نۆت و نەهـ مرۆڤ كوشتبوون، پرسیارا زاناترێ ل سەر روییێ عەردی كر، بەرێ وی دا پەرستڤانەكی، هاتە دەڤ، گۆت: وی نۆت و نەهـ مرۆڤ پێت كوشتین، كا تەوبە بۆ وی هەیە؟ گۆتێ: نە، ئینا ئەو ژی كوشت، و سەد پێ تمامكرن، پاشی پرسیارا زاناترێ خەلكێ عەردی كر، بەرێ وی دا زەلامەكێ زانا، گۆت: وی نۆت و نەهـ مرۆڤ پێت كوشتین، كا تەوبە بۆ وی هەیە؟ گۆت: بەلێ، كی هەیە بكەڤیتە د ناڤبەرا وی و تەوبێدا؟ بەلێ هەرە عەردەكێ هۆسا و هۆسا، هندە مرۆڤ پێت ل وێرێ هەین عەبدینییا خودێ دكەن، تو ژی د گەل وان عەبدینییا خودێ بكە، و نەزڤرەڤە عەردێ خۆ، عەردێ تە عەردەكێ خرابە (ئانكو: خلكێ وێ پێ خرابە)، چۆ هەتا گەهشتییە نیڤا رێكێ، مرن ب سەردا هات، ملیاكەتێت رەحمێ و ملیاكەتێت ئیزا و عەزابێ سەرا وی ب هەڤڕك چۆن، ملیاكەتێت رەحمێ گۆتن: وی یا تەوبە كری ، و ژ دل بەرێ خۆ پێ دایە خودێ، و ملیاكەتێت ئیزایێ گۆتن: وی د بنیدا خێرەك نەكرییە، ملیاكەتەك ل سەر خولكێ مرۆڤەكی هاتە دەڤ وان، وان د ناڤبەرا خۆدا كرە حەكەم، گۆت، د ناڤبەرا هەردو عەردادا بپیڤن، كا پتر نێزیكی كیژكێیە، ئەو بۆ وییە، پیڤان دیتن پتر نێزیكی وی عەردییە یێ ڤیایی و بەرێ خۆ داییێ، ئینا ملیاكەتێت رەحمێ هەلگرت و بر).** و ئەڤە بێژەیا موسلمییە.

٢٢٩٠ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يَقُولُ اللهُ عزّ وجل : مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَأَزِيدُ. وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ، فَجَزَاؤُهُ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا، أَوْ أَغْفِرُ. وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْراً، تَقَرَّبْتُ مِنْهُ ذِرَاعاً. وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي ذِرَاعاً، تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعاً. وَمَنْ أَتَانِي يَمْشِي، أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً. وَمَنْ لَقِيَنِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطِيئَةً لاَ يُشْرِكُ بِي شَيْئاً، لَقِيتُهُ بِمِثْلِهَا مَغْفِرَةً) . [م٢٦٨٧].

ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودایێ ب هێز و مەزن دبێژیت: هەر كەسێ ب خێرەكێ بهێت بۆ وی دەهـ جار وەكی وێ و زێدەتر یا هەی، و هەر كەسێ [ د ڤێ دنیایێدا ] گونەهەكێ بكەت، ئەو تەمەتی گونەها خۆ دێ ئێتە جزاكرن یان دێ بۆ ژێ بەم، و هەر كەسێ بهۆستەكێ ب گوهدارییێ خۆ نێزیكی من بكەت، ئەز دێ گەزەكێ ب دلۆڤانییێ خۆ نێزیك كەم، و هەر كەسێ گەزەكێ ب**

**گوهدارییێ خۆ نێزیکی من بکەت، ئەز دێ قاپمەکێ ب دلۆڤانییێ خۆ نێزیك کەم، و هەر کەسێ خۆ ل سەر گوهداریا خۆ راگرت و لەزێ ل گوهداریا من بکەت، خێرا من ب لەز دێ بۆ هێت و ئێتە نڤیسین. و هەر کەسێ ب تژی عەردی گونەهان بکەهیتە من و وی چو تشت بۆ من نەکربنە هەڤپشك، ئەز دێ هندی وان گونەهژێبرنێ دەمێ).**

٨ ـ باب: قبول التوبة قبل الغرغرة.

**بابەتێ: قەبویلکرنا تەوبەیێ بەری سەکەراتێ.**

٢٢٩١ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ اللهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ).[ت٣٥٣٧/جه٤٢٥٣]

* حسن.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودایێ هەر ب هێز و مەزن، تەوبەیا بەندەی قەبویل دکت هندی نەکەڤیتە د سەکەراتێدا).**

٩ ـ باب: كفارات الذنوب.

**بابەتێ: ژێبرنێت گونەهان.**

٢٢٩٢ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَتَانِي اللَّيْلَةَ رَبِّي تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ . قَالَ: أَحْسَبُهُ قَالَ: . فِي الْمَنَامِ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ: فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ . أَوْ قَالَ: فِي نَحْرِي .، فَعَلِمْتُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ، قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! هَلْ تَدْرِي فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فِي الْكَفَّارَاتِ.

وَالْكَفَّارَاتُ: الْمُكْثُ فِي الْمَسَاجِدِ بَعْدَ الصَّلَوَاتِ، وَالْمَشْيُ عَلَى الأَقْدَامِ إِلَى الْجَمَاعَاتِ، وَإِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي الْمَكَارِهِ، وَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ عَاشَ بِخَيْرٍ وَمَاتَ بِخَيْرٍ، وَكَانَ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ.

وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِذَا صَلَّيْتَ فَقُلْ: اللَّهُمَّ! إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ، وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ، وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ، وَإِذَا أَرَدْتَ بِعِبَادِكَ فِتْنَةً؛ فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مَفْتُونٍ.

قَالَ: وَالدَّرَجَاتُ: إِفْشَاءُ السَّلاَمِ، وَإِطْعَامُ الطَّعَامِ، وَالصَّلاَةُ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ) . [ت٣٢٣٣].

* صحيح.

[وانظر: ٢٩٢٨] [1].

---

(١) شیخ صالح الشامی نەڤە د مالپەرێ خۆدا زێدەکریە و د چاپا ئێکێدا نینە.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەڤ شەڤە خودایێ من پاك و بلند بوو د جوانترین رەنگدا هاتە دەڤ من، گۆت: ئەز هزر دكەم گۆت د خەونێدا، گۆت: ئەی موحەممەد ئەرێ تو دزانی بانێ بلند هەڤركییێ د چدا دكەن؟ گۆت من گۆت: نەخێر، گۆت: ئینا دەستێ خۆ دانا د نافبەرا هەردو ملێت مندا هەتا من هەست ب تەزیاتییا وێ د نافبەرا چچكێت خۆدا كری، یان گۆت د سینگێ خۆدا، ژ بەر وێ ئەوا د عەرد و عەسمانان‌دا هەی من زانی، گۆت: ئەی موحەممەد ئەرێ تو دزانی بانێ بلند هەڤركییێ د چدا دكەن؟ گۆت: من گۆت: بەلێ د گونەهژێبەراندا دكەن[1].**

**و گونەهەژێبەر ئەڤەنە: مانا ل مزگەفتان پشتی نڤێژان، و چۆنا ب پییان بۆ نڤێژێت ب جەماعەت، و دورست شویشتنا دەستنڤێژێ د نەخۆشییاندا، و هەر كەسێ ڤێ بكەت ل سەر خێرێ دێ ژیت و ل سەر خێرێ دێ مریت و د گونەها خۆدا وەكی وێ رۆژێیە یا ژ دایكا خۆ بووی.**

**و گۆت: ئەی موحەممەد ئەگەر تە نڤێژ كر بێژە: ئەی خودا ئەز داخوازا كرنا خێران و هێلانا خرابییان و حەژێكرنا ڤەلەندەران ژ تە دكەم، و ئەگەر تە ڤیا بەندەیێت خۆ بجەربینی من د سەردانەچۆیی بكێشە دەڤ خۆ.**

**گۆت: و پلەبەرزی ژی ئەڤەنە: بەلاڤكرنا سلاڤێ، و دانا زادی و خوارنێ، و كرنا نڤێژان دەمێ خەلك یێ نڤستی).**



(١) ئانكو: بەحسێ وان عیبادەتان دكەن یێت گونەهان ژێ دبەن.

## الفصل الرابع: الصلاة والسلام النبي ((ﷺ)).

## پشكا چارێ: سەلات و سلاڤ ل سەر پێغەمبەری (ﷺ).

### ١ ـ باب: فضل الصلاة على النبي (ﷺ).

### بابەتێ: خێرا دانا سەلاتدانێ ل سەر پێغەمبەری (ﷺ).

٢٢٩٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْراً). [م٤٠٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ سەلەواتەكێ بدەتە سەر من خودێ دێ دەھ سەلەواتان دەتە سەر).**

٢٢٩٤ - وعَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُوراً، وَلاَ تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيداً، وَصَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ كُنْتُمْ) . [د٢٠٤٢].

* صحيح.

[وانظر: ١٤٥٩ في فضل الصلاة عليه (ﷺ) يوم الجمعة][1].

**و ژ وی: گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مالێت خۆ نەكەنە گۆڕ[2]، و گۆڕێ من نەكەنە جهێ لێزڤڕینێ[3] و سەلەواتان بدەنە سەر من، ب راستی سەلەواتێت هەوە دگەهنە من هەر جهێ هوین لێ بن).**

### ٢ ـ باب: الترهيب من عدم الصلاة عليه (ﷺ).

### بابەتێ: ترساندن ژ نەدانا سەلەواتان سەر پێغەمبەری (ﷺ).

٢٢٩٥ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (رَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ، وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ دَخَلَ عَلَيْهِ رَمَضَانُ، ثُمَّ انْسَلَخَ قَبْلَ أَنْ يُغْفَرَ لَهُ، وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ أَدْرَكَ عِنْدَهُ أَبَوَاهُ الْكِبَرَ، فَلَمْ يُدْخِلاَهُ الْجَنَّةَ) . قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: وَأَظُنُّهُ قَالَ: (أَوْ أَحَدُهُمَا) . [ت٣٥٤٥].

* حسن صحيح.

---

(١) شێخ سالح الشامی ئەڤە د مالپەرێ خۆدا ئینایە خوارێ و د چاپا ئێكێدا نینە.

(٢) ئانكو: هندە نڤێژێت خۆ یێت سونەت پێخە مالا خۆ نەگەر تو نەو بی هەمی نڤێژێت فەرز ب جەماعەت ل مزگەفتێ دكەی.

(٣) هەرجار بێن و بێنەڤە، هزرا هندێ سەلەوات و سلاڤێت هەوە ناگەهنە من هەكە هوین یێت نێزیكی من نەبن.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دفنا وی مرۆڤی ب ئاخێ بکەڤیت (بشکێت و رەزیل ببیت) یێ ناڤێ من ل دەڤ بهێتە ئینان سەلەواتان نەدەتە سەر من، و دفنا وی مرۆڤی ب ئاخێ بکەڤیت یێ بچیتە د رەمەزانێدا و پاشی ژێ دەرکەڤیت بەری گونەهێت وی بهێتە ژێبرن، دفنا وی مرۆڤی ب ئاخێ بکەڤیت یێ بگەهیتە دایبابێت خۆ د ژیێکی مەزندا و ئەو وی نەبەنە بەحەشتێ).**

٢٢٩٥ - م . عَنْ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(الْبَخِيلُ الَّذِي مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ)** . [ت٣٥٤٦].

* صحيح.

ژ حەسەنێ کوڕێ عەلییێ کوڕێ ئەبو تالبی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(یێ چوریك ئەوە یێ ناڤێ من ل دەڤ بێتە گۆتن و سەلەواتان نەدەتە سەر من).**

## ٣ ـ باب: فضل السلام عليه (ﷺ).

## بابەتێ: خێرا سلاڤکرنێ ل سەر پێغەمبەری (ﷺ).

٢٢٩٦ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ لِلَّهِ مَلَائِكَةً سَيَّاحِينَ فِي الْأَرْضِ، يُبَلِّغُونِي مِنْ أُمَّتِي السَّلَامَ)** . [ن١٢٨١/ مي٢٨١٦].

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ کوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودێ هندە ملیاکەتێت گەرۆك د عەردیدا یێت هەین، ژ ئوممەتا من سلاڤێ دگەهیننە من).**

٢٢٩٧ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ؛ إِلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي، حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ)** . [د٢٠٤١].

* حسن.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نینە ئێك ژ هەوە سلاڤکەتە من هەکە خودێ جانێ من بۆ من نەزڤرینیت هەتا ئەز سلاڤا وی ڤەگێرم).**

٢٢٩٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ دِينَارٍ قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَقِفُ عَلَى قَبْرِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَيُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَعَلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ. [ط٣٩٩].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ دیناری (رحمه الله) گۆت: من عەبدوللایێ كوڕێ عومەری دیت ل بەر قەبرێ پێغەمبەری (ﷺ) رادوەستا و سەلەوات ددانە سەر پێغەمبەری (ﷺ) و ل سەر ئەبوبەكری و عومەری.**



## الفصل الأول: الأيمان

## پشكا ئێكێ: سويند

### ١ ـ باب: النهي عن الحلف بغير الله تعالى.

### بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ سويندخوارنا ب تشتەكی ژ بلی خودێ.

٢٢٩٩ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ أَدْرَكَ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ فِي رَكْبٍ وَهُوَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَنَادَاهُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَلاَ، إِنَّ اللهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفاً؛ فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ، وَإِلاَّ فَلْيَصْمُتْ**). [خ٦١٠٨ (٢٦٧٩)/ م١٦٤٦].

**ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، ئەو د ناڤ كاروانەكیدا ڤ عومەرێ كوڕێ خەتتابیرا گەهشت، و وی سويند ب بابێ خۆ دخوار، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گازی وان كر: (بزانن ب راستی خودایێ مەزن نەهیا هەوە دكەت هوین ب بابێت خۆ سويند بخۆن، هەر كەسێ سويند خوار بلا ب خودێ سويند بخۆت یان خۆ بێ دەنگ بكەت).**

٢٣٠٠ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، وَلاَ بِأُمَّهَاتِكُمْ، وَلاَ بِالأَنْدَادِ، وَلاَ تَحْلِفُوا إِلاَّ بِاللهِ، وَلاَ تَحْلِفُوا بِاللهِ إِلاَّ وَأَنْتُمْ صَادِقُونَ**) . [د٣٢٤٨/ ن٣٧٧٨].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نە ب بابێت خۆ سويند بخۆن و نە ب دایكێت خۆ و نە ب بوتان (سەنەمان)، و سويندێ نەخۆن ب خودێ نەبیت، و ب خودێ سويند نەخۆن ئەو نەبیت هوین د راستگۆ بن).**

٢٣٠١ - عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ حَلَفَ بِالأَمَانَةِ فَلَيْسَ مِنَّا**) . [د٣٢٥٣].

* صحيح.

**ژ بورەیدەی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نە ژ مەیە یێ ب فەرزێت خودێ سويند بخۆت)[1].**

---

(١) وەكی نڤێژێ یان زەكاتێ و حەجێ ...هتد، نابیت بلند ببنە ریزا خودێ و سويند پێ بێنە خوارن.

## ٢ ـ باب: من حلف باللات والعزى.

**بابەتێ: يێ سويندێ ب لات و عوززا بخوت.**

٢٣٠٢ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: وَاللاَّتِ وَالعُزَّى؛ فَلْيَقُلْ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ؛ فَلْيَتَصَدَّقْ).[خ٤٨٦٠/ م١٦٤٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ د سويندا خۆدا گۆت؛ ب لاتی و عوززاكەمە، بلا بێژیت؛ لا إله إلا الله، و هەر كەسێ گۆتە هەڤالێ خۆ وەرە قومارێ د گەل تە بكەم، بلا سەدەقەكێ بدەت).**

## ٣ ـ باب: من حلف يميناً فرأى غيرها خيراً منها.

**بابەتێ: ئەو كەسێ سويندەكێ بخوت و تشتەكێ باشتر ژ سويندا خۆ ببينيت.**

٢٣٠٣ – (م) عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا حَلَفَ أَحَدُكُمْ عَلَى الْيَمِينِ، فَرَأَى خَيْراً مِنْهَا؛ فَلْيُكَفِّرْهَا، وَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ) . [م١٦٥١].

ژ عەدییێ كورێ حاتەمی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێكی ژ هەوە ل سەر تشتەكی سويند خوار و ژ وێ باشتر دیت، بلا كەفارەتا وێ بدەت و بلا وێ یا باشتر بكەت).**

## ٤ ـ باب: النهي عن الإصرار على اليمين.

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ رژدبوونا ل سەر سويندێ.**

٢٣٠٤ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ (ﷺ): (وَاللهِ لأَنْ يَلِجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ، آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ الَّتِي افْتَرَضَ اللهُ عَلَيْهِ) .[خ٦٦٢٥/ م١٦٥٥].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب خودێ ئێك ژ هەوە یێ رژد بیت ل سەر سويندا خۆ د راستا مالا خۆدا گونەهكارترە ل دەڤ خودێ كو ئەو (سويندا خۆ بخوت) و كەفارەتا خودێ ل سەر فەرزكری بدەت).**

## ٥ ـ باب: اليمين اللغو.

**بابەتێ: سويندا نە ژ دل و بێ ئنيەت.**

٢٣٠٥ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أُنْزِلَتْ هذِهِ الآيَةُ: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ﴾[البقرة:٢٢٥] فِي قَوْلِ الرَّجُلِ: لاَ وَاللهِ، وَبَلَى وَاللهِ. [خ٤٦١٣].

**ژ عائيشايێ (رضي الله عنها)، گۆت: ئەڤ ئايەتە: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ﴾ خودێ ب سويندا بێ ئنيەت و ئەوا بوويە ئاخفتن، ل هەوە ناگريت. د راستا سويندا مرۆڤيدا هاتە خوارێ: نە ب خودێ، و بەلێ ب خودێ.**

## ٦ ـ باب: اليمين الكاذبة (الغموس).

**بابەتێ: سويندا درەو ( تێداچۆيى).**

٢٣٠٦ - (م) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ، فَقَدْ أَوْجَبَ اللهُ لَهُ النَّارَ، وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ**) ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَإِنْ كَانَ شَيْئاً يَسِيراً، يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**وَإِنْ قَضِيباً مِنْ أَرَاكٍ**) . [م١٣٧].

**ژ ئەبی ئومامەتە ئيياسێ كورێ سەعلەبە (رضي الله عنه)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ حەقێ مرۆڤەكى ب سويندخوارنا خۆ ژێ بستينيت، ب راستى خودێ جەهنەم بۆ وى پێدڤى كرييە، و بەحەشت ل سەر حەرام كرييە)، زەلامەكى گۆت: خۆ هەكە تشتەكێ كێم ژى بيت يا پێغەمبەرێ خودێ؟! گۆت: (خۆ هەكە داركەكێ سيواكێ بيت).**

٢٣٠٧ - عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: اخْتَصَمَ رَجُلاَنِ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فِي أَرْضٍ، أَحَدُهُمَا مِنْ أَهْلِ حَضْرَمَوْتَ، قَالَ: فَجَعَلَ يَمِينَ أَحَدِهِمَا، قَالَ: فَضَجَّ الْآخَرُ وَقَالَ: إِنَّهُ إِذاً يَذْهَبُ بِأَرْضِي! فَقَالَ: (**إِنْ هُوَ اقْتَطَعَهَا بِيَمِينِهِ ظُلْماً، كَانَ مِمَّنْ لاَ يَنْظُرُ اللهُ عزّ وجل إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلاَ يُزَكِّيهِ، وَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ**) . قَالَ: وَوَرِعَ الْآخَرُ فَرَدَّهَا. [حم١٩٥١٤].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی مووسايی (رضي الله عنه) گۆت: دو زەلامان سەرا عەردەكی هەڤرکییا خۆ برنە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، و ئێك ژ وان خەلكێ حەزرەمەوتێ بوو، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) سويند ل سەر ئێكی ژ وان دانا، گۆت: يێ دی كرە هەوار و گۆت: ئەگەر وەسا بيت ئەو دێ**

**عەردێ من بەت! ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر وی ب سویندا خۆ و ژ ستەم ب دەستخۆڤە بر، ئەو دێ ژ وان بیت یێت رۆژا قیامەتێ خودێ بەرێ خۆدانا دلۆڤانیێ بەرێ خۆ نادەتێ، و گونەهێت وی ژێ نابەت، و ئیزایەكا دژوار بۆ وی یا هەی). گۆت: و یێ دی ترسیا سویند نەخوار.**

٧ ـ باب: من حلف على ملة غير الإسلام.

**بابەتێ: هەر كەسێ د سویندا خۆدا خۆ ژ ئیسلامێ بەریكەت.**

٢٣٠٨ – عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ حَلَفَ فَقَالَ: إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الْإِسْلَامِ، فَإِنْ كَانَ كَاذِباً فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَإِنْ كَانَ صَادِقاً فَلَنْ يَرْجِعَ إِلَى الْإِسْلَامِ سَالِماً) . [د٣٢٥٨/ ن٣٧٨١/ جه٢١٠٠].

* صحيح.

ژ بورەیدەیی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ سویند خوار و گۆت: ب راستی ئەز ژ ئیسلامێ بەریمە، هەكە یێ درەوین بیت ئەو یێ وەسایە هەروەكی گۆتی، و هەكە یێ راستگۆ بیت، ئەو بێ كێماسی نازڤریتەڤە ئیسلامێ).**

٨ ـ باب: اليمين على نية المستحلِف.

**بابەتێ: سویند ل سەر ئنیەتا یێ دایە سویندێ.**

٢٣٠٩ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ عَلَيْهِ صَاحِبُكَ)** . وَقَالَ عَمْرٌو: (**يُصَدِّقُكَ** بِهِ صَاحِبُكَ) . [م١٦٥٣].

- وفي رواية: (**الْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ**) .

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(سویندا تە ل سەر وێیە یا هەڤالێ تە ل سەر باوەر ژ تە دكەت). و عەمری گۆت: (هەڤالێ تە ب وێ تە راست بزانیت).**

- **و د ڤەگێرەكێدا: (سویند ل دویف ئنیەتا یێ دایە سویندێ).**

٩ ـ باب: في يمين النَّبي (ﷺ).

**بابەتێ: سویندا پێغەمبەری (ﷺ).**

٢٣١٠ – (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: كَثِيراً مِمَّا كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَحْلِفُ: (**لَا، وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ**).[خ٦٦١٧].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گەلەك جاران پێغەمبەری (ﷺ) سویند دخوار: (نە، ب وەرگێرێ دلان).**

## ١٠ ـ باب: الاستثناء في اليمين.

**بابەتێ: گۆتنا (إن شاء الله) د سويندێدا.**

٢٣١١ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى، فَإِنْ شَاءَ رَجَعَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرَ حِنْثٍ) . [د٣٢٦٢/ ت١٥٣١/ ن٣٨٠٢/ جه٢١٠٥/ مي٢٣٨٧].

* صحيح.

ژ ئيبن عومەرى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ سويندێ بخۆت و بێژيت (إن شاء الله)، ئەگەر وى ڤيا دێ لێ زڤريت و ئەگەر ڤيا دێ هێليت بێيى سويندا وى بكەڤيت).**

٢٣١٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللهُ، لَمْ يَحْنَثْ) . [ت١٥٣٢/ ن٣٨٦٤/ جه٢١٠٤].

* صحيح.

ژ ئەبى هورەيرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ ل سەر سويندەكێ سويند بخۆت و گۆت: (إن شاء الله) سويندا وى ناكەڤيت).**

## ١١ ـ باب: النهي أن يقال: ما شاء الله وشئت.

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ وێ بهێتە گۆتن: هندى خودێ حەز كەت و تو حەز كەى.**

٢٣١٣ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا حَلَفَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَقُلْ: مَا شَاءَ اللهُ وَشِئْتَ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ شِئْتَ) . [جه٢١١٧].

* حسن صحيح.

ژ ئيبن عەباسى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێكێ ژ هەوە سويند خوار، بلا نەبێژيت: هندى خودێ حەز كەت و تو حەز كەى، بەلێ بلا بێژيت: هندى خودێ حەز كەت و پاشى تو حەز كەى).**

## ١٢ ـ باب: المعاريض في اليمين.

## بابەتێ: كارئينانا كنايا د سويندێدا.

٢٣١٤ – عَنْ سُوَيْدِ بْنِ حَنْظَلَةَ قَالَ: خَرَجْنَا نُرِيدُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَمَعَنَا وَائِلُ بْنُ حُجْرٍ، فَأَخَذَهُ عَدُوٌّ لَهُ، فَتَحَرَّجَ الْقَوْمُ أَنْ يَحْلِفُوا، وَحَلَفْتُ أَنَّهُ أَخِي، فَخَلَّى سَبِيلَهُ، فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَأَخْبَرْتُهُ: أَنَّ الْقَوْمَ تَحَرَّجُوا أَنْ يَحْلِفُوا، وَحَلَفْتُ أَنَّهُ أَخِي، قَالَ: (**صَدَقْتَ، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ**).[د٣٢٥٦/ جه٢١١٩].

* صحيح.

**ژ سوەیدێ كورێ حەنزەلەی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم دەركەفتین مە پێغەمبەرێ خودێ دڤیا، و وائیلێ كورێ حەجەری د گەل مە بوو، ئینا خویندارەكێ وی گرت و بر، و خەلكێ ب گونە هزانی سویند بخۆن، و من سویند خوار ئەو برایێ منە، ئینا رێك دایێ و بەردا، ئەم هاتینە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و من بۆ وی ڤەگێرا كو خەلكی ب گونە هزانی سویند بخۆن، و من سویند خوار ئەو برایێ منە، گۆت: (تە راست گۆت، موسلمان برایێ موسلمانییە).**

## ١٣ ـ باب: اليمين في قطيعة الرحم.

## بابەتێ: سویند د برینا مرۆڤانییێدا.

٢٣١٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ نَذْرَ إِلاَّ فِيمَا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللهِ، وَلاَ يَمِينَ فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ**) . [د٣٢٧٣].

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەزر ناهێتە كرن ئەو نەبیت د رازیبوونا خودێدا بیت، و سویند د برینا مرۆڤانییێدا ناهێتە خوارن)[1].**

٢٣١٦ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ حَلَفَ فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ، أَوْ فِيمَا لاَ يَصْلُحُ، فَبِرُّهُ أَنْ لاَ يَتِمَّ عَلَى ذَلِكَ**) . [جه٢١١٠].

* صحيح.

---

(١) ئانكو: نەدورستە نەزر و سویند د حەرامیدا بهێنە كرن، و ئەگەر كر دڤێت كەفارەتێ بدەت.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسەکێ سویندێ د برینا مرۆڤانیییێدا یان د تشتەکێ نەباشدا بخۆت پێگری ب سویندێ ئەوە وی تشتی نەکەت).

## ١٤ ـ باب: في الكفارة.

## بابەتێ: سزایی (گونەهژێبەری).

٢٣١٧ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: مَنْ حَلَفَ بِيَمِينٍ فَوَكَّدَهَا، ثُمَّ حَنِثَ فَعَلَيْهِ عِتْقُ رَقَبَةٍ، أَوْ كِسْوَةُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ، وَمَنْ حَلَفَ بِيَمِينٍ فَلَمْ يُؤَكِّدْهَا، ثُمَّ حَنِثَ فَعَلَيْهِ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ، لِكُلِّ مِسْكِينٍ مُدٌّ مِنْ حِنْطَةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ، فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ. [ط١٠٣٥].

* إسناده صحيح.

ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەر کەسێ سویندەکێ بخۆت و دوبارە بکەت بکەت و پاشی بشکێنیت، ل سەر وییە بەندەیەکی ئازا بکەت یان جلکی بکەتە بەر دەهـ هەژاران، و هەر کەسێ سویندەکێ بخۆت و دوبارە نەکەت و پاشی سویندا خۆ بشکێنیت، ل سەر وییە خوارنێ بدەتە دەهـ هەژاران، بۆ هەر هەژارەکی مستەکا هەردو دەستان ژ گەنمی، و یێ نەبوو، سێ رۆژی ل سەرن.



## الفصل الثاني: النذر.

## پشكا دوویێ: نەزر.

### ١ ـ باب: الأَمر بوفاء النذر.

### بابەتێ: فەرمان ب جهئینانا نەزرێ.

٢٣١٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ رضي الله عنه، اسْتَفْتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ، فَقَالَ: (**اقْضِهِ عَنْهَا**). [خ٢٧٦١/ م١٦٣٨].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) سەعدێ كورێ عوبادەیی (رضي الله عنه) پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، گۆت: دایكا من مر و نەزرەك ل سەر بوو، ئینا گۆت: (پێشڤە بدە).**

٢٣١٩ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ عُمَرَ سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ نَذَرْتُ فِي الجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي المَسْجِدِ الحَرَامِ؟ قَالَ: (**فَأَوْفِ بِنَذْرِكَ**). [خ٢٠٣٢/ م١٦٥٦].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومەری پرسیار ژ پێغەمبەری كر (ﷺ) گۆت: من د نەزانینێدا نەزر كربوو ئەز شەڤەكێ ئعتیكافێ ل مزگەفتا كەعبێڤە بكەم؟ گۆت: (نەزرێ خۆ ب جهـ بینە).**

٢٣٢٠ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَضْرِبَ عَلَى رَأْسِكَ بِالدُّفِّ، قَالَ: (**أَوْفِي بِنَذْرِكِ**). قَالَتْ: إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَذْبَحَ بِمَكَانِ كَذَا وَكَذَا ـ مَكَانٌ كَانَ يَذْبَحُ فِيهِ أَهْلُ الجَاهِلِيَّةِ ـ قَالَ: (**لِصَنَمٍ**) ؟ قَالَتْ: لاَ، قَالَ: (**لِوَثَنٍ**) ؟ قَالَتْ: لاَ، قَالَ: (**أَوْفِي بِنَذْرِكِ**). [د٣٣١٢].

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (رضي الله عنه) گۆت: ژنەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی من نەزر كربوو ئەز ل هنداڤ سەرێ تە دەفێ لێ بدەم، گۆت: (نەزرێ خۆ ب جهـ بینە) گۆت: من نەزر كربوو ئەز سەرەكی ل فلان جهی و فلان جهی ڤەكوژم، جهەك بوو خلكێ نەزانینێ ل وێرێ ڤەدكوشتن، گۆت: (بۆ بوتەكییە)؟ وێ گۆت: نەخێر، گۆت: (بۆ تشتەكییە ژ بلی خودێ دهێتە پەرستن)؟ وێ گۆت: نەخێر، گۆت: (نەزرێ خۆ ب جهـ بینە).**

## ٢ ـ باب: النهي عن النذر.

### بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ نەزری.

٢٣٢١ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) عَنِ النَّذْرِ، قَالَ: (**إِنَّهُ لاَ يَرُدُّ شَيْئاً، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ**). [خ٦٦٠٨/ م١٦٣٩].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ نەزرێ كری و گۆت: (ئەو چو تشتی نادەتە پاش و ئەو بەس ژ ئەگەرێ نەزرێ ژ چرویكی دەردكەڤیت)[1].**

## ٣ ـ باب: النذر في الطاعة.

### بابەتێ: نەزر د گوهدارییێدا.

٢٣٢٢ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللهَ؛ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ؛ فَلاَ يَعْصِهِ**). [خ٦٦٩٦].

[وانظر: ٢٣١٥][2].

**ژ عائیشایێ (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ نەزر كر گوهدارییا خودێ بكەت، بلا گوهدارییا وی بكەت، و هەر كەسێ نەزر كر نەگوهداریا خودێ بكەت، بلا نەگوهدارییا وی نەكەت).**

## ٤ ـ باب: من نذر المشي إلى الكعبة.

### بابەتێ: یێ نەزر بكەت ب پێیان بچیتە كەعبەیێ.

٢٣٢٣ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَأَى شَيْخاً يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ، قَالَ: (**مَا بَالُ هَذَا؟**) قَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ، قَالَ: (**إِنَّ اللهَ عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ لَغَنِيٌّ**)، وَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ.[خ١٨٦٥/ م١٦٤٢].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) پیرەمێرەك دیت دو كورێت وی ملێت وی یێت گرتین و دچیت، گۆت: (ئەڤێ خێرە)؟ گۆتن: نەزر یێ كری ب پێیان بچیت، گۆت: (خودێ منەت پێ نینە ئەڤە خۆ ئێزا بدەت). و فەرمانا وی كر سویار ببیت.**

---

(١) چونكی مرۆڤێ مەرد بێ مەرج مالێ خۆ ددەت و مەرجی د گەل خودێ ناكەت، ئەگەر تە ئەڤە بۆ من كر ئەڤ تشتە ل سەر منە.

(٢) شیخ سالح شامی ئەڤە د مالپەریدا زێدەكرییە و د چاپا ئێكێدا نینە.

٢٣٢٤ - (ق) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: نَذَرَتْ أُخْتِي أَنْ تَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اللهِ، وَأَمَرَتْنِي أَنْ أَسْتَفْتِيَ لَهَا النَّبِيَّ (ﷺ)، فَاسْتَفْتَيْتُهُ، فَقَالَ (ﷺ): (لِتَمْشِ وَلْتَرْكَبْ). [خ١٨٦٦/ م١٦٤٤].

**ژ عوقبەیێ كورێ عامری (رضي الله عنه) گۆت: خویشكا من نەزر كر ب پێیان بچیتە مالا خودێ كەعبێ، و فەرمانا من كر ئەز بۆ وێ پرسیارێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) بكەم، من پرسیار ژێ كر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بلا ب پێیان بچیت و سویار ببیت)[1].**

## ٥ ـ باب: لا نذر في معصية ولا فيما لا يملك.

## بابەتێ: نە نەزر د گونەهێدا دورستە و نە د وێدا یا نە د شیاناندا.

٢٣٢٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بَيْنَا النَّبِيُّ (ﷺ) يَخْطُبُ، إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَائِمٍ، فَسَأَلَ عَنْهُ فَقَالُوا: أَبُو إِسْرَائِيلَ، نَذَرَ أَنْ يَقُومَ وَلاَ يَقْعُدَ، وَلاَ يَسْتَظِلَّ، وَلاَ يَتَكَلَّمَ، وَيَصُومَ. فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (مُرْهُ؛ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ، وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ). [خ٦٧٠٤].

**ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) خوتبە دخواند زەلامەك دیت یێ شپیاڤە، پرسیارا وی كر، گۆتن: ئەو ئەبو ئیسرائیلە، یا نەزر كری ل بەر رۆژێ راوەستیت، و نەروینیتە خوارێ، و نەچیتە بەر سیبەرێ، و نەئاخڤیت و یێ ب رۆژی بیت، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەمرێ وی بكەن بلا باخڤیت، و بچیتە بەر سیبەرێ و رۆژییا خۆ ببەتە سەری).**

٢٣٢٦ - عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيِّ (ﷺ): (لاَ نَذْرَ لاِبْنِ آدَمَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ، وَلاَ فِي مَعْصِيَةِ اللهِ عزّ وجل). [ن٣٨٥٨].

* صحيح.

**ژ عیمرانێ كورێ (حصین)ی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نەزر ل سەر مرۆڤی د تشتێ نەیدا نینە و د نەگوهدارییا خودێدا ژی نینە).**

---

[1] ئانكو: ما دەم دشێت ب پێیان بچیت بلا ب پێیان بچیت و نەگەر وەستیا بلا سویار ببیت.

## ٦ ـ باب: كفارة النذر

**بابەتێ: كەفارەتا نەزرێ.**

٢٣٢٠ – (م) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قال: **(كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ)**.[م١٦٤٥].

**ژ عوقبەیێ كوڕێ عامری ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەفارەتا نەزرێ كەفارەتا سویندێیە).**

٢٣٢٨ – عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(النَّذْرُ نَذْرَانِ: فَمَا كَانَ مِنْ نَذْرٍ فِي طَاعَةِ اللهِ، فَذَلِكَ لِلَّهِ وَفِيهِ الْوَفَاءُ، وَمَا كَانَ مِنْ نَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللهِ، فَذَلِكَ لِلشَّيْطَانِ، وَلاَ وَفَاءَ فِيهِ، وَيُكَفِّرُهُ مَا يُكَفِّرُ الْيَمِينَ)**. [ن٣٨٥٤].

* صحيح.

**ژ عیمرانێ كوڕێ (حصین)ی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نەزر دو نەزرن، ڤێجا هندی ئەو نەزرا د گوهدارییا خودێدایە، ئەو بۆ خودێیە، و ب جهئینان یا تێدا، و هندی ئەو نەزرا د نەگوهدارییا خودێدایە، ئەو بۆ شەیتانییە، و ب جهئینان تێدا نینە، و كەفارەتا وێ كەفارەتا سویندێیە).**

## ٧ ـ باب: من مات وعليه نذر.

**بابەتێ: یێ بمریت و نەزر ل سەر بیت.**

٢٣٢٩ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ امْرَأَةً رَكِبَتِ الْبَحْرَ، فَنَذَرَتْ إِنْ نَجَّاهَا اللهُ أَنْ تَصُومَ شَهْراً، فَنَجَّاهَا اللهُ، فَلَمْ تَصُمْ حَتَّى مَاتَتْ، فَجَاءَتْ ابْنَتُهَا أَوْ أُخْتُهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَأَمَرَهَا أَنْ تَصُومَ عَنْهَا. [د٣٣٠٨/ ن٣٨٢٥].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنەك ل دەریایێ سویار بوو، ئینا نەزر كر ئەگەر خودێ ئەو رزگار كر، ئەو هەیڤەكێ ب رۆژی بیت، ئینا خودێ رزگار كر، و رۆژی نەگرتن هەتا مری، ئینا كچا وێ یان خویشكا وێ هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئینا فەرمانا وێ كر ئەو پێشڤە بگریت.**

## ٨ ـ باب: نذر الصلاة في بيت المقدس.

### بابەتێ: ئەوێ نەزر بکەت نڤێژێ ل قودسێ بکەت.

٢٣٣٠ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَجُلاً قَامَ يَوْمَ الْفَتْحِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي نَذَرْتُ لِلَّهِ إِنْ فَتَحَ اللهُ عَلَيْكَ مَكَّةَ أَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ رَكْعَتَيْنِ، قَالَ: (**صَلِّ هَاهُنَا**)، ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: (**صَلِّ هَاهُنَا**)، ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: (**شَأْنُكَ إِذَنْ**). [د٣٣٠٥/ مي٢٣٨٤]

* صحيح.

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەك ل سالا ڤەکرنا مەکەهێ رابوو، ئینا گۆت، ئەی پێغەمبەرێ خودێ من نەزرەك بۆ خودێ کربوو ئەگەر خودێ مەکەه بۆ تە ڤەکر، ئەز دو رکعەتێت نڤێژێ ل قودسێ بکەم، گۆت: (ل ڤێرێ نڤێژێ بکە)، پاشی پرسیارا خۆ دوبارە کر، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ل ڤێرێ نڤێژێ بکە)، پاشی پرسیارا خۆ دوبارە کر پێغەمبەری گۆت: (مادەم وەسایە وێ بکە یا تە دڤێت).**

## ٩ ـ باب: من نذر أن يتصدق بماله.

### بابەتێ: یێ نەزر بکەت مالێ خۆ بکەتە خێر.

٢٣٣١ - عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) . أَوْ أَبُو لُبَابَةَ، أَوْ مَنْ شَاءَ اللهُ .: إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَهْجُرَ دَارَ قَوْمِي الَّتِي أَصَبْتُ فِيهَا الذَّنْبَ، وَأَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي كُلِّهِ صَدَقَةً، قَالَ: (**يُجْزِئُ عَنْكَ الثُّلُثُ**). [د٣٣١٩].

* صحيح الإسناد.

**ژ کەعبێ کورێ مالکی (ﷺ) وی یان ئەبو لوبابەیی یان ئەوێ خودێ ڤیایی[1] گۆتە پێغەمبەری (ﷺ) ژ تەوبا من ئەز د ناڤ مللەتێ خۆ یێ من گونەه د ناڤدا کری مشەخت ببم، و ئەز ژ مالێ خۆ هەمییێ دەرکەڤم وەك خێر، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (سێکا مالێ تە بەسی تەیە و جهێ وێ دگریت).**



(١) ئانکو: هەر کەسێ هەبیت.

## الفصل الأول: احكام النكاح

## پشكا ئێكێ: فەرمانێت هەڤژینییێ.

### ١ ـ باب: الترغيب في النكاح.

### بابەتێ: پالدان ل سەر هەڤژینییێ.

٢٣٣٢ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ قَدْ غَفَرَ الله لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ. قالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَداً، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ، وَقَالَ آخرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبداً. فَجَاءَ رَسُولُ الله (ﷺ) فَقَالَ: **(أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا؟ أَمَا والله، إِنِّي لأَخْشَاكُمْ للهِ، وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي)**. [خ ٥٠٦٣/ م١٤٠١].

**ژ ئەنەسی (ﷺ)، گۆت: سێ زەلام هاتنە مالێت كابانییێت پێغەمبەری (ﷺ) پرسیارا پەرستن و عیبادەتێ پێغەمبەری (ﷺ) كرن، ڤێجا وەختێ بۆ هاتییە گۆتن، هەروەكی وان كێم داناى، ئینا گۆتن: ئەم ل كیرێ و پێغەمبەر (ﷺ) ل كیرێ، گونەهێت وی پێش و پاش ییێت هاتینە ژێبرن. ئێكی ژ وان گۆت: هندیكە ئەزم ئەز دێ شەڤان هەر و هەر ساخ كەم و نڤێژان كەم. و یێ دی گۆت: ئەز هەر و هەر دێ یێ ب رۆژی بم و رۆژییان ناخۆم. و یێ دی گۆت: ئەز دێ خۆ ژ ژنان دەمە پاش و د بنیدا ژنێ نائینم. پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هات گۆت: (هوینن ئەوێت هەوە ئەڤە و ئەڤە گۆتین؟ ئەز ب خودێ كەمە ئەز ژ هەوە خودێ ترستر و پارێزكارترم، بەلێ ئەز رۆژییێ دگرم و دخۆم، و ب شەڤ نڤێژێ دكەم و دنڤم، و ژنان دئینم، و هەر كەسێ رێكا من بهێلیت نە ژ منە).**

٢٣٣٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قال: كُنَّا مَعَ النبيِّ (ﷺ) شَبَاباً لا نَجِدُ شَيئاً، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ الله (ﷺ): **(يَا مَعْشَرَ الشَّبَاب، مَنِ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرَجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجاءٌ )**. [خ٥٠٦٦ (١٩٠٥)/ م١٤٠٠].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: ئەم كۆمەكا گەنجان ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بووین و مە چو تشت نەبوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (گەلی**

**گەنجان هەر كەسێ شیان هەبن بلا هەڤژینییێ بكەت، ب راستی ئەو پتر چاڤی دگریت، و پتر شەرمینگەهێ پاك دكەت، و یێ نەشێت ل سەر وییە یێ ب رۆژی بیت، ب راستی ئەو حەزا خراب دشكێنیت).**

٢٣٣٤ - عَنْ أَبِي نَجِيحٍ المكِّيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ قَدَرَ عَلَى أَنْ يَنْكِحَ، فَلَمْ يَنْكِحْ، فَلَيْسَ مِنَّا)**. [مي٢٢١٠].

* رجاله ثقات، مرسل.

**ژ ئەبی نەجیحێ مەككی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ شیانا هەڤژینییێ هەبیت و هەڤژینییێ نەكەت، ئەو نە ژ مەیە).**

## ٢ . باب: كراهة التبتل والخصاء.

## بابەتێ: نەباشییا ژنئەنیانێ و خەساندنێ.

٢٣٣٥ - (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: رَدَّ رَسُولُ الله (ﷺ) عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ، وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لاخْتَصَيْنَا. [خ٥٠٧٣/ م١٤٠٢].

**ژ سەعدێ كورێ ئەبی وەقاسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رازی نەبوو عوسمانێ كورێ مەزعوونی ژنێ نەئینیت ب هێجەتا خۆڤالاكرنێ بۆ پەرستنێ و ئەگەر دەستویری دابایێ ئەم دا خۆ خەسینین.**

## ٣ . باب: أنواع النكاح في الجاهلية.

## بابەتێ: رەنگێت هەڤژینییێ د نەزانینێدا.

٢٣٣٦ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) .: أَنَّ النِّكَاحَ فِي الجَاهِلِيَّةِ كَانَ على أَرْبَعَةِ أَنْحَاءٍ:

فَنِكَاحٌ مِنْهَا نِكَاحُ النَّاسِ الْيَوْمَ: يَخْطُبُ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ وَلِيَّتَهُ أَوِ ابْنَتَهُ، فَيُصْدِقُهَا، ثُمَّ يَنْكِحُهَا.

وَنِكَاحٌ آخَرُ: كانَ الرَّجُلُ يَقُولُ لامْرَأَتِهِ إِذَا طَهُرَتْ مِنْ طَمْثِهَا: أَرْسِلِي إِلَى فُلاَنٍ فَاسْتَبْضِعِي مِنْهُ، وَيَعْتَزِلُهَا زَوْجُهَا وَلاَ يَمَسُّهَا أَبَداً، حَتَّى يَتَبَيَّنَ حَمْلُهَا مِنْ ذَلِكَ الرَّجُلِ الَّذِي تَسْتَبْضِعُ مِنْهُ، فَإِذَا تَبَيَّنَ حَمْلُهَا أَصَابَهَا زَوْجُهَا إِذَا أَحَبَّ، وَإِنَّمَا يَفْعَلُ ذلِكَ رَغْبَةً فِي نَجَابَةِ الْوَلَدِ، فَكَانَ هذَا النِّكَاحُ نِكَاحَ الاسْتِبْضَاعِ.

وَنِكَاحٌ آخَرُ: يَجْتَمِعُ الرَّهْطُ ما دُونَ الْعَشَرَةِ، فَيَدْخُلُونَ عَلَى المرْأَةِ، كُلُّهُمْ يُصِيبُهَا، فَإِذَا حَمَلَتْ وَوَضَعَتْ، وَمَرَّ عَلَيْهَا لَيَالٍ بَعْدَ أَنْ تَضَعَ حَمْلَهَا، أَرْسَلَتْ إِلَيْهِمْ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ رَجُلٌ مِنْهُمْ أَنْ يَمْتَنِعَ، حَتَّى

يَجْتَمِعُوا عِنْدَهَا، تَقُولُ لَهُمْ: قَدْ عَرَفْتُمُ الَّذِي كَانَ مِنْ أَمْرِكُمْ وَقَدْ وَلَدْتُ، فَهُوَ ابْنُكَ يَا فُلاَنُ، تُسَمِّي مَنْ أَحَبَّتْ بِاسْمِهِ فَيَلْحَقُ بِهِ وَلَدُهَا، لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَمْتَنِعَ مِنْهُ الرَّجُلُ.

وَنِكَاحُ الرَّابِعِ: يَجْتَمِعُ النَّاسُ الْكَثِيرُ، فَيَدْخُلُونَ عَلَى الْمَرْأَةِ، لاَ تَمْتَنِعُ مِمَّنْ جَاءَهَا، وَهُنَّ الْبَغَايَا، كُنَّ يَنْصِبْنَ عَلَى أَبْوَابِهِنَّ رَايَاتٍ تَكُونُ عَلَماً، فَمَنْ أَرَادَهُنَّ دَخَلَ عَلَيْهِنَّ، فَإِذَا حَمَلَتْ إِحْدَاهُنَّ وَوَضَعَتْ حَمْلَهَا جُمِعُوا لَهَا، وَدَعَوْا لَهُمُ الْقَافَةَ، ثُمَّ أَلْحَقُوا وَلَدَهَا بِالَّذِي يَرَوْنَ، فَالْتَاطَ بِهِ، وَدُعِيَ ابْنَهُ، لاَ يَمْتَنِعُ مِنْ ذَلِكَ.

فَلَمَّا بُعِثَ مُحَمَّدٌ (ﷺ) بِالْحَقِّ، هَدَمَ نِكَاحَ الْجَاهِلِيَّةِ كُلَّهُ؛ إِلاَّ نِكَاحَ النَّاسِ الْيَوْمَ. [خ٥١٢٧].

**عائیشایێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ژنئینان د نەزانینێدا ل سەر چوار رەنگان بوو:**

**ژنئینانەك ژ وان وەكی هەڤژینییا ئەڤرۆ یا خەلكییە، زەلامەكی دا خویشك یان كچا زەلامەكێ دی خوازیت و مەهرا وێ دەت و پاشی دا مارەكەت.**

**و ژنئینانەكا دی: زەلامی دگۆتە ژنا خۆ دەمێ ژ بێنڤێژیا خۆ پاقژ ببا هەرە دەڤ فلانی و ژێ بخوازە بهێتە نڤینا تە، و خۆ ژێ ڤەدگرت و د بنیدا نێزیك نە دبوو هەتا دوگیانییا وێ ژ وی زەلامی ئاشكرا ببا، ڤێجا ئەگەر دوگیانییا وێ ئاشكرا ببا داچیتە نڤینا وێ ئەگەر ڤیابا، و وی ئەڤە دكر ژ بەر حەزا زارۆكەكێ بەركەفتی و ئەڤ هەڤژینییە هەڤژینییا نڤینخواستنێیە.**

**و ژنئینانەكا دی: كۆمەكا زەلامان ژ دەهان كێمتر دچۆنە مالا ژنەكێ و هەمی دچۆنە نڤینا وێ، و ئەگەر ب دوگیان كەتبا و بچویكێ خۆ دانابا و چەند شەڤ ل سەر بچویكبوونا وێ بۆریبان دا ڤرێكەتە دویف وانرا، و كەس نەدشیا نەهێت، ڤێجا دەمێ ل دەڤ وێ كۆم دبوون دا بێژیتە وان: هوین دزانن هەوە چ كار كرییە، و من زارۆك یێ بووی و ئەو كوڕێ تەیە فلان، و وێ كیژ دڤیا بچویكێ خۆ ب ناڤێ وی ب ناڤ دكر، و بچویكێ خۆ پالدا وی، و زەلام نەدشیا رێگرییێ لێ بكەت.**

**و ژنئینانا چوارێ: دا خەلەكێ گەلەك كۆم بیت و چنە دەڤ ژنەكێ، و وێ كەس ژ وان یێت هاتینە دەڤ نەددا پاش، و ئەڤە لەشفرۆش بوون، ئالا ل سەر دەرگەهێت خۆ دچكلاندن، د بوو نیشان، ڤێجا یێ ڤیابا دچۆنە دەڤ وان، و ئەگەر ئێك ژ وان دوگیان كەتبا و بچویكێ خۆ دانابا دا بۆ هێنە كۆمكرن و دا مرۆڤناس و شارەزایان بۆ وان ئینن و**

**پاشی دا بچویكی ب بال ویڤە لێدەن یێ وان دیتبا، و ب ویڤە دهاتە نویسان و ب كورێ وی دهاتە گازیكرن و وی رێگری ل ڤی كاری نەدكر.**

**ڤێجا دەمێ موحەممەد (ﷺ) ب راستییێ هاتییە هنارتن ژنئینانێت نەزانینێ هەمی هەرفاندن، هەڤژینییا ئەڤرۆ یا خەلكی نەبیت.**

**٤ ـ باب: (فاظفر بذات الدين).**

**بابەتێ: (بگەهە یا دیندار).**

٢٣٣٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا؛ فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ).** [خ٥٠٩٠/ م١٤٦٦].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ژن بۆ چار تشتان دئێتە مارەكرن: بۆ مالێ وێ و بۆ مالباتا وێ و بۆ جوانییا وێ و بۆ دینێ وێ، بگەهە یا خودان دین[1] دەستێت تە ب ئاخێ بكەڤن و هەژار ببی).**

**٥ ـ باب: خير المتاع المرأة الصالحة.**

**بابەتێ: باشترین خۆشی ژنا باشە.**

٢٣٣٨ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: **(الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ).** [م١٤٦٧].

**و ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دنیا خۆشییەكا بەروەختە و باشترین خۆشییا دنیایێ ژنا باشە).**

٢٣٣٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ): أَيُّ النِّسَاءِ خَيْرٌ؟ قَالَ: **(الَّتِي تَسُرُّهُ إِذَا نَظَرَ، وَتُطِيعُهُ إِذَا أَمَرَ، وَلاَ تُخَالِفُهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهَا بِمَا يَكْرَهُ).** [ن٣٢٣١].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: ئێكی گۆتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كیژ ژن ژ هەمیان باشترە؟ گۆت: (ئەوا وی دلخۆش بكەت، ئەگەر بەرێ خۆ دایێ، و ئەوا گوهدارییا**

---

(١) ئانكو: هەكە تە وەنەكر و ل سەر ڤی بنیاتی ژن نەهەلبژارت. رامانا حەدیسێ ئەوە: خەلك بارا پتر ژنێ ژ بەر ڤان هەرچار خاسلەتان دهەلبژێرن، ڤێجا تو ل سەر یا خودان دین رژد بە و وێ بگەهینە خۆ و ل سەر هەڤالینییا وێ یێ رژد بە.

**وی بکەت ئەگەر فەرمان لێ کر، و ئەوا نە د خۆدا و نە د مالێ خۆدا تشتەکی زەلامێ وێ پێ نەخۆش نەکەت).**

## ٦ ـ باب: الكفاءة في الدين

### بابەتێ: هەڤکویفی د دینیدایە.

٢٣٤٠ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ؛ فَزَوِّجُوهُ، إِلاَّ تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ). [ت١٠٨٤/ جه١٩٦٧].

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر هوین ژ دین و رەوشتێ ئێکی رازیبوون و کچەك ژ هەوە خواست بدەنێ، ئەگەر هوین ڤێ نەکەن، دێ بەلا و خرابییەکا مەزن د عەردیدا پەیدا بیت).**

## ٧ ـ باب: نكاح الأبكار.

### بابەتێ: مارەکرنا کچان.

٢٣٤١ - (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ الله رضي الله عنهما قَالَ: هَلَكَ أَبِي وَتَرَكَ سَبْعَ بَنَاتٍ . أَوْ تِسْعَ بَنَاتٍ . فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً ثَيِّباً، فَقَالَ لِي رَسُولُ الله (ﷺ): (تَزَوَّجْتَ يَا جَابِرُ) ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: (بِكْراً أَمْ ثَيِّباً) ؟ قُلْتُ: بَلْ ثَيِّباً، قالَ: (فَهَلاَّ جارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاعِبُكَ، وَتُضَاحِكُهَا وَتُضَاحِكُكَ). قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ عَبْدَ الله هَلَكَ، وَتَرَكَ بَنَاتٍ وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَجِيئَهُنَّ بِمِثْلِهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً تَقُومُ عَلَيْهِنَّ وَتُصْلِحُهُنَّ، فَقَالَ: (بَارَكَ الله لَكَ، أَوْ قَالَ : خَيْراً). [خ٥٣٦٧ (٤٤٣)/ م: المساقاة. ٧١٥ (١١٠)].

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: بابێ من مر، و حەفت کچ یان نەهـ کچ هێلان، ئینا من بیژنەك مارە کر، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (تە ژن ئینا ئەی جابر). من گۆت: بەلێ، گۆت: (کچە یان بیژنە)؟ من گۆت: من بیژنەك یا ئینای، گۆت: (بۆچی کچ نەدبوو تە تڕانە د گەل کربان و وێ تڕانە د گەل تە کربان، و تو د گەل بکەنی و ئەو د گەل تە بکەنیت یان تو کەنییێ وێ بینی و ئەو کەنییێ تە بینیت) گۆت: من گۆتە وی: عەبدوللاهـ یێ مری و کچ یێت هێلاین، و من نەدڤیا ئەز ئێکا وەکی وان بۆ وان بینم، من ژنەك ئینا ب کارێ وان رابیبیت و وان ب سەروبەر بکەت، ئینا گۆت: (خودێ بۆتە بەرەکەتێ بێخیتێ یان گۆت: خێرێ).**

٢٣٤٢ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ نَزَلْتَ وَادِياً وَفِيهِ شَجَرَةٌ قَدْ أُكِلَ مِنْهَا، وَوَجَدْتَ شَجَراً لَمْ يُؤْكَلْ مِنْهَا، فِي أَيِّهَا كُنْتَ تُرْتِعُ بَعِيرَكَ؟ قَالَ: **(فِي الَّتِي لَمْ يُرْتَعْ مِنْهَا)**. تَعْنِي: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) لَمْ يَتَزَوَّجْ بِكْراً غَيْرَهَا. [خ٥٠٧٧].

**ژ عائیشایێ (﵂) گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ كا بێژە من، ئەگەر تو چۆیە نهالەكێ و دارەك لێ هەبیت ژێ هاتبیتە خوارن، و تە دارەك دیت ژێ نەهاتییە خوارن، تو دێ حێشترا ل كیژكێ ژ وان چەرینی؟ گۆت: (ژ وێ یا نەهاتییە چەراندن) مەبەستا وێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چو كچ ژ بلی وێ نەئینایینە.**

## ٨ ـ باب: المحرمات من النساء.

## بابەتێ: ئەوێت حەرام ژ ژنان.

٢٣٤٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قالَ: **(لا يُجْمَعُ بَيْنَ المرأةِ وعمَّتِهَا، وَلاَ بَيْنَ المَرْأَةِ وَخَالَتِهَا)**. [خ٥١٠٩/ م١٤٠٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د نافبەرا ژنێ و مەتا وێدا ناهێتە كۆمكرن و د نافبەرا ژنێ و خالەتا وێدا ناهێتە كۆمكرن).**

## ٩ ـ باب: تحريم نكاح الشغار.

## بابەتێ: حەرامكرنا مارەكرنا پێكوهۆركانێ.

٢٣٤٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) نَهَى عَنِ الشِّغَارِ. وَالشِّغَارُ أَنْ يَزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يَزَوِّجَهُ الآخَرُ ابْنَتَهُ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ. [خ٥١١٢/ م١٤١٥].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشفەلێدانا ژ پێكوهۆركانێ كری، و پێكوهۆركانێ ئەوە زەلام كچا خۆ ل زەلامی مارە بكەت بەرامبەر یێ دی كچا خۆ ل وی مارە بكەت، و مەهر د نافبەرا واندا نەبیت.**

## ١٠ ـ باب: نكاح المُحْرِم.

## بابەتێ: مارەكرنا ئیحرامگیری.

٢٣٤٥ - (م) عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ عُبَيْدِ اللهِ أَرَادَ أَنْ يُزَوِّجَ طَلْحَةَ بْنَ عُمَرَ، بِنْتَ شَيْبَةَ بْنِ جُبَيْرٍ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ يَحْضُرُ ذَلِكَ، وَهُوَ أَمِيرُ الْحَجِّ. فَقَالَ أَبَانٌ: سَمِعْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(لاَ يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ، وَلاَ يُنْكَحُ، وَلاَ يَخْطُبُ)**. [م١٤٠٩]

**ژ نوبەیهێ كوڕێ وەهبی (رحمه الله) گۆت: عومەرێ كوڕێ عوبەیدوللایی دڤیا كچا شەیبەیێ كوڕێ جوبەیری ل تەلحەیێ كوڕێ عومەری مارە بكەت، ڤێجا ڤرێكرە دویڤ ئەبانێ كوڕێ عوسمانیڕا ل سەر ڤێ چەندێ ئامادە ببیت و ئەو سەرداری حەجێ بوو، ئینا ئەبانی گۆت: من گوە ل عوسمانێ كوڕێ عەففانی بوو دگۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئیحرامگر نە ژنێ ل خۆ مارە دكەت نە ل ئێكێ دی مارە دكەت و نە دخوازیت).**

## ١١ ـ باب: النهي عن نكاح المتعة أخيراً.

## بابەتێ: دویماهی جار پاشڤەلێدان ژ مارەكرنا میتعێ.

٢٣٤٦ – (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ وَسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، قَالاَ: كُنَّا فِي جَيْشٍ، فَأَتَانَا رَسُولُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُمْ أَنْ تَسْتَمْتِعُوا؛ فَاسْتَمْتِعُوا**). [خ٥١١٧، ٥١١٨/ م١٤٠٥].

- زاد في مسلم: يَعْنِي: مُتْعَةَ النِّسَاءِ.
- وفي رواية لمسلم: عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ الله (ﷺ)، عَامَ أَوْطَاسٍ، فِي الْمُتْعَةِ ثَلاَثاً. ثُمَّ نَهَى عَنْهَا.

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی و سەلەمەیێ كوڕێ ئەكوەعی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: ئەم د لەشكەرەكیدا بووین ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ مە و گۆت: (ب راستی دەستویری یا بۆ هەوە هاتییە دان هوین هەڤژینییا میتعێ بكەن ڤێجا میتعێ بكەن).**

- **و موسلمی زێدەكرییە: ئانكو: میتعەیا ژنان.**
- **و د ڤەگێڕەكا موسلمیدا: ژ سەلەمەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سالا ئەوتاسێ[1] سێ جاران دەستویری ب میتعێ دا، پاشی پاشڤەلێدان لێ كر.**

٢٣٤٧ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَمَّا وَلِيَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَذِنَ لَنَا فِي الْمُتْعَةِ ثَلاَثاً، ثُمَّ حَرَّمَهَا. وَاللهِ لاَ أَعْلَمُ أَحَداً يَتَمَتَّعُ وَهُوَ مُحْصَنٌ؛ إِلاَّ رَجَمْتُهُ بِالْحِجَارَةِ، إِلاَّ أَنْ يَأْتِيَنِي بِأَرْبَعَةٍ يَشْهَدُونَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَحَلَّهَا بَعْدَ إِذْ حَرَّمَهَا. [جه١٩٦٣].

* حسن.

[وانظر: ٣٦٦٥].

(١) سالا ئەوتاسێ، ئانكو: سالا ڤەكرنا مەكەهێ، و ئەوتاس نهالەكە ل تائیفێ.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ كار كەفتییە د دەستێ عومەرێ كورێ خەتتابیدا، گۆتارەك بۆ خەلكی دا و گۆت: ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سێ جاران دەستویرییا میتعێ بۆ مە یا دای، پاشی ئەو حەرام كر، ئەز ب خودێ كەم ئەز ئێكی ببینم میتعێ بكەت و ئەو یێ ب ژن بیت دێ وی بەرباران كەم ژ بلی ئەو چوار شاهدان بۆ من بینیت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یا حەلال كری پشتی ئەو حەرام كری.**

## ١٢ ـ باب: نكاح النصرانية واليهودية.

## بابەتێ: مارەكرنا ژنا فەلە و یا جوهی.

٢٣٤٨ – (خ) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ نِكاحِ النَّصْرَانِيَّةِ وَالْيَهُودِيَّةِ قَالَ: إن الله حَرَّمَ المشْرِكَاتِ عَلَى المؤْمِنِينَ، وَلاَ أَعْلَمُ مِنَ الإِشْرَاكِ شَيْئاً أَكْبَرَ مِنْ أَنْ تَقُولَ المرْأَةُ: رَبُّهَا عِيسى، وَهُوَ عَبْدٌ مِنْ عِبَادِ اللهِ. [خ٥٢٨٥].

**ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: ئەگەر پرسیارا مارەكرنا ژنا فەلە و یا جوهی ژ ئیبن عومەری هاتبا كرن دگۆت: خودێ هەڤپشكچێكەر ل سەر باوەریداران یێت حەرام كرین، و د هەڤپشكچێكرنێدا ئەز چو تشتان مەزنتر نوزانم ژ وێ یا ژن دبێژیت: خودایێ وێ عیسایە و ئەو بەندەیەكە ژ بەندەیێت خودێ.**

٢٣٤٩ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلُهُ: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ نُسِخَتْ، وَأُحِلَّ مِنَ الْمُشْرِكَاتِ نِسَاءُ أَهْلِ الْكِتَابِ. [هق٧/١٧١].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتنا خودێ** ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ **یا نەسخ بووی و ژ هەڤپشكچێكەران ژنێت خودان كتێبان (جوهی و فەلەیان) هاتنە حەلالكرن.**

٢٣٥٠ – عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ الله رضي الله عنهما يُسْأَلُ عَنْ نِكَاحِ الْمُسْلِمِ الْيَهُودِيَّةَ وَالنَّصْرَانِيَّةَ، فَقَالَ: تَزَوَّجْنَاهُنَّ زَمَانَ الْفَتْحِ بِالْكُوفَةِ مَعَ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، وَنَحْنُ لاَ نَكَادُ نَجِدُ الْمُسْلِمَاتِ كَثِيراً، فَلَمَّا رَجَعْنَا طَلَّقْنَاهُنَّ، وَقَالَ: لاَ يَرِثْنَ مُسْلِماً وَلاَ يَرِثُهُنَّ، وَنِسَاؤُهُمْ لَنَا حِلٌّ، وَنِسَاؤُنَا عَلَيْهِمْ حَرَامٌ. [هق٧/١٧٢].

**ژ ئەبی زوبەیری (رحمه الله) وی گوه ل جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) بوو پرسیارا مارەكرنا ژنا جوهی و یا فەلە ژێ هاتە كرن، ئینا گۆت: ل دەمێ**

**ڤەكرنا كووفە د گەل سەعدێ كوڕێ ئەبی وەققاسی مە ئەو مارەكرن و مە گەلەك ژنێت موسلمان نەددیتن، ڤێجا دەمێ ئەم زڤرین مە ئەو بەردان و گۆت: ئەو میراتگرییا موسلمانی ناكەن و ئەو ژی میراتگرییا وان ناكەن، و ژنێت وان بۆ مە حەلالن، و ژنێت مە ل سەر وان حەرامن.**

٢٣٥١ – عن عبد الله بْنِ السَّائِبِ مِنْ بَنِي الْمُطَّلِبِ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رضي الله عنه نَكَحَ ابْنَةَ الْفَرَافِصَةِ الْكَلْبِيَّةَ ـ وَهي نَصْرَانِيَّةٌ ـ عَلَى نِسَائِهِ، ثُمَّ أَسْلَمَتْ عَلَى يَدَيْهِ.[هق٧/١٧٢].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ سائبی (رضي الله عنه) ژ بەنی موتتەلیب، گۆت: عوسمانێ كوڕێ عەففانی (رضي الله عنه) كچا فەرافیسەیا كەلبی و ئەو فەلە بوو، ل سەر ژنێت خۆڕا مارە كر، پاشی ل سەر دەستێ وی موسلمان بوو.**

## ١٣ ـ باب: لا يخطب على خطبة أخيه.

### بابەتێ: برا د سەر خواستنا برایڕا وێ ناخوازیت.

٢٣٥٢ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يَبِيعَ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلاَ يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، حَتَّى يَتْرُكَ الخَاطِبُ قَبْلَهُ، أَوْ يَأْذَنَ لَهُ الخَاطِبُ. [خ٥١٤٢ (٢١٣٩)/ م١٤١٢].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان یا كری هندەك ژ هەوە فرۆتنێ ل سەر فرۆتنا ئێكدو بكەن، و خازگینییا ل سەر خازگینییا برایێ خۆ بكەت هەتا ئەو وێ دهێلیت یان ئەو دەستویرییێ بدەتێ.**

## ١٤ ـ باب: النظر إلى المخطوبة.

### بابەتێ: بەرێخۆدانا ژنا دئێتە خواستن.

٢٣٥٣ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ الله (ﷺ): (**أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا**) ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: (**فَاذْهَبْ؛ فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّ فِي أَعْيُنِ الأَنْصَارِ شَيْئاً**). [م١٤٢٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل دەڤ پێغەمبەری بووم (ﷺ) زەلامەك هاتە دەڤ و گۆتێ: وی ژنەك ژ ئەنساران یا مارە كری، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (ئەرێ تە بەرێ خۆ دایە وێ)؟ گۆت: نەخێر، گۆت: (هەرە بەرێ خۆ بدەیێ، چونكی ب راستی تشتەك یێ د چاڤێت ئەنساراندا هەی).**

٢٣٥٤ - عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: خَطَبْتُ امْرَأَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَنَظَرْتَ إِلَيْهَا)** ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: **(فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا)**.

[ت١٠٨٧/ن٣٢٣٥/جه١٨٦٦/مي٢٢١٨].

* صحيح.

**ژ موغیرەیێ كوڕێ شوعبەی (رضي الله عنه) گۆت: من ژنەك ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خواست، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەرێ تە بەرێ خۆ دایێ)؟ من گۆت: نەخێر، گۆت: (بەرێ خۆ بدەیێ، ب راستی ئەڤە باشترە تێكگەهشتن و ڤیانێ د ناڤبەرا هەودا بەردەوام بكەت).**

## ١٥ . باب: عرض الرجل ابنته على الرجل الصالح.

## بابەتێ: زەلام كچا خۆ بۆ زەلامێ چاك پێشكێش بكەت، مارە بكەت.

٢٣٥٥ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ، حِينَ تَأَيَّمَتْ حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ مِنْ خُنَيْسِ بْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ . وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ الله (ﷺ) قَدْ شَهِدَ بَدْراً، تُوُفِّيَ بِالمَدِينَةِ . قَالَ عُمَرُ: فَلَقِيتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَفْصَةَ، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ، قَالَ: سَأَنْظُرُ فِي أَمْرِي، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ، فَقَالَ: قَدْ بَدَا لِي أَنْ لاَ أَتَزَوَّجَ يَوْمِي هَذَا. قَالَ عُمَرُ: فَلَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتَ أَنْكَحْتُكَ حَفْصَةَ بِنْتَ عُمَرَ، فَصَمَتَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئاً، فَكُنْتُ عَلَيْهِ أَوْجَدَ مِنِّي عَلَى عُثْمانَ، فَلَبِثْتُ لَيَالِيَ، ثُمَّ خَطَبَهَا رُسُولُ الله (ﷺ)، فَأَنْكَحْتُهَا إِيَّاهُ.

فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: لَعَلَّكَ وَجَدْتَ عَلَيَّ حِينَ عَرَضْتَ عَلَيَّ حَفْصَةَ فَلَمْ أَرْجِعْ إِلَيْكَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرْجِعَ إِلَيْكَ فِيمَا عَرَضْتَ؛ إِلاَّ أَنِّي قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَدْ ذَكَرَهَا، فَلَمْ أَكُنْ لِأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ الله (ﷺ)، وَلَوْ تَرَكَهَا لَقَبِلْتُهَا. [خ٤٠٠٥].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری خودێ ژ هەردووان رازی بیت، دەمێ حەفسا كچا وی بوویە بیژن، گۆت: من عوسمانێ كوڕێ عەفانی دیت من بەحسێ حەفسایێ بۆ كر، و من گۆتێ: هەكە تە بڤێت دێ حەفسا كچا عومەری ل تە مارەكەم؟ گۆت: دێ بەرێ خۆ دەمە خۆ، چەند شەڤان ئەز مام، پاشی ئەز دیتم، گۆتە من: بۆ من دیاربی ئەز ڤێ گاڤێ ژنێ نەئینم، من ئەبوبەكر دیت (رضي الله عنه)، من گۆتێ: هەكە تە بڤێت دێ حەفسا كچا عومەری ل تە مارەكەم؟ ئەبوبەكر (رضي الله عنه) بێ دەنگ بوو، و چو ل من نەزڤراند، ئەز پتر ژ وی**

**عێجز بووم ژ عوسمانی، چەند شەڤان ئەز مام، پاشی پێغەمبەریّ خودیّ (ﷺ) خواست و من ليّ مارەكر.**

**ئەبوبەكری ئەز دیتم گۆت: دبیت تو ژ من عێجز ببی دەمیّ تە بەحسیّ حەفسایێ د گەل من كری، و من چو ل تە نەزڤراندی؟ من گۆت: بەلیّ، گۆت: چو ئەز نەدامە پاش ئەز چو ل تە نەزڤرینم ئەو نەبیت من زانیبوو پێغەمبەری (ﷺ) بەحسیّ ویّ یێ كری، و ئەز نەئەوم يێ نهێنییا پێغەمبەریّ خودیّ (ﷺ) ئاشكرا دكەت، و هەكە پێغەمبەری (ﷺ) هێلابا دا قەبویل كەم.**

## ١٦ ـ باب: عرض المرأة نفسها على الرجل الصالح.

### بابەتیّ: ژن خۆ بۆ زەلامیّ چاك پێشكێش بكەت بۆ مارەكرنا ویّ.

٢٣٥٦ - (خ) عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ أَنَسٍ، وَعِنْدَهُ ابْنَةٌ لَهُ، قَالَ أَنَسٌ: جاءَتِ امْرَأَةٌ إلى رَسُولِ الله (ﷺ) تَعْرِضُ عَلَيْهِ نَفْسَهَا، قَالَتْ: يَا رَسُولَ الله، أَلَكَ بِي حاجَةٌ؟ فَقَالَتْ بِنْتُ أَنَسٍ: ما أَقَلَّ حَيَاءَهَا، وَاسَوْأَتَاهْ! وَاسَوْأَتَاهْ!، قَالَ: هِيَ خَيْرٌ مِنْكِ، رَغِبَتْ فِي النَّبِيِّ (ﷺ)، فَعَرَضَتْ عَلَيْهِ نَفْسَهَا.[خ٥١٢٠].

**ژ سابتیّ بونانی (رحمه الله) گۆت: ئەز ل دەڤ ئەنەسی بووم، و كچەكا وی ل دەڤ وی بوو، ئەنەسی گۆت: ژنەك هاتە دەڤ پێغەمبەریّ خودیّ (ﷺ) خۆ بۆ پێشكێش كر ئەگەر بڤێت مارە بكەت، گۆت: ئەی پێغەمبەریّ خودیّ ئەریّ تە هەوجەیی ب من هەیە؟ ئینا كچا ئەنەسی گۆت: چەندا كێم شەرمە، وەی شەرمزارییێ وەی شەرمزارییێ، گۆت: ئەو ژ تە باشترە، حەز كر ببیتە هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) لەوا خۆ بۆ بەرچاڤ كر.**

## ١٧ ـ باب: لا تنكح المرأة إلا برضاها.

### بابەتیّ: ژن ناهێتە مارەكرن ب رازیبوونا ویّ نەبیت.

٢٣٥٧ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(الأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْذَنُ فِي نَفْسِهَا، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا)**. [م١٤٢١].

- وفي رواية: **(الثَّيِّبُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا..)**.

**ژ ئیبن عەباسی (خودیّ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەریّ خودیّ (ﷺ) گۆت: (بیژن ب خۆ پێشترە ژ سەمیانیّ خۆ، و كچیّ دەستویری د ویّدا دهێتە وەرگرتن و بێدەنگییا ویّ دەستویرییا ویێە).**

- **و د ڤەگێرەکێدا: (بیژن (یابەردایی یان زەلام لێ مری) ب خۆ پێشترە).**

٢٣٥٨ – (خ) عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِدَامٍ الأَنْصَارِيَّةِ: أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهْيَ ثَيِّبٌ فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَأَتَتْ رَسُولَ الله (ﷺ) فَرَدَّ نِكَاحَهُ. [خ٥١٣٨].

**ژ خەنسائا کچا خیدامێ ئەنساری (رضي الله عنها): بابێ وێ ئەو دا شوی و ئەو بیژن بوو و وێ ئەڤە نەدڤیا، ئینا هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا مارەکرنا وێ زڤراند.**

٢٣٥٩ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ جَارِيَةً بِكْراً أَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَذَكَرَتْ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ، فَخَيَّرَهَا النَّبِيُّ (ﷺ). [د٢٠٩٦، ٢٠٩٧/ جه١٨٧٥].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی: کچەکا نەشویکری هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت بابێ وێ ئەو یا دایە شوی و وێ نەڤێت، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ئەو سەرراست کر کا چ هەلبژێریت.**

٢٣٦٠ – عَنْ أَنَسٍ قَالَ: جَاءَتْ جَارِيَةٌ بِكْرٌ بين أبويها إلى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَتْ: إِنَّ أَبَوَيَّ زَوَّجَانِي وَلَمْ يَسْتَأْمِرَانِي، فَهَلْ لِي مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ؟ قَالَ: (نَعَمْ)، قَالَتْ: قَدْ خَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهِ. فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا النَّبِيُّ (ﷺ). [مخ٥/١٧٣٥]

* إسناده حسن.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: کچەك د ناڤبەرا هەردو دایبابێت خۆدا هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: ب راستی دایبابێت من ئەز یا دایمە شوی و دەستویرییا من وەرنەگرتییە، ئەرێ من تشتەك د ڤی کاریدا هەیە؟ گۆت: (بەلێ) گۆت: مادەم وەسایە ئەز ژ دەڤ وی زەلامی دەرکەفتم، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) د ناڤبەرا واندا جودا کر.**

## ١٨ ـ باب: الصداق.

## بابەتێ: مەهرێ.

٢٣٦١ – (م) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمنِ أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ـ زَوجَ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ: كَمْ كَانَ صَدَاقُ رَسُولِ الله (ﷺ)؟ قَالَتْ: كَانَ صَدَاقُهُ لأَزْوَاجِهِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً وَنَشّاً. قَالَتْ: أَتَدْرِي مَا النَّشُّ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَتْ: نِصْفُ أُوقِيَّةٍ، فَتِلْكَ خَمْسُمِائَةِ دِرْهَمٍ، فَهَذَا صَدَاقُ رَسُولِ الله (ﷺ) لأَزْوَاجِهِ. [م١٤٢٦].

**ژ ئەبی سەلەمەیێ کورێ عەبدولرەحمانی (رضي الله عنه) وی گۆت: من پرسیار ژ عائیشایێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) کر، مەهرا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چەند بوو؟ گۆت: مەهرا**

**وی بۆ هەڤژینیٚت وی دوازدە ئوقە[1] و نەشیٚك بوو؟ و ویٚ گۆت: ئەریٚ تو دزانی نەشە چییە؟ گۆت: من گۆت: نەخیٚر، گۆت: نیڤ ئوقەیە، هۆسا دبنە پیٚنج سەد دەرهەم، ئەڤە مەهرا پیٚغەمبەریٚ خودیٚ بوو (ﷺ) بۆ هەڤژینیٚت وی[2].**

٢٣٦٢ - عَنْ أَبِي الْعَجْفَاءِ السُّلَمِيِّ قَالَ: خَطَبَنَا عُمَرُ رحمه الله فَقَالَ: أَلاَ لاَ تُغَالُوا بِصُدُقِ النِّسَاءِ، فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرُمَةً فِي الدُّنْيَا، أَوْ تَقْوَى عِنْدَ اللهِ، لَكَانَ أَوْلاَكُمْ بِهَا النَّبِيُّ (ﷺ)، مَا أَصْدَقَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ، وَلاَ أُصْدِقَتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِهِ أَكْثَرَ مِنْ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً.

[د٢١٠٦/ ت١١١٤م/ ن٣٣٤٩/ جه١٨٨٧/ مي٢٢٤٦].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی عەجفائیٚ سەلەمی (رضي الله عنه) گۆت: عومەری خودیٚ دلۆڤانییٚ پیٚ ببەت، گۆتارەك بۆ مە خواند، ئینا گۆت: هشیار بن مارا ژنان گران نەکەن، ئەگەر ئەو د دنیاییٚدا ریٚزداریبا یان ل دەڤ خودیٚ پاریٚزکاریبا دا پیٚغەمبەر (ﷺ) پیٚشتریٚ هەوە بیت، پیٚغەمبەریٚ خودیٚ (ﷺ) دوازدە ئوقییە زیٚدەتر نەکرینە مار بۆ ئیٚك ژ هەڤژینیٚت خۆ و نەکرییە مارە بۆ ئیٚك ژ کچیٚت خۆ.**

٢٣٦٣ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ مِنْ يُمْنِ الْمَرْأَةِ: تَيْسِيرَ خِطْبَتِهَا، وَتَيْسِيرَ صَدَاقِهَا، وَتَيْسِيرَ رَحِمِهَا). [حم٢٤٤٧٨].

* إسناده حسن.

- وفي رواية: (إِنَّ أَعْظَمَ النِّكَاحِ بَرَكَةً، أَيْسَرُهُ مُؤْنَةً).[حم٢٤٥٢٩].

**ژ عائیشاییٚ (رضي الله عنها) گۆت: پیٚغەمبەریٚ خودیٚ (ﷺ) گۆت: (ب راستی ژ بەرەکەت و پیرۆزیا ژنیٚیە ساناهییا خواستنا ویٚ و ساناهییا مارا ویٚ و ساناهییا مالبچویکیٚ ویٚ)[3].**

- **و د ڤەگیٚرەکیٚدا: (ب راستی ژ هەڤژینییا ژ هەمیان بەرەك مەزنتر، ئەوە تیٚچوونیٚ ویٚ کیٚمتر بیت).**

---

(١) هەر ئوقییەك دبیتە چل دەرهەم.

(٢) گۆتنا عائیشاییٚ دهیٚت وەرگرتن پتریبا وان نەڤ رەنگە بوو نە هەمیان، چونکی وەکی یا دیار مەهرا هەمیا وەکی ئیٚك نەبوو، مارا سەفیاییٚ ئازاکرنا ویٚ بوو، و مارا زەینەبیٚ بەحس لیٚ نەهاتییە کرن، چونکی خودیٚ لیٚ مارە کر، و مارا ئوم حەبیبایێ ب رەنگەکیٚ دی بوو، چونکی نەجاشی پیٚش پیٚغەمبەریڤە (ﷺ) دابوون.

(٣) ئانکو: ژ نیشانیٚت هندیٚ کو ژن یا پیرۆزە و ب بەرەکەتە: خواستنا ویٚ یا ب ساناهی بیت و ب زەحمەت نەبیت، و مارا ویٚ یا ب ساناهی بیت و گەلەك نەبیت، و مالبچویکیٚ ویٚ پیٚ ب ساناهی بیت، هەر زوی خودیٚ کەرەمیٚ د گەل بکەت و دوگیان ببیت.

## ١٩ . باب: الوليمة وإجابة الدعوة إليها.

## بابەتێ: شیلانا دەواتێ و قەبویلكرنا داخوازكرنا وێ.

٢٣٦٤ - (ق) عَنْ أَنسٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَوْفٍ أَثَرَ صُفْرَةٍ قَالَ: (ما هَذَا) ؟ قَالَ: إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: (بَارَكَ اللهُ لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ). [خ٥١٥٥ (٢٠٤٩)/ م١٤٢٧]

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نیشانێت زەراتییەكێ ل سەر عەبدولرەحمانێ كورێ عەوفی دیت، گۆت: (ئەڤە چییە)؟ گۆت: ب راستی من ژنەك یا ل سەر كێشا بەركەكێ قەسپێ ژ زێری مارە كری، گۆت: (پیرۆز بیت، و خوارنەكێ چێكە خۆ كافرەك بیت).**

٢٣٦٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ كانَ يَقُولُ: شَرُّ الْطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ، يُدْعى لَهَا الأَغْنِيَاءُ وَيُتْرَكُ الْفُقَرَاءُ، وَمَنْ تَرَكَ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصى الله تَعَالى وَرَسُولَهُ (ﷺ). [خ٥١٧٧/ م١٤٣٢].

وهو مرفوع عند مسلم.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) وی دگۆت: بێخێرترین خوارن، خوارنا مەعزوماتا دەواتێیە، زەنگین بۆ دهێنە گازیكرن و هەژار دهێنە هێلان، و یێ نەهێتە داخوازییێ (مەخسەد پێ یا دەواتێ و بێ عوزر) وی نەگوهداریا خودێ و پێغەمبەرێ وی كر.**

**و ئەڤە ل دەڤ موسلمی بۆ پێغەمبەری (ﷺ) یا بلند كرییە.**

٢٣٦٦ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ صَائِماً فَلْيُصَلِّ، وَإِنْ كَانَ مُفْطِراً فَلْيَطْعَمْ). [م١٤٣١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە ئێك ژ هەوە بۆ خوارنەكێ هاتە گازیكرن بلا بچیت، هەكە یێ ب رۆژی بیت بلا دوعا بكەت، و هەكە یێ بێ رۆژی بیت بلا بخۆت).**

٢٣٦٧ - (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ فَلْيُجِبْ. فَإِنْ شَاءَ طَعِمَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ). [م١٤٣٠].

**ژ ئەبی جابری (﵁) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەکە ئێك ژ هەوە بۆ خوارنەکێ هاتە گازیکرن بلا بچیت، هەکە ڤیا بلا بخۆت، و هەکە ڤیا بلا بهێلیت و رۆژییێ نەخۆت).**

٢٣٦٨ – عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: صَنَعْتُ طَعَاماً، فَدَعَوْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَجَاءَ، فَرَأَى فِي الْبَيْتِ تَصَاوِيرَ، فَرَجَعَ. [ن٥٣٦٦/ جه٣٣٥٩].

* صحيح.

**ژ عەلی (﵁) گۆت: من خوارنەك چێ کر و من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گازی کر، ئینا هات و هندە وێنە د مالڤە دیتن ئینا زڤری.**

٢٠ ـ باب: اللهو وضرب الدف في النكاح.

**بابەتێ: مژویلی و خۆشی و لێدانا دەفێ د دەواتێدا.**

٢٣٦٩ – (خ) عَنْ خَالِدِ بْنِ ذَكْوَانَ، عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (ﷺ) غَدَاةَ بُنِيَ عَلَيَّ، فَجَلَسَ عَلَى فِرَاشِي كَمَجْلِسِكَ مِنِّي، وَجُوَيْرِيَاتٌ يَضْرِبْنَ بِالدُّفِّ، يَنْدُبْنَ مَنْ قُتِلَ مِنْ آبَائِهِنَّ يَوْمَ بَدْرٍ، حَتَّى قالَتْ جارِيَةٌ: وَفِينَا نَبِيٌّ يَعْلَمُ ما في غَدٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ تَقُولِي هكَذَا، وَقُولِي ما كُنْتِ تَقُولِينَ).** [خ٤٠٠١].

**ژ خالدێ کورێ زوکوانی (﵀) ژ رەبیعەیا کچا موعەوزی گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) سپێدەیا ئەز بوویمە بویك هاتە دەڤ من و ل سەر جهێ من روینشت وەکی روینشتنا تە ژ من، و هندەك کچکان دەف لێ ددان و ب بابێت خۆ دگۆتن ئەوێت ل بەدرێ هاتینە کوشتن، هەتا کچەکێ گۆتی: و پێغەمبەرەکێ د ناڤ مەدا دزانیت کا سوبەهی چ تێدایە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەڤێ نەبێژە و وێ بێژە یا تە دگۆت).**

٢٣٧٠ – (خ) عَنْ عائِشَةَ: أَنَّهَا زَفَّتِ امْرَأَةً إِلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ نَبِيُّ الله (ﷺ): **(يَا عائِشَةُ، ما كانَ مَعَكُمْ لَهْوٌ؟ فَإِنَّ الأَنْصَارَ يُعْجِبُهُمُ اللَّهْوُ).** [خ٥١٦٢].

**ژ عائیشایێ (﵅) گۆت: وێ بویکەك بۆ زەلامەکێ ئەنساری ڤەگوهاست، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی عائیشە مژویلی و خۆشییەك د گەل هەوە هەبوو؟ ب راستی ئەنسار حەژ خۆشییێ دکەن).**

٢٣٧١ - عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَاطِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**فَصْلُ مَا بَيْنَ الْحَلَالِ وَالْحَرَامِ: الدُّفُّ، وَالصَّوْتُ فِي النِّكَاحِ**). [ت١٠٨٨/ ن٣٣٦٩/ جه١٨٩٦].

* صحيح.

**ژ موحەممەدێ كورێ حاتبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جوداكەرا د ناڤبەرا حەلال و حەرامیدا: دەف و دەنگە[1] د دەواتێدا).**

## ٢١ . باب: الشروط في النكاح.

## بابەتێ: مەرجان د مارەكرنێدا.

٢٣٧٢ - (ق) عَنْ عَقْبَةَ بْنِ عامِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**أَحَقُّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ ما اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ**). [خ٢٧٢١/ م١٤١٨].

**ژ عەقەبەیێ كورێ عامری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هێژاترین مەرج هوین ب جهـ بینن ئەون یێت هەوە ژن بۆ خۆ پێ حەلال كرین)[2].**

## ٢٢ . باب: مراعاة تناسب السن بين الزوجين.

## بابەتێ: بەرچاڤكرتنا هەڤكونجییا ژی د ناڤبەرا ژن و مێراندا.

٢٣٧٣ - عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: خَطَبَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ رضي الله عنهما فَاطِمَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّهَا صَغِيرَةٌ**)، فَخَطَبَهَا عَلِيٌّ فَزَوَّجَهَا مِنْهُ. [ن٣٢٢١].

* صحيح الإسناد.

**ژ بورەیدەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەبوبەكری و عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) فاتیمە خواست، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەو یا بچویكە) و عەلی خواست، لێ مارە كر.**

## ٢٣ . باب: استشارة المرأة بشأن زواج ابنتها.

## بابەتێ: مشێورەتا دایكێ د راستا شویكرنا كچا وێدا.

٢٣٧٤ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (آمِرُوا النِّسَاءَ فِي بَنَاتِهِنَّ). [د٢٠٩٥].

* ضعفه الألباني، وحسنه شعيب.

---

(١) مەبەست پێ دەنگڤەدان و ئاشكراكرنە، و ئەڤە فەرە د ژنئینانێدا و سونەتە یا ئاشكەرا بیت و فەشارتی نەبیت.

(٢) مەبەست ئەو مەرجن یێت د دەمێ خواستنێدا یان د مارەكرنێدا هەوە د ناڤبەرا خۆدا دانایی، و ب وان مەرجان رازی بووین، و ئەگەر هوین نەرازیبابانە دبیت ئەو هەڤژینی نەچۆبا سەری، ڤێجا دڤێت ئەو مەرج بهێنە ب جهئینان و ب پاشگوهڤە نەهێنە لێدان.

* قال شعيب: حسن[1].

**ژ ئيبن عومەرى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مشێورەتا ژنان د كچێت واندا بكەن).**

٢٣٧٥ – عَنْ أَنَسٍ قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى جُلَيْبِيبٍ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ إِلَى أَبِيهَا، فَقَالَ: حَتَّى أَسْتَأْمِرَ أُمَّهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**فَنَعَمْ إذاً**). قَالَ: فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهَا، فَقَالَتْ: لاَهَا اللهِ إذاً، مَا وَجَدَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إلاَّ جُلَيْبِيباً؟!... وذكر الحديث. [حم١٢٣٩٣].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئەنەسى (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرى (ﷺ) كچەك ژ ئەنساران ژ بابێ وێ بۆ جولەيبيبى خواست، ئينا گۆت: هەتا ئەز مشێورەتێ د گەل دايكا وێ دكەم، ئينا پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: (بلا ئەو باشە) گۆت: زەلام چۆ دەڤ ژنا خۆ و ئەو بۆ گۆت: ئينا وێ گۆت: نە، سويند ب خودێ، ما پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كەس نەديت جولەيبيب نەبيت؟! .............. و فەرمووده تمام كر.**

## ٢٤ ـ باب: الولي في النكاح.

## بابەتێ: سەميان د مارەكرنێدا.

٢٣٧٦ – عَنْ أَبِي مُوسَى: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ نِكَاحَ إلاَّ بِوَلِيٍّ**).[د٢٠٨٥/ ت١١٠١/ جه١٨٨١/ مي٢٢٢٨]

* صحيح.

**ژ ئەبى مووسايى (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مارەكرن نەيا دورستە ب سەميانى نەبيت).**

٢٣٧٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَعَائِشَةَ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ نِكَاحَ إلاَّ بِوَلِيٍّ**).

وَفِي حَدِيثِ عَائِشَةَ: (**وَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لاَ وَلِيَّ لَهُ**). [جه١٨٨٠].

* صحيح.

**ژ ئيبن عەباسى و عائيشايێ (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆتن: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مارەكرن نەيا دورستە ب سەميانى نەبيت).**

**و د فەرموودەيا عائيشايێدا هاتييە: (و حاكمدار سەميانێ وييە يێ سەميان نەبيت).**

---

(١) نەڤ زێدەهييە د چاپا نێكێدا نەهاتييە، و شێخ سالحێ شامى د مالپەرێ خۆدا نينايە.

## ٢٥ . باب: الإشهاد في النكاح.

**بابەتێ: گرتنا شاهدان د مارەكرنێدا.**

٢٣٧٨ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِبَيِّنَةٍ. [ت١١٠٤].

* قال الترمذي صحيح موقوفاً.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: مارەكرن بێی گرتنا شاهدان نەیا دورستە.**

٢٣٧٩ – عَنِ الْحَسَنِ وَسَعِيدِ بْنِ المسَيَّبِ أَنَّ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: لا نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ وشَاهِدَيْ عَدْلٍ. [هق١٢٦/٧].

* إسناده صحيح.

**ژ حەسەنی و سەعیدێ كوڕێ موسەییەبی (خودێ ژ وان رازی بیت) كو عومەرێ كوڕێ خەتتابی گۆت: مارەكرن نەیا دورستە ب سەمیانی و دو شاهدێت دادپەروەر نەبیت.**

## ٢٦ . باب: خطبة النكاح.

**بابەتێ: گۆتارا مارەكرنێ.**

٢٣٨٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) خُطْبَةَ الْحَاجَةِ: **(إِنْ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، مَنْ يَهْدِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.**

﴿ يا أيها الناس اتقوا ربكم الذى خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ [النساء:١].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴿١٠٢﴾﴾ [آل عمران].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴿٧١﴾﴾ [الأحزاب] ) واللفظ لأبي داود. [د٢١١٨/ ت١١٠٥/ ن١٤٠٣/ جه١٨٩٢/ مي٢٢٤٨].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتارا هەوجەیییێ نیشا مە دا، (هەمی پەسن و سوپاسی بۆ خودێ بن، ئەم هاریكارییێ ژێ دخوازین، و داخوازا لێبۆرین و گونەه ژێبرنێ ژێ دكەین، و ئەم خۆ ب خودێ دپارێزین ژ خرابییێت خۆ، یێ خودێ راستەرێ بكەت كەس نینە وی سەردا ببەت، و یێ سەردا بر كەس نینە وی راستەرێ بكەت، ئەز شەهدە ددەم كو ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت، و یێ بێ شریك و بێ هەڤالە، و موحەممەد بەندەیێ وییە و پێغەمبەرێ وییە.**

﴿یا أیها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثیرا ونساء وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبا﴾

**خەلكینۆ پارێزكارییا خودایێ خۆ بكەن [باوەرییێ پێ بینن و بپەرێسن] ئەوێ هوین ژ ئێك گیانی ب تنێ ئافراندین [و وی خودایی ژ وی گیانی] هەڤسەرا وی ژێ چێ كر [ئافراند] و ژ ڤان هەردوكان گەلەك ژن و مێر دان و بەلاڤ كرن، و هوین پارێزكارییا خودێ بكەن، ئەوێ هوین ب ناڤێ وی تشتان ژ ئێكدو دخوازن، و هشیاری مرۆڤانییێ بن [نەقەتینن] ب راستی خودێ ل سەر هەوە زێرەڤانە.**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾.

**گەلی مرۆڤێت هەوە باوەری ئینایین، ب دورستی پارێزكارییا خودێ بكەن، [و هشیار بن] نەمرن هوین نەموسلمان.**

﴿یا أَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾

**گەلی خودان باوەران ژ خودێ بترسن [د هەمی كاروبارێت خۆدا]، و ئاخڤتنا راست بێژن [دیسا د هەمی كاروبارێت خۆدا]. دێ پەرستنا هەوە قەبویل كەت، و بەرێ هەوە دەتە كار و كریارێت راست و دورست، و دێ گونەهێت هەوە ژێ بەت، و هەر كەسێ گوهێ خۆ بدەتە خودێ و پێغەمبەرێ وی، ب راستی ئەڤە ئەو ب سەرفەرازییەكا مەزن سەرفەراز بوو.**

## ٢٧ ـ باب: التهنئة بالزواج.

## بابەتێ: پیرۆزباهییا هەڤژینییێ.

٢٣٨١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا رَفَّأَ الْإِنْسَانَ إِذَا تَزَوَّجَ قَالَ: **(بَارَكَ اللهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ)**. [د٢١٣٠/ ت١٠٩١/ جه١٩٠٥/ مي٢٢٢٠].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر ئێکی ژن ئینابایە پێغەمبەری (ﷺ) پیرۆزباییا وی دکر، و دگۆت: (خودێ ل تە پیرۆز کەت و ل سەر تە پیرۆز کەت و هەوە ل سەر باشییێ کۆم کەت.)**

## ٢٨ ـ باب: ما يدعو به الزوج عند الدخول على أهله

## بابەتێ: ئەو دوعا هەڤژین دکەت دەمێ دچیتە دەڤ هەڤژینا خۆ

٢٣٨٢ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمْ امْرَأَةً، أَوْ اشْتَرَى خَادِماً، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا، وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ)**. [د٢١٦٠/جه١٩١٨].

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێکی ژ هەوە ژن ئینا یان خزمەتکارەك بۆ خۆ ئینا، بلا بێژیت: یا خودێ ئەز داخوازا باشییا وێ ژ تە دکەم و باشییا تە ل سەر راکری، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خرابییا وێ و ژ خرابییا تە ل سەر راکری. و هەکە حێشترەك ژی کڕی بلا کۆمکا پشتا وێ بگریت و وەکی وێ بێژیت).**

## ٢٩ ـ باب: من تزوج ولم يسمّ صداقاً.

## بابەتێ: یێ ژنێ بینیت و مارە دەستنیشان نەکربیت.

٢٣٨٣ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: فِي رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً، فَمَاتَ عَنْهَا، وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا، وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا الصَّدَاقَ، فَقَالَ: لَهَا الصَّدَاقُ كَامِلاً، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ.

فَقَالَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَضَى بِهِ فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ.

[د٢١١٤/ ت١١٤٥/ ن٣٣٥٤/ جه١٨٩١/ مي٢٢٩٢].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (ﷺ) د راستا زەلامەكیدا ژنەك مارەكربیت و مربیت و نەچۆبیتە نڤینا وێ و مارا وی دیار نەكربیت، گۆت: مارا تمام بۆ وێیە و عیددە (ژڤان) ل سەرە و میرات ژی بۆ دكەڤیت.**

**مەعقیلێ كورێ سینانی گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) ئەڤ حوكمە د بیروەعا كچا واشیقیدا كر.**

## ٣٠ـ باب: نكاح الولود.

### بابەتێ: مارەكرنا ژنا زارۆك ببن.

٢٣٨٤ – عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: إِنِّي أَصَبْتُ امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ وَجَمَالٍ، وَإِنَّهَا لاَ تَلِدُ، أَفَأَتَزَوَّجُهَا؟ قَالَ: (لاَ)، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ فَنَهَاهُ، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: (**تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ**). [د٢٠٥٠/ ن٣٢٢٧].

* حسن صحيح.

**ژ مەعقیلێ كورێ یەساری (ﷺ) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: من ژنەكا خودان بنەمال و جوان دیت، و وێ زارۆك نابن ئەز وێ مارە بكەم؟ گۆت: (نە) پاشی بۆ جارا دووێ هاتە دەڤ پاشڤە لێدا، پاشی بۆ جارێ سێیێ هاتە دەڤ، ئینا گۆت: (یا حەژێكەر و زارۆككەر مارە بكەن، ب راستی ئەز ب گەلەكییا هەوە شانازییێ دبەم ل سەر ئوممەتان).**

## ٣١ـ باب: نكاح الزانية.

### بابەتێ: مارەكرنا زناكەرێ

٢٣٨٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً كَانَ يُقَالُ لَهَا أُمُّ مَهْزُولٍ، وَكَانَتْ تَكُونُ بِأَجْيَادَ، وَكَانَتْ مُسَافِحَةً، كَانَتْ يَتَزَوَّجُهَا الرَّجُلُ وَتَشْتَرِطُ لَهُ أَنْ تَكْفِيَهُ النَّفَقَةَ، فَسَأَلَ رَجُلٌ عَنْهَا النبي (ﷺ) أَيَتَزَوَّجُهَا؟ فَقَرَأَ نَبِيُّ الله (ﷺ) أَوْ أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً﴾[النور: ٣]. هذا لفظ البيهقي. [د٢٠٥١/ت٣١٧٧/ن٣٢٢٨/هق١٥٣/٧].

* حسن صحيح.

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ نەك هەبوو دگۆتنێ دایكا مەهزولی و ئەو ل ئەجیاد بوو و لەشفروشی دكر، و زەلامێ مارەدكر و وێ ل سەر مەرج دكر ئەو تێرا وێ مەزاختنێ بدەتێ، ئینا زەلامەكێ پرسیارا وێ ژ پێغەمبەری كر (ﷺ) كا وێ مارە بكەت؟ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤە خواند یان ئەڤ ئایەتە ل سەر هاتە خوارێ ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً﴾ و ئەڤە بێژەیا بەیهەقییە.

## ٣٢ ـ باب: المحلل والمحلل له

### بابەتێ: حەلالكەر و بۆ حەلالكری

٢٣٨٦ - عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (لَعَنَ اللهُ الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ).

[د٢٠٧٦/ ت١١١٩/ جه١٩٣٥].

- ولفظ الترمذي وابن ماجه: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ.

* صحيح.

ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (لەعنەتێت خودێ ل حەلالكەری و بۆ حەلالكری بن)[1].

- و بێژەیا تدرمزی و ئیبن ماجەی: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لەعنەت یێ ل حەلالكەری و بۆ حەلالكری كرین.

## ٣٣ ـ باب: الرجل يسْلِم وعنده أكثر من أربع أو أختان.

### بابەتێ: زەلام موسلمان ببیت و ژ چوار ژنان پتر یان دو خویشكێت ئێك ل دەڤ بن.

٢٣٨٧ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ غَيْلَانَ بْنَ سَلَمَةَ الثَّقَفِيَّ، أَسْلَمَ وَلَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَسْلَمْنَ مَعَهُ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يَتَخَيَّرَ أَرْبَعاً مِنْهُنَّ. [ت١١٢٨/ جه١٩٥٣].

* صحيح.

---

(١) حەلالكەر: ئەو كەسە یێ ژنا ب سێ تەلاقان هاتییە بەردان مارە دكەت، دا تەلاق بدەت و جارەكا دی بزڤریتەڤە زەلامێ خۆ یێ بەرێ، و یێ بۆ هاتییە حەلالكرن ئەو كەسە یێ ژنا خۆ ب سێ تەلاقان بەردایی و نەشێت ژنا خۆ بزڤرینیتەڤە ئەو نەبیت شوی بكەت و بهێتە بەردان بەلێ ب دلێ خۆ نە ب مەرج و ب نئیەتا هندێ بۆ یێ بەرێ حەلال بكەت، ئەگەر ژ بەر هندێ نەبا مارە نەدكر، و د كوردەوارییێدا دبێژنە ڤێ مارەكرنێ جەحشكرن.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: غەیلانێ كوڕێ سەلەمەیێ سەقەفی موسلمان بوو، و وی دەه ژن د نەزانینێدا هەبوون، و ئەو ژی د گەل وی موسلمان بوون، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) فەرمانا وی كر ئەو چواران ژ وان بۆ خۆ ژێ بگریت.**

٢٣٨٨ - عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ فَيْرُوزٍ الدَّيْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَسْلَمْتُ وَتَحْتِي أُخْتَانِ، قَالَ: (**طَلِّقْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ**).

ولفظ الترمذي: (**اخْتَرْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ**). [د٢٢٤٣/ ت١١٣٠/ جه١٩٥١].

* حسن.

**ژ زەحاكێ كوڕێ فەیروزێ دەیلەمی (رضي الله عنه) ژ بابێ خۆ، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز یێ موسلمان بوویم و دو خویشكێت ئێك هەڤژین ل دەڤ منن، گۆت: (هەچییا تە ژ وان بڤێت بەردە)**

**و بێژەیا ترمزی: (یا تە دڤێت ژ هەردوكان هەلبژێرە).**



## الفصل الثاني: العشرة بين الزوجين.

## پشكا دووێ: تێكەلی و سەرەدەرییا د ناڤبەرا هەڤژینیاندا.

### ١ . باب: العدل بين الزوجات.

### بابەتێ: دادپەروەرییا د ناڤبەرا هەڤژینیاندا.

٢٣٨٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ، فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ**). [د٢١٣٣/ ت١١٤١/ ن٣٩٥٢/ جه١٩٦٩/ مي٢٢٥٢]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ دو ژن هەبن، و ب رەخێ ئێكێ ژ واندا چۆبیتە خوارێ[1]، رۆژا قیامەتێ دێ هێت و لایەكێ وی یێ خوار).**

٢٣٩٠ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقْسِمُ فَيَعْدِلُ، وَيَقُولُ: (**اللَّهُمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ أَمْلِكُ**) ؛ يَعْنِي: الْقَلْبَ.[د٢١٣٤/ ت١١٤٠/ ن٣٩٥٣/ جه١٩٧١/ مي٢٢٥٣].

* قال شعيب: رجاله ثقات.

ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب دادپەروەری رۆژێت خۆ د ناڤبەرا هەڤژینێت خۆدا لێكڤە دكرن، و دگۆت: **(ئەی خودا ئەڤە لێكڤەكرنا منە و یا د شیانێت مندایە، ڤێجا ل من نەگرە ژ وێ یا تە شیان بۆ هەی و من شیان بۆ نەی)**. ئانكو: دل[2].

### ٢ . باب: تصوم المرأة بإذن زوجها.

### بابەتێ: ژن رۆژیا سونەت دێ ب دەستویرییا زەلامێ خۆ گریت.

٢٣٩١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، وَلاَ تَأْذَنَ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، وَمَا أَنْفَقَتْ مِنْ نَفَقَةٍ عَنْ غَيْرِ أَمْرِهِ، فَإِنَّهُ يُؤَدَّى إِلَيْهِ شَطْرُهُ**). [خ٥١٩٥ (٢٠٦٦)/ م١٠٢٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەدورستە بۆ چو ژنان رۆژیا سونەت بگریت و زەلامێ وێ یێ بەرهەڤ و حازر بیت ب دەستویرا وی نەبیت[1]،**

---

(١) ب كریاران پتر د گەل ئێك ژ وان بیت و ب سەرەدەرییێ و ب تشتێت زیارێ، ئەڤێ هۆسا رۆژا قیامەتێ لایەكێ وی دێ یێ خوار بیت، نیشانە بۆ هندێ د دنیایێدا نەو یێ خوار بوو و یێ راست نەبوو.

(٢) ئانكو: دل نە د بن دەستهەلاتا مرۆڤیدایە، دبیت پتر حەز بۆ ئێكێ هەبیت، بەلێ ئەڤە سەرەدەرییێ نابیت بگوهۆریت.

**و نەدورستە دەستویرییا كەسێ بۆ مالا وی بدەت، ب دەستویرییا وی نەبیت و چو مەزاختنێ بێی فەرمانا وی نامەزێخیت ئەگەر نیڤا وێ بۆ زەلامێ وێ نەبیت)**[٢].

٣ ـ باب: التسمية عند الوقاع.

**بابەتێ: ناڤئینانا خودێ دەمێ نڤینێ.**

٢٣٩٢ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ فَقَالَ: بِاسْمِ اللهِ. اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذلِكَ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَداً). [خ٧٣٩٦ (١٤١)/ م١٤٣٤].

**ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە دەمێ دڤێت بچیتە نڤینا ژنا خۆ بێژیت: ب ناڤێ خودێ، یا خودێ شەیتانی ژ مە دویر بێخە و شەیتانی ژ یێ تو ب رزقێ مە دكەی دویر بێخە، و ب راستی ئەگەر زارۆكەك ب وێ د ناڤبەرا واندا هاتە نڤیسین، شەیتان زیانێ د بنیدا ناگەهینیتێ).**

٤ ـ باب: حق الزوجة من المبيت عند الزواج

**بابەتێ: مافێ ژنێ ژ نڤستنێ دەمێ ژنئینانێ.**

٢٣٩٣ - (ق) عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعاً وَقَسَمَ، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى الْبِكْرِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثاً ثُمَّ قَسَمَ.

قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: وَلَوْ شِئْتُ لَقُلْتُ: إِنَّ أَنَساً رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ). [خ٥٢١٤ (٥٢١٣)/ م١٤٦١].

**ژ ئەبی قیلابەیی (رحمه الله) ژ ئەنەسی گۆت: ژ سونەتێیە ئەگەر زەلامی كچ ل سەر بیژنێ مارە كر ئەو حەفت شەڤان ل دەڤ بیت پاشی شەڤان لێكڤە بكەت، و ئەگەر بیژن ل سەر كچێ مارە كر ئەو سێ شەڤان ل دەڤ بیت پاشی شەڤان لێكڤە بكەت.**

(١) فەرمووده ب ئاشكەرایی دبێژیت و زەلامێ وێ یێ حازر بیت، بەلێ ئەگەر زەلام ل مال نەبیت و ل باژێرەكێ دی بیت، یان بۆ چەند رۆژان ل ئەركەكی بیت بۆ وی نینە ئەو رێكێ ل هەڤژینا خۆ بگریت و نەهێلیت رۆژییان بگریت.

(٢) بەحسێ دانا وی مالییە یێ د داب و ئەریتاندا دهێتە دان، وەكی هندە هەوجەیێت مالێ: خوێیە یان موخلكە و هندە نانە و هۆسا، ئەو دانا ب ڤی رەنگی خێرا هەردوكان ئێكە و وەكی ئێكە، و رامان ئەو نینە نیڤ خێر بۆ زەلامییە بەلێ خێرا هەر ئێكی ژ وان یا تمامە ئانكو: زەلام ب مالێ وی خێرا تمام بۆ وییە و ژن ب دانا وێ خێرا تمام بۆ وێیە).

**ئەبو قیلابەیی گۆت: ئەگەر من بڤێت دێ بێژم: ئەنەسی ئەڤە ژ پێغەمبەری (ﷺ) ڤەگوهاستییە.**

## ٥ ـ باب: المرأة تهب يومها لضرتها.

## بابەتێ: ژن رۆژا خۆ بۆ هەویا خۆ بكەتە دیاری.

٢٣٩٤ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا لِعَائِشَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقْسِمُ لِعَائِشَةَ بِيَوْمِهَا وَيَوْمِ سَوْدَةَ. [خ٥٢١٢ (٢٥٩٣)/ م١٤٦٣].

- وفي رواية للبخاري: كانَ رَسُولُ الله (ﷺ) إِذَا أَرادَ سَفَراً، أَقْرَعَ بينَ نسائه، فأَيَّتُهنَّ خرجَ سَهْمُهَا خرجَ بها مَعَهُ، وَكانَ يَقْسِمُ لِكلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ يَوْمَها وَلَيْلَتَها، غيرَ أَن سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا لِعَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، تَبْتَغِي بِذلِكَ رِضَا رَسُولِ الله (ﷺ). [خ٢٥٩٣].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: سەودەیا كچا زەمعەی، رۆژا خۆ دیاری دابوو عائیشایێ، و پێغەمبەری (ﷺ) رۆژا وێ و رۆژا سەودایێ ددا عائیشایێ.**

**و د ڤەگێرا بوخاریدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر ڤیابا بچیتە وەغەرەكێ پشك د ناڤبەرا هەڤژینێت خۆدا دكر، ڤێجا پشك بۆ كێ كەتبا ئەو د گەل دچۆ، و بۆ هەر ئێكێ ژ هەڤژینێت خۆ رۆژا وێ و شەڤا وێ دانابوو، سەودەیا كچا زەمعەی نەبیت، وێ رۆژا خۆ و شەڤا خۆ دابوو عائیشایێ، هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) ئەوێ ب ڤێ چەندێ رازیبوونا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دخواست.**

## ٦ ـ باب: غيرة الضرائر.

## بابەتێ: غیرەتا هەویان.

٢٣٩٥ – (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ: أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي ضَرَّةً، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ إِنْ تَشَبَّعْتُ مِنْ زَوْجِي غَيْرَ الَّذِي يُعْطِينِي؟ فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ، كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ)**. [خ٥٢١٩/ م٢١٣٠].

**ژ ئەسمائا كچا ئەبوبەكرێ سەددیق (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنەكێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من هەویەكا هەی ما بۆ من گونەهە هەكە ئەز خۆ ل دەڤ بینمە دەرێ زەلامێ من تشتەكێ دایە من و وی نەدابیتە من؟ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەوێ**

**تێراتییێ ژ خۆ دیار كەت ب تشتێ بۆ نەهاتییە دان، وەكی وییە دو كراسێت مزەوەر ل بەر بن)[1].**

٢٣٩٦ - (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) عِنْدَ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَأَرْسَلَتْ إِحْدَى أُمَّهَاتِ المؤْمِنِينَ بِصَحْفَةٍ فِيهَا طَعَامٌ، فَضَرَبَتِ الَّتِي النَّبِيُّ (ﷺ) فِي بَيْتِهَا يَدَ الخَادِمِ، فَسَقَطَتِ الصَّحْفَةُ، فَانفَلَقَتْ، فَجَمَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِلَقَ الصَّحْفَةِ، ثُمَّ جَعَلَ يَجْمَعُ فِيهَا الطَّعَامَ الَّذِي كَانَ فِي الصَّحْفَةِ، وَيَقُولُ: (**غارَتْ أُمُّكُمْ**) ! ثُمَّ حَبَسَ الخَادِمَ حَتَّى أُتِيَ بِصَحْفَةٍ مِنْ عِنْدِ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا، فَدَفَعَ الصَّحْفَةَ الصَّحِيحَة إِلَى الَّتِي كُسِرَتْ صَحْفَتُهَا، وَأَمْسَكَ المكْسُورَةَ فِي بَيْتِ الَّتِي كَسَرَتْ. [خ٥٢٢٥ (٢٤٨١)].

[وانظر: ٢١٥٣، ٣٨٦٥] في غيرة الرجال[2].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل دەڤ هندەك هەڤژینێت خۆ بوو، ئێك ژ دایكێت باوەریداران سێنیكەك خوارن تێدا بوو بۆ هنارت، ڤێجا ئەوا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مالا وێ دەستێ خۆ ل دەستێ خزمەتكاریدا و سێنیك ئێخست و بوو دو كەر، پێغەمبەری (ﷺ) كەرێت سێنیكێ ئێخستنە بەرێك، و دەستهاڤێتێ ئەو خوارنا ژ سێنیكێ رشتی تێدا كۆم كر، و دگۆت: (دایكا هەوە غیرەتێ گرت)، پاشی خزمەتكار راگرت هەتا سێنیكەك ژ دەڤ وێ یا ئەو ل مالا وێ ئینای و ئەو سێنیك دا وێ ئەوا سێنیكا وێ شكەستی، و ئەوا شكەستی ل مالا وێ هێلا یا سێنیك تێدا شكەستی.**

## ٧ . باب: الوصية بالنساء وحسن معاشرتهن.

## بابەتێ: وەسیەتا خێرێ ب ژنان و سەرەدەرییا باش د گەل وان.

٢٣٩٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ، فَإِنَّ المَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاَهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ، فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ**). [خ٣٣٣١/ م١٤٦٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خێر و شیرەت و باشییێ ژ خۆ بۆ ژنان بخوازن[3]، ب راستی ژن یا ژ پەراسییێ چێ بووی و دەركەفتی[1]، و**

---

(١) ئانكو: ئەو وەكی وییە یێ كراسێ ترسا ژ خودێ یان كراسێ زەنگینییێ یان یێ زانینێ بكەتە بەر خۆ و ئەو ب خۆ چو ژ وانا نەبیت بەلێ دكەتە بەر خۆ دا خەلكی پێ سەردا ببەت.

(٢) نەڤە د چاپا ئێكێدا نینە، و د مالپەرێ شێخ سالحیدا هاتییە.

(٣) ئانكو: نەفسا خۆ ل سەر هندێ فێركەن باشییێ و خێرێ بگەهیننە ژنێ.

**ب راستی خوارترین جه د پەراسییێدا سەرێ وێیە[٢]، هەکە تو چۆی راستکەی دێ شکێنی[٣]، و هەکە تو بهێلی دێ هەر مینیت خوار، ڤێجا خێرێ و شیرەتان و باشییێ ژ خۆ بۆ ژنان بخوازن)[٤].**

٢٣٩٨ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً، إنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقاً رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ)، أَوْ قَالَ: (غَيْرَهُ). [م١٤٦٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بلا چو خودان باوەر نەڤیانێ ژ ژنا خۆ یا خودان باوەر نەراکەت، هەکە ژ رەوشتەکێ وێ پێ نەرازی بیت، ژ ئێکێ دی پێ رازییە).**

٢٣٩٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً، وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ خُلُقاً). [د٤٦٨٢/ ت١١٦٢/ مي٢٨٣٤].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پێ ژ خودان باوەران باوەری تەکویز تمامتر ئەوە پێ سنج و رەوشتێ وی باشتر، و باشترینێت هەوە ئەون یێت بۆ ژنێت خۆ د رەوشت باشتر بن).**

٢٤٠٠ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ، وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي). [جه١٩٧٧].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (باشترینێ هەوە ئەوە پێ بۆ مالا خۆ باشتر بیت و ئەز باشترینێ هەوەمە بۆ مالا خۆ).**

---

(١) ئەڤە ئیشارەتە بۆ چێبوونا حەوایێ ژ پەراسیا ئادەمی (عليه السلام).

(٢) ئەڤە مەتەلەچاوا جهێ ژ هەمیا خوارتر ژ پەراسییێ سەرێ وێیە، هۆسا جهێ ژ هەمیان پتر دبیت نەزیەت ژ ژنێ بێت سەرێ وێیە، ئانکو: نەزمانێ وێیە.

(٣) چونکی پەراسی د بنەتارێ خۆدا یا خوارە و راست نابیت، هۆسا هەکە تە ڤیا خوارییا نەزمانێ ژنێ راستکەی دێ گەهیتە بەردانێ.

(٤) ئانکو: نەفسا خۆ ل سەر هندێ فێرکەن باشییێ و خێرێ بگەهیننە ژنێ.

## ٨ ـ باب: خير النساء من تعتني بزوجها وأولادها.

**بابەتێ: باشترین ژن ئەوە یا خەمێ ژ زەلام و زارۆكێت خۆ دخۆت.**

٢٤٠١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**نِسَاءُ قُرَيْشٍ خَيْرُ نِسَاءٍ رَكِبْنَ الإِبِلَ، أَحْنَاهُ عَلَى طِفْلٍ، وَأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذَاتِ يَدِهِ**).

يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَى إِثْرِ ذلِكَ: وَلَمْ تَرْكَبْ مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ بَعِيراً قَطُّ. [خ٣٤٣٤/ م٢٥٢٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (ژنێت قورەیشییان باشترین ژنن سویاری حێشترێ بووین[1]، دلۆڤانترن بۆ بچویكی، و زەحمەتا زەلامێت وان دبەن پتر بەرچاڤ وەردگرن[2]).**

**ئەبو هورەیرە هەر ل سەر ڤێ سوحبەتێ دبێژیت: و مەریەما كچا عیمرانی د بنیدا سویاری حێشترێ نەبوویە[3].**

## ٩ ـ باب: خدمة الرجل في أهله

**بابەتێ: زەلام خزمەتا مالا خۆ بكەت.**

٢٤٠٢ - (خ) عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ: مَا كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَكُونُ فِي مَهْنَةِ أَهْلِهِ ـ تَعْنِي: خِدْمَةَ أَهْلِهِ ـ فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ، خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ.[خ٦٧٦].

**ژ ئەسوەدێ كورێ یەزیدی گۆت: من پرسیار ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) كر: پێغەمبەری (ﷺ) د مالا خۆدا چ دكر؟ گۆت: د شۆلێ مالا خۆدا بوو، ئانكو: د خزمەتا كابانییا خۆدا بوو، و هەكە وەختێ نڤێژێ دهات، دەردكەفتە نڤێژێ.**

٢٤٠٣ - عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قِيلَ لِعَائِشَةَ: مَا كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: كَمَا يَصْنَعُ أَحَدُكُمْ، يَخْصِفُ نَعْلَهُ وَيُرَقِّعُ ثَوْبَهُ. [حم٢٤٧٤٩].

* صحيح.

---

(١) مەبەست پێ ژ ژنێت عەرەبان، چونكی ئەو سویاری حێشترێ دبوون.

(٢) ئانكو: ب ئابۆرن و دەستدرییانێ د مەزاختنا مالێ زەلامێ خۆدا ناكەن و مالێ وی دپارێزن.

(٣) مەبەستا ئەبو هورەیرە ژ ڤێ ئاخفتنێ ئەوە ئەو ژ مەریەمێ چێتر نینن، چونكی مەریەم ل حێشترێ سویار نەبوویە و پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: باشترین ژنێت ل حێشترا سویار بووین یێت قورەیشیانە.

ژ هیشامی ژ بابێ خۆ (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پرسیار ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) هاتە كرن: پێغەمبەری (ﷺ) د مالا خۆدا چ دكر؟ گۆت: ئەو دكر ئەوا ئێك ژ هەوە دكەت، شمكا خۆ ددوری و پێكڤە گرێ ددا و جلكێ خۆ پنی دكر.

## ١٠ . باب: حديث أم زرع.

### بابەتێ: سەرهاتییا ئوم زەرعەیی.

٢٤٠٤ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَلَسَ إِحْدَى عَشْرَةَ امْرَأَةً، فَتَعَاهَدْنَ، وَتَعَاقَدْنَ أَنْ لاَ يَكْتُمْنَ مِنْ أَخْبَارِ أَزْوَاجِهِنَّ شَيْئاً.

[فَذَكَرَتْ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ طَرِيْقَةَ مُعَامَلَةِ زَوْجِها لَهَا، وَكَانَ أَفْضَلَ هَؤُلاءِ الأَزْواجِ: أَبُو زَرْعٍ].

قَالَتْ عَائِشَةُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (كُنْتُ لَكِ كَأَبِي زَرْعٍ لأُمِّ زَرْعٍ). [خ ٥١٨٩/ م٢٤٤٨].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: یازدە ژن روینشتنە خوارێ و پەیمان د گەلێك بەستن و ئاخفتن دانە هەڤدو چو ژ دەنگ و باسێت زەلامێت خۆ نەڤەشێرن.

[هەر ئێكێ ژ وان رێكا سەرەدەرییا زەلامێ خۆ بۆ وان بەحس كر، و باشترین هەڤژین د ناڤ واندا هەڤژینێ ئوم زەرعێ بوو].

عائیشایێ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ئەز بۆ تە وەكی ئەبو زەرعیمە بۆ ئوم زەرعێ.

## ١١ . باب: الحجاب وخروج النساء لحاجتهن.

### بابەتێ: پەردەپۆشی و دەركەفتنا ژنان بۆ هەوجەییێت خۆ.

٢٤٠٥ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (ﷺ) كُنَّ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ، إِذَا تَبَرَّزْنَ، إِلَى الْمَنَاصِعِ ـ وَهُوَ صَعِيدٌ أَفْيَحُ ـ فَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): احْجُبْ نِسَاءَكَ، فَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَفْعَلُ. فَخَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ، زَوْجُ النَّبِيِّ (ﷺ) لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي، عِشَاءً، وَكَانَتِ امْرَأَةً طَوِيلَةً، فَنَادَاهَا عُمَرُ: أَلاَ قَدْ عَرَفْنَاكِ يَا سَوْدَةُ! حِرْصاً عَلَى أَنْ يُنْزَلَ الْحِجَابُ، فَأَنْزَلَ اللهُ آيَةَ الْحِجَابِ. [خ١٤٦/ م٢١٧٠].

[وانظر في فرض الحجاب: ٣٦٤٦.

وانظر في الكاسيات العاريات: ٢٧٩٢].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) ب شەڤ ئەگەر ڤیابان بچنە دەستئاڤێ دەردكەفتنە مەناسعێ[1]. و ئەو دەشتەكا فرەهـ و بێ ئاڤاهییە، و عومەری دگۆتە پێغەمبەری (ﷺ) هەڤژینێت خۆ پەردەپۆشكە نەهێلە هەڤژینێت تە دەركەڤن، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە نەدكر، ئینا سەودا كچا زەمعەیی شەڤەكێ ژ شەڤان عەیشا دەركەفت، و ژنەكا درێژ بوو، ئینا عومەری گازی كرێ بزانە مە تو نیاسی ئەی سەودا، ئەڤە ژ بەر رژداتییێ فەرمان ب پەردەپۆشییێ بهێتە خوارێ، ئینا ئایەتا پەردەپۆشییێ هاتە خوارێ[2].

## ١٢ . باب: تحريم هجر فراش الزوج

### بابەتێ: هەرامییا خۆدویركرنا ژنێ ژ نڤینا زەلامی.

٢٤٠٦ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ، فَأَبَتْ، فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا، لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ). [خ٣٢٣٧/ م١٤٣٦].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گۆت: **(هەكە زەلامی داخوازا ژنا خۆ بۆ نڤینا خۆ كر و نەهاتە دەڤ و ب شەڤ ژێ كەرب گرتی بوو، ملیاكەت لەعنەتان لێ دكەن هەتا لێ دبیتە سپێدە).**

٢٤٠٧ – عَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا الرَّجُلُ دَعَا زَوْجَتَهُ لِحَاجَتِهِ، فَلْتَأْتِهِ، وَإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُورِ). [ت١١٦٠].

* صحيح.

ژ تەلقێ كورێ عەلی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەكە زەلامی داخوازا ژنا خۆ بۆ هەوجەییا خۆ كر بلا بێتە دەڤ هەكە خۆ ل سەر تەنویرێ بیت).**

---

(١) مەناسع: جهێ دەستئاڤێت ژنان بوو بەری جهێ دەستئاڤان د مالاندا بهێنە دورستكرن، دكەفتنە دویماهییا مەدینەیێ ژ لایێ بەقیعێڤە.

(٢) نیشانە بۆ ڤێ ئایەتێ ﴿وإذا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ من وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾. و هەر وەختێ هەوە هەوجەییەك ژ ژنێت پێغەمبەری خواست یان هەوە ڤیا وان باخێڤن، ڤێجا ل پشت پەردەیێ ژێ بخوازن یان باخێڤن نەڤە بۆ دلێ هەوە و دلێ وان ژێ چێترە.

## ١٣ ـ باب: ما يكره من ضرب النساء

### بابەتێ: پاشڤەلێدانا ڤوتانا ژنان.

٢٤٠٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ الله بْنِ زمعة قَالَ: خطب رَسُول اللهِ (ﷺ)... وَذَكَرَ النِّسَاءَ فَقَالَ: (**يَعْمَدُ أَحَدُكُمْ يَجْلِدُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ، فَلَعَلَّهُ يُضَاجِعُهَا مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ**) ! [خ٤٩٤٢ (٣٣٧٧)/ م٢٨٥٥].

**ژ عەبدوللایێ کورێ زەمعەی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، خوتبە دخواند، و بەحسێ ژنان کر، و گۆت: (ئێك ژ هەوە دێ ڤەستا ژنا خۆ کەت و دێ ڤوتیت ڤوتانا کۆلەی ئانکو: عەبدی، و د گەل ڤێ ژی دبیت دویماهییا رۆژا خۆ بچیتە نڤینا وێ).**

٢٤٠٩ - عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَضْرِبُوا إِمَاءَ اللهِ**)، فَجَاءَ عُمَرُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: ذَئِرْنَ النِّسَاءُ عَلَى أَزْوَاجِهِنَّ، فَرَخَّصَ فِي ضَرْبِهِنَّ، فَأَطَافَ بِآلِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) نِسَاءٌ كَثِيرٌ، يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لَقَدْ طَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ نِسَاءٌ كَثِيرٌ، يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ، لَيْسَ أُولَئِكَ بِخِيَارِكُمْ**). [د٢١٤٦/ جه١٩٨٥/ مي٢٢٦٥].

* صحيح.

[وانظر في أن المرأة لا تضرب إلا إذا أدخلت رجلاً غريباً إلى بيتها، أو أتت بفاحشة: ٢٤٢٥. وانظر: ٢٤٢٤].

**ژ ئیاسێ کورێ عەبدوللایێ کورێ ئەبی زوبابی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژنان نەڤوتن)، عومەر (ﷺ) هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ژن ل سەر زەلامێت خۆ ب جسارەت کەفتن، ئینا دەستویری ب ڤوتانا وان دا، گەلەك ژنان دۆرماندۆرێت بنەمالا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گرتن و گازندە ژ زەلامێت خۆ کرن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (گەلەك ژنا دۆرماندۆرێت بنەمالا موحەممەدی گرتن و گازندە ژ زەلامێت خۆ کرن ئەوێت ژنێت خۆ دڤوتن ئەو نە ژ باشێت هەومنە).**

## ١٤ ـ باب: فتنة الرجال بالنساء.

### بابەتێ: جەرباندنا زەلامان ب ژنان.

٢٤١٠ - (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قال: (**ما تَرَكْتُ بَعْدي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ**). [خ٥٠٩٦/ م٢٧٤٠].

ژ ئوسامەیێ كورێ زەیدی، (خودێ ژ وان رازی بیت)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(من چو جەرباندن پشتی خۆ ل سەر زەلامان نەهێلاینە ژ ژنان ب زیانتر).**

٢٤١١ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، قَالَ: (**إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ، وَإِنَّ اللهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا، فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ؟ فَاتَّقُوا الدُّنْيَا، وَاتَّقُوا النِّسَاءَ فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَتْ فِي النِّسَاءِ**). [م٢٧٤٢].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری، (ﷺ)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(دنیا یا شرین و تەڕە، و خودێ دێ هەوە تێدا كەتە شوینگرێت بەری هەوە، دا بەرێ خۆ بدەتێ كا هوین دێ چ كار كەن؟[1] ڤێجا خۆ بپارێزن و هشیار بن، دنیا هەوە سەردا نەبەت و ژن هەوە سەردا نەبەن، ب راستی ئەزموونا ئێكێ یا ئیسرائیلییان د ژناندا بوو).**

## ١٥ . باب: إياكم والدخول على النساء.

## بابەتێ: هشیار بن ب تنێ بچنە دەڤ ژنان.

٢٤١٢ - (ق) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ**)، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَرَأَيْتَ الحَمْوَ؟ قَالَ: (**الحَمْوُ: المَوْتُ**). [خ٥٢٣٢/ م٢١٧٢].

ژ عوقبەیێ كورێ عامری (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خۆ بپارێزن ژ چۆنا دەڤ ژنێت بیانی[2]، زەلامەكی ژ خەلكێ مەدینێ گۆت: تو چ دبێژی بۆ مرۆڤێت زەلامێ ژنێ؟ گۆت: مرۆڤێت زەلامێ ژنێ ترس پتر یا ژ وان. (یان چۆنا وان وەكی مرنێیە د كرێتی و خرابییێدا).**

٢٤١٣ - (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَلاَ لاَ يَبِيتَنَّ رَجُلٌ عِنْدَ امْرَأَةٍ ثَيِّبٍ؛ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ نَاكِحاً، أَوْ ذَا مَحْرَمٍ**). [م٢١٧١].

ژ جابری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هشیار بن چو زەلام ل دەڤ ژنا بیژن (ب تنێ) نەمینیت[3] ئەو نەبیت مارەكربیت یان مەحرەمێ وێ بیت).**

---

(١) كا دێ خێران كەن یان گونەهان كەن.

(٢) ژنا بیانی: ژنا بۆ مرۆڤی نەحەرام، حەرامییەكا هەر و هەر، ب ڤی رەنگی كچ خال و كچ مام و كچ مەت و كچ خالەت و ژنبرا بیانی حسێبن.

(٣) ج ب شەڤ بیت یان ب رۆژ بیت و ب تنێ بیت.

## ١٦ . باب: من رأى امرأة فليأت أهله.

## بابەتێ: هەر کەسێ ژنەك دیت بلا بچیتە دەڤ ژنا خۆ.

٢٤١٤ - (م) عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) رَأَى امْرَأَةً، فَأَتَى امْرَأَتَهُ زَيْنَبَ، وَهِيَ تَمْعَسُ مَنِيئَةً لَهَا، فَقَضَى حَاجَتَهُ. ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: (**إِنَّ الْمَرْأَةَ تُقْبِلُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ، وَتُدْبِرُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ، فَإِذَا أَبْصَرَ أَحَدُكُمُ امْرَأَةً فَلْيَأْتِ أَهْلَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ يَرُدُّ مَا فِي نَفْسِهِ**). [م١٤٠٣].

- وفي رواية: (**إِذَا أَحَدُكُمْ أَعْجَبَتْهُ الْمَرْأَةُ، فَوَقَعَتْ فِي قَلْبِهِ، فَلْيَعْمِدْ إِلَى امْرَأَتِهِ؛ فَلْيُوَاقِعْهَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يَرُدُّ مَا فِي نَفْسِهِ**).

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژنەك دیت، ئینا هاتە دەڤ هەڤژینا خۆ زەینەبێ و وێ پیستەکێ خۆ گەمار دکر، هەوجەیا خۆ قەتاند، و پاشی زڤری دەڤ هەڤالێت خۆ و گۆت: (ب راستی ژن ب ئاوایێ شەیتانی دهێت و ب ئاوایێ شەیتانی دچیت[1]، ڤێجا ئەگەر ئێکی ژ هەوە ژنەك دیت بلا بچیتە دەڤ ژنا خۆ و نڤینا وێ، ب راستی ئەڤە دێ یا د دلێ ویدا بەت).**

- **و د ڤەگێرەکێدا: (ئەگەر ئێکی ژ هەوە ژنەکێ ئەو گوهشاند، و تشتەك کەفتە د دلێ ویدا بلا بەر ب ژنا خۆڤە بچیت و ب چیتە نڤینا وێ ب راستی ئەڤە دێ یا د دلێ ویدا بەت).**

## ١٧ . باب: لا تصف المرأة امرأة لزوجها.

## بابەتێ: نابیت هەڤژین ژنێ بۆ زەلامێ خۆ سالۆخەت بکەت.

٢٤١٥ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ تُبَاشِرِ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ، فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا، كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا**). [خ٥٢٤٠].

**ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژن لەشێ خۆ د لەشێ ژنێ نەدەت (نەرماتییا لەشێ وێ هەست پێ بکەت) و رەوشا وێ بۆ زەلامێ خۆ بێژیت هەروەکی ئەو پێ بەرێ خۆ ددەتێ).**

---

(١) ئانکو: هاتنا وێ و چۆنا وێ دلێ مرۆڤی دخوازیتە خرابییێ کا چاوا شەیتان بەرێ مرۆڤی ددەتە خرابیێ و دلی بەرەف خرابییێڤە دبەت.

## ١٨ ـ باب: جواز الغيلة[1].

**بابەتیٚ: دورستییا چۆنا نڤینا ژنا بچویك ب شیر.**

٢٤١٦ - (م) عَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ، أُخْتِ عُكَّاشَةَ قَالَتْ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فِي أُنَاسٍ، وَهُوَ يَقُولُ: (لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغِيلَةِ، فَنَظَرْتُ فِي الرُّومِ وَفَارِسَ، فَإِذَا هُمْ يُغِيلُونَ أَوْلاَدَهُمْ، فَلاَ يَضُرُّ أَوْلاَدَهُمْ ذَلِكَ شَيْئاً). [م١٤٤٢].

**ژ جودامەیا كچا وەهەبی، خویشكا عوكاشەی (رضي الله عنها) گۆت: ئەز ل دەڤ پێغەمبەریٚ خودیٚ (ﷺ) د ناڤ هندە خەلكیدا ئامادە بووم، و وی دگۆت: (من كرە دلیٚ خۆ ئەز پاشڤەلێدانیٚ بكەم زەلام بچیتە نڤینا ژنا خۆ یا بچویك ب شیر یان ژنا ب حەملە شیری بدەتە بچویكیٚ خۆ، پاشی من بەریٚ خۆ دا رۆمیٚ و فورسیٚ و ئەو ڤیٚ[2] د گەل بچویكێت خۆ دكەن و ئەڤە چو زیانیٚ ناگەهینیتە بچویكێت وان).**

## ١٩ ـ باب: تحريم إفشاء سر المرأة.

**بابەتیٚ: حەرامكرنا ئاشكراكرنا نهێنییا ژنیٚ.**

٢٤١٧ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ مِنْ أَشَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، الرَّجُلَ يُفْضِي إِلَى امْرَأَتِهِ، وَتُفْضِي إِلَيْهِ، ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا). [م١٤٣٧].

وفي رواية: (إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الأَمَانَةِ عِنْدَ اللهِ..) الحديث.

**ژ ئەبی سەعیدیٚ خودری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەریٚ خودیٚ (ﷺ) گۆت: (مرۆڤیٚ رۆژا قیامەتیٚ جهیٚ وی ل دەڤ خودیٚ ژ هەمیان خرابتر ئەو زەلامە ییٚ دچیتە دەڤ ژنا خۆ و ژنا وی دهێتە دەڤ پاشی نهێنییا ویٚ ئاشكراكەت).**

**و د ڤەگێرەكێدا: (ب راستی ژ مەزنترین ئێمانەتان ل دەڤ خودیٚ) فەرمووده.**

---

(١) غیلە: ئەوە زەلام بچیتە نڤینا ژنا خۆ و ئەو یا بچویك ب شیر ترسا هندیٚ ب دوگیان بكەڤیت و بچویكیٚ ویٚ هەر ییٚ ب شیر بیت، یان ژنا ب دوگیان شیری بدەتە بچویكیٚ خۆ، و ئەڤە هەردو دورستن، چونكی پێغەمبەری (ﷺ) دانەپاش لیٚ نەكرییە.

(٢) ئانكو: دچنە نڤینێت ژنێت خۆ و ئەو یێت ب شیر یان ژنێت وان شیری ددەنە بچویكێت خۆ و ئەو یێت ب دوگیان .

## ٢٠ - باب: حكم العزل[١].

## بابەتێ: فەرمانا زەلام ئاڤا خۆ برێژیتە دەرڤەی مالبچویكی.

٢٤١٨ - (ق) عَنْ جابِرٍ قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ). [خ٥٢٠٧/ م١٤٤٠]

- وفي رواية لهما: كُنَّا نَعْزِلُ والْقُرْآنُ يَنْزِلُ. [خ٥٢٠٨].
- وزاد في رواية لمسلم: لَوْ كَانَ شَيْئاً يُنْهَى عَنْهُ، لَنَهَانَا عَنْهُ الْقُرْآنُ.
- وفي رواية لمسلم: قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَبَلَغَ ذَلِكَ نَبِيَّ الله (ﷺ)، فَلَمْ يَنْهَنَا.

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) مە عەزل دكر[٢].**

- **و د ڤەگێرەكا دیدا یا وان: مە عەزل دكر و قورئان دهاتە خوارێ.**
- **و د ڤەگێرەكا موسلمیدا زێدە كرییە: ئەگەر تشتەك با پاشڤەلێدان لێ هاتبا كرن دا قورئان پاشڤەلێدانێ لێ كەت.**
- **و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) مە عەزل دكر و ئەڤە گەهشتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەم پاشڤە لێ نەداین.**

٢٤١٩ - عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّا كُنَّا نَعْزِلُ، فَزَعَمَتِ الْيَهُودُ: أَنَّهَا الْمَوْؤُودَةُ الصُّغْرَى، فَقَالَ: (كَذَبَتِ الْيَهُودُ! إِنَّ اللهَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْلُقَهُ، فَلَمْ يَمْنَعْهُ) [ت١١٣٦].

* صحيح.

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: مە گۆت ئەی پێغەمبەرێ خودێ مە عەزل دكر، ئینا جوهییان گۆت: ب راستی ئەو بنئاخكرنا بچویكە، ئینا گۆت: (جوهیان درەو كر ب راستی ئەگەر خودێ ڤیا چێكەت ئەو رێگرییێ لێ ناكەت).**

---

(١) (عەزل): ئەوە زەلام دەمێ دچیتە نڤینا هەڤژینا خۆ ئاڤا خۆ برێژیتە دەرڤەی رەحما ژنێ ب مەرەما هندێ زارۆك نەبن یان گیرۆ بكەن یان رێك بێخن، ئەڤە دورستە بەلێ ب رازیبوونا هەردووان.

(٢) ئاڤا خۆ درێژیتە دەرڤەی رەحمێ ژنێ د دەمێ نڤینێدا.

## ٢١ ـ باب: وصايا للنساء.

**بابەتێ: شيرەت بۆ ژنان.**

٢٤٢٠ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذَا صَلَّتِ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا، وَصَامَتْ شَهْرَهَا، وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا، وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا، قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ)**. [حم١٦٦١].

* حسن لغيره.

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ عەوفی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت (ئەگەر ژنێ پێنج نفێژێت خۆ كرن، و هەيڤا خۆ ب رۆژی بوو، و دەهمەنا خۆ پاراست، و گوهدارييا زەلامێ خۆ كر، دێ بۆ هێتە گۆتن، د وی دەرگەهیڕا هەرە د بەحەشتێڤە یێ تە بڤێت).**

٢٤٢١ - وعَن أَبِي هُرَيْرَةَ مثله مرفوعاً. [حب٤١٦٣].

* حديث صحيح.

**و ژ ئەبی هورەيرە (رضي الله عنه) وەكی ڤێ فەرموودەیێ ب بلندكری ئينايە.**

**٢٢ ـ باب: حق الزوج على المراه.**

**بابەتێ: مافێ زەلامی ل سەر ژنێ.**

٢٤٢٢ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لَوْ كُنْتُ آمِراً أَحَداً أَنْ يَسْجُدَ لِأَحَدٍ، لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا)**. [ت١١٥٩].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەيرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر من فەرمانا ئێكی كربا بۆ ئێكی چۆبا سوجدەیێ دا فەرمانا ژنێ كەم بۆ زەلامێ خۆ چۆبا سوجدەیێ).**

٢٤٢٣ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: لَمَّا قَدِمَ مُعَاذٌ مِنَ الشَّامِ، سَجَدَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، قَالَ: **(مَا هَذَا يَا مُعَاذُ)** ؟ قَالَ: أَتَيْتُ الشَّامَ فَوَافَقْتُهُمْ يَسْجُدُونَ لِأَسَاقِفَتِهِمْ وَبَطَارِقَتِهِمْ، فَوَدِدْتُ فِي نَفْسِي أَنْ نَفْعَلَ ذَلِكَ بِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(فَلاَ تَفْعَلُوا، فَإِنِّي لَوْ كُنْتُ آمِراً أَحَداً أَنْ يَسْجُدَ لِغَيْرِ اللهِ، لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لاَ تُؤَدِّي الْمَرْأَةُ حَقَّ رَبِّهَا حَتَّى تُؤَدِّيَ حَقَّ زَوْجِهَا، وَلَوْ سَأَلَهَا نَفْسَهَا، وَهِيَ عَلَى قَتَبٍ، لَمْ تَمْنَعْهُ)**. [جه١٨٥٣].

* حسن صحيح. وقال شعيب: مضطرب.

[وانظر: الباب قبله].

ژ عەبدوللایێ كورێ ئەبی ئەوفا گۆت: دەمێ مەعاز ژ شامێ هاتی، بۆ پێغەمبەری (ﷺ) چۆ سوجدێ، گۆت: **(ئەڤە چییە ئەی مەعاز)؟** گۆت: ئەز ژ شامێ دهێم من ئەو دیتن بۆ ئەساقیفە[1] و بەتاریقێت[2] خۆ سوجدە دبرن، و من د دلێ خۆدا دڤیا ئەم ڤێ بۆ تە بكەین، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەڤێ نەكەن ئەگەر من فەرمانا ئێكی كربا بۆ ئێكی چۆبا سوجدێ دا فەرمانا ژنێ كەم بۆ زەلامێ خۆ چۆبا سوجدێ، ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا ژن مافێ خودایێ خۆ ل سەر خۆ ناراكەت هەتا ئەو مافێ زەلامێ خۆ ددەت، و ئەگەر وی ئەو بۆ هەوجەییا خۆ داخواز كر، و ئەو ل سەر كورتانێ حێشترێ بیت رێگرییێ لێ نەكەت).**

## ٢٣ - باب: حق المرأة على زوجها.

**بابەتێ: مافێ ژنێ ل سەر زەلامێ وێ.**

٢٤٢٤ - عَنْ مُعَاوِيَةَ الْقُشَيْرِيِّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا حَقُّ زَوْجَةِ أَحَدِنَا عَلَيْهِ؟ قَالَ: **(أَنْ تُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمْتَ، وَتَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ . أَوِ اكْتَسَبْتَ . وَلاَ تَضْرِبِ الْوَجْهَ، وَلاَ تُقَبِّحْ، وَلاَ تَهْجُرْ إِلاَّ فِي الْبَيْتِ)**.[د٢١٤٢/ جه١٨٥٠].

* حسن صحيح.

ژ موعاویەیێ قوشەیری (رضي الله عنه)، گۆت: من گۆت یا پێغەمبەرێ خودێ حەقێ ژنا ئێكی ژ مە ل سەر چییە؟ گۆت: **(ئەوە تو خوارنێ بدەیێ وەختێ تو دخۆی و جلكی بكەیە بەر وەختێ جلكی دكەیە بەر خۆ، و ل سەر و چاڤێت وێ نەدەی، و خەبەر و ئاخفتنا پێ نەخۆش نەبێژییێ[3] و خۆ ژ نڤینا وێ نەدەیە پاش د مالێدا نەبیت).**

٢٤٢٥ - عَنْ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ: أَنَّهُ شَهِدَ حَجَّةَ الْوَدَاعِ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَذَكَّرَ وَوَعَظَ، فَذَكَرَ فِي الْحَدِيثِ قِصَّةً فَقَالَ: **(أَلاَ وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْراً، فَإِنَّمَا هُنَّ عَوَانٌ عِنْدَكُمْ، لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئاً غَيْرَ ذَلِكَ؛ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ، فَإِنْ فَعَلْنَ، فَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ، وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْباً غَيْرَ مُبَرِّحٍ، فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً.**

---

(١) نوسقوف: سەرۆكێ قەشە و قەمامیسانە ل گوندان و باژێرێت بچویك.

(٢) بەتریق: سەرۆكێ مەتران و قەشایە و خودانێ پلەیا ژ هەمیان بەرزترە د دێرێدا.

(٣) وەكی بێژییێ: خودێ تە ژ دلۆڤانییا خۆ دویر بێخیت، یان خودێ تە كەشمەفرێت بكەت.

أَلاَ إِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقّاً، وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقّاً:

فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ، فَلاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ، وَلاَ يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ.

أَلاَ وَحَقُّهُنَّ عَلَيْكُمْ، أَنْ تُحْسِنُوا إِلَيْهِنَّ فِي كِسْوَتِهِنَّ وَطَعَامِهِنَّ). [ت١١٦٣/ جه١٨٥١]

* حسن.

ژ عەمرویێ كورێ ئەحوەسێ جوشەمی (رضي الله عنه)، وی ل حەجا خاترخواستنێ گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) پشتی حەمد و شوكرا خودێ كری و پەسن و مەدحێت وی كرین پاشی گۆت: **(هشیار بن هەوە ئەمانەت ژن و ئەمر و وەسیەتا من د راستا ژناندا وەرگرن و خێر و شیرەتان و باشییێ ژ خۆ بۆ ژنان بخوازن[1]، ب راستی ئەو ئێخسیرن دەڤ هەوە، و هەوە ژ بلی ڤێ كو خێرخواز و باشیخواز بن بۆ ژنا چێ دی (ژ ڤوتان و پشتدانێ) ل سەر وان نینە، ژ بلی كو ئەو خەلەتییەكا ئاشكرا بكەن هەكە وەكرن[2]، هینگێ خۆ ژ نڤینا وان بدەنە پاش[3] ڤێجا لێ بدەن لێدانەكا بێ ئێش، ڤێجا ئەگەر گوهێ خۆ دانە هەوە، هوین چو هێجەتان هلنەئێخن[4].**

**بزانن هەوە حەق یێ ل سەر ژنێت خۆ هەی و ژنێت هەوە ژی حەق یێ ل سەر هەوە هەی.**

**و حەقێ هەوە ل سەر وان: یێ هەوە نەڤێت، نەهێتە سەر نڤینێت هەوە، و دەستویرییا كەسێ نەدەن یێ هەوە نەڤێت بێنە د مالێت هەوەڤە، و بزانن حەقێ وان ل سەر هەوە هوین باشییێ د گەل وان بكەن د جلك و خوارنا واندا).**

**٢٤ ـ باب: النهی عن إتیان النساو ڤ أعجازهن.**

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ چۆنا نڤینا ژنێ د جهێ دەستنڤێژا ستویرڕا.**

٢٤٢٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا).

[د٢١٦٢/ جه١٩٢٣/ مي١١٨٠]

* حسن.

---

(١) ئانكو: نەفسا خۆ ل سەر هندێ ڤێركەن باشییێ و خێرێ بگەهینە ژنێ.

(٢) خۆ ل سەر زەلامێ خۆ مەزن كرن و مافێت وان نەدەنێ.

(٣) ئانكو: و ل سەر نڤینا وێ بی بەلێ پشتا خۆ بدەیێ و پویتە بێ نەكەی، و هەكە ب ڤێ چەندێ ژی نەهاتە رێ.

(٤) كو هوین خورتی و ستەمێ لێ بكەن.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەو یێ لەعنەتكرییە یێ د جهێ دەستنڤێژا ستویرڕا بچیتە دەڤ ژنا خۆ)**[1].

## ٢٥ ـ باب: التستر عند الجماع.

## بابەتێ: خۆپەردەكرن ل دەمێ نڤینێ.

٢٤٢٧ – عَنِ عُتْبَةَ بْنِ أَبِي حَكِيمٍ: أَنَّهُ سَأَلَ سُلَيْمَانَ بْنِ مُوسَى عَنِ الرَّجُلِ يَنْظُرُ إِلى فَرْجِ امْرَأَتِهِ، فَقَالَ: سَأَلْتَ عَنْهَا عَطَاءً، فَقَالَ: سأَلْتُ عَنْهَا عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَحِبِّي (ﷺ) مِنَ الإِنَاءِ الوَاحِدِ تَخْتَلِفُ فِيْهِ أَكُفُّنَا، وأَشَارَتْ إِلى إِنَاءٍ فِي البَيْتِ قَدْرَ سِتَّةِ أَقْسَاطٍ. [حب٥٥٧٧].

* إسناده حسن.

**ژ عوتبەیێ كوڕێ ئەبی حەكیمی (رضي الله عنه) وی پرسیارا بەرێخۆدانا زەلامی بۆ شەرمگەها ژنا خۆ ژ سولەیمانێ كوڕێ مووسایی كر، ئینا گۆت: من ئەڤ پرسیارە ژ عەتائی كر، گۆت، من ئەڤ پرسیارە ژ عائیشایێ كر، ئینا گۆت: من و خۆشتڤییێ خۆ (ﷺ) د ئێك ئاماندا سەرێ خۆ دشویشت دەستێت مە تێدا تێكەل دبوون، و نیشان كرە ئامانەكی د مالێدا تەمەت شەش قستان دچۆنێ[2].**

٢٤٢٨ – عَنْ عُتْبَةَ بْنِ عبدٍ السُّلمي قال: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) : (**إذا أتَى أحَدُكم أهلَهُ فليَسْتَتِرْ ولا يَتَجَرَّدْ تَجَرُّدَ العَيْرَيْنِ**). [جه١٩٢١].

* ضعيف.

**ژ عوتبەیێ كوڕێ عەبدێ سەلەمی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە چۆ دەڤ ژنا خۆ بلا خۆ پەردە بكەت و خۆ رویس نەكەت رویساتییا كەرێت كویڤی).**

---

**(١) شێخ سالح ئەلشامی ئەڤ فەرموودە د مالپەرێ خۆدا ب ژمارا دویڤرا ئینایە، و هەر ل سەر وی بابەتییە:**

٢٤٢٧ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم: (**لاَ يَنْظُرُ اللهُ إِلَى رَجُلٍ أَتَى رَجُلاً، أَوْ امْرَأَةً فِي الدُّبُرِ**).[ت١١٦٥].

* حسن.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ بەرێ خۆ نادەتە زەلامەكی (بەرێخۆدانا دلۆڤانییێ) د جهێ دەستنڤێژا ستویرڕا بچیتە دەڤ زەلامەكی یان ژنەكێ).**

**(٢) (هەر قستەك نیڤ ساعە، و هەر ساعەك ب كێشانا ئەڤرۆ ل دەڤ جمهوری دبیتە (٢،٠٢٥) كغم، و ل دەڤ حەنەفییان دبیتە: (٣،٢٥) كغم.**

## الفصل الثالث: النفقات.

## پشكا سێيێ: نەفەقە.

### ١ - باب: فضل النفقة على الأهل

### بابەتێ: خێرا نەفەقەيێ ل سەر خەلكێ خۆ.

٢٤٢٩ - (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا أَنْفَقَ الْمُسْلِمُ نَفَقَةً عَلَى أَهْلِهِ، وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا، كانَتْ لَهُ صَدَقَةً) . [خ٥٣٥١ (٥٥)/ م١٠٠٢].

ژ ئەبی مەسعودێ بەدری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر زەلام ب ئنيەتا خێرێ مەزاختنەكێ د بەر مالا خۆدا بمەزێخيت، ئەو بۆ سەدەقەيە).**

٢٤٣٠ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ، وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ، أَعْظَمُهَا أَجْراً الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ) . [م٩٩٥].

ژ ئەبی هورەيرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(تە دينارەك د رێكا خودێدا مەزاختبيت و تە دينارەك د ئازاكرنا كۆلەيەكيدا مەزاختبيت و تە دينارەك كربيتە سەدەقە بۆ بەلەنگازەكی، و تە دينارەك ل سەر مالا خۆ مەزاختبيت، يا ژ هەميان خێرا وێ مەزنتر ئەوە يا تە ل سەر مالا خۆ مەزاختی).**

٢٤٣١ - عَنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ) تَبُوكاً، فَمَرَّ بِنَا شَابٌّ نَشِيطٌ، يَسُوقُ غُنَيْمَةً لَهُ فَقُلْنَا: لَوْ كَانَ شَبَابُ هَذَا وَنَشَاطُهُ فِي سَبِيلِ الله كَانَ خَيْراً لَهُ مِنْهَا، فَانْتَهَى قَوْلُنَا حَتَّى بَلَغَ رَسُولَ الله (ﷺ)، فَقَالَ: (مَا قُلْتُمْ؟) ، قُلْنَا: كَذَا وَكَذَا، قَالَ: (أَمَا إِنَّهُ إِنْ كَانَ يَسْعَى عَلَى وَالِدَيْهِ أَوْ أَحَدِهِمَا فِهُوَ فِي سَبِيلِ الله، وَإِنْ كَانَ يَسْعَى عَلَى عِيَالٍ يَكْفِيهِمْ فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله، وَإِنْ كَانَ يَسْعَى عَلَى نَفْسِهِ فَهُوَ فِي سَبِيلِ الله عزّ وجل). [هق٧/٤٧٩].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) وی گۆت: مە خەزا تەبووكێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، جەحێلەكی زيرەك د بەر مەرا بۆری هندە پەزێ خۆ دهاژۆت، ئينا مە گۆت: ئەگەر جەحێلينی و زيرەكييا وی د رێكا خودێدا بايە، بۆ وی ژ ڤێ چێتر بوو (ئانكو: د جيهادێدا بايە) ئاخفتنا مە گەهشتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئينا گۆت: **(هەوە چ گۆت)؟** مە گۆت: ئەڤە و ئەڤە، گۆت: **(ئەگەر ئەو ل سەر خاترا دايك و بابێت خۆ كار**

**دكەت يان ئێك ژ وان ئەو د رێكا خودێدایە، و ئەگەر بۆ خۆ دكەت كار ئەو د رێكا خودایێ هەر ب هێز و مەزندایە).**

## ٢ ـ باب: نفقة الأَهل مقدمة على الصدقة.

## بابەتێ: مەزاختنا ل سەر خەلكێ مالێ بەری خێرێ و سەدەقەیێ دهێت.

٢٤٣٢ – (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: بَلَغَ النَّبِيَّ (ﷺ) أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِهِ أَعْتَقَ غُلاَماً لَهُ عَنْ دُبُرٍ، لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ، فَبَاعَهُ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ، ثُمَّ أَرْسَلَ بِثَمَنِهِ إِلَيْهِ. [خ٧١٨٦ (٢١٤١)/ م٩٩٧].

- ولفظ مسلم . وبعضه عند البخاري . قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي عُذْرَةَ عَبْداً لَهُ عَنْ دُبُرٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: **(أَلَكَ مَالٌ غَيْرُهُ)** ؟ فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ: **(مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي)** ؟ فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنِ عَبْدِ اللهِ الْعَدَوِيُّ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ، فَجَاءَ بِهَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: **(ابْدَأْ بِنَفْسِكَ فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ فَلأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَيْءٌ فَلِذِي قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِي قَرَابَتِكَ شَيْءٌ فَهكَذَا وَهَكَذَا)** . يَقُولُ: فَبَيْنَ يَدَيْكَ، وَعَنْ يَمِينِكَ، وَعَنْ شِمَالِكَ. [خ٢١٤١].

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) **گۆت: گەهشتە پێغەمبەری** (ﷺ) زەلامەكی ژ هەڤالێت وی بەندەیەك بۆ مشتی مرنا خۆ ئازا كر[1] و وی چو مالێ دی نەبوو ژ وی پێڤەتر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ئەو فرۆت و بهایێ وی بۆ وی هنارت.

- و د بێژەیا موسلمیدا، و هندەك ژ وێ ل دەڤ بوخارییە: گۆت: زەلامەكی ژ بنەمالا عوزرەیی بەندەیەك بۆ پشتی مرنا خۆ ئازا كر، ئەڤە گەهشتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا گۆت: **(ئەرێ ژ بلی ڤی تە مالەكێ دی هەیە)؟** گۆت: نەخێر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(كی دێ ڤی ژ من كریت)؟** ئینا نوعەیمێ كورێ عەبدوللایێ عەدەوی ب هەشت سەد دەرهەمان كری، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینان و دانەڤ وی، و پاشی گۆت: **(ژ خۆ دەست پێ بكە خێرێ د گەل بكە، و ئەگەر تشتەك ژ تە زێدە بوو بۆ مالاتە، و ئەگەر تشتەك ژ بەر مالا تە زێدە بوو، بۆ مرۆڤێت تە، و ئەگەر تشتەك ژ بەر مرۆڤێت تە زێدە بوو ڤێجا هۆسا و هۆسا)** ب دەستێ خۆ دبێژیت: ل بەر سینگێ خۆ و لایێ خۆ یێ راستێ و لایێ چەپێ.

---

(١) (عن دبر) پشتی مرنا خۆ: رامان ئەوە د ژینا خۆدا ئازا ناكەت و بێژیت: ئەگەر ئەز مرم یان پشتی ئەز دمرم بەندەیێ من یێ ئازایە، و ئەڤە كارەكێ باشە ئەگەر وی مال هەبیت و كێماسی نەگەهیتە میراتگران.

## ٣ ـ باب: تأخذ الزوجة من مال زوجها بالمعروف.

## بابەتێ: ژن دێ هندێ ژ مالێ زەلامێ خۆ راكەت تێرا وێ بكەت.

٢٤٣٣ – (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: جاءَتْ هِنْدُ بِنْتُ عُتْبَةَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، ما كانَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ مِنْ أَهْلِ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ يَذِلُّوا مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ، ثُمَّ ما أَصْبَحَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَهْلُ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ يَعِزُّوا مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ. قَالَ: (**وَأَيْضاً، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ**) . قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مِسِّيكٌ، فَهَلْ عَلَيَّ حَرَجٌ أَنْ أُطْعِمَ مِنَ الَّذِي لَهُ عِيَالَنَا؟ قالَ: (**لاَ أُرَاهُ إِلاَّ بِالمَعْرُوفِ**) . [خ٣٨٢٥ (٢٢١١)/ م١٧١٤]

وفي رواية لهما: قالت: إِنَّ أَبا سُفْيانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، وَلَيْسَ يُعْطِينِي ما يَكْفِينِي وَوَلَدِي؛ إِلاَّ ما أَخَذْتُ مِنْهُ، وَهْوَ لاَ يَعْلَمُ، فَقَالَ: (**خُذِي ما يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالمَعْرُوفِ**) . [خ٥٣٦٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: هندا كچا عوتبەی هات، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من پێخۆش نەبوو كەسەك ل سەر روویێ عەردی ژ خودانێ خیڤەتەكێ[1] ژ خەلكێ خیڤەتا تە شكەستیتر بیت، پاشی ئەڤرۆ وەلێهات من پێخۆش نینە كەسەك ل سەر روییێ عەردی ژ خودانێ خیڤەتەكێ[2] ژ خەلكێ خیڤەتا تە ب سەرفەراز و ب هێزتر بن، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (و هێژ[3]، ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستیدا)، وێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەبو سوفیان زەلامەكێ گرتییە (چوریكە) ما گونەهەك ل سەر من هەیە ئەز ژ وی یا وی هەی بدەمە زارۆكێت خۆ؟ گۆت: (نەخێر ئەز باش نابینم ب جوامێری (عەدەتی) نەبیت)[4].**

**و د ڤەگێرەكا واندا: ب راستی ئەبو سوفیان زەلامەكێ ڤەلسە و هندێ نادەتە من تێرا من و عەیالێ من بكەت ئەو نەبیت یا ئەز ژێ وەردگرم و ئەو نوزانیت؟ گۆت: (ب جوامێری (دویڤ عەدەتی) هندێ راكە تێرا تە و عەیالێ تە بكەت).**

---

(١) خودانێ مالەكێ یان ژ تە ب خۆ.

(٢) خودانێ مالەكێ یان ژ تە ب خۆ.

(٣) ئانكو: دێ باوەرییا تە و ڤیانا تە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ژ ئیسلامێ پتر لێ هێت.

(٤) ئانكو: تێرا خۆ و عەیالێ خۆ نەزێدەتر.

## ٤ ـ باب: الرجل يأخذ من مال ولده.

## بابەتێ: زەلام دێ مالێ كورێ خۆ راكەت.

٢٤٣٤ – عَنْ عُمَارَةَ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَمَّتِهِ: أَنَّهَا سَأَلَتْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: فِي حِجْرِي يَتِيمٌ، أَفَآكُلُ مِنْ مَالِهِ؟ فَقَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ مِنْ أَطْيَبِ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ، وَوَلَدُهُ مِنْ كَسْبِهِ**) . [د٣٥٢٨/ ت١٣٥٨/ ن٤٤٦١/ جه٢١٣٧/ مي٢٥٧٩].

* صحيح.

**ژ عومارەیێ كورێ عومەیری (رحمه الله) ژ مەتا خۆ، وێ پرسیار ژ عائیشایێ كر (رضي الله عنها) ئێتیمەك یێ ل دەڤ من، ئەرێ ئەز ژ مالێ وی بخۆم؟ ئینا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی حەلالترین تشتێ مرۆڤی خواری ئەوە ژ كارێ خۆ بخۆت و كورێ وی ژ كارێ ویيە).**

٢٤٣٥ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ لِي مَالاً وَوَلَداً، وَإِنَّ وَالِدِي يَجْتَاحُ مَالِي، قَالَ: (**أَنْتَ وَمَالُكَ لِوَالِدِكَ ، إِنَّ أَوْلاَدَكُمْ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِكُمْ، فَكُلُوا مِنْ كَسْبِ أَوْلاَدِكُمْ**). [د٣٥٣٠/جه٢٢٩٢].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی من مال و عەیال یێ هەی، و بابێ من ب سەر مالێ مندا دگریت (مالێ من دبەت) گۆت: (تو و مالێ خۆ یێت بابێ خۆنە، ب راستی عەیالێت هەوە پاكترین كارێ هەومیە، فێجا ژ كارێ عەیالێ خۆ بخۆن).**

٢٤٣٦ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**إِنَّ أَوْلاَدَكُمْ هِبَةُ الله لَكُم**: ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾ [الشورى:٤٩] **فَهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ لَكُمْ إِذَا احْتَجْتُمْ إِلَيْهَا**). [ك٣١٢٣/هق٧/٤٨٠].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی زارۆكێت هەوە دیارییا خودێنە بۆ هەوە ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾[1] ئەو و مالێ وان بۆ هەوەیە ئەگەر هوین هەوجە ببنێ).**



(١) یێ بڤێت دێ كچان دیاری دەتێ و یێ بڤێت دێ كوڕان دیاری دەتێ.

## ١ ـ باب: يحرم من الرضاع ما يحرم من النسب.

**بابەتێ: ب شیردانێ حەرام دبیت ئەوا ب بابینییێ حەرام دبیت.**

٢٤٣٧ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) في بِنْتِ حَمْزَةَ: (**لاَ تَحِلُّ لِي، يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ ما يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ، هَيَ بِنْتُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ**) .[خ٢٦٤٥/ م١٤٤٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) د راستا كچا حەمزەیدا گۆت: (ئەو بۆ من حەلال نابیت، ئەوا ب بابینییێ حەرام دبیت ب شیری ژی حەرام دبیت ، ئەو كچا برایێ منە یا شیری).**

٢٤٣٨ – عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ حَرَّمَ مِنَ الرَّضَاعِ مَا حَرَّمَ مِنَ النَّسَبِ**). [ت١١٤٦].

* صحيح.

**ژ عەلییێ كوڕێ ئەبو تالبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی ئەوا خودێ ب بابینییێ حەرام كری ب شیری ژی یا حەرام كری)**

## ٢ ـ باب: لبن الفحل.

**بابەتێ: شیرێ زەلامی.**

٢٤٣٩ – (ق) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبيرِ أَنَّ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ أَفْلَحُ ـ أَخُو أَبِي الْقُعَيْسِ، بَعْدَما أُنْزِلَ الْحِجَابُ ـ، فَقُلْتُ: لاَ آذَنُ لَهُ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ فِيهِ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَإِنَّ أَخاهُ أَبَا الْقُعَيْسِ لَيْسَ هُوَ أَرْضَعَنِي، وَلكِنْ أَرْضَعَتْنِي امْرَأَةُ أَبِي الْقُعَيْسِ، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَفْلَحَ أَخا أَبِي الْقُعَيْسِ اسْتَأْذَنَ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ حَتَّى أَسْتَأْذِنكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**وَما مَنَعَكِ أَنْ تَأْذَنِي! عَمُّكِ**) . قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ الرَّجُلَ لَيْسَ هُوَ أَرْضَعَنِي، وَلكِنْ أَرْضَعَتْنِي امْرَأَةُ أَبِي الْقُعَيْسِ، فَقَالَ: (**ائْذَنِي لَهُ، فَإِنَّهُ عَمُّكِ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ**) .

قالَ: عُرْوَةُ: فَلِذلِكَ كانَتْ عائِشَةُ تَقُولُ: حَرِّمُوا مِنَ الرَّضَاعَةِ ما تُحَرِّمُونَ مِنَ النَّسَبِ.خ٤٧٩٦ (٢٦٤٤)/ م١٤٤٥].

**ژ عوروەیێ كوڕێ زوبەیری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەفلەحێ برایێ ئەبو قوعەیسی دەستویری ژ من خواست بهێتە دەڤ من، پشتی ئایەتا پەردەپۆشییێ هاتییە خوارێ، من گۆت: ئەز دەستویرییێ نادەمێ، هەتا ئەز دەستویرییا پێغەمبەری (ﷺ) د راستا ویدا نەوەرگرم، چونكی ب راستی برایێ ئەبو قوعەیسی شیر**

نەدایە من، بەلێ ژنا ئەبو قوعەیسی شیر پێ دایە من، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەڤ من و من گۆتە وی: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەفلەحێ برایێ ئەبی قوعەیسی دەستویری خواست بێتە دەڤ من، من نەڤیا ئەز دەستویرییا وی بدەم هەتا دەستویرییا تە وەردگرم، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە وێ: **(و چ رێگری ل تە كر تو دەستویرییا مامێ خۆ نەدەی)** من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی وی زەلامی شیر نەدایە من، بەلێ ژنا ئەبو قوعەیسی شیر پێ دایە من، ئینا گۆت: **(دەستویرییێ بدەیێ ئەو مامێ تەیە دەستێ تە پێ راستێ ب ئاخێ بكەڤیت)**.

عوروەیی گۆت: ژ بەر هندێ عائیشایێ دگۆت: ب شیردانێ حەرام بدانن ئەوا هوین ب بابینییێ حەرام ددانن.

### ٣ ـ باب: إنما الرضاعة من المجاعة.

### بابەتێ: ب راستی شیردانا حەرام دكەت ژ برسێیە

٢٤٤٠ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا رَجُلٌ، فَكَأَنَّهُ تَغَيَّرَ وَجْهُهُ، كَأَنَّهُ كَرِهَ ذلِكَ. فَقَالَتْ: إِنَّه أَخِي، فَقَالَ: (انْظُرْنَ مَنْ إِخْوَانُكُنَّ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ). [خ٥١٠٢ (٢٦٤٧)/ م١٤٥٥].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەڤ وێ و زەلامەك ل دەڤ وێ بوو، هەروەكی ناڤچاڤێت وی گوهۆڕین، هەروەكی وی ئەڤە پێ نەخۆش بوو، ئینا وێ گۆت: ئەو برایێ من (پێ شیرییە)، ئینا گۆت: **(بەرێ خۆ بدەنێ كا كی برایێت هەوەنە، شیردانا حەرام دكەت ئەوە یا ژ برساتییێ بیت)**.

### ٤ ـ باب: في المصة والمصتين.

### بابەتێ: مێژتنەك و دو مێژتن.

٢٤٤١ - (م) عَنْ عائِشَةَ قَالَتْ: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لا تُحَرِّمُ المصَّةُ والمصَّتَانِ) .[م١٤٥٠].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(مێژتنەك و دو مێژتن حەرام ناكەن)**.

## ٥ ـ باب: التحريم بخمس رضعات.

## بابەتێ: حەرامكرن ب پێنج شیرخوارنایە.

٢٤٤٢ – (م) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرْآنِ: عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ. ثُمَّ نُسِخْنَ: بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ. فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَهُنَّ فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ . [م١٤٥٢].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) وێ گۆت: ژ وێ یا ژ قورئانێ هاتییە خوارێ ئەڤە بوو: دەه شیردانێت ئاشكەرا[1] حەرام دكەن پاشی ب پێنجێت ئاشكرا هاتە نەسخكرن، و پێغەمبەرێ خودێ چۆ بەر دلۆڤانییا خودێ و ئەو ژ قورئانێ دهاتە خواندن[2].**

## ٦ ـ باب: رضاعة الكبير.

## بابەتێ: شیردانا مەزنی.

٢٤٤٣ – (م) عَن ابنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ القَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ سَالِماً ـ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ ـ كَانَ مَعَ أَبِي حُذَيْفَةَ وَأَهْلِهِ فِي بَيْتِهِمْ، فَأَتَتْ ـ تَعْنِي: ابْنَةَ سُهَيْلٍ ـ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: إِنَّ سَالِماً قَدْ بَلَغَ مَا يَبْلُغُ الرِّجَالُ، وَعَقَلَ مَا عَقَلُوا، وَإِنَّهُ يَدْخُلُ عَلَيْنَا، وَإِنِّي أَظُنُّ أَنَّ فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئاً. فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَرْضِعِيهِ تَحْرُمِي عَلَيْهِ، وَيَذْهَبِ الَّذِي فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ**) ، فَرَجَعَتْ فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُهُ، فَذَهَبَ الَّذِي فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ. [م١٤٥٣].

وفي رواية: قَالَتْ عَائِشَةُ: جَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلٍ إلى النبيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَرَى فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيْفَةَ مِنْ دُخُولِ سالمٍ ـ وهو حَلِيفهُ ـ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَرْضِعِيهِ**) ، قَالَتْ: وَكَيْفَ أُرْضِعُهُ وَهُوَ رَجُلٌ كَبِيرٌ؟! فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَقَالَ: (**قَدْ عَلِمْتُ أَنَّهُ رَجُلٌ كَبِيرٌ**).

**ژ ئیبن ئەبی مەلیكەی (رضي الله عنه) ژ قاسمی ژ عائیشایێ: سالم ئازاكرییێ ئەبی حوزەیفە بوو، و ل دەڤ ئەبو حوزەیفەی و هەڤژینا وی د مالا وانڤە بوو، ئەو ـ ئانكو: كچا سوهەیلی ـ هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: ب راستی سالم یێ گەهشتییە وێ یا زەلام دگەهنێ و وێ تێ دگەهیت یا ئەو تێ دگەهن[3]، و ئەو دهێتە دەڤ مە و ئەز هزر دكەم تشتەك ژ ڤێ چەندێ دكەڤیتە دلێ ئەبی حوزەیفەدا، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت:**

(١) رامانا ئاشكەرا: شیرخوارنەك بیت بچویكی تێر بكەت و ژ برسێ بیت و ژییێ وی ژ دو سالان كێمتر بیت.

(٢) ئەڤە رەنگێ دوویێە ژ نەسخێ، نەسخا خواندنێ و هێلانا فەرمانێ و هندەكان دخواند و نەدزانی یا هاتییە نەسخكرن.

(٣) ئانكو: یێ بالغ بووی.

**(شیری بدێ دێ ل سەر تە حەرام بیت و ئەوا د دلێ ئەبو حوزەیفەدا دێ چیت)** زڤری و گۆت: من شیر دایێ، ئینا ئەوا د دلێ ئەبو حوزەیفەدا چۆ.

- و د ڤەگێرەکێدا: عائیشایێ گۆت: سەهلا کچا سوهەیلی هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز تشتەکی ژ هاتنا سالمی دەڤ مە د نافچاڤێت ئەبو حوزەیفەدا دبینم و ئەو هەڤپەیمانێ وییە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(شیری بدەیێ)** گۆت: چاوا شیرێ بدەمێ و ئەو زەلامەکێ مەزنە؟! پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گرنژی و گۆت: **(ئەز دزانم ئەو زەلامەکێ مەزنە)**.

٢٤٤٤ - (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ قَالَتْ: أَبَى سَائِرُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنْ يُدْخِلْنَ عَلَيْهِنَّ أَحَداً بِتِلْكَ الرَّضَاعَةِ، وَقُلْنَ لِعَائِشَةَ: وَاللهِ مَا نَرَى هذَا إِلاَّ رُخْصَةً أَرْخَصَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِسَالِمٍ خَاصَّةً، فَمَا هُوَ بِدَاخِلٍ عَلَيْنَا أَحَدٌ بِهَذِهِ الرَّضَاعَةِ، وَلاَ رَائِينَا. [م١٤٥٤].

ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: هەمی هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) نەهێلان ب شیردانا مەزنی ئێك بهێتە دەڤ وان و گۆتنە عائیشایێ ئەم ب خودێ کەینە ئەم وێ شیردانێ نابینین ژ بلی کو دەستویرییەکا تایبەتە بۆ سالمی و کەس ب ڤێ شیردانێ ناهێتە دەڤ مە و نە مە دبینیت.

## ٧ ـ باب: شهادة المرضعة.

## بابەتێ: شەهدەییا شیردەهێ.

٢٤٤٥ - (خ) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الحَارِثِ: أَنَّهُ تَزَوَّجَ ابْنَةً لأَبِي إِهَابِ بْنِ عَزِيزٍ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: قَدْ أَرْضَعْتُ عُقْبَةَ وَالَّتِي تَزَوَّجَ، فَقَالَ لَهَا عُقْبَةُ: ما أَعْلَمُ أَنَّكِ أَرْضَعْتِنِي وَلاَ أَخْبَرْتِنِي، فَأَرْسَلَ إِلَى آلِ أَبِي أَهَابٍ يَسْأَلُهُمْ، فَقَالُوا: ما عَلِمْنا أَرْضَعَتْ صَاحِبَتَنا. فَرَكِبَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) بِالمدِينَة فَسَأَلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (كَيْفَ وَقَدْ قِيلَ) ! ففارَقَها وَنَكَحَتْ زَوْجاً غَيْرَهُ. [خ٢٦٤٠ (٨٨)].

ژ عوقبێ کورێ حارسی (رضي الله عنه)، کو وی کچا ئەبی ئیهابێ کورێ عەزیزی مارە کربوو، ژنەك هاتە دەڤ و گۆت: من شیر یێ دایە عوقبەی و دایە ئەوا مارەکری ژی، عوقبەی گۆتێ: ب راستی ئەز نوزانم تە شیر دایە من و تە نەگۆتییە من، سویار بوو چۆ مەدینێ دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پرسیارا وی کر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(چاوا چێ دبیت پشتی ئەڤە گۆتی)**، عوقبەی ئەو هێلا و ژنەکا دی مارە کر.

## ٨ ـ باب: لا رضاع بعد فصال.

## بابەتێ: پشتی شیرڤەكرنێ شیردانا حەرام دكەت نینە.

٢٤٤٦ – عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ يُحَرِّمُ مِنَ الرِّضَاعَةِ؛ إِلاَّ مَا فَتَقَ الْأَمْعَاءَ فِي الثَّدْيِ، وَكَانَ قَبْلَ الْفِطَامِ) . [ت١١٥٢].

* صحيح.

ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب شیردانێ حەرام نابت ئەو نەبیت یا رویڤیكا تژی دكەت ژ شیرێ د چچكیدا و بەری شیرڤەكرنێ بیت).

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

# الكتاب الثالث

## الطلاق وأحكام مفارقة الزوجة

# کتێبا سێیێ

## بەردان و فەرمانێت جودابوونا ل گەل ژ ژنێ.

## الفصل الأول: احكام الطلاق.

## پشكا ئێكێ: فەرمانێت بەردانێ.

### ١ ـ باب: أبغض الحلال.

### بابەتێ: نەشرینترین حەلال.

٢٤٤٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**أَبْغَضُ الْحَلاَلِ إِلَى اللهِ تَعَالَى الطَّلاَقُ**).[د٢١٧٨/ جه٢٠١٨].

* ضعيف.

* قال المنذري، مرسل غريب[1].

[وانظر: ٢٥٠٨] .

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نەشرینترین حەلال ل دەڤ خودێ بەردانە).**

### ٢ ـ باب: طلاق السنة.

### بابەتێ: بەردانا دورست.

٢٤٤٨ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي قَوْلِهِ عزّ وجل: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[الطلاق:١] . قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنه: قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ.          [ن٣٣٩٣].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی د گۆتنا خودایێ هەر ب هێز و مەزندا** ﴿يا أَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾**(٢) گۆت: و وان دەستپێكا ژڤانا وان و د پاقژیيا واندا بەردەن.**

٢٤٤٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: طَلاَقُ السُّنَّةِ أَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِراً فِي غَيْرِ جِمَاعٍ.[ن٣٣٩٥/ جه٢٠٢٠].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: بەردانا دورست ئەوە د پاقژیيا نڤین چێنەبوویی تێدا بەردەت.**

---

(١) نەڤ رۆنكرنە د چاپا ئێكێدا نەهاتییە، و شێخ سالحی د مالپەرێ خۆدا ئینایە.

(٢) هەی پێغەمبەر گاڤا هەوە ڤیا ژنان بەردەن، وان د پاقژیيا واندا بەردەن [پاقژیيا ژ ژڤانا خۆ دەركەفتی، و چۆنا نڤینێ د گەل چێنەبوویی].

٢٤٥٠ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: الطَّلاَقُ عَلَى أَرْبَعَةِ وُجُوهٍ، وَجْهَانِ حَلاَلٌ، وَوَجْهَانِ حَرَامٌ، فَأَمَّا الْحَلاَلُ: فَأَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِراً مِنْ غَيْرِ جِمَاعٍ، أَو يُطَلِّقَهَا حَامِلاً مُسْتَبِيناً حَمْلَهَا، وَأَمَّا الْحَرَامُ: فَأَنْ يُطَلِّقَهَا حَائِضاً، أَوْ يُطَلِّقَهَا حِينَ يُجَامِعُهَا، لاَ يَدْرِي اشْتَمَلَ الرَّحِمُ عَلَى وَلَدٍ أَمْ لاَ.[هق٧/٣٢٥].

**ژ ئیبن عەباسی (خودیّ ژ وان رازی بیت) گۆت: بەردان چوار رەنگن، دو حەرامن و دو حەلالن، هندیکە یێت حەلالن: ئەوە د پاقژیا نڤین چێنەبوویی تێدا بەردەت، یان ژی بەردەت و ئەو یا ب حال و حالیّ ویّ ییّ ئاشکەرا، و هندیکە یێت حەرامن: بەردەت و ئەو یا بێنڤێژ، یان بچیتە نڤینا ویّ و پاشی بەردەت و ئەو نەزانیت کا مالبچویکیّ ویّ ب زارۆك کەتییە یان نە.**

٢٤٥١ – عَنْ عَلِي رضي الله عنه قَالَ: مَا طَلَّقَ رَجُلٌ طَلاَقَ السُّنَّةِ فَيَنْدَمَ أَبداً.[هق٧/٣٢٥].

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: نینە زەلامەك ب بەردانەکا دورست بەردەت و جارەکیّ پەشێمان ببیت.**

## ٣ ـ باب: [اَلطَّلاَقُ مَرَّتَانِ].

## بابەتیّ: ﴿الطلاق مرّتانِ﴾ تەلاق دو جارن.

٢٤٥٢ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ للنَّبِي (ﷺ): إِنِّي أَسْمَعُ الله يَقُولُ: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ﴾فَأَيْنَ الثَّالِثَةُ؟ قَالَ: (﴿فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ﴾ [البقرة: ٢٢٩] هِيَ الثَّالِثَةُ). [هق٧/٣٤٠].

**ژ ئەنەسیّ کوڕیّ مالکی (رضي الله عنه) گۆت، زەلامەکی گۆتە پێغەمبەری (ﷺ) ئەز گوھ ل خودیّ دبم دبێژیت، ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ﴾ تەلاق دو جارن، پا کا یاسێییّ؟ گۆت، (﴿فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ﴾) ئەو یا سێیێیە)[1].**

٢٤٥٣ – عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثاً، قَالَ: فَسَكَتَ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ رَادُّهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَنْطَلِقُ أَحَدُكُمْ فَيَرْكَبُ الْحَمُوقَةَ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! وَإِنَّ اللهَ قَالَ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا﴾ [الطلاق:٢] ، وَإِنَّكَ لَمْ تَتَّقِ اللهَ، فَلَمْ

(١) رامان ئەوە: بەردانا لێزڤرین تێدا ـ (الطلاق الرجعي) دو جارنە، پشتی ڤان یا سێییّ یان دەست دەینانە سەرە ب قەنجی، یان دەست ژ سەرراکرنە ب قەنجی.

أَجِدْ لَكَ مَخْرَجاً، عَصَيْتَ رَبَّكَ، وَبَانَتْ مِنْكَ امْرَأَتُكَ، وَإِنَّ اللهَ قَالَ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ ﴾ [الطلاق:١] فِي قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ.

وفي رواية عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: إِذَا قَالَ: أَنْتِ طَالِقٌ ثَلاَثاً، بِفَمٍ وَاحِدٍ؛ فَهِيَ وَاحِدَةٌ. وفي رواية جَعَلَهُ مَنْ قَوْلَ عِكْرِمَةَ. [د٢١٩٧].

* صحيح.

**ژ موجاهدی (رحمه الله) گۆت: ئەز ل دەڤ ئیبن عەباسی بووم زەلامەك هاتە دەڤ و گۆتێ: وی ژنا خۆ ب سێ تەلاقان یا بەردای، ئینا بێدەنگ بوو هەتا من هزر كر دێ بۆ زڤرینیتەڤە، پاشی گۆت: ئێك ژ هەوە دێ چیت كارەكی كێم عەقل كەت، پاشی دێ بێژیت: ئەی ئیبن عەباس، ئەی ئیبن عەباس و خودێ گۆتییە:** ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا﴾ **و تە تەقوا خودێ نەكرییە**[1]**، ڤێجا ئەز چ رێكا بۆ تە نابینم، تە نەگوهدارییا خودایێ خۆ كر و ژنا تە ژ تە چۆ، و خودێ دبێژیت:** ﴿یا أَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾. **و وان دەستپێكا ژڤانا وان و د پاقژییا واندا بەردەن.**

- **و د ڤەگێرەكێدا ل دەڤ عیكریمەیی (رحمه الله) ژ ئیبن عەباسی: ئەگەر هەرسێ تەلاق ب ئێك جار هاڤێتن، ئەو ئێك تەلاقە، و د ڤەگێرەكێدا: ئەڤە كرییە گۆتنا عیكریمەیی.**

## ٤ ـ باب: طلاق الحائض.

## بابەتێ: بەردانا ژنا د بێنڤێژییێدا.

٢٤٥٤ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حائِضٌ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ ذلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْها حَتَّى تَطْهُر، ثُمَّ تَحِيضَ ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمرَ اللهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ)** . [خ٥٢٥١ (٤٩٠٨)/ م١٤٧١].

- وفي رواية لمسلم: **(مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا طَاهِراً أَوْ حَامِلاً)** .
- وفي رواية له: قُلْتُ: فَاعْتَدَدْتَ بِتِلْكَ التَّطْلِيقَةِ الَّتِي طَلَّقْتَ، وَهْيَ حَائِضٌ؟ قَالَ: مَا لِيَ لاَ أَعْتَدُّ بِهَا؟ وَإِنْ كُنْتُ عَجَزْتُ وَاسْتَحْمَقْتُ.

---

(١) نانكو: تو ل دویڤ فەرمانێت شەرعی د بەردانێدا نەچۆیە هەتا خودێ رێكەكێ ل بەر تە ڤەكەت و كارێ تە ب ساناهی بكەت.

ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژنا خۆ بەردا و ئەو د بێنڤێژییێدا بوو، ئینا عومەرێ كوڕێ خەتتابی پرسیارا ڤێ چەندێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(فەرمانا وی بكە بلا بزڤرینیتەڤە، پاشی بلا بهێلیت هەتا پاقژ دبیت، پاشی بێنڤێژ دبیت، و پاشی پاقژ دبیت، پاشی ئەگەر ڤیا بلا بگریت و ئەگەر ڤیا بلا بەردەت بەری بچیتە دەڤ ئها ئەڤە ئەو ژڤانن یێت خودێ فەرمان كری ژن تێدا بهێنە بەردان).**

- و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: **(فەرمانا وی بكە بلا بزڤرینیتەڤە، پاشی بلا د پاقژییێدا یان د حەملیدا بەردەت).**
- و د ڤەگێرەكا دی یا موسلمیدا: ئەرێ تە ئەو بەردانا تە د بێنڤێژییێدا بەردایی تە بەردان حسێب كر؟ گۆت: ئەز چاوا بەردان ناهەژمێرم، ما ئە ئەگەر ئەز نەچار ببم (نەشێم بزڤرینم) یان من ساویلكی كربیت[1].

## ٥ . باب: أحكام الطلاق والطلاق الثلاث.

### بابەتێ: فەرمانێت بەردانێ و بەردانا سێ جاری پێكڤە.

٢٤٥٥ – (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الطَّلَاقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَأَبِي بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلَافَةِ عُمَرَ، طَلَاقُ الثَّلَاثِ: وَاحِدَةً. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: إِنَّ النَّاسَ قَدِ اسْتَعْجَلُوا فِي أَمْرٍ قَدْ كَانَتْ لَهُمْ فِيهِ أَنَاةٌ ، فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عَلَيْهِمْ! فَأَمْضَاهُ عَلَيْهِمْ . [م١٤٧٢].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: بەردان ل سەردەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبوبەكری و دو سالان ژ حوكمدارییا عومەری سێ بەردان ب بەردانەكێ بوو، ئینا عومەرێ كوڕێ خەتتابی گۆت: خەلكی لەز ل تشتەكێ كر وان دەرفەت تێدا هەبوو[2]، ئەگەر مە سێ ل سەر حسێبكربان و ل سەر وان حسێب كرن.

٢٤٥٦ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: طَلَّقَ رُكَانَةُ امْرَأَتَهُ ثَلاثاً فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ، فَحَزِنَ عَلَيْهَا حُزْناً شَدِيداً، فَسأَلَهُ رَسُولُ الله (ﷺ): (**كَيْفَ طَلَّقْتَهَا؟**)، قَالَ: طَلَّقْتُهَا ثَلاَثاً، فَقَالَ: (**فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ؟**) ، قَالَ:

---

(١) ئانكو: چاوا ناهێتە هەژمارتن و ئەگەر ئەز نەشێم بزڤرینم یان من ساویلكی كربیت ما ئەڤە دێ بیتە هێجەت تەلاق نەهێتە هەژمارتن.

(٢) ئانكو: ئەگەر وان ئێك جار ئێك جار بەردابان دا دەرفەتەكا باش دەنە خۆ ئەو بریارا دورست بدەن بەردەن یان پەشێمان ببن و نەبەردەن.

نَعَمْ، قَالَ: (**فَإِنَّمَا تِلْكَ وَاحِدَةٌ فَأَرْجِعْهَا إِنْ شِئْتَ**)، فَرَاجَعَهَا، فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَرَى أَنَّمَا الطَّلاَقُ عِنْدَ كُلِّ طُهْرٍ، فَتِلْكَ السُّنَّةُ التي كَانَ عَلَيْهَا النَّاسُ، وَالَّتِي أَمَرَ الله لَهَا ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾. [هق٧/٣٣٧].

* وَهَذَا الإِسْنَادُ لاَ تَقُومُ بِهِ الْحُجَّةُ، مَعَ ثَمَانِيَةٍ رَوَوْا عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فُتْيَاهُ بِخِلاَفِ ذَلِكَ.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: روكانەیی د ئێك روینشتندا سێ جاران ژنا خۆ بەردا، ئینا ب خەم كەفت خەمەكا دژوار، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پرسیار ژێ كر: (چاوا تە بەردا). گۆت:** سێ جاران، ئینا گۆت: **(و د ئێك دیواندا) گۆت: بەلێ، گۆت: (ب راستی ئەو تنێ ئێك بەردانە، بزڤرینە ئەگەر تە بڤێت) ئینا زڤراند، و ئیبن عەباسی ددیت ئەو بەردان دكەڤیت و دچیت ئەوە یا ل دەستپێكا هەر پاقژییەكێ بیت، و ئەڤەیە بەردانا دورست و ل دویڤ سوننەتێ ئەوا خەلك ل سەر و ئەوا خودێ فەرمان پێ كری** ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[1].

**و ب ڤێ رێكێ بەلگە پێ دورست نابیت و هەشت كەسان فەتوا بەروڤاژی ڤێ ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ڤەگێرایە.**

## ٦ ـ باب: لا تحل المطلقة ثلاثاً حتى تنكح غيره.

## بابەتێ: ئەوا سێ جاران هاتییە بەردان بۆ زەلامێ خۆ دورست نابیت هەتا شوی ب ئێكێ دی نەكەت.

٢٤٥٧ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رِفاعَةَ الْقُرَظِيَّ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَبَتَّ طَلاَقَهَا، فَتَزَوَّجَهَا بَعْدَهُ عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ الزُّبَيْرِ، فَجاءَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّها كانَتْ عِنْدَ رِفاعَةَ فَطَلَّقَهَا آخِرَ ثَلاَثِ تَطْلِيقَاتٍ، فَتَزَوَّجَهَا بَعْدَهُ عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ الزَّبِيرِ، وَإِنَّهُ وَاللهِ ما مَعَهُ يَا رَسُولَ الله إِلاَّ مِثْلُ هذِهِ الْهُدْبَةِ . لِهُدْبَةٍ أَخَذَتْهَا مِنْ جِلْبَابِهَا .! قالَ: وَأَبُو بَكْرٍ جالِسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَابْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ جالِسٌ بِبَابِ الحُجْرَةِ لِيُؤْذَنَ لَهُ، فَطَفِقَ خالِدٌ يُنادِي أَبَا بَكْرٍ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَلاَ تَزْجُرُ هذِهِ عَمَّا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)؟! وَما يَزِيدُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى التَّبَسُّمِ، ثُمَّ قالَ: (**لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفاعَةَ؟! لاَ، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ ، وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ**) . [خ٦٠٨٤ (٢٦٣٩)/ م١٤٣٣].

(١) نانكو: ژنان دەستپێكا ژڤانا وان و د پاقژییا واندا بەردەن.

ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: ریفاعەییێ قەرەزی ژنا خۆ ب سێ تەلاقان بەردابوو، ئینا پشتی وی عەبدولرەحمانێ كوڕێ زوبەیری مارە كر، ئینا هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو ل دەڤ ریفاعەییی بوو و ب سێ تەلاقان ئەو بەردا و عەبدولرەحمانێ كوڕێ زوبەیری پشتی وی ئەو مارە كر، و ئەز ب خودێ كەمە چو ل دەڤ وی نینە ئەی پێغەمبەرێ خودێ وەكی ڤێ لفكێ نەبیت، لفكەك ژ جلكێ خۆ گرت! گۆت: و ئەبوبەكر ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ روینشتی بوو، و كوڕێ سەعیدێ كوڕێ عاسی ل بەر دەرگەهی یێ روینشتی بوو دا دەستویری بۆ بهێتە دان، ئینا خالدی دەستهاڤێتێ گازی ئەبوبەكری كر، ئەی ئەبابەكر ئەرێ تو وێ پاشڤەنابەی ژ وێ ئەوا ئەو ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئاشكەرا دكەت؟! و ژ گرنژینێ پێڤەتر ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زێدە نەدبوو، پاشی گۆت: **(بەلكی تە دڤێت بزڤرییە ریفاعەیی؟! نەخێر هەتا تام دكەیە شرینیا وی و ئەو تام دكەتە شرینیا تە).**

٢٤٥٨ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): فِي الرَّجُلِ تَكُونُ لَهُ الْمَرْأَةُ يُطَلِّقُهَا، ثُمَّ يَتَزَوَّجُهَا رَجُلٌ آخَرُ، فَيُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَتَرْجِعَ إِلَى زَوْجِهَا الْأَوَّلِ؟ قَالَ: **(لاَ، حَتَّى تَذُوقَ الْعُسَيْلَةَ)**.[ن٣٤١٤/ جه١٩٣٣].

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) د راستا وی زەلامیدا یێ ژنا خۆ ب سێ تەلاقان بەرددەت و پاشی زەلامەكێ دی مارە بكەت، و بەری بچیتە دەڤ بەردەت و ئەو بزڤریتە زەلامێ خۆ یێ ئێكێ؟ گۆت: **(نەدورستە هەتا تام دكەتە شرینییێ)**[1].

(١) ئانكو: هەتا یێ دووێ ب دورستی بچیتە نڤینا وێ.

## ٧ ـ باب: الطلاق في إغلاق.

## بابەتێ: بەردان د تورەبوونا عەقل تێدا دائێخستی[1].

٢٤٥٩ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (لاَ طَلاَقَ، وَلاَ عَتَاقَ فِي غِلاَقٍ) .[د٢١٩٣/ جه٢٠٤٦]

- ولفظ ابن ماجه: (لاَ طَلاَقَ، وَلاَ عَتَاقَ فِي إِغْلاَقٍ).

* حسن.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (نە بەردان نە ئازاكرن د غیلاقێدا نینە)[2].**

- **و دبێژەیا ئیبن ماجەیدا: (نە بەردان نە ئازاكرن د غیلاقێدا نینە).**

## ٨ ـ باب: طلاق المريض والمكره والسكران والهازل.

## بابەتێ: بەردانا نەساخی و خورتیلێكری و ترانەكەری.

٢٤٦٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (ثَلاَثٌ جَدُّهُنَّ جَدٌّ، وَهَزْلُهُنَّ جَدٌّ: النِّكَاحُ، وَالطَّلاَقُ، وَالرَّجْعَةُ) . [د٢١٩٤/ ت١١٨٤/ جه٢٠٣٩].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سێیان رژداتییا وان راستییە و ترانا وان ژی راستییە: مارەكرن و بەردان و زڤراندنەڤە)[3].**

٢٤٦١ – عَنْ مَالِك: أَنَّهُ سَمِعَ رَبِيعَةَ بْنَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: بَلَغَنِي أَنَّ امْرَأَةَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ سَأَلَتْهُ أَنْ يُطَلِّقَهَا، فَقَالَ: إِذَا حِضْتِ ثُمَّ طَهُرْتِ، فَآذِنِينِي. فَلَمْ تَحِضْ حَتَّى مَرِضَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، فَلَمَّا طَهُرَتْ آذَنَتْهُ، فَطَلَّقَهَا الْبَتَّةَ، أَوْ تَطْلِيقَةً لَمْ يَكُنْ بَقِيَ لَهُ عَلَيْهَا مِنَ الطَّلاَقِ غَيْرُهَا، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ يَوْمَئِذٍ مَرِيضٌ، فَوَرَّثَهَا عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ مِنْهُ بَعْدَ انْقِضَاءِ عِدَّتِهَا. [ط١٢٠٩].

* حديث صحيح.

---

(١) زانا د رامانا ئیغلاقێدا د ژێك جودانە: هندەك دبێژن: خورتیلێكرنە، و هندەك دبێژن: دیناتییە، و هندەك دبێژن: تۆرەبوونا زێدە دژوارە یا وەل مرۆڤی دكەت نەزانیت چ گۆت و مەبەستا بەردانێ نەی، و بۆچۆنا دورست ئیغلاق ژ ڤان هەمیان دگریت ئەگەر مەبەستێ ب دائێخیت و نەهێلیت.

(٢) ئانكو: بەردان بنەجهـ نابیت و ناهێنە ژێكڤەكرن و ئازاكرنا بەندەیی دیسا بنەجهـ نابیت د كراسێ ئیغلاقێدا، ئەو كراسێ ژ بەر ئەگەرێ دیناتییێ یان خورتییاتییێ یان تۆرەبوونا دژوار پەردە كەفتییە بەر مەبەستێ.

(٣) ئانكو: ئەڤە هەرسێ رژدیاتی و ترانا وی ئێكە و فەرمان ل سەر دهێتە ئاڤاكرن مارەكرن و بەردان و زڤراندنا ژنێ د بەردانا زڤراندن تێدا.

**ژ مالكی (ﷺ) وی گوه ل رەبیعەیێ كوڕێ ئەبی عەبدولرەحمانی بوو دگۆت: گەهشتە من ژنەكا عەبدولرەحمانێ كوڕێ عەوفی ژێ خواست وێ بەردەت، ئینا گۆت: ئەگەر تو بێنڤێژ بووی پاشی پاقژ بووی من ئاگەهدار بكە، و ئەو بێنڤێژ نەبوو هەتا عەبدولرەحمانێ كوڕێ عەوفی نەساخ بووی، ڤێجا دەمێ پاقژ بووی ئەو ئاگەهدار كر، ئینا ب سێ تەلاقان بەردا، یان ب تەلاقەكێ و وی چو تەلاقێت دی ل سەر وێ نەبوون، و عەبدولرەحمانێ كوڕێ عەوفی وێ رۆژێ یێ نەساخ بوو، ئینا عوسمانێ كوڕێ عەفانی پشتی ژڤانێت وێ میرات ژ وی بۆ ئێخست.**

٢٤٦٢ – عَنْ ثَابِتِ بْنِ الْأَحْنَفِ: أَنَّهُ تَزَوَّجَ أُمَّ وَلَدٍ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: فَدَعَانِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ فَجِئْتُهُ، فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَإِذَا سِيَاطٌ مَوْضُوعَةٌ، وَإِذَا قَيْدَانِ مِنْ حَدِيدٍ، وَعَبْدَانِ لَهُ قَدْ أَجْلَسَهُمَا، فَقَالَ: طَلِّقْهَا؛ وَإِلاَّ وَالَّذِي يُحْلَفُ بِهِ فَعَلْتُ بِكَ كَذَا وَكَذَا، قَالَ فَقُلْتُ: هِيَ الطَّلاَقُ أَلْفاً.

قَالَ: فَخَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهِ، فَأَدْرَكْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ بِطَرِيقِ مَكَّةَ، فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي كَانَ مِنْ شَأْنِي، فَتَغَيَّظَ عَبْدُ اللهِ وَقَالَ: لَيْسَ ذَلِكَ بِطَلاَقٍ، وَإِنَّهَا لَمْ تَحْرُمْ عَلَيْكَ، فَارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ. قَالَ: فَلَمْ تُقْرِرْنِي نَفْسِي حَتَّى أَتَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ـ وَهُوَ يَوْمَئِذٍ بِمَكَّةَ أَمِيرٌ عَلَيْهَا ـ فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي كَانَ مِنْ شَأْنِي، وَبِالَّذِي قَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، قَالَ: فَقَالَ لِي عَبْدُ اللهِ بْنُ الزُّبَيْرِ: لَمْ تَحْرُمْ عَلَيْكَ، فَارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ، وَكَتَبَ إِلَى جَابِرِ بْنِ الْأَسْوَدِ الزُّهْرِيِّ ـ وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ ـ، يَأْمُرُهُ أَنْ يُعَاقِبَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَأَنْ يُخَلِّيَ بَيْنِي وَبَيْنَ أَهْلِي. قَالَ: فَقَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَجَهَّزَتْ صَفِيَّةُ امْرَأَةُ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ امْرَأَتِي حَتَّى أَدْخَلَتْهَا عَلَيَّ بِعِلْمِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، ثُمَّ دَعَوْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ يَوْمَ عُرْسِي لِوَلِيمَتِي، فَجَاءَنِي.[ط١٢٤٥].

**ژ سابتێ كوڕێ ئەحنەفی (ﷺ) وی دایكا زاڕۆكەكێ عەبدولرەحمانێ كوڕێ زەیدی كوڕێ خەتتابی مارە كربوو، گۆت: عەبدوللایێ كوڕێ عەبدولرەحمانێ كوڕێ زەیدێ كوڕێ خەتتابی گازی من كر و ئەز هاتم چۆمە دەڤ، من دیت قامچی و دو زنجیرێت ئاسنی د دانینە و دو بەندەیێت وی یێت ئینانیە وێرێ د روینشتینە، ئینا گۆت: بەردە یان ئەز ب وی كەمە یێ سویند پێ دهێتە خوارن، ئەز دێ هۆ ل تە كەم و هۆ ل تە كەم و هۆ ل تە كەم، گۆت: من گۆت: ئەو هزار جار یا بەردایی بیت.**

**گۆت: ئەز ژ دەڤ وی دەركەفتم و د رێكا مەكەهێدا گەهشتمە عەبدوللایێ كورێ عومەری و من ئەوا د گەل من چێ بووی بۆ گۆت، عەبدوللا تێك چۆ و گۆت: ئەو نەبەردانە و ژنا تە ل سەر تە حەرام نەبوویە، و بزڤرەڤە ژنا خۆ، دلێ من رەحەت نەبوو هەتا ئەز هاتیمە دەڤ عەبدوللایێ كورێ زوبەیری و ئەو هینگێ ئەمیرێ مەكەهێ بوو، و ئەوا د گەل من چێ بووی من بۆ وی گۆت، و ئەوا عەبدوللایێ كورێ عومەری ژی گۆتییە من، گۆت: عەبدوللایێ كورێ زوبەیری گۆتە من: ل سەر تە حەرام نەبوویە، و بزرەڤە ژنا خۆ، و بۆ جابرێ كورێ ئەسوەدێ زوهری نڤیسی و ئەو ئەمیرێ مەدینەیێ بوو و فەرمانا وی كر ئەو عەبدوللایێ كورێ عەبدولرەحمانی سزا بدەت و رێكێ د ناڤبەرا من و ژنا مندا ڤەكەت، گۆت: و ئەز هاتمە مەدینەیێ و سەفییا هەڤژینا عەبدوللایێ كورێ عومەری هەڤژینا من بۆ من كار كر هەتا ئینایە دەڤ من و ب ئاگەهدارییا عەبدوللایێ كورێ عومەری، پاشی من عەبدوللایێ كورێ عومەری رۆژا دەواتا خۆ داخوازكرە خوارنا دەواتێ و ئەو ژی هاتە دەڤ من.**

٢٤٦٣ – عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيَّبِ وَسُلَيْمَانَ بْنَ يَسَارٍ سُئِلاَ عَنْ طَلاَقِ السَّكْرَانِ؟ فَقَالاَ: إِذَا طَلَّقَ السَّكْرَانُ جَازَ طَلاَقُهُ، وَإِنْ قَتَلَ قُتِلَ بِهِ. [ط١٢٤٩].

**ژ مالكی (رحمه الله) گەهشتییە وی: سەعدێ كورێ موسەییەبی و سولەیمانێ كورێ یەساری پرسیارا بەردانا سەرخۆشی ژ وان هاتە كرن؟ گۆتن: ئەگەر سەرخۆشی ژنا خۆ بەردا بەردانا وی دكەڤیت و ئەگەر كوشتن كر دێ پێ دهێتە كوشتن.**

### ٩ ـ باب: طلاق المعتوه.

### بابەتێ: بەردانا ساویلكەی.

٢٤٦٤ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(كُلُّ طَلاَقٍ جَائِزٌ؛ إِلاَّ طَلاَقَ الْمَعْتُوهِ الْمَغْلُوبِ عَلَى عَقْلِهِ)** . [ت١١٩١].

* ضعيف جدا.

* صحيح موقوف على أبي هريرة[١].

(١) ئەڤە د چاپا نێكێدا نینە، و د مالپەرێ شێخ سالحیدا هاتییە، و رامان ئەوە ئەو گۆتن راوەستیایی یە ل سەر ئەبو هورەیرە یا دورستە.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەمی بەردان د دورستن بەردانا ساویلکەیێ عەقل ژ دەستدایی نەبیت).**

## ١٠ ـ باب: في كنايات الطلاق.

## بابەتێ: پەیڤێت نەئاشكەرا د بەردانێدا[1].

٢٤٦٥ - عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ لَهُ: الْبَتَّةُ مَا يَقُولُ النَّاسُ فِيهَا؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقُلْتُ لَهُ: كَانَ أَبَانُ بْنُ عُثْمَانَ يَجْعَلُهَا وَاحِدَةً، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: لَوْ كَانَ الطَّلاَقُ أَلْفاً مَا أَبْقَتِ الْبَتَّةُ مِنْهَا شَيْئاً، مَنْ قَالَ: الْبَتَّةَ؛ فَقَدْ رَمَى الْغَايَةَ الْقُصْوَى. [ط١١٧٠].

**ژ ئەبی بەكرێ كورێ حەزمی (ﷺ) گۆت: عومەرێ كورێ عەبدولعەزیزی گۆتە وی: بەردانا ب هەمی بەردانان (بەردانا زڤرین تێدا نە) خەلك بۆ چ دبێژن؟ ئەبوبەكری گۆت: من گۆتە وی: ئەببانێ كورێ عوسمانی ئەو ئێك دهەژمارت، ئینا عومەرێ كورێ عەبدولعەزیزی گۆت: ئەگەر بەردان هزار ژی بن، ئەڤە چو ژێ ناهێلیت، هەر كەسێ بێژیت ب هەمی بەردانا ئەوی دویماهی بەردان بەردا.**

٢٤٦٦ - عَنِ ابْنِ شِهَابٍ: أَنَّ مَرْوَانَ بْنَ الْحَكَمِ كَانَ يَقْضِي فِي الَّذِي يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ: أَنَّهَا ثَلاَثُ تَطْلِيقَاتٍ. [ط١١٧١].

**ژ ئیبن شیهابی (ﷺ) گۆت: مەروانێ كورێ حەكەمی فەرمان د ویدا یێ ژنا خۆ ب گۆتنا هەمی بەردانان بەردەت كر: ئەو سێ بەردان دهەژمارتن.**

٢٤٦٧ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَقُولُ فِي الْخَلِيَّةِ وَالْبَرِيَّةِ: إِنَّهَا ثَلاَثُ تَطْلِيقَاتٍ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا. [ط١١٧٤].

* إسناده صحيح.

**ژ نافعی (ﷺ) گۆت: عەبدوللایێ كورێ عومەری د (الخلیة والبریة)[2]دا دگۆت: ئەو سێ تەلاقن هەر ئێك ژ وانان.**

---

(١) بەردانا كنانی بەردانا نەئاشكەرایە ئەوا ب وان پەیڤان بیت پێت رامانا بەردانێ ددەن و رمانا نەبەردانێ ژی ددەن، وەكی بێژیت: هەرە مالا بابێ خۆ ئەم ب كێر ئێكدو ناهێین، ڤی رەنگێ بەردانێ پێدڤییە پرسیارا ئنیەتا زەلامی بهێتە كرن، كا مەراما وی چییە، بەردانە یان نە؟

(٢) دو پەیڤێت بەردانێنە: یا ئێكێ بێژتە ژنا خۆ تو هێلایی، و یا دووێ بێژیتێ تو ژ من یا بەری و ئەز ژ تە یێ بەریمە.

## ١١ . باب: الطلاق المعلق بشرط.

## بابەتێ: بەردانا ب مەرجەكێڤە هەلاویستی.

٢٤٦٨ – عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: فِي رَجُلٍ قَالَ لِامْرَأَتِهِ: إِنْ فَعَلَتْ كَذَا وَكَذَا، فَهِيَ طَالِقٌ فَتَفْعَلُهُ، قَالَ: هِيَ وَاحِدَةٌ، وَهُوَ أَحَقُّ بِهَا. [هق٧/٣٥٦].

**ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: د راستا زەلامەكیدا بێژیتە ژنا خۆ ئەگەر تە ئەڤە و ئەڤە كر تو یا بەردایی، ئەو یا بەردایە ئەگەر ئەو تشت كر، گۆت: ئەو ئێك بەردانە، و ئەو هەژیترە وێ بزڤرینیت.**

٢٤٦٩ – عَنْ إِبْرَاهِيمَ: فِي رَجُلٍ قَالَ لِامْرَأَتِهِ: هِيَ طَالِقٌ إِلَى سَنَةٍ، قَالَ: هِيَ امْرَأَتُهُ يَسْتَمْتِعُ مِنْهَا إِلَى سَنَةٍ.[هق٧/٣٥٦].

**ژ ئیبراهیمی (رحمه الله) د راستا زەلامەكیدا بێژیتە ژنا خۆ هەتا سالەكێ تو یا بەردایی، گۆت: ئەو ژنا وییە و دێ خۆشییێ پێ بەت هەتا سالەكێ.**

٢٤٧٠ – عَنِ الشَّعْبِي فِي رَجُلٍ قَالَ لِامْرَأَتِهِ: أَنْتِ طَالِقٌ إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ، قَالَ: هِيَ امْرَأَتُهُ يَوْمَ طَلَّقَهَا حَتَّى يَجِيءَ رَمَضَانُ. [هق٧/٣٥٦].

**ژ شەعبی (رحمه الله) د راستا زەلامەكیدا بێژیتە ژنا خۆ تو یا بەردایی ئەگەر رەمەزان هات، گۆت: ئەو ژنا وییە ژ رۆژا بەردایی هەتا رەمەزان دهێت.**

## ١٢ . باب: الطلاق قبل النكاح.

## بابەتێ: بەردانێ بەری مارەكرنێ.

٢٤٧١ – عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ طَلاَقَ قَبْلَ نِكَاحٍ، وَلاَ عِتْقَ قَبْلَ مِلْكٍ)** .[جه٢٠٤٨].

* حسن صحيح.

**ژ میسوەرێ كورێ مەخرەمەیی ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بەری مارەكرنێ بەردان نینە و بەری خودانبوونێ (ملكدارییێ) ئازاكرنا بەندەی نینە).**

٢٤٧٢ – عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي عَيَّاشٍ الْأَنْصَارِيِّ: أَنَّهُ كَانَ جَالِساً مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ وَعَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: فَجَاءَهُمَا مُحَمَّدُ بْنُ إِيَاسِ بْنِ الْبُكَيْرِ فَقَالَ: إِنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثاً قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَمَاذَا تَرَيَانِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الزُّبَيْرِ: إِنَّ هَذَا الْأَمْرَ مَا لَنَا فِيهِ قَوْلٌ، فَاذْهَبْ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ فَإِنِّي تَرَكْتُهُمَا عِنْدَ عَائِشَةَ، فَسَلْهُمَا، ثُمَّ ائْتِنَا فَأَخْبِرْنَا. فَذَهَبَ فَسَأَلَهُمَا،

فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ لِأَبِي هُرَيْرَةَ: أَفْتِهِ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، فَقَدْ جَاءَتْكَ مُعْضِلَةٌ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: الْوَاحِدَةُ تُبِينُهَا، وَالثَّلاَثَةُ تُحَرِّمُهَا حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ.

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ مِثْلَ ذَلِكَ. [ط١٢٠٦].

* حديث صحيح.

**ژ موعاوییەیێ کورێ عەیاشێ ئەنساری (ﷺ) ئەو ل دەڤ عەبدوللایێ کورێ زوبەیری و عاسمێ کورێ عومەرێ کورێ خەتتابی یێ روینشتی بوو، گۆت: موحەممەدێ کورێ ئیاسێ کورێ بوکەیری هاتە دەڤ وان و گۆت: زەلامەکی ژ خەلکێ دەشتێ ژنا خۆ ب سێ تەلاقان بەردا بەری بچیتە نڤینا وێ، هوین چ دبینن؟ ئینا عەبدوللایێ کورێ زوبەیری گۆت: ڤی کاری مە چو گۆتن تێدا نینە، هەرە دەڤ عەبدوللایێ کورێ عەباسی و ئەبو هورەیرە من ئەو ییٚت ل دەڤ عائیشایێ هێلاین پرسیارێ ژ وان بکە، و پاشی وەرە دەڤ مە بۆ مە بێژە، ئەز چۆم من پرسیارا وان کر، ئینا ئیبن عەباسی گۆتە ئەبو هورەیرەیی بەرسڤا وی بدە ب راستی پرسەکا ب زەحمەت بۆ تە هات، ئینا ئەبو هورەیرەیی گۆت: ئێك وێ ژ وی جودا دکەت، و سێ وێ ل سەر حەرام دکەن هەتا ئەو شوی ب زەلامەکێ دی دکەت.**

**و ئیبن عەباس ژی هەر وەکی وی گۆت.**

## ١٣ ـ باب: الطلاق لمن أخذ بالساق.

**بابەتێ: بەردان د دەستێ زەلامیدایە یێ بۆ وی دورست یێ وێ بگریت.**

٢٤٧٣ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ سَيِّدِي زَوَّجَنِي أَمَتَهُ، وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنِي وَبَيْنَهَا، قَالَ: فَصَعِدَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْمِنْبَرَ فَقَالَ: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ، مَا بَالُ أَحَدِكُمْ يُزَوِّجُ عَبْدَهُ أَمَتَهُ، ثُمَّ يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَهُمَا؟! إِنَّمَا الطَّلاَقُ لِمَنْ أَخَذَ بِالسَّاقِ)** .[جه٢٠٨١].

* حسن.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، خودانێ من بەندەیا خۆ ل من مارە کر و وی دڤێت ئەو من و وێ ژێکڤەکەت، گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب سەر مینبەرێ کەفت و گۆت: (گەلی خەلکی هەوە خێرە ئێك ژ هەوە بەندەیا خۆ ل بەندەیێ خۆ مارە دکەت، و**

**پاشی دڤێت وانا ژێكڤه بكەت؟! ب راستی بەردان بەس بۆ زەلامییە ئەوێ بۆ دورست پێ وێ بگریت).**

## ١٤ ـ باب: من جعل أمر المرأة بيدها.

## بابەتێ: یێ فەرمانا ژنێ بكەتە ددەستێ وێدا.

٢٤٧٤ – عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي جَعَلْتُ أَمْرَ امْرَأَتِي فِي يَدِهَا، فَطَلَّقَتْ نَفْسَهَا، فَمَاذَا تَرَى؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: أُرَاهُ كَمَا قَالَتْ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لاَ تَفْعَلْ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ! فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَنَا أَفْعَلُ؟ أَنْتَ فَعَلْتَهُ. [ط١١٧٧].

* اسناده منقطع.

**ژ مالكی (رحمه الله) گەهشتییە وی: زەلامەك هاتە دەڤ عەبدوللایێ كورێ عومەری، ئینا گۆت: ئەی بابێ عەبدولرەحمانی من بەردانا ژنا خۆ كرە د دەستێ وێدا، ئینا وێ خۆ بەردا، تو چ دبینی؟! ئینا عەبدوللایێ كورێ عومەری گۆت: ئەز وەسا دبینم وەكی گۆتی، ئینا زەلامی گۆت: ئەی بابێ عەبدولرەحمانی وێ نەكە! ئینا گۆت ئیبن عومەری گۆت: ئەز بكەم؟ تە وەكر.**

٢٤٧٥ – عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ: أَنَّهُ كَانَ جَالِساً عِنْدَ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، فَأَتَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عَتِيقٍ وَعَيْنَاهُ تَدْمَعَانِ، فَقَالَ لَهُ زَيْدٌ: مَا شَأْنُكَ؟ فَقَالَ: مَلَّكْتُ امْرَأَتِي أَمْرَهَا، فَفَارَقَتْنِي، فَقَالَ لَهُ زَيْدٌ: مَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: الْقَدَرُ، فَقَالَ زَيْدٌ: ارْتَجِعْهَا إِنْ شِئْتَ، فَإِنَّمَا هِيَ وَاحِدَةٌ، وَأَنْتَ أَمْلَكُ بِهَا. [ط١١٧٩].

* إسناده صحيح.

**ژ خاریجەیێ كورێ زەیدێ كورێ سابتی (خودێ ژ وان رازی بیت) ئەو ل دەڤ زەیدێ كورێ سابتی یێ روینشتی بوو، ئینا موحەممەدێ كورێ ئەبی عەتیقی هاتە دەڤ و رۆندك ژ چاڤێت وی دهاتن، ئینا زەیدی گۆتێ: تە خێرە؟ گۆت: من بەردانا ژنا خۆ كرە د دەستێ وێدا ئینا ژ من جودا بوو، ئینا زەیدی گۆتێ: ما كێ تو پالدایی وەبكەی؟ گۆت: قەدەرێ، ئینا زەیدی گۆت: بزڤرینەڤە ئەگەر تە بڤێت ئەو ئێك بەردانە و تو ژ غەیری خۆ پێ مافدارتری.**

## ١٥ ـ باب: ليس التخيير طلاقاً.

## بابەتێ: هەلبژارتن نەبەردانە.

٢٤٧٦ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنه قَالَتْ: خَيَّرَنَا رسول الله (ﷺ)، فَاخْتَرْنَا اللهَ وَرَسُولَهُ، فَلَمْ يَعُدَّ ذلِكَ عَلَيْنَا شَيْئاً. [خ٥٢٦٢/ م١٤٧٧].

- وفي رواية لهما: عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عائِشَةَ عَنِ الْخِيَرَةِ؟ فَقَالَتْ: خَيَّرَنَا النَّبِيُّ (ﷺ)، أَفَكَانَ طَلاَقاً؟[خ٥٢٦٣].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەلبژارتن دا مە، ئینا مە خودێ و پێغەمبەرێ وی هەلبژارتن و ئەڤە ب چو ل سەر مە نەهەژمارت.**

- **و د ڤەگێرەكا واندا: ژ مەسروقی گۆت: من پرسیارا هەلبژارتنێ ژ عائیشایێ كر؟ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەلبژارتن دا مە ما خۆنە ئەو بەردانە؟!**

٢٤٧٧ - عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ: أَنَّهَا خَطَبَتْ عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ قُرَيْبَةَ بِنْتَ أَبِي أُمَيَّةَ، فَزَوَّجُوهُ، ثُمَّ إِنَّهُمْ عَتَبُوا عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَقَالُوا: مَا زَوَّجْنَا إِلاَّ عَائِشَةَ، فَأَرْسَلَتْ عَائِشَةُ إِلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَجَعَلَ أَمْرَ قُرَيْبَةَ بِيَدِهَا، فَاخْتَارَتْ زَوْجَهَا، فَلَمْ يَكُنْ ذَلِكَ طَلاَقاً. [ط١١٨١].

* إسناده صحيح.

[وانظر: ٣٦٩٧] .

**ژ عائیشایێ دایكا باوەریداران (رضي الله عنها) وێ قورەیبەیا كچا ئەبی ئومەییە بۆ عەبدولرەحمانێ كورێ ئەبی بەكری خواست، پاشی وان گازندە ژ عەبدولرەحمانی كرن و گۆتن: و مە نەدایە تە ژ بەر عائیشایێ نەبیت، ئینا عائیشایێ ڤرێكرە دویڤ عەبدولرەحمانیرا و ئەو ئاخفتن بۆ گۆتن، ئینا وی بەردانا قورەیبایێ كرە د دەستێ وێدا، ئینا زەلامێ خۆ هەلبژارت و ئەڤە بەردان نەبوو.**

## ١٦ ـ باب: من خبب امرأة.

## بابەتێ: یێ ژنەكێ خراب بكەت و سەردا ببەت.

٢٤٧٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ خَبَّبَ زَوْجَةَ امْرِئٍ، أَوْ مَمْلُوكَهُ؛ فَلَيْسَ مِنَّا)** . [د٢١٧٥/ ٥١٧٠].

* صحيح.

وفي رواية: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ خَبَّبَ امْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا، أَوْ عَبْداً عَلَى سَيِّدِهِ) .

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: هەر کەسێ ژنا زەلامەکی سەردا ببەت و خراب بکەت، یان کۆلەیێ وی ئەو نە ژ مەیە.**

**و د ڤەگێرەکێدا: نە ژ مەیە یێ ژنەکێ ل سەر زەلامێ وێ سەردا ببەت و خراب بکەت، یان کۆلەیی ل سەر سەروەرێ وی.**

## ١٧ ـ باب: في الرجعة والإشهاد عليها.

## بابەتێ: زڤراندنا ژنێ و وەرگرتنا شاهدان ل سەر.

٢٤٧٩ – عَنْ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) طَلَّقَ حَفْصَةَ، ثُمَّ رَاجَعَهَا. [د٢٢٨٣/ن٣٥٦٢/جه٢٠١٦/مي٢٣١٠].

* صحيح.

**ژ عومەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەفسا بەردا و پاشی زڤراندڤە.**

٢٤٨٠ – عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّه سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ، ثُمَّ يَقَعُ بِهَا، وَلَمْ يُشْهِدْ عَلَى طَلاَقِهَا، وَلاَ عَلَى رَجْعَتِهَا؟ فَقَالَ: طَلَّقْتَ لِغَيْرِ سُنَّةٍ، وَرَاجَعْتَ لِغَيْرِ سُنَّةٍ، أَشْهِدْ عَلَى طَلاَقِهَا وَعَلَى رَجْعَتِهَا وَلاَ تَعُدْ. [د٢١٨٦/ جه٢٠٢٥].

* صحيح.

**ژ عیمرانێ کورێ (حصین)ی: پرسیار ژ وی هاتە کرن ژ وی زەلامێ ژنا خۆ بەردەت پاشی بچیتە نڤینا وێ و شاهدان نەگریت نە ل سەر بەردانا وێ و نە ل سەر زڤراندنا وێ؟ ئینا گۆت: تە نە ل سەر سوننەتێ بەردایە و نە ل سەر سوننەتێ زڤراندییە، شاهدان ل سەر بەردانا وێ و ل سەر زڤراندنا وێ بگرە و وەنەکەڤە.**

## ١٨ ـ باب: نفقة وسكنى المطلقة ثلاثاً.

## بابەتێ: نەفەقە و ئاکنجیبوونا یا ب سێ تەلاقان هاتییە بەردان.

٢٤٨١ – (م) عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ: أَنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ طَلَّقَهَا الْبَتَّةَ، وَهُوَ غَائِبٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا وَكِيلُهُ بِشَعِيرٍ، فَسَخِطَتْهُ. فَقَالَ: واللهِ! مَا لَكِ عَلَيْنَا مِنْ شَيْءٍ. فَجَاءَتْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: **(لَيْسَ لَكِ عَلَيْهِ نَفَقَةٌ)** ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَعْتَدَّ فِي بَيْتِ أُمِّ شَرِيكٍ، ثُمَّ قَالَ: **(تِلْكَ امْرَأَةٌ يَغْشَاهَا أَصْحَابِي، اعْتَدِّي عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَإِنَّهُ رَجُلٌ أَعْمَى، تَضَعِينَ ثِيَابَكِ، فَإِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي)** ، قَالَتْ: فَلَمَّا حَلَلْتُ ذَكَرْتُ لَهُ: أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ وَأَبَا جَهْمٍ خَطَبَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ

(ﷺ): (أَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَلاَ يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ، وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لاَ مَالَ لَهُ. انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ) ، فَكَرِهْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: (انْكِحِي أُسَامَةَ) ، فَنَكَحْتُهُ، فَجَعَلَ اللهُ فِيهِ خَيْراً، وَاغْتَبَطْتُ. [م١٤٨٠].

- وفي رواية: قَالَتْ: طَلَّقَنِي زَوْجِي ثَلاثاً، فَأَرَدْتُ النُّقْلَةَ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ). فَقَالَ: (انْتَقِلِي إِلَى بَيْتِ ابْنِ عَمِّكِ عَمْرِو بْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ؛ فَاعْتَدِّي عِنْدَهُ) .
- وفي رواية: فقال (ﷺ): (لا نَفَقَةَ لَكِ، ولا سُكْنَى) .
- وفي رواية: قَالَتْ: طَلَّقَنِي بَعْلِي ثَلاَثاً، فَأَذِنَ لِي النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ أَعْتَدَّ فِي أَهْلِي.

ژ فاتیمایا کچا قەیسی (رضي الله عنها) گۆت: بابێ عەمرێ کورێ حەفسی ئەو ب سێ تەلاقان بەردا، و ئەو یێ دیار نەبوو[1]، و ب رێکا بریکارێ خۆ جەهـ بۆ وێ هنارت، ئینا ئەو پێ رازی نەبوو[2]، وی گۆت: ئەز ب خودێ کەمە تە چو ل سەر مە نینە، ئینا هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەڤە بۆ وی گۆت، ئینا گۆت: **(تە نەفەقە ل سەر وی نینە)** و فەرمانا وێ کر ژڤانێت خۆ ل مالا ئوم شەریکێ ببەت، پاشی گۆت: **(ئەو ژنەکە هەڤالێت من دچنە لایێ وێ، ل دەڤ ئیبن ئوم مەکتوم ژڤانێت خۆ ببە، ئەو زەلامەکێ کۆرەیە و تو دشێی جلکێت خۆ ل دەڤ دانی، و ئەگەر ژڤانێت تە ب دویماهی هاتن من ئاگەهدار بکە)**، گۆت: ڤێجا دەمێ ئەز ژ ژڤانان دەرکەفتم من گۆتە وی: ب راستی موعاوییەیێ کورێ ئەبو سوفیان و ئەبو جەهم من دخوازن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هندیکە ئەبو جەهمە دارێ وی هەر یێ ل سەر ملی[3]، و هندیکە موعاوییە هەژارە و وی چو مال نینە، شوی ب ئوسامەیێ کورێ زەیدی بکە)** من نەڤیا، پاشی گۆت: **(شوی ب ئوسامەیی بکە)** من شوی پێ کر و خودێ خێر کرە تێدا و ئەز دلخۆش بووم.

- و د ڤەگێرەکێدا: گۆت: زەلامێ من ب سێ تەلاقان ئەز بەردام و من نەفەقە دڤیا، ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، ئینا گۆت: **(خۆ بگوهێزە مالا کورمامێ خۆ عەمرێ کورێ ئوم مەکتومی و ژڤانێت خۆ ل دەڤ وی ببە)**.
- و د ڤەگێرەکێدا: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(نە تە نەفەقە هەیە و نە ئاکنجیبوون)**.

---

(١) ئانکو: ب رێکا بریکارێ خۆ بەردا و ئەو یێ ئامادە نەبوو.

(٢) چونکی یێ کێم بوو، یان تشتێ هنارتی یێ کێم بهایە.

(٣) ئانکو: ژنان دقوتیت یان ل مالا خۆ ناروینیت، هینگێ ومغەرا دکەت.

**و د ڤەگێرەكێدا: زەلامێ من ئەز ب سێ تەلاقان بەردام، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) دەستویری دا من ئەز ژڤانێت خۆ ل دەڤ مرۆڤێت خۆ ببەم.**

## ١٩ . باب: متعة المطلقة.

## بابەتێ: (میتعا)[1] بەردایێ.

٢٤٨٢ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي هَذِهِ الآيَةِ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ [البقرة: ٢٣٦] قَالَ: هُوَ الرَّجُلُ يَتَزَوَّجُ الْمَرْأَةَ وَلَمْ يُسَمِّ لَهَا صَدَاقاً، ثُمَّ طَلَّقَهَا مِنْ قَبْلِ أَنْ يَنْكِحَهَا، فَأَمَرَ اللهُ تَعَالَى أَنْ يُمَتِّعَهَا عَلَى قَدْرِ يُسْرِهِ وَعُسْرِهِ، فَإِنْ كَانَ مُوسِراً، مَتَّعَهَا بِخَادِمٍ أَوْ نَحْوِ ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَ مُعْسِراً، فَبِثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ أَوْ نَحْوِ ذَلِكَ. [هق٧/٢٤٤].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د ڤێ ئایەتێدا** ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ **گۆت: ئەو زەلامە یێ ژنێ مارە دكەت و مەهرا وێ نەڤەبڕیت پاشی بەری بچیتە نڤینا وێ بەردەت، خودایێ مەزن فەرمان كر، دەست فرەه ل دویڤ دەستفرەهییا خۆ، دەست تەنگ ل دویڤ دەستتەنگییا خۆ، متا و پەرگالەكی (ئانكو: تشتەكی بۆ دلێ وان) بدەتە وان، ئەگەر یێ دەستفرەه بیت خزمەتكارەكێ و وەكی وی بدەتێ وەك میتعە، و ئەگەر یێ دەستەنگ بیت سێ جلك و وكی وان بدەتێ.**

٢٤٨٣ - عَنِ ابْنِ سِيرِينَ: أَنَّ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ رضي الله عنهما: طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ، فَمَتَّعَهَا بِعَشَرَةِ آلاَفِ دِرْهَمٍ، قَالَ فَقَالَتْ: مَتَاعٌ قَلِيلٌ لِحَبِيبٍ أُفَارِقُ، قَالَ: فَبَلَغَهُ ذَلِكَ فَرَاجَعَهَا. [هق٧/٢٤٤].

**ژ ئیبن سیرینی (رحمه الله) گۆت: حەسەنێ كوڕێ عەلی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژنەكا خۆ بەردا، ئینا دەه هزار دەرهەم متا دانێ، گۆت: ئینا وێ گۆت: متایەكێ كێمە بەرامبەر خۆشتڤییەكی ئەز ژێ جودا دبم گۆت: ئەو گەهشتە وی ئینا زڤراندەڤە.**

٢٤٨٤ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لِكُلِّ مُطَلَّقَةٍ مُتْعَةٌ، إِلاَّ الَّتِي تُطَلَّقُ وَقَدْ فُرِضَ لَهَا الصَّدَاقُ، وَلَمْ تُمَسَّ، فَحَسْبُهَا نِصْفُ مَا فُرِضَ لَهَا. [هق٧/٢٥٧].

---

(١) میتعا بەردانێ ئەو مال و جلكن یێت زەلام وەك ڤەرەبوو ددەتە یا وی بەردای تایبەت ئەگەر بەردان ژ لایێ زەلامی بیت وەك دلخۆشكرنەك و دلەدلیدانەك ژ بەر نەخۆشییا بەردانێ.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی دگۆت: بۆ هەر بەردابییەكێ میتعەك هەیە ئەو نەبیت یا بهێت بەردان و مەهرا وێ هاتبیتە ڤەبڕین و نەچۆبیتە نڤینا وێ، بەسی وێیە نیڤا مارا بۆ هاتییە ڤەبڕین.**

## ٢٠ ـ باب: عدة الوفاة.

## بابەتێ: ژڤانێت مرنێ.

٢٤٨٥ - (ق) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ جَالِسٌ عِنْدَهُ، فَقَالَ: أَفْتِنِي فِي امْرَأَةٍ وَلَدَتْ بَعْدَ زَوْجِهَا بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: آخِرُ الأَجَلَيْنِ، قُلْتَ أَنَا: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّۚ﴾ [الطلاق:٤].

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَا مَعَ ابْنِ أَخِي ـ يَعْنِي: أَبَا سَلَمَةَ ـ، فَأَرْسَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ غُلاَمَهُ كُرَيْباً إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ يَسْأَلُهَا، فَقَالَتْ: قُتِلَ زَوْجُ سُبَيْعَةَ الأَسْلَمِيَّةِ وَهِيَ حُبْلَى، فَوَضَعَتْ بَعْدَ مَوْتِهِ بِأَرْبَعِينَ لَيْلَةً، فَخُطِبَتْ، فَأَنْكَحَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وكانَ أَبُو السَّنَابِلِ فِيمَنْ خَطَبَهَا. [خ٤٩٠٩/ م١٤٨٥].

**ژ ئەبی سەلەمەیی (رحمه الله) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ ئیبن عەباسی و ئەبو هورەیرە ل دەڤ وی یێ رونشتی بوو، ئینا گۆت: بەرسڤا شەرعی بدە من د ژ نەكێدا پشتی زەلامێ خۆ ب چل رۆژان زارۆك بوویە؟ ئینا ئیبن عەباسی گۆت: درێژترین ژڤان[1] من گۆت: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّۚ﴾.**

**ئەبو هورەیرە گۆت: ئەز یێ د گەل برازایێ خۆ ـ ئانكو ئەبا سەلەمەیی ـ، ئینا ئیبن عەباسی خزمەتكارێ خۆ كورەیب هنارتە دەڤ ئوم سەلەمەیێ پرسیارێ ژ وێ بكەت، ئینا وێ گۆت: زەلامێ سوبەیعەیا ئەسلەمی هاتە كوشتن و ئەو یا ب حال بوو، و وێ زارۆكێ خۆ پشتی چل شەڤان دانا و هاتە خواستن و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دا شوی و ئەبو سونابل ژ وان بوو یێت خواستی.**

٢٤٨٦ - عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ عَجْرَةَ: أَنَّ الْفُرَيْعَةَ بِنْتَ مَالِكِ بْنِ سِنَانٍ ـ وَهِيَ أُخْتُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ـ أَخْبَرَتْهَا: أَنَّهَا جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) تَسْأَلُهُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهَا فِي بَنِي خُدْرَةَ، فَإِنَّ زَوْجَهَا

---

(١) ئانكو: درێژترین ژڤان دێ خۆ گریت ئەگەر حەمل درێژتر بیت دێ حەمل ژڤانێ وێ بیت و ئەگەر زوی بارێ خۆ دانا دێ چیتە ژڤانێ درێژتر، چار هەیف و دەه رۆژان.

خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْبُدٍ لَهُ أَبَقُوا، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِطَرَفِ الْقَدُومِ لَحِقَهُمْ؛ فَقَتَلُوهُ. فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَنْ أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي، فَإِنِّي لَمْ يَتْرُكْنِي فِي مَسْكَنٍ يَمْلِكُهُ وَلاَ نَفَقَةٍ.

قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(نَعَمْ)** .

قَالَتْ: فَخَرَجْتُ، حَتَّى إِذَا كُنْتُ فِي الْحُجْرَةِ ـ أَوْ فِي الْمَسْجِدِ ـ دَعَانِي ـ أَوْ أَمَرَ بِي، فَدُعِيتُ لَهُ ـ فَقَالَ: **(كَيْفَ قُلْتِ)** ؟ فَرَدَدْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ الَّتِي ذَكَرْتُ مِنْ شَأْنِ زَوْجِي، قَالَتْ: فَقَالَ: **(امْكُثِي فِي بَيْتِكِ، حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ)** . قَالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً.

قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، أَرْسَلَ إِلَيَّ فَسَأَلَنِي عَنْ ذَلِكَ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَاتَّبَعَهُ وَقَضَى بِهِ.

[د٢٣٠٠/ ت١٢٠٤/ ن٣٥٢٨/ جه٢٠٣١/ مي٢٣٣٣]

* صحيح.

**ژ زەینەبا كچا كەعبێ عەجرەیی (رضي الله عنها) گۆت: فورەیعەیا كچا مالكێ كوڕێ سینانی خویشكا ئەبی سەعیدێ خودری بوو، وێ گۆتە وێ: ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ وی داخواز بكەت ئەو بزڤریتە دەڤ مرۆڤێت خۆ ل بابكێ خودرە، چونكی زەلامێ وێ د دویف هندە بەندەیێت خۆڕا دەركەفت بوو، رەڤی بوون، هەتا لاییێ قدوم ئەو گەهشتنێ و كوشت، ئینا من داخواز ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر ئەز بزڤرمە ناڤ مرۆڤێت خۆ، چونكی وی چو خانی نەهێلاینە ئەو خودان بیت و نەفەقە ژی نەهێلایە.**

**وێ گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆن: (بلا).**

**وێ گۆت: ئینا ئەز چۆم هەتا چۆیمە د ژۆرڤە یان د مزگەفتێڤە، گازی من كر یان فەرمان ب من كر ئەز بۆ هاتمە گازیكرن، ئینا گۆت: (تە چ گۆت)؟ من سەرهاتییا خۆ بۆ ڤەگێراڤە ل دۆر زەلامێ خۆ، وێ گۆت: ئینا گۆت: (د مالا خۆدا بمینە هەتا ژڤانێت تە ب دویماهی دهێن) وێ گۆت: من چار هەیڤ و دەھ رۆژ ژڤان تێدا برن.**

**وێ گۆت: ڤێجا دەمێ بوویە خیلافەتا عوسمانی ڤرێكرە دویف منڕا و پرسیارا وێ چەندێ ژ من كر، من بۆ گۆت، ئینا ل دویف ڤێ چۆ و حوكم پێ كر.**

## ٢١ ـ باب: عدة المطلقة.

### بابەتێ: ژڤانێت یا بەردایی.

٢٤٨٧ – عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ بْنِ السَّكَنِ الْأَنْصَارِيَّةِ: أَنَّهَا طُلِّقَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَلَمْ يَكُنْ لِلْمُطَلَّقَةِ عِدَّةٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل حِينَ طُلِّقَتْ أَسْمَاءُ بِالْعِدَّةِ لِلطَّلاَقِ، فَكَانَتْ أَوَّلَ مَنْ أُنْزِلَتْ فِيهَا الْعِدَّةُ لِلْمُطَلَّقَاتِ. [د٢٢٨١].

* حسن.

**ژ ئەسمائا كچا یەزیدێ كورێ سەكەنی یا ئەنساری: ئەو ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە بەردان و هینگێ ژنا بەردایی ژڤان نەبوون، ئینا خودایێ هەر ب هێز و مەزن دەمێ ئەسماء هاتییە بەردان ژڤان بۆ بەردایێ ئینا خوار، ئەو یا ئێكێ بوو دەمێ ژڤانان بۆ بەردایییان د راستا وێدا هاتییە خوار.**

٢٤٨٨ – عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ: أَنَّهُ كَانَتْ عِنْدَهُ أُمُّ كُلْثُومٍ بِنْتُ عُقْبَةَ، فَقَالَتْ لَهُ، وَهِيَ حَامِلٌ: طَيِّبْ نَفْسِي بِتَطْلِيقَةٍ، فَطَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ فَرَجَعَ وَقَدْ وَضَعَتْ، فَقَالَ: مَا لَهَا؟ خَدَعَتْنِي خَدَعَهَا اللهُ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: (**سَبَقَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ، اخْطُبْهَا إِلَى نَفْسِهَا**) . [جه٢٠٢٦].

* صحيح.

**ژ زوبەیرێ كورێ عەوامی (رضي الله عنه) گۆت: ئوم كەلسوما كچا عوقبەیی ل دەڤ وی بوو، ئینا گۆتە وی و ئەو یا ب حال بوو، دلێ من خۆش بكە ب تەلاقەكێ، ئینا ب تەلاقەكێ بەردا، پاشی دەركەفت چۆ نڤێژێ زڤری و وێ بچویك بوو، ئینا گۆت وێ خێرە؟ وێ ئەز خاپاندم خودێ سزایێ خاپاندنا وێ بدەتێ، پاشی هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: (ژڤانێت وێ ب بچویكبوونێ تمام بوون، بۆ خۆ بخوازە).**

٢٤٨٩ – عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ وَسَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ وَأَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ وَابْنِ شِهَابٍ، أَنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا دَخَلَتِ الْمُطَلَّقَةُ فِي الدَّمِ مِنَ الْحَيْضَةِ الثَّالِثَةِ، فَقَدْ بَانَتْ مِنْ زَوْجِهَا، وَلاَ مِيرَاثَ بَيْنَهُمَا، وَلاَ رَجْعَةَ لَهُ عَلَيْهَا. [ط١٢٢٤].

**ژ مالكی (رحمه الله) گەهشتییە وی: ژ قاسمێ كورێ موحەممەدی و سالمێ كورێ عەبدوللایی و ئەبی بەكرێ كورێ عەبدولرەحمانی و سولەیمانێ كورێ یەساری و ئیبن شیهابی، وان دگۆتن: ئەگەر ژنا بەردایی كەفتە د خوین دیتنێدا ژ بێنڤێژییا سێیێ ئەو ژ**

**زەلامێ خۆ خلاس بوو، و میراتگری د ناڤبەرا واندا نینە، و وی زڤراندنا وێ ل سەر وێ نینە.**

## ٢٢ ـ باب: عدة المفقود.

### بابەتێ: ژڤانێت بەرزەبوویی.

٢٤٩٠ – عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ فَقَدَتْ زَوْجَهَا، فَلَمْ تَدْرِ أَيْنَ هُوَ؟ فَإِنَّهَا تَنْتَظِرُ أَرْبَعَ سِنِينَ، ثُمَّ تَعْتَدُّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً، ثُمَّ تَحِلُّ. [ط١٢١٩].

* رجاله ثقات.

**ژ سەعیدێ کورێ موسەییەبی (رحمه الله) گۆت: عومەرێ کورێ خەتتابی گۆت: هەر ژنا زەلامێ خۆ بەرزە کربیت و نەزانیت کا ئەو ل کیڤەیە؟ ئەو دێ چوار سالان خۆ گریت، پاشی چار هەیف و دەه رۆژان ژڤانان بەت پاشی دێ حەلال بیت شوی کەت.**

## ٢٣ ـ باب: خروج المعتدة لحاجتها نهاراً.

### بابەتێ: دەرکەفتنا ژنا د ژڤاناندا ب رۆژ بۆ هەوجەییا خۆ.

٢٤٩١ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: طُلِّقَتْ خَالَتِي، فَأَرَادَتْ أَنْ تَجُدَّ نَخْلَهَا، فَزَجَرَهَا رَجُلٌ أَنْ تَخْرُجَ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: **(بَلى، فَجُدِّي نَخْلَكِ، فَإِنَّكِ عَسَى أَنْ تَصَدَّقِي، أَو تَفْعَلِي مَعْرُوفاً)**. [م١٤٨٣].

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خالەتا من هاتە بەردان، و ڤیا قەسپێت خۆ بچنیت، ئینا زەلامەکی پاشڤە بر کو دەرکەڤیت، هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: (بەلێ هەرە قەسپێت خۆ بچنە دبیت تو بکەیە خێر یان کارەکێ باش بکەی).**

٢٤٩٢ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لاَ تَبِيتُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، وَلاَ الْمَبْتُوتَةُ؛ إِلاَّ فِي بَيْتِهَا. [ط١٢٥٧].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی دگۆت: ئەوا زەلامێ وێ ژێ مری و یا ب سێ تەلاقان هاتییە بەردان ب شەڤ ل چو جهان نامینیت و بنڤیت ل مالا خۆ نەبیت.**

## ٢٤ . باب: الإحداد في عدة الوفاة.

## بابەتێ: بەهیدارییێ د ژڤانا مرنا زەلامیدا.

٢٤٩٣ - (ق) عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَتْ: لَمَّا جاءَ نَعْيُ أَبِي سُفْيَانَ مِنَ الشَّامِ، دَعَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ رضي الله عنها بِصُفْرَةٍ فِي الْيَوْمِ الثَّالِثِ، فَمَسَحَتْ عارِضَيْهَا وَذِرَاعَيْهَا، وَقَالَتْ: إِنِّي كُنْتُ عَنْ هذَا لَغَنِيَّةً، لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بالله وَالْيَوْمِ الآخِرِ، أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا تُحِدُّ عَلَيْهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً)** . [خ١٢٨٠/ م١٤٨٦].

**ژ زەینەبا کچا ئەبی سەلەمە، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ خەبەرێ مرنا ئەبی سوفیانی ل شامێ هاتی، ئوم حەبیبە (﵅) ، داخوازا گولاڤەکێ کر زەراتییا خەلوقێ تێدا بوو[1]، جارییەکێ د خۆ دا، پاشی ژ وێ هندەك ل بن هەردو گەهێت خۆ دا، پاشی گۆت: ب خودێ من دل سەر نینە، بەلێ من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (دورست نینە بۆ ژنەکێ باوەرییێ ب خودێ و رۆژا قیامەتێ بینیت، ئەو تازییێ ل سەر مرییەکی سێ رۆژان زێدەتر راکەت، ل سەر هەڤسەری نەبیت چار هەیڤ و دەه رۆژان).**

٢٤٩٤ - عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا لاَ تَلْبَسُ الْمُعَصْفَرَ مِنَ الثِّيَابِ، وَلاَ الْمُمَشَّقَةَ ، وَلاَ الْحُلِيَّ، وَلاَ تَخْتَضِبُ، وَلاَ تَكْتَحِلُ)** .

ولم يذكر النسائي: الْحُلِيَّ. [د٢٣٠٤/ ٣٥٣٧ن].

* صحيح.

**ژ ئوم سەلەمەیێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەوا زەلامێ وێ لێ مری، نە جلکێ ب زەری رەنگکری و نە جلکێ ب سۆری رەنگکری دکەتە بەر خۆ و نە جەکی دکەتە بەر خۆ و نە خەنایێ د خۆ ددەت و نە چاڤان کل ددەت).**

**و نەسائی بەحسێ کلی نەکرییە.**

---

(١) خەلوق: گیایەکە بۆ بێهنخۆشییێ دهێتە ب کارئینان رەنگێ زەر ددا.

## ٢٥ ـ باب: الحضانة.

## بابەتێ: دایینییێ (خودانکرنا بچویکی).

٢٤٩٥ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ ابْنِي هَذَا كَانَ بَطْنِي لَهُ وِعَاءً، وَثَدْيِي لَهُ سِقَاءً، وَحِجْرِي لَهُ حِوَاءً، وَإِنَّ أَبَاهُ طَلَّقَنِي، وَأَرَادَ أَنْ يَنْتَزِعَهُ مِنِّي، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مَا لَمْ تَنْكِحِي)**. [د٢٢٧٦].

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنەك هات و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، کورێ من ڤی، زکێ من بۆ وی ئامان بوو، چچکێ من بۆ وی ئاڤدانك بوو، و کۆشا من بۆ وی حەوینگەهـ بوو، و بابێ وی ئەز بەردام، و دڤێت ژ من وەرگریت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تو هەژیتری بۆ کورێ خۆ هندی تو شوی نەکەی).**

٢٤٩٦ - عَنْ رَافِعِ بْنِ سِنَانٍ: أَنَّهُ أَسْلَمَ، وَأَبَتِ امْرَأَتُهُ أَنْ تُسْلِمَ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: ابْنَتِي وَهِيَ فَطِيمٌ أَوْ شَبَهُهُ، وَقَالَ رَافِعٌ: ابْنَتِي، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(اقْعُدْ نَاحِيَةً)**، وَقَالَ لَهَا: **(اقْعُدِي نَاحِيَةً)** قَالَ: وَأَقْعَدَ الصَّبِيَّةَ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ قَالَ: **(ادْعُوَاهَا)**، فَمَالَتِ الصَّبِيَّةُ إِلَى أُمِّهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(اللَّهُمَّ اهْدِهَا)** فَمَالَتِ الصَّبِيَّةُ إِلَى أَبِيهَا، فَأَخَذَهَا. [د٢٢٤٤/ ن٣٤٩٥/ جه٢٣٥٢].

* صحيح.

**ژ رافعێ کورێ سینانی (رضي الله عنه) ئەو موسلمان بوو، و ژنا وی نەڤیا موسلمان ببیت، ژنا وی هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: کچا من یا شیرڤەکرییە یان وەکی وێیە و رافعی گۆت: کچا منە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: (ل رەخەکی روینە خوارێ) و گۆتە وێ: (ل رەخەکی روینە خوارێ)، گۆت: و کچك دانا د ناڤبەرا واندا، پاشی گۆت: (هەردو گازی بکەنێ) کچکێ بەرێ خۆ دا دایکا خۆ، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەی خودا راستەرێ بکە) ئینا بەرێ خۆ دا بابێ خۆ و دەستێ وێ گرت.**

## ٢٦ ـ باب: الأجل للعنين.

## بابەتێ: خۆگرتنێ بۆ نەمێری.

٢٤٩٧ - عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنْ تَزَوَّجَ امْرَأَةً فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يَمَسَّهَا، فَإِنَّهُ يُضْرَبُ لَهُ أَجَلٌ سَنَةً، فَإِنْ مَسَّهَا؛ وَإِلاَّ فُرِّقَ بَيْنَهُمَا. [ط١٢٤١].

**ژ سەعیدیّ كوڕیّ موسەییەبی (رحمه الله) وی دگۆت: هەر كەسیّ ژنەكیّ مارە بكەت و نەشیّت بچیتە نڤینا ویّ، دەمیّ سالەكیّ دیّ بۆ هیّتە دیارەكرن، ئەگەر چۆ نڤینا ویّ باشە، و ئەگەر نە دیّ ژیّك هیّنە جوداكرن.**

٢٤٩٨ - عَنْ مَالِكٍ: أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ: مَتَى يُضْرَبُ لَهُ الْأَجَلُ، أَمِنْ يَوْمِ يَبْنِي بِهَا، أَمْ مِنْ يَوْمِ تُرَافِعُهُ إِلَى السُّلْطَانِ؟ فَقَالَ: بَلْ مِنْ يَوْمِ تُرَافِعُهُ إِلَى السُّلْطَانِ. [ط١٢٤٢].

**ژ مالكی (رحمه الله) وی پرسیار ژ ئیبن شیهابی كر: كەنگی دیّ دەم بۆ هیّتە دیاركرن ئەریّ ژ رۆژا دەواتا ویّ یان ژ رۆژا ئەو داخوازا خۆ دبەتە دەڤ قازی؟ گۆت: بەلكی ژ رۆژا كاریّ خۆ بلندكەتە دەڤ قازی.**

٢٤٩٩ - عَنْ عُمَر بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ فِي الْعِنِّينِ: يُؤَجَّل سَنَةً، فَإِنْ قَدِرَ عَلَيْهَا وإِلاَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا، وَلَهَا المهْر، وَعَلَيْهَا العِدَّة. [هق٧/٢٢٦].

**ژ عومەریّ كوڕیّ خەتتابی (رضي الله عنه) وی د راستا نەمیّریدا گۆت: سالەكیّ دیّ هیّتە گیرۆكرن، ئەگەر شیان ل سەر هەبوون باشە، و ئەگەر نە دیّ ژیّك هیّنە جوداكرن، و مارە بۆ هەیە و ژڤان ل سەرن.**

## ٢٧ . باب: ما جاء في الحكمين.

## بابەتیّ: ئەوا د راستا هەردو حەكەماندا هاتی.

٢٥٠٠ - عَنْ مَالِكٍ أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ قَالَ فِي الْحَكَمَيْنِ اللَّذَيْنِ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾ [النساء] إِنَّ إِلَيْهِمَا الْفُرْقَةَ بَيْنَهُمَا وَالاجْتِمَاعَ. [ط١٢٣٩].

**ژ مالكی (رحمه الله) گەهشتییە وی: عەلییّ كوڕیّ ئەبی تالبی د راستا هەردو دادوەریّت خودیّ د راستا واندا گۆتی:** ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾[1] **بۆ وان هەردووان هەیە د ناڤبەرا واندا ژیّك ڤەكەن یان د ناڤبەرا واندا كۆم بكەن.**

---

(١) رامان ب كورتی: و ئەگەر هوین ترسیان ناڤبەرا وان نەخۆش بیت و ژیّك نەگرن، دادوەرەكی ژ مرۆڤیّت زەلامی و دادوەرەكی دی ژ مرۆڤیّت ژنیّ هەلبژیّرن (و فریّكەنە دەڤ ئیّك، دا پیّكڤە بەریّ خۆ بدەنە ناریّشەییّ و چارەسەر بكەن)، ڤیّجا هەكە ب راستی وان

٢٥٠١ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: إِنِ اجْتَمَعَ رَأْيُهُمَا عَلَى أَنْ يُفَرِّقَا أَوْ يَجْمَعَا، فَأَمْرُهُمَا جَائِزٌ. [هق٧/٣٠٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەگەر بۆچۆنا وان بوو ئێك، ژێكڤە بكەن یان بگەهینە ئێك، فەرمانا وان یا دورستە.**

٢٥٠٢ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما ﴿إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآ﴾ [النساء: ٣٥] قَالَ: يَعْنِي الحَكَمَيْن. [هق٧/٣٠٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د راستا ڤێ ئایەتێدا ﴿إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآ﴾ گۆت: ئانكو: هەردو دادوەر.**

## ٢٨ . باب من حرم امرأته أو ظاهر منها.

## بابەتێ: ئەو كەسێ ژنا خۆ ل سەر خۆ حەرام بكەت یان وەكی مەحرەمەكا خۆ دانیت[1].

٢٥٠٣ – (ق) عن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ في الْحَرَامِ: يُكَفِّرُ. وَقالَ ابن عَبَّاسٍ: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ﴾[الأحزاب:٢١] . [خ٤٩١١/ م١٤٧٣].

وفي رواية للبخاري: قال: إِذَا حَرَّمَ امْرَأَتَهُ لَيْسَ بِشَيْءٍ. [خ٥٢٦٦].

وفي رواية لمسلم: قَالَ: إِذَا حَرَّمَ الرَّجُلُ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ، فَهْيَ يَمِينٌ يُكَفِّرُهَا.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) د حەرامكرنێدا گۆت: كەفارەت یا هەی، و ئیبن عەباسی ئەڤ ئایەتە گۆت: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ﴾.**

**و د ڤەگێرەكا بوخاریدا، گۆت: ئەگەر ژنا خۆ ل سەر خۆ حەرام كر چو تێدا نینە.**

**و د ڤەگێرەكا موسلمیدا گۆت: ئەگەر زەلامی ژنا خۆ ل سەر خۆ حەرام كر ئەو سویندە دێ كەفارەتێ دەت.**

---

(هەردو دادوەران) بڤێن وان پێك بینن و د ناڤبەرا واندا خۆش بكەن، خودێ دێ وان نێخیتە بەرێك، ب راستی خودێ زانا و شارەزایە.

(١) ظهار: زەلام ژنا خۆ ب مەحرەمەكا خۆ دانیت، وەكی: دایكێ یان خویشكێ، و بێژیتە ژنا خۆ تو وەكی دایكا منی یان پشتا دایكا منی ە كا حاوا دایكا من ل سەر من یا حەرامە تو ژی وەسا ل سەر من یا حەرامی.

٢٥٠٤ - عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ قَالَتْ: وَاللهِ فِيَّ وَفِي أَوْسِ بْنِ صَامِتٍ أَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل صَدْرَ سُورَةِ الْمُجَادَلَةِ، قَالَتْ: كُنْتُ عِنْدَهُ وَكَانَ شَيْخاً كَبِيراً قَدْ سَاءَ خُلُقُهُ وَضَجِرَ، قَالَتْ: فَدَخَلَ عَلَيَّ يَوْماً، فَرَاجَعْتُهُ بِشَيْءٍ، فَغَضِبَ فَقَالَ: أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمِّي. قَالَتْ: ثُمَّ خَرَجَ فَجَلَسَ فِي نَادِي قَوْمِهِ سَاعَةً، ثُمَّ دَخَلَ عَلَيَّ، فَإِذَا هُوَ يُرِيدُنِي عَلَى نَفْسِي، قالتْ: فَقُلْتُ: كَلاَّ، وَالَّذِي نَفْسُ خُوَيْلَةَ بِيَدِهِ! لاَ تَخْلُصُ إِلَيَّ وَقَدْ قُلْتَ مَا قُلْتَ، حَتَّى يَحْكُمَ اللهُ وَرَسُولُهُ فِينَا بِحُكْمِهِ، قَالَتْ: فَوَاثَبَنِي، وَامْتَنَعْتُ مِنْهُ فَغَلَبْتُهُ بِمَا تَغْلِبُ بِهِ الْمَرْأَةُ الشَّيْخَ الضَّعِيفَ، فَأَلْقَيْتُهُ عَنِّي. قَالَتْ: ثُمَّ خَرَجْتُ إِلَى بَعْضِ جَارَاتِي، فَاسْتَعَرْتُ مِنْهَا ثِيَابَهَا، ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى جِئْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَجَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَذَكَرْتُ لَهُ مَا لَقِيتُ مِنْهُ، فَجَعَلْتُ أَشْكُو إِلَيْهِ (ﷺ) مَا أَلْقَى مِنْ سُوءِ خُلُقِهِ.

قَالَتْ: فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(يَا خُوَيْلَةُ، ابْنُ عَمِّكِ شَيْخٌ كَبِيرٌ، فَاتَّقِي اللهَ فِيهِ)** قَالَتْ: فَوَاللهِ مَا بَرِحْتُ حَتَّى نَزَلَ فِيَّ الْقُرْآنُ، فَتَغَشَّى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَا كَانَ يَتَغَشَّاهُ، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ، فَقَالَ لِي: **(يَا خُوَيْلَةُ، قَدْ أَنْزَلَ اللهُ فِيكِ وَفِي صَاحِبِكِ)** ثُمَّ قَرَأَ عَلَيَّ: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ۝١﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝٤﴾ [المجادلة: ١ ـ ٤].

فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مُرِيهِ فَلْيُعْتِقْ رَقَبَةً)** ، قالتْ: فَقُلْتُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ مَا عِنْدَهُ مَا يُعْتِقُ! قَالَ: **(فَلْيَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ)** ، قالتْ: فَقُلْتُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّهُ شَيْخٌ كَبِيرٌ مَا بِهِ مِنْ صِيَامٍ، قَالَ: **(فَلْيُطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِيناً وَسْقاً مِنْ تَمْرٍ)** ، قالتْ: قُلْتُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ مَا ذَاكَ عِنْدَهُ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(فَإِنَّا سَنُعِينُهُ بِعَرَقٍ مِنْ تَمْرٍ)** ، قالتْ: فَقُلْتُ: وَأَنَا يَا رَسُولَ اللهِ سَأُعِينُهُ بِعَرَقٍ آخَرَ. قَالَ: **(قَدْ أَصَبْتِ وَأَحْسَنْتِ، فَاذْهَبِي فَتَصَدَّقِي عَنْهُ، ثُمَّ اسْتَوْصِي بِابْنِ عَمِّكِ خَيْراً)** قَالَتْ: فَفَعَلْتُ. [د٢٢١٤/ حم٢٧٣١٩].

* حسن.

هذا لفظ المسند ، وزاد أبو داود: وَالْعَرَقُ سِتُّونَ صَاعاً.

**ژ خەولەیا كچا سەعلەبەیی (رضي الله عنها) گۆت: ئەز ب خودێ كەمە دەستپێكا سۆرەتا موجادیلە د راستا من و ئەوسێ كورێ سامتیدا هاتە خوارێ، گۆت: ئەز ل دەڤ وی بووم و ئەو پیرەمێرەكێ مەزن بوو، رەوشتێ وی خراب ببوو و بێزار ببوو، ئینا رۆژەكێ هاتە دەڤ من، و من بەرسڤا وی د تشتەكیدا دا، ئینا تۆرە بوو و گۆت: تو وەكی پشتا دایكا منی ل**

سەر من، وێ گۆت: پاشی دەركەفت و دەمەكی روینشتە دیوانخانا خەلكێ خۆ، پاشی هاتە دەڤ من و من دیت وی ئەز بۆ خۆ دڤیام، وێ گۆت: من گۆت: نەخێر ئەز ب وی كەمە یێ جانێ خەولایێ د دەستێ ویدا تو دەستێ خۆ ناكەیە من و ناگەهییە من، و تە ئەو گۆت یا تە گۆتی، هەتا خودێ و پێغەمبەرێ وی د راستا مەدا حوكمێ خۆ دكەن، وێ گۆت: رابوو بەرسینگێ من و من رێك لێ گرت، ئەز شیامە وی ب وێ شیانا ژن دشێتە پیرەمێرێ لاواز، من ژ خۆ دا پاش، وێ گۆت: پاشی ئەز چۆمە دەڤ جیرانەكا خۆ، و من كراسێ وێ ب ئەمانەت ژێ وەرگرت، پاشی ئەز دەركەفتم هەتا هاتیمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئەز ل بەر سینگێ وی روینشتمە خوارێ، و ئەوا من ژ وی دیتی من بۆ گۆت، و من دەستهاڤێتێ گازندا خۆ گەهاندە پێغەمبەری (ﷺ) ل سەر خرابییا سەرەدەرییا وی.

وێ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستهاڤێتێ گۆتە من: **(ئەی خوویلا، پسمامێ تە پیرەمێرەكێ مەزنە ژ خودێ بترسە د راستا ویدا)**، وێ گۆت: ئەز ب خودێ كەم ئەز ل جهێ خۆ نەرابووم هەتا وەحی د راستا مندا هاتییە خوار، و ئەو ب سەر پێغەمبەریدا (ﷺ) هاتە خوار یا ب سەر ویدا دهاتە خوار، و پاشی بەردا و ڤەرەڤی و گۆتە من: **(ئەی خوویلا خودێ د راستا تە و هەڤالێ تەدا قورئان ئینا خوار)**، پاشی بۆ من خواند: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾ هەتا گۆتنا خودێ ﴿وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[1].

---

(١) رامانا وان چوار ئایەتان ب كورتی ئەڤەیە: ب سویند خودێ گۆتنا وێ ژنا د راستا خۆدا جڕەبڕ د گەل تە دكر، و گازندە و خەما خۆ بۆ خودێ دیار دكر؛ بهیست، و خودێ ئاگەهـ ژ دان و ستاندنا هەوە هەبوو، ب راستی خودێ یێ گوهدێر و بینەرە. و ژ هەوە ئەوێت دبێژنە ژنێت خۆ تو وەكی دەیكا من ل من حەرام بی، ژنێت وان نابنە دەیكێت وان، دەیكێت وان بەس ئەون ئەوێت ئەو ژێ بوویین، و ب راستی ئەو (ب ڤێ ئاخفتنا خۆ) ئاخفتنەكا دویری راستییێ و شەرعی، و ئاخفتنەكا درەو دبێژن، و ب راستی خودێ لێبۆر و گونەهـ ژێبەرە (وەختێ دەرگەهێ رزگاربوونێ ب كەفارەتێ بۆ هەوە ڤەكری). و ئەوێت دبێژنە ژنێت خۆ تو وەكی دەیكا من ل من حەرام بی و پاشی پەشێمان دبن و لێڤە دبن، ڤێجا بەری ئەو بچنە نڤینا خۆ دڤێت كۆلەیەكی (چ ژن بیت چ مێر) ئازا بكەن، ئەمرێ هەوە ب ڤێ بڕیارێ دئێتە كرن (دا هوین ڤێ ئاخفتنێ نەكەن) و هوین چ بكەن خودێ پێ ئاگەهدارە (و چو ل بەر بەرزە نابیت) و یێ كۆلە نەدیت و ب دەست نەكەفت، ڤێجا هێژ نەچۆینە نڤینا ئێك و دو، بلا دو هەیڤان ل سەرێك ب رۆژی بیت، و یێ نەشیا (دو هەیڤان ب رۆژی بیت) بلا زادی بدەتە شێست بەلنگازان، ئەڤە (بڕیارێت زیهارێ مە دیاركرن) بۆ هندێیە دا هوین باوەرییێ ب خودێ و

ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: **(بلا بەندەیەكێ ئازا بكەت)**، وێ گۆت: من گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەی پێغەمبەرێ خودێ وی چو نینە ئازا بكەت، گۆت **(بلا دو هەیڤان ل سەرێك ب رۆژی بیت)**، وێ گۆت: من گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو پیرەمێرە نەشێت رۆژییان بگریت، گۆت: بێژێ: **(بلا وسقەكێ[1] ژ قەسپان بدەتە بەلنگازان)**، وێ گۆت: من گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەی پێغەمبەرێ خودێ وی ئەو نینە، وێ گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەم دێ ب سەبكەكێ ژ قەسپان هاریكارییا وی كەین)**، وێ گۆت من گۆت: و ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز ژی دێ هاریكارییا وی ب سەلكەكا دی كەم، گۆت: **(تە دورست كر و تە باشی كر، هەرە پێش ویڤە بكە خێر پاشی چاڤێ خۆ بدە پسمامێ خۆ)**، گۆت من وەكر.

و ئەڤە بێژەیا موسنەدێیە و ئەبو داوود ئەڤە زێدە كرییە: و سەلك شێست ساعە.

٢٥٠٥ - عَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ الْبَيَاضِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي الْمُظَاهِرِ يُوَاقِعُ قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ، قَالَ: (كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ). [ت١١٩٨/ جه٢٠٦٤].

* صحيح.

**ژ سەلەمەیێ كورێ سەخرێ بەیازی ژ پێغەمبەری (ﷺ) د راستا وی كەسیدا یێ ژنا خۆ وەكی ئێك ژ مەحەرەمێت خۆ ددانیت و بچیتە دەڤ بەری كەفارەتێ بدەت، گۆت: (ئێك كەفارەتە).**

٢٥٠٦ - عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: تَبَارَكَ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ كُلَّ شَيْءٍ، إِنِّي لَأَسْمَعُ كَلَامَ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ، وَيَخْفَى عَلَيَّ بَعْضُهُ، وَهِيَ تَشْتَكِي زَوْجَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَهِيَ تَقُولُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَكَلَ شَبَابِي، وَنَثَرْتُ لَهُ بَطْنِي، حَتَّى إِذَا كَبِرَتْ سِنِّي، وَانْقَطَعَ وَلَدِي، ظَاهَرَ مِنِّي، اللَّهُمَّ إِنِّي أَشْكُو إِلَيْكَ! فَمَا بَرِحَتْ حَتَّى نَزَلَ جِبْرَائِيلُ بِهَؤُلَاءِ الْآيَاتِ ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ [المجادلة: ١]. [ن٣٤٦٠/ جه١٨٨، ٢٠٦٣].

* صحيح.

ورواية النسائي مختصرة.

---

پێغەمبەرێ وی بینن (كار ب بڕیارا وی بكەن، و ل سەر بڕیارێت نەزانینێ نەمینن)، و ئەڤە تخویب و بڕیارێت خودێنە، و گاوران ئیزایەكا ب ژان و دژوار یا هەی).

(١) هەر وسقەك دبیتە شێست من، و هەر منەك دبیتە (٢،١٧٦غرام)، و شێست من دبنە (١٣٠،٥٦).

ژ عوروەیێ كوڕێ زوبەیری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عائیشایێ گۆت: پاك و بلند بوو ئەوێ هەمی تشتان گوهـ لێ دبیت، من گوهدارییا ئاخفتنا خەولایا كچا سەعلەبەی دكر، و هندەك ئاخفتنا وێ ل من بەرزە دبوو و وێ گازندەیا ژ زەلامێ خۆ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دكر، و وێ دگۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ گەنجاتییا من خوار، و من زێدە زارۆك بۆ ئینان، ڤێجا هەتا ژییێ من درێژ بووی، و ئەز ژ زارۆكا خلاس بوویم، ئەز ل سەر خۆ حەرام كرم و ئەز وەكی مەحرەمێت خۆ دانام، ئەی خودێ ئەز گازندا خۆ دگەهینمە تە، ئەو ژ جهێ خۆ نەرابوو و نەچۆ هەتا جبرائیل ب ڤان ئایەتان هاتە خوارێ ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَـٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾.

و ڤەگێرا نەسائی یا كورتە.

## ٢٩ . باب: الخُلْع.

## بابەتێ: خولعێ[١].

٢٥٠٧ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جاءَتِ امْرَأَةُ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، ما أَنْقِمُ عَلَى ثَابِتٍ فِي دِينٍ وَلاَ خُلُقٍ؛ إِلاَّ أَنِّي أَخافُ الْكُفْرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (فَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ)؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، فَرَدَّتْ عَلَيْهِ، وَأَمَرَهُ فَفَارَقَهَا. [خ٥٢٧٦ (٥٢٧٣)].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنا سابتێ كوڕێ قەیسێ كوڕێ شەماسی هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەز كێماسی و تۆڕەبوونێ د سابتیدا د دین و رەوشتێ ویدا نابینم، بەلێ ئەز ژ رەوشتێ گاوران دترسم[٢]، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەرێ دێ بیستانێ وی بۆ زڤرینی)؟ گۆت: بەلێ، لێ زڤراند و فەرمانا وی كر ژێ جودا بوو.

٢٥٠٨ – عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلاَقاً فِي غَيْرِ مَا بَأْسٍ، فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ) . [د٢٢٢٦/ ت١١٨٧/ جه٢٠٥٥/ مي٢٣١٦].

* صحيح.

---

(١) خولع: ئەوە ژن خۆ ژ مێری خلاس كەت بەرامبەر تشتەكی بدەتە زەلامی، و خولعە نێك تەلاقە و نێكسەر دبیتە ژێكڤەبوونا بچویك (بینونة صغری).

(٢) كارەكی بكەم یێ گاوران بیت، یان ژی ئەز ژ كوفرا نیعمەتێ دترسم، چونكی وێ ئەو نەڤێت ڤێجا ب ئەركێ خۆ نەرابیت و مافێت وی نەدەتێ.

**ژ سەوبانی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر ژنەکا بێ زەرەر و زیانەك هەبیت داخوازا بەردانێ ژ مێرێ خۆ بکەت بێهنا بەحەشتێ ل سەر وێ حەرامە).**

٢٥٠٩ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ اخْتَلَعَتْ مِنْهُ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) عِدَّتَهَا حَيْضَةً.

[د٢٢٢٩/ ت١١٨٥م].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنا سابتێ کوڕێ قەیسی خولعە د گەل کر و ب خولعێ ژێ جودا بوو، و پێغەمبەری (ﷺ) ژڤانا وێ کرە بێنڤێژییەك.**



## الفَصْل الثاني: اللّعان.

## پشكا دووێ: بابەتێ: هەڤلەعنەتكرن.

٢٥١٠ ـ (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ: أَنَّ عُوَيْمِراً الْعَجْلاَنِيَّ جاءَ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ الأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ لَهُ: يَا عَاصِمُ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ سَلْ لِي يَا عاصِمُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ). فَسَأَلَ عَاصِمٌ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَكَرِهَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) المسَائِلَ وَعَابَهَا، حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). فَلَمَّا رَجَعَ عاصِمٌ إِلى أَهْلِهِ، جَاءَ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا عَاصِمُ، ماذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)؟ فَقَالَ عاصِمٌ: لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ، قَدْ كَرِهَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) المسْأَلَةَ الَّتِي سَأَلْتُهُ عَنْهَا. قَالَ عُوَيْمِرٌ: واللهِ لاَ أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَهُ عَنْهَا.

فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَسْطَ النَّاسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**قَدْ أَنْزَلَ اللهُ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ، فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا**). قالَ سَهْلٌ: فَتَلاَعَنَا، وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَلَمَّا فَرَغا، قالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا، فَطَلَّقَهَا ثَلاَثاً، قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ).

قالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَتْ تِلْكَ سُنَّةَ المتَلاَعِنَيْنِ. [خ٥٢٥٩ (٤٢٣)/ م١٤٩٢].

**ژ سەهلێ كورێ سەعدێ ساعدى (ﷺ) گۆت: عوومیمرێ عەجلانى هاتە دەڤ عاسمێ كورێ عودەى یێ ئەنسارى، گۆتێ: ئەى عاسم بێژە من، ئەگەر زەلامەكى زەلامەك د گەل ژنا خۆ دیت، ئەرێ وى بكوژیت هوین ژى دێ وى كوژن، یان چ بكەت؟ ئەى عاسم بۆ من پرسیارا ڤێ چەندێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بكە. ئینا عاسمى پرسیارا ڤێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤ پرسیار نەڤیا و ب كێماسى زانى، هەتا عاسمى ئەوا ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بووى ل سەر وى گران بوویى، ڤێجا دەمێ عاسم زڤرییە مالا خۆ، عوومیمر هات و گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چ گۆتە تە؟ ئینا عاسمى گۆت: تە چ باشى بۆ من نەئینایە، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو پرسیار نەڤیا ئەوا من ژ وى كرى.**

**عوومیمرى گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەز ناراوەستم هەتا ئەز وێ پرسیارێ ژێ نەكەم.**

**ئینا عوومیمر هات، هەتا هاتییە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: ئەى پێغەمبەرێ خودێ بێژە من ئەگەر زەلامەكى زەلامەك د گەل ژنا خۆ دیت، ئەرێ وى**

**بكوژیت هوین ژی دێ وی كوژن، یان چ بكەت؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ د راستا تە و هەڤالا تەدا قورئان ئینایە خوارێ، هەرە وێ بینە) سەهلی گۆت: لەعنەت ل ئێكدو كرن و ئەز د گەل خەلكی ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ بووم (ﷺ)، ڤێجا دەمێ هەردو ب دویماهی هاتین، عوومیمری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەگەر من ل دەڤ خۆ هێلا رامان ئەوە ئەز درەوان دكەم، و سێ جاران بەردا بەری پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا وی بكەت.**

٢٥١١ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً رَمَى امْرَأَتَهُ، فَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا، فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَتَلاَعَنَا كَمَا قَالَ اللهُ، ثُمَّ قَضَى بِالْوَلَدِ لِلْمَرْأَةِ، وَفَرَّقَ بَيْنَ المَتَلاَعِنَيْنِ. [خ٤٧٤٨/ م١٤٩٤].

- وفي رواية للبخاري: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ... [خ٥٣٠٦].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەلامەكی ژنا خۆ ب زنایێ گونەهبار كر و خۆ ژ زارۆكێ وێ بەری كر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا وان كر و لەعنەت ل ئێكدو كرن هەر وەكو خودێ گۆتی، پاشی حوكم ب زارۆكی بۆ ژنێ كر، و د ناڤبەرا هەڤلەعنەتكەراندا ژێكڤە كر.**

- **و د ڤەگێرەكا بوخاریدا: زەلامەك ژ ئەنساران.**

٢٥١٢ - (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنِ المَتَلاعِنَيْنِ، فَقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِلْمُتَلاعِنَيْنِ: (**حِسَابُكُمَا عَلَى اللهِ، أَحَدُكُمَا كاذِبٌ، لاَ سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا**). قَالَ: مَالِي؟ قَالَ: (**لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا، فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا، فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ**).

[خ٥٣١٢ (٥٣١١)/ م١٤٩٣].

**ژ سەعیدێ كورێ جوبەیری (رحمه الله) گۆت: من پرسیارا هەڤلەعنەتكەران ژ ئیبن عومەری كر، ئینا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە هەڤلەعنەتكەران: (پرسینا هەوە ل دەڤ خودێیە، ئێك ژ هەوە درەوینە، تە چو رێك ل سەر وێ نینن)، گۆت: و مالێ من؟ گۆت: (تە مال ل دەڤ نینە، ئەگەر گونەهبارییا تە د راستا وێدا یا دورست بیت ئەو بەرامبەر حەلالزانینا نڤینا وێیە، و ئەگەر تە د گونەهبارییا خۆدا درەو ل سەر كربیت ئەو مال بۆ تە دویرترە).**

٢٥١٣ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**الْبَيِّنَةَ، أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ**). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِذَا رَأَى أَحَدُنَا عَلَى امْرَأَتِهِ رَجُلاً، يَنْطَلِقُ يَلْتَمِسُ الْبَيِّنَةَ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقُولُ: (**الْبَيِّنَةَ؛ وَإِلاَّ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ**). فَقَالَ هِلاَلٌ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ! إِنِّي لَصَادِقٌ، فَلَيُنْزِلَنَّ اللهُ ما يُبَرِّئُ ظَهْرِي مِنَ الحَدِّ، فَنَزَلَ جِبْرِيلُ وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ﴾، فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ: ﴿إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾[النور:٩]. فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَجَاءَ هِلاَلٌ فَشَهِدَ، وَالنَّبِيُّ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ**) ؟ ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ، فَلَمَّا كَانَتْ عِنْدَ الخَامِسَةِ وَقَّفُوهَا، وَقَالُوا: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَتَلَكَّأَتْ وَنَكَصَتْ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهَا تَرْجِعُ، ثُمَّ قَالَتْ: لاَ أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ، فَمَضَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَبْصِرُوهَا، فَإِنْ جاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ، سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ، خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ، فَهُوَ لِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ**). فَجَاءَتْ بِهِ كَذلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لَوْلاَ ما مَضَى مِنْ كِتَابِ اللهِ، لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ**). [خ٤٧٤٧ (٢٦٧١)]

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هیلالێ كورێ ئومەییە ژنا خۆ ب زینایێ د گەل شەریكێ كورێ سەحمائێ ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گونەهبار كر، ئینا** پێغەمبەری (ﷺ) **گۆت: (شاهدان بینە یان ڤامچییا سزایێ ل سەر پشتا تەیە) ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەگەر ئێكی ژ مە زەلامەك ل سەر ژنا خۆ دیت بچیت ل شاهدان بگەریت، هەر پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (شاهدان بینە یان ڤامچییا سزایێ ل سەر پشتا تەیە)، ئینا هیلالی گۆت: ئەز ب وی كەمە یێ تو ب راستییێ هنارت ئەز یێ راستگۆمە و دێ خودێ وێ ئینیتە خوارێ پشتا من ژ ڤامچییا سزایی بەریكەت، ئینا جبریل هاتە خوارێ و ئەڤە ل سەر ئینانە خوارێ** ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ **و خواند هەتا گەهشتییە** ﴿إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ **ئینا پێغەمبەر (ﷺ) چۆ و فرێكرە د دویڤ وێرا، هیلال هات شەهدەیی دا، و پێغەمبەری (ﷺ) دگۆت: (ب راستی خودێ دزانیت ئێك ژ هەوە یێ درەوینە، ئەرێ ئێك ژ هەوە تەوبێ ناكەت)؟ پاشی ئەو ژن رابوو و شەهدەیی دا، ڤێجا دەمێ گەهشتییە یا پێنجێ، پێغەمبەری (ﷺ) ئەو راوەستاند، و خەلكی گۆت: ئەڤە**

دێ مسۆگەر کەت[1]. ئیبن عەباسی گۆت: هەزقی و زڤری هەتا مە هزر کر دێ لێڤەبیت، پاشی گۆت: ئەز مرۆڤێت خۆ ب درێژیا رۆژان شەرمزار ناکەم، و بەردەوام بوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(بەرێ خۆ بدەنێ زارۆکێ وێ ئەگەر چاڤ رەش و کماخ فرەھ و لنگ قەلەو هات ئەو یێ شەریکێ کورێ سەحمائییە)**، و وێ وەسا ئەو بوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ژ بەر هندێ نەبایە بەری نوکە د کتێبا خودێدا سزا ل سەر هەڤلەعنەتکەران ب هەڤلەعەنتکرنێ رادبیت دا من کارەکێ دی د راستا وێدا هەبیت).**

٢٥١٤ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَمَرَ رَجُلاً حِينَ أَمَرَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ أَنْ يَتَلاَعَنَا، أَنْ يَضَعَ يَدَهُ عَلَى فِيهِ عِنْدَ الْخَامِسَةِ، ويَقُولُ: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ. [د٢٢٥٥/ ن٣٤٧٢].

* صحيح.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: فەرمانا زەلامەکی کر دەمێ فەرمان کری هەڤلەعنەتکەر هەڤلەعەنتکرنێ بکەن ئەو د یا پێنجێدا دەستێ خۆ دانیتە سەر دەڤێ وی، و بێژیت: ب راستی ئەڤە مسۆگەرکەرە[2].



(١) تانکو: دێ سزا و غەزەبا خودێ ل سەر ئێکی ژ وان یێ درەوین مسۆگەر کەت.

(٢) تانکو: ئەڤە دێ سزا و غەزەبا خودێ ل سەر تە مسۆگەر کەت ئەگەر تو درەوان بکەی.

## الفَصل الثالِث: الإيلاء.

## پشكا سێیێ: سویندخوارن ب نەچۆنا نڤینا ژنێ(١).

٢٥١٥ - (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) حَلَفَ لاَ يَدْخُلُ عَلَى بَعْضِ أَهْلِهِ شَهْراً، فَلَمَّا مَضَى تِسْعَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْماً غَدَا عَلَيْهِنَّ أَوْ رَاحَ، فَقِيلَ لَهُ: يَا نَبِيَّ اللهِ! حَلَفْتَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ عَلَيْهِنَّ شَهْراً؟ قَالَ: (**إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ يَوْماً**). [خ٥٢٠٢ (١٩١٠)/ م١٠٨٥].

وفي رواية للبخاري: آلَى مِنْ نِسَائِهِ شَهْراً. [خ١٩١٠].

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) سویند خوار ئەو هەیڤەكێ نەچیتە دەڤ هندەك ژ هەڤژینێت خۆ، ڤێجا دەمێ بیست و نەهـ رۆژ بۆرین، سپێدێ یان ئێڤاری چۆ دەڤ وان، ئینا گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تە سویند خواربوو هەیڤەكێ نەچییە دەڤ وان؟ گۆت: (ب راستی دبیت هەیڤ بیست و نەهـ رۆژ بیت).**

٢٥١٦ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَصْبَحْنَا يَوْماً وَنِسَاءُ النَّبِيِّ (ﷺ) يَبْكِينَ، عِنْدَ كُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ أَهْلُهَا، فَخَرَجْتُ إِلَى المسْجِدِ، فَإِذَا هُوَ مَلآنُ مِنَ النَّاسِ، فَجَاءَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، فَصَعِدَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَهُوَ فِي غُرْفَةٍ لَهُ، فَسَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ سَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ سَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، فَنَادَاهُ، فَدَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَال: أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ فَقَالَ: (**لاَ، وَلكِنْ آلَيْتُ مِنْهُنَّ شَهْراً**). فَمَكَثَ تِسْعاً وَعِشْرِينَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ. [خ٥٢٠٣].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: رۆژەكێ ل مە بوو سپێدە و هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) دكرنە گری، مرۆڤێت هەر ژنەكێ ژ وان ل دەڤ وێ كۆم بوون، ئینا ئەز دەركەفتمە مزگەفتێ من دیت یا ژ مرۆڤان پڕ بووی، ئینا عومەرێ كوڕێ خەتتابی هات و سەركەفتە دەڤ پێغەمبەری و ئەو د ئۆدەكا خۆڤە بوو، ئینا سلاڤ كر، كەسێ سلاڤا وی نەوەرگرت پاشی سلاڤ كرەڤە كەسێ سلاڤا وی نەوەرگرت پاشی سلاڤ كرەڤە كەسێ سلاڤا وی نەوەرگرت، ئینا گازی كرێ، چۆ دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەرێ تە هەڤژینێت خۆ بەردانە؟ گۆت: (نەخێر، بەلێ من یا سویند خواری هەیڤەكێ نەچمە دەڤ وان)، ئینا بیست و نەهـ رۆژان ما، پاشی چۆ دەڤ هەڤژینێت خۆ.**

---

(١) ئیلاء: ئەلام سویند بخوت نێزیكی نڤینا ژنا خۆ نەبیت، بەردەوام یان ژ چوار هەیڤان پتر.

٢٥١٧ - (خ) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما كَانَ يَقُولُ فِي الإِيلاَءِ الَّذِي سَمَّى اللهُ: لاَ يَحِلُّ لأَحَدٍ بَعْدَ الأَجَلِ؛ إِلاَّ أَنْ يُمْسِكَ بَالمَعْرُوفِ، أَوْ يَعْزِمَ الطَّلاَقَ كَمَا أَمَرَ الله عزّ وجل.[خ٥٢٩٠].

**ژ نافعی (ﷺ) گۆت: ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) د سویندخوارنا نەچوونا نڤینا ژنێدا ئەوا خودێ ب ناڤ ئینایی دگۆت: پشتی دەمێ وێ دبوریت بۆ کەسێ حەلال نینە یان ب باشی بگریت یان یێ رژد بیت ل سەر بەردانێ، هەروەکی خودایێ هەر مەزن و ب هێز فەرمان پێ کری.**



# الفصل الأول: النسب.

## پشكا ئێكێ: رڤیٚشت.

### ١ ـ باب: إذا عرض بنفي الولد.

### بابەتێ: ئەگەر ب نەئاشكرایی زارۆك ژ خۆ دا پاش.

٢٠١٨ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ أَعْرَابِيّاً أَتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَماً أَسْوَدَ، وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ)** ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: **(فَمَا أَلْوَانُهَا)**، قالَ: حُمْرٌ، قَالَ: **(هَلْ فِيهَا مِنْ أَورَقَ)** ؟ قَالَ: إِنَّ فِيهَا لَوُرْقاً، قالَ: **(فَأَنَّى تُرَى ذلِكَ جَاءَهَا)** ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، عِرْقٌ نَزَعَهَا، قَالَ: **(وَلَعلَّ هَذَا عِرْقٌ نَزَعَهُ)**. وَلَمْ يُرَخِّصْ لَهُ فِي الاِنْتِفَاءِ مِنْهُ. [خ٧٣١٤ (٥٣٠٥)/ م١٥٠٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (﵁) گۆت: كۆچەرە عەرەبەك هاتە دەڤ پیٚغەمبەریٚ خودیٚ (ﷺ)، ئینا گۆت:** ب راستی ژنا من بچویكەكیٚ رەش یێ یا بووی و ئەز وی پەسند نابینم، ئینا پیٚغەمبەریٚ خودیٚ (ﷺ) گۆت: **(ئەریٚ تە حیٚشتر هەنە)؟** گۆت: بەلیٚ، گۆت: **(رەنگیٚت وان چاوانن)** گۆت: سۆرن، گۆت: **(ئەریٚ ژ وان بەلەك هەنە)، گۆتیٚ** بەلیٚ ژ وان ییٚت بەلەك ییٚت هەین، گۆت: **(تو دبینی ئەو بەلەكی ژ كیڤە ئینا بیت)، گۆت بەلكی ژ رهەكیٚ** وەرگرتبیت ئەی پیٚغەمبەریٚ خودیٚ، گۆت: **(و دبیت ئەڤە ژی رهەك بیت وەرگرتبیت) و بۆ وی دورست نەكر ئەو زارۆكی ژ خۆ بدەتە پاش.**

### ٢ ـ باب: الولد للفراش.

### بابەتێ: بچویك بۆ خودانیٚ نڤینا نڤستنیٚیە.

٢٠١٩ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ)**.
[خ٦٨١٨ (٦٧٥٠)/ م١٤٥٨]

- وفي رواية للبخاري: (**الْوَلَدُ لِصَاحِبِ الْفِرَاشِ**). [خ٦٧٥٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (﵁) گۆت:** پیٚغەمبەریٚ خودیٚ (ﷺ) گۆت: **(بچویك بۆ خودانیٚ جهیٚ نڤستنیٚیە و زیان و خوسارەتی بۆ زناكەرییە).**

- و د ڤەگیٚرا بوخاریدا: **(زارۆك بۆ خودانیٚ نڤینیٚیە).**

٢٥٢٠ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي غُلاَمٍ، فَقَالَ سَعْدٌ: هذَا يَا رَسُولَ اللهِ ابْنُ أَخِي عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ، انْظُرْ إِلَى شَبَهِهِ. وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: هَذَا أَخِي يَا رَسُولَ اللهِ، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلى شَبَهِهِ فَرَأَى شَبَهاً بَيِّناً بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: (**هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتَ زَمْعَةَ**). فَلَمْ تَرَهُ سَوْدَةُ قَطُّ. [خ٢٢١٨ (٢٠٥٣)/ م١٤٥٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) وێ گۆت: سەعدێ كورێ ئەبی وەقاسی و عەبدویێ كورێ زەمعە د زارۆكەكیدا ب هەڤرك چۆن، ئینا سەعدی گۆت: ئەڤە ئەی پێغەمبەرێ خودێ كورێ برایێ منە عوتبەیێ كورێ ئەبی وەقاسی، وی وەسیەتا وی ل من كربو ئەو كورێ وییە، بەرێ خۆ بدەیێ وەكی وییە، و عەبدویێ كورێ زەمعەیی گۆت: ئەڤە برایێ منە ئەی پێغەمبەرێ خودێ و ئەو یێ ل سەر نڤینا وی بوویی و ژ جارییا وی، ئینا گۆت: (ئەو بۆ تەیە ئەی عەبدو، بچویك بۆ خودانێ نڤینا نڤستنێیە و خوسارەتی و زیان بۆ زناكەرییە، و ئەی سەودەیا كچا زەمعەیی خۆ ژێ ڤەشێرە). سەودەیێ د بنیرا ئەو نەدیت.**

٢٥٢١ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَمْرٍو قَالَ: قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ فُلاَناً ابْنِي، عَاهَرْتُ بِأُمِّهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ دِعْوَةَ فِي الإِسْلاَمِ، ذَهَبَ أَمْرُ الْجَاهِلِيَّةِ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ**). [د٢٢٧٤].

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەك رابوو گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، فلان، كورێ منە، من د نەزانینێدا زنا د گەل دایكا وی كربوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (داخوازییا بچویكی د ئیسلامێدا نینە، كاروبارێ نەزانینێ چۆ، بچویك بۆ خودانێ نڤینا نڤستنێیە و خوسارەتی و زیان بۆ زناكەرییە).**

**٣ ـ باب: القائف.**

**بابەتێ: دروێناس (گەهوبارناس).**

٢٥٢٢ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) دَخَلَ عَلَيَّ مَسْرُوراً، تَبْرُقُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ فَقَالَ: (**أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزاً نَظَرَ آنِفاً إِلى زَيْدِ بْنِ حارِثَةَ وَأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، فَقَالَ: إِنَّ هذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ**). [خ٦٧٧٠ (٣٥٥٥)/ م١٤٥٩].

وفي رواية لهما: دَخَلَ فَرَأَى أُسَامَةَ وَزَيْداً، وَعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ، قَدْ غَطَّيَا رُؤُوسَهُمَا وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا، فَقَالَ: (**إِنَّ هذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ**). [خ٦٧٧١].

- وفي رواية لهما: فَسُرَّ بِذَلِكَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَأَعْجَبَهُ، فَأَخْبَرَ بِهِ عَائِشَةَ. [خ٣٧٣١].
- وفي رواية لمسلم: وَكَانَ مُجَزِّزٌ قَائِفاً.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ من، و یێ دلخۆش بوو، و خیچێت سەروچاڤێت وی دبرسقین، ئینا گۆت: (ئەرێ ما تو نابینی بەرێ دەمەكێ كێم موجەززیزی بەرێ خۆ دا پێت حاریسەیی و زەیدی، ئینا گۆت: ئەڤ پێیە هندەك ژ هندەكانە).**

- **و د ڤەگێرەكا واندا: ب ژۆر كەفت ئینا ئوسامە و زەید دیتن و پاتەكێ ریشۆلەك ل سەر وان بوو سەرێ خۆ نخافتبوون و پێت وان ل دەرڤە بوون، ئینا گۆت: (ب راستی ئەڤ پێیە هندەك ژ هندەكانە).**
- **و د ڤەگێرەكا واندا: پێغەمبەر (ﷺ) ب ڤێ چەندێ دلخۆش بوو و حەژێ كر، ئینا ئەڤە بۆ عائیشایێ گۆت.**
- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: و موجەززیزی دوریناس بوو.**

## ٤ ـ باب: من ادعى لغير أبيه.

## بابەتێ: یێ خۆ بگەهینیتە نەبابێ خۆ.

٢٥٢٣ - (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ ـ وَهْوَ يَعْلَمُهُ ـ؛ إِلاَّ كَفَرَ بِاللهِ. وَمَنِ ادَّعَى قَوْماً لَيْسَ لَهُ فِيهِمْ نَسَبٌ؛ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ). [خ٣٥٠٨/ م٦١].

**ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نینە زەلامەك خۆ بكەتە كوڕێ نەبابێ خۆ و ئەو بزانیت ئەو نەبابێ وییە، هەكە وی كارەك نەكربیت ژ گاوران پێڤەتر وی كاری ناكەن، و هەر كەسێ تشتەكێ نەیێ وی بێژیت یێ منە ئەو نە ژ مەیە، و بلا جهێ خۆ ژ جەهنەمێ بگریت، و هەر كەسێ ئێكی ب گاورییێ گازی بكەت، یان بێژیت: دژمنێ خودێ و ئەو یێ وەسا نەبیت ئەو دێ بۆ وی زڤڕیت).**

٢٥٢٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ تَرْغَبُوا عَنْ آبَائِكُمْ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ أَبِيهِ، فَهُوَ كُفْرٌ). [خ٦٧٦٨/ م٦٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەڤیانێ نەراكەن كو هوین دگەهنە بابێت خۆ، هەر كەسێ نەڤێت كو ئەو كوڕ یان كچا بابێ خۆ بیت، كارێ وی رەنگەكێ گاورییێیە).**

٥ ـ باب: تحريم الطعن في النسب.

**بابەتێ: حەرامكرنا تاندانانا د نفشیدا.**

٢٥٢٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ). [م٦٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دو تشتێت د ناڤ خەلكیدا ژ كارێت گاورانە: عەیبداركرنا بنیاتان و پێگۆتنا ب دەنگێ بلند ل سەر مرییان).**

٦ ـ باب: اللقيط.

**بابەتێ: زارۆكێ دیتی و دایباب نەنیاس.**

٢٥٢٦ - (خ) عَنْ سُنَيْنٍ أَبِي جَمِيلَةَ ـ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ ـ: أَنَّهُ وَجَدَ مَنْبُوذاً فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، قَالَ: فَجِئْتُ بِهِ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى أَخْذِ هَذِهِ النَّسَمَةِ؟ فَقَالَ: وَجَدْتُهَا ضَائِعَةً، فَأَخَذْتُهَا، فَقَالَ لَهُ عَرِيفُهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّهُ رَجُلٌ صَالِحٌ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَكَذَلِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: اذْهَبْ فَهُوَ حُرٌّ، وَلَكَ وَلاَؤُهُ، وَعَلَيْنَا نَفَقَتُهُ. [خ: الشهادات ـ باب ١٦/ ط١٤٤٨].

* إسناده صحيح.

**ژ سونەینی بابێ جەمیلەیێ (رضي الله عنه) زەلامەكە ژ هۆزا سولەیمی: ل سەر دەمێ عومەرێ كورێ خەتتابی وی مرۆڤەكێ دیتی و هاڤێتی دیت، گۆت: من ئینا دەڤ عومەرێ كورێ خەتتابی، ئینا گۆت: چ تو پالدای ڤی گیانداری هەلگری؟ گۆت: من دیت یێ هاڤێتی بوو، من هەلگرت، بەرپرسێ وی گۆت: ئەی میرێ باوەریداران ئەو زەلامەكێ چاكە[1]، ئینا عومەری گۆتە وی: ئەو یێ وەسایە؟ گۆت: بەلێ، ئینا عومەرێ كورێ خەتتابی گۆت: هەرە ببە و ئەو یێ ئازایە و خودانكرن و پەروەردەكرنا وی بۆ تەیە و نەفەقا وی ل سەر مەیە.**

٧ – باب: النسب والعمل.

**بابەتێ: بنیات و كار.**

[وانظر: ٣٣٣٤ (من بطأ به عمله)]

**بەرێ خۆ بدە (٣٣٣٤) (هەر كەسێ كارێ وی ئەو پاش ئێخست).**



---

(١) ئانكو: ئەو مرۆڤەكێ چاكە باوەر ژێ بكە و ئەز دنیاسم و شادەیێ بۆ ددەم.

## الفصل الثاني: التسمية والعقيقة.

## پشكا دووێ: نافكرن و ئاقیقە[1].

### ١ . باب: (تسموا باسمي ولا تكنوا بكنيتي).

### بابەتێ: ب من ناڤ بكەن و ب ناسناڤێ من ناسناڤ نەكەن.

٢٥٢٧ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ، فَقَالَتِ الأَنْصَارُ: لاَ نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ، وَلاَ نُنْعِمُكَ عَيْناً، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، وُلِدَ لِي غُلاَمٌ، فَسَمَّيْتُهُ الْقَاسِمَ، فَقَالَتِ الأَنْصَارُ: لاَ نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ، وَلاَ نُنْعِمُكَ عَيْناً، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَحْسَنَتِ الأَنْصَارُ، سَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي، فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ**). [خ٣١١٥/ م٢١٣٣].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایێ ئەنساری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەكی ژ مە بچویكەك بۆ بوو، ئینا ناڤێ وی كرە ئەلقاسم، ئینا ئەنساران گۆت، ئەم تە ب ئەبو ئەلقاسم ناڤ ناكەین و ئەم چاڤێت تە ب ڤی ناڤی رۆن ناكەین، ئینا هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بچویكەكێ من یێ ژ دایك بووی و من ب ئەلقاسم ناڤ كرییە، و ئەنسار دبێژن: ئەم تە ب ئەبو ئەلقاسم ناڤ ناكەین و ئەم چاڤێت تە ب ڤی ناڤی رۆن ناكەین، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەنساران باش كر، ب من ناڤ بكەن، و ب ناسناڤێ من ناسناڤ نەكەن، ب راستی تنێ ئەزم لێكڤەكەر)[2].**

٢٥٢٨ - (ق) عَنْ أَنس رضي الله عنه قال: دَعَا رَجُلٌ بِالبَقِيعِ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: لَمْ أَعْنِكَ، قَالَ: (**سَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكْتَنُوا بكُنْيَتِي**). [خ٢١٢١ (٢١٢٠)/ م٢١٣١].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەكی ل بەقیعێ گازی كر ئەی بابێ ئەلقاسمی، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) زڤری، ئینا گۆت: مەبەستا من تو نینی، گۆت: (ب من ناڤ بكەن، و ب ناسناڤێ من ناسناڤ نەكەن).**

---

(١) عەقیقە و دبێژنێ ئاقیق یان حەفتین، چونكی رۆژا حەفتێ دهێتە سەرژێكرن، و هندەك دبێژنێ: ناڤ چونكی د وێ رۆژێدا بچویك دهێتە نافكرن، و ئاقیقە ئەو سەرژێكرییە یێ ل رۆژا حەفتێ پشتی پرچێ زارۆكێ نوی ژ دایك بوویی دهێتە برین، بۆ خێرێ دهێتە سەرژێكرن.

(٢) ئانكو: هەر ئێكی ئەز ل دویف هێژاتییا وی و لایقی وی و ب فەرمانا خودێ ددەمێ، یێ من كێم دایێ ب فەرمانا وییە و یێ من گەلەك دایێ هەر ب فەرمانا وییە.

## ٢ ـ باب: التسمي بأسماء الأنبياء.

## بابەتێ: ناڤكرنا ب ناڤێت پێغەمبەران.

٢٥٢٩ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى رضي الله عنه قَالَ: وُلِدَ لِي غُلاَمٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ، فَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ، ودَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ، وَدَفَعَهُ إِلَيَّ، وَكَانَ أَكْبَرَ وَلَدِ أَبِي مُوسى. [خ٥٤٦٧/ م٢١٤٥].

**ژ ئەبی مووسایی (رضي الله عنه) گۆت: بچویكەكێ من ژ دایك بوو، من ئینا دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا ب ئیبراهیمی ناڤ كر، و ب قەسپەكێ مێژكۆیی كر و دوعا خێرێ و بەرەكەتێ بۆ كر و داڤە ڤ من، و ئەو كوڕێ مەزن بوو یێ ئەبی مووسایی.**

## ٣ ـ باب: تحويل الاسم إلى أحسن منه.

## بابەتێ: گوهۆڕینا ناڤی بۆ یێ ژ وی باشتر.

٢٥٣٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ زَيْنَبَ كَانَ اسْمُهَا بَرَّةَ، فَقِيلَ: تُزَكِّي نَفْسَهَا، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ): زَيْنَبَ. [خ٦١٩٢/ م٢١٤١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: ناڤێ زەینەبێ بەڕە[1] بوو هاتە گۆتن: پەسنا خۆ دكەت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ناڤێ وێ كرە زەینەب.**

٢٥٣١ - (خ) عَنِ ابْنِ المسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ أَبَاهُ جاءَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: (**ما اسْمُكَ**) ؟ قالَ: حَزْنٌ، قالَ: (**أَنْتَ سَهْلٌ**)، قالَ: لاَ أُغَيِّرُ اسْماً سَمَّانِيْهِ أَبِي! قَالَ ابْنُ المسَيَّبِ: فَمَا زَالَتِ الحُزُونَةُ فِينَا بَعْدُ. [خ٦١٩٠].

**ژ ئیبن موسەییبی (رضي الله عنه) ژ بابێ خۆ: بابێ وی هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: (ناڤێ تە چییە)؟ گۆت: حەزن[2]، گۆت: (تو سەهلی) گۆت: ئەز ناڤەكی ناگوهۆڕم بابێ من ئەز پێ ناڤكریم، ئیبن موسەییبی گۆت: بەردەوام پشتی هینگێ زەحمەتی د ناڤمەدا بوو.**

٢٥٣٢ - (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ ابْنَةً لِعُمَرَ كَانَتْ يُقَالُ لَهَا: عَاصِيَةُ، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ): جَمِيلَةَ.[م٢١٣٩].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: كچەكا عومەری ناڤێ وێ عاسییە بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ناڤێ وێ كرە جەمیلە.**

---

(١) بەڕە: ئانكو چاككار.

(٢) حەزن: ئانكو عەردێ هشك و ب زەحمەت، و پێغەمبەری (ﷺ) ڤیا بگوهۆڕیت بۆ رامانا ب ساناهی بەلێ وی نە ڤیا لەوا زەحمەتی د ژیانا واندا یا بەردەوام بوو.

٢٥٣٣ – عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يُغَيِّرُ الاِسْمَ الْقَبِيحَ. [ت٢٨٣٩].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ناڤێ کرێت دگوهۆری.**

**٤ ـ باب: ما يكره من الأسماء.**

**بابەتێ: ئەو ناڤێت نەباش دهێنە دانان.**

٢٥٣٤ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عن النَّبِي (ﷺ) قَالَ: (**أَخْنَعُ الأَسْمَاءِ عَنْدَ اللهِ رَجُلٌ تَسَمَّى بِمَلِكِ الأَمْلاَكِ**). [خ٦٢٠٦ (٦٢٠٥)/ م٢١٤٣]

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (شکەستیترین و بێخێرترین ناڤ ل دەڤ خودایێ هەر ب هێز و مەزن ناڤێ زەلامەکییە خۆ ب شاهینشاه یان شاهێ شاهان ب ناڤ بکەت).**

٢٥٣٥ – (م) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تُسَمِّ غُلاَمَكَ: رَبَاحاً، وَلاَ يَسَاراً، وَلاَ أَفْلَحَ، وَلاَ نَافِعاً**). [م٢١٣٦].

**ژ سەمورەیێ کورێ جوندوبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بچویکێ خۆ نە رەباح و نە یەسار و نە ئەفلەح و نە نافع ب ناڤ نەکە)[1].**

٢٥٣٦ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَرَادَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يَنْهى عَنْ أَنْ يُسَمَّى بِيَعْلَى، وَبِبَرَكَةَ، وَبِأَفْلَحَ، وَبِيَسَارٍ، وَبِنَافِعٍ، وَبِنَحْوِ ذلِكَ. ثُمَّ رَأَيْتُهُ سَكَتَ بَعْدُ عَنْهَا، فَلَمْ يَقُلْ شَيْئاً. ثُمَّ قُبِضَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَلَمْ يَنْهَ عَنْ ذلِكَ. ثُمَّ أَرَادَ عُمَرُ أَنْ يَنْهَى عَنْ ذلِكَ، ثُمَّ تَرَكَهُ. [م٢١٣٨].

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ڤیا پاشڤەلێدانێ ب ناڤکرنا یەعلا و بەرەکە و ئەفلەح و یەسار و نافع و یێت وەکی ڤان بکەت، پاشی پشتی هینگێ من دیت ل وان بێ دەنگ بوو و چو نەگۆت، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر کر و پاشڤەلێدان لێ نە کر، پاشی عومەری ڤیا پاشڤەلێدانێ ل وان بکەت پاشی هێلان.**

---

(١) رەباح ئەوە یێ ڤازانجدار و خوسارەت نەبیت، و یەسار ساناهیبوون و زەحمەت نەبیت، و ئەفلەح سەرفەرازییە و شەرمزاری نەبیت، و نافع ئانکو: مفادارە، و ئەڤ پاشڤەلێدانە یا مەکروهییێیە و نە یا حەرامییێیە، و ئەگەر ژی ئەڤەیە: دا بێ هیڤی هندە جاران چێ نەبیت دەمێ تو دبێژی کا یەسار ئێك بێژیت یەسار نینە یان کا سەرفەراز بێژیت سەرفەرز نینە یان رەباح ئانکو: ڤازانج ئێك بێژیت ڤازانج نینە، دا ئەڤە پەیدا نەبیت، پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤ ناڤە نەباش دانان نەکو حەرام کرن.

## ٥ ـ باب: أحب الأسماء.

## بابەتیّ: خۆشڤیترین ناڤ.

٢٥٣٧ – (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللهِ: عَبْدُ اللهِ، وَعَبْدُ الرَّحْمنِ). [م٢١٣٢].

**ژ ئیبن عومەری (خودیّ ژ وان رازی بیت) گۆت: پیّغەمبەریّ خودیّ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خۆشڤیترین ناڤ ل دەڤ خودیّ عەبدوللاە و عەبدولرەحمانن).**

## ٦ ـ باب: العقيقة والتحنيك.

## بابەتیّ: ئاقیقیّ[1] و میّژكوكرنیّ.

٢٥٣٨ – (خ) عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: مَعَ الْغُلاَمِ عَقِيقَةٌ. [خ٥٤٧١].

**ژ سەلمانیّ كوڕیّ عامری (رضي الله عنه) گۆت: ئاقیق د گەل بچویكی هەیە.**

٢٥٣٩ – عَنْ أُمِّ كُرْزٍ الْكَعْبِيَّةِ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ). [د٢٨٣٤/ ن٤٢٢٦/ جه٣١٦٢/ مي٢٠٠٩].

* صحيح.

**ژ ئوم كورەیزەیا كەعبی (رضي الله عنها) گۆت: من گوه ل پیّغەمبەریّ خودیّ بوو (ﷺ) دگۆت: (دو پەزیّت وەكی ئیّك پیّش كوركیڤە، و كچیّ پەزەك).**

٢٥٤٠ – عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (كُلُّ غُلاَمٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ، تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ، وَيُحْلَقُ، وَيُسَمَّى). [د٢٨٣٨/ ت١٥٢٢/ ن٤٢٣١/ جه٣١٦٥].

* صحيح.

**ژ سەمورەیّ كوری جوندەبی (رضي الله عنه) گۆت: پیّغەمبەریّ خودیّ (ﷺ) گۆت: (هەر بچویكەكیّ دڤیّت ئاقیق بۆ هەبیت، یان سلامەتییا وی یان بەرەڤانییا وی بۆ دایبابیّت وی ب ئاقیقیّڤە گریّدایە، رۆژا حەفتیّ ژ بوونا وی بۆ ڤەدكوژن و سەریّ وی دتراشن و دهیّتە نافكرن).**

---

(١) عەقیقە و دبیّژنیّ ئاقیق یان حەفتین، چونكی رۆژا حەفتیّ دهیّتە سەرژیّكرن، و هندەك دبیّژنیّ: ناڤ چونكی د ویّ رۆژیّدا بچویك دهیّتە نافكرن و ئاقیقە ئەو سەرژیّكرییە یێ ل رۆژا حەفتیّ پشتی پرچیّ زارۆكیّ نوی ژ دایك بوویی دهیّتە برین، بۆ خیّریّ دهیّتە سەرژیّكرن.

٢٥٤١ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَقَّ عَنِ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ كَبْشاً كَبْشاً.[د٢٨٤١/ ن٤٢٣٠]

* صحيح.

[وانظر في التحنيك: ١٧١٤، ٢٥٢٩، ٣٦٠٤، ٣٧٦٧].

- ولفظ النسائي: بِكَبْشَيْنِ كَبْشَيْنِ.

**و ژ ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەریَ خودیَ (ﷺ) پێش هەر ئیَك ژ حەسەن و حوسەینیڤە بەرانەك ئاقیق دا.**

- **و بێژەیا نەسائی: دو بەران دو بەران.**

## ٧ ـ باب: ما جاء في الختان.

## بابەتیَ: ئەوا د سونەتكرنیَدا هاتی.

٢٥٤٢ – (خ) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سُئِلَ ابنُ عَبَّاسٍ: مِثْلُ مَنْ أَنْتَ حينَ قُبِضَ النبيُّ (ﷺ)؟ قال: أنا يَومَئِذٍ مَخْتُونٌ. قالَ: وَكَانُوا لاَ يَخْتِنُونَ الرَّجلَ حَتَّى يُدْرِكَ. [خ٦٢٩٩].

**ژ سەعیدیَ كوڕیَ جوبەیری (رحمه الله) گۆت: پرسیار ژ ئیبن عەباسی هاتە كرن: تو وەكی كیَ بووی دەمیَ پێغەمبەری (ﷺ) وەغەر كری؟ گۆت: ئەز ویَ رۆژیَ یێ سونەتكری بووم و گۆت: و وان زەلام سونەت نەدكر هەتا بالغ ببا.**

٢٥٤٣ – عن أم عطية الأنصارية: أن امرأةً كانت تَخْتِنُ بالمدينةِ، فقال لها النبيُّ صلى الله عليه وسلم: (**لا تَنْهِكي؛ فإن ذلك أحظى للمرأةِ وأحبُّ للبَعْلِ**). [د٥٢٧١][1].

* صحيح، وقال أبوداود: ضعيف.

**ژ ئوم عەتییەیا ئەنساری (رضي الله عنها) گۆت: ژنەكیَ ژن ل مەدینەییَ سونەت دكرن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتیَ: (زێدە نەبڕە، چونكی ئەو بۆ ژنیَ خۆشترە و بۆ زەلامی خۆشڤیترە)[1].**

---

(١) شیخ سالحی ئەڤ فەرموودە هەر ب ویَ هەژماریَ د مالپەریَ خۆدا ئینایە:

٢٥٤٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم يَقُولُ: (الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ، وَالاسْتِحْدَادُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الآبَاطِ).[خ٥٨٩١، م٢٥٧]

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەریَ خودیَ (ﷺ) بوو دگۆت: (سونەتا پێغەمبەران پێنجن: سونەتكرن و رنڤ حێكرن و سمبێل كورتكرن و نینۆك برین، و بنكەفش جێكرن).**

## ٨ ـ باب: الأذان في أذن المولود.

## بابەتێ: بانگدانێ د گوهێ دایكبوویێدا.

٢٥٤٤ ـ . عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَذَّنَ فِي أُذُنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ حِينَ وَلَدَتْهُ فَاطِمَةُ بِالصَّلاَةِ. [د٥١٠٥/ ت١٥١٤].

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

**ژ ئەبی رافعی (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت بانگێ نڤێژێ د گوهێ حەسەنێ كورێ عەلیدا ددا دەمێ فاتیمایێ ئەو بوویی.**

## ٩ ـ باب: ما جاء في تأديب الولد وأمره بالصلاة.

## بابەتێ: ئەوا د راستا تۆرەدانا زارۆكیدا هاتی و فەرمانكرنا وی ب كرنا نڤێژان.

٢٥٤٥ ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لأَنْ يُؤَدِّبَ الرَّجُلُ وَلَدَهُ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِصَاعٍ)**. [ت١٩٥١].

* ضعيف.

**ژ جابرێ كورێ سەمورەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر زەلام زارۆكێ خۆ ب تۆرە بێخیت ب خێرترە ئەو منەكێ[٢] بكەتە خێر).**

٢٥٤٦ ـ عَنْ عَمْرِو بْنِ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِي: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَا نَحَلَ وَالِدٌ وَلَداً مِنْ نَحْلٍ، أَفْضَلَ مِنْ أَدَبٍ حَسَنٍ)**. [ت١٩٥٢].

* ضعيف.

* قال الترمذي: حديث مرسل[٣].

[وانظر: ١١٧١] وفي أمره بالصلاة والتفريق في المضاجع.

---

(١) ئەڤ فەرمووده ڤەگێرانا ئەبو داوودییە، و هەر وی لاواز دانایە، و رامان ئەوە جهێ سونەتكرنێ گەلەك ژێڤەنەكە، ئەو جهێ خۆشییا زەلامی و ژنێیە، و سونەتكرنا ژنێ د ئیسلامێدا جهێ ئەلێكیا زانایانە و مە ل كوردستانێ ئەڤ نارێشە نینە، و كچ ناهێنە سونەتكرن، هەرچەندە ئەم شافعینە ژی، و ل دەڤ شافعییان ـ هەروەكی ئەوەوی (رحمه الله) دبێژیت ـ سونەتكرن واجبە د دەرحەقێ ژن و مێراندا، بەلێ د گەل هندێ ژی ئەیا بەلاڤە د راستا ژنێدا، بەلكی ئەیا نیاسە، لەوا ئەز بۆچۆنا وان زانایان دورستتر دبینم یێت دبێژن نەواجبە د دەرحەقێ ژناندا و خودێ چێتر دزانیت.

(٢) هەر منەك دبیتە (٢,٥) كغم ژ گەنمی یان ژ ڤەسپان یان هەر تشتێ هەبیت.

(٢) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێكێدا نینە.

**ژ عەمرێ كورێ سەعيدێ كورێ عاسى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو بابان دانەك نەدايە كورەكێ خۆ باشتر بيت ژ دانا رەوشتەكێ باش).**

## ١٠ . باب: في الكنى.

## بابەتێ: ناسناڤكرنێ.

٢٥٤٧ - عَنْ حَمْزَةَ بْنِ صُهَيْبٍ: أَنَّ عُمَرَ قَالَ لِصُهَيْبٍ: مَا لَكَ تَكْتَنِي بِأَبِي يَحْيَى، وَلَيْسَ لَكَ وَلَدٌ؟ قَالَ: كَنَّانِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِأَبِي يَحْيَى. [جه٣٧٣٨]

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

**ژ حەمزەيێ كورێ سوهەيبى (رضي الله عنه) گۆت: عومەرى گۆتە سوهەيبى: تە خێرە تو ب بابێ يەحيايى دهێيە نافكرن و تە زارۆك نينن؟ گۆت: پێغەمبەرێ خۆدێ (ﷺ) ئەز ب ناڤێ بابێ يەحيايى ناسناڤ كرم.**

٢٥٤٨ - عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، كُلُّ صَوَاحِبِي لَهُنَّ كُنًى، قَالَ: (**فَاكْتَنِي بِابْنِكِ عَبْدِ اللهِ**). يَعْنِي: ابْنَ اخْتِهَا، فَكَانَتْ تُكَنَّى بِأُمِّ عَبْدِ اللهِ. [د٤٩٧٠/ جه٣٧٣٩].

* صحيح.

**ژ عائيشايێ (رضي الله عنها) وێ گۆت: ئەى پێغەمبەرێ خودێ هەمى هەڤالێت من ناسناڤێ خۆ هەيە، گۆت: (خۆ ب كورێ خۆ عەبدوللايى ـ ئانكو كورێ خويشكا خۆ ـ ناسناڤ بكە).**

## ١١ . باب: مداعبة الأولاد.

## بابەتێ: ترانەيان د گەل بچويكان.

٢٥٤٩ — عن عبدالله بن الحارث قال: كان رسولُ اللهِ (ﷺ) يصفُّ عبدَ اللهِ وعبيدَ اللهِ وكثيرًا بني العباسِ ثم يقولُ (**من سبَق إليَّ فله كذا وكذا**) قال فيستبقونَ إليه فيقعون على ظهرِهِ وصدرِهِ فيُقبِّلُهم ويلتزِمُهم. [حم١٨٣٦][1].

* إسناده ضعيف.

---

**(١) شيخ سالح ئەحمەد شامى ئەڤ فەرمووده هەر ب وێ هەژمارێ د مالپەرێ خۆدا شوينا وێ نينايە:**

٢٥٤٩ - (ق) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صلّى الله عليه وسلّم، والحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ عَلَى عاتِقِهِ، يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ! إِنِّي أُحِبُّهُ، فَأَحِبَّهُ**). [خ٣٧٤٩، م٢٤٢٢].

**ژ بەرائى (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ديت و حەسەنێ كورێ عەلى ل سەر ستۆيێ وى بوو و دگۆت: (ئەى خودا ئەز حەژێ دكەم ڤێجا حەژێ بكە).**

ژ عەبدوللایێ کورێ حارسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) عەبدوللا و عوبەیدوللا کورێت عەباسی رێز دکرن و پاشی دگۆت: **(کی بەری گەهشتە من ئەڤە و ئەڤە بۆ وییە)** گۆت: بەریکانا هەڤ دکرن بۆ دەڤ وی و دا کەڤنە سەر پشتا وی و سینگێ وی، ڤێجا دا وان ماچیکەت و ب نك خۆڤە کێشیت.



## الفصل الأول: الفرائض.

## پشكا ئێكێ: پشكێن ڤەبڕی(١).

### ١ ـ باب: إلحاق الفرائض بأهلها بعد أداء الحقوق.

### بابەتێ: طةهاندنا ثشكيَت ظةبڕي بؤ خودانيَت وان ثشتي ب جهئينانا مافان.

٢٥٥٠ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا بَقِيَ فَهْوَ لأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ**). [خ٦٧٣٢/ م١٦١٥].

**ژ ئيبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بيت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (پشكێت ڤەبڕی بگەهيننە خودانێت وان و ئەوا مايی بۆ زەلامی ژ هەميان نێزيكترە).**

### ٢ ـ باب: ميراث الأبوين والزوجين.

### بابەتێ: ميراتێ دايباب و هەڤژينان.

٢٥٥١ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كانَ المالُ لِلْوَلَدِ، وَكَانَتِ الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ، فَنَسَخَ الله مِنْ ذلِكَ ما أَحَبَّ، فَجَعَلَ لِلذَّكَرِ: مِثْلَ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ، وَجَعَلَ لِلأَبَوَيْنِ: لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسَ، وَجَعَلَ لِلْمَرْأَةِ: الثُّمُنَ والرُّبُعَ، وَلِلزَّوْجِ: الشَّطْرَ وَالرُّبُعَ. [خ٢٧٤٧].

- وفي رواية: وَجَعَلَ لِلأَبَوَيْنِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسَ وَالثُّلُثَ. [خ٤٥٧٨].

**ژ ئيبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بيت) گۆت: مال بۆ كوڕی بوو و وەسيەت ژی بۆ دايبابان بوو، ئينا خودێ ئەوا ڤيای ژ وێ نەسخ كر و پشكا كوڕی وەكی دو پشكێت كچێ دانا، و دايبابان بۆ هەر ئێكی شەشێك دانا، و بۆ ژنێ ژ زەلامی هەشتێك و چارێكە، و بۆ زەلامی ژ ژنێ نيڤ و چارێكە[٢].**

- **و د ڤەگێڕەكێدا: بۆ دايبابان هەر ئێكی شەشێك و سێكە[٣].**

---

(١) مەبەست ئەو پشك و بارمنە يێت هاتينە دەستنيشانكرن يان د قورئانێدا يان د فەرموودەيا پێغەمبەريدا (ﷺ) و ئەو ژی ئەڤەنە: نيڤ و سێك و چارێك و دوسێك و شەشێك و هەشتێك.

(٢) ئانكو: ل دويڤ هەژمارا ميراتگران و نێزيكيا وان پشكێت وان گوهۆڕين ب سەردا دهێت.

(٣) ئانكو: ل دويڤ هەژمارا ميراتگران و نێزيكيا وان پشكێت وان گوهۆڕين ب سەردا دهێت.

## ٣ . باب: ميراث الجد.

## بابەتێ: میراتێ باپیری.

٢٥٥٢ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كَتَبَ أَهْلُ الْكُوفَةِ إِلَى ابْنِ الزُّبَيْرِ فِي الجَدِّ، فَقَالَ: أَمَّا الَّذِي قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً مِنْ هذِهِ الأُمَّةِ خَلِيلاً، لاَتَّخَذْتُهُ**). أَنْزَلَهُ أَباً. يَعْنِي: أَبَا بَكْرٍ.[خ٣٦٥٨].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ ئەبی مولەیكەیی (ﷺ) گۆت: خەلكێ كووفە بۆ ئیبن زوبەیری د راستا میراتێ باپیریدا نڤیسی، ئینا گۆت: هندیكە ئەوا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د راستا وێدا گۆتی: (ئەگەر من ئێك ژ ڤێ ئوممەتێ ئەو تنێ بۆ حەژێكرنا خۆ ژێكرتبا دا وی ژێ گرم)، و ئەو جهێ بابێ دانا، ئانكو: ئەبوبەكر.**

٢٥٥٣ - عَنِ الحَسَنِ: أَنَّ عَلِيّاً كَانَ يُشَرِّكُ الجَدَّ مَعَ الإِخْوَةِ إِلَى السُّدُسِ. [مي٢٩٦٣].

* إسناده صحيح.

**ژ حەسەنی (ﷺ) گۆت: عەلی باپیر د گەل برایان بۆ شەشێكێ پشكدار دكر.**

٢٥٥٤ - عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ يُشَرِّكُ الجَدَّ إِلَى سِتَّةٍ مَعَ الإِخْوَةِ، يُعْطِي كُلَّ صَاحِبِ فَرِيضَةٍ فَرِيضَتَهُ، وَلاَ يُوَرِّثُ أَخاً لِأُمٍّ مَعَ جَدٍّ، وَلاَ أُخْتاً لِأُمٍّ، وَلاَ يَزِيدُ الجَدَّ مَعَ الْوَلَدِ عَلَى السُّدُسِ؛ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ غَيْرُهُ، وَلاَ يُقَاسِمُ بِأَخٍ لِأَبٍ مَعَ أَخٍ لِأَبٍ وَأُمٍّ. وَإِذَا كَانَتْ أُخْتٌ لِأَبٍ وَأُمٍّ، وَأَخٌ لِأَبٍ، أَعْطَى الأُخْتَ النِّصْفَ، وَالنِّصْفَ الآخَرَ بَيْنَ الجَدِّ وَالأَخِ نِصْفَيْنِ. وَإِذَا كَانُوا إِخْوَةً وَأَخَوَاتٍ شَرَّكَهُمْ مَعَ الجَدِّ إِلَى السُّدُسِ. [مي٢٩٦٥].

* فيه انقطاع.

**ژ ئیبراهیمێ نەخەعی (ﷺ) عەلی باپیر د گەل شەش برایان پشكدار دكر و پشكا ڤەبڕی دا هەر ئێك خودان پشكا ڤەبری، و د گەل باپیری میرات نە بۆ برایێ ژ دایكێ دئێخست نە بۆ خویشكا ژ دایكێ، و بۆ باپیری د گەل كوڕان ژ شەشێكێ زێدە نەدكر، ئەو نەبیت میراتگر غەیری كوڕان بن، و برایێ ژ بابێ د گەل برایێ دایبابی پشكدار نەدكر، و ئەگەر خویشكەكا دایبابیبا و برایەك ژ بابێ نیڤ ددا خویشكێ و نیڤا دی د ناڤبەرا باپیری و برایاندا نیڤ ب نیڤێ و ئەگەر برا و خویشك بن د گەل باپیرێ وان بۆ شەشێكێ پشكدار دكەت.**

٢٥٥٥ - عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ: أَنَّهُ كَانَ يُقَاسِمُ بِالجَدِّ مَعَ الإِخْوَةِ إِلَى الثُّلُثِ، ثُمَّ لاَ يُنْقِصُهُ.[مي٢٩٧١].

* إسناده منقطع.

ژ زەیدێ كورێ سابتی (رضي الله عنه) وی بۆ سێكێ پشكداریيا باپیرى د گەل برايان دكر و پاشی ژ فێ كێمتر نەدكر.

## ٤ ـ باب: میراث الولد.

## بابەتێ: میراتێ عەیالی.

٢٥٥٦ – (خ) عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَتَانَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ بِالْيَمَنِ مُعَلِّماً وَأَمِيراً، فَسَأَلْنَاهُ: عَنْ رَجُلٍ تُوُفِّيَ: وَتَرَكَ ابْنَتَهُ وَأُخْتَهُ؟ فَأَعْطَى الابْنَةَ النِّصْفَ، وَالأُخْتَ النِّصْفَ. [خ٦٧٣٤].

ژ ئەسوەدێ كورێ یەزیدی (رحمه الله) گۆت: مەعازێ كورێ جەبەلی وەك ئەمیر و فێركەر ل یەمەنێ هاتە دەڤ مە، مە پرسیارا زەلامەكێ مری ژێ كر: كچا خۆ و خویشكا خۆ ل پاش خۆ هێلاینە؟ ئینا نیڤ دا كچێ و نیڤ دا خویشكێ.

٢٥٥٧ – (خ) عَنْ هُزَيْلِ بْنِ شُرَحْبِيلَ قَالَ: سُئِلَ أَبُو مُوسى: عَنِ ابْنَةٍ، وَابْنَةِ ابْنٍ، وَأُخْتٍ؟ فَقَالَ: لِلابْنَةِ النِّصْفُ، وَلِلأُخْتِ النِّصْفُ، وَأْتِ ابْنَ مَسْعُودٍ فَسَيُتَابِعُنِي. فَسُئِلَ ابْنُ مَسْعُودٍ، وَأُخْبِرَ بِقَوْلِ أَبِي مُوسى، فَقَالَ: لَقَدْ ضَلَلْتُ إِذاً وَما أَنَا مِنَ المُهْتَدِينَ! أَقْضِي فِيهَا بِمَا قَضى النَّبِيُّ (ﷺ): لِلابْنَةِ النِّصْفُ، وَلابْنَةِ الابْنِ السُّدُسُ تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ، وَما بَقِيَ فَلِلأُخْتِ. فَأَتَيْنَا أَبَا مُوسى فَأَخْبَرْنَاهُ بِقَوْلِ ابْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَ: لاَ تَسْأَلُونِي، ما دَامَ هذَا الحَبْرُ فِيكُمْ. [خ٦٧٣٦].

ژ هوزەیلێ كورێ شورەحبیلی (رحمه الله) گۆت: پرسیار ژ ئەبی مووسایی هاتە كرن: ژ كچەكێ و كچا كچەكێ و خویشكەكێ؟ ئینا گۆت: نیڤ بۆ كچێیە و نیڤ بۆ خویشكێیە، و هەرە دەڤ ئیبن مەسعودی ئەو ژی دێ وەكی من بێژیت، پرسیار ژ ئیبن مەسعودی هاتە كرن و ئاخفتنا ئەبی مووسایی بۆ هاتە گۆتن، ئینا گۆت، ئەگەر من وەكر ئەز سەرداچۆم و ئەز نە ژ راستەرێكریانم، ئەز دێ حوكمی تێدا كەم ب وێ یا پێغەمبەری (ﷺ) حوكم تێدا كری: نیڤ بۆ كچێیە، و بۆ كچا كچێ شەشێكە تمامكرنا دو سێكان، و یا مایی بۆ خویشكێیە، ئینا ئەم هاتینە دەڤ ئەبی مووسایی، و مە گۆتنا ئیبن مەسعودی بۆ گۆت، ئینا گۆت: پرسیارێ ژ من نەكەن هندی ئەڤ زانایە د ناڤ هەوەدا بیت.

٢٥٥٨ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: جَاءَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَعُودُنِي وَأَنَا مَرِيضٌ فِي بَنِي سَلِمَةَ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، كَيْفَ أَقْسِمُ مَالِي بَيْنَ وَلَدِي؟ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ شَيْئاً، فَنَزَلَتْ: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ﴾الآيَةَ [النساء:١١]. [ت٢٠٩٦، ٣٠١٥]

* هو في الصحيحين بلفظ قريب (خ٥٦٥١/ م١٦١٦).

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت: ئەز ل بەنی سەلەمە یێ نەخۆش بووم و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هات سەرا من بدەت، ئینا من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز چاوا مالێ خۆ د ناڤبەرا عەیالێ خۆدا لێکڤە بکەم، ب چو تشتا بەرسڤا من نەدا، ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ:** ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ﴾.

## ٥ ـ باب: لا يرث المسلم الكافر.

## بابەتێ: موسلمان میراتگرییا گاوری ناکەت.

٢٥٥٩ – (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يَرِثُ المُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلاَ الْكَافِرُ المُسْلِمَ**). [خ٦٧٦٤ (١٥٨٨)/ م١٦١٤].

**ژ ئوسامەیێ کورێ زەیدی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (موسلمان میراتگرییا گاوری ناکەت و گاور میراتگرییا موسلمانی ناکەت).**

٢٥٦٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ شَتَّى**).[د٢٩١١/ جه٢٧٣١]

* حسن صحيح.

[وانظر: ٢٣٥٠][1].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خەلکێ دو دینێت ژێك جودا میراتگرییا ئێکدو ناکەن).**

## ٦ ـ باب: ميراث الكلالة.

## بابەتێ: میراتێ وی یێ نە باب و نە عەیال پاش خۆ نەهێلایی.

٢٥٦١ – (م) عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ خطَبَ يَوْمَ جُمُعَةٍ، فَذَكَرَ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ)، وَذَكَرَ أَبَا بَكْرٍ، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي لاَ أَدَعُ بَعْدِي شَيْئاً أَهَمَّ عِنْدِي مِنَ الْكَلاَلَةِ، مَا رَاجَعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فِي شَيْءٍ مَا رَاجَعْتُهُ فِي الْكَلاَلَةِ، وَمَا أَغْلَظَ لِي فِي شَيْءٍ مَا أَغْلَظَ لِي فِيهِ، حَتَّى طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِي صَدْرِي، وَقَالَ: (**يَا عُمَرُ، أَلاَ تَكْفِيكَ آيَةُ الصيْفِ الَّتِي فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ**) ؟ وَإِنِّي إِنْ أَعِشْ أَقْضِ فِيهَا بِقَضِيَّةٍ، يَقْضِي بِهَا مَنْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَمَنْ لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ. [م١٦١٧].

---

(١) نەڤە د جابا ئێكێدا ئینە.

**ژ مەعدانێ كوڕێ ئەبی تەلحەیی (رضي الله عنه) گۆت: رۆژا خوتبە عومەرێ كوڕێ خەتتابی خوتبە دخواند، و بەحسێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و بەحسێ ئەبوبەكری كر، پاشی گۆت: ئەز چو تشتان پاش خۆ ناهێلم ژ كەلالەیی گرنگتر بیت و د چو تشتاندا هندی كەلالەیی من زڤرین بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەكرییە و د چو تشتاندا د گەل من توند نەبوویە هندی د كەلالەیدا توند بوویی، هەتا هەردو تلێت خۆ ل سینگێ من دان و گۆت: (ئەی عومەر ما ئایەتا هاڤینێ[1] ئەوا ل دویماهییا سۆرەتا نیساء تێرا تە نینە)، ئەگەر ئەز بژیم ئەز دێ ب رەنگەكی حوكمی تێدا كەم ئەوێت قورئانێ دخوینن و ئەوێت قورئانێ نەخوینن تێ بگەهن.**

٢٥٦٢ – عَنْ جَابِرٍ قَالَ: اشْتَكَيْتُ وَعِنْدِي سَبْعُ أَخَوَاتٍ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَنَفَخَ فِي وَجْهِي، فَأَفَقْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ أُوصِي لِأَخَوَاتِي بِالثُّلُثَيْنِ؟ قَالَ: (**أَحْسِنْ**). قُلْتُ: الشَّطْرُ؟ قَالَ: (**أَحْسِنْ**). ثُمَّ خَرَجَ وَتَرَكَنِي، فَقَالَ: (**يَا جَابِرُ، لاَ أُرَاكَ مَيِّتاً مِنْ وَجَعِكَ هَذَا، وَإِنَّ اللهَ قَدْ أَنْزَلَ فَبَيَّنَ الَّذِي لِأَخَوَاتِكَ فَجَعَلَ لَهُنَّ الثُّلُثَيْنِ**). قَالَ: فَكَانَ جَابِرٌ يَقُولُ: أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِيَّ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ﴾[النساء:١٧٦].[د٢٨٨٧].

* صحيح.

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز نەساخ بووم و من حەفت خویشك هەبوون، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ من، و پفكرە ناڤچاڤێت من، ئینا ئەز هشیار بووم، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز وەسیەتێ ب دو سێكێت مالێ خۆ نەكەم؟ گۆت: (باش بكە) من گرت: (ب نیڤێ) گۆت: (باش بكە) پاشی دەركەفت و ئەز هێلام، ئینا گۆت: (ئەی جابر**

---

**(١) ئایەتا هاڤینێ، ئانكو: ئەوا ل هاڤینێ هاتییە خوارێ و مەبەست پێ ئەڤ ئایەتەیە** ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَنْ تَضِلُّوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾**. ئانكو: [هەی موحەممەد] پرسیارا میراتێ وی مری ئەوێ نە باب و نە باپیر و نە كوڕ و نە نەڤی هەین، ژ تە دكەن [كا چاوانە] بێژە: ژ خۆ خودێ دێ بۆ هەوە میراتێ وی دیاركەت، ئەگەر مرۆڤەك مر و چو زاڕۆك و نەڤی [دویندەهـ] نەبن و چو باب و باپیر ژی نەبن و خویشكەكا [دەیبابی یان یا بابێ نەیا دەیكێ ب تنێ] هەبیت، نیڤا میراتێ وی بۆ خویشكا وییە، و ئەگەر خویشك مر و چو دویندەهـ و باب و باپیر نەبن. برا دبیتە میراتخۆرێ وێ، و ئەگەر ژ دو خویشكان و پتر بن، دوسێكا میراتی بۆ وانە، و ئەگەر خویشك و برا د گەلێك بن، بارا برایی تەمەتی بارا دو خویشكانە. دا هوین مافێ كەسێ نەخۆن و د سەردا نەچن، خودێ بۆ هەوە ڕۆن دكەت، و ب ڕاستی خودێ ب هەمی تشتان پێ زانا و ئاگەهدارە.**

**ئەز نابینم تو دێ د ڤێ نەساخییا خۆدا مری، و ب راستی خودێ یا ئینایە خوارێ و ئەوا بۆ خویشکێت تە دکەڤیت دیار کرییە دو سێك بۆ وانن). گۆت: ژ بەر ڤێ جابری دگۆت: ئەڤ ئایەتە ﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ﴾ د راستا مندا یا هاتییە خوار.**

٢٥٦٣ – عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ يَسْتَفْتُونَكَ فِي الْكَلاَلَةِ، فَمَا الْكَلاَلَةُ؟ قَالَ: (**تُجْزِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ**).

فَقُلْتُ لِأَبِي إِسْحَاقَ: هُوَ مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَدَعْ وَلَداً وَلاَ وَالِداً؟ قَالَ: كَذَلِكَ ظَنُّوا أَنَّهُ كَذَلِكَ. [د٢٨٨٩/ ت٣٠٤٢].

* صحيح.

**ژ ئەبی بەکرێ کورێ عەیاشی (رحمه الله) ژ ئەبی ئیسحاقی ژ بەرائێ کورێ عازبی، گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ پرسیارا میراتێ کەلالەیی ژ تە دکەن کا چاوانە، ئەرێ کەلالە چییە؟ گۆت: (ئایەتا هاڤینێ بەسی تەیە)[1].**

**ئینا من گۆتە ئەبی ئیسحاقی: ئەوە یێ مری باب و عەیال نەی؟ گۆت: وەسا وان هزر دکر ئەو ئەو مرۆڤ بیت.**

## ٧ـ باب: ميراث الولد المنفي في اللعان.

## بابەتێ: میراتێ بچویکێ ژ لیعانێ نەهەبویلکری.

٢٥٦٤ – عَنْ مَكْحُولٍ قَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِيرَاثَ ابْنِ الْمُلاَعَنَةِ لِأُمِّهِ، وَلِوَرَثَتِهَا مِنْ بَعْدِهَا.[د٢٩٠٧].

* صحيح مرسل.

**ژ مەکحولی (رحمه الله) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) میراتێ کورێ ژنا هەڤلەعنەتکری بۆ دایکا وی ئێخست، و بۆ میراتگرێت وێ پشتی وێ.**

## ٨ـ باب: في ميراث الإخوة.

## بابەتێ: میراتێ برایان.

٢٥٦٥ – عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ): أَنَّ أَعْيَانَ بَنِي الْأُمِّ يَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي الْعَلاَّتِ. [ت٢٠٩٥/ جه٢٧٣٩/ مي٣٠٢٧].

* حسن.

(١) مەبەست پێ ئایەتا دویماهییا سۆرەتا نیسائە ئەوا د هاڤینێدا هاتییە خوارێ.

- زاد ابن ماجه والدارمي: يَرِثُ الرَّجُلُ أَخَاهُ لِأَبِيهِ وَأُمِّهِ، دُونَ إِخْوَتِهِ لِأَبِيهِ.

* حسن.

**ژ عەلی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حوکم کر، خویشك و برایێت دایبابی میراتگرییا هەڤدو دکەن ژ بلی برایێت ئێك باب و دایکێت جودا.**

- **ئیبن ماجه و دارەمی زێدە کرییە: زەلام میراتگرییا برایێ خۆ یێ دایبابی دکەت ژ بلی برایێت خۆ یێت بابێ.**

## ٩ . باب: ميراث الجدة.

## بابەتێ: میراتێ داپیرێ.

٢٥٦٦ – عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَتِ الْجَدَّةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى شَيْءٌ، وَمَا عَلِمْتُ لَكِ فِي سُنَّةِ نَبِيِّ اللهِ (ﷺ) شَيْئاً، فَارْجِعِي حَتَّى أَسْأَلَ النَّاسَ. فَسَأَلَ النَّاسَ، فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَعْطَاهَا السُّدُسَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَلْ مَعَكَ غَيْرُكَ؟ فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَأَنْفَذَهُ لَهَا أَبُو بَكْرٍ.
ثُمَّ جَاءَتِ الْجَدَّةُ الْأُخْرَى إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى شَيْءٌ، وَمَا كَانَ الْقَضَاءُ الَّذِي قُضِيَ بِهِ إِلاَّ لِغَيْرِكِ، وَمَا أَنَا بِزَائِدٍ فِي الْفَرَائِضِ، وَلَكِنْ هُوَ ذَلِكَ السُّدُسُ، فَإِنِ اجْتَمَعْتُمَا فِيهِ فَهُوَ بَيْنَكُمَا، وَأَيَّتُكُمَا خَلَتْ بِهِ فَهُوَ لَهَا.[د٢٨٩٤/ ت٢١٠٠/ جه٢٧٢٤/ مي٢٩٨١]

* قال شعيب: صحيح لغيره.

**ژ قەبیسەیێ کوڕێ زوئەیبی (ﷺ) وی گۆت: داپیرەك هاتە دەڤ ئەبوبەکری داخوازا میراتێ خۆ دکر، ئینا گۆتێ: تە چ د کتێبا خودێدا نینە، و من د سونەتا پێغەمبەرێ خودێدا نەزانییە تە تشتەك هەبیت، بزڤرە هەتا ئەز پرسیارا خەلکی دکەم، ئینا پرسیارا خەلکی کر، موغیرەیێ کوڕێ شوعبەیی گۆت: ئەز ل دەڤ پێغەمبەری بووم (ﷺ) شەشێك دا وێ، ئینا ئەبوبەکری گۆت: ئەرێ ئێکێ دی د گەل تە هەیە؟ ئینا موحەممەدێ کوڕێ مەسلەمیی رابوو وەکی وێ گۆت یا موغیرەیێ کوڕێ شوعبەیی گۆتی، ئینا ئەبوبەکری بۆ وێ ب جهـ ئینا و شەشێك دایێ.**

**پاشی داپیرا دی (ژ لایێ بابێڤە) هاتە دەڤ عومەرێ کوڕێ خەتتابی داخوازا میراتێ خۆ دکر، ئینا گۆت: تە چ د کتێبا خودێدا نینە، و ئەو حوکم نەهاتییە کرن بۆ ئێکا دی**

نەبیت، و ئەز چو پشكان د میراتیدا زێدە ناكەم، فێجا هەما هەر ئەو شەشێكە ئەگەر هوین د گەلێك كۆم ببن ئەو بۆ هەوە هەردوكایە، و هەر ئێك ژ هەوە ب تنێ بوو ئەو بۆ وێیە.

## ١٠ ـ باب: في العصبة.

## بابەتێ: عەسەبەیان[1].

٢٥٦٧ – عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ قَيْسٍ: أَنَّ عُمَرَ قَضَى فِي أَهْلِ طَاعُونِ عَمَوَاسَ . أول طَاعُونٍ فِي الإِسْلاَمِ . أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا كَانُوا مِنْ قِبَلِ الْأَبِ سَوَاءً، فَبَنُو الْأُمِّ أَحَقُّ، وَإِذَا كَانَ بَعْضُهُمْ أَقْرَبَ مِنْ بَعْضٍ بِأَبٍ، فَهُمْ أَحَقُّ بِالْمَالِ. [مي٣٠٢٥].

* إسناده صحيح.

ژ زەحاكێ كورێ قەیسی (رضي الله عنه) گۆت: عومەری حوكم د خەلكێ تاعوونا عەمواسدا كر، تاعوونا ئێكێ بوو د ئیسلامێدا، ئەگەر ژ لایێ بابێڤە وەكی ئێك بن، كورێت ئێك دایكێ هەژیترن، و ئەگەر هندەك ژ وان ب بابێ ژ هندەكێت دی نێزیكترن ئەو بۆ مالی هەژیترن.

٢٥٦٨ – عَن إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ: الْأُمُّ عَصَبَةُ مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ، وَالْأُخْتُ عَصَبَةُ مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ. [مي٣٠٢٩]

* منقطع، رجاله ثقات.

ژ ئیبراهیمی (رحمه الله) گۆت: عەبدوللایێ كورێ مەسعودی گۆت: دایك عەسەبەیە بۆ وی یێ عەسەبە نەی و خویشك عەسەبەیە بۆ وی یێ عەسبە نەی.

## ١١ ـ باب: الأخوات مع البنات عصبة.

## بابەتێ: خویشك د گەل كچان عەسەبەنە.

٢٥٦٩ – عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: قَضَى مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ بِالْيَمَنِ، فِي بِنْتٍ وَأُخْتٍ، فَأَعْطَى الْبِنْتَ النِّصْفَ، وَالْأُخْتَ النِّصْفَ. [مي٢٩٢١].

* إسناده صحيح على شرط البخاري.

ژ ئەسوەدێ كورێ یەزیدی (رحمه الله) گۆت: مەعازێ كورێ جەبەلی ل یەمەنێ حوكم د راستا كچ و خویشكەكێدا كر، كچێ نیف دایێ و خویشكێ نیف دایێ.

[1] عەسەبە: خوینا مرینە ژ زەلامان ئەوێت میراتخۆر و پشكا وان نە دیاركری و مالێ ژ میراتخۆرێت مایی دگەهیتە وان.

## ١٢ ـ باب: مسألة أحد الزوجين مع الأبوين (الغراوين)(١).

## بابەتیٚ: پرسا ئێك ژ هەڤژینان د گەل دایبابان (دو ستێرێت رۆن).

٢٥٧٠ – عن ابراهيم قال: قال عبدالله بن مسعود: كان عمرُ إذا سلك بنا طريقًا، وجدناه سهلًا، وإنه قال في زوجٍ وأبوَين: للزوجِ النصفُ وللأمِّ ثلثُ ما بقِيَ(٢). [مي٢٩٠٧].

* اسناده ضعيف.

**ژ ئیبراهیمی (رحمه الله) گۆت: عەبدوللایێ كورِیٚ مەسعودی گۆت: ئەگەر عومەری رێكەك دابا بەر مە، مە ب ساناهی ددیت و ئەوی د راستا زەلام و دایبابان‌دا گۆت: نیڤ بۆ زەلامییە و سێكا مایی بۆ دایكێیە.**

٢٥٧١ - عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ الجَرْمِيِّ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ، قَالَ فِي امْرَأَةٍ وَأَبَوَيْنِ: لِلْمَرْأَةِ الرُّبُعُ، وَلِلْأُمِّ ثُلُثُ مَا بَقِيَ. [مي٢٩٠٩]

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی موهەللەبیٚ جەرمی (رحمه الله) گۆت: عوسمانیٚ كورِیٚ عەففانی د راستا ژنەكیٚ و دەیبابان‌دا گۆت: چارێك بۆ ژنێیە و سێكا مایی بۆ دایكێیە.**

## ١٣ ـ باب: في المشرّكة.

## بابەتیٚ: هەڤپشككرنیٚ.

٢٥٧٢ - عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ: فِي زَوْجٍ، وَأُمٍّ، وَإِخْوَةٍ لِأَبٍ وَأُمٍّ، وَإِخْوَةٍ لِأُمٍّ؟ قَالَ: كَانَ عُمَرُ وَعَبْدُ اللهِ وَزَيْدٌ يُشَرِّكُونَ، وَقَالَ عُمَرُ: لَمْ يَزِدْهُمُ الأَبُ إِلاَّ قُرْباً. [مي٢٩٢٤].

* إسناده صحيح.

---

(١) غەراومین، ئانكو: دو پرسێت بەلاڤ و ناڤدار و رۆن وەكی ستێران.

(٢) شیخ سالح شامی نەڤ فەرموودەیە هەر ب وێ هەژمارێ شوینا وێ د مالپەرێ خۆدا ئینایە:

٢٥٧٠ – عن سعيد بن المسيب: أنه سئل عن رجل ترك امرأته وأبويه؟ فقال: قسمها زيد بن ثابت من أربعة. [مي ٢٩٠٨].

* إسناده صحيح.

**ژ سەعیدیٚ كورِیٚ موسەییەبی (رحمه الله) پرسیارا زەلامەكی ژیٚ هاتە كرن ژنا خۆ و دایبابێت خۆ پاش خۆ هێلایی؟ ئینا گۆت: زێدی ئێك ژ چواران بۆ ئێخست (ئانكو: چارێك دایێ).**

**ژ ئيبراهيمێ نەخەعى (ﷺ) د راستا زەلامى و دايك و برايێت دايبابى و برايێت دايكێدا گۆت: عومەرى و عەبدوللايى و زەيدى هەڤپشك دكرن، و عومەرى گۆت: بابێ ژ نێزيكبوونێ پێڤەتر ژ وان زێدە نەكرييە.**

## ١٤ ـ باب: في الأكدرية.

## بابەتێ: ئەكدەرييێ[1].

٢٥٧٣ – عَنْ قَتَادَةَ: أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ قَالَ فِي أُخْتٍ، وَأُمٍّ، وَزَوْجٍ، وَجَدٍّ، قَالَ: جَعَلَهَا مِنْ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ: لِلْأُمِّ سِتَّةٌ، وَلِلزَّوْجِ تِسْعَةٌ، وَلِلْجَدِّ ثَمَانِيَةٌ، وَلِلْأُخْتِ أَرْبَعَةٌ. [مي٢٩٧٣].

* إسناده صحيح.

**ژ قەتادەيى (ﷺ) گۆت: زەيدێ كوڕێ سابتى د راستا خويشكەك و دايك و زەلام و باپيرەكيدا گۆت: كرنە بيست و حەفت پشك، شەش بۆ دايكێ و نەهـ بۆ زەلامى و هەشت بۆ باپيرى و چوار بۆ خويشكێ.**

## ١٥ ـ باب: في العول.

## بابەتێ: زێدەكرنا پشكان[2].

٢٥٧٤ – عَنْ شُرَيْحٍ: فِي امْرَأَةٍ تَرَكَتْ: زَوْجَهَا، وَأُمَّهَا، وَأُخْتَهَا لِأَبِيهَا وَأُمِّهَا، وَأُخْتَهَا لِأَبِيهَا، وَإِخْوَتَهَا لِأُمِّهَا:

جَعَلَهَا مِنْ سِتَّةٍ، ثُمَّ رَفَعَهَا فَبَلَغَتْ عَشْرَةً: لِلزَّوْجِ النِّصْفُ: ثَلَاثَةُ أَسْهُمٍ، وَلِلْأُخْتِ مِنَ الْأَبِ وَالْأُمِّ النِّصْفُ: ثَلَاثَةُ أَسْهُمٍ، وَلِلْأُمِّ السُّدُسُ: سَهْمٌ، وَلِلْإِخْوَةِ مِنَ الْأُمِّ الثُّلُثُ: سَهْمَانِ، وَلِلْأُخْتِ مِنَ الْأَبِ: سَهْمٌ تَكْمِلَةُ الثُّلُثَيْنِ. [مي٢٩٣٨].

* إسناده صحيح.

---

(١) ئەكدەرييە: پرسەكا ميراتزانێيە، ئەو پرسە يا د ميراتێ ژنا مريدا زەلام و دايك و باپير و خويشكا وێ تێدا كۆم دبن.

(٢) عەول: زێدەكرنا پشكانە ل سەر بنياتێ پرسێ، چونكى پشتى لێكڤەكرنێ ل سەر پشكێت وان وەكى بنياتێ پرسێ دەرناكەڤيت و زێدە دبن، ئەو زێدەيى دبێژنێ عەول، بۆ نموونە: ئەگەر زەلامەك بمريت و دايك و باب و چوار كچ و ژنا خۆ پاش خۆ هێلابن: بۆ بابێ شەشێكە و بۆ دايكێ شەشێكە و بۆ ژنێ هەشتێكە و دو سێك بۆ هەر چوار كچانە، و بابەت ل سەر بنياتێ (٢٤) پشكان چارەسەر دبيت، بنياتى ل سەر شەشێكا لێكڤەكە، بابێ (٤) پشك دگەهنێ و ل سەر شەشێكا دايكێ ديسا (٤) پشك دگەهنێ و ل سەر هەشتێكا ژنێ (٣) پشك دگەهنێ و ل سەر دو سێكێت كچان پێكڤە (١٦) پشك دگەهنە وان، ئەگەر ڤان پشكان كۆم بكەين (٤+٤+٣+١٦) دێ بنە (٢٧) نە (٢٤)، و ئەو ب خۆ بنياتێ پرسێ (٢٤)ە پشتى لێكڤەكرنێ بوونە (٢٧)، ئاها دبێژنە ڤێ عەول، زێدەكرنا پشكان.

ژ شورەیحی (ڕەحمەتی لێ بیت) د راستا ژنەكێدا مێرێ خۆ و دایكا خۆ و خویشكا خۆ یا دایبابی و خویشكا خۆ یا بابێ و برایێت خۆ یێت بابێ پاش خۆ هێلابن، ئەڤە كر:

كرنە شەش پشك پاشی بلندكرن كرنە دەه پشكا، نیڤ بۆ زەلامییە سێ پشك و نیڤ بۆ خویشكا دایبابی سێ پشك و شەشێك بۆ دایكێیە پشكەك و سێك بۆ برایێت ژ دایكێنە و پشكەك بۆ خویشكا وێ یا بابێیە تمامكەرا دو سێكان.

## ١٦ . باب: في الرد.

## بابەتێ: بۆ زڤراندن[1].

٢٥٧٥ – عن عبدالله بن مسعود: في ابنة، وابنة ابنٍ، قال: النصف والسُّدس، وما بقي فرد على البنت.[مي٢٩٨٨][2].

* اسناده ضعيف.

ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (ڕەزایا خودێ لێ بیت) د راستا كچەكێ و كچا كچەكێدا گۆت: نیڤ و شەشێكە و یا مایی بۆ كچێ دزڤریت.

٢٥٧٦ – عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ: أَنَّهُ أُتِيَ فِي إِخْوَةٍ لِأُمٍّ، وَأُمٍّ؟ فَأَعْطَى الْإِخْوَةَ مِنَ الْأُمِّ الثُّلُثَ، وَالْأُمَّ سَائِرَ الْمَالِ، وَقَالَ: الْأُمُّ عَصَبَةُ مَنْ لاَ عَصَبَةَ لَهُ. [مي٢٩٨٩].

* موقوف، إسناده صحيح.

---

(١) رەد د میراتگرییێدا نەڤەیە بارا میراتگران زێدە ببیت و پشك كێم ببن بەروڤاژی عەولێیە بار تێدا كێم دبن و پشك زێدە دبن.

(٢) شێخ سالحێ شامی و هەر ب وێ هەژمارێ نەڤ فەرمووده شوینا وێ د مالپەرێ خۆدا ئینایە:

٢٥٧٥ – عن حيَّان بن سُليمانَ قالَ: كنتُ عند سويدِ بنِ غَفْلَة، فجاءَهُ رجلٌ فسأله عن فريضةِ رجلٍ تركَ ابنَته وامرأته، قالَ: أنا أُنبئكَ قَضاءَ عليٍّ، قالَ: حسْبي قضاءُ عليٍّ، قالَ: قَضى عليٌّ لامرأتِه الثُّمنُ، ولابنتِهِ النصفُ، ثمَّ ردَّ البقيةَ على ابنتِهِ.[مي ٣٠٦٣]

* إسناده صحيح.

ژ حەییانێ كوڕێ سولەیمانی (ڕەحمەتی لێ بیت) گۆت: ئەز ل دەڤ سوومیدێ كوڕێ غەفلەیی بووم، زەلامەك هاتە دەڤ پرسیارا میراتێ زەلامەكی ژێ كر كچا خۆ و ژنا خۆ پاش خۆ هێلابن، گۆت: ئەز دێ حوكمێ عەلی بۆ تە بێژم، گۆت: ئەز ب حوكمێ عەلی رازیمە، گۆت:عەلی ب هەشتێكێ بۆ ژنێ و ب نیڤێ بۆ كچێ حوكم كر پاشی یا مایی بۆ كچێ زڤراند.

**ژ عەلقەمەی (رحمه الله) ژ عەبدوللایی گۆت: پرسەك ئینا دەڤ د راستا برایێت دایكێدا و دایكەكێدا؟ ئینا سێك دا برایێت دایكێ و یا مایی دا دایكێ، و گۆت: دایك عەسەبەیە بۆ یێ عەسەبە نەبیت.**

٢٥٧٧ - عَنِ عامِرٍ الشَّعْبِيِّ: سئل عَنْ رَجُلٍ مَاتَ وَتَرَكَ ابْنَتَهُ، لاَ يُعْلَمُ لَهُ وَارِثٌ غَيْرُهُمَا؟ قَالَ: لَهَا الْمَالُ كُلُّهُ. [مي ٢٩٩٠].

* إسناده صحيح.

**ژ عامرێ شەعبی (رحمه الله) پرسیارا زەلامەكی ژێ هاتە كرن مربیت كچا خۆ پاش خۆ هێلابیت؟ گۆت: هەمی مال بۆ وێیە.**

## ١٧ . باب: ميراث المولود.

## بابەتێ: میراتێ زارۆكی.

٢٥٧٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا اسْتَهَلَّ الْمَوْلُودُ وُرِّثَ**). [د٢٩٢٠].

* صحيح.

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر بچویكی دەنگ ژێ هات میرات دگەهیتێ).**

٢٥٧٩ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ وَالْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ، قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ يَرِثُ الصَّبِيُّ حَتَّى يَسْتَهِلَّ صَارِخاً**).

قَالَ: وَاسْتِهْلاَلُهُ: أَنْ يَبْكِيَ، أَوْ يَصِيحَ، أَوْ يَعْطِسَ. [جه٢٧٥١]

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی و میسوەرێ كورێ مەخرەمەیی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بچویك میرات بۆ ناكەڤیت هەتا دەنگێ وی بلند نەبیت).**

**گۆت: ئیستهلال: ئانكو بكەتە گری یان بكەتە ڤیژی یان ب بێهنژیت.**

## ١٨ . باب: ميراث الغرقى والقتلى.

## بابەتێ: میراتێ خەندقی و كوشتییان.

٢٥٨٠ - عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: كُلُّ قَوْمٍ مُتَوَارِثِينَ، عَمِيَ مَوْتُهُمْ فِي هَدْمٍ، أَوْ غَرَقٍ، فَإِنَّهُمْ لاَ يَتَوَارَثُونَ، يَرِثُهُمُ الأَحْيَاءُ. [مي٣٠٨٧].

* إسناده حسن.

**ژ زەیدێ کوڕێ سابتی (رضي الله عنه) گۆت: هەمی کەسێت بۆ ئێکدو میراتگر، ئەگەر مرنا وان ژ بەر سەرداهاتنەکێ یان خەندقاندنەکێ نەهاتە زانین کا کی بەری کێ مرییە ئەو میراتگرییا ئێکدو ناکەن، و یێت ساخ میراتگرییا وان دکەن.**

٢٥٨١ - عَنْ يَحْيَى بْنِ عَتِيقٍ قَالَ: قَرَأْتُ فِي بَعْضِ كُتُبِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ العَزِيزِ: فِي الْقَوْمِ يَقَعُ عَلَيْهِمُ البَيْتُ، لاَ يُدْرَى أَيُّهُمَا مَاتَ قَبْلُ؟ قَالَ: لاَ يُوَرَّثُ الْأَمْوَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ، وَيُوَرَّثُ الْأَحْيَاءُ مِنَ الْأَمْوَاتِ. [مي٣٠٨٨].

* إسناده صحيح.

**ژ یەحیایێ کوڕێ عەتیقی (رحمه الله) گۆت: من د هندە نفیسارێت عومەرێ کوڕێ عەبدولعەزیزیدا خواند دەربارەی ئەو کەسێت خانی ب سەر واندا هاتییە خوار و نەهاتبیتە زانیین کا کی بەری مرییە؟ گۆت: نابنە میراتگرێت ئێکدو و یێت ساخ میراتخۆرێت مریانن.**

## ١٩ . باب: ميراث الخنثى.

### بابەتێ: میراتێ نێرەمێیێ.

٢٥٨٢ - عَنْ عَلِيٍّ: فِي الرَّجُلِ يَكُونُ لَهُ مَا لِلرَّجُلِ وَمَا لِلْمَرْأَةِ، مِنْ أَيِّهِمَا يُوَرَّثُ؟ فَقَالَ: مِنْ أَيِّهِمَا بَالَ؟[مي٣٠١٢].

* مرسل رجاله ثقات.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامی ئەو هەبیت یێ زەلامان هەی و ژنان هەی دێ ب کیژ ژ وان میراتی وەرگریت؟ گۆت: ب کیژکێ ژ وان بمیزیت.**

## ٢٠ . باب: ميراث ذوي الأرحام.

### بابەتێ: میراتێ کەسوکارێت ژ لایێ ژنانڤە.

٢٥٨٣ - عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**ابْنُ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْهُمْ**).[د٥١٢٢].

* صحيح.

**ژ ئەبی مووسایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خوارزایێ خەلکێ ژ وانە).**

٢٥٨٤ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الْخَالُ وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ**).[ت٢١٠٤/ مي٣٠٢٠].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (﵂) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خال میراتگرێ وییە یێ میراتگر بۆ نەبن).**

٢٥٨٥ - عَنْ زِيَادٍ قَالَ: أُتِيَ عُمَرُ فِي عَمٍّ لِأُمٍّ، وَخَالَةٍ، فَأَعْطَى الْعَمَّ لِلْأُمِّ الثُّلُثَيْنِ، وَأَعْطَى الْخَالَةَ الثُّلُثَ.[مي٣٠٢١].

**ژ زیادی (﵁) گۆت: مامێ دایكێ و خالەتەك ئینانە دەڤ عومەری، ئینا دو سێك دانە مامێ دایكێ و سێك دا خالەتێ.**

٢٥٨٦ - عَنِ الْحَسَنِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ أَعْطَى الْخَالَةَ الثُّلُثَ، وَالْعَمَّةَ الثُّلُثَيْنِ. [مي٣٠٢٢].

* إسناده منقطع.

**ژ حەسەنی (﵁) گۆت: عومەرێ كوڕێ خەتتابی سێك دا خالەتێ و دو سێك دانە مەتێ.**

٢٥٨٧ - عَنْ مَسْرُوقٍ: فِي رَجُلٍ تُوُفِّيَ وَلَيْسَ لَهُ وَارِثٌ؛ إِلاَّ ابْنَةُ أَخِيهِ وَخَالُهُ، قَالَ: لِلْخَالِ نَصِيبُ أُخْتِهِ، وَلاِبْنَةِ الْأَخِ نَصِيبُ أَبِيهَا. [مي٣١٠٠].

* إسناده صحيح.

**ژ مەسروقی (﵁) گۆت: زەلامەك مری بیت و چو میراتگر نەبن برازایا وی و خالێ وی نەبیت، گۆت: بارا خویشكا وی بۆ خالێ وییە و برازایا وی بارا بابێ وێ بۆ وێیە.**

## ٢١ ـ باب: في ميراث المرتد.

## بابەتێ: میراتێ كەسێ خرپایی (ژ ئیسلامێ دەركەفتی).

٢٥٨٨ - عَنْ أَبِي عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ: أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ جَعَلَ مِيرَاثَ الْمُرْتَدِّ لِوَرَثَتِهِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ. [مي٣١١٧].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی عەمرێ شەیبانی (﵁) گۆت: عەلییێ كوڕێ ئەبی تالبی میراتێ كەسێ خرپایی (ژ ئیسلامێ دەركەفتی) دا میراتگرێت وی ژ موسلمانان.**

## ٢٢ ـ باب: إبطال ميراث القاتل.

## بابەتێ: بێبەهركرنا كوژەكی ژ میراتی.

٢٥٨٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْقَاتِلُ لاَ يَرِثُ**).[ت٢١٠٩/ جه٢٦٤٥].

* صحيح.

**ژ ئەبى هورەيرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: (كوژەك بێ بەهرە ژ ميراتى).**

## ٢٣ . باب: ميراث الزوجين من الدية.

**بابەتێ: ميراتێ هەڤژينان ژ خوينێ.**

٢٥٩٠ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ، قَتَلَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا زَوْجٌ وَوَلَدٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) دِيَةَ الْمَقْتُولَةِ عَلَى عَاقِلَةِ الْقَاتِلَةِ، وَبَرَّأَ زَوْجَهَا وَوَلَدَهَا، قَالَ: فَقَالَ عَاقِلَةُ الْمَقْتُولَةِ: مِيرَاثُهَا لَنَا؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ، مِيرَاثُهَا لِزَوْجِهَا وَوَلَدِهَا)**. [د٤٥٧٥/ جه٢٦٤٨].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللايى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: دو ژنان ژ هوزەيلييان، ئێكێ يا دى كوشت، و هەر ئێكێ ژ وان زەلامەك و كورەك هەبوو، ئينا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خوينا كوشتييێ ئێخستە سەر عەشيرا كوژەكێ و چو نەئێخستە سەر زەلام و كورێ وێ، ئينا عەشيرا كوشتييێ گۆت: ميراتێ وێ بۆ مەيە؟ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەخێر، ميراتێ وێ بۆ زەلام و كورێ وێيە).**

## ٢٤ . باب: ميراث ولد الزنى.

**بابەتێ: ميراتێ كورێ زنايێ.**

٢٥٩١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(أَيُّمَا رَجُلٍ عَاهَرَ بِحُرَّةٍ أَوْ أَمَةٍ، فَالْوَلَدُ وَلَدُ زِنًى، لاَ يَرِثُ وَلاَ يُورَثُ)**. [ت٢١١٣/ جه٢٧٤٥].

* حسن.

**ژ عەبدوللايێ كورێ عەمرى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر زەلامەكێ زنايێ د گەل ژنەكا ئازا يان كۆلە بكەت بچويكێ ژێ دبيت بچويكێ زنايێيە، نە ميراتگرييا وى دهێتە كرن و نە ئەو ميراتگرييا وى دكەت).**

٢٥٩٢ – عن الحسن قال: ابن الملاعنة مثل ولد الزنى: ترثه أمه وورثته أمه. [مي٣١٤٩][1].

---

(١) شێخ سالحێ شامى هەر ب وێ هەژمارێ ئەڤ فەرمووده د مالپەرێ خۆدا ئينايە:

٢٥٩٢ – عن الحكم: أنَّ ولدَ الزنى، لا يرثُه الذي يدَّعيه، ولا يرثُه المولودُ.[مي٣١٤٦].

* إسناده صحيح.

* إسناده ضعيف.

**ژ حەسەنى (ﷺ) گۆت: بچویكێ مولاعەنێ وەكى بچویكێ زنایێیە، دایكا وى میراتگرییا وى دكەت و میراتگرێت دایكا وى میراتگرێت وینە.**

## ٢٥ ـ باب: الدين قبل الوصية.

**بابەتێ: دانا دەینى بەرى ب جهئینانا وەسیەتێیە.**

٢٥٩٣ – عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِالدَّيْنِ قَبْلَ الْوَصِيَّةِ، وَأَنْتُمْ تَقْرَؤُونَهَا: ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ﴾[النساء:١٢]، وَإِنَّ أَعْيَانَ بَنِي الْأُمِّ لَيَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي الْعَلاَّتِ.[ت٢٠٩٤/ جه٢٧١٥]

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

**ژ عەلى (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرى وەسیتێ فەرمانا دانا دەینى دكر و هوین دخوینن: ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ﴾ و برا و خویشكێت ئێك دایك میراتگرییا ئێكدو دكەن نە برا و خویشكێت دایكێت جودا.**

## ٢٦ ـ باب: ما جاء في تعليم الفرائض.

**بابەتێ: ئەوا د راستا فێركرنا میراتخوازییێدا هاتى.**

٢٥٩٤ – عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: لَوْ هَلَكَ عُثْمَانُ وَزَيْدٌ فِي بَعْضِ الزَّمَانِ، لَهَلَكَ عِلْمُ الْفَرَائِضِ، لَقَدْ أَتَى عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ وَمَا يَعْلَمُهَا غَيْرُهُمَا. [مي٢٨٩٤].

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبن شیهابى (ﷺ) گۆت: ئەگەر عوسمان و زەید د دەمەكیدا مربان دا زانینا میراتگرییێ بەرزەبیت، دەمەك ب سەر خەلكیدا هات ژ وان پێڤەتر كەسێ دى میراتگرى نەدزانى.**

٢٥٩٥ – عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(تَعَلَّمُوا الْعِلْمَ وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ، تَعَلَّمُوا الْفَرَائِضَ وَعَلِّمُوهَا النَّاسَ، تَعَلَّمُوا الْقُرْآنَ وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ، فَإِنِّي امْرُؤٌ مَقْبُوضٌ، وَالْعِلْمُ سَيُقْبَضُ، وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ، حَتَّى يَخْتَلِفَ اثْنَانِ فِي فَرِيضَةٍ، لاَ يَجِدَانِ أَحَداً يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا)**. [مي٢٢٧/ ك٧٩٥٠].

* إسناده صحيح.

---

ژ حەكەمى (ﷺ) بچویكێ زنایێ نەوێ بۆ خۆ ددانیت میراتگرییا وان ناكەت، و بچویك میراتگرییا وى ناكەت.

ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: **(فێری زانینێ ببن و فێری خەلكی بكەن و فێری میراتگرییێ ببن و فێری خەلكی بكەن و فێری قورئانێ ببن و فێری خەلكی بكەن، ئەز مرۆڤەكەم دێ مرم و زانین دێ هێتە كێشان و بەلا دێ بەلاڤ بن هەتا دو د ئەركەكێدا ژێك جواد دبن و هەردو كەسێ نابینن حوكمی د ناڤبەرا واندا بكەت)**.



## الفصل الثاني:الوصايا والوقف

## پشكا دووێ: وەسیەت و وەقف.

### ١ . باب: الترغيب في الوصية.

### بابەتێ: پالدان بۆ وەسیەتكرنێ.

٢٥٩٦ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ، يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ**). [خ٢٧٣٨/ م١٦٢٧].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەحەقێ چو مرۆڤێت موسلمانە تشتەك هەبیت وەسیەتێ پێ بكەت، و دو شەڤان بنڤیت هەكە وەسیەتا وی ل دەڤ وی یا نڤیسی نەبیت).**

### ٢ . باب: وصية النبي (ﷺ).

### بابەتێ: وەسیەتا پێغەمبەری (ﷺ).

٢٥٩٧ - (ق) عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى رضي الله عنهما: هَلْ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَوْصى؟ فَقَالَ: لاَ، فَقُلْتُ: كَيْفَ كُتِبَ عَلَى النَّاسِ الْوَصِيَّةُ، أَوْ أُمِرُوا بِالْوَصِيَّةِ؟ قَالَ: أَوْصى بِكِتَابِ الله. [خ٢٧٤٠/ م١٦٣٤].

[وانظر: ٣٧٠٩ ـ ٣٧١٢، ٣٧١٤م].

**ژ تەلحەیێ كوڕێ موسەریفی (رحمه الله) گۆت: من پرسیار ژ عەبدوللایێ كوڕێ ئەبی ئەوفایی (خودێ ژ وان رازی بیت) كر: ئەرێ پێغەمبەری (ﷺ) وەسیەت ب تشتەكی كر؟ گۆت: نەخێر، ئینا من گۆت: پا چاوا وەسیەت ل سەر خەلكی هاتە نڤیسین یان فەرمانا وان ب وەسیەتێ هاتە كرن؟ گۆت: وەسیەت ب كتێبا خودێ كر.**

### ٣ . باب: الوصية بالثلث

### وەسیەتكرن ب سێكێ

٢٥٩٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قالَ: لَوْ غَضَّ النَّاسُ إِلَى الرُّبُعِ، لأَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (**الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، أَوْ كَبِيرٌ**). [خ٢٧٤٣/ م١٦٢٩].

**ژ ئیبن عەباسی (خودیٚ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەگەر خەلكی وەسیەت ژ سێكیٚ بۆ چارێكیٚ كێم كربا باشتر بوو، چونكی پێغەمبەریٚ خودیٚ (ﷺ) دبێژیت: (سێك، سێك ژی گەلەكە یان یا مەزنە).**

٢٥٩٩ - . (م) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ رَجُلاً أَعْتَقَ سِتَّةَ مَمْلُوكِينَ لَهُ عِنْدَ مَوْتِهِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُمْ، فَدَعَا بِهِمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَجَزَّأَهُمْ أَثْلاَثاً، ثُمَّ أَقْرَعَ بَيْنَهُمْ، فَأَعْتَقَ اثْنَيْنِ، وَأَرَقَّ أَرْبَعَةً، وَقَالَ لَهُ قَوْلاً شَدِيداً. [م١٦٦٨].

وفي رواية: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ أَوْصَى عِنْدَ مَوْتِهِ، فَأَعْتَقَ سِتَّةَ مَمْلُوكِينَ.

**ژ عیمرانیٚ كوریٚ (حصین)ی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەكی دەمیٚ مرنا خۆ شەش كۆلە ئازا كرن و وی چو مال ژ وان پێڤەتر نەبوو، ئینا پێغەمبەریٚ خودیٚ (ﷺ) داخواز كرن و كرنە سیٚ پشك و تیروپشك ئێخستە د ناڤبەرا واندا و دو ئازا كرن و چوار كۆلە هێلان و ئاخفتنەكا دژوار گۆتە وی.**

**و د ڤەگێرەكێدا: زەلامەكی ژ ئەنساران ل مرنا خۆ وەسیەت كر، شەش كۆلە هاتنە ئازاكرن.**

## ٤ . باب: تصرفات المريض.

## بابەتیٚ: كریارێت نەساخی.

٢٦٠٠ - (خ) وَيُذْكَرُ أَنَّ شُرَيْحاً، وَعُمَرَ بْنَ عَبْدِ العَزِيزِ، وَطَاوُساً، وَعَطَاءً، وَابْنَ أُذَيْنَةَ أَجَازُوا إِقْرَارَ الْمَرِيضِ بِدَيْنٍ.

وَقَالَ الْحَسَنُ: أَحَقُّ مَا تَصَدَّقَ بِهِ الرَّجُلُ آخِرَ يَوْمٍ مِنَ الدُّنْيَا، وَأَوَّلَ يَوْمٍ مِنَ الْآخِرَةِ.

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ وَالْحَكَمُ: إِذَا أَبْرَأَ الْوَارِثَ مِنَ الدَّيْنِ بَرِئَ.

وَأَوْصَى رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ أَنْ لاَ تُكْشَفَ امْرَأَتُهُ الْفَزَارِيَّةُ عَمَّا أُغْلِقَ عَلَيْهِ بَابُهَا. [خ. الوصايا، باب ٨].

**دهێتە گۆتن: شورەیحی و عومەریٚ كوریٚ عەبدولعەزیزی و تاووسی و عەتائی و ئیبن ئوزەینە حەڤاندنا نەساخی ب دەینی دورست ددانا.**

**و حەسەنی گۆت: هەژیترین تشتیٚ مرۆڤ باوەر ژ زەلامی بكەت یێ دویماهی رۆژا وی ل دنیایێ و رۆژا ئێكیٚ یا وی ل ئاخرەتیٚ.**

**و ئیبراهیم و حەكەمی گۆت: ئەگەر نەساخی میراتگر ژ دەینی بەری كر ئەو هاتە بەریكرن.**

**و رافعێ كورێ خەدیجی وەسیەتا ژنا خۆ یا فیزاری كر ئەو مالێ وێ دەرگەهـ ژێ گرتی پشتی مرنا وی بەرچاڤ نەكەت، ئانكو: یێ وێیە و هەوجەی شاهدان نینە.**

٢٦٠١ – عَنْ عَامِرٍ قَالَ: يَجُوزُ بَيْعُ الْمَرِيضِ وَشِرَاؤُهُ وَنِكَاحُهُ، وَلاَ يَكُونُ مِنَ الثُّلُثِ. [مي٣٢٦٠].

* إسناده حسن.

**ژ عامری (رحمه الله) گۆت: فرۆتنا نەساخی و كڕینا وی و مارەكرنا وی دورستە و ئەڤە (فرۆتن و كڕین و مارەكرن) د سێكێدا نابیت.**

٢٦٠٢ – عَنِ الْحَارِثِ الْعُكْلِيِّ قَالَ: مَا حَابَى بِهِ الْمَرِيضُ فِي مَرَضِهِ مِنْ بَيْعٍ أَوْ شِرَاءٍ، فَهُوَ فِي ثُلُثِهِ قِيمَةُ عَدْلٍ. [مي٣٢٦١].

* إسناده صحيح.

**ژ حارسێ عوكەیلی (رحمه الله) گۆت: ئەوا نەخۆشی د نەساخییا خۆدا و ژ حەژێكرن كڕین و فرۆتن كری ئەو د سێكا بهاكرنەكا دادپەروەردایە.**

٢٦٠٣ – عَنْ حُمَيْدٍ الطَّوِيلِ: أَنَّ رَجُلاً يُكْنَى أَبَا ثَابِتٍ، أَقَرَّ لاِمْرَأَتِهِ عِنْدَ مَوْتِهِ: أَنَّ لَهَا عَلَيْهِ أَرْبَعَمِائَةِ دِرْهَمٍ مِنْ صَدَاقِهَا، فَأَجَازَهُ الْحَسَنُ. [مي٣٣٠٢].

* إسناده صحيح.

**ژ حومەیدێ تەویل (رحمه الله) زەلامەكی دگۆتنێ ئەبا سابت، د مرنا خۆدا بۆ ژنا خۆ پەسەند كر وێ چوار سەد دینار مارە یێت ل سەر وی هەین، حەسەنی دورست دانا.**

## ٥ ـ باب: الوصاية على اليتيم.

## بابەتێ: وەسیەتێ بۆ ئێتمی.

٢٦٠٤ – (خ) عَنْ نَافِعٍ قَالَ: مَا رَدَّ ابْنُ عُمَرَ عَلَى أَحَدٍ وَصِيَّةً. [خ٢٧٦٧].

**ژ نافعی (رحمه الله) گۆت: ئیبن عومەری وەسیەت ژ كەسێ نەزڤراندییە.**

٢٦٠٥ – عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ، فَقَالَ لَهُ: إِنَّ لِي يَتِيماً وَلَهُ إِبِلٌ، أَفَأَشْرَبُ مِنْ لَبَنِ إِبِلِهِ؟ فَقَالَ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنْ كُنْتَ تَبْغِي ضَالَّةَ إِبِلِهِ، وَتَهْنَأُ جَرْبَاهَا، وَتَلُطُّ حَوْضَهَا، وَتَسْقِيهَا يَوْمَ وِرْدِهَا، فَاشْرَبْ غَيْرَ مُضِرٍّ بِنَسْلٍ، وَلاَ نَاهِكٍ فِي الْحَلْبِ. [ط١٧٣٩].

* إسناده صحيح.

ژ قاسمێ كورێ موحەممەدی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ ئیبن عەباسی و گۆتە وی: من ئێتیمەك یێ هەی و وی حێشتر یێت هەین، ئەرێ ئەز ژ شیرێ حێشترێت وی ڤەخۆم؟ ئینا ئیبن عەباسی گۆتە وی: ئەگەر تو ل حێشترا وی یا بەرزە دگەری و یا گری ڤەتران دكەی و گەرا وان یا ئاڤدانێ چێ دكەی و ب ئاخێ دهنی و رۆژا ئاڤدانێ وان ئاڤ ددەی، شیرێ وان ڤەخۆ بێی زیانێ بگەهینییە تێژكا و زێدە بدۆشی هشك بەكی.

٢٦٠٦ - عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: ابْتَغُوا بِأَمْوَالِ الْيَتَامَى، لاَ تَأْكُلُهَا الصَّدَقَةُ.[هق٦/٢].

ژ عومەرێ كورێ خەتتابی (ڕازیبوونا خودێ لێ بیت) گۆت: مالێ ئێتیمی بێخنە د شۆلیدا بلا زەكات ژێ كێم نەكەت.

٢٦٠٧ - عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: كَانَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها تُزَكِّي أَمْوَالَنَا، وَإِنَّهَا لَيُتْجَرُ بِهَا فِي الْبَحْرَيْنِ. [هق٦/٣].

[وانظر: ٣٣٤٠ في الأكل من مال اليتيم. وانظر: ٣٤٥٧ في كفالة اليتيم].

ژ قاسمێ كورێ موحەممەدی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: (عائیشایێ زەكات ژ مالێ مە ددا و ل بەحەرەینێ بازرگانی پێ دكر.

## ٦ ـ باب: لا وصية لوارث

### بابەتێ: وەسیەت بۆ میراتگری نینە.

٢٦٠٨ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّ اللهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ). [د٢٨٧٠/ ت٢١٢٠/ جه٢٧١٣].

* صحيح.

ژ ئەبی ئومامە (ڕازیبوونا خودێ لێ بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی خودێ هەر ئێكێ خودان ماف مافێ وی یێ دایێ، ڤێجا وەسیەت بۆ میراتگری ناهێتە كرن).

## ٧ ـ باب: الصدقة في الحياة أفضل من الوصية

## بابەتێ: سەدەقە د ژیانێدا بخێرترە ژ وەسیەتێ.

٢٦٠٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، نَبِّئْنِي بِأَحَقِّ النَّاسِ مِنِّي بِحُسْنِ الصُّحْبَةِ؟ فَقَالَ: (**نَعَمْ، وَأَبِيكَ! لَتُنَبَّأَنَّ: أُمُّكَ**) قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (**ثُمَّ أُمُّكَ**) قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (**ثُمَّ أُمُّكَ**) قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (**ثُمَّ أَبُوكَ**).

قَالَ: نَبِّئْنِي يَا رَسُولَ اللهِ عَنْ مَالِي، كَيْفَ أَتَصَدَّقُ فِيهِ؟ قَالَ: (**نَعَمْ، وَاللهِ لَتُنَبَّأَنَّ: أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَأْمُلُ الْعَيْشَ، وَتَخَافُ الْفَقْرَ، وَلاَ تُمْهِلْ، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ نَفْسُكَ هَاهُنَا، قُلْتَ: مَالِي لِفُلاَنٍ، وَمَالِي لِفُلاَنٍ، وَهُوَ لَهُمْ، وَإِنْ كَرِهْتَ**). [جه٢٧٠٦].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ بێژە من كی ژ مرۆڤان پتر هەژی هەڤال باشییا منە؟ گۆت: (بەلێ و ب بابێ تە كەمە[1] دێ بۆ تە هێتە گۆتن، دەیكا تە)، گۆت: پاشی كی؟ گۆت: (پاشی دەیكا تە)، گۆت: پاشی كی؟ گۆت: (پاشی دەیكا تە)، گۆت: پاشی كی؟ گۆت: (پاشی بابێ تە).**

**گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بێژە من د راستا مالێ خۆدا چاوا بكەمە خێر؟ گۆت: (بەلێ ب خودێ كەم دێ بۆ تە هێتە دیاركرن، تو سەدەقێ بدەی و تو یێ ساخلەم بی، و دلێ تە ل سەر بیت، و تە هیڤی هەبیت بژی، و تو ژ هەژارییێ بترسی، و تو گیرۆ نەكەی هەتا رح دگەهیتە ئها ڤێرێ ژ نوی بێژی: مالێ من بۆ بێڤانی و بۆ بێڤانی، و ئەو ب خۆ بۆ وانە خۆ ئەگەر تە پێ نەخۆش ژی بیت).**

## ٨ ـ باب: الرجوع عن الوصية.

## بابەتێ: لێڤەبوون ژ وەسیەتێ.

٢٦١٠ – عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: يُغَيِّرُ صَاحِبُ الْوَصِيَّةِ مِنْهَا مَا شَاءَ غَيْرَ الْعَتَاقَةِ. [مي٣٢٥٣].

* إسناده صحيح.

**ژ شەعبی (رحمه الله) گۆت: خودانێ وەسیەتێ چاوا بڤێت دێ گوهۆریت ئازاكرنا بەندەیی نەبیت.**

٢٦١١ – عَنِ الزُّهْرِيِّ: فِي الرَّجُلِ يُوصِي بِوَصِيَّةٍ، ثُمَّ يُوصِي بِأُخْرَى؟ قَالَ: هُمَا جَائِزَتَانِ فِي مَالِهِ.[مي٣٢٥٧].

(١) ئەوەوی دبێژیت: ئە سویندا ب مەبەستە، دورستە ئەگەر هۆسا بهێتە سەر ئەزمانی و مەبەست پێ سویند ب خۆ نەبیت.

* إسناده صحيح.

**ژ زوهری (رحمه الله) د راستا زەلامەکیدا ب وەسیەتیٚ وەسیەتەك کربیت پاشی ب ئێکا دی وەسیەتیٚ بکەت؟ گۆت: هەردو د مالیٚ ویدا دورستن.**

## ٩ ـ باب: من أوصى بأكثر من الثلث.

## بابەتیٚ: یێ ب سێکیٚ پتر وەسیەتیٚ بکەت.

٢٦١٢ - عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ: فِي رَجُلٍ أَوْصَى وَالْوَرَثَةُ شُهُودٌ مُقِرُّونَ؟ فَقَالَ: لاَ يَجُوزُ. قَالَ الدارمي: يَعْنِي: إِذَا أَنْكَرُوا بَعْدُ. [مي٣٢٣٣]

* إسناده صحيح.

**ژ ئیبراهیمیٚ نەخەعی (رحمه الله) د راستا زەلامەکیدا وەسیەت کربیت و میراتگر د ئامادە بن و پەسەند بکەن، گۆت: نەدورستە، دارامی گۆت: ئانکو ئەگەر وان پشتی هینگیٚ پەسند نەکرن.**

٢٦١٣ - عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَكَمَ وَحَمَّاداً عَنِ الْأَوْلِيَاءِ يُجِيزُونَ الْوَصِيَّةَ، فَإِذَا مَاتَ لَمْ يُجِيزُوا؟ قَالَ: لاَ يَجُوزُ. [مي٣٢٣٤].

* إسناده صحيح.

**ژ شوعبەیی (رحمه الله) گۆت: من پرسیارا حەکەم و حەممادی ژ کەسوکاران کر وەسیەتیٚ دورست ددانن و ئەگەر مر دورست نادانن؟ گۆت: ئەڤە نەیا دورستە.**

## ١٠ ـ باب: الوقف.

## بابەتیٚ: وەقفیٚ.

٢٦١٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ أَصَابَ أَرْضاً بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضاً بِخَيْبَرَ، لَمْ أُصِبْ مالاً قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُ بِهِ؟ قَالَ: (**إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا**).

قالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ: أَنَّهُ لاَ يُبَاعُ وَلاَ يُوهَبُ وَلاَ يُورَثُ، وَتَصَدَّقَ بِهَا فِي الْفقَرَاءِ، وَفِي الْقُرْبى، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالمعْرُوفِ، وَيُطْعِمَ غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ. قَالَ: فَحَدَّثْتُ بِهِ ابْنَ سِيرِينَ، فَقَالَ: غيْرَ مُتَأَثِّلٍ مالاً. [خ٢٧٣٧ (٢٣١٣)/ م١٦٣٢]

- وفي رواية للبخاري: فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**تَصَدَّقْ بِأَصْلِهِ، لاَ يُبَاعُ وَلاَ يُوهَبُ وَلاَ يُورَثُ، وَلكِنْ يُنْفَقُ ثَمَرُهُ**). [خ٢٧٦٤].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عەردەك ل خەیبەرێ گەهشتە عومەرێ کورێ خەتتابی، ئینا هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) فەرمانا وی تێدا بزانیت، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ عەردەك ل خەیبەرێ یێ گەهشتییە من، چو جاران مال نەگەهشتییە من ل دەڤ من ژ وی ب بهاتر بیت، تو چ فەرمانا من تێدا دکەی؟ گۆت: (ئەگەر تە بڤێت بنیاتێ وی بەند بکە و رابگرە و بەرهەمی بکە خێر).**

**گۆت: ئینا عومەری کرە خێر: نە بفرۆشن و نە بکەن دیاری و نە ببیتە میرات، و کرە خێر و سەدەقە بۆ هەژار و کەسوکار و بەندەیان و رێکا خودێ و مێڤانان، و گونەه ل سەر وی نینە یێ سەخبێرییا وێ دکەت ل دویف عەدەتی ژێ بخۆت و بدەت و بۆ خۆ کۆم نەکەت، گۆت: من بۆ ئیبن سیرینی گۆت، ئینا گۆت: وەك مال و سامان کۆم نەکەت و هەلگریت.**

- **و د ڤەگێرا بوخاریدا: ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بنیاتێ وی بکە سەدەقە و خێر، نەدهێتە فرۆتن و نەدهێتە دیاریکرن و نە میرات دهێتە وەرگرتن، بەلێ بەرێ وی دهێتە مەزاختن).**

٢٦١٥ - عَنِ الزُّبَيْرِ: أنه جَعَلَ دُورَهُ صَدَقَةً عَلَى بَنِيهِ، لاَ تُبَاعُ وَلاَ تُوَرَّثُ، وَأَنَّ لِلْمَرْدُودَةِ مِنْ بَنَاتِهِ أَنْ تَسْكُنَ غَيْرَ مُضِرَّةٍ وَلاَ مُضَارٍّ بِهَا، فَإِنْ هِيَ اسْتَغْنَتْ بِزَوْجٍ، فَلاَ حَقَّ لَهَا. [مي٣٣٤٣].

* إسناده صحيح.

[وانظر في الصدقة الجارية: ١٦٣٨].

**ژ زوبەیری (ﷺ): وی خانییێت خۆ بۆ عەیالێت خۆ کرنە خێر و نەهێنە فرۆتن و نەبنە میرات و بۆ یا زڤری (ژ بەردانێ یان ژ مرنا زەلامێ وێ) ژ کچێت وی هەیە ئەو تێدا ئاکنجی ببیت و ب بێ زیان گەهاندنێ و زیان پێ گەهاندنێ و ئەگەر ئەو ب هەڤژینی بێمنەت بوو هینگێ وێ ماف نینە.**



# الكتاب السادس

## البر والصلة بين أفراد الأسرة

# كتێبا شەشێ

## چاكی و باشییا د ناڤبەرا ئەندامێت مالێدا.

## ١ ـ باب: بر الوالدين.

## بابەتێ: باشییا د گەل دایبابان.

٢٦١٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَال: **(أُمُّكَ)**. قالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: **(ثُمَّ أُمُّكَ)**. قالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: **(ثُمَّ أُمُّكَ)**. قالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: **(ثُمَّ أَبُوكَ)**. [خ٥٩٧١/ م٢٥٤٨].

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ کی ژ مرۆڤان پتر هەژی هەڤال باشییا منە؟ گۆت: (دەیکا تە)، گۆت: پاشی کی؟ گۆت: (پاشی دەیکا تە)، گۆت: پاشی کی؟ گۆت: (پاشی دەیکا تە)، گۆت: پاشی کی؟ گۆت: (پاشی بابێ تە).**

٢٦١٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَاسْتَأْذَنَهُ فِي الْجِهَادِ، فَقَالَ: **(أَحَيٌّ وَالِدَاكَ)**؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: **(فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ)**. [خ٣٠٠٤/ م٢٥٤٩].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمرێ کورێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) دەستویری بۆ جیهادێ ژێ خواست، گۆت: (دایبابێت تە د ساخن)؟ گۆت: بەلێ، گۆت: (جیهادێ د واندا بکە)[1].**

٢٦١٨ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(رَغِمَ أَنْفُهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ)** قِيلَ: مَنْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ، أَحَدَهُمَا أَوْ كِلَيْهِمَا، ثُمَّ لَمْ يَدْخُلِ الْجَنَّةَ)**. [م٢٥٥١]. [وانظر: ١٨٠٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دفنا وی ب ئاخێ بکەڤیت[2] پاشی دفنا وی ب ئاخێ بکەڤیت، پاشی دفنا وی ب ئاخێ بکەڤیت، یێ بگەهیتە دایبابێت خۆ و د پیر یان ئێك ژ وان، و ب وان نەچیتە بەحەشتێ).**

---

(١) ئانکو: خۆ بۆ وان بوەستینە هەتا تو وان رازی دکەی.

(٢) ئانکو: بشکێت و رەزیل ببیت.

## ٢ ـ باب: صلة الوالد المشرك.

## بابەتێ: باشییا د گەل بابێ هەڤپشکچێکەر.

٢٦١٩ - (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ: قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهْيَ مُشْرِكَةٌ، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَاسْتَفْتَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، قُلْتُ: إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ وَهْيَ رَاغِبَةٌ، أَفَأَصِلُ أُمِّي؟ قَالَ: (**نَعَمْ، صِلِي أُمَّكِ**). [خ٢٦٢٠/ م١٠٠٣].

وفي رواية للبخاري: فِي عَهْدِ قُرَيْشٍ إِذْ عَاهَدُوا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، وَمُدَّتِهِمْ. [خ٣١٨٣].

**ژ ئەسمائا کچا ئەبیبەکرێ سدیق خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت دەیکا من هاتە دەڤ من، و ئەو ل سەر وەختێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یا هەڤپشکچێکەر بوو، من پرسیارا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر من گۆت: دەیکا من یا هاتییە دەڤ من و حەز دکەت تشتەکی بدەمێ، ئەرێ ئەز باشییێ د گەل دەیکا خۆ بکەم؟ گۆت: بەلێ باشییێ د گەل دەیکا خۆ بکە.**

**و د ڤەگێرا بوخاریدا: د دەمێ پەیمانا قورەیشییاندا وەختێ وان بۆ دەمەکی پەیمانا ئاشتیبوونێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گرێدایی[1].**

## ٣ ـ باب: تحريم عقوق الوالدين.

## بابەتێ: حەرامکرنا دلهێلانا دایبابان.

٢٦٢٠ - (ق) عَنِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ: عُقُوقَ الأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ البَنَاتِ، وَمَنَعَ وَهَاتِ. وَكَرِهَ لَكُمْ: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ المَالِ**).

[خ٢٤٠٨ (٨٤٤)/ م: الأقضية. ٥٩٣ (١٢)].

**ژ موغیرەیێ کورێ شوعبەی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودایێ مەزن ل سەر هەوە یا حەرام کری: دلهێلانا دایکان، و نەهێلانا ب جهئینا تشتێ واجب، و خواستنا تشتێ نەیێ مرۆڤی، و بنئاخکرنا کچان ب ساخی ، و نەهیا هەوە دکەت: ژ گۆتگۆتکان، و پرسیارکرنا زێدە، و مەزاختنا مالی نە د جهێ دورستدا).**

---

(١) ئەڤە ئیشارەتە بۆ سولحا حودەیبییێ، د وی دەمیدا دایکا وێ هاتە مەدینێ و خۆ گەهاندە ئەسمایێ.

٢٦٢١ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ: أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ**)، قِيلَ: يَا رَسُولَ الله، وَكَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟ قَالَ: (**يَسُبُّ الرَّجُلُ أَبَا الرَّجُلِ؛ فَيَسُبُّ أَبَاهُ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ؛ فَيَسُبُّ أُمَّهُ**). [خ٥٩٧٣/ م٩٠].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ژ مەزنترین گونەهێت مەزنە مرۆڤ لەعنەتێ ل دایبابێت خۆ بكەت)، گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ ما مرۆڤ لەعنەتێ ل دایبابێت خۆ دكەت؟ گۆت: (خەبەرا دبێژیتە بابێ مرۆڤی، ئەو ژی خەبەرا دبێژیتە بابێ وی، و خەبەرا دبێژیتە دایكا وی ئەو ژی خەبەرا دبێژیتە دایكا وی).**

## ٤ ـ باب: فضل صلة أصدقاء الوالدين.

## بابەتێ: باشییا د گەل هەڤالێت دایبابان.

٢٦٢٢ – (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ كَانَ إِذَا خَرَجَ إِلَى مَكَّةَ كَانَ لَهُ حِمَارٌ يَتَرَوَّحُ عَلَيْهِ، إِذَا مَلَّ رُكُوبَ الرَّاحِلَةِ، وَعِمَامَةٌ يَشُدُّ بِهَا رَأْسَهُ. فَبَيْنَا هُوَ يَوْماً عَلَى ذلِكَ الْحِمَارِ، إِذْ مَرَّ بِهِ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ: أَلَسْتَ ابْنَ فُلاَنِ بْنِ فُلاَنٍ؟ قَالَ: بَلَى، فَأَعْطَاهُ الْحِمَارَ وَقَالَ: ارْكَبْ هذَا، وَالْعَمَامَةَ، قَالَ: اشْدُدْ بِهَا رَأْسَكَ. فَقَالَ لَهُ بَعْضُ أَصْحَابِهِ: غَفَرَ الله لَكَ! أَعْطَيْتَ هذَا الأَعْرَابِيَّ حِمَاراً كُنْتَ تَرَوَّحُ عَلَيْهِ، وَعِمَامَةً كُنْتَ تَشُدُّ بِهَا رَأْسَكَ! فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ صِلَةَ الرَّجُلِ أَهْلَ وِدِّ أَبِيهِ، بَعْدَ أَنْ يُوَلِّيَ**)، وَإِنَّ أَبَاهُ كَانَ صَدِيقاً لِعُمَرَ. [م٢٥٥٢].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت): وەختێ دچۆ مەكەهێ وی كەرەك هەبوو لێ سویار دبوو هەكە ل سەر حێشترێ شلببا، و شاشكەك هەبوو ل سەرێ خۆ دشداند، رۆژەكێ ل سەر پشتا وی كەری بوو كۆچەرە عەرەبەك د بەرڕا بۆری گۆت: تو نە بێڤانێ كوڕێ بێڤانی؟ گۆت: بەلێ، ئینا كەر دایێ گۆتێ لێ سویاربە، و شاشكەك ژی دایێ و گۆت: ل سەرێ خۆ بشدینە، هندە هەڤالێت وی گۆتنێ: خودێ گونەهێت تە پویچ كەت، تە كەرەك دا ڤی كۆچەرە عەرەبی تو پێ دهاتی و دچۆی، و شاشكەك تە سەرێ خۆ پێ دشداند؟ گۆت: من یا گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بووی (ﷺ) دگۆت: (ب راستی باشترین باشی ئەوە مرۆڤ د گەل دۆستێ بابێ خۆ بكەت پشتی مری). و ب راستی بابێ وی هەڤالێ عومەری بوو.**

## ٥ ـ باب: رحمة الأَولاد.

**بابەتێ: دلۆڤانییا ب بچویکان.**

٢٦٢٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَبَّلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ وَعِنْدَهُ الأَقْرَعُ بْنُ حابِسٍ التَّمِيمِيُّ جالِساً، فَقَالَ الأَقْرَعُ: إِنَّ لِي عَشْرَةً مِنَ الْوَلَدِ ما قَبَّلْتُ مِنْهُمْ أَحَداً، فَنظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ الله (ﷺ) ثُمَّ قالَ: (مَنْ لاَ يَرْحَمُ لاَ يُرْحَمُ). [خ٥٩٩٧/ م٢٣١٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەسەنێ كوڕێ عەلی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت ماچی كر و ئەقرەعێ كوڕێ حابسی ل دەڤ بوو، ئەقرەعی گۆت: من دەه بچویك یێت هەین هێژ من ئێك ماچی نەكریە، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرێ خۆ دایێ و گۆت: (یێ دلۆڤانییێ نەبەت، دلۆڤانی پێ ناهێتە برن).**

٢٦٢٤ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: جاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: تُقَبِّلُونَ الصِّبْيَانَ؟ فَمَا نُقَبِّلُهُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (أَوَ أَمْلِكُ لَكَ أَنْ نَزَعَ اللهُ مِنْ قَلْبِكَ الرَّحْمَةَ). [خ٥٩٩٨/ م٢٣١٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: هندە مرۆڤ ژ كۆچەرێت عەرەبان هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆتن: ئەرێ هوین بچویكێت خۆ ماچی دكەن؟ گۆت: بەلێ، گۆتن: پانێ ئەم ماچی ناكەین، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز نەشێم دلۆڤانییێ بكەمە د دلێت هەوەدا، هەكە خودێ دلۆڤانی ژ دلێت هەوە كێشابیت).**

٢٦٢٥ – عَنْ يَعْلَى الْعَامِرِيِّ أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ يَسْعَيَانِ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَضَمَّهُمَا إِلَيْهِ وَقَالَ: (إِنَّ الْوَلَدَ مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ). [جه٣٦٦٦].

* صحيح.

**ژ یەعلایێ عامری (رضي الله عنه) ئەوی گۆت: حەسەن و حسێن بۆ لایێ پێغەمبەری (ﷺ) هاتن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) هەردو كێشانە بەر خۆڤە و گۆت: (ب راستی زارۆك ئەگەرێ چرویكی و ترسێنە)[1].**

---

(١) ئانكو: ئەو بابێ پالدەنە چرویكییێ ژ بەر وان ب مەزاختنا هەژی نارابیت و ژ بەر وان خێرا ناكەت، و ترسێ بۆ چێ دكەت جیهادێ نەكەت و رێكا خودێ نەگریت، چونكی دترسیت تشتەك ل وی بهێت و زارۆكێت وی ببنە ئێتیم و بێ خودان بمینن، نوزانیت خودان هەر خودێیە.

## ٦ ـ باب: فضل الإحسان إلى البنات.

## بابەتێ: خێرا باشییا د گەل كچان.

٢٦٢٦ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: دَخَلَتِ امْرَأَةٌ مَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا تَسْأَلُ، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئاً غَيْرَ تَمْرَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا، فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا، وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَيْنَا فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: (مَنِ ابْتُلِيَ مِنْ هذِهِ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ، كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ). [خ١٤١٨/ م٢٦٢٩].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: ژنەك هاتە دەڤ من دو كچێت وی د گەل بوون، خازۆكی دكر، چو ل دەڤ من نەدیت ژ بلی قەسپەكێ ب تنێ، من ئەو قەسپ دایێ، وێ د مابەینا هەردو كچێت خۆدا لێكڤە كر، و وێ چو ژێ نەخوار و دەركەفت، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەڤ مە، من بۆ گۆت: ئینا وی گۆت: (هەر كەسێ ب تشتەكی ژ ڤان كچان هاتە جەرباندن و ئمتیحانەكرن و ئەو باشییێ بگەهینیتە وان، دێ بۆ بنە پەردە ژ ئاگرێ جەهنەمێ).**

٢٦٢٧ – (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ) وَضَمَّ أَصَابِعَهُ. [م٢٦٣١].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ دو كچان خودان كەت هەتا بالغ بن، رۆژا قیامەتێ دێ هێت ئەز و ئەو وەكی ڤان هەردوكاینە). و هەردو تبلێت خۆ گەهاندنە ئێك[1].**

٢٦٢٨ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ وُلِدَتْ لَهُ أُنْثَى فَلَمْ يَئِدْهَا وَلَمْ يُهِنْهَا، وَلَمْ يُؤْثِرْ وَلَدَهُ ـ يعني الذكر ـ عَلَيْهَا، أَدْخَلَهُ اللهُ بِهَا الجَنَّةَ). [ك٧٣٤٨].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ كچەك بوو و ب ساخی بن ئاخ نەكر و نەشكاند و سڤكاتی پێ نەكر، و كوڕێ خۆ ب سەر وێ نەئێخست، خودایێ مەزن ب وێ دێ بەتە بەحەشتێ).**

---

(١) مەخسەد پێ تلا وی یا شەهدێ و یا نیڤێیە.

## ٧ ـ باب: صلة الرحم

### بابەتێ: مرۆڤانی.

٢٦٢٩ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ اللهَ خَلَقَ الْخَلْقَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْ خَلْقِهِ، قَالَتِ الرَّحِمُ: هذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ، أَمَا تَرْضَيْنَ بأَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى، يَا رَبِّ! قَالَ: فَهُوَ لَكِ**). قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**فَاقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ**: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾﴾[محمد]). [خ٥٩٨٧ (٤٨٣٠)/ م٢٥٥٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودایێ مەزن چێكری چێكرن هەتا تەكویز و تمام كرین، مرۆڤانی رابوو، گۆت: ئەڤە جهێ خۆپاراستنێیە ب تە ژ برینا مرۆڤانییێ، گۆت: ما تو یا رازی نینی ئەز وی بگەهینمە دلۆڤانییا خۆ یێ تە بپارێزیت، و یێ تە ببڕیت ئەز دلۆڤانییا خۆ ژ وی ببڕم، گۆت: بەلێ ئەز یا رازیمە، خودێ گۆت: ئەو بۆ تەیە، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: بخوینن هەكە هەوە بڤێت:** ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ﴾ **و دبیت ئەگەر هوین پشتا خۆ بدەنە ئیسلامێ، خرابییێ د ئەردیدا بكەن و بەنكێ مرۆڤانییێ ببڕن. ئەڤە [ ئەڤێت پشتا خۆ ددەنە ئیسلامێ و خرابییێ د ئەردیدا دكەن ] ئەون یێت خودێ لەعنەت لێ كرین [ و ژ دلۆڤانییا خۆ دویر ئێخستین ] و كەڕ و كۆرە كرین [ نە هەڤییێ گوهـ لێ دبن، و نە دبینن ]).**

٢٦٣٠ – (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، أَوْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ ؛ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ**). [خ٢٠٦٧، ٢٥٥٧].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ بڤێت رزقێ وی بۆ بێتە بەرفرەهكرن، و ژیێ وی و دویماهییا وی بۆ بێنە گیرۆكرن بلا باشییێ د گەل مرۆڤێت خۆ بكەت).**

٢٦٣١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**تَعَلَّمُوا مِنْ أَنْسَابِكُمْ مَا تَصِلُونَ بِهِ أَرْحَامَكُمْ، فَإِنَّ صِلَةَ الرَّحِمِ مَحَبَّةٌ فِي الْأَهْلِ، مَثْرَاةٌ فِي الْمَالِ، مَنْسَأَةٌ فِي الْأَثَرِ**). [ت١٩٧٩].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﭬ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) (وێ ژ بنیاتێ خۆ فێر ببن پێ باشییێ د گەل مرۆڤێت خۆ بكەن، ب راستی باشییا د گەل كەسوكاران خۆشڤییاتییە د مالێدا و زەنگینییە د مالیدا و گیرۆكرنە د ژیدا).**

## ٨ ـ باب: إثم قاطع الرحم.

## بابەتێ: گونەها بڕینا مرۆڤانییێ.

٢٦٣٢ - (ق) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ).[خ٥٩٨٤/ م٢٥٥٦].

**ژ جوبەیرێ كوڕێ موتعمی (ﭬ) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ مرۆڤانییێ ببڕیت[1]، ناچیتە بەحەشتێ).**

- وفي رواية لمسلم: (لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ).

**و د ڤەگێرا موسلمیدا: (مرۆڤانیبڕ، ناچیتە بەحەشتێ).**

٢٦٣٣ - عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ اللهُ لِصَاحِبِهِ العُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا، مَعْ مَا يَدَّخِرُ لَهُ فِي الآخِرَةِ، مِنَ البَغْيِ، وَقَطِيْعَةِ الرَّحِمِ).[د٤٩٠٢/ ت٢٥١١/جه٤٢١١].

* صحيح.

**ژ ئەبی بەكرەتە (ﭬ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە گونەهەك هەژیتر بیت خودێ لەزێ ل سزادانا خودانێ وێ د دنیایێدا بكەت د گەل وێ یا بۆ وی د ئاخرەتێدا هەلگرتی ژ ستەمێ و بڕینا مرۆڤانییێ).**

## ٩ ـ باب: ليس الواصل بالمكافئ.

## بابەتێ: باشی ئەوە تو باشییێ دانییە شوینا باشییێ.

٢٦٣٤ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ، وَلكِنِ الْوَاصِلُ الَّذِي إِذَا قُطِعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا). [خ٥٩٩١].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (یێ بۆ مرۆڤانییێ باش ئەوە یێ ڤەنجی و باشییێ ل جهی دانیت، بەلێ یێ بۆ مرۆڤانییێ باش ئەوە هەكە مرۆڤێت وی بۆ د خراب بن، ئەو بۆ وان هەر یێ باش بیت).**

(١) ئانكو: ئەوێ مرۆڤانییێ دبڕینیت و ئەوە یێ د گەل مرۆڤانییێ خراب.

## ١٠ ـ باب: بر الخالة.

## بابەتێ: باشییا د گەل خالەتێ.

٢٦٣٥ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَصَبْتُ ذَنْباً عَظِيماً، فَهَلْ لِي تَوْبَةٌ؟ قَالَ: (**هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍّ**)؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: (**هَلْ لَكَ مِنْ خَالَةٍ**)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَبِرَّهَا**). [حب ٤٣٥/ ت ملحق ١٩٦٨].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين (شعيب).

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت): زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من گونەهەکا مەزن یا کری، ئەرێ تەوبە بۆ من هەیە؟ گۆت: (ئەرێ تە دایك هەیە)؟ گۆت: نەخێر، گۆتێ: (ئەرێ تە خالەت هەیە)؟ گۆت: بەلێ، گۆت: (باشییێ د گەل بکە).**

## ١١ ـ باب: هل يطلق امرأته، لبرّ الوالدين

## بابەتێ: ئەرێ ژ بەر باشییا د گەل دایبابان ژنا خۆ بەردەت.

٢٦٣٦ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَتْ تَحْتِي امْرَأَةٌ، وَكُنْتُ أُحِبُّهَا، وَكَانَ عُمَرُ يَكْرَهُهَا، فَقَالَ لِي: طَلِّقْهَا، فَأَبَيْتُ، فَأَتَى عُمَرُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**طَلِّقْهَا**).[د٥١٣٨/ ت١١٨٩/ جه٢٠٨٨].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنەك ل دەڤ من بوو و من حەژێ دکر، و عومەری نەدڤیا، ئینا گۆتە من: وێ بەردە، من نەڤیا بەردەم، ئینا هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەڤە بۆ وی گۆت، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (وێ بەردە).**

٢٦٣٧ – عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ: أَنَّ رَجُلاً أَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ لِيَ امْرَأَةً، وَإِنَّ أُمِّي تَأْمُرُنِي بِطَلاَقِهَا. قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ**)، فَإِنْ شِئْتَ فَأَضِعْ ذَلِكَ الْبَابَ، أَوْ احْفَظْهُ.

وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: إِنَّ أُمِّي، وَرُبَّمَا قَالَ: إِن أَبِي.[ت١٩٠٠/ جه٢٠٨٩، ٣٦٦٣].

* صحيح.

ژ ئەبی دەردائی (ﷺ)، زەلامەك هاتە دەڤ گۆت: من ژنەكا هەی و دەیكا من فەرمانا من دكەت ئەز بەردەم؟ گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(باب دەرگەهێ ناڤنجییە یێ بەحەشتێ)**، ڤێجا هەكە تە بڤێت بەرزەكە یان بپارێزە.

و دبیت سوفیانی گۆتبیت: دایكا من، و دبیت گۆتبیت: بابێ من.



هەوجەییێت پێدڤی

# الكتاب الأول: الطعام واشراب

# كتێبا ئێكێ: خوارن و ڤەخوارن

## الفصل الأول: الأطعمة وآداب الأكل.

## پشكا ئێكێ: خوارن و رەوشتێت خوارنێ.

### ١ ـ باب: أكل الحلال والتسمية والأكل باليمين.

### بابەتێ: خوارنا حەلال و گۆتنا بسم الله و خوارن ب دەستێ راستێ.

٢٦٣٨ - (ق) عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: كُنْتُ غُلاَماً فِي حَجْرِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(يَا غُلامُ، سَمِّ الله، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ)**، فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ. [خ٥٣٧٦/ م٢٠٢٢].

**ژ عومەرێ كورێ ئەبی سەلەمەیی (رضي الله عنه)، گۆت: ئەز نیڤمێرە بووم ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و دەستێ من د سێنیكێدا خوار دبوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (ناڤێ خودێ بینە، (ئانكو: بێژە بسم الله الرحمن الرحیم) و ب دەستێ خۆ یێ راستێ بخۆ، و ژ بەرۆكا خۆ بخۆ).**

٢٦٣٩ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ الله عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ. وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ الله عِنْدَ دُخُولِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ. وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ الله عِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ)**. [م٢٠١٨].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەكە ئێك ژ هەوە چۆ د مالا خۆڤە و ناڤێ خودایێ مەزن د زۆركەفتنا خۆڤە و ل سەر خوارنا خۆ ئینا، شەیتان دێ بێژیتە هەڤالێت خۆ: نە هەوە جهێ نڤستنێ هەیە و نە خوارن، و هەكە چۆ ژۆر و ناڤێ خودایێ مەزن د زۆركەفتنا خۆڤە نەئینا، شەیتان دێ بێژیت: هوین گەهشتنە جهێ نڤستنێ، و هەكە ناڤێ خودایێ مەزن ل سەر خوارنا خۆ ژی نەئینا، دێ بێژیت: هوین گەهشتنە جهێ نڤستنێ و شیڤێ).**

٢٦٣٩م - (م) وَعَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ص) قَالَ: **(لاَ تَأْكُلُوا بِالشِّمَالِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِالشِّمَالِ)**. [م٢٠١٩].

**و ژ وی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب دەستێ چەپێ نەخۆن، ب راستی شەیتان ب دەستێ چەپێ دخۆت و ڤەدخۆت).**

٢٦٤٠ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَن رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بِيمِينِه، وَإِذَا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ**). [م٢٠٢٠].

وَكَانَ نَافِعٌ يَزِيدُ فِيهَا: (**وَلاَ يَأْخُذُ بِهَا، وَلاَ يُعْطِي بِهَا**).

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە تشتەك خوار بلا ب دەستێ راستێ بخۆت، و ئەگەر تشتەك ڤەخوار بلا ب دەستێ راستێ ڤەخۆت، ب راستی شەیتان ب دەستێ چەپێ دخۆت و ڤەدخۆت).**

٢٦٤١ – عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ؛ فَلْيَذْكُرِ اسْمَ اللهِ تَعَالَى، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللهِ تَعَالَى فِي أَوَّلِهِ؛ فَلْيَقُلْ: بِاسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ**). [د٣٧٦٧/ ت١٨٥٨/ جه٣٢٦٤/ مي٢٠٦٣].

* صحيح.

[وانظر في طلب الحلال: ٢٢٢٧، ٣١٩٦]

**ژ عائیشایێ (خودێ ژێ رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە ئێكی ژ هەوە خوار، بلا ناڤێ خودایێ مەزن بینیت، و هەكە ژبیر كر ناڤێ خودایێ مەزن دەستپێكا وێ بینیت، بلا بێژیت: ب ناڤێ خودێ ل پێشییێ و دویماهییێ).**

## ٢ ـ باب: المؤمن يأكل في معًى واحد.

## بابەتێ: باوەریدار ب ئێك رویڤیك دخۆت.

٢٦٤٢ – (ق) عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ لاَ يَأْكُلُ حَتَّى يُؤْتَى بِمِسْكِينٍ يَأْكُلُ مَعَهُ، فَأَدْخَلْتُ رَجُلاً يَأْكُلُ مَعَهُ، فَأَكَلَ كَثِيراً، فَقَالَ: يَا نَافِعُ، لاَ تُدْخِلْ هذَا عَلَيَّ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، والْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ**). [خ٥٣٩٣/ م٢٠٦٠].

**ژ نافعی (خودێ ژێ رازی بیت) گۆت: ئیبن عومەری خوارن نەدخوار هەتا هەژارەك دئینا و د گەل خواربا، ئینا من زەلامەك ئینا دەڤ دا د گەل وی بخۆت، وی گەلەك خوار، ئینا گۆت: ئەی نافع ئەڤی نەئینە دەڤ من، من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (باوەریدار ب رویڤیكەكێ دخۆت و گاور ب حەفت رویڤیكان دخۆت).**

## ٣ ـ باب: الأكل متكئاً.

## بابەتێ: خوارنا ل سەر ئەنیشكێ پالدایی.

٢٦٤٣ – (خ) عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنِّي لاَ آكُلُ مُتَّكِئاً**). [خ٥٣٩٨].

**ژ ئەبی جوحەیفەتە، (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ل سەر تەنشتێ پالدایی ناخۆم).**

٢٦٤٤ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ يَأْكُلَ الرَّجُلُ وَهُوَ مُنْبَطِحٌ عَلَى وَجْهِهِ.[جه٣٣٧٠].

* حسن. وقال شعيب: ضعيف

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا کری زەلام کەتبیتە سەر دەڤێ خۆ و خورانێ بخۆت.**

## ٤ . باب: لعق الأَصابع والأكل بثلاث.

## بابەتێ: مێژتنا تلان و خوارن ب سێیان.

٢٦٤٥ - (م) عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَأْكُلُ بِثَلاَثِ أَصَابِعَ، وَيَلْعَقُ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يَمْسَحَهَا. [م٢٠٣٢].

**ژ کەعبێ کورێ مالکی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب سێ تلان دخوار، و دەستێت خۆ بەری ڤەمالیت دمێژتن.**

## ٥ . باب: إذا وقعت لقمة فليأخذها.

## بابەتێ: ئەگەر پارییەك کەفت بلا راکەت.

٢٦٤٦ - (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّ الشَّيْطَانَ يَحْضُرُ أَحَدَكُمْ عِنْدَ كُلِّ شَيْءٍ مِنْ شَأْنِهِ، حَتَّى يَحْضُرَهُ عَنْدَ طَعَامِهِ، فَإِذَا سَقَطَتْ مِنْ أَحَدِكُمُ اللُّقْمَةُ؛ فَلْيُمِطْ مَا كَانَ بِهَا مِنْ أَذى، ثُمَّ لِيَأْكُلْهَا، وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ، فَإِذَا فَرَغَ؛ فَلْيَلْعَقْ أَصَابِعَهُ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي فِي أَيِّ طَعَامِهِ تَكُونُ الْبَرَكَةُ). [م٢٠٣٣].

وفِي رواية: (وَلاَ يَمْسَحْ يَدَهُ بِالْمِنْدِيلِ، حَتَّى يَلْعَقَ أَصَابِعَهُ).

**ژ جابری (ﷺ)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (ب راستی شەیتان د گەل ئێك ژ هەوە د هەر تشتەکیدا ژ کارێ وی بەرهەڤ دبیت، هەتا ل سەر خوارنا وی د گەل حازر دبیت، ڤێجا هەکە پارییێ ئێکی ژ هەوە کەفت، بلا راکەت، و بلا ئەو پیساتییا پێڤە پاقژ کەت و راکەت، و بلا بخۆت، و بلا بۆ شەیتانی نەهێلیت، و هەکە بەس کر بلا تلێت خۆ بمێژیت، ب راستی ئەو نوزانیت کا بەرەکەت د کیژ خوارنا ویدایە).**

**و د ڤەگێرەکێدا: (و بلا دەستێ خۆ ب کەڤیکێ پاقژ نەکەت هەتا تلێت خۆ نەمێژیت)**

## ٦ ـ باب: ما يقول إذا فرغ من طعامه.

## بابەتێ: دێ چ بێژیت ئەگەر ژ خوارنا خۆ خلاس بوو.

٢٦٤٧ - (خ) عَنْ أَبِي أُمامَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ طَعَامِهِ . وَقالَ مَرَّةً: إِذَا رَفَعَ مائِدَتَهُ .، قالَ: (**الحَمْدُ للهِ الَّذِي كَفَانَا وَأَرْوَانَا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلاَ مَكْفُورٍ**). وَقالَ مَرَّةً: (**الحَمْدُ لله رَبِّنَا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلاَ مُوَدَّعٍ، وَلاَ مُسْتَغْنًى، رَبَّنَا**). [خ٥٤٥٩].

**ژ ئەبی ئومامەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ژ خوارنا خۆ خلاس ببا، و جارەكێ گۆت: ئەگەر سێنییا وی هاتبا راكرن، دگۆت: (حەمد و شوكر بۆ خودێ ئەوێ هەوجەیێت مە ڤەتاندین و ئاڤ دایە مە، كەس هەوجەییا وی ناڤەتینیت[1] و نێعمەتێت وی ناهێنە ئینكاركرن). و جارەكێ گۆت: (سوپاسی هەمی بۆ خودێ خودایێ مە، كەس هەوجەییا وی ناڤەتینیت و بێ زاری ژ نیعمەتێت وی ناهێتە كرن و كەس بێ ژێ بێ منەت نینە خودایێ مە).**

٢٦٤٨ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا**). [م٢٧٣٤].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ ژ بەندەیی رازی دبیت ل سەر خوارنەكێ بخۆت، و شوكرا وی ل سەر بكەت، یان ڤەخوارنەكێ ڤەخۆت، و شوكرا وی ل سەر بكەت).**

٢٦٤٩ - عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا أَكَلَ أَوْ شَرِبَ قَالَ: (**الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَ وَسَقَى، وَسَوَّغَهُ، وَجَعَلَ لَهُ مَخْرَجاً**). [د٣٨٥١].

* صحيح.

**ژ ئەبی ئەیووبێ ئەنساری گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر خواربا یان ڤەخواربا دگۆت: (حەمد و شوكر بۆ خودێ ئەوێ خوارن و ڤەخوارن دایە مە، و رێكا چۆنەخوارێ ب ساناهی كری و رێك بۆ دەركەفتنێ دورست كری).**

---

(١) چونكی ئەو، ئەو خودایە یێ هەمی هەوجە، و وەجا هەمیان دڤەتینیت، و هەوجەی كەسێ نە.

## ٧ ـ باب: الضيف إذا تبعه غيره.

## بابەتێ: ئەگەر ئێك د گەل مێڤانی چۆ.

٢٦٥٠ - (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يُكْنَى أَبَا شُعَيْبٍ، فَقَالَ لِغُلاَمٍ لَهُ قَصَّابٍ: اجْعَلْ لِي طَعَاماً يَكْفِي خَمْسَةً، فَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَدْعُوَ النَّبِيَّ (ﷺ) خَامِسَ خَمْسَةٍ، فَإِنِّي قَدْ عَرَفْتُ فِي وَجْهِهِ الجُوعَ، فَدَعَاهُمْ. فَجَاءَ مَعَهُمْ رَجُلٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنَّ هذَا قَدْ تَبِعَنَا، فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ فَأْذَنْ لَهُ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ يَرْجِعَ رَجَعَ**). فَقَالَ: لاَ، بَلْ قَدْ أَذِنْتُ لَهُ. [خ٢٠٨١/ م٢٠٣٦].

**ژ ئەبی مەسعودێ بەدری (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکی پێغەمبەر (ﷺ) گازیکرە خوارنەکێ بۆ وی چێ کربوو و ئەو یێ پێنجێ بوو، زەلامەك د گەل وان چۆ، دەمێ گەهشتینە بەر دەرگەهی، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەڤە یێ د گەل مە هاتی، هەکە تە بڤێت دەستویرییا وی بدە و هەکە تە بڤێت دێ زڤریت). ئینا گۆت: نە، من دەستویرییا وی دا.**

## ٨ ـ باب: إذا طلب الضيف دعوة غيره.

## بابەتێ: ئەگەر مێڤان ئێکێ دی د گەل خۆ داخواز بکەت.

٢٦٥١ - (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ جَاراً لِرَسُولِ الله (ﷺ) فَارِسِيّاً، كَانَ طَيِّبَ الْمَرَقِ، فَصَنَعَ لِرَسُولِ الله (ﷺ)، ثُمَّ جَاءَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ: (**وَهذِهِ**)؟. لِعَائِشَةَ ـ. فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ**). فَعَادَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): (**وَهذِهِ**)؟ قَالَ: لاَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ**). ثُمَّ عَادَ يَدْعُوهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**وَهذِهِ**)؟ قَالَ: نَعَمْ، فِي الثَّالِثَةِ، فَقَامَا يَتَدَافَعَانِ حَتَّى أَتَيَا مَنْزِلَهُ. [م٢٠٣٧].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: جیرانەکێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ فارسی بوو، و ئاڤکا وان یا خۆش بوو، ئینا بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چێ کر، پاشی هات گازی بکەت، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (و ئەڤە ژی) ئانکو عائیشا، ئینا گۆت: نەخێر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەخێر)، جارەکا دی زڤری گازی بکەت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (و ئەڤە ژی) ئانکو: عائیشا، ئینا گۆت: نەخێر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەخێر)، پاشی زڤری گازی بکەت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (و ئەڤە ژی) ئانکو: عائیشا، ئینا جارا سێیێ گۆت: بەلێ، ئینا هەردو رابوون بەری ئێك کەڤتن هەتا هاتینە مالا وی.**

## ٩ ـ باب: لا يعيب طعاماً.

## بابەتێ: گازندێ ژ چو خوارنان نەکەت.

٢٦٥٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: ما عابَ النَّبِيُّ (ﷺ) طَعَاماً قَطُّ، إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ. [خ٥٤٠٩ (٣٥٦٣)/ م٢٠٦٤]

- وفي رواية لمسلم: وَإِنْ لَمْ يَشْتَهِهِ، سَكَتَ.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چو جاران گازندە ژ چو خوارنان نەکرییە، هەکە دلێ وی چۆبایێ دخوار و هەکە نەڤیابا دهێلا.**

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: ئەگەر دلێ وی نەچۆبایێ بێدەنگ دبوو.**

## ١٠ ـ باب: طلب الدعاء من الضيف الصالح.

## بابەتێ: داخوازکرنا دوعایان ژ مێڤانێ راستکار.

٢٦٥٣ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ قَالَ: نَزَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى أَبِي، قَالَ: فَقَرَّبْنَا إِلَيْهِ طَعَاماً وَوَطْبَةً، فَأَكَلَ مِنْهَا، ثُمَّ أُتِيَ بِتَمْرٍ فَكَانَ يَأْكُلُهُ، وَيُلْقِي النَّوَى بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ، وَيَجْمَعُ السَّبَّابَةَ وَالْوُسْطَى ـ قَالَ شُعْبَةُ: هُوَ ظَنِّي. وَهُوَ فِيهِ، إِنْ شَاءَ الله، إِلْقَاءُ النَّوَى بَيْنَ الإِصْبَعَيْنِ ـ ثُمَّ أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ الَّذِي عَنْ يَمِينِهِ. قَالَ: فَقَالَ أَبِي، وَأَخَذَ بِلِجَامِ دَابَّتِهِ: ادْعُ الله لَنَا، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ! بَارِكْ لَهُمْ فِي مَا رَزَقْتَهُمْ، وَاغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ**). [م٢٠٤٢].

**ژ عەبدوللایێ کورێ بوسری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو مێڤانێ بابێ من، گۆت: ئینا مە خوارنەك و خورما قوتایی د گەل کەشکی و دوهنی بۆ نێزیك کر و ژێ خوار، و پاشی قەسپ بۆ ئینان، و دخوارن و بەرکێت وان ددانانە د ناڤبەرا تلێت خۆدا، و تلا شەهدێ و یا نیڤێ کۆم دکرن. شوعبەیی گۆت: و ئەو هزرا منە و ئەو بەرك د ناڤ تلێت ویدا بوون إن شاء الله، پاشی ڤەخوارنەك بۆ ئینا و ژێ ڤەخوار، و پاشی دا یێ لایێ خۆ یێ راستێ. گۆت: ئینا بابێ من گۆت و ئەوی هەڤسارێ دەوارێ وی گرتبوو، دوعا بۆ مە ژ خودێ بکە، ئینا گۆت: (یا خودێ بەرمکەتێ بۆ وان بێخە وێ یا تو ب رزقێ وان دکەی، و گونەهێت وان ژێ ببە و دلۆڤانییێ ب وان ببە).**

## ١١ . باب: طعام الواحد يكفي الاثنين.

### بابەتێ: خوارنا ئێكی تێرا دووا دكەت.

٢٦٥٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**طَعَامُ الاِثْنَيْنِ كَافِي الثَّلاَثَةِ، وَطَعَامُ الثَّلاَثَةِ كَافِي الأَرْبَعَةِ**). [خ٥٣٩٢/ م٢٠٥٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خوارنا دووا بەسی سێیانە و خوارنا سێیان بەسی چارانە).**

## ١٢ . باب: نعم الأُدم الخل.

### بابەتێ: سهك خۆش پێخوارنە.

٢٦٥٥ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِي (ﷺ) سَأَلَ أَهْلَهُ الأُدُمَ، فَقَالُوا: مَا عِنْدَنَا إِلاَّ خَلٌّ، فَدَعَا بِهِ، فَجَعَلَ يَأْكُلُ بِهِ ويَقُولُ: (**نِعْمَ الأُدُمُ الْخَلُّ، نِعْمَ الأُدُمُ الْخَلُّ**). [م٢٠٥٢].

**ژ جابری، (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پرسیارا پێخوارنێ ژ مالا خۆ كر، گۆتن: چو ل دەڤ مە نینە سهك نەبیت، گۆتێ: بینن، دەستهاڤێتێ دخوار و دگۆت: (سهك خۆش پێخوارنە، سهك خۆش پێخوارنە).**

٢٦٥٦ - عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ**)؟ فَقُلْتُ: لاَ، إِلاَّ كِسَرٌ يَابِسَةٌ وَخَلٌّ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**قَرِّبِيهِ، فَمَا أَقْفَرَ بَيْتٌ مِنْ أُدْمٍ فِيهِ خَلٌّ**). [ت١٨٤١].

* حسن.

**ژ ئوم هانیئا كچا ئەبی تالبی (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ من، ئینا گۆت: (ئەرێ هەوە تشتەك هەیە)؟ من گۆت: نەخێر، هندەك پرتكێت نانێ هشك نەبن و سهك، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نێزیك بكە ئەو مال ژ پێخوارنان ڤالا نابیت یا سهك تێدا).**

## ١٣ ـ باب: التلبينة.

## بابەتێ: شۆربا ئارێ جەهی د گەل ئاڤێ و د گەل شیری و د گەل هنگڤینی[1].

٢٦٥٧ - (ق) عَنْ عائِشَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ: أَنَّهَا كانَتْ إِذَا ماتَ المَيِّتُ مِنْ أَهْلِهَا، فَاجْتَمَعَ لِذلِكَ النِّسَاءُ، ثُمَّ تَفَرَّقْنَ إِلاَّ أَهْلَهَا وَخاصَّتَهَا، أَمَرَتْ بِبُرْمَةٍ مِنْ تَلْبِينَةٍ، فَطُبِخَتْ، ثُمَّ صُنِعَ ثَرِيدٌ، فَصُبَّتِ التَّلْبِينَةُ عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: كُلْنَ مِنْهَا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**التَّلْبِينَةُ مَجَمَّةٌ لِفُؤَادِ المَرِيضِ، تَذْهَبُ بِبَعْضِ الحُزْنِ**). [خ٥٤١٧، ٢٢١٦].

**ژ عائیشایێ (ڕەزای خودێ لێ بیت) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) ئەگەر ئێك ژ خەلكێ وێ مربا و ژن بۆ هندێ كۆم ببان، پاشی ژێكڤە ببان خەلكێ وێ و نێزیكێت وێ نەبان، فەرمان ب قازانەكا تەلبینێ دكر و دهاتە لێنان، پاشی دا شۆربا نانی چێ كەت، و تەلبینە ب سەردا دكر، پاشی دگۆت: ژێ بخۆن، من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دبێژیت: (تەلبینە دلێ نەساخی ڤەدحەسینیت، و هندەك خەمێ ژێ دبەت).**

## ١٤ ـ باب: الرطب بالقثاء.

## بابەتێ: روتەب د گەل ترۆزییان.

٢٦٥٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْقِثَّاءِ. [خ٥٤٤٠/ م٢٠٤٣].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ جەعفەرێ كوڕێ ئەبو تالبی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) دیت روتەب د گەل ترۆزی دخوارن.**

## ١٥ ـ باب: العجوة والتمر.

## بابەتێ: عەجوە و قەسپ.

٢٦٥٩ - (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ تَصَبَّحَ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعَ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً، لَمْ يَضُرَّهُ فِي ذلِكَ الْيَوْمِ: سُمٌّ وَلاَ سِحْرٌ**). [خ٥٤٤٥/ م٢٠٤٧].

---

(١) ئارێ جەهی دێ پەرداغەكا ئاڤێ كەنە سەر، پاشی داننە سەر ئاگرەكێ نەرم، پاشی پەرداغەكا شیری كەنە سەر، پاشی هندەك هنگڤینی كەنە د گەل.

ژ سەعدێ كورێ ئەبی وەققاسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ هەمی رۆژان سپێدێ حەفت كەتێت ڤەسپێت عەجوە بخۆت ژەهر و سحر د وێ رۆژێدا زیانێ ناگەهیننێ).**

٢٦٦٠ - (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ يَجُوعُ أَهْلُ بَيْتٍ عِنْدَهُمُ التَّمْرُ)**.[م٢٠٤٦].

ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خەلكێ وێ مالێ برسی نابیت و ڤەسپ ل دەڤ وان هەبن).**

٢٦٦١ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِتَمْرٍ عَتِيقٍ، فَجَعَلَ يُفَتِّشُهُ يُخْرِجُ السُّوسَ مِنْهُ.[د٣٨٣٢/ جه٣٣٣٣].

* صحيح.

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: هندەك ڤەسپێت كەڤن بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ئینان، ڤێجا دەستهاڤێتێ لێگەریا خرشك ژێ دئینانە دەر.

## ١٦ ـ باب: الدباء.

## بابەتێ: كولندی.

٢٦٦٢ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّ خَيَّاطاً دَعا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لِطَعَامٍ صَنَعَهُ. قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: فَذَهَبْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) إِلَى ذلِكَ الطَّعَامِ، فَقَرَّبَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) خُبْزاً وَمَرَقاً، فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ مِنْ حَوَالَيِ الْقَصْعَةِ، قَالَ: فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ مِنْ يَوْمِئِذٍ. [خ٢٠٩٢/ م٢٠٤١].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: درواركارەكی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ خوارنەكێ گازی كر، ئەنەسێ كورێ مالكی گۆت: ئەز د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ وێ خوارنێ چۆم، ئینا نان و ئاڤك نێزیكی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كرن كولند و گۆشتێ هشككری تێدابوو، من پێغەمبەر (ﷺ) دیت یێ ل كولندی د سێنیێدا دگەریت، ژ وێ رۆژێ وەرە ئەز حەژ كولندی دكەم.

## ١٧ ـ باب: الثوم والبصل.

## بابەتێ: سیرێ و پیڤازێ.

[أنظر: ١١١٤- ١١١٦، ٣٦٠٢]

## ١٨ . باب: إذا وقع الذباب في الإناء.

**بابەتێ: ئەگەر مێش كەفتە د ئامانیدا.**

٢٦٦٣ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ؛ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ، ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ شِفَاءً، وَفِي الآخَرِ دَاءً). [خ٥٧٨٢ (٣٣٢٠)].

- وفي رواية: (فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ). [خ٣٣٢٠].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر مێش كەفتە د ئامانێ ئێكی ژ هەوەدا، بلا وێ هەمییێ نقۆم بكەت، پاشی باڤێژیت، ب راستی چەنگەكی وێ دەرمان پێ تێدا و پێ دی دەرد).**

- **و د ڤەگێرەكێدا: (د ڤەخوارنا ئێك ژ هەوەدا).**

## ١٩ . باب: غسل اليدين قبل الطعام وبعده.

**بابەتێ: شویشتنا هەردو دەستان بەری و پشتی خوارنێ.**

٢٦٦٤ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ نَامَ وَفِي يَدِهِ غَمَرٌ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ، فَأَصَابَهُ شَيْءٌ، فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ). [د٣٨٥٢/ ت١٨٦٠/ جه٣٢٩٧/ مي٢١٠٧].

* صحيح.

- ولفظ غير أبي داود: (وَفِي يَدِهِ رِيحُ غَمَرٍ...).

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ بنڤیت و دوهن ب دەستێ ویڤە بیت و نەشۆت، و زیانەك گەهشتێ، بلا گازندا ژ خۆ پێڤەتر نەكەت).**

- **و دبێژەییا نەیا داوودیدا: (و بێهنا دوهنی ژ دەستێ وی بێت).**

## ٢٠ . طرف من معيشته صلى الله عليه وسلم واصحابه

**بابەتێ: چەندەك ژ ژیایارا وی (ﷺ) و هەڤالێت وی**

**[ بەرێ خۆ بدە: ٣٦٦٩ ، ٣٦٧١، ٣٦٧٥، ٣٧٤٧]**

## ٢١ . باب: طعام أهل الكتاب والمشركين وآنيتهم.

**بابەتێ: خوارنا خودان كتێبان (جوهی و فەلەیان) و هەڤپشكچێكەران و ئامانێت وان.**

٢٦٦٥ - عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَنُصِيبُ مِنْ آنِيَةِ الْمُشْرِكِينَ وَأَسْقِيَتِهِمْ، فَنَسْتَمْتِعُ بِهَا، فَلاَ يَعِيبُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ. [د٣٨٣٨].

* صحيح.

**ژ جابرى (رضي الله عنه) گۆت: مە خەزا د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دكر، و مە ئامانێت هەڤپشكچێكەران و ئاڤدانكێت وان ددیتن و مە مفا ژێ وەردگرت، و پێغەمبەرى ئەڤە ب خرابى ل سەر وان نەدهەژمارت.**

٢٦٦٦ - عن عَدِيِّ بْنَ حَاتِمٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ أَبِي كَانَ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَيَفْعَلُ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: (**إِنَّ أَبَاكَ أَرَادَ أَمْراً فَأَدْرَكَهُ**) . يَعْنِي: الذِّكْرَ . قَالَ: قُلْتُ: إِنِّي أَسْأَلُكَ عَنْ طَعَامٍ لاَ أَدَعُهُ إِلاَّ تَحَرُّجاً، قَالَ: (**لاَ تَدَعْ شَيْئاً ضَارَعْتَ فِيهِ نَصْرَانِيَّةً**). [حم١٨٢٦٢].

* حسن.

**ژ عەدییێ كورێ حاتیمى (رضي الله عنه) گۆت: من گۆت: ئەى پێغەمبەرێ خودێ بابێ من بۆ مرۆڤانییێ یێ باش بوو و ئەڤە و ئەڤە دكر، گۆت: (ب راستى بابێ تە تشتەك دڤیا و گەهشتێ)، ئانكو: مەتحێن وى، گۆت: من گۆت: ئەز پرسیارا خوارنەكێ ژ تە دكەم ئەز وێ خوارنێ ژ بەر گونەهێ نەبیت ئەز ناهێلم، گۆت: (تشتەكى نەهێلە تێدا وەكى فەلەیان بى)[1].**

## ٢٢ ـ باب: أكل اللحم.

## بابەتێ: خوارنا گۆشتى.

٢٦٦٧ - عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُعْجِبُهُ الذِّرَاعُ. قَالَ: وَسُمَّ فِي الذِّرَاعِ، وَكَانَ يَرَى أَنَّ الْيَهُودَ هُمْ سَمُّوهُ. [د٣٧٨١].

* صحيح.

**ژ ئیبن مەسعودى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەژ زەندكى دكر، گۆت: و زەندك هاتبوو ژەهركرن، و ددیت جوهیان ئەو یێ ژەهر كرى.**

## ٢٣ ـ باب: ما جاء في لحوم الجلالة وألبانها.

## بابەتێ: ئەوا د راستا گۆشت و شیرێ گیانەوەرێ پیساتى خواریدا هاتى.

٢٦٦٨ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ أَكْلِ الْجَلاَّلَةِ وَأَلْبَانِهَا.[د٣٧٨٥/ ت١٨٢٤/ جه٣١٨٩].

- ولأبي داود: نُهِيَ عَنْ رُكُوبِ الْجَلاَّلَةِ.[د٢٥٥٧].

---

(١) ئانكو: وەكى فەلەیان نەكە هەر تشتێ تێدا ب شك كەفتى و ل دویڤ دلێ خۆ حەرام ببینى، حەرام ئەوە یێ خودێ و پێغەمبەرێ وى حەرام كرى، و حەلال ئەوە یێ خودێ و پێغەمبەرێ وى حەلال كرى، و حەلالێ خودێ و پێغەمبەرى حەلال كرى ب وێ حەرام نابیت دلێ تە د گەلە یان نە.

* حسن صحيح.

ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ نەهیا ژ خوارن حێشترا پیساتییێ دخۆت کری و شیرێ وێ.

- و د ڤەگێرا ئەبو داوودیدا: دانەپاشا ژ سویاربوونا گیانەوەرێ پیساتی خۆری هاتییە کرن.

**٢٤ . باب: ما جاء في الحوارى والرقاق.**

**بابەتێ: ئەوا د راستا ئارێ سپی و نانیدا هاتی.**

٢٦٦٩ – عَنْ أُمِّ أَيْمَنَ: أَنَّهَا غَرْبَلَتْ دَقِيقاً، فَصَنَعَتْهُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) رَغِيفاً، فَقَالَ: (مَا هَذَا)؟ قَالَتْ: طَعَامٌ نَصْنَعُهُ بِأَرْضِنَا، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَصْنَعَ مِنْهُ لَكَ رَغِيفاً، فَقَالَ: (رُدِّيهِ فِيهِ، ثُمَّ اعْجِنِيهِ). [جه٣٣٣٦].

* حسن الإسناد.

ژ دایکا ئەیمەنی (رضي الله عنها): وێ ئار ل موخلکێ کر و بۆ پێغەمبەری (ﷺ) کره نان، ئینا گۆت: (ئەڤە چییە)؟ گۆت: خوارنەکە ئەم ل جهێ خۆ[1] چێ دکەین، من دڤیا ئەز نانەکێ بۆ تە ژێ چێکەم، ئینا گۆت: بزڤرینەڤە د ناڤدا و پاشی هەڤیر بکە)[2].

**٢٥ . باب: ما جاء في أكل الجبن والسمن.**

**بابەتێ: ئەوا د راستا خوارنا پەنیری و دوهنیدا هاتی.**

٢٦٧٠ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِجُبْنَةٍ فِي تَبُوكَ، فَدَعَا بِسِكِّينٍ، فَسَمَّى وَقَطَعَ.[د٣٨١٩].

* حسن الإسناد.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ل تەبووکێ پەنیر بۆ پێغەمبەری ئینا، کێرەك داخواز کر و ناڤێ خودێ ئینا و کەر کر.

٢٦٧١ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ أَطْعَمَهُ اللهُ طَعَاماً، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ! بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَارْزُقْنَا خَيْراً مِنْهُ، وَمَنْ سَقَاهُ اللهُ لَبَناً، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ! بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَزِدْنَا مِنْهُ، فَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ مَا يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ؛ إِلاَّ اللَّبَنُ). [جه٣٣٢٢],

* حسن.

---

(١) ئانکو: ل حەبەشە.

(٢) ئانکو: ئەوا تە ب موخلێ جودا کری بکەڤە ناڤێك و پاشی پێکڤە هەڤیر بکە.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ خودێ خوارنەك داییێ بلا بێژیت: یا خودێ بەرەکەتێ بۆ مە بێخێ و باشتر ژێ بدە مە، و هەر کەسێ خودێ شیر داییێ بلا بێژیت: یا خودێ بەرەکەتێ بۆ مە بێخێ و ل مە زێدەکە، ب راستی ئەز نوزانم تشتەك جهێ خوارنێ و ڤەخوارنێ بگریت شیر نەبیت).**

٢٦ ـ باب: ما جاء في أكل الزيت.

**بابەتێ: ئەوا د خوارنا زەیتێدا هاتی.**

٢٦٧٢ - عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(كُلُوا الزَّيْتَ، وَادَّهِنُوا بِهِ، فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ)**.

ولفظ ابن ماجه: (**ائْتَدِمُوا بِالزَّيْتِ...**). [ت١٨٥١/ جه٣٣١٩]

* صحيح.

ژ عومەرێ کوڕێ خەتتابی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(زەیتێ بخۆن و خۆ پێ دوهندەن، ب راستی ئەو دارەکا پیرۆزە).**

و بێژەیا ئیبن ماجە: **(زەیتێ بکەنە پێخوارن).**

٢٧ ـ باب: التعوذ من الجوع

**بابەتێ: خۆپاراستنا ژ برسێ.**

٢٦٧٣ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ! إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ، فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ)**. [د١٥٤٧/ ن٥٤٨٣/ جه٣٣٥٤].

* حسن.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: **(یا خودێ ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ برسێ، ب راستی ئەو پیسە حالە، و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خیانەتێ ب راستی ئەو پیسە خسلەتا نەدیارە).**

## ٢٨ . باب: الاقتصاد في الأكل والأكل مما يليك[١]

## بابەتێ: ئابۆری د خوارنێدا و خوارن ژ بەرۆکێ خۆ.

٢٦٧٤ - عَنِ المِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرّاً مِنْ بَطْنٍ. بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لاَ مَحَالَةَ، فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ)**. [ت٢٣٨٠/ جه٣٣٤٩].

* صحيح.

**ژ میقدامێ کورێ مەعدی یەکربی (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (مرۆڤی ئامانەك پڕ نەکرییە خرابتر ژ زکێ خۆ، چەند پارییەك بەسی مرۆڤینە پشتا خۆ پێ رابگریت، هەکە هەر دێ ژ وان پارییان بۆریت، بلا سێك بۆ خوارنا وی بیت، و سێك بۆ ڤەخوارنا وی، و سێك بۆ بێهنا وی).**

٢٦٧٥ – عن عطية بن عامر الجهني قال: سمعت سلمان، وأُكرِهَ على طعام يأكله، فقال: حسبي، إني سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلّم يقول: **(إنَّ أكثَرَ الناسِ شِبَعًا في الدُّنْيا أطوَلُهم جوعًا في الآخرةِ)**[٢]. [جه٣٣٥١].

* حسن. ضعفه شعيب.

**ژ عەتییەیێ کورێ عامرێ جوهەنی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل سەلمانی بوو، و ل سەر خوارنەکێ خورتی لێ هاتە کرن بخۆت، ئینا گۆت: من بەسە، من گوه ل پێغەمبەرێ**

---

**(١) ئەڤ ناڤونیشانە د چاپا ئێکێدا هوسا نەهاتییە، بەلکو هوسا د مالپەرێ خۆ دا ئینایە.**

**(٢) شێخ سالحێ شامی ئەڤ فەرمووده و هەر ب وێ هەژمارێ شوینا ڤێ د مالپەرێ خۆدا ئینایە:**

٢٦٧٥ - عن ابن عباس، عن النبي صلّى الله عليه وسلّم قال: (إذا أكَلَ أحَدُكُمْ طعَاماً، فَلا يأكُلْ مِنْ أعلا الصَّحفةِ، ولكنْ ليأكُلْ مِن أسْفلِها، فإنَّ البركةَ تَنْزِلُ مِنْ أعْلاها). [د٣٧٧٢، ت١٨٠٥، جه٣٢٧٧، مي٢٠٩٠].

* صحيح.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێکی ژ هەوە خوارنەك خوار بلا ژ سەرێ وێڤە نەخۆت و بلا ژ بنێ وێڤە بخۆت، چونکی ب راستی بەرەکەت ژ سەرێ وێ دهێتە خوارێ).**

## ٢٨ ـ باب: الاقتصاد في الأكل وعدم الشبع.

### بابەتێ: ئابۆری د خوارنێدا و تێر نەخوارن.

**خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (ب راستی تێرترین خەلك د دنیایێدا درێژترین برساتییە د ئاخرەتێدا).**

٢٦٧٦ — عن ابن عمر قال: تجشأ رجلٌ عند النبي صلّى الله عليه وسلم، فقال: (**كُفَّ عنا جُشاءك، فإن أكثرهم شبعاً في الدنيا أطولهم جوعاً يوم القيامة**)(١). [ت٢٤٧٨/ جه٣٣٥٠].

* حسن. وضعفه شعيب جدّا.

[وانظر: ٢٦٤٢]

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەکی ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) برِك كرن، ئینا گۆت: (برِكێت خۆ ژ مە دویربێخە، ب راستی تێرترین خەلك د دنیایێدا درێژترین برساتییە د ئاخرەتێدا).**

## ٢٩ ـ باب: المضطر إلى الميتة.

### بابەتێ: یێ نەچاری مراری ببیت.

٢٦٧٧ - عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَنَّ رَجُلاً نَزَلَ الْحَرَّةَ، وَمَعَهُ أَهْلُهُ وَوَلَدُهُ، فَقَالَ رَجُلٌ: إِنَّ نَاقَةً لِي ضَلَّتْ، فَإِنْ وَجَدْتَهَا فَأَمْسِكْهَا، فَوَجَدَهَا، فَلَمْ يَجِدْ صَاحِبَهَا، فَمَرِضَتْ، فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: انْحَرْهَا، فَأَبَى، فَنَفَقَتْ، فَقَالَتْ: اسْلَخْهَا حَتَّى نُقَدِّدَ شَحْمَهَا وَلَحْمَهَا وَنَأْكُلَهُ، فَقَالَ: حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَأَتَاهُ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: (**هَلْ عِنْدَكَ غِنًى يُغْنِيكَ**)؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: (**فَكُلُوهَا**). قَالَ: فَجَاءَ صَاحِبُهَا فَأَخْبَرَهُ الْخَبَرَ، فَقَالَ: هَلاَّ كُنْتَ نَحَرْتَهَا؟ قَالَ: اسْتَحْيَيْتُ مِنْكَ. [د٣٨١٦].

---

(١) ـ شێخ سالحێ شامی نەڤ فەرموودە هەر ب وێ هەژمارێ شوینا ڤێ د مالپەرێ خۆدا نینایە:

٢٦٧٦ - عنْ واثلةَ بنِ الأسْقعِ قالَ: أخذَ رسُولُ اللهِ ﷺ برأسِ الثَّريدِ فَقَالَ: (**كُلوا باِسْمِ اللهِ مِنْ حَوَاليها، واغفوا رأسَها، فإنَّ البركَةَ تأتِيهَا مِن فَوْقِها**). [جه٣٢٧٦].

* صحيح.

[وانظر: ٢٦٤٢].

**ژ واسیلەیێ کورێ ئەسقەعی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) سەرێ تەشریفێ گرت و گۆت: (ب ناڤێ خودێ ل دۆرماندۆرێت وێ بخۆن و ژ سەریڤە وێ بهێلن، ب راستی بەرەكەت ژ سەرێ وێ دهێتە خوارێ).**

* حسن الإسناد.

**ژ جابرێ کورێ سەمورەیی (رضي الله عنه): گۆت: زەلامەك ل حەررە ئاکنجی بوو و هەڤژینا وی و زارۆکێت وی د گەل بوون، ئینا زەلامەکی گۆت: ب راستی حێشترەکا من یا بەرزە بووی، ئەگەر تە دیت ل دەڤ خۆ بهێلە، ئینا دیت و خودانێ وێ نەدیت، و نەساخ بوو، ئینا هەڤژینا وی گۆت: ڤەکوژە، و وی نەڤیا، ئینا مر، ژنا وی گۆت: کەڤل بکە دا ئەم دوینگێ وێ و گۆشتێ وێ بۆ خۆ هشك بکەین و بخوین، ئینا گۆت: هەتا پرسیارا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دکەم، هاتە دەڤ و پرسیار ژێ کر، ئینا گۆت: (ئەرێ تە تشتەك هەیە تە ژێ بێ منەت بکەت)؟ گۆت: نەخێر، گۆت: (وێ بخۆن) گۆت: خودانێ وێ هات و سوحبەت بۆ ڤەگێرا، ئینا گۆت: بۆچی تە نەڤەدکوشت؟ گۆت: من شەرم ژ تە دکر.**

## ٣٠ . باب: الاجتماع على الطعام.

## بابەتێ: خوارنا پێکڤە.

٢٦٧٨ – عَنْ وَحْشِيٍّ: أَنَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّا نَأْكُلُ وَلاَ نَشْبَعُ، قَالَ: (**فَلَعَلَّكُمْ تَفْتَرِقُونَ**)؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: (**فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ، يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ**). [د٣٧٦٤/ جه٣٢٨٦].

* حسن.

**ژ وەحشی (رضي الله عنه) گۆت: هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ، ب راستی ئەم دخۆین و ئەم تێر نابین؟ گۆت: (بەلکی هوین جودا جودا دخۆن)، گۆتن: بەلێ، گۆت: (خوارنا خۆ کۆمکەن و ناڤێ خودێ لێ بینن، خودێ دێ بۆ هەوە بەرەکەتێ ئێخیتێ).**

## ٣١ . باب: عرض الطعام.

## بابەتێ: پێشکێشکرنا خوارنێ.

٢٦٧٩ – عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ قَالَتْ: أُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِطَعَامٍ، فَعَرَضَ عَلَيْنَا، فَقُلْنَا: لاَ نَشْتَهِيهِ، فَقَالَ: (**لاَ تَجْمَعْنَ جُوعاً وَكَذِباً**). [جه٣٢٩٨].

* حسن.

**ژ ئەسمائا کچا یەزیدی (ﷺ) گۆت: هندەك خوارن بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە ئینان، ئینا بۆ مە پێشکێش کر، مە گۆت: دلێ مە ناچیتێ ئینا گۆت: (برسێ و درەوێ د گەلێك کۆم نەکەن).**

## ٣٢ . باب: الدعاء لصاحب الطعام.

**بابەتێ: دوعاکرنێ بۆ خودانێ خوارنێ.**

٢٦٨٠ - عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) جَاءَ إِلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَجَاءَ بِخُبْزٍ وَزَيْتٍ، فَأَكَلَ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الأَبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ المَلَائِكَةُ**).[د٣٨٥٤].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: سەعدێ کوڕێ عوبادەی (ﷺ) نان و زەیت بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ئینان خوارن، پاشی پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (خودێ خێرا وی بدەتە هەوە یێ خوارنێ ددەتە رۆژیگران و چاك و خۆپارێزکار خوارنا هەوە بخۆن و ملیاکەت بۆ هەوە دوعا گونەه ژێبرنێ بکەن).**



## الفصل الثاني:الذبائح والصيد.

## پشكا دووێ: سەرژێكری و نێچیر.

### ١ . باب: الأَمر بإحسان الذبح والقتل.

### بابەتێ: فەرمانكرن ب باش سەرژێكرن و كوشتنێ.

٢٦٨١ - (م) عَنْ شَدَّاد بْنِ أَوْسٍ قَالَ: ثِنْتَانِ حَفِظْتُهُمَا عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ اللهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ؛ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ؛ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ**). [م١٩٥٥].

**ژ شەدادێ كوڕێ ئەوسى (رضي الله عنه) گۆت من دو تشت یێت ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژبەر كرین، گۆت: (ب راستی خودێ كارجوانی و بنەجهی د هەمی تشتاندا یێ واجب كری، ڤێجا هەكە هەوە كوشت جوان و بنەجه كوشتنێ بكەن[1]، و هەكە هەوە ڤەكوشت جوان و بنەجه ڤەكوشتنێ بكەن، و ئێك ژ هەوە بلا كێرا خۆ خۆش كەت و ڤەكوشتییا خۆ تەنا بكەت)[2].**

### ٢ . باب: الفرع والعتيرة.

### بابەتێ: فەرەعە و عەتیرەیێ.

٢٦٨٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِيرَةَ**).

وَالْفَرَعُ: أَوَّلُ النِّتَاجِ، كَانُوا يَذْبَحُونَهُ لِطَوَاغِيتِهِمْ، وَالْعَتِيرَةُ فِي رَجَبٍ. [خ٥٤٧٣/ م١٩٧٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (فەرەع و عەتیرە نە د واجبن).**

**فەرەع: بەرێ ئێكێیە یێ گیانەوەری، چ حێشتر بیت چ پەز بیت عەرەبان د نەزانینێدا واجب ددیت بهێتە ڤەكوشتن، و عەتیرە ئەو قوربانە یێ وان د رەجەبێدا واجب ددیت ڤەكوژن.**

---

(١) مەخسەد پێ د حدود و قیساساندا.

(٢) كێرێ ل سەر ستۆی گیرۆ نەكەت و حێل ل نەردی نەدەت، كێرێ پێش چاڤان خۆش نەكەت ...هتد.

## ٣ ـ باب: ما يفعله المذكي

## بابەتێ: ئەو كارێ سەرژێكەر دكەت.

٢٦٨٣ – (ق) عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِذِي الحُلَيْفَةِ، فَأَصَابَ النَّاسَ جُوعٌ، فَأَصَابُوا إِبلاً وَغَنَماً، قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي أُخْرَيَاتِ الْقَوْمِ، فَعَجِلُوا وَذَبَحُوا وَنَصَبُوا الْقُدُورَ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِالْقُدُورِ فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَمَ، فَعَدَلَ عَشَرَةً مِنَ الْغَنَمِ بِبَعِيرٍ، فَنَدَّ منها بعيرٌ، فطَلَبُوهُ فَأَعْيَاهُمْ، وَكَانَ فِي الْقَوْمِ خَيْلٌ يَسِيرَةٌ، فَأَهْوَى رَجُلٌ مِنْهُمْ بِسَهْمٍ، فَحَبَسَهُ اللهُ، ثُمَّ قَالَ: **(إِنَّ لِهَذِهِ الْبَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا، فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا)**. قَالَ: فَقُلْتُ: إِنَّا نَرْجُو ـ أَوْ نَخَافُ ـ الْعَدُوَّ غَداً، وَلَيْسَتْ مَعَنَا مُدًى، أَفَنَذْبَحُ بِالْقَصَبِ؟ قَالَ: **(مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ، فَكُلُوهُ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذلِكَ: أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الحَبَشَةِ)**.[خ٢٤٨٨/ م١٩٦٨].

**ژ رافعێ كوڕێ خەدیجی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم ل زیلحولەیفە د گەل پێغەمبەری بووین (ﷺ)، خەلك برسی بوون و حێشتر و پەز گەهشتبوونێ، گۆت: و پێغەمبەر (ﷺ) ل دویماهییا خەلكی بوو، وان لەز كرن و ڤەكوشتن و قازان دانان، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) فەرمان كر قازان بهێنە سەرنشیڤكرن، پاشی لێكڤەكرن، و دەه پەز دانانە بەرامبەر حێشترەكێ، و حێشترەك ژ وان تەڤیا و دویڤرا چۆن، ئەو وەستاندن و نەگرت، و هەسپ د ناڤ خەلكیدا د كێم بوون، ئینا زەلامەكی ژ وان تیرەك هاڤێتێ و ئینا خودێ راوەستاند، پاشی گۆت: (ب راستی ڤان گیانەوەران كویڤیاتی یا هەی وەكی كویڤیاتییا دوڕندەیان، وان هوین نەچاركرن ڤێ د گەل بكەن). گۆت: من گۆت: مە سوبەهی دژمن دڤێت یان ژێ دترسین، و كێر د گەل مە نینن، ئەرێ ب قامیشی ڤەكوژین؟ گۆت: (ئەوا خوین ڕێتی و ناڤێ خودێ ل سەر هاتییە ئینان، بخۆن، ب ددان و نینۆكێ نەبیت، و ئەز دێ بۆ هەوە بێژم ژ بەر چ، هندیكە ددانە ئەو هەستییە، و هندیكە نینۆكە ئەو كێرێت حەبەشیانە).**

٢٦٨٤ – (خ) عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّهُ كَانَتْ لَهُمْ غَنَمٌ تَرْعَى بِسَلْعٍ، فَأَبْصَرَتْ جَارِيَةٌ لَنَا بِشَاةٍ مِنْ غَنَمِنَا مَوْتاً، فَكَسَرَتْ حَجَراً فَذَبَحَتْهَا بِهِ، فَقَالَ لَهُمْ: لاَ تَأْكُلُوا حَتَّى أَسْأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ)، أَوْ أُرْسِلَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) مَنْ يَسْأَلُهُ، وَأَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنْ ذَاكَ، أَوْ أَرْسَلَ، فَأَمَرَهُ بِأَكْلِهَا. [خ٢٣٠٤].

**ژ كەعبێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: وان پەز هەبوو ل سەلەع دچەری، ئینا جارییەكێ پەزەكا مە دیت یا دمریت، بەرەك شكاند و پێ ڤەكوشت، گۆتە وان: نەخۆن**

**هەتا ئەز پرسیارا پێغەمبەری (ﷺ) دکەم یان ئێکی فرێدکەم پرسیارا پێغەمبەری (ﷺ) بکەت، و وی پرسیارا وێ چەندێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) کر یان ئێك هنارت، ئینا فەرمانا وی کر ئەو وێ بخۆن.**

٢٦٨٥ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: إِذَا نُحِرَتِ النَّاقَةُ فَذَكَاةُ مَا فِي بَطْنِهَا فِي ذَكَاتِهَا، إِذَا كَانَ قَدْ تَمَّ خَلْقُهُ وَنَبَتَ شَعْرُهُ، فَإِذَا خَرَجَ مِنْ بَطْنِ أُمِّهِ ذُبِحَ، حَتَّى يَخْرُجَ الدَّمُ مِنْ جَوْفِهِ. [ط١٠٦١].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەگەر حێشتر هاتە ڤەکوشتن هینگێ ڤەکوشتنا تێژکا د زکیدا د ڤەکوشتنا وێدایە، ئەگەر چێکرنا وێ تمام ببیت و موی لێ هاتبن، و ئەگەر ئەو ژ زکێ ماکا خۆدا دەرکەفت ڤەکوژن دا خوین ژ ناڤ هناڤان دەرکەڤیت.**

## ٤ . باب: ذبيحة الأَعراب.

## بابەتێ: ڤەکوشتییێ کۆچەرە عەرەبان.

٢٦٨٦ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ قَوْماً قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ قَوْماً يَأْتُونَنَا بِاللَّحْمِ، لاَ نَدْرِي: أَذَكَرُوا اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ أَمْ لاَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**سَمُّوا اللهَ عَلَيْهِ، وَكُلُوهُ**). [٢٠٥٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: هندەك کەسان گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ هندەك کەس گۆشتی بۆ مە دئینن، ئەم نوزانین: کا ناڤێ خودێ ل سەر ئینایە یان نە. ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ناڤێ خودێ ل سەر بینن و بخۆن).**

## ٥ . باب: الصيد بالكلب وبالقوس.

## بابەتێ: نێچیرا ب سەی و ب تیرێ.

٢٦٨٧ - (ق) عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قُلْتُ: إِنَّا قَوْمٌ نَصِيدُ بِهَذِهِ الْكِلاَبِ؟ فَقَالَ: (**إِذَا أَرْسَلْتَ كِلاَبَكَ الْمُعَلَّمَةَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ، فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَإِنْ قَتَلْنَ؛ إِلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَهُ عَلَى نَفْسِهِ، وَإِنْ خَالَطَهَا كِلاَبٌ مِنْ غَيْرِهَا، فَلاَ تَأْكُلْ**). [خ٥٤٨٣ (١٧٥)/ م١٩٢٩]

**ژ عەدییێ کوڕێ حاتیمی (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر، من گۆت: ئەم خەلکەکین ب ڤان سەیان نێچیرێ دکەین؟ ئینا گۆت: (ئەگەر تە سەیێت خۆ**

**پێت فێركری هنارتن و تە ناڤێ خودێ ئینا ئەوا بۆ هەوە دگرن بخۆ خۆ ئەگەر كوشت بیت ژی، ئەو نەبیت سەی خوار بیت، هینگێ ئەز دترسم وی بۆ خۆ گرتبیت، و ئەگەر هندە سەیێت نەفێركری تێكەلی وان بن نەخۆ).**

٢٦٨٨ - (ق) عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الخُشَنِيِّ قالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ! إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ أَهْلِ الْكِتَابِ، أَفَنَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ؟ وَبِأَرْضِ صَيْدٍ، أَصِيدُ بِقَوْسِي وَبِكَلْبِي الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، وَبِكَلْبِي المعَلَّمِ، فَمَا يَصْلُحُ لِي؟ قَالَ: **(أَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ: فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فَلاَ تَأْكُلُوا فِيهَا، وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا، وَكُلُوا فِيهَا. وَمَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ، فَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ، فَكُلْ. وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ المُعَلَّمِ، فَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ، فَكُلْ. وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ غَيْرَ مُعَلَّمٍ، فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ، فَكُلْ).** [خ٥٤٧٨/ م١٩٣٠].

ژ ئەبی سەعلەبەیێ خوشەنی گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەم یێ ل عەردەكی خەلكێ خودان كتێبان، ئەرێ ئەم د ئامانێت واندا بخوین؟ و ئەم یێ ل عەردەكی نێچیرێ و ئەز ب تیرێ و ب سەیێ خۆ نە یێ فێركری نێچیرێ دكەم، كا چ بۆ من یێ دورستە؟ گۆت: **(هندیكە ئەوا تە ل راستا خودان كتێباندا گۆتی ئەگەر هەوە ژ بلی وان دیتن تێدا نەخۆن و ئەگەر هەوە نەدیتن بشۆن و تێدا بخۆن، و ئەوا تو ب تیرا خۆ نێچیر دكەی و تە ناڤێ خودێ ل سەر ئینایی بخۆ، و ئەوا تو ب سەیێ خۆ یێ فێركری نێچیر دكەی و تە ناڤێ خودێ ل سەر ئینایی بخۆ، و ئەوا تو ب سەیێ خۆ یێ نەفێركری نێچیر دكەی ئەگەر تو گەهشتی ڤەكوژی بخۆ).**

٦ ـ باب: إِذا غاب الصيد يومين أَو أَكثر.

**بابەتێ: ئەگەر نێچیر دو رۆژان یان پتر نەهاتە دیتن.**

٢٦٨٩ - (م) عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الخُشَنِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ، فَغَابَ عَنْكَ، فَأَدْرَكْتَهُ، فَكُلْهُ، مَا لَمْ يُنْتِنْ).** [م١٩٣١].

ژ ئەبی سەعلەبەیێ خوشەنی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر تە تیرا خۆ هاڤێت و ل تە بەرزە بوو، و تو ڤێرا گەهشتی بخۆ هندی گەنی نەبیت).**

## ٧ ـ باب: النهي عن الصيد بالخَذْف والبُنْدُقَة.

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ نێچیركرنا ب بەرتیفك و رساسێ گروڤر.

٢٦٩٠ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ: أَنَّهُ رَأَى رَجُلاً يَخْذِفُ، فَقَالَ لَهُ: لاَ تَخْذِفْ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ الخَذْفِ . أَوْ كَانَ يَكْرَهُ الخَذْفَ . وَقَالَ: (**إِنَّهُ لاَ يُصَادُ بِهِ صَيْدٌ، وَلاَ يُنْكَأُ بِهِ عَدُوٌّ، وَلكِنَّهَا قَدْ تَكْسِرُ السِّنَّ، وَتَفْقَأُ الْعَيْنَ**). ثُمَّ رَآهُ بَعْدَ ذلِكَ يَخْذِفُ، فَقَالَ لَهُ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ نَهَى عَنِ الخَذْفِ . أَوْ كَرِهَ الخَذْفَ . وَأَنْتَ تَخْذِفُ؟! لاَ أُكَلِّمُكَ كَذَا وَكَذَا. [خ٥٤٧٩ (٤٨٤١)/ م١٩٥٤].

**ژ عەبدوللایێ كورێ موغەففەل (رضي الله عنه) گۆت: وی زەلامەك دیت بەرتیڤانكەك هاڤێت، ئینا گۆتێ: بەرتیڤانكا نەهاڤێژە، ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان یا ژ بەرتیڤانكێ كری، یان حەژێ نەدكر، و گۆت: (ب راستی نێچیر ب وێ ناهێتە كرن، و دژمن پێ ناهێتە ئێشاندن، بەلێ دبیت ئەو ددانی بشكێنیت و چاڤی بپەقینیت. پاشی پشتی هینگێ دیت پێ بەرتیفكا دهاڤێژیت، ئینا گۆتێ: ئەز دبێژمە تە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان یا ژێ كری، یان حەژێ ناكەت، و تو بەرتیڤانكا دهاڤێژی؟ ئەز هندە و هندە د گەل تە نائاخڤم).**

## ٨ ـ باب: تحريم كل ذي ناب من السباع.

## بابەتێ: حەرامكرنا هەمی خودان كێلبەیان ژ دوڕندەیان.

٢٦٩١ – (ق) عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ. [خ٥٥٣٠ (٥٥٢٧)/ م١٩٣٢]

**ژ ئەبی سەعلەبەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ خوارنا هەمی خودان كێلبەیان ژ دوڕندەیان كرییە.**

٢٦٩٢ – (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ. [م١٩٣٤].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ خوارنا هەمی خودان كێلبەیان ژ دوڕندەیان و ژ هەمی خودان پەنجەیان ژ بالندەیان كرییە.**

## ٩ ـ باب: تحريم الحمر الإنسية.

## بابەتێ: حەرامکرنا کەرێت کەهی.

٢٦٩٣ – (ق) عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ قَالَ: حَرَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لُحُومَ الحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ. [خ٥٥٢٧/ م١٩٣٦].

**ژ ئەبی سەعلەبەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆشتێ کەرێت کەهی حەرام کرییە.**

## ١٠ ـ باب: إباحة الضب والأرنب.

## بابەتێ: حەلالکرنا بزنمشکی و کێڤریشکێ.

٢٦٩٤ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَهْدَتْ أُمُّ حُفَيْدٍ ـ خَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ ـ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) أَقِطاً وَسَمْناً وَأَضُبّاً، فَأَكَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنَ الأَقِطِ وَالسَّمْنِ، وَتَرَكَ الضَّبَّ تَقَذُّراً.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَلَوْ كَانَ حَرَاماً مَا أُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [خ٢٥٧٥/ م١٩٤٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دایکا حوفەیدی ـ خالەتا ئیبن عەباسی ـ کەشك و دوهن و بزنمشکەك دیاری پێغەمبەری (ﷺ) کر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) کەشك و دوهن خوار و بزنمشك ژ دلڕەشی هێلا[1].**

**ئیبن عەباسی گۆت: و ئەو ل سەر سێنییا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە خوارن و ئەگەر یا حەرام با ل سەر سێنییا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەدهاتە خوارن.**

٢٦٩٥ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**الضَّبُّ لَسْتُ آكُلُهُ، وَلاَ أُحَرِّمُهُ**). [خ٥٥٣٦/ م١٩٤٣].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بزنمشکی نە ئەز دخۆم و نە ئەز حەرام دکەم).**

٢٦٩٦ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فِيهِمْ سَعْدٌ، فَذَهَبُوا يَأْكُلُونَ مِنْ لَحْمٍ، فَنَادَتْهُمُ امْرَأَةٌ مِنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ): إِنَّهُ لَحْمُ ضَبٍّ، فَأَمْسَكُوا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**كُلُوا، أَوِ اطْعَمُوا، فَإِنَّهُ حَلاَلٌ ـ أَوْ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ، شَكَّ فِيهِ ـ وَلكِنَّهُ لَيْسَ مِنْ طَعَامِي**). [خ٧٢٦٧/ م١٩٤٤].

---

(١) [illegible] نه چونکی یا حەرامە.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خەلكەك ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) و ژ وانا سەعد چۆن ژ گۆشتی بخۆن، ئینا ژنەكێ ژ هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) گازی وان كر: ب ڕاستی ئەو گۆشتێ بزنمشكێیە، ئینا خۆ ڤەگرتن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بخۆن یان بكەنە خوارن، ب راستی ئەو یا حەلالە) یان گۆت: (خرابی تێدا نینە)، گۆمان تێدا هەبوو[1] (بەلێ یا ئەو خوارنا من نینە).

٢٦٩٧ - عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَفْوَانَ، أَوْ صَفْوَانَ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: اصَّدْتُ أَرْنَبَيْنِ فَذَبَحْتُهُمَا بِمَرْوَةٍ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْهُمَا، فَأَمَرَنِي بِأَكْلِهِمَا. [د٢٨٢٢/ ن٤٣٢٤/ ٤٤١١/ جه٣١٧٥/ مي٢٠٥٧]

* صحيح.

ژ موحەممەدێ كوڕێ سەفوانی یان سەفوانێ كوڕێ موحەممەدی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: من دو كێڤریشك نێچیر كرن، ئینا من ب بەرەكێ سپی ڤەكوشتن، و من پرسیار د راستا واندا ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، ئینا فەرمانا من ب خوارنا وان كر.

## ١١ ـ باب: إباحة أكل الجراد والدجاج.

## بابەتێ: حەلالكرنا خوارنا كولی و مریشكێ.

٢٦٩٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى رضي الله عنهما قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) سَبْعَ غَزَوَاتٍ أَوْ سِتًّا، كُنَّا نَأْكُلُ مَعَهُ الجَرَادَ. [خ٥٤٩٥/ م١٩٥٢].

ژ عەبدوللایێ كوڕێ ئەبی ئەوفایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: مە حەفت یان شەش خەزا د گەل پێغەمبەری (ﷺ) كرن مە كولی د گەل وی دخوارن.

٢٦٩٩ - (خ) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيتُ النبيَّ (ﷺ) يَأْكُلُ دَجَاجاً. [خ٥٥١٧].

ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (ڕەزایا خودێ لێ بیت) گۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) دیت مریشك دخوار.

## ١٢ ـ باب: إباحة لحوم الخيل

## بابەتێ: حەلالیا گوشتێ هەسپی

٢٧٠٠ - (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ: نَحَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) فَرَساً، فَأَكَلْنَاهُ. [خ٥٥١٠/ م١٩٤٢]

- وفي رواية للبخاري: وَنَحْنُ بِالْمَدِينَةِ. [خ٥٥١١].

---

(١) ناتكو: ڤەگێر ب گۆمان كەفت كا ئەو گۆت یان نەو.

**ژ ئەسمائا کچا ئەبی بەکری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) مە هەسپەك ڤەکوشت و مە خوار.**

- **و د ڤەگێرا بوخاریدا: و ئەم ل مەدینەیێ بووین.**

٢٧٠١ - عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كُنَّا نَأْكُلُ لحُومَ الْخَيْلِ، قُلْتُ: فَالْبِغَالُ؟ قَالَ: لاَ. [جه٣١٩٧].

* صحيح الإسناد.

**ژ عەتائێ کورێ رەباحی (رحمه الله) ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی گۆت: مە گۆشتێ هەسپان دخوار، من گۆتێ پا یێت هێستران؟ گۆت: نەخێر.**

## ١٣ ـ باب: النهي عن صبر البهائم.

### بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ گرێدانا گیانەوەران بۆ ئارمانجانێ.

٢٧٠٢ - (ق) عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَنَسٍ عَلَى الحَكَمِ بْنِ أَيُّوبَ، فَرَأَى غِلْمَاناً، أَوْ فِتْيَاناً، نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا، فَقَالَ أَنَسٌ: نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ تُصْبَرَ الْبَهَائِمُ. [خ٥٥١٣/ م١٩٥٦].

**ژ هیشامێ کورێ زەیدی (رحمه الله) گۆت ئەز د گەل ئەنەسی چۆمە دەڤ حەکەمێ کورێ ئەیووبی، چەند بسپۆرەك یان گەنجەك دیتن مریشکەك یا گرێدای و یێ بەرا دهاڤێژنێ، ئینا ئەنەسی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهی یا کری جانەوەر بهێنە گرێدان بۆ کوشتنێ.**

٢٧٠٣ - (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ، فَمَرُّوا بِفِتْيَةٍ، أَوْ بِنَفَرٍ، نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا، فَلَمَّا رَأَوْا ابْنَ عُمَرَ تَفَرَّقُوا عَنْهَا، وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَعَنَ مَنْ فَعَلَ هَذَا. [خ٥٥١٥/ م١٩٥٨].

**ژ سەعیدێ کورێ جوبەیری (رحمه الله) گۆت: ئەز د گەل ئیبن عومەری ل بەر هندە لاوێت قورمیشییانڕا یان هندە کەسێت وانڕا بۆرین، مریشکەك ڤەنابوو و تیر دهاڤێتنێ، ڤێجا دەمێ وان ئیبن عومەری دیتی، ژێك بەلاڤ بوون، ئیبن عومەری گۆت: کێ ئەڤە کرییە؟ ب راستی پێغەمبەری (ﷺ) لەعنەتێت ل وی کرین یێ ئەڤە کری.**

٢٧٠٤ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ تَتَّخِذُوا شَيْئاً فِيهِ الرُّوحُ غَرَضاً)**.[م١٩٥٧].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(چو تشتێ ب رح نەڤەنن و بكەنە ئارمانج).**

## ١٤ ـ باب: صيد البحر.

## بابەتێ: نێچیرا دەریای.

٢٧٠٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ): أَنَتَوضَّأُ بِمَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ رسولُ الله (ﷺ): (**هُوَ الْبَحْرُ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ**). [د٨٣/ ت٦٩/ جه٣٨٦، ٣٢٤٦].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) زەلامەكی پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر: ئەرێ ئەم دەستنڤێژێ ب ئاڤا دەریای بگرین؟ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەو دەریایا ئاڤا وێ یا پاكە و مرارێ وێ یێ حەلالە).**

٢٧٠٦ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**أُحِلَّتْ لَكُمْ مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ، فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ: فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ، وَأَمَّا الدَّمَانِ: فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ**). [جه٣٢١٨، ٣٣١٤].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دو مری و دو خوین بۆ هەوە یێت حەلال بووین، هندیكە دو مرینە ماسی و كولییە، و هندیكە دو خوینن: مێلاك و دێدكە)[1].**

## ١٥ ـ باب: السلخ.

## بابەتێ: كەڤلكرنێ.

٢٧٠٧ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَرَّ بِغُلاَمٍ يَسْلُخُ شَاةً، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**تَنَحَّ حَتَّى أُرِيَكَ**)، فَأَدْخَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَدَهُ بَيْنَ الْجِلْدِ وَاللَّحْمِ، فَدَحَسَ بِهَا حَتَّى تَوَارَتْ إِلَى الْإِبِطِ، وَقَالَ: (**يَا غُلاَمُ، هَكَذَا فَاسْلُخْ**)، ثُمَّ مَضَى، وَصَلَّى لِلنَّاسِ، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. [د١٨٥/ جه٣١٧٩].

* صحيح.

قَالَ أَبُو دَاوُد: زَادَ عَمْرٌو فِي حَدِيثِهِ: «يَعْنِي: لَمْ يَمَسَّ مَاءً».

---

(١) هندەك دبێژنێ خالخالك.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر بسپۆرەكیڕا بۆری پەزەك كەڤل دكر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: **(خۆ ڤەدە هەتا ئەز نیشا تە بدەم)** ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێ خۆ كرە د ناڤبەرا كەڤلی و گۆشتیڕا و گڤاشت هەتا دەستێ وی ل بنكەفشی بەرزە بووی و گۆت: **(گەنجۆ ئها هۆسا كەڤل بكە)** پاشی چۆ و نڤێژ ل بەری خەلكی كر و دەستنڤێژ نەشویشت.

ئەبو داوود گۆت: و عەمری د فەرموودا خۆدا زێدە كر: ئانكو: دەستێت خۆ نەشویشتن.

## ١٦ـ باب: النهي عن ذبح الحلوب.

## بابەتێ: نەباشییا ڤەكوشتنا یا ب شیر.

٢٧٠٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَتَى رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ، فَأَخَذَ الشَّفْرَةَ لِيَذْبَحَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِيَّاكَ وَالْحَلُوبَ**). [جه٣١٨٠].

* صحيح. وأخرجه مسلم في حديث طويل (٢٠٣٨).

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ زەلامەكێ ئەنساری، كێرك هەلگرت دا بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سەرژێكەت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هشیاری یا ب شیر بی)**[1].

## ١٧ـ باب: ما جاء في الضفدع.

## بابەتێ: ئەوا د راستا بەقێدا هاتی.

٢٧٠٩ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ: أَنَّ طَبِيباً سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنْ ضِفْدَعٍ يَجْعَلُهَا فِي دَوَاءٍ، فَنَهَاهُ النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ قَتْلِهَا. [د٣٨٧١/ ن٤٣٦٦/ مي٢٠٤١].

* صحيح.

ژ عەبدولرەحمانێ كوڕێ عوسمانی (ﷺ) گۆت: نوژدارەكی پرسیارا بەقێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) كر بكەتە د ناڤ دەرمانیدا، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ئەو ژ كوشتنا وێ پاشڤەلێدا.

(١) ئانكو: یا ب شیر نەڤەكوژی.

## ١٨ ـ باب: ذكاة الجنين.

### بابەتێ: ڤەكوشتنا تێژكا د زكیدا.

٢٧١٠ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**ذَكَاةُ الْجَنِينِ ذَكَاةُ أُمِّهِ**). [د٢٨٢٨/ مي٢٠٢٢].

* صحيح.

[وانظر: ٢٦٨٥].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ڤەكوشتنا تێژكا د زكیدا ڤەكوشتنا دایكا وێیە).**

## ١٩ ـ باب: ما قطع من الحي فهو ميت.

### بابەتێ: ئەوا ژ گیانەوەرێ زیندی دهێتە ژێڤەكرن ئەو یێ مرارە.

٢٧١١ – عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْمَدِينَةَ وَهُمْ يَجُبُّونَ أَسْنِمَةَ الْإِبِلِ، وَيَقْطَعُونَ أَلْيَاتِ الْغَنَمِ، قَالَ: (**مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ، فَهِيَ مَيْتَةٌ**). [د٢٨٥٨/ ت١٤٨٠/ مي٢٠٦١].

* صحيح.

**ژ ئەبی واقدێ لەیسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینەیێ و وان پشتا حێشترێ دبرِی، و دوینگێ پەزی ژێڤە دكرن، ئینا گۆت: (ئەوا ژ گیانەوەری دهێتە برِین و ئەو یێ ساخ ئەو یا مرارە).**

٢٧١٢ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ، فَمَا قُطِعَ مِنْهَا فَهُوَ مَيْتَةٌ**). [جه٣٢١٦].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەوا ژ گیانەوەری دهێتە برِین و گیانەوەر یێ ساخ بیت، ئەوا ژێ برِی یا مرارە).**



## الفصل الثالث: الأضحية.

## پشكا سێیێ: قوربان.

### ١ ـ باب: سنة الأضحية ووقتها.

### بابەتێ: سونەتا قوربانی و دەمێ وی.

٢٧١٣ – (ق) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّي، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، مَنْ فَعَلَهُ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلُ، فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لِأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ**). فَقَامَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ، وَقَدْ ذَبَحَ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي جَذَعَةً، فَقَالَ: (**اذْبَحْهَا، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ**).　　[خ٥٥٤٥ (٩٥١)/ م١٩٦١]

**ژ بەرائی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئێكەمین تشت ئەم د ئەڤێ رۆژا خۆدا دەست پێ بكەین نڤێژێ بكەین، و پاشی بزڤرین قوربانی ڤەكوژین، و یێ ئەڤە كر ئەو ب رێكا مە كەفت، و یێ پێشتر ڤەكوشت، ئەو بەس گۆشتەكە پێشكێشی مالا خۆ كری و چو ژێ قوربان نینە)**، ئینا بوردەیێ كورێ نیاری رابوو، و وی ڤەكوشتبوو گۆت: من گسیكەك یێ هەی، ئینا گۆت: **(ڤەكوژە و پشتی تە بۆ كەسێ دی بەرناكەڤیت)**.

### ٢ ـ باب: سنّ الأضحية.

### بابەتێ: ژیێ قوربانی.

٢٧١٤ – (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَذْبَحُوا إِلاَّ مُسِنَّةً ؛ إِلاَّ أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ، فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ**).　　[م١٩٦٣].

**ژ جابری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دو سالی نەبیت بۆ قوربانی نەڤەكوژن ئەو نەبیت ب دەست هەوە نەكەڤیت ڤێجا هوین كاڤرەكێ شەش هەیڤی ژ پەزێ سپی ڤەكوژن)**.

٢٧١٥ – عَنْ عَاصِمِ بْنِ كُلَيْبِ بنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) يُقَالُ لَهُ: مُجَاشِعٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ، فَعَزَّتِ الْغَنَمُ، فَأَمَرَ مُنَادِياً فَنَادَى: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: (**إِنَّ الْجَذَعَ يُوَفِّي مِمَّا يُوَفِّي مِنْهُ الثَّنِيُّ**).　　[د٢٧٩٩/ ن٤٣٩٥/ جه٣١٤٠].

**ژ عاسمێ کورێ کولەیبێ کورێ شیهابی ژ بابێ خۆ (ڕەزی خودێ ژێ بیت) گۆت: ئەم د گەل زەلامەکی بووین ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) دبێژنێ: موجاشیع ژ بەنی سولەیمییە، پەز کێم بوو، ئینا فەرمان ل گازیکەرەکی کر، و گازی کر: ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (بێ گۆمان بەرخێ شەش هەیڤی جهێ وێ دگریت یا دو سالی جهێ وێ دگریت).**

### ٣ ـ باب: أضحية النبي (ﷺ).

### بابەتێ: قوربانێ پێغەمبەری (ﷺ).

٢٧١٦ - (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: ضَحَّى النَّبِيُّ (ﷺ) بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ، وَسَمَّى وَكَبَّرَ، وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا.　　　　[خ٥٥٦٥ (٥٥٥٣)/ م١٩٦٦].

**ژ ئەنەسی (ڕەزی خودێ ژێ بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دو بەرانێت سپی یێت ب شاخ قوربان دا، ب دەستێ خۆ ڤەکوشتن، و ناڤێ خودێ ئینا و تەکبیر کر و پێ خۆ دانا سەر رەخێ ستۆیێ وان.**

٢٧١٧ - (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَمَرَ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ، يَطَأُ فِي سَوَادٍ، وَيَبْرُكُ فِي سَوَادٍ، وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ، فَأُتِيَ بِهِ لِيُضَحِّيَ بِهِ. فَقَالَ لَهَا: (**يَا عَائِشَةُ هَلُمِّي الْمُدْيَةَ**). ثُمَّ قَالَ: (**اشْحَذِيهَا بِحَجَرٍ**)، فَفَعَلَتْ، ثُمَّ أَخَذَهَا، وَأَخَذَ الْكَبْشَ فَأَضْجَعَهُ، ثُمَّ ذَبَحَهُ، ثُمَّ قَالَ: (**بِاسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ، وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ**)، ثُمَّ ضَحَّى بِهِ.　　　　[م١٩٦٧].

**ژ عائیشایێ (ڕەزی خودێ ژێ بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان ب بەرانەکی رەش و ب شاخ و پێ رەش و بنزک رەش و چاڤ و دۆرماندۆر رەش کر، دا بکەتە قوربان، ئینا گۆتێ: (ئەی عائیشا کا کێرێ بینە) پاشی گۆت: (ب بەری بهوسە و خوشکە) وێ ئەو کر، پاشی هەلگرت و بەران گرت و درێژ کر، و پاشی ڤەکوشت، و پاشی گۆت: (ب ناڤێ خودێ ئەی خودا ژ موحەممەدی و ژ خلکێ مالا موحەممەدی و ژ ئوممەتا موحەممەدی قەبویل بکە).**

٢٧١٨ - عَنْ جَابِرٍ قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) الْأَضْحَى بِالْمُصَلَّى، فَلَمَّا قَضَى خُطْبَتَهُ نَزَلَ مِنْ مِنْبَرِهِ، وَأُتِيَ بِكَبْشٍ فَذَبَحَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِيَدِهِ، وَقَالَ: (**بِاسْمِ اللهِ، وَاللهُ أَكْبَرُ، هَذَا عَنِّي وَعَمَّنْ لَمْ يُضَحِّ مِنْ أُمَّتِي**).　　　　[د٢٨١٠/ ت١٥٢١].

* صحيح.

ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل نڤێژا عەیدا حاجیا ل نڤێژگەهێ ئامادە بووم، ڤێجا دەمێ خوتبا خۆ ب دویماهی ئینای، ژ مینبەرا خۆ هاتە خوارێ، و بەرانەك بۆ ئینا و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب دەستێ خۆ ڤەکوشت و گۆت: **(ب ناڤێ خودێ و الله اکبر و ئەڤە ژ پێش منڤە و پێش ویڤە ژ ئوممەتا من یێ قوربان نەدایی).**

## ٤ ـ باب: النحر بالمصلى.

## بابەتێ: ڤەکوشتنا قوربانی ل نڤێژگەهێ.

٢٧١٩ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَذْبَحُ وَيَنْحَرُ بِالمصَلَّى. [خ٥٥٥٢ (٩٨٢)]

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل نڤێژگەهێ قوربان (پەز یان حێشتر) ڤەدکوشت[1].

## ٥ ـ باب: الإذن بادخار لحوم الأَضاحي.

## بابەتێ: دەستویردان ب هەلگرتنا گۆشتێ قوربانان.

٢٧٢٠ - (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (مَنْ ضَحَّى مِنْكُمْ، فَلاَ يُصْبِحَنَّ بَعْدَ ثَالِثَةٍ وَبَقِيَ فِي بَيْتِهِ مِنْهُ شَيْءٌ)، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ المقْبِلُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، نَفْعَلُ كَمَا فَعَلْنَا عَامَ المَاضِي؟ قَالَ: (كُلُوا، وَأَطْعِمُوا، وَادَّخِرُوا؛ فَإِنَّ ذلِكَ الْعَامَ كَانَ بِالنَّاسِ جَهْدٌ، فَأَرَدْتُ أَنْ تُعِينُوا فِيهَا). [خ٥٥٦٩/ م١٩٧٤].

ژ سەلەمەیێ کورێ ئەکوەعی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ ژ هەوە قوربان دا، بلا سپێدا سێیێ ب سەر نەهێت و تشتەك ژێ ما بیتە دەڤ وی)** ڤێجا دەمێ بوویە سالا پاشتر، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەم وێ بکەین یا مە ل سالا پار کری؟ گۆت: **(بخۆن و بدەن و هەلگرن، وێ سالێ خەلکێ هەژار و تەنگاڤ بوو، و من ڤیا هوین تێدا هاریکارییێ بکەن)**[2].

---

(١) نڤێژگەهە، ئەو جهە یێ نڤێژا جەژنێ لێ دهێتە کرن و دکەڤیتە دەرڤەی مالان، ل وێرێ پێغەمبەری (ﷺ) قوربان ڤەدکوشت دا موسلمان ببینن و چاڤ لێ بکەن و دا بزانن کارێ مرۆڤ پشتی نڤێژێ بکەت ڤەکوشتنا قوربانییە.

(٢) ئانکو: من ڤیا هوین بدەنە هەژاران و ل دەڤ خۆ نەهێلن.

٢٧٢١ - (م) عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: ذَبَحَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ضَحِيَّتَهُ، ثُمَّ قَالَ: (يَا ثَوْبَانُ، أَصْلِحْ لَحْمَ هَذِهِ)، فَلَمْ أَزَلْ أُطْعِمُهُ مِنْهَا حَتَّى قَدِمَ الْمَدِينَةَ. [م١٩٧٥].

- وفي رواية: فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.

**ژ سەوبانی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) قوربانێ خۆ ڤەکوشت، پاشی گۆت: (ئەی سەوبان گۆشتێ ڤێ سەروبەر بکە)، بەردەوام من ئەو گۆشت ددایێ هەتا هاتییە مەدینەیێ.**

- **و د ڤگێرەکێدا: ل حەجا خاترخواستنێ.**

## ٦ ـ باب: لا يأخذ المضحي شعراً ولا ظفراً.

## بابەتێ: خودانێ قوربانی نە موییێ خۆ ژێڤە دکەت نە نینۆکا.

٢٧٢٢ - (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا رَأَيْتُمْ هِلاَلَ ذِي الْحِجَّةِ، وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ؛ فَلْيُمْسِكْ عَنْ شَعْرِهِ وَأَظْفَارِهِ). [م١٩٧٧].

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە هەیڤا ئێك شەڤی یا زیلحیجێ دیت، و ڤیا قوربانی بدەت، بلا موییێ خۆ و نینۆکێت خۆ بهێلیت)[1].**

## ٧ ـ باب: فضل الأضحية.

## بابەتێ: خێرا قوربانی.

٢٧٢٣ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَا عَمِلَ آدَمِيٌّ مِنْ عَمَلٍ يَوْمَ النَّحْرِ أَحَبَّ إِلَى اللهِ مِنْ إِهْرَاقِ الدَّمِ، إِنَّهَا لَتَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِقُرُونِهَا وَأَشْعَارِهَا وَأَظْلاَفِهَا، وَإِنَّ الدَّمَ لَيَقَعُ مِنَ اللهِ بِمَكَانٍ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ مِنَ الأَرْضِ، فَطِيبُوا بِهَا نَفْساً). [ت١٤٩٣/ جه٣١٢٦].

* ضعيف

* قال الترمذي: حسن غريب.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (مرۆڤی ل رۆژا جەژنا قوربانی چو کار نەکرینە ل دەڤ خودێ خۆشڤیتر بن ژ ڤەکوشتنا قوربانی، و ب راستی**

---

(١) ئانکو: چو ژ لەشێ خۆ ژێڤە نەکەت نە موییان و نە نینۆکان هەتا قوربانێ خۆ ددەت.

**رۆژا قیامەتێ ئەو ب شاخ و موی و سمێت خۆڤە دهێت، خودێ وێ ڤەکوشتنێ قەبویل دکەت بەری خوین بکەڤیتە عەردی، ڤێجا پێ دلخۆش ببن).**

## ٨ ـ باب: الشاة تجزئ عن أهل البيت.

### بابەتێ: پەزەك بەسە و تێرا مالێ هەیە.

٢٧٢٤ – عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ: كَيْفَ كَانَتِ الضَّحَايَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)؟ فَقَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ، حَتَّى تَبَاهَى النَّاسُ فَصَارَتْ كَمَا تَرَى. [ت١٥٠٥/ جه٣١٤٧].

* صحيح.

**ژ عەتائێ کوڕێ یەساری (رحمه الله) گۆت: من پرسیارا ئەبی ئەیووبێ ئەنساری کر: قوربان ل سەردەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د چاوا بوون، گۆت: زەلامی پەزەك پێش خۆ و خەلکێ مالا خۆڤە ددا و ژێ دخوارن و ددان حەتا خەلك کەفتینە د شانازیبرنێدا، وەلێ هات وەکی تو دبینی.**

## ٩ ـ باب: الأضحية عن الميت.

### بابەتێ: دانا قوربانی پێش مریڤە.

٢٧٢٥ – عَنْ عَاصِمِ بْنِ شُرَيْبٍ قَالَ: أُتِيَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه يَوْمَ النَّحْرِ بِكَبْشٍ فَذَبَحَهُ، وَقَالَ: بِسْمِ الله، اللَّهُمَّ مِنْكَ وَلَكَ، وَمِنْ مُحَمَّدٍ لَكَ، ثُمَّ أَمَرَ بِهِ فَتُصُدِّقَ بِهِ. ثُمَّ أُتِيَ بِكَبْشٍ آخَرَ فَذَبَحَهُ، فَقَالَ: بِسْمِ الله اللَّهُمَّ مِنْكَ، وَلَكَ، وَمِنْ عَلِيٍّ لَكَ. قَالَ ثُمَّ قَالَ: ائْتِنِي بِطَابِقٍ مِنْهُ، وَتَصَدَّقْ بِسَائِرِهِ. [هق٩/٢٨٧].

**ژ عاسمێ کوڕێ شورەیبی گۆت: ل رۆژا قوربانی بەرانەك بۆ عەلییێ کوڕێ ئەبی تالبی ئینان، ڤەکوشت و گۆت: ب ناڤێ خودێ، یا خودێ ژ تەیە، و بۆ تەیە، و ژ موحەممەدییە بۆ تە، و پاشی فەرمان پێ دا، کرە خێر، پاشی بەرانەکێ دی بۆ ئینا و ڤەکوشت و گۆت: ب ناڤێ خودێ، یا خودێ ژ تەیە، و بۆ تەیە، و ژ عەلییە بۆ تە، پاشی گۆت: پارچەکێ ژێ بۆ من بینن، و ئەڤا دی هەمی کرە خێر.**

## ١٠ ـ باب: الاشتراك في الأضحية.

**بابەتێ: پشکداری د قوربانیدا.**

٢٧٢٦ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَ الْأَضْحَى، فَاشْتَرَكْنَا فِي الْبَقَرَةِ سَبْعَةً، وَفِي الْبَعِيرِ عَشَرَةً.　　　　[ت٩٠٥، ١٥٠١/ ن٤٤٠٤/ جه٣١٣١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما) گۆت: ئەم ل وەغەرەکێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بووین، و بوو دەمێ قوربانان، ئینا ئەم حەفت د چێلەکێدا پشکدار بووین و دەه د حێشترەکێدا.**

## ١١ ـ باب: ما يكره من الأضاحي وما لا يجوز.

**بابەتێ: یا نەباش د قورباناندا و یا نەدورست.**

٢٧٢٧ – عَنْ عُبَيْدِ بْنِ فَيْرُوزَ قَالَ: سَأَلْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ: مَا لاَ يَجُوزُ فِي الْأَضَاحِيِّ؟ فَقَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ـ وَأَصَابِعِي أَقْصَرُ مِنْ أَصَابِعِهِ، وَأَنَامِلِي أَقْصَرُ مِنْ أَنَامِلِهِ ـ فَقَالَ: (**أَرْبَعٌ لاَ تَجُوزُ فِي الْأَضَاحِيِّ: الْعَوْرَاءُ بَيِّنٌ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ بَيِّنٌ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ بَيِّنٌ ظَلْعُهَا، وَالْكَسِيرُ الَّتِي لاَ تُنْقِي**). قَالَ قُلْتُ: فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَكُونَ فِي السِّنِّ نَقْصٌ، قَالَ: مَا كَرِهْتَ فَدَعْهُ، وَلاَ تُحَرِّمْهُ عَلَى أَحَدٍ.

[د٢٨٠٢/ ت١٤٩٧/ ن٤٣٨١/ جه٣١٤٤/ مي١٩٩٢].

* صحيح.

**ژ عوبەیدێ کورێ فەیروزی (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیارا بەرائێ کورێ عازبی کر: کا چ د قورباناندا چێ نابیت؟ ئینا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ناڤ مەدا رابوو و تبلێت من ژ تبلێت وی کورتتر بوون، و سەرتلێت من ژ سەرتلێت وی کورتتر بوون[١]، ئینا گۆت: (چوار تشت بۆ قوربانی دورست نینن: کۆرەیا کۆراهییا وێ ئاشکەرا و نەساخا نەساخییا وێ ئاشکەرا[٢] و لەنگا لەنگاتییا وێ ئاشکەرا[٣]، و یا شکەستی و ژ بەر شکەستنێ مەژی د**

---

(١) ئانکو: دەستێ وی و تلێت وی ژ یێت من جوانتر بوون.

(٢) ئانکو: یا ژ نەساخییێ ئالفی نەخۆت و نەچەریت.

(٣) ئانکو: نەشێت ب رێڤە بچیت بچەریت لەوا زەعیف بوویە.

**هەستیدا نەمایی)، گۆت: من گۆت: ئەز نەباش دبینم د ددانان‌دا كێماسییەك هەبیت، گۆت: ئەوا نەباش دبینی، بهێلە و ل سەر كەسێ حەرام نەكە.**

٢٧٢٨ - عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ وَالْأُذُنَ.

[ت١٥٠٣/ ن٤٣٨٨/ جه٣١٤٣/ مي١٩٩٤]

* حسن صحيح.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا مە كر، ئەم بەرێ خۆ بدەینە چاڤ و گوهێت قوربانی كا د ساخلەمن یان نە.**

## ١٢ ـ باب: من اشترى أضحيته فأصيبت.

### بابەتێ: یێ قوربانێ خۆ بكڕیت و ل دەڤ وی تشتەك لێ بهێت.

٢٧٢٩ - عَنْ أَبِي حَصِينٍ: أَنَّ ابْنَ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما رَأَى هَدَايَا لَهُ فِيهَا نَاقَةٌ عَوْرَاءٌ فَقَالَ: إِنْ كَانَ أَصَابَهَا بَعْدَما اشْتَرَيْتُمُوهَا فَأَمْضُوهَا، وَإِنْ كَانَ أَصَابَهَا قَبْلَ أَنْ تَشْتَرُوهَا فَأَبْدِلُوهَا.[هق٥/٢٤٢، ٩/٢٨٩].

**ژ (أبي حصين)ی (رضي الله عنه) گۆت: كوڕێ زوبەیری (خودێ ژ وان رازی بیت) د ناڤ چەند قوربانێت خۆدا حێشترەكا مێ یا كۆرە دیت، ئینا گۆت: ئەگەر ئەڤە كۆرە بوویە پشتی هەوە كڕی ببۆرینن، و ئەگەر بەری هوین بكڕن كۆرە ببوو بگوهۆڕن.**

## ١٣ ـ باب: التوكيل في ذبح الأضحية.

### بابەتێ: بریكاری (وەكالەت) د ڤەكوشتنا قوربانیدا.

٢٧٣٠ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَحَرَ بَعْضَ بُدْنِهِ بِيَدِهِ، وَنَحَرَ بَعْضَهَا غَيْرُهُ.

[ن٤٤٣١].

* صحيح.

[وانظر: ٢٠٤٠ في نحر عليّ بعض هدي النبي (ﷺ)].

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هندە قوربانێت خۆ ب دەستێ خۆ ڤەكوشتن، و هندەكێت دی هندەك ژێ ڤەكوشتن.**



## الفصل الرابع: الأشربة وآداب الشرب.

## پشكا چوارێ: ڤەخوارن و رەوشتێت ڤەخوارنێ.

### ١ ـ باب: إثم من منع فضل الماء.

### بابەتێ: گونەها یێ رێ ل ئاڤا زێدە دگریت.

٢٧٣١ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ ماءٍ بِالطَّرِيقِ يَمْنَعُ مِنْهُ ابْنَ السَّبِيلِ. وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَاماً لاَ يُبَايِعُهُ إِلاَّ لِدُنْيَاهُ، إِنْ أَعْطَاهُ مَا يُرِيدُ وَفَى لَهُ؛ وَإِلاَّ لَمْ يَفِ لَهُ. وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلاً بِسِلْعَةٍ بَعْدَ العَصْرِ، فَحَلَفَ بِاللهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا كَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ، فَأَخَذَهَا، وَلَمْ يُعْطَ بِهَا).[خ٧٢١٢ (٢٣٥٨)/ م١٠٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سێ كەسان خودێ رۆژا قیامەتێ ئاخفتنا دلۆڤانی و رازیبوونێ د گەل نائاخڤیت، و گونەهێت وان ژێ نابەت و كریارێت وان قەبویل ناكەت، و ئیزایەكا گران بۆ وانە: مرۆڤەك ل سەر ئاڤەكێ بیت ل چۆلەكی ژ رێڤینگی ڤەگریت، و مرۆڤەك پەیمانا خۆ بدەتە مەزنەكی، پەیمانێ نادەتێ بۆ دنیایێ نەبیت، ڤێجا هەكە دایێ ب جە ئینا و هەكە نەدایێ ب جە نەئینا. و مرۆڤەك پشتی ئێڤاری تشتەكی بفرۆشیتە مرۆڤەكێ دی و بۆ سویند بخۆت وی ب هندێ و هندێ یێ كڕی و ئەو باوەر ژێ بكەت و ئەو نەییێ وەسا).**

### ٢ ـ باب: النهي عن الشرب قائماً.

### بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ ڤەخوارنا ژ پییاڤە.

٢٧٣٢ – (م) عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ نَهَى أَنْ يَشْرَبَ الرَّجُلُ قَائِماً. قَالَ قَتَادَةُ: فَقُلْنَا: فَالأَكْلُ؟ فَقَالَ: ذَاكَ أَشَرُّ أَوْ أَخْبَثُ. [م٢٠٢٤].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) نەهی یا كری زەلام ژ پیاڤە ئاڤێ ڤەخۆت، قەتادەی گۆت: مە گۆتە ئەنەس: پا خوارن؟ گۆت: ئەو خرابترە یان پیسترە.**

٢٧٣٣ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ يَشْرَبَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ قَائِماً، فَمَنْ نَسِيَ؛ فَلْيَسْتَقِئْ). [م٢٠٢٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە ژ پیاڤە نەڤەخۆت، و هەكە ژبیر كر بلا دلێ خۆ راكەت).**

## ٣ ـ باب: الشرب من زمزم وغيره قائماً.

## بابەتێ: ڤەخوارنا ئاڤا زەمزەم و غەیری وێ ژ پیانڤە.

٢٧٣٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: سَقَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مِنْ زَمْزَمَ، فَشَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ. [خ١٦٣٧/ م٢٠٢٧]

زاد مسلم في رواية: وَاسْتَسْقَى وَهُوَ عِنْدَ الْبَيْتِ.

**ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: من ئاڤا زەمزەم دا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەخوار و ئەو یێ ژ پیاڤە بوو.**

**و موسلمی زێدەكرییە: و ئاڤ داخواز كر و ئەو ل دەڤ كەعبێ بوو.**

٢٧٣٥ - (خ) عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه: أَنَّهُ صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ قَعَدَ فِي حَوَائِجِ النَّاسِ فِي رَحَبَةِ الْكُوفَةِ، حَتَّى حَضَرَتْ صَلاَةُ الْعَصْرِ، ثُمَّ أُتِيَ بِمَاءٍ، فَشَرِبَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَذَكَرَ رَأْسَهُ وَرِجْلَيْهِ، ثُمَّ قامَ، فَشَرِبَ فَضْلَهُ وَهُوَ قائِمٌ، ثُمَّ قالَ: إِنَّ نَاساً يَكْرَهُونَ الشُّرْبَ قِيَاماً، وَإِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَنَعَ مِثْلَ ما صَنَعْتُ. [خ٥٦١٦ (٥٦١٥)].

**ژ عەلی (رضي الله عنه): وی نڤێژا نیڤرۆ كر و پاشی بۆ هەوجەیێت خەلكی ل حەوشا مزگەفتا كووفە روینشت هەتا بوویە دەمێ نڤێژا ئێڤاری، پاشی ئاڤ بۆ ئینا و ڤەخوار و نافچاڤێت خۆ و دەستێت خۆ شویشتن، و ڤەگێری گۆت: و سەرێ خۆ و پێت خۆ ژی، پاشی رابوو ژ پێڤە و ئەو ئاڤا مایی ژ پێڤە ڤەخوار، پاشی گۆت: هندەك خەلك ڤەخوارنا ژ پێڤە نەدورست ددانن، و من ئەو كر یا پێغەمبەری (ﷺ) كری.**

٢٧٣٦ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَشْرَبُ قَائِماً وَقَاعِداً. [ت١٨٨٣].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت ئاڤ ژ پیاڤە ڤەدخوار و روینشتی ژی.**

٢٧٣٧ - عَنْ كَبْشَةَ الْأَنْصَارِيَّةِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) دَخَلَ عَلَيْهَا، وَعِنْدَهَا قِرْبَةٌ مُعَلَّقَةٌ، فَشَرِبَ مِنْهَا وَهُوَ قَائِمٌ، فَقَطَعَتْ فَمَ الْقِرْبَةِ تَبْتَغِي بَرَكَةَ مَوْضِعِ فِي رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [ت١٨٩٢/ جه٣٤٢٣].

* صحيح.

**ژ كەبشەیا ئەنساری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ وێ و مەشكەكا هەلاویستی ل دەڤ وێ بوو، و ئاڤ ژێ ڤەخوار و ئەو یێ ژ پیاڤە بوو، ئینا وێ دەڤێ مەشكێ بڕی و وێ بەرەكەتا شوین دەڤێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دخواست.**

## ٤ . باب: النهي عن الشرب من فم السقاء.

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا ڤەخوارنا ژ دەڤێ مەشكێ.

٢٧٣٨ - (خ) عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يُشْرَبَ مِنْ فِي السِّقَاءِ. [خ٥٦٢٨ (٢٤٦٣)].

زاد في رواية لأحمد: قَالَ أَيُّوبُ: فَأُنْبِئْتُ أَنَّ رَجُلاً شَرِبَ مِنْ فِي السِّقَاءِ، فَخَرَجَتْ حَيَّةٌ. [حم٧١٥٣].

**ژ ئەیووبی (ﷺ) ژ عیكریمەیی ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهیا كری ژ دەڤێ مەشكێ بێتە ڤەخوارن.**

**و د ڤەگێرەكا ئەحمەدیدا ئەڤە زێدە كرییە: بۆ من هاتە گۆتن زەلامەكی ژ دەڤێ مەشكێ ڤەخوار مارەك هاتە دەرڤە.**

## ٥ . باب: كراهة التنفس في الإناء.

## بابەتێ: نەباشییا بێهنهەلكێشانێ د ئامانیدا.

٢٧٣٩ - (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إذا شربَ أَحَدُكُمْ؛ فلاَ يَتَنَفَّسْ في الإناءِ).** [خ١٥٣/ م٢٦٧ (٦٥)، الأشربة (١٢١)]

**ژ ئەبی قەتادەی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە ئاڤ ڤەخوار بلا بێهنا خۆ د ئامانیدا نەكێشیت).**

٢٧٤٠ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعُودَ؛ فَلْيُنَحِّ الْإِنَاءَ ثُمَّ لِيَعُدْ، إِنْ كَانَ يُرِيدُ).** [جه٣٤٢٧].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە ڤەخوار بلا بێهنا خۆ د ئامانیدا نەئینیت، و ئەگەر ڤیا بێهنا خۆ بهەلكێشیت بلا ئامانی بدەتە لایەكی پاشی بلا بزڤریت، ئەگەر بڤێت).**

## ٦ . باب: الأيمن فالأيمن في الشرب.

## بابەتێ: ل لایێ راستێ بۆ راستێ د ڤەخوارنێدا.

٢٧٤١ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي دَارِنَا هذِهِ، فَاسْتَسْقَى، فَحَلَبْنَا لَهُ شَاةً لَنَا، ثُمَّ شِبْتُهُ مِنْ مَاءِ بِئْرِنَا هذِهِ، فَأَعْطَيْتُهُ، وَأَبُو بَكْرٍ عَنْ يَسَارِهِ، وَعُمَرُ تُجَاهَهُ، وَأَعْرَابِيٌّ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا فَرَغَ، قَالَ عُمَرُ: هذَا أَبُو بَكْرٍ، فَأَعْطَى الْأَعْرَابِيَّ فَضْلَهُ، ثُمَّ قَالَ: (**الأَيْمَنُونَ، الأَيْمَنُونَ، أَلاَ فَيَمِّنُوا**).

قَالَ أَنَسٌ: فَهْيَ سُنَّةٌ، فَهْيَ سُنَّةٌ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. [خ٢٥٧١ (٢٣٥٢)/ م٢٠٢٩].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ مە ل ڤێ مالا مە، ڤەخوارنەك داخواز کر، ئینا مە پەزەکا خۆ بۆ دۆت، پاشی من د گەل ڤێ ئاڤا بیرا مە تێکەل کر، و من دایێ و رەخێ چەپێ وی ئەبوبەکر بوو، و بەرامبەر وی عومەر بوو، و رەخێ وی یێ راستێ کۆچەرە عەرەبەك بوو، ڤێجا دەمێ ڤەخواری عومەری گۆت: ئەڤە ئەبوبەکرە، ئینا پاشمایێ خۆ دا کۆچەرە عەرەبی و گۆت: (پێت راستێ دویڤرا پێت راستێ دویڤرا[1] هشیار بن راستێ پێش بێخن).**

**ئەنەسی گۆت: (ئەڤە سونەتە ئەڤە سونەتە) سێ جاران.**

٢٧٤٢ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَ مِنْهُ، وَعَنْ يَمِينِهِ غُلاَمٌ، وَعَنْ يَسَارِهِ الأَشْيَاخُ، فَقَالَ لِلْغُلاَمِ: (**أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هؤُلاَءِ**)، فَقَالَ الْغُلاَمُ: وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، لاَ أُوثِرُ بِنَصِيبِي مِنْكَ أَحَداً، قَالَ: فَتَلَّهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي يَدِهِ. [خ٥٦٢٠ (٢٣٥١)/ م٢٠٣٠].

**ژ سەهلێ کورێ سەعدێ ساعدی (رضي الله عنه) گۆت: ئاڤ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هات ژێ ڤەخوار، و لایێ وی یێ راستێ لاوەك لێ بوو، و لایێ چەپێ پیرەمێر بوون، گۆتە لاوی: (دێ دەستویرییا من دەی ئەز بدەمە ڤان)؟ لاوی گۆت: نە ب خودێ یا پێغەمبەرێ خودێ ئەز کەسێ ب بارا خۆ ژ تە ب پێش خۆ نائێخم، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کرە د دەستێ ویدا.**

(١) ئانکو: یێ راستێ هەژیترە پاشی یێ دویڤرا ژ رەخێ راستێ.

### ٧ ـ باب: تغطية الإناء.

### بابەتێ: نخافتنا ئامانی.

٢٧٤٣ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه قَالَ: جاءَ أَبُو حُمَيْدٍ ـ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ ـ مِنَ النَّقِيعِ بِإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَلاَّ خَمَّرْتَهُ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضَ عَلَيْهِ عُوداً)**. [خ٥٦٠٦ (٥٦٠٥)/ م٢٠١١].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەبو حەمید ـ زەلامەك بوو ژ ئەنساران ـ ل نەقیعێ[(١)] ب ئامانەكێ شیری هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بلا تە نخافتبا خۆ ئەگەر تە دارکەك دانابا سەر).**

٢٧٤٤ - (م) وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(غَطُّوا الإِنَاءَ، وَأَوْكُوا السِّقَاء، فَإِنَّ فِي السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فِيهَا وَبَاءٌ، لاَ يَمُرُّ بِإِنَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ غِطَاءٌ، أَوْ سِقَاءٍ لَيْسَ عَلَيْهِ وِكَاءٌ؛ إِلاَّ نَزَلَ فِيهِ مِنْ ذلِكَ الْوَبَاءِ)**. [م٢٠١٤].

**ژ وی (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: (ئامانی بنخێڤن، و مەشكێ گرێدەن، ب راستی د سالێدا شەڤەكا هەی نەخۆشی تێدا دهێتە خوار و د سەر چو ئامانانرا نابۆریت و نەنخافتی بیت یان مەشكەكێ یا گرێدای نەبیت ئەگەر هندەك ژ وێ نەخۆشییێ نەچیتە تێدا).**

٢٧٤٥ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِتَغْطِيَةِ الْإِنَاءِ، وَإِيكَاءِ السِّقَاءِ، وَإِكْفَاءِ الْإِنَاءِ. [جه٣٤١١/ مي٢١٧٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا مە ب نخافتنا ئامانی و گرێدانا مەشكێ و ب دەرنشیڤكرنا ئامانی كر[(٢)].**

### ٨ ـ باب: الشرب كرعاً.

### بابەتێ: ڤەخوارنا ئاڤێ ئێكسەر نە ب ئامانی و نە ب دەستی.

٢٧٤٦ - (خ) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) دَخَلَ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَمَعَهُ صَاحِبٌ لَهُ، فَسَلَّمَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَصَاحِبُهُ، فَرَدَّ الرَّجُلُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، بِأَبِي أَنْتَ

---

(١) جهەكە دكەڤیتە ژێرییا مەدینەیێ.

(٢) هەلبەت ئەگەر ئامانێ ڤالا بیت و چو تێدا نەبیت، و ئەگەر تشتەك تێدا بیت دڤێت بهێتە نخافتن.

وَأُمِّي! وَهِيَ سَاعَةٌ حَارَّةٌ، وَهْوَ يُحَوِّلُ فِي حَائِطٍ لَهُ؛ يَعْنِي: المَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ فِي شَنَّةٍ، وَإِلاَّ كَرَعْنَا)**، وَالرَّجُلُ يُحَوِّلُ المَاءَ فِي حَائِطٍ، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللهِ! عِنْدِي مَاءٌ بَاتَ فِي شَنَّةٍ، فَانْطَلَقَ إِلَى الْعَرِيشِ، فَسَكَبَ فِي قَدَحٍ مَاءً، ثُمَّ حَلَبَ عَلَيْهِ مِنْ دَاجِنٍ لَهُ، فَشَرِبَ النَّبِيُّ (ﷺ)، ثُمَّ أَعَادَ، فَشَرِبَ الرَّجُلُ الَّذِي جاءَ مَعَهُ. [خ٥٦٢١ (٥٦١٣)].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللايی (خودێ ژ وان رازی بيت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ دەڤ زەلامەكێ ئەنساری و هەڤالەكێ وی د گەل بوو (ئەبوبەكر بوو (رضي الله عنه)) ئينا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەڤالێ وی سلاڤ كرێ، و زەلامی سلاڤ وەرگێڕا، ئينا گۆت: باب و دايكێت من گۆری تە ببن و ئەو دەمەكێ گەرم بوو، و وی ئاڤ ژ بيستانی وەردگێڕا بۆ جهەكێ دی، ئينا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر تە ئاڤا شەڤين د مەشكەكێدا هەبيت، و ئەگەر نە دێ ئێكسەر بێ ئامان و بێ ب دەستان ڤەخوين)، و وی زەلامی ئاڤ ژ بيستانەكی وەردگێڕا، ئينا زەلامی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من ئاڤا شەڤين د مەشكەكێدا يا هەی، و بۆ لايێ كەپرێ چۆ، و ئاڤ كرە د ئامانەكيدا پاشی ژ پەزەكا مالێ شير دۆتە سەر، ئينا پێغەمبەری (ﷺ) ڤەخوار، پاشی دوبارە كر و ئەو زەلامێ د گەل هاتی ڤەخوار.**

## ٩ ـ باب: استعذاب الماء.

## بابەتێ: خۆشكرن و تەزاندنا ئاڤێ.

٢٧٤٧ - عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يُسْتَعْذَبُ لَهُ الْمَاءُ مِنْ بُيُوتِ السُّقْيَا. قَالَ قُتَيْبَةُ: هِيَ عَيْنٌ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْمَدِينَةِ يَوْمَانِ. [د٣٧٣٥].

* صحيح.

**ژ عائيشايێ (رضي الله عنها) گۆت: ئاڤا شرين بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ژ كانيێت سوقيا دئينا. قوتەيبەيی دگۆت: د ناڤبەرا وێ كانيێ و مەدينەيێدا ڤۆناغا دو رۆژان بوو.**

## ١٠ ـ باب: الحالب لا يجهد الشاة.

## بابەتێ: ئەوێ پەزی ددۆشيت پەزی ب دۆتنێ ناوەستينيت.

٢٧٤٨ - عَنْ ضِرَارِ بْنِ الْأَزْوَرِ قَالَ: أَهْدَيْتُ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) لِقْحَةً، فَأَمَرَنِي أَنْ أَحْلُبَهَا، فَحَلَبْتُهَا، فَجَهَدْتُ فِي حَلْبِهَا، فَقَالَ: **(دَعْ دَاعِيَ اللَّبَنِ)**. [مي٢٠٤٠].

* إسناده حسن.

**ژ زیرارێ کورێ ئەزوەری (ﷺ) گۆت: حێشترەکا ب شیر دیاری بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هات، ئینا فەرمانا من کر ئەز بدۆشم، من ژی دۆت و من زێدە دۆت، ئینا گۆت: (شیری بهێلە شیری د دویڤ خوڕا بینیت)[1].**

## ١١ . باب: الشرب من ثلمة القدح.

## بابەتێ: ڤەخوارنا ئاڤێ ژ جهێ شکەستی یێ ئامانی.

٢٧٤٩ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ الشُّرْبِ مِنْ ثُلْمَةِ الْقَدَحِ، وَأَنْ يُنْفَخَ فِي الشَّرَابِ. [د٣٧٢٢].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) پاشڤەلێدانا ڤەخوارنا ئاڤێ ژ جهێ شکەستی یێ ئامانی و پفکەنە ڤەخوارنێ یا کری.**

## ١٢ . باب: ساقي القوم آخرهم شرباً.

## بابەتێ: ئاڤگێر دویماهییا هەمیان ڤەدخۆت.

٢٧٥٠ – عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (سَاقِي الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْباً).[ت١٨٩٤/ جه٣٤٣٤/ مي٢١٨١].

* صحيح. وهو عند مسلم في حديث طويل (٦٨١).

**ژ ئەبی قەتادە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئاڤگێر دویماهییا هەمیانە).**



(١) ئانکو: شیری هەمییێ نەدۆشە، هندەکێ بهێلە شیرێ سەردا د دویڤ خۆدا بینیت.

## الفصل الخامس: الأشربة المحرمة.

## پشکا پێنجێ: ڤەخوارنێت حەرام

### ١ ـ باب: تحريم الخمر.

### بابەتێ: حەرامكرنا عەرەقێ.

٢٧٥١ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: كُنْتُ سَاقِيَ الْقَوْمِ فِي مَنْزِلِ أَبِي طَلْحَةَ، وَكَانَ خَمْرُهُمْ يَوْمَئِذٍ الْفَضِيخَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مُنَادِياً يُنَادِي: أَلاَ إِنَّ الخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ، قَالَ: فَقَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ: اخْرُجْ فَأَهْرِقْهَا، فَخَرَجْتُ، فَهَرَقْتُها، فَجَرَتْ فِي سِكَكِ المدِينَةِ. فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: قَدْ قُتِلَ قَوْمٌ وَهْيَ فِي بُطُونِهِمْ، فَأَنْزَلَ الله: ﴿لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ﴾الآيَةَ [المائدة:٩٣].[خ٢٤٦٤/ م١٩٨٠].

**ژ ئەنەسی (ڕەزایا خودێ لێ بیت) گۆت: من عەرەق ل مالا ئەبی تەلحەیی بۆ خەلکی دگێڕا، و عەرەڤا وان وێ ڕۆژێ ڤەزیخ بوو[1]، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) فەرمان ب گازیکەرەکی کر گازی بکەت: بزانن عەرەق هاتە حەرامکرن، گۆت: ئەبو تەلحەیی گۆتە من: دەرکەڤە بڕێژە، ئەز دەرکەفتم و من ڕێت، ڤێجا جۆك د ڕێکێت مەدینەیێدا چۆن، ئینا هندەك کەسان گۆت: هندەك کەس هاتنە کوشتن و ئەو د زکێ واندا بوو، ئینا خودێ ئینا خوارێ:** ﴿لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ﴾[2].

٢٧٥٢ - عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ، قَالَ عُمَرُ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شِفَاءً، فَنَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْبَقَرَةِ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ﴾ الْآيَةَ [البقرة:٢١٩]، قَالَ: فَدُعِيَ عُمَرُ، فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، قَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شِفَاءً، فَنَزَلَتِ الْآيَةُ

---

(١) عەرەڤەکە ژ ڕوتەبا دهێتە دورستکرن.

(٢) هندەك ژ سەحابییێت پێغەمبەری (سلاڤێت خودێ ل سەر پێغەمبەری بن) مربوون بەری حەرامکرنا عەرەقێ و قومارێ، ڤێجا هندەك سەحابییان گۆت: ئەرێ پا ئەڤێت بەری نوکە مرین، بەری عەرەق و قومار حەرام ببن، حوکمێ وان چییە؟! ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوارێ، چو گونەھ ل سەر وان نینە، ئەوێت باوەری ئینایین و کار و کریارێت چاك کرین ل سەر ئەوا وان کری [ژ ڤەخوارنا مەیێ و کرنا قومارێ بەری حەرام ببن]. ئەگەر بەری هینگێ خۆ ژ حەرامی یان شیرکێ پاراستبیت، و باوەری ب خودێ ئینابیت و کار و کریارێت ڤەنج کربن، پاشی خۆ ژ وی حەرامی دابنە پاش پێ وان باوەری پێ ئینایی، و پاشی بەردەوام بوویین ل سەر خۆپارستنێ و کار و کریارێت ڤەنج کربن، و خودێ ب خۆ ژی حەژ ڤەنجیکاران دکەت.

الَّتِي فِي النِّسَاءِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ﴾ [النساء: ٤٣]، فَكَانَ مُنَادِي رَسُولِ اللهِ (ﷺ) إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ يُنَادِي: أَلاَ لاَ يَقْرَبَنَّ الصَّلاَةَ سَكْرَانُ، فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ! بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شِفَاءً، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ۝٩١﴾ [المائدة: ٩١]، قَالَ عُمَرُ: انْتَهَيْنَا. [د٣٦٧٠/ ت٣٠٤٩/ ن٥٥٥٥]

* صحيح.

**ژ عومەرێ كوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) دەمێ حەرامكرنا عەرەقێ هاتییە خوارێ عومەری گۆت: یا خودێ ئاشكراكرنەكا ڤەبڕی د عەرەقێدا بدە مە، ئینا ئەڤ ئایەتا سۆرەتا بەقەرە هاتە خوارێ: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ﴾ گۆت: عومەر هاتە گازیكرن و ئەو ئایەت بۆ هاتە خواندن، ئینا گۆت: یا خودێ ئاشكراكرنەكا ڤەبڕی د عەرەقێدا بدە مە، ئینا ئەو ئایەتا د سۆرەتا نیسائدا هاتە خوار: ﴿يَا أَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ﴾ ڤێجا گازیكەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر قامەتا نڤێژێ هاتبا گرتن گازی دكر: بزانن كەس نێزیكی نڤێژێ نەبیت و ئەو یێ سەرخۆش، و عومەر هاتە گازیكرن و ئەو ئایەت بۆ هاتە خواندن، ئینا گۆت: یا خودێ ئاشكراكرنەكا ڤەبڕی د عەرەقێدا بدە مە، ئینا ئەڤ ئایەتە هاتە خوار: ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ ئینا عومەری گۆت: مە بەس كر.**

## ٢ ـ باب: إثم من شرب الخمر ولم يتب.

## بابەتێ: گونەها وی یێ عەرەق ڤەخواری و تۆبە نەكری.

٢٧٥٣ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا، حُرِمَهَا فِي الآخِرَةِ).** [خ٥٥٧٥/ م٢٠٠٣].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ عەرەقێ د دنیایێدا ڤەخۆت و پاشی ژێ تۆبە نەكەت، د ئاخرەتێدا دێ ژێ بێ بار بیت).**

٢٧٥٤ – عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مُدْمِنُ خَمْرٍ).** [جه٣٣٧٦].

* صحيح.

**ژ ئەبی دەردائی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (یێ بەردەوام ل سەر ڤەخوارنا عەرەقێ ناچیتە بەحەشتێ).**

### ٣ . باب: كان تحريم الخمر بعد أحد.

### بابەتێ: حەرامکرنا عەرەقێ پشتی ئوحودێ بوو.

٢٧٥٥ - (خ) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: صَبَّحَ أُنَاسٌ غَدَاةَ أُحُدٍ الخَمْرَ، فَقُتِلُوا مِنْ يَوْمِهِمْ جَمِيعاً شُهَدَاءَ، وَذلِكَ قَبْلَ تَحْرِيمِهَا. [خ٤٦١٨ (٢٨١٥)]

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: هندەکان رۆژا ئوحودێ ل سەر عەرەقێ لێ بوو سپێدە، و هەمی د وێ رۆژا خۆدا ب شەهیدی هاتنە کوشتن و ئەڤە بەری حەرام ببیت.**

### ٤ . باب: الخمر من العنب وغيره.

### بابەتێ: عەرەق ژ تری و تشتێ دی دهێتە دورستکرن.

٢٧٥٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: خَطَبَ عُمَرُ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ نَزَلَ تَحْرِيمُ الخَمْرِ وَهْيَ مِنْ خَمْسَةِ أَشْيَاءَ: الْعِنَبِ، وَالتَّمْرِ، وَالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالْعَسَلِ، وَالْخَمْرُ ما خامَرَ الْعَقْلَ. وَثَلاَثٌ، وَدِدْتُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لَمْ يُفَارِقْنَا حَتَّى يَعْهَدَ إِلَيْنَا عَهْداً: الجَدُّ، وَالْكَلاَلَةُ، وَأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا. [خ٥٥٨٨ (٤٦١٩)/ م٣٠٣٢].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومەری گۆتار ل سەر مینبەرا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خواند و گۆت: ب راستی حەرامییا عەرەقێ هاتە خوارێ و ئەو ژ پێنج تشتان بوو: تری و قەسپ و گەنم و جەهـ و هنگفینی، و عەرەق ئەوە یا عەقلی دڤەشێریت، و سێ تشتان هڤیا من ئەو بوو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ناڤ مەدا بار نەکەت هەتا بۆ مە ئێکلا دکەت[1]: میراتا باپیری و میراتێ وی یێ دمریت و باب و زارۆك نەی و چەند دەرگەهەك ژ دەرگەهێت ریبایێ.**

٢٧٥٧ - عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ مِنَ الْعِنَبِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ التَّمْرِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ الْعَسَلِ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ الْبُرِّ خَمْراً، وَإِنَّ مِنَ الشَّعِيرِ خَمْراً). [د٣٦٧٦/ ت١٨٧٢/ جه٣٣٧٩].

**ژ نوعمانێ کورێ بەشیری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی عەرەق ژ تری یا هەی، و ب راستی عەرق ژ قەسپێ یا هەی، و ب راستی عەرەق ژ**

---

(١) نانكو: نەلێكی تێدا نەمابا.

**هنگڤینی یا هەی، و ب راستی عەرەق ژ گەنمی یا هەی، و ب راستی عەرەق ژ جەهی یا هەی).**

٥ ـ باب: كل شراب أسكر فهو حرام.

**بابەتێ: هەر ڤەخوارنەکا سەرخۆش بکەت ئەو یا حەرامە.**

٢٧٥٨ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ الْبِتْعِ؟ فَقَالَ: (**كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ**). [خ٥٥٨٥ (٢٤٢)/ م٢٠٠١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) پرسیارا ئاڤەهنگڤینی ژ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە کرن؟ گۆت: (هەر ڤەخوارنەکا سەرخۆش بکەت یا حەرامە).**

٢٧٥٩ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ، فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ**).

[د٣٦٨١/ ت١٨٦٥/ جه٣٣٩٣]

* حسن صحيح.

**ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەوا گەلەکا وێ سەرخۆش بکەت کێما وێ ژی یا حەرامە).**

٢٧٦٠ - عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**أَنْهَاكُمْ عَنْ قَلِيلِ مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ**).

[ن٥٦٢٤/ مي٢١٤٤].

* صحيح.

**ژ سەعدێ کوڕێ ئەبی وققاسی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەوا گەلەکا وێ سەرخۆش دکەت ئەز پاشڤەلێدانا هەوە ژ کێما وێ دکەم).**

٦ ـ باب: كراهة انتباذ التمر والزبيب مخلوطين.

**بابەتێ: نەباشییا خۆشاڤکرنا قەسپ و مێویژان د گەلێک.**

٢٧٦١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ الزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ، وَالْبُسْرِ وَالتَّمْرِ، وَقَالَ: (**يُنْبَذُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَتِهِ**). [م١٩٨٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ مێویژا و قەسپا و روتەبا زەر نەبوویی و قەسپا کری، و گۆت: (هەر ئێکێ ژ وان جودا خۆشاڤ ژێ دهێتە دورستکرن).**

٢٧٦٢ – (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَدْ نُهِيَ أَنْ يُنْبَذَ الْبُسْرُ وَالرُّطَبُ جَمِيعاً، وَالتَّمْرُ وَالزَّبِيبُ جَمِيعاً.[م١٩٩١].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی دگۆت: پاشڤەلێدانا هاتییە كرن روتەبا زەر نەبوویی و روتەبا زەر بوویی پێكڤە و قەسپ و مێویژان پێكڤە بكەنە خۆشاڤ.**

## ٧ ـ باب: إباحة النبيذ الذي لم يصر مسكراً.

## بابەتێ: حەلالییا خۆشاڤێ ئەوا نەبوویە سەرخۆشكەر.

٢٧٦٣ – (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُنْبَذُ لَهُ الزَّبِيبُ فِي السِّقَاءِ، فَيَشْرَبُهُ يَوْمَهُ وَالْغَدَ وَبَعْدَ الْغَدِ، فَإِذَا كَانَ مَسَاءُ الثَّالِثَةِ شَرِبَهُ وَسَقَاهُ، فَإِنْ فَضَلَ شَيْءٌ أَهَرَاقَهُ. [م٢٠٠٤].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: مێویژ د مەشكێدا بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دكرە خۆشاڤ، ڤێجا ل رۆژا خۆ و سوبەهی و دوسبە ژێ ڤەدخوار، و ئەگەر ببا ئێڤارا رۆژا سێیێ ژێ ڤەدخوار و ددا هندەكێت دی، و ئەگەر تشتەك ژێ مابا و زێدە ببا درێت.**

٢٧٦٤ – (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، بِقَدَحِي هذَا، الشَّرَابَ كُلَّهُ: الْعَسَلَ، وَالنَّبِيذَ، وَالْمَاءَ، وَاللَّبَنَ. [م٢٠٠٨].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: ب راستی ب ڤی ئامانی خۆ هەمی ڤەخوارن من یێت داینە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ): هنگڤین و خۆشاڤ و ئاڤ و شیر.**

## ٨ ـ باب: الخمر لا تخلل.

## بابەتێ: عەرەقێ ناكەنە سهك.

٢٧٦٥ – (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) سُئِلَ عَنِ الخَمْرِ تُتَّخَذُ خَلاًّ؟ فَقَالَ: (لاَ). [م١٩٨٣].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) پرسیار ژ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە كرن عەرەقێ بكەنە سهك؟ گۆت: (نەخێر).**

## ٩ ـ باب: في الأوعية والظروف.

## بابەتێ: ئامانا و مەشكان.

٢٧٦٦ – (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَنْتَبِذُوا فِي الدُّبَّاءِ، وَلاَ فِي الْمُزَفَّتِ**). وَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُلْحِقُ مَعَهَا: الْحَنْتَمَ وَالنَّقِيرَ. [خ٥٥٨٧/ م١٩٩٢].

ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (ﷺ) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خۆشاڤێ د كولندیدا و د ئامانێ ڤێركریدا چێ نەكەن).** و ئەبو هورەیرە جەرێت كەسك و ڤورمێ ڤوراندی ژی ژ وان ددانان.

٢٧٦٧ - (م) عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (نَهَيْتُكُمْ عَنِ النَّبِيذِ إِلاَّ فِي سِقَاءٍ، فَاشْرَبُوا فِي الأَسْقِيَةِ كُلِّهَا، وَلاَ تَشْرَبُوا مُسْكِراً). [م٩٧٧، الأشربة (٦٣)].

- وفي رواية: (كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنِ الأَشْرِبَةِ فِي ظُرُوفِ الأَدَمِ، فَاشْرَبُوا فِي كُلِّ وِعَاءٍ، غَيْرَ أَنْ لاَ تَشْرَبُوا مُسْكِراً). [م٩٧٧ (٦٥)]
- وفي رواية: قَالَ: (نَهَيْتُكُمْ عَنِ الظُّرُوفِ، وَإِنَّ الظُّرُوفَ . أَوْ ظَرْفاً . لاَ يُحِلُّ شَيْئاً، وَلاَ يُحَرِّمُهُ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ). [م٩٧٧ (٦٤)]

ژ بورەیدەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(من پاشڤەلێدانا دورستكرنا خۆشاڤێ یا كری د مەشكاندا نەبیت، ڤێجا د هەمی مەشكاندا ڤەخۆن و ڤەخوارنا سەرخۆشكەر نەڤەخۆن)**

- و د ڤەگێرەكێدا: **(من پاشڤەلێدانا هەوە كربوو ژ ڤەخوارنان ژ مەشكێت پیستی، ڤێجا ژ هەمی ئامانان ڤەخۆن، بەلێ سەرخۆشكەران نەڤەخۆن).**
- و د ڤەگێرەكێدا: **(من پاشڤەلێدانا هەوە ژ هندەك ئامانان كربوو، و ب راستی ئامان یان ئامانەك چو تشتی نە حەلال دكەت و نە حەرام دكەت، و هەمی سەرخۆشكەر د حەرامن).**

٢٧٦٨ - عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ نَبِيذِ الأَوْعِيَةِ، أَلاَ وَإِنَّ وِعَاءً لاَ يُحَرِّمُ شَيْئاً، كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ). [جه٣٤٠٦].

* صحيح.

ژ ئیبن مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی من پاشڤەلێدانا هەوە ژ دورستكرنا خۆشاڤێ د هندەك ئاماناندا كربوو، و بزانن ئامانەك چو حەرام ناكەت و هەمی سەرخۆشكەر حەرامن).**

## ۱۰ ـ باب: تسمية الخمر بغير اسمها.

## بابەتێ: ناڤکرنا عەرەقێ ب غەیری ناڤێ وێ.

٢٧٦٩ - عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**لَيَشْرَبَنَّ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ، يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا**). [د٣٦٨٨/ جه٤٠٢٠].

* صحيح.

زاد ابن ماجه: (**يُعْزَفُ عَلَى رُؤُوسِهِمْ بِالْمَعَازِفِ وَالْمُغَنِّيَاتِ، يَخْسِفُ اللهُ بِهِمُ الأَرْضَ، وَيَجْعَلُ مِنْهُمُ القِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ**).

**ژ ئەبی مالکێ ئەشعەری (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (بێ گۆمان هندەك كەس ژ ئوممەتا من دێ عەرەقێ ڤەخۆن، و ب غەیری ناڤێ وێ دێ ناڤ کەن).**

■ **و ئیبن ماجە زێدە کرییە: (ل سەر سەرێ وان موسیقە دێ هێتە لێدان و سترانبێژێت ژن دێ ستران بێژن، خودێ دێ وان د ئەردیدا نقۆم کەت و وان گوهۆریت کەتە بەراز و مەیمووینك)[1].**

٢٧٧٠ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَذْهَبُ اللَّيَالِي وَالْأَيَّامُ، حَتَّى تَشْرَبَ فِيهَا طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ، يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا**). [جه٣٣٨٤].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (شەڤ و رۆژ دویماهی ناهێن هەتا دەستەیەك ژ ئوممەتا من عەرەقێ نەڤەخۆن و دێ ب غەیری ناڤێ وێ ناڤ کەن).**

## ۱۱ ـ باب: لعن الله الخمر.

## بابەتێ: خودێ لەعنەت یا ل عەرەقێ کری.

٢٧٧١ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَعَنَ اللهُ الْخَمْرَ، وَشَارِبَهَا، وَسَاقِيَهَا، وَبَائِعَهَا، وَمُبْتَاعَهَا، وَعَاصِرَهَا وَمُعْتَصِرَهَا، وَحَامِلَهَا وَالْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ**).

---

(۱) گوهۆرینا رەوشتێ وانە بۆ رەوشتێ بەراز و مەیمووینکان، چونکی گوهۆرینا راستی ژ بەر قەدرێ پێغەمبەرێ مە (ﷺ) د ئوممەتا [illegible] و خودێ چێتر دزانیت.

- ولفظ ابن ماجه: (لُعِنَتِ الْخَمْرُ عَلَى عَشْرَةِ أَوْجُهٍ: بِعَيْنِهَا، وَعَاصِرِهَا، وَمُعْتَصِرِهَا، وَبَائِعِهَا، وَمُبْتَاعِهَا، وَحَامِلِهَا، وَالْمَحْمُولَةِ إِلَيْهِ، وَآكِلِ ثَمَنِهَا، وَشَارِبِهَا، وَسَاقِيهَا). [د٣٦٧٤/ جه٣٣٨٠].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ لەعنەت یێت ل عەرەقێ کرین، و یێ ڤەدخۆت، و یێ دگێرینیت، و یێ دفرۆشیت، و یێ دکڕیت، و یێ چێ دکەت، و یێ داخواز دکەت، و یێ داخوازا دورستکرنا وێ دکەت، و یێ هەلدگریت و یێ بۆ دهێتە هەلگرتن).**

- **و بێژەیا ئیبن ماجە: (عەرەق ژ دەه رویانڤە لەعنەتکرییە[1]، عەرەق ب خۆ و یێ دورست دکەت و یێ داخوازا دورستکرنا وێ دکەت، و یێ دفرۆشیت، و یێ دکڕیت، و یێ هەلدگریت، و یێ بۆ هەلگرتی، و یێ بهایێ وێ دخۆت، و یێ ڤەدخۆت، و یێ دگێڕیت).**

## ١٢ ـ باب: الخمر أم الخبائث.

## بابەتێ: عەرەق ماکا گونەهانە.

٢٧٧٢ - عَنْ عُثْمَانَ رضي الله عنه قَالَ: اجْتَنِبُوا الْخَمْرَ فَإِنَّهَا أُمُّ الْخَبَائِثِ، إِنَّهُ كَانَ رَجُلٌ مِمَّنْ خَلاَ قَبْلَكُمْ تَعَبَّدَ، فَعَلِقَتْهُ امْرَأَةٌ غَوِيَّةٌ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ جَارِيَتَهَا، فَقَالَتْ لَهُ: إِنَّا نَدْعُوكَ لِلشَّهَادَةِ، فَانْطَلَقَ مَعَ جَارِيَتِهَا، فَطَفِقَتْ كُلَّمَا دَخَلَ بَاباً أَغْلَقَتْهُ دُونَهُ، حَتَّى أَفْضَى إِلَى امْرَأَةٍ وَضِيئَةٍ، عِنْدَهَا غُلاَمٌ، وَبَاطِيَةُ خَمْرٍ، فَقَالَتْ: إِنِّي وَاللهِ مَا دَعَوْتُكَ لِلشَّهَادَةِ، وَلَكِنْ دَعَوْتُكَ لِتَقَعَ عَلَيَّ، أَوْ تَشْرَبَ مِنْ هَذِهِ الْخَمْرَةِ كَأْساً، أَوْ تَقْتُلَ هَذَا الْغُلاَمَ. قَالَ: فَاسْقِينِي مِنْ هَذَا الْخَمْرِ كَأْساً، فَسَقَتْهُ كَأْساً، قَالَ: زِيدُونِي فَلَمْ يَرِمْ حَتَّى وَقَعَ عَلَيْهَا، وَقَتَلَ النَّفْسَ؛ فَاجْتَنِبُوا الْخَمْرَ، فَإِنَّهَا وَاللهِ! لاَ يَجْتَمِعُ الْإِيمَانُ وَإِدْمَانُ الْخَمْرِ ؛ إِلاَّ لَيُوشِكُ أَنْ يُخْرِجَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ. [ن٥٦٨٢، ٥٦٨٣].

* صحيح موقوف.

**ژ عوسمانی (ﷺ) گۆت: ژ عەرەقێ دویر بکەڤن، ب راستی ئەو ماکا گونەهانە، زەلامەکی ژ یێت بەری هەوە خودێ دپەرست، ژنەکا خراب لێ عاشق ببوو، خزمەتکارا خۆ هنارتە دەڤ، ئینا گۆتێ: ئەم تە بۆ شەهدەدانەکێ داخواز دکەین، د گەل خزمەتکارا وێ چۆ، و دەستهاڤێتێ هەر گاڤا د دەرگەهەکیڕا بۆریبا ئەو دەرگەهـ پشت وی دگرت، هەتا**

---

[1] **نانکو: حەرامکرییە.**

گەهشتییە ژنەكا جوان، بچویكەك و ئامانەكێ شیشەی یێ عەرەقێ ل دەڤ وێ بوو، ئینا گۆت: ئەز ب خودێ كەمە مە تو بۆ شەهدەییێ نەداخوازكرییە، بەلێ من تو یێ داخواز كری دا زنایێ د گەل من بكەی، یان پەرداغەكی ژ ڤێ عەرەقێ ڤەخۆی، یان ڤی بچویكی بكوژی. گۆت: پەرداغەكی ژ ڤێ عەرەقێ بدە من[1]، گۆت: بۆ من زێدەكە (زێدەتر بدە من). چو یێ وەسا نەما هەتا زنا د گەل كری، و ئەو بچویك كوشتی، ڤێجا ژ عەرەقێ دویر بكەڤن، چونكی ئەز ب خودێ كەم باوەری و بەردەوامیبوون ل سەر عەرقێ ل گەلێك كۆم نابن ئەگەر ئێك ژ وان ئەوا دیتر نەدەرێخیت.



(١) وی هزر كر نەڤە ژ وان گونەهان: زینایێ و كوشتنا بچویكی بچویكتر و سڤكترە.

## ١ ـ باب: الإعجاب بالنفس.

## بابەتێ: ب خۆ شاهیبوون.

٢٧٧٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قال: قالَ النَّبِيُّ، أَوْ قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ): (**بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي حُلَّةٍ، تُعْجِبُهُ نَفْسُهُ، مُرَجِّلٌ جُمَّتَهُ، إِذْ خَسَفَ اللهُ بِهِ، فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ**).[خ٥٧٨٩/ م٢٠٨٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری یان بابێ قاسمی (ﷺ) گۆت: (وەختەکی زەلامەك ب جلکەکێ جوان دچۆ ب خۆ پێ شاهی بوو، سەرێ وی پێ شەکری بوو، و د رێڤەچۆنا خۆدا خۆ قەبە و دفن بلند کر، و ئەو پێ هۆسا خودێ د عەردیدا برە خوار و ئەو هەتا رۆژا قیامەتێ پێ د عەردیدا دچیتە خوارێ).**

## ٢ ـ باب: تحريم جر الثوب خيلاء.

## بابەتێ: حەرامکرنا راکێشانا جلکی د دویڤ خۆڕا ژ خۆمەزنکرن.

٢٧٧٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (**لاَ يَنْظُرُ اللهُ إِلَى مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ**). [خ٥٧٨٣ (٣٦٦٥)/ م٢٠٨٥].

- زاد البخاري في رواية: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ أَحَدَ شِقَّيْ ثَوْبِي يَسْتَرْخِي؛ إِلاَّ أَنْ أَتَعَاهَدَ ذلِكَ مِنْهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّكَ لَسْتَ تَصْنَعُ ذلِكَ خُيَلاَءَ**). [خ٣٦٦٥].

**ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ ب چاڤێ دلۆڤانییێ بەرێ خۆ نادەتە وی یێ جلکێ خۆ ژ خۆمەزنکرن د دویڤ خۆڕا بکێشیت).**

- **و بوخاری د ڤەگێرەکێدا زێدە کرییە: ئەبوبەکری گۆت: ب راستی رەخەکێ ئیزارێ من هەکە ئەز نەگرم و نەشدینم شۆڕ دبیت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (تو نە ژ وانی یێت ژ خۆمەزنکرن وەدکەن).**

٢٧٧٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**بَيْنَمَا رَجُلٌ يَجُرُّ إِزَارَهُ مِنَ الخُيَلاَءِ خُسِفَ بِهِ، فَهْوَ يَتَجَلْجَلُ فِي الأَرْضِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ**). [خ٣٤٨٥].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (وەختەکی زەلامەکی جلکێ خۆ ژ خۆمەزنکرن و قەبە د دویڤ خۆڕا دکێشا، و ئەو پێ**

**هۆسا خودێ د عەردیدا برە خوار و ئەو هەتا رۆژا قیامەتێ یێ د عەردیدا دچیتە خوارێ).**

٢٧٧٦ - (م) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: مَرَرْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَفِي إِزَارِي اسْتِرْخَاءٌ، فَقَالَ: (**يَا عَبْدَ اللهِ ارْفَعْ إِزَارَكَ**)، فَرَفَعْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: (**زِدْ**)، فَزِدْتُ، فَمَا زِلْتُ أَتَحَرَّاهَا بَعْدُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: إِلَى أَيْنَ؟ فَقَالَ: أَنْصَافِ السَّاقَيْنِ. [م٢٠٨٦].

**ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: ئەز د بەر پێغەمبەرێ خودێرا بۆریم (ﷺ) و ئیزارێ[1] من پیچەکێ شۆڕ ببوو، گۆت: (ئەی عەبدوللا ئیزارێ خۆ بلندکە)، من بلند کر، گۆت: (هێژ)، من هێژ بلند کر، پشتی ڤێ بەردوەام ئەز بلند دکەم، هندەکان گۆت: هەتا کیرێ؟ گۆت: هەتا نیڤا هەردو لنگان.**

## ٣ ـ باب: ما أَسفل من الكعبين فهو في النار.

## بابەتێ: یێ د بن گۆزەکاندا ئەو یێت د ئاگریدا.

٢٧٧٧ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**ما أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الإِزَارِ فَفِي النَّارِ**). [خ٥٧٨٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یا د بن گۆزەکاندا ژ ئیزاری یا د ئاگریدا)[2].**

## ٤ ـ باب: أَحب الثياب الحبرة.

## بابەتێ: خۆشڤیترین جلکێ ژ کتانی یان ژ پەمبی و خەتخەت و خەملاندی.

٢٧٧٨ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) أَنْ يَلْبَسَهَا: الْحِبَرَةُ. [خ٥٨١٣ (٥٨١٢)/ م٢٠٧٩)].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: خۆشڤیترین جلك ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئەو بکەتە بەر خۆ: جلکێ ژ کتانی یان ژ پەمبی و خەتخەت و خەملاندی.**

---

(١) نیزار: پارچا نافتەنگێ پێدایە.

(٢) هەلبەت هەکە ژ خۆمەزنکرن بیت.

## ٥ . باب: تحريم لبس الحرير على الرجال.

## بابەتێ: حەرامكرنا زەلام جلكێ ئارمویشی بكەتە بەر خۆ.

٢٧٧٩ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ لَبِسَ الحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا، فَلَنْ يَلْبَسَهُ فِي الآخِرَةِ**). [خ٥٨٣٢/ م٢٠٧٣].

**ژ ئەنەسی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ ئارمویشی د دنیایێدا بكەتە بەر خۆ وی د ئاخرەتێدا نەكرە بەر خۆ).**

٢٧٨٠ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَوِ اشْتَرَيْتَ هذِهِ، فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الجُمُعَةِ، وَلِلْوَفْدِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّمَا يَلْبَسُ هذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ**). ثُمَّ جَاءَتْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مِنْهَا حُلَلٌ، فَأَعْطَى عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رضي الله عنه مِنْهَا حُلَّةً، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ! كَسَوْتَنِيهَا، وَقَدْ قُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنِّي لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا**)، فَكَسَاهَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ رضي الله عنه أَخاً لَهُ بِمَكَّةَ مُشْرِكاً. [خ٨٨٦/ م٢٠٦٨].

- وفي رواية لهما: (**تَبِيعُهَا، وتُصِيبُ بِهَا حَاجَتَكَ**).[خ٩٤٨].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومەرێ كوڕێ خەتتابی جلكەكێ دوپارچە یێ ئارمویشی ل بەر دەرگەهێ مزگەفتێ دیت، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەگەر تە ئەڤە كڕیبا رۆژا خوتبە كربا بەر خۆ و بۆ شاندان ئەگەر هاتنە دەڤ تە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی تنێ ئەو ئارمویشی دكەتە بەر خۆ یێ رۆژا قیامەتێ چو پشك و بار نەی). پاشی هندەك جلك ژ وان بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتن ئینا جلكەك ژ وان دا عومەرێ كوڕێ خەتتابی، ئینا عومەری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو جلك تە دا من و تە ئەو د جلكێ عەتاردیدا[1] گۆت یا تە گۆتی؟ پێغەمبەری خودێ (ﷺ) گۆت: (من نەدایە تە دا بكەیە بەر خۆ)، عومەرێ كوڕێ خەتتابی كرە بەر برایەكێ خۆ ل مەكەهێ موشرك بوو.**

- **و د ڤەگێڕەكا واندا: (بفرۆشی و هەوجەیا خۆ پێ بقەتینی).**

(١) مەبەست پێ عەتاردێ كوڕێ حاجبێ تەمیمییە، و ئەو جلكێ عومەری دیتی و ژ پێغەمبەری (ﷺ) خواستی بكڕیت یێ وی بوو.

## ٦ ـ باب: إباحة لبس الحرير لمرض الحكة وللقتال.

**بابەتێ: حەلالكرنا كرنەبەرا ئارمویشی بۆ نەخۆشییا خوریانێ و بۆ شەڕی.**

٢٧٨١ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ فِي قَمِيصٍ مِنْ حَرِيرٍ، مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا. [خ٢٩١٩/ م٢٠٧٦].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستویری بۆ زوبەیری و عەبدولرەحمانێ كوڕێ عەوفی دا خودێ ژ هەردووان رازی بیت ئارمویشی بكەنە بەر خۆ، ژبەر خوریانەكێ ل دەڤ هەردووكان هەبوو.**

## ٧ ـ باب: الحرير والذهب للنساء.

**بابەتێ: ئارمویش و زێڕ بۆ ژنانە.**

٢٧٨٢ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّهُ رَأَى عَلَى أُمِّ كُلْثُومٍ عليها السلام، بِنْتَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، بُرْدَ حَرِيرٍ سِيَرَاءَ. [خ٥٨٤٢].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) وی كراسەكێ ئارمویشی ل بەر ئوم كەلسومێ (رضي الله عنها) كچا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت.**

٢٧٨٣ - عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(حُرِّمَ لِبَاسُ الْحَرِيرِ وَالذَّهَبِ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي وَأُحِلَّ لِإِنَاثِهِمْ).** [ت١٧٢٠/ ن٥١٦٣].

* صحيح.

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ ﷺ گۆت: (جلكێ ئارمویشی و زێڕ ل سەر زەلامێت ئوممەتا من یێت حەرام بووین و بۆ ژنێ یێت حەلال بووین).**

٢٧٨٤ - عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَدِمَتْ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) حِلْيَةٌ مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ أَهْدَاهَا لَهُ، فِيهَا خَاتَمٌ مِنْ ذَهَبٍ، فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ، قَالَتْ: فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِعُودٍ مُعْرِضاً عَنْهُ، أَوْ بِبَعْضِ أَصَابِعِهِ، ثُمَّ دَعَا أُمَامَةَ ابْنَةَ أَبِي الْعَاصِ، ابْنَةَ ابْنَتِهِ زَيْنَب، فَقَالَ: **(تَحَلَّيْ بِهَذَا يَا بُنَيَّةُ).** [د٤٢٣٥/ جه٣٦٤٤].

* حسن.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: هندەك جلك ژ دەڤ نەجاشی بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتن، بۆ كربینە دیاری و گوستیركەكا زێری د گەل بوو و ناڤكەكا حەبەشی تێدا بوو، وێ گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب داركەكی یان ب هندەك تلێت خۆ راكر و پاشی**

**گازی ئومامەیا كچا ئەبی عاسی كر كچا كچا خۆ زەینەبێ و گۆت: (كچا من خۆ ب ڤێ بخەملینە).**

٨ ـ باب: لبس المعصفر والنهي عن التزعفر.

**بابەتێ: كرنەبەرا جلكێ زەركری و پاشڤەلێدان ژ بۆیاغكرنا ب زەعفەرانی.**

٢٧٨٥ – (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: نَهى النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ. [خ٥٨٤٦/ م٢١٠١].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهی یا كری زەلام جلكەكێ زەعفەرانكری[1] بكەتە بەر خۆ.**

٢٧٨٦ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَيَّ ثَوْبَيْنِ مُعَصْفَرَيْنِ، فَقَالَ: (**أَأُمُّكَ أَمَرَتْكَ بِهذَا**)؟ قُلْتُ: أَغْسِلُهُمَا، قَالَ: (**بَلْ أَحْرِقْهُمَا**). [م٢٠٧٧].

- وفي رواية: فَقَالَ: (**إِنَّ هَذِهِ مِنْ ثِيَابِ الْكُفَّارِ، فَلاَ تَلْبَسْهَا**).

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمرێ كوڕێ عاسی خودێ ژ هەردووان رازی بیت گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دو كراسێت بۆیاغكری ب عەسفەرێ (گیایەكە جلكان پێ بۆیاغ دكەن) ل بەر من دیتن، گۆت: (دایكا تە ئەمرێ تە ب ڤێ كرییە)؟ من گۆت: بشۆم؟ گۆت: (نەشۆ بسۆژە).**

- **و د ڤەگێڕەكێدا: ئینا گۆت: (ب راستی ئەڤە ژ جلكێت گاورانە نەكەیە بەر خۆ).**

٢٧٨٧ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ الْمُفَدَّمِ. قَالَ يَزِيدُ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ: مَا الْمُفَدَّمُ؟ قَالَ: الْمُشْبَعُ بِالْعُصْفُرَةِ. [جه٣٦٠١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ زەرێ زێدە كری، یەزیدی گۆت: من گۆتە حەسەنی موفەددەم چییە؟ گۆت: یێ رەنگێ وی زێدە زەر.**

٩ ـ باب: لبس الأَصفر للنساء.

**بابەتێ: جلكێ زەر بۆ ژنانە.**

٢٧٨٨ – (خ) عَنْ أُمِّ خَالِدٍ بِنْتِ خَالِدِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَتْ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَعَ أَبِي، وَعَلَيَّ قَمِيصٌ أَصْفَرُ، قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**سَنَهْ سَنَهْ**) . قَالَ عَبْدُ اللهِ: وَهِيَ بِالْحَبَشِيَّةِ: حَسَنَةٌ . قَالَتْ:

(١) زەعفەران: گیایەكە جلك پێ دهێنە بۆیاغكرن.

فَذَهَبْتُ أَلْعَبُ بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ، فَزَبَرَنِي أَبِي، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**دَعْهَا**)، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَبْلِي وَأَخْلِقِي، ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِقِي، ثُمَّ أَبْلِي وَأَخْلِقِي**). قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَبَقِيَتْ حَتَّى ذَكَرَ. [خ٣٠٧١].

**ژ ئوم خالدی كچا خالدێ كوڕێ سەعیدی، گۆت: ئەز د گەل بابێ خۆ هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و كراسەكێ زەر ل بەر من بوو، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سەنە سەنە) عەبدوللایی گۆت: ئەو ب زمانێ حەبەشی: جوانە جوانە، وێ گۆت، ئەز چۆم من یاری ب نیشانا پێغەمبەراتییێ كرن، ئینا بابێ من ل من حەیتاند و ئەز پاشڤە برم، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بهێلە)، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەڤن بكەی و بدڕینی پاشی كەڤن بكەی و بدڕینی و پاشی كەڤن بكەی و بدڕینی)[1] عەبدوللایی گۆت: هند ما و ژیا هەتا ڤەگێڕا ژێ خەبەر دایی.**

## ١٠ . باب: النهي عن اشتمال الصماء والاحتباء في ثوب واحد

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ جلك د خۆ ئالاندنێ و دەستێت خۆ یان هەر تشتێ دی بدەتە چۆكێت خۆ و چۆكان بێخیتە زكێ خۆ و پالا خۆ ڤەدەت و جلكەك ب تنێ د بەر.

٢٧٨٩ - (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ. [خ٣٦٧].

- زاد في رواية: وَالصَّمَّاءُ أَنْ يَجْعَلَ ثَوْبَهُ عَلَى أَحَدِ عَاتِقَيْهِ، فَيَبْدُو أَحَدُ شِقَّيْهِ لَيْسَ عَلَيْهِ ثَوْبٌ.[خ٥٨٢٠].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ جلك د خۆ ئالاندنێ كری، و زەلام دەستێت خۆ یان هەر تشتێ دی بدەتە چۆكێت خۆ و چۆكان بێخیتە زكێ خۆ و پالا خۆ ڤەدەت و جلكەك ب تنێ د بەر و چو ل سەر شەرمگەها وی نەبیت.**

- **و د ڤەگێڕەكێدا زێدە كرییە: (صماء) ئەوە: جلكێ خۆ دانیتە سەر ملەكێ خۆ و لایەك ژێ دەركەڤیت جلك ل سەر نەبیت.**

---

(١) نەڤە دوعاكرنە بۆ وێ ب عەمر درێژییێ.

## ١١ ـ باب: النهي عن التعري.

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ خۆرویسكرنێ.

٢٧٩٠ – (م) عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ: أَقْبَلْتُ بِحَجَرٍ، أَحْمِلُهُ، ثَقِيلٍ، وَعَلَيَّ إِزَارٌ خَفِيفٌ. قَالَ: فَانْحَلَّ إِزَارِي وَمَعِيَ الْحَجَرُ، لَمْ أَسْتَطِعْ أَنْ أَضَعَهُ حَتَّى بَلَغْتُ بِهِ إِلَى مَوْضِعِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(ارْجِعْ إِلَى ثَوْبِكَ فَخُذْهُ، وَلاَ تَمْشُوا عُرَاةً).** [م٣٤١].

**ژ میسوەرێ كورێ مەخرەمەیی (رضي الله عنه) گۆت: من دەست دا بەرەكی هەلگرت یێ گران بوو، و ئیزارەكێ[1] سڤك ل بەر من بوو، گۆت: ئینا ئیزارێ من كەفت و بەر ف من بوو ئەز نەشیام دانم هەتا من گەهاندییە جهێ وی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بزڤڕە جلكێ خۆ هەلگرە و رویس ب رێڤە نەچن).**

٢٧٩١ – عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) رَأَى رَجُلاً يَغْتَسِلُ بِالْبَرَازِ بِلاَ إِزَارٍ، فَصَعَدَ الْمِنْبَرَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ (ﷺ): **(إِنَّ اللهَ عزّ وجل حَيِيٌّ سِتِّيرٌ، يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسَّتْرَ، فَإِذَا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ؛ فَلْيَسْتَتِرْ).** [د٤٠١٢/ ن٤٠٤].

* صحيح.

**ژ یەعلایێ كورێ ئومەییەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەلامەك دیت ل بەرچاڤان ل جهەكێ ڤەكری و بێ ئیزار خۆ دشویشت، ئینا سەركەفتە مینبەرێ و حەمدا خودێ كر و پەسنا وی كر، پاشی پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی ئێك ژ ناڤێت خودێ شەرمین و پەردەكەرە و حەژ شەرمێ و پەردەكرنێ دكەت، ڤێجا ئەگەر ئێكی ژ هەوە سەرێ خۆ شویشت بلا خۆ بنخێڤیت).**

## ١٢ ـ باب: الكاسيات العاريات.

## بابەتێ: ژنێت ب جلك و رویس.

٢٧٩٢ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ، مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ، رُؤُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ، لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ، وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا).** [م٢١٢٨].

---

(١) ئیزار: پارچا سەرییە ژ جلكی.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دو جویێن ژ خەلکێ جەهنەمێ من نەدیتینە، جوینێ ئێکێ: هندەکن قامچی یێت وەکی کورییێت چێلان یێت ڤێ و خەلکی پێ دقوتن، و جوینێ دووێ: هندە ژنن ب جلکن و د رویسن[1] دلێ وان ژ گوهدارییێ یێ خوارە و غەیری خۆ ژی ژ گوهدارییێ خوار دکەن (یان قەبە و شاهی ب رێڤە دچن و مل و ستۆیێت خۆ ژ مەزناتی بادن)، سەرێت وان وەکی پشتا حێشترانە، ئەو ناچنە بەحەشتێ و بێهنا وێ ژی ناچیتە وان، و دویراتییا هندێ و هندێ بێهنا وێ دهێتە هەلکێشان).**

١٣ ـ باب: تحريم النظر إلى العورات.

**بابەتێ: حەرامکرنا بەرێخۆدانا شەرمگەهان.**

٢٧٩٣ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لاَ يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلاَ الْمَرْأَةُ إِلى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ، وَلاَ يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَلاَ تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ). [م٣٣٨].

ژ ئەبی سەعیدی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(زەلام بەرێ خۆ نەدەتە شەرمینگەها زەلامی، و ژن بەرێ خۆ نەدەتە شەرمینگەها ژنێ، و زەلام نەگەهیتە زەلامی د کراسەکیدا[2] و ژن نەگەهیتە ژنێ د کراسەکیدا[3]).**

٢٧٩٤ - عَنْ جَرْهَدٍ ـ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ ـ قَالَ: جَلَسَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عِنْدَنَا، وَفَخِذِي مُنْكَشِفَةٌ، فَقَالَ: (أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْفَخِذَ عَوْرَةٌ). [د٤٠١٤/ ت٢٧٩٥/ مي٢٦٩٢].

* صحيح.

ژ جەرهەدی (ﷺ) و ئەو ژ خەلکێ سوففەیێ[4] بوو، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل دەڤ مە روینشتە خوارێ و رانێ من یێ دەرکەفتی بوو، ئینا گۆت: **(ما تو نوزانی ران شەرمگەهە).**

---

(١) ئانکو: جلکێت بەر بەلێ لەشێ وان ناگریت یان د رۆنن یان د کورتن.

(٢) ئانکو: رویس خۆ پێکڤە بن تشتەکێڤە درێژ نەکەن.

(٣) ئانکو: رویس خۆ پێکڤە بن تشتەکێڤە درێژ نەکەن.

(٤) خەلکێ سوففێ: هندە کەسێت فەقەتیایی بوون ژ مرۆڤێت خۆ و ژ هەژارییا خۆ، ل مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) دمان ل هیڤیا خێر و سەدەقەیان.

## ١٤ ـ باب: المتشبهون بالنساء والمتشبهات بالرجال.

**بابەتێ: ئەو زەلامێت خۆ وەکی ژنان لێ دکەن و ئەو ژنێت خۆ وەکی زەلامان لێ دکەن.**

٢٧٩٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) المَتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ. [خ٥٨٨٥].

وفي رواية: قال: لَعَنَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْمُخَنَّثِينَ مِنَ الرِّجَالِ، وَالمتَرَجِّلاَتِ مِنَ النِّسَاءِ، وَقَالَ: (**أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ**). قَالَ: فَأَخْرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) فُلاَنَاً، وَأَخْرَجَ عُمَرُ فُلانَةً. [خ٥٨٨٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لەعنەت یێت ل وان زەلامان کرین ئەوێت خۆ وەکی ژنان لێ دکەن، و لەعنەت یێت ل وان ژنان کرین ئەوێت خۆ وەکی زەلامان لێ دکەن.**

**و د ڤەگێرەکێدا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لەعنەت یێت ل دارەژنان کرین ژ زەلامان و لەعنەت یێت ل دارەزەلامان کرین ژ ژنان[1]. و گۆت: (وان ژ مالێت خۆ دەربێخن) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) فلان دەرئێخست و عومەری فلانە ژن دەرئێخست.**

٢٧٩٦ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الرَّجُلَ يَلْبَسُ لِبْسَةَ الْمَرْأَةِ، وَالْمَرْأَةَ تَلْبَسُ لِبْسَةَ الرَّجُلِ.[د٤٠٩٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لەعنەت یێت ل وی زەلامی کرین یێ جلکێت ژنان دکەتە بەر خۆ، و ل وێ ژنێ کرین یا جلکێت زەلامی دکەتە بەر خۆ.**

٢٧٩٧ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أُتِيَ بِمُخَنَّثٍ، قَدْ خَضَّبَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ بِالْحِنَّاءِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**مَا بَالُ هَذَا**)؟ فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! يَتَشَبَّهُ بِالنِّسَاءِ، فَأَمَرَ بِهِ فَنُفِيَ إِلَى النَّقِيعِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! أَلاَ نَقْتُلُهُ، فَقَالَ: (**إِنِّي نُهِيتُ عَنْ قَتْلِ الْمُصَلِّينَ**).

قَالَ أَبُو أُسَامَةَ: وَالنَّقِيعُ نَاحِيَةٌ عَنِ الْمَدِينَةِ، وَلَيْسَ بِالْبَقِيعِ. [د٤٩٢٨].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: دارەژنەك ئینا دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) دەست و پێت خۆ خەنا کربوون، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەڤێ خێرە)؟ هاتە گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، خۆ وەکی ژنان لێ دکەت، ئینا فەرمان پێ کر بۆ نەقیعێ هاتە**

---

(١) دارەژن و دارەزەلام: ئەون یێت دارێ خۆ دگوهۆرن.

دەرئێخستن، ئینا گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەم وی نەکوژین؟ گۆت: **(ب راستی پاشڤەلێدانا من ژ کوشتنا نڤێژکەران یا هاتییە کرن).**

**ئەبو ئوسامەیی گۆت: و نەقیع لایەکێ مەدینەیێیە و نە بەقیعە.**

## ١٥ ـ باب: فرق الشعر.

## بابەتێ: ژێکڤەکرنا پرچێ.

٢٧٩٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَسْدِلُ شَعْرَهُ، وَكَانَ المشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُؤُوسَهُمْ، وَكانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَسْدِلُونَ رُؤُوسَهُمْ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ بِشَيْءٍ، ثُمَّ فَرَقَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) رَأْسَهُ. [خ٣٥٥٨/ م٢٣٣٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پرچێ خۆ بەرددا خوارێ و هەڤپشکچێکەران پرچێت خۆ ژێکڤە دکرن، و خودان کتێبان پرچێت خۆ بەرددان و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حەز دکر وەکی خودان کتێبان بکەن د وێدا یا فەرمانا وی تێدا ب چو نەهاتییە کرن، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پرچا خۆ ژێکڤە کر.**

٢٧٩٩ - عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ: أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي الْمَسْجِدِ، فَدَخَلَ رَجُلٌ ثَائِرَ الرَّأْسِ وَاللِّحْيَةِ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِيَدِهِ أَنِ اخْرُجْ، كَأَنَّهُ يَعْنِي: إِصْلاَحَ شَعْرِ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، فَفَعَلَ الرَّجُلُ، ثُمَّ رَجَعَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَلَيْسَ هَذَا خَيْراً مِنْ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدُكُمْ ثَائِرَ الرَّأْسِ كَأَنَّهُ شَيْطَانٌ)؟** [ط١٧٧٠].

* مرسل.

[وانظر: ٣٧٢٤].

**ژ زەیدێ کوڕێ ئەسلەمی (رحمه الله) کو عەتائێ کوڕێ یەساری گەهاندە وی، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مزگەفتێ بوو، زەلامەکی سەر و ریە قژەڤژ هاتە د ژۆرڤە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب دەستێ خۆ نیشان کرێ دەرکەڤە، هەروەکی دڤێت پرچێ سەرێ خۆ و رهێت خۆ ب سەروبەر بکەت، ئینا زەلامی وەکر پاشی زڤریڤە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەرێ ما ئەڤە چێتر نینە ژ وێ ئێك ژ هەوە ب سەرێ قژەڤژ بهێت هەروەکی شەیتانە).**

## ١٦ ـ باب: خضاب الشيب

### بابەتێ: بۆیاغكرنا پرچا سپی.

٢٨٠٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قال: **(إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لاَ يَصْبِغُونَ؛ فَخَالِفُوهُمْ)**. [خ٣٤٦٢/ م٢١٠٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جوی و فەلە سەر و رهێت خۆ بۆیاغ ناكەن، هوین بۆیاغكەن).**

٢٨٠١ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أُتِيَ بِأَبِي قُحَافَةَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ. وَرَأْسُهُ وَلِحْيَتُهُ كَالثَّغَامَةِ بَيَاضاً، فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): **(غَيِّرُوا هذَا بِشَيْءٍ، وَاجْتَنِبُوا السَّوَادَ)**. [م٢١٠٢].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: ئەبی قوحافە رۆژا ڤەكرنا مەكەهێ ئینا، و سەر و رهێت وی وەكی سوغامەیێ[1] سپی بوون، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ڤی ب تشتەكی بگوهۆڕن، و خۆ ژ رەشاتیێ بدەن پاش).**

٢٨٠٢ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بِن عَمْرٍو قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ نَتْفِ الشَّيْبِ، وَقَالَ: **(هُوَ نُورُ الْمُؤْمِنِ)**. [ت٢٨٢١/ جه٣٧٢١]

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ هەلكێشانا موییێت سپی كری و گۆت: (ب راستی ئەو رۆناهییا باوەریدارینە).**

## ١٧ ـ باب: النهي عن القزع.

### بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ سەر كولاڤكییێ[2].

٢٨٠٣ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَنْهَى عَنِ الْقَزَعِ. قَالَ عُبَيْدُ اللهِ: قُلْتُ: وما الْقَزَعُ؟ فَأَشَارَ لَنَا عُبَيْدُ اللهِ قَالَ: إِذَا حُلِقَ الصَّبِيُّ، وَتُرِكَ هَاهُنَا شَعْرَةٌ وَهَاهُنَا وَهَاهُنَا، فَأَشَارَ لَنَا عُبَيْدُ اللهِ إِلَى نَاصِيَتِهِ وَجانِبَيْ رَأْسِهِ. [خ٥٩٢٠/ م٢١٢٠].

---

(١) سوغامە: گیایەكە یێ سپییە و گولا وی ژی هەر یا سپییە.

(٢) (قەزەعێ): هندەكێ ژ سەری بتراشیت هندەكێ نە.

- وفي رواية لأبي داود والنسائي: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَأَى صَبِيّاً قَدْ حُلِقَ بَعْضُ شَعْرِهِ وَتُرِكَ بَعْضُهُ، فَنَهَاهُمْ عَنْ ذَلِكَ، وَقَالَ: (**احْلِقُوهُ كُلَّهُ، أَوِ اتْرُكُوهُ كُلَّهُ**). [د٤١٩٥/ ن٥٠٦٣].

**ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) پاشڤەلێدان ژ سەرتراشتنا سەرکولاڤکی کر.**

**عوبەیدوللایی گۆت: قەزەع چییە؟ عوبەیدوللایی نیشان بۆ مە کر و گۆت: ئەگەر سەرێ زارۆکی هاتە تراشتن و ل ڤێرێ موییەکی بهێلی و ڤێرێ و ڤێرێ، و عوبەیدوللایی نیشان کرە پۆرکا خۆ و هەردو لایێت سەرێ خۆ.**

- **و د ڤەگێرەکا ئەبو داود و نەسائیدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بچویکەك دیت و سەرێ وی هندەك هاتبوو تراشتن و هندەك هاتبوو هێلان، ئینا نەهیا وان ژ ڤێ کر و گۆت: یان هەمییێ بتراشن یان هەمییێ بهێلن.**

## ١٨ ـ باب: إعفاء اللحى.

## بابەتێ: بەردانا رهان.

٢٨٠٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ: وَفِّرُوا اللِّحى، وَأَحْفُوا الشَّوارِبَ**).

وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ: إِذَا حَجَّ أَوِ اعْتَمَرَ قَبَضَ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَمَا فَضَلَ أَخَذَهُ. [خ٥٨٩٢/ م٢٥٩].

**ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جودابوونا هەڤپشکچێکەران بکەن، ریهان بەردەن و سمبێلا ل سەر لێڤان ببڕن (یان کورتکەن).**

**و ئیبن عومەری: ئەگەر حەج کربا یان عومرە کربا دەستێ خۆ دهاڤێتە رهێت خۆ و یێت ژێ زێدە ژێڤە دکر.**

## ١٩ ـ باب: خصال الفطرة.

## بابەتێ: خەسلەتێت سونەت.

٢٨٠٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ، وَالاسْتِحْدَادُ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الآبَاطِ**). [خ٥٨٩١ (٥٨٨٩)/ م٢٥٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سونەتا پێغەمبەران پێنجن؛ سونەتكرن و چێكرنا رێڤان و كورتكرنا سمبێلان و بڕینا نینۆكان، و چێكرنا بنكەفشان).**

٢٨٠٦ – (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ**).

قَالَ زَكَرِيَّاءُ: قَالَ مُصْعَبٌ: وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ؛ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ. [م٢٦١].

**ژ عائیشایێ (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دەھ تشت ژ سونەتا پێغەمبەرانە؛ سمبێل كورتكرن و ریھ بەردان و سیواك و ئاڤ هەلكێشان ب دفنێ و نینۆك بڕین و شویشتنا ناڤ تلان و بنكەفش چێكرن و رێڤ چێكرن، و خۆپاقژكرن ب ئاڤێ).**

**زەكەریای گۆت: و یا دەهێ من ژبیر كر ژ بلی كو ئەو ئاڤ د دەڤی تێوەردان بیت.**

٢٨٠٧ – (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: وُقِّتَ لَنَا فِي قَصِّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمِ الأَظْفَارِ، وَنَتْفِ الإِبِطِ، وَحَلْقِ الْعَانَةِ: أَنْ لاَ نَتْرُكَ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً. [م٢٥٨].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (ﷺ) گۆت: دەم بۆ مە هاتییە دەستنیشانكرن بۆ سمبێل كورتكرن و نینۆك بڕین و بنكەڤش چێكرن و رێڤ چێكرنێ، ئەم ژ چل شەڤان پتر گیرۆ نەكەین.**

## ٢٠ ـ باب: وصل الشعر.

## بابەتێ: پرچ ب پرچێڤە بێتە گرێدان.

٢٨٠٨ – (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ ابْنَتِي أَصَابَتْهَا الْحَصْبَةُ، فَامَّرَقَ شَعْرُهَا، وَإِنِّي زَوَّجْتُهَا، أَفَأَصِلُ فِيهِ؟ فَقَالَ: (**لَعَنَ اللهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمَوْصُولَةَ**). [خ٥٩٤١ (٥٩٣٥)/ م٢١٢٢].

وفي رواية لهما: وَزَوْجُهَا يَسْتَحِثُّنِي بِهَا، أَفَأَصِلُ رَأْسَهَا؟ [خ٥٩٣٥].

**ژ ئەسمائا كچا ئەبوبەكری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژنەكێ پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر و گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ من كچەكا هەی سۆركا یا گرتی و پرچێ وێ یێ وەریای، و من یا دایە شوی، ئەز پرچێ وێ ب پرچەكێ دیڤە درێژ**

**نەكەم؟ گۆت: (خودێ لەعنەت بێت ل وێ ژنێ كرین یا پرچێ خۆ ب پرچێ ئێكا دیڤە درێژ دكەت و ئەوا ئەڤێ كارە ب رازیبوونا وێ بۆ دئێتە كرن).**

و د ریوایەتەكا واندا: و زەلامێ وێ ژ من دخوازیت من پال ددەت، ئەرێ ئەز پرچێ وێ ب پرچەكێ دیڤە درێژ بكەم؟

٢٨٠٩ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لَعَنَ اللهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ). [خ٥٩٣٧/ م٢١٢٤].

ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(لەعنەت ل وێ ژنێ بن یا پرچێ خۆ ب پرچێ ئێكا دیڤە درێژ دكەت و ئەوا دخوازیت ئەڤ كارە د گەل بێتە كرن، و یا دەقێ بۆ خۆ چێ دكەت و یا دخوازیت دەق بۆ بێتە چێكرن).**

## ٢١ . باب: تحريم فعل الواصلة والواشمة والنامصة.

## بابەتێ: حەرامكرنا كریارا پرچ ب پرچیڤە بهێتە درێژكرن و دەقچێكرن و برۆی زراڤكرنێ.

٢٨١٠ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: لَعَنَ اللهُ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُوتَشِماتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ، المغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللهِ. فَبَلَغَ ذلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهَا: أُمُّ يَعْقُوبَ، فَجَاءَتْ فَقَالَتْ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ لَعَنْتَ كَيْتَ وَكَيْتَ، فَقَالَ: وَمَا لِي لاَ أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَمَنْ هُوَ فِي كِتَابِ اللهِ؟! فَقَالَتْ: لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ اللَّوْحَيْنِ، فَمَا وَجَدْتُ فِيهِ مَا تَقُولُ، قَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وَجَدْتِيهِ، أَمَا قَرَأْتِ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ﴾ [الحشر:٧]. قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّهُ قَدْ نَهَى عَنْهُ. قَالَتْ: فَإِنِّي أَرَى أَهْلَكَ يَفْعَلُونَهُ، قَالَ: فَاذْهَبِي فَانْظُرِي، فَذَهَبَتْ فَنَظَرَتْ، فَلَمْ تَرَ مِنْ حَاجَتِهَا شَيْئاً، فَقَالَ: لَوْ كَانَتْ كَذلِكَ مَا جَامَعْتُنَا. [خ٤٨٨٦/ م٢١٢٥].

ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه)، گۆت: خودێ لەعنەت بێت ل دەق چێكەران و دەق خوازان و برۆی چێكەران و ددان زراڤكەران بۆ جوانییێ ژ ژنان كرین. ئەوێت چێكرنا خودێ دگوهۆڕن، ئەڤە گەهشتە ژنەكێ ژ بەنی ئەسەد دگۆتنێ ئوم یەعقوب: ئینا هات و گۆت: گەهشتییە من تو لەعنەتا ل ڤێ و ل ڤێ دكەی!، ئینا گۆت: ما بۆچی ئەز لەعنەتان ل وی ناكەم یێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لەعنەت لێ كرین و ئەوێت د كتێبا خودێدا هاتین، ئینا وێ گۆت: من قورئان د ناڤبەرا هەردو لادا خواند و من ئەو نەدیت یا تو

دبێژی؟! گۆت: ئەگەر تە خواندبیت تە یا دیتی، ما تە نەخواندییە: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ﴾[1] وێ گۆت: بەلێ، گۆت: بێ گۆمان پێغەمبەری (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژێ کری، ئینا وێ گۆت: ئەز دبینم هەڤژینا تە وەدکەت، گۆت: هەرە بەرێ خۆ بدەیێ، ئینا چۆ بەرێ خۆ دایێ چو ژ هەوجەیا خۆ نەدیت[2] عەبدوللایی گۆت: ئەگەر هەڤژینا من یا وەسابا ئەو د گەل من کۆم نەدبوو و د گەل من نەدما.

## ٢٢ ـ باب: تحريم خاتم الذهب على الرجال.

## بابەتێ: حەرامکرنا گوستیرکا زێری ل سەر زەلامان.

٢٨١١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ نَهَى عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ.[خ٥٨٦٤/ م٢٠٨٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ گوستیرکا زێری کری.**

٢٨١٢ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) رَأَى خَاتَماً مِنْ ذَهَبٍ فِي يَدِ رَجُلٍ، فَنَزَعَهُ فَطَرَحَهُ وَقَالَ: (**يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ إِلَى جَمْرَةٍ مِنْ نَارٍ، فَيَجْعَلُهَا فِي يَدِهِ**) فَقِيلَ لِلرَّجُلِ، بَعْدَمَا ذَهَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): خُذْ خَاتِمَكَ انْتَفِعْ بِهِ. قَالَ: لاَ، وَاللهِ لاَ آخُذُهُ أَبَداً، وَقَدْ طَرَحَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [م٢٠٩٠].

**ژ ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوستیرکەکا زێری د دەستێ زەلامەکی دیت، کێشا و هاڤێت و گۆت: (ئێك ژ هەوە، ئەو ب خۆ دێ قەستا پەلەکی ژ ئاگری کەت و دێ کەتە دەستێ خۆ)، گۆتنە وی زەلامی پشتی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆی، گوستیرکا خۆ راکە، و بۆ خۆ فایدە ژێ بکە، گۆت: نە ب خودێ قەت ئەز ناراکەم، پشتی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاڤێتی.**

## ٢٣ ـ باب: خاتم الرسول (ﷺ).

## بابەتێ: گوستیرکا پێغەمبەری (ﷺ).

٢٨١٣ - (ق) عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَتَبَ النَّبِيُّ (ﷺ) كِتَاباً. أَوْ أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ. فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لاَ يَقْرَؤُونَ كِتَاباً إِلاَّ مَخْتُوماً، فَاتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ فِضَّةٍ، نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ. فَقُلْتُ لِقَتَادَةَ: مَنْ قَالَ نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: أَنَسٌ. [خ٦٥/ م٢٠٩٢].

---

(١) ئانكو: ج ئەمرێ پێغەمبەری ل هەوە كر بكەن، و نەهییا هەوە ژ ج كر خۆ ژێ بدەنە پاش.

(٢) ئانكو: یا وەسا نەبوو وەكی گۆتی.

**ژ شوعبەیی (رحمه الله) ژ قەتادەیی ژ ئەنەسێ کورێ مالکی گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) نڤیسارەك نڤیسی یان دڤیا بنڤیسیت، ئینا بۆ هاتە گۆتن: ب راستی ئەو چو نڤیساران ناخوینن یا مۆرکری نەبیت، ئینا گوستیرکەکا زیڤی هەلگرت و نەخشێ وی: موحەممەد پێغەمبەرێ خودێیە، هەروەکی ئەز یێ بەرێ خۆ ددەمە سپیاتییا وێ د دەستێ ویدا. ئینا من گۆتە قەتادەیی: کێ گۆت نەخشێ وێ: موحەممەد پێغەمبەرێ خودێیە؟ گۆت: ئەنەسی.**

٢٨١٤ - (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رضي الله عنه لَمَّا اسْتُخْلِفَ كَتَبَ لَهُ، وَكَانَ نَقْشُ الخَاتَمِ ثَلاَثَةَ أَسْطُرٍ: مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولٌ سَطْرٌ، وَاللهُ سَطْرٌ. [خ٥٨٧٨].

زاد في رواية: كانَ خاتَمُ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي يَدِهِ، وَفِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ بَعْدَهُ، وَفِي يَدِ عُمَرَ بَعْدَ أَبِي بَكْرٍ، فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ، جَلَسَ عَلَى بِئْرِ أَرِيسَ، قَالَ: فَأَخْرَجَ الخَاتَمَ، فَجَعَلَ يَعْبَثُ بِهِ، فَسَقَطَ، قَالَ: فَاخْتَلَفْنَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مَعَ عُثْمَانَ، فَنَنْزَحُ الْبِئْرَ فَلَمْ نَجِدْهُ. [خ٥٨٧٩].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ئەبوبەکر بوویە خەلیفە نڤیسارەك بۆ نڤیسی، و نەخشێ گوستیرکا وی سێ رێز بوو، موحەممەد رێزەك بوو، و پێغەمبەر رێزەك بوو، و خودێ رێزەك بوو.**

**و د ڤەگێرەکێدا زێدە کرییە: گوستیرکا پێغەمبەری (ﷺ) ل دەستێ وی بوو، و ل دەستێ ئەبوبەکر بوو پشتی وی، و ل دەستێ عومەری بوو پشتی وی، ڤێجا وەختێ بوویە دەمێ عوسمانی ل سەر بیرا ئەریس راوەستا، گۆت: گوستیرك دەرئێخست، دەستهاڤێتێ ئینا و بر، ئینا کەفت، گۆت: سێ رۆژان ب گەر ئەم د گەل عوسمانی چۆینە د بیرێدا و مە ئاڤا وێ دەردئێخست و مە نەدیت.**

٢٨١٥ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كانَ خاتَمُهُ مِنْ فِضَّةٍ، وَكَانَ فَصُّهُ مِنْهُ. [خ٥٨٧٠].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: گوستیرکا پێغەمبەری (ﷺ) ژ زیڤی بوو و ڤاشا وێ ژی ژێ بوو.**

٢٨١٦ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لَبِسَ خَاتَمَ فِضَّةٍ فِي يَمِينِهِ، فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ، كَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ. [م٢٠٩٤].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوستیرکەکا زیڤی کربوو دەستێ خۆ یێ راستێ و ڤاشەکا حەبەشی هەبوو و ڤاشا وێ دئینا بەرێ دەستێ خۆ.**

٢٨١٧ - (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي هذِهِ، وَأَشَارَ إِلَى الْخِنْصِرِ مِنْ يَدِهِ الْيُسْرَى.[م٢٠٩٥].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: گوستیركا پێغەمبەری (ﷺ) د ڤێ دابوو و نیشان كره تبلا قلیچا دەستێ خۆ یێ چەپێ.**

٢٨١٨ - عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ. [د٤٢٢٦/ ن٥٢١٨].

* صحيح.

**ژ عەلی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گوستیركا خۆ دكره دەستێ خۆ یێ راستێ.**

## ٢٤ ـ باب: تقليد المشركين في لباسهم وهيئتهم.

## بابەتێ: چاڤلێكرنا هەڤپشكچێكەران د جلك و سەروبەرێ واندا.

٢٨١٩ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ)**.[د٤٠٣١].

* حسن صحيح.

[وانظر في تقليدهم في اللباس: ٢٧٨٦.

وفي فرق الشعر وصبغه: ٢٧٩٨، ٢٨٠٠.

وفي الشوارب واللحى: ٢٨٠٤.

وفي اتباع الأمم السابقة: ٨٤٣].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەو كەسێ خۆ وەكی هندە كەسان لێ دكەت[1] ئەو ژ وانە)[2].**

## ٢٥ ـ باب: (إن الله جميل يحب الجمال).

## بابەتێ: (ب راستی خودێ یێ جوانە و كار و بارێت وی هەمی د جوانن و حەژ خۆجوانكرنێ دكەت).

٢٨٢٠ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَرَأَى رَجُلاً شَعِثاً، قَدْ تَفَرَّقَ شَعْرُهُ، فَقَالَ: **(أَمَا كَانَ يَجِدُ هَذَا مَا يُسَكِّنُ بِهِ شَعْرَهُ)**؟ وَرَأَى رَجُلاً آخَرَ، وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ وَسِخَةٌ، فَقَالَ: **(أَمَا كَانَ هَذَا يَجِدُ مَاءً يَغْسِلُ بِهِ ثَوْبَهُ)**؟

ولم يذكر النسائي أمر الثوب. [د٤٠٦٢/ ن٥٢٥١].

---

(١) د كار و كریار و ئاخفتن و سەروبەرێ واندا.

(٢) پرسین و حسێبا وان ئێكە.

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ مە، زەلامەكێ سەر قژەڤژ و پرچ بەلاڤ بوویی دیت، ئینا گۆت: (ئەرێ ڤی چو نەدیت پرچا خۆ پێ لێك بدەت)، و زەلامەكێ دی دیت جلكێت پیس ل بەر بوون، ئینا گۆت: (ئەرێ ڤی ئاڤ ب دەست نەكەفتییە جلكێ خۆ پێ بشۆت).**

**و نەسائی: بەحسێ جلكی نەكرییە.**

٢٨٢١ - عَنْ مالِكِ بْنِ نَضْلَةَ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فِي ثَوْبٍ دُونٍ، فَقَالَ: (**أَلَكَ مَالٌ**)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (**مِنْ أَيِّ الْمَالِ**)؟ قَالَ: قَدْ آتَانِي اللهُ مِنَ الْإِبِلِ وَالْغَنَمِ وَالْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، قَالَ: (**فَإِذَا آتَاكَ اللهُ مَالاً، فَلْيُرَ أَثَرُ نِعْمَةِ اللهِ عَلَيْكَ وَكَرَامَتِهِ**). [د٤٠٦٣/ ن٥٢٣٨، ٥٢٣٩، ٥٣٠٩].

* صحيح.

**ژ مالكێ كورێ نەزلەیی (ﷺ) گۆت: ئەز ب جلكەكێ نزمدا هاتمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: (تە مال هەیە)؟ گۆت: بەلێ، گۆت: (ژ كیژ مالی) گۆت: خودێ ژ حێشتران و پەزی و هەسپان و كۆلەیان یێت داینە من، گۆت: (ئەگەر خودێ مال دایە تە بلا نیشانا نیعمەتا خودێ و كەرەما وی ل سەر تە بهێتە دیتن).**

٢٨٢٢ - عَنِ ابْنِ عَمْرِو بْنِ العاص قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ يُحِبُّ أَنْ يُرَى أَثَرُ نِعْمَتِهِ عَلَى عَبْدِهِ**). [ت٢٨١٩].

* حسن صحيح.

**ژ عەمرێ كورێ شوعەیبی ژ بابێ خۆ، ژ باپیرێ خۆ (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ حەز دكەت نیشانا نیعمەتا خۆ ل سەر بەندەیێ وی بهێتە دیتن).**

٢٨٢٣ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ كَانَ لَهُ شَعْرٌ؛ فَلْيُكْرِمْهُ**). [د٤١٦٣].

* حسن صحيح.

[وانظر: ٢٧٩٩، ٣٣٩٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (﵁) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ پرچ هەبیت بلا چاڤێ خۆ بدەتێ)[1].**

## ٢٦. باب: لا يرد الطيب.

### بابەتێ: بێهنخۆشی ناهێتە زڤراندن.

[انظر: ٣١٢٤. وانظر: ١١٠٥ من مست طيبا لا تذهب إلى المسجد].

## ٢٧ ـ باب: ألوان الثياب.

### بابەتێ: رەنگێت جلكان.

٢٨٢٤ - عَنْ هِلاَلِ بْنِ عَامِرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بِمِنًى يَخْطُبُ عَلَى بَغْلَةٍ، وَعَلَيْهِ بُرْدٌ أَحْمَرُ، وَعَلِيٌّ رضي الله عنه أَمَامَهُ يُعَبِّرُ عَنْهُ. [د٤٠٧٣].

* صحيح.

**ژ هیلالێ كورێ عامری (﵁) ژ بابێ خۆ گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مینایێ دیت، ل سەر هێسترەكێ گۆتار دخواند و كراسەكێ سۆر ل بەر بوو، و عەلی (﵁) ل بەر سینگێ وی ئاخفتنا وی دگەهاندە خەلكێ دویر.**

٢٨٢٥ - عَنْ مَالِك أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ: إِنِّي لأُحِبُّ أَنْ أَنْظُرَ إِلَى الْقَارِئِ أَبْيَضَ الثِّيَابِ.[ط١٦٨٩].

**ژ مالكی (﵁) گەهشتە وی، كو عومەرێ كورێ خەتتابی گۆت: ب راستی ئەز حەز دكەم بەرێ خۆ بدەمە قورئانخوینی و جلكێ سپی د بەر بن.**

٢٨٢٦ - عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَلْبَسُ الثَّوْبَ الْمَصْبُوغَ بِالْمِشْقِ، وَالثَّوْبَ الْمَصْبُوغَ بِالزَّعْفَرَانِ.[ط١٦٩١].

* إسناده صحيح.

[انظر: ٢٠٤٣، ٢٧٨٥، ٢٧٨٨، ٣٧٢٣].

**ژ نافعی (﵁) گۆت: عەبدوللایێ كورێ عومەری جلكێ ب میشقێ[2] بۆیاغكری و جلكێ ب زەعفەرانی بۆیاغكری دكرە بەر خۆ.**

---

(١) ئانكو: بلا پاقژ بكەت و شەكەت و جوان بكەت و دوهن بدەت و بێهنخۆش بكەت و ب سەروبەر بكەت.

(٢) رەنگەكێ بۆیاغێیە ژ ئاخەسۆركێ یان ژ رەنگەكێ بەران دەردئێخن و جلكان پێ بۆیاغ دكەن.

## ٢٨ ـ باب: التيمن في اللباس.

### بابەتێ: ژ راستێڤە جلكان بكەنە بەر خۆ.

٢٨٢٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا لَبِسَ قَمِيصاً بَدَأَ بِمَيَامِنِهِ.[ت١٧٦٦].

* صحيح.

[انظر: ٩٥٠، ٢٨٤٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر قەمیس كربایە بەرخۆ ژ لایێ راستێ دەست پێ دكر.**

## ٢٩ ـ باب: ما يقول إذا لبس ثوباً جديداً.

### بابەتێ: دێ چ بێژیت ئەگەر جلكەكێ نوی كرە بەر خۆ.

٢٨٢٨ – عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْباً سَمَّاهُ بِاسْمِهِ، إِمَّا قَمِيصاً، أَوْ عِمَامَةً، ثُمَّ يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهِ وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ، وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ**). [د٤٠٢٠ . ٤٠٢٢/ ت١٧٦٧].

* صحيح.

[انظر: ٢٧٨٨].

- زاد أبو داود: قَالَ أَبُو نَضْرَةَ: فَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (ﷺ) إِذَا لَبِسَ أَحَدُهُمْ ثَوْباً جَدِيداً قِيلَ لَهُ: تُبْلِي وَيُخْلِفُ اللهُ تَعَالَى.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەكە جلكەكێ نوی كربا بەر خۆ ناڤێ وی دگۆت: شاشك یان قەمیس یان عەبا و دگۆت: (یا خودێ حەمد و شوكور بۆ تە بن، تە كرە بەر من، ئەز داخوازا باشییا وی ژ تە دكەم و باشییا بۆ هاتییە چێكرن و ئەز خۆ ب تە دپارێزم ژ خرابییا وی و ژ خرابییا بۆ هاتییە چێكرن).**

- **ئەبو داوود زێدە كرییە: ئەبو نەزری گۆت: هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) ئەگەر ئێكی ژ وان جلكەكێ نوی كربا بەر خۆ دگۆتنێ: هند بژی بدڕینی و خودێ ئێكێ دی شوینێ بدەتە تە.**

## ٣٠ ـ باب: ثوب الشهرة.

**بابەتێ: جلكێ ناڤبانگییێ.**

٢٨٢٩ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ فِي الدُّنْيَا، أَلْبَسَهُ اللهُ ثَوْبَ مَذَلَّةٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ أَلْهَبَ فِيهِ ناراً). [د٤٠٢٩، ٤٠٣٠/ جه٣٦٠٦، ٣٦٠٧].

* حسن.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ جلكێ ناڤبانگییێ د دنیایێدا بكەتە بەر خۆ خودێ رۆژا قیامەتێ دێ جلكێ شەرمزارییێ كەتە بەر، پاشی دێ ئاگری بەردەتێ).**

## ٣١ ـ باب: البذاذة والتقشف أحياناً.

**بابەتێ: د بەرخۆڕانەچۆن و دەستگرتن د هندە دەماندا.**

٢٨٣٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ التَّرَجُّلِ إِلاَّ غِبّاً.[د٤١٥٩/ ت١٧٥٦/ ن٥٠٧٠].

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ كوڕێ موغەففەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) **پاشڤەلێدانا ژ سەرشەكرنێ كری دەم بۆ دەمی نەبیت.**

٢٨٣١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) رَحَلَ إِلَى فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ، وَهُوَ بِمِصْرَ، فَقَدِمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ آتِكَ زَائِراً، وَلَكِنِّي سَمِعْتُ أَنَا وَأَنْتَ حَدِيثاً مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) رَجَوْتُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَكَ مِنْهُ عِلْمٌ، قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا.

قَالَ: فَمَا لِي أَرَاكَ شَعِثاً وَأَنْتَ أَمِيرُ الْأَرْضِ؟ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَنْهَانَا عَنْ كَثِيرٍ مِنَ الْإِرْفَاهِ. قَالَ: فَمَا لِي لاَ أَرَى عَلَيْكَ حِذَاءً؟ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَأْمُرُنَا أَنْ نَحْتَفِيَ أَحْيَاناً. [د٤١٦٠/ ن٥٠٧٣، ٥٢٥٤].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ بورەیدەیی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) گەشت كر، چۆ دەڤ فوزالەیێ كوڕێ عوبەیدی، و ئەو ل مسرێ بوو، هاتە دەڤ ئینا گۆت: ئەز بۆ سەرەدانێ نەهاتیمە دەڤ تە، بەلێ من و تە فەرموودەیەكا ژ پێغەمبەرێ**

خودێ (ﷺ) گوه لێ بووی، من هیڤییە تە زانینەك پێ هەبیت، گۆت: كیژ؟ گۆت: ئەڤە و ئەڤە.

گۆت: تە خێرە سەرێ تە یێ ڤژەڤژە و تو میرێ ڤی جهی؟ گۆت: ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا مە دكر ژ گەلەك ژ بەرخۆراچۆنێ. گۆت: بۆچی ئەز پێلاڤێ د پێ تە نابینم؟ گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) فەرمانا مە دكر ئەم هندە جاران خۆ پێخاس بكەین.

## ٣٢ ـ باب: لبس الصوف.

### بابەتێ: كرنەبەرا هرییێ.

٢٨٣٢ - عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: صَنَعْتُ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) بُرْدَةً سَوْدَاءَ، فَلَبِسَهَا، فَلَمَّا عَرِقَ فِيهَا، وَجَدَ رِيحَ الصُّوفِ، فَقَذَفَهَا.

قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَكَانَ تُعْجِبُهُ الرِّيحُ الطَّيِّبَةُ. [د٤٠٧٤].

* صحيح.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من عەبایەك ژ هرییێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دورست كر، ئینا كرە بەر خۆ، ڤێجا دەمێ خوهێ تێدا دایی، بێهنا هرییێ هاتێ ئینا هاڤێت.

گۆت: و ئەز هزر دكەم گۆت: و وی حەژ بێهنا خۆش دكر.

## ٣٣ ـ باب: ما جاء في العمامة والقميص والجبة والخف.

### بابەتێ: ئەوا د راستا دەرسۆك و قەمیس و جوبە و خوفێدا هاتی.

٢٨٣٣ - عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا اعْتَمَّ سَدَلَ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ.

قَالَ نَافِعٌ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَسْدِلُ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ. [ت١٧٣٦].

* صحيح.

[وانظر: ٢٠٤٣].

ژ نافعی (رحمه الله) ژ ئیبن عومەری گۆت: ئەگەر پێغەمبەری (ﷺ) شاشك كربایێ لفكا وێ د ناڤبەرا ملێت خۆدا بەردا.

نافعی گۆت: ئیبن عومەری لفكا شاشكا خۆ د ناڤبەرا ملێت خۆدا بەردا.

٢٨٣٤ - عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كَانَ أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) الْقَمِيصَ.
[د٤٠٢٥/ ت١٧٦٢/ جه٣٥٧٥].

* صحيح.

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: خۆشڤیترین جلك ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ قەمیس بوو.**

٢٨٣٥ - عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَبِسَ جُبَّةً رُومِيَّةً ضَيِّقَةَ الْكُمَّيْنِ. [ت١٧٦٨].

* صحيح.

**ژ موغیرەیێ کورێ شوعبەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) جوبەیەکێ رۆمی یێ هچك تەنگ کرە بەر خۆ.**

٢٨٣٦ - عَنِ الشَّعْبِيِّ. قَالَ: قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: أَهْدَى دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) خُفَّيْنِ، فَلَبِسَهُمَا. [ت١٧٦٩].

* صحيح.

**ژ شوعبەیی (رضي الله عنه) گۆت: موغیرەیێ کورێ شوعبەیی گۆت: دوحیەیێ کەلبی دو خوفك دیاری دانە پێغەمبەری (ﷺ) ئینا کرنە پێ خۆ.**

## ٣٤ ـ باب: ما جاء في طيب الرجال والنساء.

**بابەتێ: ئەوا د راستا بێهنخۆشیيا ژن و زەلاماندا هاتی.**

٢٨٣٧ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(طِيبُ الرِّجَالِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ وَخَفِيَ لَوْنُهُ، وَطِيبُ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ وَخَفِيَ رِيحُهُ)**. [د٢١٧٤/ ت٢٧٨٧/ ن٥١٣٢، ٥١٣٣].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بێهنخۆشیيا زەلامان ئەوە یا بێهنا وێ دیار ببیت و رەنگێ وێ ڤەشارتی بیت و بێهنخۆشیيا ژنان ئەوە یا رەنگێ وێ ئاشکرا ببیت و بێهنا وێ ڤەشارتی بیت).**

## ٣٥ ـ باب: الكحل.

**بابەتێ: کلی.**

٢٨٣٨ - عَنْ جَابِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(عَلَيْكُمْ بِالْإِثْمِدِ عِنْدَ النَّوْمِ، فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ)**. [جه٣٤٩٦].

* صحيح.

**ژ جابری (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (دەمێ خەوێ کلی د چاڤێ خۆ بدەن، ب راستی ئەو چاڤی رۆن دکەت و موویێ مژویلانکان شین دکەت).**

٣٦ ـ باب: الخضاب للنساء.

**بابەتێ: خەناکرنێ بۆ ژنان.**

٢٨٣٩ – عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ امْرَأَةً مَدَّتْ يَدَهَا إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) بِكِتَابٍ، فَقَبَضَ يَدَهُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَدَدْتُ يَدِي إِلَيْكَ بِكِتَابٍ فَلَمْ تَأْخُذْهُ؟ فَقَالَ: **(إِنِّي لَمْ أَدْرِ، أَيَدُ امْرَأَةٍ هِيَ أَوْ رَجُلٍ)** قَالَتْ: بَلْ يَدُ امْرَأَةٍ، قَالَ: **(لَوْ كُنْتِ امْرَأَةً لَغَيَّرْتِ أَظْفَارَكِ بِالْحِنَّاءِ)**. [ن٥١٠٤].

* حسن.

**ژ عەئیشایێ (ﷺ) ژنەکێ ب نڤیسارەکێ دەستێ خۆ درێژ کرە پێغەمبەری (ﷺ)، ئینا پێغەمبەری دەستێ خۆ ڤەکێشا، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من دەستێ خۆ ب نڤیسارەکێ بۆ تە درێژ کر و تە ژ من وەرنەگرت؟ ئینا گۆت: (من نە زانی ئەو دەستێ ژنێیە یان یێ زەلامییە) وێ گۆت: بەلکی دەستێ ژنێیە، گۆت: (ئەگەر تو ژن بایە دا نینۆکێت خۆ ب خەنایێ گوهۆری).**

٣٧ ـ باب: المرأة تتطيب للخروج.

**بابەتێ: ژن بۆ چۆنا دەرڤە بێهنخۆشییێ ل خۆ بکەت.**

٢٨٤٠ – عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا اسْتَعْطَرَتِ الْمَرْأَةُ، فَمَرَّتْ عَلَى الْقَوْمِ لِيَجِدُوا رِيحَهَا، فَهِيَ كَذَا وَكَذَا)**. قَالَ قَوْلاً شَدِيداً.[د٤١٧٣/ ت٢٧٨٦/ ن٥١٤١/ مي٢٦٨٨].

* حسن.

**ژ ئەبی مووسا (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ژنێ بێهنخۆشی ل خۆ کر و د بەر هندەك زەلامانرا بۆری دا بێهنا وێ بگەهیتە وان، ئەو یا هۆسا و هۆسایە)، و ئاخفتنەکا دژوار گۆت.**

٢٨٤١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ، فَإِذَا خَرَجَتِ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ)**. [ت١١٧٣].

* صحيح.

[انظر: ١١٠٦].

**ژ عەبدوللایێ كورێ ئیبن مەسعودی، (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ژن شەرمگەهە[1]، ڤێجا ئەگەر دەركەڤت شەیتان وێ د چاڤێت زەلاماندا جوان دكەت).**

## ٣٨ ـ باب: حجاب المرأة.

## بابەتێ: حیجابا ژنان.

٢٨٤٢ – عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ﴾[الأحزاب:٥٩]، خَرَجَ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ كَأَنَّ عَلَى رُؤُوسِهِنَّ الْغِرْبَانَ مِنَ الْأَكْسِيَةِ. [د٤١٠١].

* صحيح.

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها) گۆت: دەمێ ئەڤ ئایەتە: ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ﴾ هاتییە خوارێ، ژنێت ئەنساران دەركەفتن هەروەكی قەلەرش ییێت ل سەر سەرێت وان، ژ پەردەپۆشییێ.**

٢٨٤٣ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ، دَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَعَلَيْهَا ثِيَابٌ رِقَاقٌ، فَأَعْرَضَ عَنْهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَقَالَ: **(يَا أَسْمَاءُ، إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ، لَمْ يَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلاَّ هَذَا وَهَذَا)**، وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ. [د٤١٠٤].

* صحيح، وقال أبو داود: مرسل.

[وانظر: في فرض الحجاب: ٧١٤، ٢٤٠٥، ٣٦٤٦.

وانظر في الفصل بين الجنسين: ٢٤١٠، ٢٤١١.

وانظر في عدم الدخول على النساء: ٢٤١٢، ٢٤١٣].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەسمائا كچا ئەبی بەكری هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، و هندەك جلكێت تەنك ل بەر بوون، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرێ خۆ ژێ وەرگێرا و گۆت: (ئەی ئەسما ئەگەر ژن گەهشتە بێنڤێژییێ، نەدورستە چو ژێ بهێتە دیتن، ئەڤە و ئەڤە نەبیت) و نیشان كرە سەروچاڤ و هەردو لەپێت خۆ.**

(١) نانكو: ئەگەر لەشێ وێ دەركەڤت شەرم ژێ دهێتە كرن هەروەكی شەرم ژ جهێ دڤێت نەهێتە دیاركرن دهێتە كرن.

### ٣٩ ـ باب: ذيول النساء.

### بابەتێ: دەمانێت ژنان.

٢٨٤٤ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاَءَ، لَمْ يَنْظُرِ اللهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: فَكَيْفَ يَصْنَعْنَ النِّسَاءُ بِذُيُولِهِنَّ؟ قَالَ: (**يُرْخِينَ شِبْراً**)، فَقَالَتْ: إِذاً تَنْكَشِفُ أَقْدَامُهُنَّ، قَالَ: (**فَيُرْخِينَهُ ذِرَاعاً، لاَ يَزِدْنَ عَلَيْهِ**). [ت١٧٣١/ ن٥٣٥١].

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ جلکێ خۆ ژ خۆمەزنکرن د دویڤ خۆڕا بکێشیت، رۆژا قیامەتێ خودێ ب چاڤێ دلۆڤانییێ بەرێ خۆ نادەتە وی).** ئوم سەلەمە گۆت: ژن چ ل دەمانێت خۆ بکەن؟ گۆت: **(بلا بهۆستەکێ شۆڕکەن)**، گۆت: هۆسا دێ پێت وێ دیار بن، گۆت: **(بلا گەزەکێ درێژکەن و ژ ڤێ زێدە نەکەن).**

### ٤٠ ـ باب: لبس النعل.

### بابەتێ: کرنەپێیا شمکێ.

٢٨٤٥ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ، وَإِذَا انْتَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، لِتَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعْ**). [خ٥٨٥٦/ م٢٠٩٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێکی ژ هەوە شمك کرە پێ خۆ بلا ب لایێ راستێ دەست پێ بکەت، و ئەگەر ئێخست بلا ب لایێ چەپێ دەست پێ بکەت، و بلا لایێ راستێ ل بەر کرنێ یا ئێکێ بیت و ژ پێ ئێخستنێ یا دویماهییێ بیت).**

٢٨٤٦ – (م) عَنْ أَبِي رَزِينٍ قَالَ: خَرَجَ إِلَيْنَا أَبُو هُرَيْرَةَ، فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى جَبْهَتِهِ فَقَالَ: أَلاَ إِنَّكُمْ تَحَدَّثُونَ أَنِّي أَكْذِبُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) لِتَهْتَدُوا وَأَضِلَّ! أَلاَ وَإِنِّي أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِذَا انْقَطَعَ شِسْعُ أَحَدِكُمْ، فَلاَ يَمْشِ فِي الْأُخْرَى حَتَّى يُصْلِحَهَا**). [م٢٠٩٨].

ژ ئەبی رەزینی (رضي الله عنه) گۆت: ئەبو هورەیرە دەرکەڤت هاتە دەڤ مە، و دەستێ خۆ ل ئەنیا خۆ دا و گۆت: هوین دزانن هوین دبێژن ئەز درەوان ب ناڤێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دکەم دا هوین راستەڕێ ببن و ئەز سەردا بچم! بزانن ئەز شەهدەیێ ددەم من گوه

**ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (هەكە قەیتانا نەعالا ئێكی ژ هەوە قەتیا بلا ب یا دی نەچیت هەتا دوروست دكەت).**

٢٨٤٧ – عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ يَنْتَعِلَ الرَّجُلُ قَائِماً. [د٤١٣٥].

* صحيح.

**ژ جابری (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهی یا كری مرۆڤ ژ پێڤە نەعالێ بكەتە پێ خۆ[1].**



(١) ئەڤە ئەگەر پێلاڤ یان نەعال هەوجەی گرێدانێ بیت دا ئەزیەت نەگەهیتێ، و ئەگەر هەوجەی گرێدانا قەیتانێ نەبیت چو نینە ژ پیاڤە بكەتێ.

# ناڤەروکا بەرگێ دویێ

## تماميا مەبەستا سێيێ: پەرستن

## کتێبا پێنجێ: نڤێژا سونەت و ويتر


**پشکا ئێکێ: نڤێژا سونەت..................................................٥**

١. بابەتێ: پاریزیکرن و هشیاری ل سەر دو رکعەتێت سونەتا سپێدێ..........٥

٢. بابەتێ: کرنا سونەتان بەری نڤێژێت فەرز و پشتی وان..................٦

٣. بابەتێ: کرنا سونەتان ل مال............................................٨

٤. بابەتێ: کرنا نڤێژا سونەت روینشتی......................................٩

٥. بابەتێ: نڤێژا تێشتەگەهێ...............................................١٠

٦. بابەتێ: نڤێژا زێدە خوزڤرى و تەوبەداران.................................١١

٧. بابەتێ: نڤێژا خێرخوازییێ ( ئستیخارێ )..................................١١

٨. بابەتێ: نڤێژا سلاڤا مزگەفتێ ( تەحیا مزگەفتێ )...........................١٢

٩. بابەتێ: نڤێژا درێژ ( تەسابیحان )......................................١٣

١٠. بابەتێ: نڤێژا پێدڤییێ...............................................١٤

١١. بابەتێ: رازاندنێ پشتی هەردو رکعەتێت سونەتا سپێدێ.................. ١٤

١٢. بابەتێ: کەنگی دێ هەردو رکعەتێت بەری نڤێژا سپێدێ قەزا کەت...........١٥

١٣. بابەتێ: ئەرێ دێ سونەتێ ل وی جهی کەت یێ نڤێژا فەرز لێ کری.......... ١٥

**پشکا دووێ: شەڤنڤێژ و ویتر..................................................١٧**

١. بابەتێ: بهایێ دوعایێ و نڤێژێ ل دویماهییا شەڤێ..........................١٧

٢. بابەتێ: نڤێژا شەڤێ دو رکعەت دو رکعەتە....................................١٧

٣. بابەتێ: هاندانا پێغەمبەرێ خودێ ( س ) ل سەر شەڤنڤێژان.....................١٨

٤. بابەتێ: هاندانا پێغەمبەرێ خودێ ( س ) ل سەر شەڤنڤێژان.....................١٩

٥. بابەتێ: کا دێ چ بێژیت ئەگەر رابوو شەڤنڤێژان................................٢١

٦. بابەتێ: ئەوا نەباش ژ توندرەوییێ د پەرستنێدا..............................٢٢

٧. بابەتێ: وەستیانا پێغەمبەرى ( س ) د پەرستنێدا..............................٢٢

٨. بابەتێ: یێ ب شەڤ بنڤیت هەتا سپێدە دبیت..................................٢٤

٩. بابەتێ: ویترێ.......................................................٢٥

